

# باخچەی بۆن خۆشان

کۆمەڵێ لە کەراماتی مەشایخی هەورامان

## لەحضرەتی شێخ عثمانەوە تا حضرەتی شاعثمان

لە دانانی خوالێخۆشبوو
حاجی ملا أحمدی قاضی پێنجوێنی

چاپی یەکەم

باخچەی بۆن خۆشان
لە دانانی خوالێخۆشبوو
حاجی ملا أحمدی قاضی پێنجوێنی
چاپی یەکەم



کۆمەڵێ لە کەراماتی مەشایخی هەورامان

لە حضرەتی شێخ عثمانەوە تا حضرەتی شاعثمان

دانراوی

ملا أحمدی قاضی پێنجوێنی

چاپی یەکەم

## ناونیشانی کتێب

❖ ناوی کتێب: باخچەی بۆنخۆشان

❖ چاپخانەی هێڤی - هەولێر

❖ تیراژ: (١٠٠٠) دانە

❖ چاپی یەکەم: ساڵی ٢٠١٦

❖ لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٨٢٥)ی ساڵی ٢٠١٦ ی پێدراوە



## حاجی ملا أحمدی قاضی پێنجوینی

ئـــەولیاء اللە بـــە عـــیزز و نـــازن
بـە بـازوو شـێر و بـە دیـدە بـازن

بۆ ئەوجی فـەزای مەرتەبەی قوربـەت
هـــەڵۆ هەڵمـــەت و بوڵنـــد پـــەروازن

بـۆ دۆس و ئـەحباب لـە هـەردو دنیا
کهـــف الامـــان و نعـــم المـــلازن

بـە رەحم و وەفـان دەرون پڕ صـەفـان
لە حەق مەغفیرەت بۆ خـەڵق ئەخوازن

ئەمان موئمن و خەڵکیش هەر موئمن
ئـــەمان حەقیقـــەت ئـــەوان مـــەجازن

بـــە کـــورتی گـــرۆی ئـــەولیاء اللە
لـــە بـــەنی نـــەوعی خۆیـــان مومتـــازن



نحمدك تعالى حمد الذاكرين, ونشكرك تعالى شكر العابدين, أن هديتنا إلى سواء السبيل, فأنت المنان والحنان ذو القوة المتين, فعال لما يريد, ممسك السموات السبع أن يقعن, ورب العرش العظيم مالك الملك, وخالق الخلق ومنزل الحق المبين, لا اله الا أنت سبحانك, وأفضل الصلاة وأتم التسليم على الهادي المهدي والمبعوث رحمة للعالمين, شفيع الامة, وحبيب رب العزة سيدنا ومولانا محمد صلّى الله عليه وآله وسلّم ذو الخلق العظيم, و على اله وأصحابه الذين ساروا على منهجه القويم, وأكرموا برؤية نور وجهه الكريم, ونهلوا من فيض علمه العظيم, وفقنا الله لهديهم وألحقنا بهم يوم الدين.

خوێنەری هێژاو خۆشەویست: لەو ڕۆژەوەی خوای میهرەبان بە گەورەیی و لوتفی بێ سنوری، ئەم جیهانەی بەنووری ئیسلام پرشنگدار کردو مرۆڤایەتیی لەژێر چنگاڵی چەوسانەوەو سەرکوتکردن رزگار کردو لە لێواری دۆزەخەوە گەڕاندیەوە بۆ خۆشیەکانی بەهەشت و ژیانێکی پڕ ئارامیی و ئاسودەیی، لە هەمان کاتدا بەڕەحمەتێکی گەورە خۆشنوودی کردین کەلە کەسایەتیی بەرزو بێ وێنەی حەزرەتی محمد المصطفى (صلّى الله عليه وآله وسلّم)دا خۆی بینیەوە:

(وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين)(سورة الأنبياء:١٠٧)، ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە (صلّى الله عليه وآله وسلّم) بوو بە ڕەحمەت بۆ جیهانیان، بۆ مرۆڤایەتی، چونکە مرۆڤایەتی بەشێکی هەرە زۆری پیرۆزییەکانی خۆی لە دەست دابوو، هەروەك چۆن مرۆڤەکان لە شیرازەی مرۆڤایەتیی لایاندابو، هەر بۆیە هەموو جیهانیان بە ئاسمان و زەویەوە، بە دارو بەردو کەژو کێو و گوڵ و گوڵزاریەوە، بە پێدەشت و نزاریەوە بە زمانی حاڵ هاواریان ئەکرد و ئەپاڕانەوە لە پەروەردگار کە فریاد ڕەسێکیان بۆ بنێرێت

بۆئەوەی لە هەموو ئەو ستەم و چەوساندنەوانە ڕزگاریان بکات و بیانگەڕێنێتەوە بۆ دۆخی ئاسایی و پڕ لە ئارامیی.

خوای میهرەبان وەزیفەی ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستەی (صلّی الله علیه وآله وسلّم) لە قورئانی پیرۆزدا دیاریکردووە، کە لە یەکێك لە ئایەتە پیرۆزەکاندا بەرچاومان دەکەوێت:

(هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ)( الجمعة ٢).

یەکەم وەزیفەی ئەم پێغەمبەرە سەروەرە (صلّی الله علیه وآله وسلّم):

يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ: ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان ئەخوێنێتەوە بەسەریاندا، بەجۆرێك کە پێغەمبەرێتی ئەو خۆشەویستەی بۆ نومایان دەکردن و یاساکانی شەریعەتی بۆ ڕوون دەکردنەوە.

ئەو کەسانەی کە پێشتر مێشك و هەست و بیرو هۆشیان ئاوێتەی چەند ناوێکی نەگریس کرابوو، وەکو: (لاتو عوزاو مناة) کە کردبوونیانە هاوبەشی خواو خۆشیان کۆیلەو گەردنکەچی سەرانی بێ باوەڕبوون، وا ئەمڕۆ لەسەر زمانی شیرینی بەڕێزترین مرۆڤی سەر ڕوی زەوی، دوایەمین پەیامبەری خوا دڵ و دەروونیان بەم پەیامە پیرۆزە زاخاو ئەدرێت، وشەی پیرۆزی (لا إله إلا الله محمد رسول الله) لە دڵیاندا جێگیر دەبێت، سەردەمی گەردنکەچی بۆ ستەمکاران و هاوەڵ پەیداکردن بۆ پەروەردگار بەسەرچوو، تاکە ئاوازی پڕ لە سۆز و تەئسیر کە قورئانی پیرۆزە بوو بە بەهاری دلانیان، هەر یەکێك لەو هاوەڵە بەڕێزانە بوون قورئانێکی زیندوو لە هەڵسوکەوتوو گوفتار و خوڕەوشتی بەرزدا.

دووەم وەزیفەی ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە (صلّی الله علیه وآله وسلّم):

وَيُزَكِّيهِمْ: پاڵفتەکردنی دڵ و دەروونیانە، هەموو لەطائفیان کە پێشتر بەهۆی دووربوون لە (معرفة الله) تاریکی و قەسوەت باڵی بەسەردا کێشابوون، وا ئەمڕۆ

هەر بە ئیمان هێنان و بینینی ڕوخساری پێغەمبەر (صلّى الله عليه وآله وسلّم) ئەگەنە پلەیەکی بەرز و ناوێکی بێوێنە کە ئەویش ناوی پیرۆزی (صحابه)یە، وەزیفەی دووەمی حەزرەت (صلّى الله عليه وآله وسلّم) گۆڕانکاریی ڕیشەیی لەسەر خودی مرۆڤەکان و دەوروبەریاندا دروستکرد، ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە خوای تعالی شەرەفمەندی کردن بەم صوحبەتە، کارو کردەوەیان لە مێژووی پڕ سەروەری مرۆڤایەتیدا تۆمارکرا، بەڵێ ئەم هاوەڵە بەڕێزانە لە ڕەگەزی مرۆڤ بوون، بەلاّم هەڵوێستگەلێکیان نواند کە مرۆڤایەتی دووچاری سەرسوڕمان بوو لە گەورەییان و ئەم پرسیارەیان لەلا گەلاڵە بوو، ئایا ئەم هاوەلاّنە لە ڕەگەزی مرۆڤن یان فریشتەن لە شێوەی مرۆڤدا؟

سەدان نموونە لە ژیانی پڕ بەرەکەتی ئەم هاوەلاّنەدا گەواهی ڕاستی وتەکانی پێشوومانن، سەرەڕای خواناسی و زوهدو دونیا نەویستی، سەقامگیرکردنی دادپەروەری و لە خەمی خەڵکیدا بوون، دەستەبەرکردنی دادپەروەری کۆمەلاّیەتی و هتد... سیمای بەرزو ئاکاری ناوازەی ئەم بەڕێزانە بوون.

ئەم قۆناغە پیرۆزە کە حەزرەت (صلّى الله عليه وآله وسلّم) بە فەرمانی پەروەردگاری بە ئەنجامی گەیاند، بەپێی شایستەیی کەسەکان جۆراوجۆر بوون، کەسایەتییەکی گەورەی وەکو دایکی ئیمانداران حەزرەتی خدیجە (رضي الله عنها) کە تیشکی ئەم رسالە پیرۆزە دەبیستێت سوێند ئەخوات بۆ حەزرەتی پێغەمبەر(صلّى الله عليه وآله وسلّم) و ئەفەرموێت: (كلاّ، والله لا يخزيك الله أبَداً، إنَّك تصلُ الرَّحِم، وتصْدُق الحديث، وتحْمل الكلّ، وتَقْري الضَّيْف، وتكسب المعدوم، وتُعينُ على نوائب الحق)[1]. تەنها لە خزمەتابوونی حەزرەت (صلّى الله عليه وآله وسلّم) کافی

(١) رواه البخاري ومسلم واتە: (سوێند بەخوا هەرگیزاو هەرگیز خوا نائومێدت ناکات، چونکە تۆ سەردانی خزمانت دەکەیت و یارمەتی هەژاران دەدەیت و دەستی بێ نەوایان دەگریت و ڕێز لە میوان دەگریت، وە لە هەموو کارێکی چاکەدا دەستپێشخەری دەکەیت).

بوو بۆ ئەم تەسلیم بوونەی بە پەروەردگار و باوەڕهێنانی وەکو یەکەم ئافرەتی باوەردار هاتە ناوزەدبوون.

یـاخود نموونـەی بـەرزی حـەزرەتی أبـو بکـری صـدیق (رضـي الله عنـه) تـەنها بەگوێبیستی بانگەوازی حەزرەت بێ دوودڵی موسوڵمان دەبێ، کە بەمە بـوو بـە یەکـەم کـەس لـە چینی پیـاوان کـە سـەری گەردنکەچیی و تەسـلیم بـوونی بـۆ پـەروەردگار دانەواند.

لە چینی منالأنیشدا ئیمامی (علی) (کرم الله وجهه) وەکو پەپولەی دەوری چرای ڕوی ڕۆشانیی حەزرەت (صلّی الله علیه وآلـه وسلّم) بەرچاو ئەکـەوێت، کـە بـەو تەمەنە بچوکەوە، بەو خاوێنی منالّییەوە، لەگەڵ نووری پـیرۆزی ئیسـلام و توجهـاتی پێغەمبەرو خۆشەویستی حەزرەت (صلّی الله علیه وآله وسلّم) تێکەڵ دەبێت.

- یان کەسانی دیکـە بـەهۆی دوعـاو نـزاو پاڕانـەوەی حەزرەتـەوە خـوای گـەورە هیدایەتی فـەرموون: (وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ)(الشوری:٥٢)، حـەزرەتی عمـر (رضي الله عنه) بەر ئەو نزا پیرۆزەی پێغەمبەر (صلّی الله علیه وآلـه وسـلّم) کـەوت، کە ئەیفەرموو: (اللهم أعز الإسلام بأحب هذين الرجلين إليك بأبي جهل أو بعمر بن الخطاب, قال: وكان أحبهما إليه عمر)[1]، خوای میهرەبان هیدایەتی ئیمام عمری داو بەموسـوڵمان بـوونی موسـوڵمانان پێیـان نایـە قۆنـاغێکی نوێـوە ئـەویش بـریتی بـوو لـە ئاشکرابوونی بانگەوازی ئەم ئایینە پیرۆزەو دواتریش هەموو ئـەو بەربەسـتانە ڕەوانـەوە کە ئەیان ویست نوری ئەم بانگەوازە پیرۆزە خامۆش بکەن.

سێیەم وەزیفەی ئەم پێغەمبەرە نازدارە (صلّی الله علیه وآله وسلّم):

(١) رواه الترمذي بسند صحیح واته: ( خوایە لەم دوو کەسە کامیانت خۆشدەوێ ئیسلامی پێ سـەربخە، "أبـو جهـل عمـرو بـن الهاشـم"، یـان "عمـری کـوڕی خـاب". گێڕەرەوە دەفـەرموێت: لـەو دووانـە خۆشەویستەکەیان لای خوا ئیمامی عمر بوو.)

(وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ) فێری قورئانی پیرۆزو فەرائیزەکان و سوننەتە شیرینەکانی دەکردن، لەبەرامبەردا هاوەڵە بەڕێزەکان چاو و دڵیان کردەوە بۆ فێربوون تێگەیشتن لەم قورئانە پیرۆزەو، بە دڵ و گیان لە خزمەتی قورئانی پیرۆزو سوننەتی شیرینی حەزرەتدا بوون (صلّى الله عليه وآله وسلّم)، تەقواو لە خواترسانیان کردە سەر مەشقی ژیانو هەوێنی کاریان، خۆیان لە هەموو خوویەکی ناپەسەندو ناهەموار پاراست، لەبەرامبەردا خوای تعالى شەرفمەندی کردن بە چەند کارێکی بەدەر لە عادەت (خارق للعادة) کە لە بیروباوەڕی موسوڵمانانـدا بە (کرامەت)[1] ناسراون[2].

لەولاتی کوردەواری خۆماندا بەتایبەتی شارەزوورو هەورامانی کوردستانی باشور، چەندین زاناو شێخی پایەبەرزری تیا هەڵکەوتووە، کە کاری پیرۆزیان بانگکردنی خەڵکی بووە بۆ ناسینی خوای بێ هاوتاو دوورکەوتنەوە لە حەرام و بێشەرعی، هەزاران کەسیان بانگکرد بۆ پابەندبوونی زیاتر بە ئیسلامەوە، دەیان مەدرەسەی ئایینیان کردەوەو لە ساڵانی گرانی و نەبوونیدا مەدرەسەکانی ئەم شێخە

---

(١) کرامة: واتە ڕێزلێنان، کارێکە وەکو (معجزة) لە سنووری توانای ئادەمیزادا نییە، خوای گەورە لەسەر دەستی دۆستانی خۆی ئەیهێنێتە جێ و داوای پێغەمبەرایەتیش ناکەن، واتە (کرامة) ڕێزلێنان و بەڵگەیەکە، کە ئەم ئایینە ڕاستەو بەئەنجامدانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەندە ئەبێتە دۆستی خوا، کەواتە: ئەگەر موسوڵمانێك ئەم (کرامة)ی دەست نەکەوت ئەوە پلەی پێ دانابەزێ لەلای خوا و پێویستە لە ڕێگەی ڕاست هەر بەردەوام بێ. لە قورئانی پیرۆزدا چەند نموونەیەك هەیە، لە کەرامەت، وەکو: ڕووداوی حەزرەتی (مريم) دایکی حەزرەتی (عیسا)ی پێغەمبەر و، چیرۆکی (أصحاب الكهف) و، گواستنەوەی عەرشی بەلقیس لەلایەن (ئاصەفی کوڕی بەرخیا)، کە ئەم نموونانە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای قورئانن کە جێگای ئینکاری نین.

(٢) کەرامەتی هاوەڵان زۆرن و نوسراوێکی تایبەتی ئەوێت، لەوانەی کە لە سەرچاوەکاندا تۆمارکراون، بانگکردنی حەزرەتی عمر (رضي الله عنه) لەسەر مینبەر لە شاری (مەدینە)وە لە سارية(رضي الله عنه) [يا سارية الجبل] کە سارية ئەوکات لە (نەهاوەند) بو، مانگێك لە (مەدینە) دوور بوو، (سارية)ش گوێی لە دەنگی ئیمامی عمر (رضي الله عنه) بو، بەهۆیەوە موسوڵمانەکان سەرکەوتن. یان هاوەڵی بەڕێز خوبەیب (رضي الله عنه) کاتێك لە زیندان زنجیرکرا بوو بینیان سینیەك تریّ لەلا بوو، وەرزی تریّ نەبوو، وە چەندەها نموونەی دیکە لەسەر دەستی تابعین و چینی دوای ئەوان بینراون.

پایەبەرزانە ململانێی زانکۆکانی ئەو سەردەمەیان کردووەو لە یەك کاتا خانەقاکانیان قوتابخانەی سەیرو سلوك و زیکرو یادی خوا بوون و نەخۆشخانەیەك بوون بۆ تیماری نەخۆشی‌یەکانی (ظاهر) و (باطن)و خواردنگەی بێ منەت بوون بۆ هەموو کەسێك بێ جیاوازی، باوانی فەقیرو هەژارو بێلانەو حاڵ بوون. هەتیوخانەو خانەی بەساڵاچوان بوون، بەڕاستی ئەم ئایەتە پیرۆزە لە کردەوەکەی ئەواندا زۆر بە جوانی بەرجەستەو راڤە دەبێت:

((وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا (٨) إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا ))( الإنسان: ٩).

ئەم شێخە بەڕێزانە لە شێخ عثمانی سراج الدینی یەکەمەوە - کە خەلیفەی هەڵکەوتووی حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی بووە- پاشان کوڕو نەوەکانی لە وێنەی شێخ عبدالرحمن أبو الوفای کوڕی و، شێخی بهاء الدین‌و، شێخ عمری ضیاء الدین‌و, شێخ نجم الدین‌و, شێخ محمد علاء الدین‌و, شێخی حسام الدین‌و, حەزرەتی شێخی سراج الدینی دووەم و شێخ مەولانا خالیدی برای کە خزمەتیان زۆر لەبەر چاوەو، ئەم زاتانە لە خواناسی و بۆ خوا سوڵحاندا تاکە گەوهەری سەردەمی خۆیان بوون و، بەکردارە شیرینەکانیان کاریگەری‌یان لەسەر دڵان دروست کردووەو بە توجهاتی پیرۆزیان سەدان دڵ و دەروونیان لە ژەنگ و ژاری گوناهو قەسوەت پاك کردۆتەوەو ڕایان کێشاون بەرەو خواناسی و خزمەت کردن بە دین و ژین.

سەدان فەقێیان پێگەیاندووەو سەدان زانایان بەخشیوە بە گوندو شارو شارۆچکەکانی کوردستان، جیهاد و بەرگرییان لە دین و خاك و نیشتمان ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە، تەسلیم نەبوون بە هیچ دەسەڵاتێکی دونیایی، گەواهی ئیمانی پتەویان بووە، ئەوەتا (شێخ عمری ضیاءالدین)- قدس سرە - لە وەڵامی (ناصر الدین)ی شای قاجاردا کە ئامادەیی خۆی دەربڕیوە بۆ دابینکردنی موچەی مانگانەی خانەقا و مەدرەسەکەی حەزرەتی شێخ عمر ـقدس سرەـ لە وەڵامدا ئەفەرموێت:

ما ابروی فقرو قناعت نمی بریم        باپادشا بگوئید که روزی مقر راست[1]

ئەم شیعرو وەڵامە جوانە هەڵهێنجراوە لە عەقیدەیەکی ڕاست و بەتینی ئیسلام (الرزق مقسوم) وەکو لە سەرچاوەکانی عقیدەدا هاتووە، سەرەڕای (توکل)و پشت ئەستوری بە خوا کە نیشانەی ئیمانی کاملەکانە.

یاخود خزمەتە بەرچاوەکانی شێخی پایەبەرز حەزرەتی شێخ محمد عثمان سراج الدینی دووەم کە چەندین نووسراوی ئەوێت تابتوانرێت بەشێك لە مافی خۆی پێ بدرێت، بەتایبەتی لە ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو، خانەقای تورکیا بووە جێگای حەوانەوەو پەناگەی کوردی لێقەوماو بە خواردن و شوێنی نووستن لە خزمەتیاندا بوون، کە ئەو چەند ساڵەو ئەو قەرەباڵغی و خزمەتە مەگەر تەنها خوای میهرەبان پاداشتی ئەو پیرە دڵ مونیرە بداتەوەو لەناو ڕەحمەتی خۆیدا خۆشنوودی بکات.

ئەم شێخە پایەدارانە - قدس الله أسرارهم- بە شاهیدی گەورەزاناو خواناسانی سەردەمی خۆیان بەسەدان (کەرامەت)یان لێبینراوەو، دەماودەم لەلایەن کەسانی ڕاستگۆو خاوەن متمانەوە گێردراونەتەوە، ئەگەرچی خۆیان بەهیچ شێوەیەك باسی خۆیان نەکردووەو خۆیان لە دەنگ و باس و هەواڵی کاری بەدەر لە عادەت (خارق للعادة) پاراستووە؛ بەڵام ئەگەر پەروەردگار کەسێکی خۆشویست بانگەوازی بۆ ئەکات و فریشتەی بەڕێز جبریل بانگ دەکات و پێی ڕادەگەیەنێت کە پەروەردگار فلانە کەسی خۆشدەوێت و تۆیش (واتە جبریل) خۆشت بوێت، جبریلیش خۆشی دەیوێت، پاشان جبریل بانگەواز دەکات بە ناو ئاسمانییەکاندا و ئەفەرموێت کە پەروەردگار فلانە کەسی خۆش دەوێت ئێوەش خۆشتان بوێت، ئاسمانییەکانیش

---

(۱) واتە ئێمە ئابڕوی هەژاری و قەناعەت نابەین، بە پاشا بڵێن کە ڕۆزی دیاری کراوە.

خۆشیان دەوێت. پاشان جێگای ڕەزمانـدیی و قبـوولکردنی لەسـەر زەوی بـۆ دابـین دەکرێت[1].

بەدڵنیاییشەوە ئەم زاتانە بەر ئەو بانگەوازەی پەروەردگارو خۆشەویستی بۆیـان و پاشـان جبریـل و ئـەهلی ئاسمـان کـەوتوون کـە قبـوولکردنی خـەڵکی لەسـەر زەوی نیشانەی درووستی کاری ئەم بەڕێزانەو بۆ خوا سوڵحانیان بووە.

خوێنەری هێژا: ئەم کتێبەی بەردەستان بریتییە لە چاپی دووەمی کتێبی (باخچـەی بۆنخۆشان) کە بەشێکە لە کەراماتی شێخانی پایەبەرزی هـەورامان لـە حـەزرەتی شـێخ عثمان سراج الدینی یەکەمەوە تا حەزرەتی شێخ محمد عثمان سراج الـدینی دووەم کـە زانای گەورەو خۆشەویست مامۆستا مەلا ئەحمەدی قاضی[2] (رەحمەتی خوای لێ بێت)،

---

(١) ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاری دەیگێڕێتەوە: ((إِذَا أَحَبَّ اللَّهُ الْعَبْدَ نَادَى جِبْرِيلَ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلَانًا فَأَحْبِبْهُ فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ فَيُنَادِي جِبْرِيلُ فِي أَهْلِ السَّمَاءِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلَانًا فَأَحِبُّوهُ فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ ثُمَّ يوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الْأَرْضِ ))

(٢) مامۆسـتا مـەلا ئەحمـەد کـوڕی زانـای گـەورە مـەلا محمـدی قاضـی پێنجـوێنی لەسـاڵی ١٩٢٠ لەشارۆچکەی پێنجوێن لە دایك بووە.

- زانایەکی گەورەو بانگخوازو هۆنـەرێکی لێهـاتوو بـووە، شـارەزاییەکی زۆر بـاشی لـە زانسـتە عـەقلیو نەقلیەکاندا هەبووە.

- زمانی فارسی و عەرەبی زۆر بە باشی زانیوە.

- لە کۆماری کوردستان لە مهاباد بە شیعر لە ڕۆژنامەکاندا هاوکار بووە.

- لە شاری پێنجوێن و پاشان لە مزگەوتی (نەقیب) لە سلێمانی پێش نوێژ بووە.

- لـە ڕێبـازی نەقشـبەندیدا موریـدێکی پێگـەیشتووی ئـەم ڕێبـازە بـوەو ڕۆڵێکـی مـەزنی بینیـوە لـە بانگهێشتکردنی گەنجانی شار

بۆخواناسیو دوورکەوتنەوە لە فیکرەی مارکسیەت کە لەو ڕۆژەگارەدا باوی بوە.

- خاوەنی کتێبی گەنجینەی گەوهەر و باخچەی بۆنخۆشانە.

- خاوەنی دیوانێکی شیعرە کە بەم نزیکانە بەچاپ دەگات.

- خاوەنی کتێبی (کأس الشاربین)ە کە بە زمانی عەرەبییە، هێشتا چاپ نەکراوە.

- لە ساڵی ١٩٨٣ بە هۆی نەخۆشیەوە لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی سەیوانی شاری سلێمانی بەخاك سپێردراوە.

هەڵساوە بە کۆکردنەوەیان و لە کەسانی ڕاستگۆ و باوەڕپێکراوەوە وەریگرتوون و پاشان تۆماریکردووە و بەچاپی گەیاندوون.

ئەم کتێبە سەرەڕای ئەوەی کە زیاتر لە (٣٢) ساڵ بەسەر چاپی یەکەمیدا تێپەڕیوە بەڵام تا ئێستاش تاموچێژێکی تایبەتی هەیەو ڕۆڵی ڕێنماکار دەبینێ بەرەو چرای خواناسی و خۆنزیك کردنەوە لە ڕاستگۆیان (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ) (التوبة ١١٩) ئەگەر چی بەهۆی هەندێك تەوژمی ڕێبازی وەهابیەت کە لە سەرەتای ساڵانی نەوەدی سەدەی ڕابردوودا هێنرایە کوردستانەوە، ئەم کتێبە و نـاوەرۆك و ڕێبازەکـانی تەسـەووف کەوتنـە بـەر هەڵمـەتێکی بێویژدانانـەی چەواشەکارانەوە بەبێ ئاوڕدانەوە بۆ مێژووی پرشنگدارو خزمەتی کەم وێنەی ئەم مەردە گەورانەی ڕێبازی نەقشبەندی، لە پێگەیاندنی زانایان و هاوکاری فەقیر و هـەژار و بێنـەوایان و تیمـاری نـەخۆش و دەردەداران، کەوتنـە دژایـەتیکردن و لەکەدارکردنیان لە بری ئەوەی باسی خزمەت و لێبڕانیان بۆ گەنج و لاوەکان بکردایە بە چەمکەکانی (خورافات، بیدعە، شیرك) ئەم مەردە خواناسانەیان عەیبدار ئەکردو زۆر کەسیان چەواشە کردو، هەر بەمەشەوە نەوەستان بەڵکو عەقیدەی ئەشعەری کە عەقیدەی ٩٥% ی موسوڵمانانی جیهانە کرایە عەقیدەیەکی ناپەسەند و بەدەر لە ئەهلی سوننەت و جەماعە، لەبەرامبەردا عەقیدەی (مجسمة) و (مشبهة) کرایە بەدیل و، نەوەی نوێی ئەم گەلە ستەمدیدەیان پێ فریو دا و بۆ ئەوەی بەناو جیهادەکەشیان وەرگیراوی لای میستەرەکانیان بێت مەزاروگۆڕی ئەو شێخە بەڕێزانەیان دەرهێنا، بەبێ گەڕانەوە بۆ سوننەتی پێغەمبەر (صلّی الله علیه وآله وسلّم) بەڵام کەسە ژیرەکان و تێگەیشتوانی ڕاستەقینە لە قورئان و سوننەت باش تێگەیشتبوون کە سەرەنجامی ئەم کەسانە کاتییەو لە ناوچوونە؛ چونکە پەروەردگار لە دوو حاڵەتدا جەنگی لە دژی دوو دەستە ڕاگەیاندووە:

یەکەمیان: سوخۆرەکان: (فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ)

(البقرة ٢٧٩)٠

دووەمیان: ئەوانەی دژایەتی ئەولیاو دۆستانی پەروەردگار دەکەن، وەکو لە فەرموودەی قدسیدا هاتووە: (من عادی لي وليا فقد آذنته بالحرب) رواة البخاري. واتە هەر کەسێك ئازاری دۆستێکی من بدات بەزمان یان بەکردار، ئەوا بەڕاستی ئاگاداری ئەکەمەوە کە من جەنگی لە دژ ئەکەم.

هەربۆیە بەشێك لەم دەستانە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لەناوچوون، لەشێوەی (أصحاب الفيل) کە لە قورئاندا بەسەرهاتیان تۆمارکراوەو بەماوەیەکی کەم لەسەر ڕەخشەی ناوچەی هەورامان سڕانەوەو هاوسۆزەکانیشیان لە قاڵبدران و سڕکران.

ئەوەی کە ئێستا ئامادەکراوەتەوە، هەوڵێکە لە لایەن کوڕەکانی مامۆستا مەلا ئەحمەدی قاضی و بنەماڵەکەیانەوە، وەکو وەفایەك بۆ هەوڵی جەنابی مامۆستای قاضی، پاشان باوەڕی تەواو بە ڕێبازی عاریفان و خواناسان هەڵساون بە چاپکردنەوەی، لە هەمان کاتدا لە ڕووی (حسن الظن)ی بەڕێزیشیان بە بەندە، داوایان کرد کە پێشەکییەك بۆ ئەم کتێبە پڕ بەهایە بنووسم، لە ڕاستیدا من هەرگیز خۆم بەوە نەزانیوە شایەنی نووسینی پێشەکی نوسراوی مامۆستای قاضی بم، بەلاّم لەگەڵ ئەم قەناعەتەمدا دەستبەڕوونانی ئەم بنەماڵە بەڕێزەشم بەکارێکی نەشیاو و نەگونجاو زانی.

ئومێدەوارم کە خوای میهرەبان ئەم هەوڵەی لە مامۆستای قاضی وەرگرتبێت و گەنجی ئەم سەردەمەی خۆیشمان چاوو دڵ و دەروونیانی پێ ڕووناك بکەنەوەو خۆیان لەلاڕێ و تولە ڕێگاکان بپارێزن و شوێن ئەو زاتانە بکەون کە ئیسلامیان بۆ

بەرژەوەندی کەسی بەکارنەهێنا، بەڵکو خۆیان و سەروەت و سامانیان کردە قوربانی ئیسلام، خوای میهرەبان لە ڕیزی ئەم خواناسانەدا هەژمارمان بکات و لە کاروانی پڕ بەرەکەتی پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکاندا حەشرمان بفەرموێت و حسن أولئك رفيقا.

د. عرفان رشید شریف
پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە زانکۆی سلێمانی
سەرۆکی لیژنەی فتوای سلێمانی
پێشنوێژ و وتارخوێن لە مزگەوتی
دارالسلام لە سلێمانی
٢٠١٤/٩/٩



الحمدُ لله وصلى الله على خاتم الأنبياء وآله وأصحابه الأتقياء.

له پاش ستایش و درود بۆ سەر رۆحی خاوەنی مقامی محمود

**پێویسته زانینی ئەمە:**

گەلی هەر وولاتێ لەسەر دوو بەشه یەکەم ئەفرادی عام کە بریتین لە جوتیار و تاجر و بازرگان و عەتار و بەقاڵ و پزیشك و باقی تر لە کاسب و خاوەن پیشە. دووەم ئەندامی میری، کە لە کاتبێ یان سەربازێ یان پۆلیسێکەوە تا دەگاتە سەرۆك وەزیران بەمانە ئەڵێن (رجالی دەولە) یانی پیاوانی میری، دیارە پیاوانی میری هەر یەك لە روشتەی خۆیدا پلە و پایەیەکی هەیە لەناو مەدەنیەکانا لە مدیر ناحیەوە تا قایمقام و پارێزگار و مدیری عامی وەزارەتی ناوخۆ و وەزیر و سەرۆك وەزیران.

لە سەربازیدا لە یەك خەتەوە تا نائیب عەریف و رئیس عرفاو نائب ضابط و پایە پایەی ئەو پلە (مەنصەب)ە بەرزانە لە ملازم یەکەوە تا نەقیب و رائید و مقدم و عەقید و تا ئاخر.

لە پۆلیسیشەوە (شرطە) موفەوەز و معاون مدیر شرطە و تا ئەگاتە سەرەوە.

ئەڵبەتە ئەمانە بەپێی خوێندن و شەهادەی بەرز و نزم و کردەوەی چاك بەم مەقامانە گەیشتون، بە هەموو ئەمانە ئەڵێن مەئموری دەوڵەت، ئەنجا مدیر شرطەی وا هەیە دە دینار شك نابات ئەتوانێ دەوڵەمەندێکی ملیۆنێر بگرێت و زیندانی بکات.

لەبەرئەوە کە لەلایەن میرییەوە دەسەلاتی دراوەتێ یان محافزێ چی مەیلی بێ ئەیکات بەلام ئەمان بێ ئەوەی کە شەهادەی خوێندەواری خۆیان بەدەستەوە بێ بەو پایانە دامەزراون.

ئەمجا لەناو عمومی موسڵماناندا عابید، زاهید، عالم و سائری موسڵمانان هەر یەك بەپێی زۆری عیبادەت و ئەعمالی صالحە و کەمێ لە کردەوەی چاکدا لای خوا مەقبولن و پاداشتی لە قیامەتدا هەیە وە بە بەهەشتی هەمیشە بەقا واصل ئەبن.

بەلاّم کەسانیٚ لە دانشتگای تصوف دەرئەچن وە طەی(بڕین) مەراتب ئەکەن بە أهل الله مەحسوبن وە هەر کام بە ئەندازەی گەیشتن بەهەر مەرتەبەیەك وەظیفەیە یا پایە بەرزی هەیە، وا ئەبیٚ لە ئەهلی أعمالی ظاهردا هەیە لەو لە پیٚشتر بەلاّم ئەم لە قەبیلەی رجالی دەولّەت، باقی موسلّمانان وەك ئەندامی گەل وان. بەمان ئەڵیٚن پیاوانی خودا، وەك بە هی دونیایی ئەڵیٚن پیاوانی حوکمەت لە پاش گەڕانەوە لە فەنای أتم رجوعی قەهقەری وەك عەبدی مەئزون معامەلەی لەگەلّ ئەکریٚت، والسلام.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمدُ لله مولي النعمة وكاشف الغمة والسلام على سيدنا محمد قائد الأمة ونبي الرحمة رسول ربّ العالمين وآله الطيبين الطاهرين وأصحابه نجوم الهداية رضوان الله تعالى عليهم أجمعين.

پاش حمد و ثنا و درود و سەلام

بە پێویستی ئەزانم بۆ ئەمڕۆ کە بە تەواوی إهتمام و گوێدان بە کاروباری ئایین خراوەتە پشت گوێ هەرکەس بە گوێرەی توانا و هەڵسوڕان کۆششێ بۆ سودی دواڕۆژی خۆی بکات، وە خزمەتێکی ئەم ئایینە بکات.

هەروەها کەڵکێکی بۆ برایانی هاوزوبانی خۆی ببێ، ئینجا لە ڕووی ڕاستیەوە ئەڵێم ئەگەر چی هیچ جۆرە لیاقەت و قابیلیەتێ لە خۆما نابینم، بەلام چونکە بۆ ڕۆژی دوایی (تۆشە)یە شك نابەم، لەبەر ئەوە بە ئۆمێدی تأییداتی ڕەحمانی و هیمەت و بەرەکەتی بەندەکانی عارفان و صادقانی خۆی، منیش وەك ئەو پیرەژنە ئەکەم کە بە چنگە خوریەکەوە چوو بۆ کرینی حەزرەتی یوسف درودی خوا لەسەر پێغەمبەری خۆمان و ئەویش بێت، پێیان ووت: داپیرە خاوەن دەسەلات و سەروەت و سامانی زۆر لە کرینی یوسف عاجزن، وە لە تەواوکردنی قیمەتی ئەو بێ دەسەلاتن، تۆ بەم نەختە خوریەوە بۆ هاتوی؟ پیرەژن ووتی: بۆ ئەوە هاتوم کە منیش ناوم بێتە ناو ناوی کڕیارانەوە ئەگینا ئەزانم هیچ دەست مایەیەکم نیە.

ئەنجا منیش بەم بێ دەسەلاتی خۆمەوە لە مایەی عیلم و إخلاص و مەعریفەتا هاتومە مەیدان بەڵکو بە یەکێ لە خزمەتکاران بە ئایینی بەرزی ئیسلام بدرێمە

قەڵەم...! کەریمان (کا)[1] بە نرخی کێو وەرئەگرن ئینجا کە دەستم دایە ئەم کارە مەبەستم ئەوە بوو کە سودی هەبێ بۆ برایان، چونکە لەو جۆرە خزمەتە کەم پێشکەش کراوە بە زمانی کوردی.

بناغەی دین ئیمانە، کە ئیمان دامەزراو و پتەو بوو معامەلەی ئایین و کار پێکردنی لەسەر شان سوك تر ئەبێ.

شارەزایی و مەعریفەت بە کەراماتی ئەولیا و خەواریقیان بۆ دامەزراندن و پتەوکردنی هێزی بیروباوەڕ دەستێکی باڵای هەیە.

ئەوا بە کۆمەکی خوا لە کەرامات و دەسەلات و تەسەروفاتی أولياء الله کە لە ووڵاتی خۆمان ... لە نزیکی خۆمان ... هەندێکیان لە زەمانی خۆماندا ... بە زمانی خۆمان، چۆن ڕووی داوە باسی ئەکەین.

وە هەروەکوو لە پێشەوە باسمان کرد کە مەبەستم ئەوەیە بیکەم بە تۆشەیە بۆ (ئاخیرەتم) وە برایانی هاوزبانم کەڵکی لێ وەربگرن، هەروەها بە حەیفم زانی ئەم پیاوە گەورە گەورانە کە باس ئەکرێن و کەراماتیان ئەخرێتە بەرچاو، وە خزمەتیان بە گەل و ئایینی ئیسلام کردوە گەلەکەمان نایانناسن.

هەروەها چاك وایە لە هەندێ معامەلە و کاروباری ئایین بەخەبەربێین، لە خوای عەلیم و حەکیم داوا ئەکەم تەوفیقم بدات وە ئەم خزمەتەم بۆ بکات بە هانای بەخشین و بەخششی خۆی، وە سودێکی زۆر بۆ برایانی ئایینی لێ بەرهەم بێت، ئامین یا ربّ العالمین.

---

(١) هەروەك لە فەرموودەی شەریفدا ئەفەرموێ (درهم سبق مئة ألف) یانی وا ڕێك ئەکەوێ یەك درهەم پێش سەد هەزار درهەم ئەکەوێ: دیارە ئیخلاصی زیاتر و مەبەست هەر بۆ خوایە خاوەنەکەشی کەم دەسەلات و ئەو کەسەش وەرئەگرێ زیاتر موستەحەقە جا هەر لەو مەعنایەدایە ئەڵێن (کەریمان کا بە نرخی کێو وەرئەگرن).

پێش ئەوەی دەست بە نوسینەوەی کەرامەتەکان بکەین، هەندێ لە اصطلاحاتی تەصەووف بە کورتی ئەخەینە بەرچاو، لە دواییدا ئەوانەیان کە پێویستیان بە درێژەپێدان هەبێت ئەگەڕێینەوە سەریان بەپێی پێویست درێژەیان پێ ئەدەین.

**ئیمان:** یانی باوەڕ بەبێ شکو گومان، ئەمیش سێ پلەی هەیە:

١- ئیمانی تەقلیدی

٢- ئیمانی إستدلالی

٣- ئیمانی شهودی

**دین:** یانی تۆڵە – مالك یوم الدین- یانی خاوەن و دەسەلاتداری ڕۆژی تۆڵەدانەوە بە چاکە، یان تۆڵە سەندنەوەی ناحەق و خراپەکاری لە ظالمان و خراپەکاران.

**دین:** بریتیە لە عیلم، عەمەل (کردەوە)، ئیخلاص.

**دین:** دووبەشە: یەکەم بەشی ئەحکام، دووەم: بەشی ئەسرار.

**شەریعەت:** عیلم بە ئەحکام.

**طەریقەت:** عەمەلە بەگوێرەی ئەحکام، بەلام لەگەڵ (کولفەت) یانی زەحمەت و مەشەقەت و ڕەنجدانێکی زۆر.

**حەقیقەت:** عەمەلە بەگوێرەی ئەحکام، بەلام بە پێچەوانەی پێش تر، یانی بێ زەحمەت و مەشەقەت[1].

**یەقین:** دامەزراوی و دڵنیایی بە ڕاستیی خەبەر، یانی نەبونی هیچ شك و گومانێك بە بوون یا نەبوونی شت، وە ڕووتێنەکردنی وەهەم بە هیچ جۆرێك، تا ڕادەیەك کە ساحەی سینە لە هەموو غوبار و گەردێکی تەردید و گومان پاك بێتەوە.

**یەقین:** سێ پلەی هەیە یەکەم: علم الیقین، دووەم: عین الیقین، سێهەم: حق الیقین.

---

(١) انسان کە عیلمی بو بە ئەحکام وە بەو عیلمە عەمەل و کردەوەی کرد، بەگوێرەی ئەو ئادابە لە طەریقەتا دانراوە ئەگات بە حقیقەت، خاوەنی حقیقەت عەمەل کردنی بەپێی شەریعەتی بۆ ئەبێ بە (جوزئی طبیعەت) بە هیچ جۆرێك ناتوانێ بە پێچەوانەی ئەوەوە ئیش و کار بکات وە دەق بەو خوەوە ئەگرێت.

**علم اليقين**[1]: ئەوەیە کە دڵنیایی پەیدا ببێت بۆ بوونی شتێك بەهۆی بوونی شتی ترەوە وەك پەیداکردنی دڵنیایی بە بوونی ئاگر لە پشت کێوێکەوە بە هۆی بەرزبونەوەی دوکەڵ لە پشت کێوەکەوە، دیارە وەك ئاگرەکە نابینرێت چونکە کێوەکە بەردەمی گرتوە، بەڵام شتی تر بەڵگەیە لەسەر بوونی ئاگر کە ئەویش (دوکەڵە)، کەواتە وا دوکەڵی بینراو بو بە بەڵگە و دەلیل بۆ بوونی ئاگری نەبینراو، ئینجا بە دوکەڵەکە ئەوترێ (ئەثەر) وە بە ئاگرەکە ئەوترێ (مؤثر).

**عين اليقين**: بینینی هەمان ئەو ئاگرەیە کە باسمان کرد، کاتێ بچیتە سەر کێوەکە، و تەماشای (مشاهدەی) بکەیت، لێرەدا دڵنیاییەکە زیاتر ئەبێت چونکە یەقین لە عیلمەوە کۆچ ئەکات بۆ عەین.

**حق اليقين**: ئەوەیە کەسێ دوای بینینی ئاگرەکە، بکەوێتە ناوی وە هەموو ذەراتی جیسم و وجودی ببێ بە ئاگر، مثلا: وا فەرزکەین پارچەیەك ئاسن روحی تیا بێت بیخەیتە ناو ئاگرێکەوە، وەك پشکۆ سوور ببێتەوە بەڵام حەیات و رۆحەکەی بمێنێ، لەم کاتەدا لەگەڵ ئاگرەکە خۆی جیا ناکاتەوە (والحال ئەو ئاسنە ئاگر نی‌یە بەڵام سەیطرە و قارەمانی ئاگرەکە وەك خۆی لێ کردوە ... منصبغ بووە بە صبغەی ئاگر).

**نەفس**: حقیقەتی شخصی انسان، وە پێی ئەوترێ (نەفسی ناطقة).

**نەفس**: سێ پلەی هەیە: نەفسی ئەمارە، نەفسی لوّامە، نەفسی موطمەئینّە.

**ئەمارە**: نەفسێکە کە پێش ئەوەی خۆی لە أصلا نفسێکی قدسی بێت وەك (أنبیاء) وەیان هەندێ لە کباری (أولیاء) وە یان پێش ئەوەی دەستکاری کرابێ لە ژێر تربیەی مرشدێکی مقتدادا، ئەم نەفسە هەمیشە کاروکردەوەی سەرکێشی‌یە لە فەرمانی خوا، وە بە خراپە نەبێ فەرمان نادا.

---

(١) حصولی یەقین وا ئەبێ بەبێ وجودی دەلیل دەس ئەدا، وەك ئیمانی تقلیدی.

**لوّامە:** هەر ئەو نەفسەیە بەلاّم پاش ماوەیەك (تزکیە) بون ئەگاتە ئەو ڕادەیەی سەرزەنشتی خۆی بکات لە بیٚ فەرمانی خوا وە لە غەفلّەت و خەریك نەبون بە فەرمانی خواوە.

**مطمئنة:** هەر ئەو نەفسەیە بەلاّم بە تەواوی بە هۆی تەواوکردنی معاملە و کاروباری سلوکەوە لە ژێر تربیەی مرشدی عارفا بە مرتبەی (فنای أتم) و (بقای أتم) کە ئەویش بریتی‌یە لە گەیشتن بە (شرفی ولایتی کبری) ئەگات، ئەو کاتە ئەبێت بە (مؤمن)ی کامل وە ڕاستی و صدقی ئایەی کەریمەی [اللّهُ وَلِيُّ الّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ] [1] بە تەواو مەعنا لەو دێت.

**طەریقەت:** طریق ڕێگەیە، وە ڕێگەش ئیبتدا و ئینتیهایەکی هەیە، یانی لە جێگەیەکەوە دەرباز بوونە بۆ گەیشتن بە جێگەیەکی تر.

**طەریقەت:** بە دوو جۆر ئەبڕدریٚ، یەکەم بە (جەزبە) دووەم بە (سلوك).

**ڕابیطە:** (پەیوەندی) لە بەینی دوو کەسا، لە طەریقەدا بریتی‌یە لە پەیوەندی لە نێوان مرید و مرشیدا بەپێی فێربوونی ئادابی تایبەتی خۆی [2].

**حُبّ:** خۆشەویستی چەسپینی شتێکی پەسەند، بە طبیعەت یا بە دلّەوە.

**عیشق:** شدەت و تینی موحەبەت، هەر شتێك موحەبەتی لەدلّدا تینی سەندەوە بلّێسەی ئاگری لەدلا چەسپا وە دەرونی هێنایە جۆش و خرۆش، ئارامی بە خاوەن دلّ نەهێشت، صبر و قەراری لیٚ هەلّگرت، ئەوە پێی ئەوتریٚ (عیشق). پێچەوانەی (حب) (بوغصن)، وە پێچەوانەی (عیشق) (مەقت)ە.

**فەنا:** پلەی ژور عیشقە، لە ئەنجامی شدەت و تینی عیشقەوە پەیدا ئەبیٚ، ئنجا وەك عیشق وا لەسەرو حبەوە، فەناش وا لە سەرو عیشقەوە، خاوەنی عیشق ئاگای لە خۆیەتی بەلاّم خاوەنی فەنا بیٚ ئاگایە، بەکورتی هۆش و إدراکی خاوەن فەنا لە بەدلا

---

(١) البقرة: ٢٥٧.

(٢) مرید = سالیك, مُراد= مجذوب, طالب= منیب, مطلوب = مجتبى.

چەسپاوەکەی خۆیدا ون ئەبێ، وای لێ دێت خۆی و ئەو لەیەك جیاناکاتەوە، بەڵکو خۆی نامێنی لە نەزەر خۆیا، فەنا بڕینی بادیەی وجودە بە تەواوی، تا هیچ ئەثەرێ لە خاوەن فەنا نامێنێ.

**بەقا:** گەڕانەوەیە لە حاڵی فەنا (کە بێ ئاگایی‌یە) بۆ حاڵی ئاگاداری و بەهۆش هاتنەوە وە ئەمەش بە مەعنا (إیجادێکی ثانوی)یە یانی لە پاش فەنا کە بریتی بوو لە نیسیان و لە بیرچوونەوەی بە تەواوی غەیری خوای تعالی، وە تیاچوونی زاتی سالیك لە زات و صیفاتی حق‌دا سەرلەنوێ دروستبونەوەیەکی تر لە طرف (لایەن) خواوە ڕوو ئەدات وەك فەرمویانە: (لن یلجَ ملکوت السماء من لم یولد مرّتین) گوزەر ناکا بە مەڕاتبی حەقیقەتی ئەوزاعی ئاسمان مەگەر کەسێ نەبێ کە دووجار لەدایك بووبێ جاری یەکەم بەپێی عادەت جاری دووەم بە بەقای تەواو لە دوای فەنای تەواو کە گەیشتنە بە پایەی حقّ الیقین، رزقنا الله بفضله العظیم آمین.

ئەنجا لە پاش هاتنەوە بۆ بەقا وەك یەکەم جار لەگەڵ ڕەزائیلدا نابێ بەڵکو بە ئەخلاقی پەسەندیدەو خووڕەوشتی زۆر جوان و تەبیعەتێکی تەواو ڕێك و پێك و سیرەتێکی بەرزی فاضلانەوە دێتەوە.

بە عیبارەتێکی کورت متخلق ئەبێ بە (أخلاق الله)وە لە گەرد و تۆزی ڕەزائیل پاك ئەبێت، ئیتر شەریعەتی ئیسلام ئەبێت بە سروشت بۆی یانی لە پاش بەفەناچونی وجودی سەر لە نوێ وجود و زاتێکی پێ ئەبەخشێ کە پاك بێ لە پەیوەندی دنیا و ئاخیرەت بەڵکو پەیوەندی و عەلاقەی لەگەڵ خودادا ئەبێ و بەس.

**سلوك:** ڕێگە بڕین و ڕوو لە منزلی (مقصود)کردن بە کۆشش و سەعی نەفسی سالیك خۆی.

**سالیك:** ڕێبوار، لێرەدا بە معنا ڕێگە بڕین بە پاکردنەوەی نەفس و بەدەست هێنانی موناسەبە بە هۆی رابیطە و زیکری خواوە بۆ نزیکی بە عالەمی قدس، نەفسی إنسان تا بە یادی خوا مناسبە پەیدا نەکات، تا لە أخلاقی نالەباری و بەدکاری و بەد

أطواری نەگەڕێتەوە وە نەکەوێتە سەر ڕێگەی نییەتی جوان و خولق و خوی شیرین و کرداری چاك، وە رەوشتی پەسەندکراوی شەریعەت دورە لە مقام و پلە و پایەی (تقرّب) بۆ لای خوا. بەلاّم کە بەم بارەدا وەرگەڕایەوە وردە وردە ڕووەو منزلّی پلەی بەرزی و گەیشتن بە مقامی قبولّی (قُربی) ئیلاهی (جل جلالە) نزیك ئەکەوێتەوە.

**جەذبە:** ڕاکێشان و بردن.

**مەجذوب:** راکێشراو (براو) لێرەدا مەرام ڕاکێشانی ئەهلی زیکر و طەریقەتە لە لایەن خواوە بەبێ إختیاری ئەو کەسە راکێشراوە خۆی، (سالیك) بە کۆششی خۆی ئەڕوا. بەلاّم (مجذوب) ئەیبەن، هەندێ کات بۆ هەندێ کەس هەیە ماوەیەك سلوك ئەکا ئنجا لوطف و عینایەتی خوایی بە حالّەتی —جەذبە– بە ماوەیەکی کەم لە مقامی پەستیەوە بە بەرزی پایەی قورب و پلەی بالاّی ویلایەتی ئەگەیەنێ، وە هەندێکیش هەر لە ئەوەلّەوە پێش سلوك بە (مغناطیسی نیسبەتی مەحبوبیەت و مرادیەت) بەبێ سەعی و کوششێکی زۆر بە خەلاّتی مەرتەبەی ویلایەت لە ماوەیەکی کەما کامەران و بە نیشانەی قوبولّ لە بارەگای حضرتی ئەحەدییەت سەر شانی شەئنی ئەڕازێتەوە.

وە هەروەها جەزبە دووبەشە ١- جەزبەی قەلبی، ٢- جەزبەی روحی، جەزبەی قەلبی بۆ موبتدیە، وە بە هۆی دەوامی زیکر یا توجهی مرشد بۆ تصفیەی دلّ ڕوو ئەدات، وە لە نەتیجەی تێکەلّبوونی زولّمەت و نورەوەیە، وەك مالّێ گسکی لێ بدەیت یا حەوزێ پاك بکرێتەوە، بەلاّم جەزبەی ڕۆحی لەسەر پاکی و صافیەوەیە، وە بەس لە عینایەتی لوتفی ئەزەلیەوە رادەکێشرێ بۆ عالەمی قدس إلی ماشاء الله.

نەظەری لوطفی لەهەر کەسێ       گۆی بەختیاری لە مەیدانا برد

**مقام:** حالّەتێکی ثابت و دامەزراوە بۆ خاوەن (مقام)، وەك بوترێ: فلان کەس کە سالیکە لە مەقامی صبردایە، یان لە مقامی (توکّل) دایە، یان لە مقامی (خوف) دایە.

**مقام:** (ده) مقام له طەریقەتدا هەیە، سالیك ئەبێ نەقڵ بێت لەمەوە بۆ ئەو. یەکەمیان تەوبەیە و دەهەمیان مقامی رەضایە.

**حاڵ:** حاڵەتێکی وایە کە لە سالیك روئەدات بەڵام ثابت و دامەزراو نیەیە، کە دامەزرا ئەبێ بە (مقام).

**ئیمداد:** کۆمەك و یارمەتیدان.

**ئیستمداد:** داواکردنی کۆمەکی و یارمەتی.

**وەلی:** شخصی خاوەن ویلایەت.

**ویلایەت:** بریتی‌یە لە (فەناو بەقا)، یانی فەناو بەقای تەواو کردبێ، ئەوەی ئەم دوانەی تەواوکرد پێی ئەوترێ ویلایەتی هەیە، کەسێ ویلایەتی بوو وەلی‌یە.

ویلایەت: سێ پلەیە، یەکەم ویلایەتی صغری، دووەم ویلایەتی کبری، سێهەم ویلایەتی علیا.

**دوائر:** (٢٠) بیست دائیرە هەیە لە طەریقەتدا، یەکەمیان بریتی‌یە لە عالەمی ئیمکان، بیستەم اللاتعینیّە.

**ذکر:** بەهەر اسمێك (ناوێك) لە أسمای إلهی کە (٩٩) إسمە، یان بە تسبیحات و حمدو ثنا و لا حول ولا قوە إلاّ بالله، وە یان صلوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بکرێت داخلی ذکرە, کە یادی پێ ئەڵێن.

بەڵام لە طەریقەتدا (بە پێی دەستوری مورشید لە طەریقەی علیّەی نقشبندیدا) تعلیمی ذکری (الله)یە، بەشەرتێ ریعایەتی شروطی بکرێت، لە دوای ئەوەی ذکری نەفی و إثبات هەیە کە ئەمیش شروطی تایبەتی خۆی هەیە کە ئەبێ ریعایەت بکرێ.

**ویلایەت:** دوو بەشە (عامە) و (خاصە) ویلایەتی عامە ویلایەتی پێغەمبەرانە دوورودی خوایان لەسەر بێ (ئەمە جگە لە پێغەمبەری خۆمان ﷺ).

بەڵام ویلایەتی خاصە ویلایەتی محمدی‌یە، وە ئەم ویلایەتە ویلایەتی پێغەمبەری خۆمانە ﷺ.

**مراقبه:** مواظبه و غافل نەبون بەپێی ئەو دەستورەی کە مورشید فێری مریدی ئەکا، وە هەر مراقبەشە أحوالّ و أوضاعي تیا روئەدات.

**مراقبه:** چەند ناوێکی هەیە وەکو: المراقبة المعيّة, المراقبة العمديّة, المراقبة الأقربيّة, المراقبة الأحديّة.

**الكمالات الثلاثة:** سێ کەمالاتن تعلیمی مرید ئەکرێت یەك لە دوای یەك، لە یەکەمیانا مقامی (برد اليقين) بۆ سالیك ڕووئەدات.

**برد اليقين:** مەقامێکە ئیمان پتەو و معرفەت زیاد ئەکات. ئەو حقائقەی کە لە دینا ثابتن و لە شریعەتی ئیسلاما موجودن، بە تەواوی لەبەر چاو پەیدا و مکشوف ئەبن.

وەك: مەلائیکە، جن، کەشفی بەهەشت، جەهەننەم، نیعمەت و عەزابی قەبر بۆ خاوەن قەبر، بینینی أسرار، بینینی (نکیر و منکر) و ملائکەتانی قەبر، أرواحی أنبیا و أولیا و کۆبونەوە لەگەڵیانا. پرسیار لێ کردنیان لە هەرچی موشکیلەیەك کە هەبێ، معریفەت بە وەحدەتی حەزرەتی أحدیەت (جلّت قدرة ربّنا الواحد الأحد).

**الحقائق السبعة:** مراقبەی حەوت حقیقەتە یەك لە دوای یەك، لەوانە: (حقيقة الكعبة الربانية)، حقیقەتی نوێژ، حقيقة العبودية الصرفة, حقيقة الخلة, حقيقة الحب.

بە تەواوبونی ئەمانە طەریقەت تەواو وە خاوەن طريق منتهي‌یە.

**التصفية:** پاکردنەوەی لطائف وە لابردنی پەردەی مانع لە بینین لەسەریان.

**التزكيه:** خاوێن کردنی نەفس لە (رذائل) وە لە أمراضی نفسي.

**تخلية:** تخليه و تزكيه لە یەك مەعنادان، یانی نەفس و دەرون خاڵیکردن لەو شتانە کە لە شریعەتا ناپەسەند و زەم کراون.

**تحليه:** یانی دوای تەخلیەی نفس لە (رذائل)، رازاندنەوەی بە (فضائل)[1] وە بە أخلاقی جوان و أطواری پەسەند[2].

**توجه:** معاملەیەکە کە (أهل الله) قدّس الله أرواحهم بە کاری ئەهێنن لە کاروباری گرنگدا، وەك گوێزانەوەی مرید لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر وە لە مقامێکەوە بۆ مقامێکی تر. یان بۆ تصفیه و پاکردنەوەی (لطیفة)ی مرید، یان تزکیەی نفسی مرید، یان بۆ لابردنی نەخۆشی، تەنانەت بۆ لابردنی ئازار و نارەحەتی لەسەر مردوش.

**نظر:** ئەمیش لە معنای (توجه) دایە، وتویانە:

دست بدست آمده این سیلسله

یك نظر پیـر بـه از چل چله

**الأجزاء العشرة الإنسانية:** پێنجیان لە (عالەمی خلق)ەوەیە، وە پێنجەکەی تریان لە (عالەمی ئەمر)ەوەن کە پێیان ئەوترێ بەمانەی دوایی (اللطائف).

ئەجزای عەشرەی إنسانی ئەمانەیە:

١-قەلب، روح، سر، خەفی، ئەخفا، ئەم پێنجە لە عالەمی ئەمرن خوای تعالی ئەفەرموێ: (أَلا لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ)[3]،

إنسانی کامل ئەم پێنج عالەمە ئەمرییەی یەکەیەکە تصفیەی ئەبێ، لە کورەی فەناوە دێتە کۆڕی بەقا، وە هەریەکە لەو پێنجە دەبنە مظهرێ بۆ علمێ، مثلا چاو کە تانەیەکی لەسەر بوو بە معالجە و تداوی کە لاچوو ئیتر ئەو چاوە ئەبینێ، وە ئەبێت بە مظهر بۆ عیلمێك، یانی ئەو معلوماتانە کە بەهێزی (باصیره) دەست ئەکەوێ ئیتر

---

(١) فضائل، بێ هەوایی، خۆ بەکەم زانین، سەخاوەت، شەهامەت و پیاوەتی، تەرکی خۆشەویستی دنیا، حوسن و جوانی أخلاق پەیوەندی بەستن بەو شتانەوە کە خوا پێی خۆشە.

(٢) رذائل: وەك غرور، خۆ بە گەورە زانین، بەخیلی، عجب، حەسودی، تەماع، حیرص، خۆشەویستی دنیا، سوئی أخلاق.

(٣) الأعراف: ٥٤.

پەیدا ئەبێ، ڕەنگو، تاریکی و ڕووناکی و دار و بەرد و بەڕر و بەحر و هەر شتێکی تیایە، لە چاودا ظاهیر ئەبن، کەواتە وا چاو بو بە مظهر، وە ئەو شتانەی چاو ئەیان بینێ ئەبن بە ظاهر, ئاوێنە بیدەرە بەر ڕۆژ یان بەرامبەر کێوێ رایگرە، ڕۆژ یان کێوەکەی تیا دیارە، ئاوێنەکە پێی ئەوترێ مظهر, ڕۆژ یان کێوەکەش پێیان ئەوترێ ظاهر.

هەروەها بۆن خۆش بێت یان ناخۆش کە بۆن کرا هێزی (بۆن کردن) (شامە) مظهرە بۆنەکەش ظاهیرە، بە گوێ بیستن دور یان نزیك، خۆش یان ناخۆش، هەر جۆرێ بێت هێزی (بیستن) (سامعە) کە لە گوێدایە مظهرە، دەنگەکەشی ظاهیرە، هەروەها بەم جۆرە باقی حەواسەکان ئینجا ئەوانەی بە چاو یان بە گوێ یان بە هەر حاسەیەکی تر زانرا ئەوە عیلمە، چونکە زانین عیلمە وە نەزانین (جەهل)ە، ئاشکرایە چاو معلومی خۆی تایبەتە بە خۆی، بە گوێ نازانرێ، بەلاَم ئەمانە تەنیا دەخلْیان بە مەحسوساتی (هەستی) ظاهیرەوە هەیە، وە هێزیان ناگاتە ئەوەی نفوز بکاتە ناو کاروباری (باطنیە)وە ... لطائف کە لە عالەمی ئەمرن، ئەوانیش هەریەکەیان (مظهرە) بۆ (ظاهیر)ێك کە مخصوص و تایبەتی خۆیەتی لە معلومات و معارفی باطنیدا، لە پاش سەیقەل دان و کشف الغطای لطائفی عالەمی ئەمری هەریەکە بە تەنیا بۆ خۆی ئەبێ بە سەرچاوەی دەریاهای بێ بن و ساحیلی عیلم و معرفەتێکی تایبەتی خۆی کە لە باطنا هەیەتی.

دوای تەواوبونی معاملەی یەکە یەکەی ئەمان، هەریەکەیان (بە کاتی خۆی) لە بابەت تصفیە و عروجیانەوە هەریەکە بۆ مەڵبەندی تایبەتی خۆی، نۆبەی تزکیەی نەفس دێت، بۆ رزگاربونی لە نەخۆشی باطنی، وە لە تەواوی (رذائل)وە رزگاربونی لە صیفەتی ئەممارەیی[1]، وە گەیشتنی ئەمیش وەك (لطائف)ەکان بە نیهایەتی عروج و گەیشتنی بە مەراتبی (فنای أتم) و (بقای أتم) ئەوسا پێی لە دوا مەرتەبەی (ولایەتی

---

(١) ئەممارە: إنّ النفس لأمارة بالسوء إلاّ ما رحم ربي.

صغری) ئەگوێزرێتەوە بۆ شەرەفی پلەی (ولایەتی کبری) کە لە ئەصلا ولایەتی (أنبیا)یە (صلوات الله وسلامه علیهم أجمعین) لە دوای ئەمیش بە عنایەت و توفیق و دەست گیری أزلی، تزکیەی یەکە یەکەی (٤) عنصرەکە دەست پێ ئەکا، تەنانەت عنصری (خاك)یش دوای هەمویان لە وەزعی (کثافەت)ەوە بۆ پلەی بەرزی وەصفی (لطافت) عروج[١] ئەکات، بە کۆتایی معاملەی ئەم، دوا نقتەی لە دائرەی (١٩) نۆزدەهەم لەو (٢٠) بیست دائرەیە کە وترا تەواو ئەبێ، ئنجا بە تەواو بوونی معاملەی هەر (دە) جوزئەکەی ئەو سالیکە، یانی (أجزای عشرەی إنسان) ئەبێت بە انسانی کامل، شەریعەت ئەبێ بە تبیعەت بۆ ئەم زاتە، وە حقیقەتەکە پڕ بە پڕی معنای (تخلّقوا بأخلاق الله) دێت، وە ئەبێت بە پارچەیەك (نور)ی ڕووت.

معصیەت و گوناهو أخلاقی ناشیرین هەموی لە تاریکی و زوڵمەتی نەفسی ئەمارەوە روئەدات، کە زوڵمەت و تاریکی و ئەمارەیی نەما ئەوانیش نامێنن، بە ڕاستی ئەم ئینسانەیە مؤمنی کامل، صدقی ئایەتی کریمەی (اللّهُ وَلِيُّ الّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ)[٢]، بە تەواوی مەعنا لەم خاوەن حقیقەتە دێت و بەس. ئەمانە هەموی ئەنجام و بەرهەمی عەمەل بە شریعەت بو بە گوێرەی پەیڕەوی ئادابی تەریقەت:

| | |
|---|---|
| تەریقەت باخی گوڵ و گوڵزارە | باخی پڕ میوەی درەخت و دارە |
| باخی خۆش هەوای ئاوی ئاواتە | پڕ لە سەرچاوەی خۆشی حەیاتە |
| مەڵبەندی نەزهەی نازی نازارە | مەنزڵگای نزیە نەزاکەت دارە |
| هەواری بەرزی دیمەن دییارە | مەئوای گەیشتن بە لیقای یارە |
| جێگەی شرفی قوربی خودایە | مولکێکی گەورەی هەتا هەتایە |

(١) عروجي عناصر عروجی شروفیە، عروجی حقیقی واقیعی نیە، ئەڵبەت لطافەت شەرەف و پایەبەرزی هەیە بەسەر وەصفی کثافەتدا.

(٢) البقرة: ٢٥٧.

**نور**: روناکی، وه ئەم روناکی‌یه هۆیه بۆ رێ بینین، وه رێ لێ تێکنەچون، وه کەشفی شت و مەك لەبەرچاوا.

ئنجا به شەوقی چرا، مانگ لۆکس، گڵۆپ، ئەوترێ نور، چاوی ساغ که شت ببینێ پێی ئەوترێ نور (نوری چاو)، چونکه تەنیا نوری چرا و مانگ و ڕۆژ بەس نی‌یه بۆ بینین ئەبێ نوری چاویش هەبێ، کەوابو به هێزی حاسەی چاو ئەوترێ (نور) به عەقڵ ئەوترێ (نور) چونکه جوان و ناشیرین، چاك و خراپ، سود و زیان، وه کاروباری رێك و ناڕێك، لەبارو نالەبار به عەقڵ جیا ئەکرێتەوه، کەوابو عەقلیش نوره.

به عیلم ئەوترێ (نور) چونکه چەندەها نەزانراوی پێ ئەزانرێ، زانست کەواته نوره (نور) دیسان ناوێکه له (أسمائی إلهی جل جلاله) ئەویش به مەعنایەك نوره که هەر مەگەر (حەزرەتی باری تعالی) خۆی بیزانێ، وه خواناس (عارف الله) به رێگای (مکاشفه) دەرکی بکەن، بەڵام حقیقەتی نور ئەو (نورەیه).

**ظوڵمەت**: ظوڵمەت پێچەوانەی نوره، تاریکی، کوێری، شێتی، جەهل، هەموی به زوڵمەت ناو ئەبرێن، که نور نەما دنیا تاریکه رێگا دەرناکەوێ، یەکێك که کوێر بو بێ نوری چاو رێگا نازانێ، که نوری عەقلی نەبوو شێت و سەرگەردان ئەبێ، که نوری عیلمی نەبوو نەزان و جاهیل و سەر لێ شێواو ئەبێ.

"دەست که گەیشت به چل چرای تەریقەت ئەتبات تا بەفەجری صادقی حەقیقەتت ئەگەیەنێ، وه به فەوزی طلوعی ڕۆژی حقیقەت ئیتر فوو له چرای ئەدیلەی عیلمی که هەر بەکاری روناك کردنەوەی شەوی نەزانی ئەهات ئەکەیت".

جا ئیتر (حەقیقەت) که خۆی میوەی شیرین و پێگەیشتوی درەخت و مێوی پڕ له بەری (طەریقەته) وه ئەمیش که له باخی خۆش مناخی (شریعەت) بەدی هاتوو له ئەرزی استعدادی بەرزی سەعادەت و سەرفرازی شاری پڕ له ئەنواری سینەی بێ وێنه و ممتازی وجودی أشرف الموجودی سوڵتانی حیجازی‌یه ﷺ، که به هۆی سەرەو

کاری باخەوانی ئەمین و چاودێری فایقانەی بەردەوامی (فی الأفق المبین)، بە پێی دەستوری بە (نور مستور)ی عینایەتی ئەزەلی و پرتەوی (فەزلی جەلی) بوو ظهوری سڕی (فتق)ی بە حقی بەینی زەمینی (محبوبی) و ئاسمانی (محبی)یە، کە لە أصلی (رتق)ی حبی صیرفی سەرچاوەی (کنت کنزا مخفیاً فأحببت أن أعرف فخلقت الخلق لکي أعرف) بە بەرهەم هاتوە.

بێ گومان خاوەنی ئەم (حقیقەتە)یە مکانەتی (فی معقد صدق) وە منـزیلەتی (عند ملیك مقتدر) شاد، وە بە پلە و پایەی بەرزی شەرەفی (فبی یسمع وبی یبصر وبی یبطش) لە دەست دیلێتی خۆپەرستی ئازاد بوە (بەندەی بەڕاستی ئەمە. خاوەنی خواناسی ئەمە) هەرکەس بە ڕاستی لەگەڵیا بێ لە دەرد و بەلاّ و شەڕی هەردو دونیا ئەمین و دڵنیایە، وە فەرمانبەری ئایەتی کریمەی (وکونوا مع الصادقین)ە.

**قەبض:** حاڵەتێکە بۆ سالیك پەیدا ئەبێ، ئەوەندە نارەحەت و دڵ گوشراو ئەبێت، جاری وا هەیە خەریکە خۆی بکوژێ.

**بەسط:** حاڵەتێکە بە پێچەوانەی قەبضەوەیە، بەسەر سالیك دێت، لە خۆشیا ئارامی نامێنێ، خەریکە باڵ بگرێ.

**جلال:** صیفەتێکە کە حاڵەتی (قەبض) لەوەوە پەیدا ئەبێ. جەلال بۆ متوسط وە قەبض بۆ مبتدی.

**جمال:** صیفەتێکە کە حاڵەتی (بەسط) لەوەوە دەرئەکەوێ. جمال بۆ متوسط وە بەسط بۆ مبتدی.

**ابن الوقت**[1]: مقامێکە کە (أولیاء) لە پلەی (تلوین) دان، هەندێ جار (مغلوبی) صیفەتی (جلال)ن وە هەندێ کات لە ژێر دەسەلاّت و قارەمانێتی صیفەتی (جمال دان).

(١) ابن الوقت سالیکێکە کە هێشتا لە پلەی تلوین دایە.

**کمال:** مقامێکە تیایا (أولیاء) ئەچنە مقامی (تمکین)، وە لە (تلوین) دەرئەچن لە (جلال)دا ئەحواڵی (جمال)ی بەکاردێنن، وە لە جمالا ئەحواڵی جلالی ئەخەنە کار. (کاتی جلالیان عەینی جمال، وە کاتی جمالیان عەینی جلالە).

**أبو الوقت**[1]: بە (أولیاء)ی خاوەن کمال ئەوترێ کە باس کرا.

دور نی‌یە محوی کە لە دیوانەکەیدا ئەڵێت:

بە ضایع چو هەموو وەقتم لە مالا یەعنیا یعنی

ئەبێ وەقتێ لە بو الوقتێ بخوازم تا تیا بمرم

مەبەستی ئەم (أبو الوقت)ە نەبووبێ.

**خرق العادە:** یانی کردنی کاری وەها کە بە پێچەوانەی عادەت و دەسەلاتی بەشەرەوە بێت، وە کردنی شتی وەها نەگونجێ، وەکو: معجزەی أنبیا علی نبینا وعلیهم الصلوة والسلام. وە کەرامەتی أولیاء الله قدس الله أسرارهم.

**إحسان:** دوو پلەیە، یەکەم: بەندەیی و فەرمان بەرداری خوا بە جۆرێك بکەی وا بزانی (خوا) ئەبینی، ئەمەش مرتبەی (مقربین)ە.

دووەم: فەرمان بەرداری بکەی بۆ خوا و بزانی کە خوا ئەت بینێ، ئەمەشیان مرتبەی (أبرارە)[2].

**إیمان:** (شەش) روکن و پایەیە: ١- ئیمان بە خوا، ٢- ئیمان بە ملائیکە، ٣- ئیمان بەو کتێبانەی لە ئاسمانەوە هاتونەتە خوارەوە، وەکو صحف، تەورات، إنجیل، زەبور، قرآن. ٤- ئیمان بە پێغەمبەران درودی خوایان لەسەر بێ. ٥- ئیمان بە زیندوبونەوە لە ڕۆژی قیامەتا. ٦- ئیمان بە قەزاوقەدەر چاکی و خراپی کە لە خواوەیە، ئنجا کە ئیمان بەمانە هەبو، ئیتر ئەوەی لە قورئانا ثابتە وەك (فرضیەتی)

---

(١) ئەوانەن کە لە پلەی تلوین دەرچوون وە بە مەقامی تمکین گەیشتوون.

(٢) مقرّبین: واصلین= نزیکان= گەیشتوان. أبرار= سالك= ڕێگرەبەر بۆ لای خوا

نوێژ، وە حەرامی دزی و غەش و خیانەت و هەموو ئەحکام، کە لەبەر زۆری باسیان ناکرێ، وە ئیمان ئەیان گرێتەوە.

**إیمان**: پێش تر وتمان سێ (٣) پلەی هەیە:

١- تقلیدی ٢- استدلالی ٣- شهودی.

تقلیدی ئەوەیە کە انسان شوێن بیروباوەڕی دایك و باوك و مامۆستا و خەڵکی دەوروپشتی ولاتەکەی کەوتبێ، وە گوێ بە دلیل و بەڵگە نەدات، وە بەو چاولێکەری‌یە قناعەتی دەست کەوتبێ.

**استدلالی**: ئەوەیە ئەو بیروباوەڕەی کە بە مەسائیلی شەرعی هەیەتی، لە ڕووی بەڵگە و دەلیلەوە بێ، نەك تەنیا چاولێکردن بێت و بەس.

**شهودی**: ئیمانی شهودی ئەوەیە کە ئەو کەسە ئەو بیروباوەڕەی هەیەتی لە ڕووی مشاهدەوەیە، ئەوەی لە شەرعا هەیە و سابتە ئەو (عیاناً) مشاهدەی بکات، ئینجا بەرزترین پلەی ئیمان ئیمانی شهودی‌یە، ئیمان بە بەڵگە و دەلیل دامەزراندن لە چاو ئیمانی شهودیدا هیچ بایەخێکی نی‌یە وەك فەرمویانە:

پای استدلالیان چو بین بود پای چوبین سخت بی تمکین بود

واتە: أهلی استدلال پێیان دارینە پێی دارین لەق و بێ هێز و تینە

یانی ئەوانەی بە بەڵگە شت إثباتە لایان وەك کەسانێ وان کە قاچیان لە دار بۆ دروست کرابێ، خۆیانی لەسەر ڕاناگرن، هەمیشە لەق و بێ هێزە.

مەبەست لە تەریقەت ئەوەیە ئیمان ببێت بە ئیمانی شهودی وە بە (عیان)ی أسراری عالەمی (ملکوت) لە نەظردا دەرکەوێ وەکو: مکاشفەی دڵ وە زانینی أحوالی مردو لە قەبرا بە مشاهدە، ئایا لە خۆشیدایە یان ناخۆشی، وە هۆی چی‌یە. یان وەك بینینی مەلائیکە و أرواحی (أنبیاء) علیهم الصلاة والسلام، وە کۆبونەوە لەگەڵیان و پرسیارلێکردنیان و وەلام وەرگرتنەوە و شتی تریش لەم جۆرانە.

بــه فــەرمایشتی شــاهی نەقشــبەند پێشــەوای تــەریق پـیری دەولەمەنـد

بــەری درەخــتی تەریقــەت دووانــە ئـەی بـرای باشـم هـەردووی بزانـە

ئـەوەی بـە کـورتی لـە شـەرع بـەیانی کــراوە، ئــەمجا بــە طـول ئـەیزانی

ئــەوەش بــە دەلیــل إثبــات کــراوە لـە تەریقەتـدا گشـت لەبـەر چـاوە

(الإحسان أنْ تعبد الله كأنك تراه, فإنْ لم تكن تراهُ فإنّه يراك) حديث.

حــەزرەتی (علــی) فەرمویــە ئەگــەر پــەردە لابچــێ ئەســرار بێتــە دەر

مکشــوف بێ لــەلام هــەمووی ببیـنم لـــە ئێســـتە زیــاتر نــابێ یــەقینم

(مەولەوی) رەحمەتی خوای لێبێ لە باسی ئیمان لە کتێبی (فضیله)دا فەرمویەتی:

وهـــو كيـــف عـــرض نفســـاني لـــيس بالاختيـــار للإنســـان

فكونـــــه معلـــــق الخطـــــاب بســـبب التكليـــف بالأســـباب

يكســـب بعـــد الفضـــل والتأييـــد مـــن كشـــف أو برهـــان أو تقليـــد

مـــا كـــان أعلـــى رتـــب الإيمـــان مـا كـان عـن كشـف وعـن عيـان

دعهـــا لأصـــحاب الصـــفاء والوفـــا هـــم شـــاربون شـــرب هـــيم للجفـــا

راضـــــون رائضـــــون بالقضـــــاء أنفســـــهم في أوســـــع الفضـــــاء

خلـــو جلـــو مـــواطن الأمكـــان علـــو علـــى الزمـــان والمكـــان

فعـــــدموا الــــرواح والصــــباح بـــدا الصـــباح أطفئـــوا المصـــباح

(أولياء الله) قدس الله أرواحهم، لـە عیلمـەوە ئەبەن بـۆ (عـەین)، مەولـەوی لـە مەدحی شێخی سراج الدین‌دا (قدّس سرّه) لە (عقيدة المرضية)دا ئەفەرموێ:

واسیطەی ڕێگەی بەینی عیلم و عەین

وارثی حائز حەیای ذي النورين

عیشق لە طریقەدا بۆ هەندێ لە سەرەتای پێ خستنە طریقەوە سەرهەڵئەدات و دەرئەکەوێت ئیتر وەستانی نابێ، وە دەمدەم زیاد ئەکات، ئینجا خۆیشی بە (سلوك) هێز بەو شۆڕ و جەزبەیە پەیدا ئەکات.

طریقە هۆی خواناسینە، یانی هۆی معریفەت و ناسینی خوایە، هەر پلەیەك کە ئەهلی طریقەت سەرکەوێ (معرفەتی) بەخوا زیاتر ئەبێ، وە کە مەعریفەت و ئاشنای زیاتر بوو (محەببەتی) زیاتر ئەبێت، خوای تعالی خۆی خوایەکی وەهایە تا بناسرێ محبوب و خۆشەویستتر ئەبێ، تێکڕای خەلق لە محبەتی خوا کەم بەشن هۆی ئەوەیە کە نایناسن.

(ناسین هۆی معریفەتە و معریفەت هۆی محبەتە و محبەتیش کە زیادی کرد ئەبێتە عیشق) عیشق پەیژەی سەرکەوتن و تەرەقیاتی سالیکە، بەڵکو پەیژەی سەرکەوتنی ئەهلی طەریقەتە.

سالیکێك وتویەتی:

بیزارم أزان کهنه خدای که تو داری

هر روزه را تازه خدای دیگری هست

یانی ئەڵێ بێزارم لەو خوا کۆنە کە تۆ هەتە. هەموو ڕۆژێ من خوایەکی سەرلەنوێ و تازەم هەیە. یانی بەهۆی بڕینی پلەی ناسینی خواوە گەورەیی و عەظەمەت و قودسییەت و جەلالی خوام لە پێشوو زیاتر بۆ دەرئەکەوێت، وەکو وا بێت کە لە چاو دوێنێ و پێرێ و ڕۆژانی پێشووتردا ئەمە خوایەکی تر بێت.

کەوابو (تەریقەت) بەحرێکی پڕ لە جۆرەها گەوهەری وایە کە هەموو گەوهەری دنیا لە چاویا زۆر بێ نرخترە لە سواڵەتە لەتەی کۆلانان.

تەریقەت گەنجینەی گەنجی (معرفەتە) ئاوی حەیاتی عشق و محبەتە، باخی خەلاتی نزیکی و (قربەتە)، بە کورتی بە حوکمی (وإن تعدّوا نعمة الله لا تحصوها) ئەوەندە دەستکەوتی پڕ لە سود و بە نرخی تیایە زوبان لەتقریر و باس کردنی لاڵ و قەڵەم لە

نوسینی کۆڵ و بێ دەسەلات ترە سەدەها جار، بەڵکو باڵندەی خەیاڵ لە بڕینی فضای (تصور)ی بێ پەڕو باڵ و ئاوارەی شیو و دۆڵی سەرسوڕمان و سەرلێشێواوی ئەکا.

(أهلی تەریقـەت) خۆیـان فەرمویانـە: (مـن لم یـذق لم یَـدر. هنیئاً لأربـاب النعـیم نعیمها)، بەڵی کەسێ بەشێکی لە بازاڕی پڕ لە سعادەتی بەرز مەرتەبەی شمـولی ئایـەتی کریمەی (وأمّا إن کان من المقـرّبین) بـبێ، بـە نەقـدی استعدادی فیطـری و صـەرفی بێ درێغی رەنج و کۆششی (وأن لیس للإنسان إلاّ ما سعی) بە پەیژەی (ألا طـال شـوق الأبرار إلی لقائي)دا، سەرگەرمی سەرکەوتن ئەبێ تا دەستی فضل و ئیمدادی (وأنا إلی لقائهم أشدّ شوقاً) بە باڵی (سریع السیر) تینی (انجذاب) و تـیژ پـەڕی مزیـدی اشـتیاق دەسـتگیری ئـەکات، لـە ماوەیـەکی کـەما لـە ڕێگـەی پڕ سـام و خطـر و مسـافەی دورودرێژی (في یوم کان مقداره خمسین ألف سنة) بە سەلامەتی بە مـەتاعی منـزیلەتی (في مقعد صدق عنـد ملیك مقتـدر) واصـل ئـەبێ. وە بایـەخی خـۆش مـەناخی (فـروح وریحان وجنة نعیم) نائل. وە بە لیقای هەمیشە بەقای نەبڕاوەی (وجـوه یومئذٍ ناضـرة إلی ربّها ناظرة) سیمای وجـودی بـە جـوانترین شێوە شـامل وە پایـەی بـە مەرتەبـەی (رضي الله عنهم ورضوا عنه) کامل ئەکات.

هەردو باڵی سۆز و شەوقت بێنە جونبـوش وەك شیهاب
تێ پـەڕە گـاە سـالیکانە گـاە بـە رەسمـی ئینجـذاب
تـا لـە سـاحەی قـدسی قوربـا تـۆش بـە وێنـەی عارفـان
پڕ بەقای وەجهی لیقـا بی و سـەرخۆشی بـادەی خیطـاب

بـەڵێ کـەسێ خـاوەنی عـەقڵی سـاغ بێ، ببـینێ کەسـێکی زانـای بـەرز هیمـەت، خاوەنی پیاوەتی و شەهامەت، سلطانی وەقت داوای بکـات بـۆ مـەجلیسی خـۆی، بـۆ دانیشـتن لـە ڕیـزی جماعـەتی دیـوانی سـلطانی خۆیـدا و بـۆ ئـەوەی تعیـینی بکـات لـە منصبێکی بەرزدا.

ئینجا پێش ئەوەی بە حضوری سلطانی مشرەف بێ وە لەو مقام و منصبەی جێگیر بێ بیبەنە باخێکی پڕ لە جۆرەهای میوەهات و خواردنی خۆش و بەلەزەتی پڕ تام، وە نەنێرن بە دوایدا بۆ لای سلطان یان بۆ سەر کاروباری تازەی، ئایا هەموو تام و خۆشی و شیرینی ئەو خواردنانەی لە لا تاڵ نابێ؟ بێگومان شەخصی خاوەن مایە حەز بە پایە و پلە ئەکات نەك وورگ پڕ کردن (إنّ الله يحب معالي الهمم). دۆستانی خوا شیرینی بەهەشتیان لەلا تاڵە ئەگەر لە تشرف بە شەرەفی ملاقاتی ربّ العالمين بەشدار نەبن، حەزرەتی عبدالقادری گەیلانی (قدس سره) شیعرێکی لەم معنایەدا هەیە کە لە سەرەتایەوە ئەفەرموێ:

گر جمالی لا یزالی رانەبینند در بهشت

میکنند مستان حق از بیخ جنت خشت خشت

| | |
|---|---|
| گەر لە بەهەشتا جەمالی مەولا | نەبینن گرۆی أولیاء الله |
| لا ناکەنەوە بۆ سەیری بەهەشت | تێك ئەدەن یەکسەر قصر و باخ و دەشت |

ئینجا نەزەری حەزرەتی مەولا کە لە (محبەتی) خۆی بەولاوە هیچی تری لە دڵ و دەروونی بەندەی صادقا نەدی، وە نەفسی ئەو بەندەی خۆیەی دی (منوەرە) بە شەوقی ئەو وە سەری لەبەر قاپی (محبەتی) ئەودایە، بێ گومان بە مەفادی (هل جزاء الإحسان إلاّ الإحسان) مەشمولی پرتەوی أنظاری عليهّ، وە بە أوجی مەرتەبەی سعادەتی سەرمەدیەی ئەگەیەنێ، وە لەسەر کورسی مجلیسی قدسی (يحبّهم ويحبونه) دای ئەنیشێنی، (أولياء الله) محبوبی (بالذات) یان هەر خوایە، وە هەرشتێکی تریان خۆش بوێت (بالتبعيه) خۆشیان ئەوێت نەك (بالذات)، یانی لەبەر خاتری ئەوە چونکە دروست کراوی ئەوەو هی ئەوە.

پـای سـەگ بوسـید مجنـون خلـق گفتـا ایـن چ بـود
گفـت ایـن سـگ گـاە گـاهی کـوی لـیلا رفتـە بـود
پێی سەگی ماچ کرد مجنون خەلق ووتی چی بو ئەوە
پێی وتـن جارجـار بـە بـەردەم مـاڵی لـەیلا رۆیـوە

ئینجا لێرەدا وا چاکە حیکایەتێك بەم بۆنەیەوە باس بکەین:

سولتان محمودی غەزنەوی لەناو کۆمەڵی وەزیرانی خۆیا (أیاس)ی لـە هـەموویان خۆشتر ئەویست، لە هیچ شوێنێك بێ ئەو ئارامی نەبوو، ئەبوو ئەوی هـەر لەگـەڵ بوایە، قسە و باسی زۆرتر لەگەڵ ئەو بوو، عاشقی کرداری ئەو بوو، مـەحرەمی ئەسراری هەر ئەو بوو. لەبەر ئەوە وەزیرەکان لەناوخۆیانـدا گلـەیی‌یان ئـەکرد، ئـەیان وت: (أیاس) نەهەیئەت و شکڵی لە ئێمە پەسەندترە، نەقەد و قیافەتی لە ئێمە رێـك و پێك ترە، هەر کامێك لە ئێمە بگریت لە هەموو شێوە و صورەتێکا لـەو لەپێشترین، نـازانین سـوڵتان بۆ فـەزڵی ئـەو ئـەدا بەسـەرمانا، سـوڵتانیش ئـەم گلـەیی و قسـانەی ئەبیستـەوە بـەڵام ئەگـەڕا بـۆ فرسـەتێ کـە پێیـان بسـەلمێنێ بـۆچی فـەزڵی ئـەو ئـەدا بەسەریانا[1].

رۆژێـك سـوڵتان فـەرمان ئـەدات لەشـکر و وەزیـران ئامادەبن لەگـەڵیا بڕۆن بـۆ سەفەر وە لەگەڵ خۆیا سـامان و جـەواهێرێکی زۆر بـە صـندوق بـار ئەکـەن ئەیبـەن، دوای ئـەوەی ئـەجوڵێن بـۆ سـەفەرەکە لـە رێگـا ئەگـەن بـە ناوچـەیەکی بـەردەڵان و سەخت و نالەبار، لە پڕ صندوقێك لەو جەواهێرانە ئەدات لە کەڵە بەردێك ئەشکێت وە جـەواهێرات لـەو نـاوەدا بـڵاو ئەبێتـەوە، سـوڵتان ئـەمر ئـەکا کـە ئـەو جەواهێرانـە نەکرێنەوە ناو صندوقەکە، وە هەر کەسێ ئازایە بەشی خـۆی کـۆ بکاتـەوە بـۆ خـۆی،

(١) (غەزنین) پایتەختی وڵاتی سوڵتان محمود بووە، بەڵام باری جغرافی ئەوسا لەگـەڵ ئێستادا جیـاوازی زۆر بوە.

وەزیران و ئـەمیران و دەسـت و پێوەنـد ئەنیشنـە سـەر جـەواهیرات دەسـت ئەکـەن بـە چنینەوە، سـوڵتانیش بـە غـار مەرکـەبی خـۆی تـاو ئـەدات و مسـافەیەکی زۆر پـێش ئەکەوێ، ئەوەندە ئەڕوات لە لەشکر دور ئەکەوێتـەوە، کـاتێ لا ئەکاتـەوە وەزیـرە پڕ فیز و نازەکانی یـەکێکی لەگـەڵ نـەماوە تـەنیا (أیـاس) نـەبێ، سـوڵتان محمـود ئـەڵێ بـە (أیاس):

ئەی خۆشەویستی من، تۆ لەو تالانیە چیت دەست کـەوت، (أیـاس) لـە وەلامـا وتی: هیچ، سولتان لێی پرسی: بۆچی؟ أیاس وتی: من خۆتم لەبەر خۆت ئـەوێ، تـۆم بـۆ دنیـا و سـامان و دەوڵـەت نـاوێ، مـن عـیزەت و گـەورەیی خـۆم بـەوە ئـەزانم کـە هەمیشە لە خزمەتی ریکابی سەڵتەنەتی تۆدا بم، تۆم ببێ هەمو شتێکم هەیە، بەبێ تۆش هەمو دنیام لەلا تاڵە.

لەسـەر تـۆم دوژمنـە عالـەم قەزیـیەم مـانع الجَمعـة[1]
کە تەرکی تۆ نەکەم تەرکی هەمو عالەم نەکەم چبکەم

سوڵتان وتی: ئیتر بزانن بۆچی (أیاس)م لەلا خۆشەویست و عزیزە.
خوای زانا بە هەموو نهێنی و ئاشکرایەك محبەتی خـۆی لەهـەر دڵێکـا دی بـە کێشـانەی مقداری ئەو موحەبەتە روی نەزەری لوتف و مەرحەمەتی لەو عەبدەیە.

حـەزرەتی گـەیلانی (قـدس سره) فەرمویـەتی: (ئەگـەر جمـالی لا یزالـی حـەزرەتی ملك الملوك لە بەهەشتا نەبێ، عاشقانی جـەماڵی ئـەو چی خشـت لـە قصـر و قصـوری بەهەشتا هەیـە دەری ئـەهێنن و وێـرانی ئەکـەن) وەکـو پـێش تـر لـە معنـای شیعرێکیدا باسمان کرد.

---

(١) مانع الجمع: یعنی رێك ناکەوێ تۆشم بوێ و عالەمیش، یان تۆ یان عالەم، ئینجا کە من تۆم ئەوێ بێ گومان تەرکی عالەم نەکەم چی بکەم.

بەڕاستی ئەم ڕێ ڕێگەی عشاقە بۆ غەیری ئەوان ڕێی لا یُطاقە
عیشقە قوت و قوەتی روحانیان عیشقە مایەی هیمەتی روحانیان
عیشقە مەصعەد بۆ گرۆهی سالیکان بەندی ناکا تا ئەگاتە لامکان
شاپەڕی پڕ هێزی زمرەی واصلین عیشقە، عیشقە شوربی جامی کاملین

کەسی وا هەیە ئەڵێت: تالیبی ئەم عیلمە بۆچی کەمە، وە کەم کەس لەم جۆرە پیاوانە ئەکەونە بەرچاو وە ئاوا باس ئەکرێن، لە وەلاما ئەڵێین:

یەکەم: حاڵی ئەمانە شاراوەیە، هەیە ئەم أحوال و أوزاعەی هەیە بەلام ئێمە وای نازانین، چونکە (علومی أسرار) ناوی خۆی بە خۆیەوەیەتی، ئەگەر ئاشکرا بکرێت ئیتر کوا ئەبێ پێی بوترێ (أسرار).

در درون شو و اشنا و وزبیرون بیگانە وش
اینچنین زیبا روش کم دیدەئم اندر جیهان

تۆ بە (سرّی) ئاشنا بەو روبەڕو بێگانە خوو
شەخصی وا شیرین صیفەت لەم عالەما کەم دێتە ڕوو

دووەم: وتراوە:

کاری هر بزنیست خر من کوفتن
گاو نەر میخواهد و مەردی کسُهَن

بۆ بزن ناشێت گێرەی خەرمانان گای جووتی ئەوێ و پیاوی پاڵەوان

ئینجا ئەو کەسەی ئەو پرسیارە ئەکات هەر خۆی بیر لەوە بکاتەوە کە ڕێگایەکی وا دور و درێژ و پڕ لە خەتەر، جگە لەوەی خۆشی لەنیشانەی ڕێگا و جیابونەوەی

جۆرەها شیو و دۆڵی موشکیله و نارەحەتی بێ ئاگایە، ئەوسا بۆی دەرئەکەوێ کە ئەم رێیە رێی تەنیا رەوی نیە و چارەی نیە ئەبێ تەمەسوك بکا بە داوێنی رەفیقی شارەزای رێگاوە.

یەکەم (پێ) لەم رێگایەدا دانرێ ئەوەیە کە سەر دانرێ لە ژێر پێدا.

ئەبێ پێش هەمو شتێك بە پاچی سەعی بێ درێغ و بێڵی رەنجی بێ مۆڵەت شان و بازوی هیمەت بخەیتە کار، لە حەوشی خانوی دەرونتا بۆ مایەی ژیانی بێ پایان (وجعلنا من الماء کلّ شيء حي) تدبیری بیری ئاواتی أولو الالبابان بکەیت، وە ساحەی سینە لە خەوش و خاڵی غەش و کینە بەرامبەر بە هەموو ئومەتی شاهی مدینە بە گسکی (حسنی ظن) و چاو لێپۆشی پاك بماڵی. ئەگەر لەهەر کەل و قوژبنێکی چاڵی هەڵکەنراوی (نەفسی) خەسیسەوە دوچاری ماری ئازاری (رێ) و، شکی و دوپشکی خەتەرە و خەیاڵی دووشکی بووی، بەداری إعتبار بە صدقی (من صبر ظفر) چاری مار، وە بە تاکەوشی هۆش بۆ چارەسەرکردنی لێو وشکی دوپشکی دووشکی عیلاج بکەی. قۆڵی هەڵ کردوی ئارەزوو إشتیاق لە دەرهێنانی ماء الحیاة فەیض و بەرەکاتی أبدی دانەدەیتەوە، جڵەوی ئەسپی عەزمی بەهێز لە غاری شەورەوی دڵ گەرمی و سۆزی دەرون نەگرێتەوە بە کۆڵەمستی مەستی (لا یخافون لومة لائم) سەر لوتی لۆمەکەران و چەنەی چەنەبازان بشکێنە، شریتی برێتی لە عیلاقەی محبەتی بالذات بە دەستی هیمەت و هەڵمەتی صادقانە و خەنجەری کەمەری عاشقانەی (وتبتل إلیه تبتیلاً) لە غەیری مجنونی حقیقی بسێنە، تا لە ئاسمانی (یحبهم ویحبونه) لێزمەی بارانی پڕ لە شۆر و محبەتی متکثرەی إیلاهی، وە لێشاوی واردات و بەرەکاتی متنوعەی لامتناهی (ونزلنا من السماء ماء مبارکاً) زەوی و زاری دڵ و دەرون بە إحیای (فانبتنا به جنات وحبّ الحصید)ی علوم معارفی قدسیه کامەران، وە بە مەوریدی تفریحی زائران و منزلگای کۆڕی یاران جێی باصفای دلبەران بێ:

سـيماهم في وجـوههم دليلـى عـزت وشـأنيانه

إنّ ألله يحـبّ معـالي الهمـم نيشانـەی سەرشـانيانه

جەماعـەتێکی عـالی هیمـەتن بۆ دوژمن نیقمەت بۆ دۆست نیعمەتن

لـە کـاتی قـەهرا پلـنگ هەڵمـەتن لـە وەخـتی بـەسطا بـەحری رەحمـەتن

لـە غایـەت بـە دەر شـیرین أوصـافن بۆیـە بـۆ کـەمی سـیمرغی قـافن

**نەفسـی ئەممارە:** هەمیشـە سـەرکێش و متمـرد و لـە خـوا یـاخی‌یـە (إنّ الـنفس لأمارة بالسوء).

**نەفسی لوامە:** ئەچێتە صیفەتێکەوە سەرزەنشتی خۆی ئەکا، بۆچی وا غافل و کەم تاعەتە.

**نەفسی مطمئنە:** نەفسێکە کە سەراپا بووە بە نور لە خوا ڕازییە، خـواش لـەو ڕازییە (یا أیّتها النفس المطمئنة إرجعي إلى ربّك راضية مرضية فادخلي في عبادي وادخلي جنتي). (اللّهم لا مانع لما أعطيت إنّك أنت الوهاب الكريم).

جار جار انسان لە خۆی ناڕازییە و لۆمەی خۆی دەکات. ئەوە ظاهرەن لە نەفسەوە نییە دڵ باوەڕی بە خوا و قرآن و پەیمان و هەڕەشەی ڕۆژی دوایی هەیە. دڵ نەفس ئەترسێنی لە هەڕەشەی خوا، ئیمانی دڵ نەفس ڕائەگرێ لە عەمەل و کردەوەی نالەبار، بەڵام گرنگ ئەوەیە نەفس بە سلوك بگاتە رادەیە خۆی لۆمەی خۆی بکات. نەفسی مطمئنە یەکسەر بە پێچەوانەی نەفسی ئەممارەوە ئەوەستێ.

**نەفسی ئەممارە:** کافرە. ئەگەر دەسەلاتی هەبێ إتاعەی خوا ناکات، مناڵێکی بمرێ تا لە توانای بێ ئەو نەفسە نایەڵێ. ئیرادەی ئەو نەفسە بەرەنگاری ئیرادەی خوای بۆ ناکرێت ئەگینا ئەیکرد، یانی دەسەلات و قودرەتی خوای بۆ رەت ناکرێتەوە بەلام نەفسی مطمئنە دەرئەچێ لە مقامی صبر چونکە صبر مەشەقەتی تیایە بەلام قبوڵی

ئەکات. وە نەفسی مطمئنە کاروباری خوای پێ خۆشە، لە جیاتی ئەوەی صبر لە ژێر بەلادا بکات پێی خۆشە و لەزەتی لێ ئەبینێ.

حەزرەتی ئیمامی رەبانی لە (مکتوبات)دا ئەفەرموێ: خەڵکی پارە ئەدەن بەلایان لە کۆڵ بێتەوە ئەمان پارە ئەدەن بەلا ئەکڕن (مرغ اتشخوارە کی لذت شناسد دانەرا)[1]، ئەفەرموێ: ئەو باڵندانە (سەمەندەر) کە بە خواردنی ئاگر ئەژین کەی لە دانە لەزەت وەرئەگرن.

دین کە بریتی بوو لە عیلمی (أحکام) و عیلمی (ئەسرار) ئەوانەی کە هەڵگری عیلمی (أحکام)ن عولەمای ظاهرن، وە ئەوانەی کە هەڵگرتنی عیلمی أسراریان خستۆتە سەر ئەستۆی خۆیان عولەمای باطنن، ئینجا وا ئەبێ هەر یەکە لە أولیاء الله زاتێکە کە لە هەردوو عیلمەکەدا خاوەن بەشە، ئەمانە پێیان ئەوترێ ذوالجناحین. لەولاتی خۆمانا حەزرەتی مولانا خالید لەم جۆرە زاتانە بووە، خاوەنی هەردوو علیمەکە بووە بۆیە لەقەبی (ذوالجناحین)ی بووە.

**عالەمی وجوب**: عالەمی ألوهیەتە، عالەمی لا مثلی‌یە.

لقد تقدّست عن المثال        في الذاتِ والصفاتِ

**عالەمی إمکان**: عالەمی مخلوقات ومحسوساتە. تەنیا زاتی أقدس خوا و صفاتی مقدسەی ئەو نەبێ و أفعالی ئەو ئیتر ئەوی تر هەموی داخلی عالەمی إمکانە. عالەمی إمکان حادث ومتغیر و ڕوو لە نەمان و زەوالە.

عالەمی وجوب داوێنی لە گەردی حدوث پاکە و مەرتەبەی بەرزی لە دەستی کورتی تغیر و زەوال بێ باکە.

**عالەمی لاهوت**: عالەمی وجوبە.

---

(١) سەمەندەر: باڵدارێکە لە شاخە (بورکانی‌یەکاندا) لەناو ئاگر هێلانە ئەکات. لەسەر خواردنی (پشکۆ)ی ئاگر ئەژی.        مەلی ئاگر خۆر بە دانەوێڵە        ئارەزووی ناشکێ مەیلی لێی وێڵە

**عالەمی ناسوت:** عالەمی إمکانە.

**قەڵەم:** قەڵەمی الإلهی لا مثلی‌یە ناوی (القلم الاعلی)یە.

**لەوح:** لەوحی محفوظ هەیە، وە لەوحی مەحو اثبات هەیە.

**لوح المحفوظ:** لەوحێکە مەحوی تیا نیە. هەر یەکێ لە أولیاء الله جێگای نەزەری ئەوێی هەبێ غەڵەت لە کەشفیا نابێ.

**لوحی محو اثبات:** (٣٦٠) لەوحە. هەندێ لە أولیا ئەوانە ئەبینێ و بە پێی بینینی خۆی خەبەر ئەدات، دوایی مەحوی بەسەرا دێت. ئەگەر لێی بپرسیتەوە خەبەری مەحوەکەشت ئەداتێ.

**نظر:** یان توجهە، یان شبیهە بە توجە.

جارێك سولتانێك چووە خزمەت یەکێ لە (مشایخ) پرسیاری حەزرەتی (أبا یزیدی بسطامی) لێ کرد (قدس سرە) کە پیاوێکی چۆن بووە. ئەویش لە وەلاما فەرموی: هەرکەس لەحزەیە یان سەعاتێ لە خزمتیا بوو بێ بە سعادەتی أبدی گەیشتوە. سوڵتانیش بە سەرسوڕمانەوە وتی: باشە کافرەکان زۆر لە خزمەت پێغەمبەرا ﷺ بوون بەلام هیچ بە سعادەت نەگەیشتن. ئەویش فەرموی: کافرەکان لە خزمەتی (محمد رسول الله)دا ﷺ نەبون، ڕەفاقەتی (محمدی کوڕی عبدالله)یان کردوە. أصحابە بە خزمەتی (محمد رسول الله) ﷺ گەیشتن سعادەتێکیان برد کەس نەی برد.

معنای ئەوەیە ئەوەی بە إخلاص و باوەڕ و عقیدەوە چووە خزمەت (أبا یزید) بەو سعادەتە گەیشت. ئەوەش چووە لای وەك کەسێکی سەیر کرد وەکو هەمو کەسانی تر هیچ کەڵك و بەهرەیەکی لێ نەبرد.

ئینجا ئەو سعادەتەی کە لەو ڕەفاقەتە دەست ئەکەوێ لە (أثر)ی (نظر)یان (توەجە)وەیە.

إمامی شعرانی ناوی چەند کەسێك ئەبا ئەفەرموێ ئەمانە سلوکم پێ نەکردون هەر بە (نظر) پێم گەیاندون.

کەسێك چووە خزمەت حەزرەتی فەخری عالەم ﷺ عەرزی کرد قوربان من موسڵمان ئەبم بەڵام حەز لە (زینا) ئەکەم. أصحابی کرام لێی توند بون پێیانوت: بۆچی لە حزوری (رسول الله)دا علیه الصلاة والسلام جەسارەت ئەکەی و پەیڕەوی ئەدەب ناکەی. بەڵام مامۆستای مکارمی أخلاق، خۆشەویستی حەزرەتی خلاّق فەرموی لێی گەڕێن. بانگی کردە پێشەوە فەرموی: تۆ حەز ئەکەی زینا لەگەڵ دایکتا بکرێ. وتی نەخێر دایك و باوکم بە فیدات بێ. فەرموی: خەڵکیش حەز ناکا لەگەڵ دایکیا بکرێ، فەرموی: حەز ئەکەی لەگەڵ (...) بکرێ. وتی: نەخێر دایك و باوکم بە فیدات بێ. فەرموی: خەڵکیش حەز ناکەن لەگەڵ (...) بکرێ، فەرموی حەز ئەکەی لەگەڵ (...) بکرێ، ووتی: نەخێر، دایك و باوکم بە قوربانت بێ فەرموی: خەڵکیش حەز ناکەن لەگەڵ (...) بکرێ هەروەها چەند کەسێکی تری لە پور و کەسو کاری بو حساب کرد. هەر عەرزی کرد نەخێر دایك و باوکم بە قوربانت بێ. فەرموی: هەروەها خەڵکیش زینایان لەگەڵ کەس و کاری خۆیان پێ ناخۆشە. ئینجا حەزرەت ﷺ دەستی مبارەکی بەسەر سینەیدا هێنا و فەرموی: خوایە (عەورەتی) لە کردەوەی خراپ محفوز و پارێزراو بکەیت. دوایی پیاوەکە هاتە دەرەوە وتی: لەم کاتەدا (زینا)م لە هەموو شت لەلا ناشیرین تر و ناپەسەندترە و ڕقم لێیەتی الحمد لله. بێگومان ئەمە لە (نەزەر و توجهە)وە بووە کەوا خێرا ئەو محبەتیە لە دڵیا لاچوو.

حەزرەتی عمری کوڕی خەتاب ﷺ عەرزی حەزرەتی کرد ﷺ: قوربان تۆم لە ماڵ و مناڵ و هەموو کەسم خۆشتر ئەوێ تەنیا لە خۆم نەبێ. فەرموی: ئیمانت کامیل و تەواو نابێ تا منت لە خۆشت خۆشتر نەوێ. ئەویش عەرزی کرد: ئا ئێستا تۆم لە خۆشم خۆشتر ئەوێ. ئەمەش زۆر ئاشکرایە کە لە (توجە و نەزەرەوە) بووە چونکە محبەت و خۆشەویستی لە ئیختیاری ئینساندا نیە. کە ئاوای لێ هات دەست بەجێ ئەوی لە خۆی خۆشتر ویست، بە (توجە) لەو پلەیە سەری خست ... صلی الله علیه وسلم ورضي الله عنه وعن سائر الخلفاء الراشدین.

**ویلایەتی عامە:** ویلایەتی هەموو پێغەمبەرانە جگە لە پێغەمبەری ﷺ خۆمان.

**ویلایەتی خاصە:** ویلایەتی پێغەمبەری خۆمانە ﷺ. پێی ئەڵێن (ویلایەتی محمدی).

لە عیلمی تەصەوفدا: مقررە کە سالیکانی ڕێگای حقیقەت عروجیان هەیە و نزولیان هەیە (یانی سەرکەوتن و هاتنە خوارەوە) ئینجا ویلایەتی خاصەی (محمدی).

جیاوازی بەینی ئەم دوانە هەم لەلایەنی عروج (سەرکەوتن)ەوەیە، وە هەم لە لایەن نزول (هاتنەوەی بۆ خوارەوە).

لە لایەن سەرکەوتنەوە (العروج) لطائفی ئەولیایە لە ژێر (قەدەم)ی باقی أنبیادان (فەنا و بەقا)یان پەڕی ئەو پەڕ تا خفی هەیە، بەڵام بە پێی پایە و پلە.

بۆ نموونە هەندێ تا (روح) ئەڕوا و هەندێ تا (سرّ) هەندێکی تر تا (خفی) ئەڕۆن، ئەمە نیهایەتی فەنا و بەقای ویلایەتی عامەیە. ئەمما خاوەنی ویلایەتی خاصّە (أخفی)یشی فەنا و بەقای تەواوی ئەبێ. ئەمە جیاوازی بەینی ئەم دوو ویلایەتە لە تەرەفی عروجەوە دوبارە لە بارەی نزولیشەوە فەرقیان ئەمەیە ئەولیا کە لە ژێر قەدەمی حەزرەتان ﷺ ئەجسادیان وەك عالەمە، ئەمریەکەیان بەشی لە کەمالاتی دەرەجاتی ئەو ویلایەتەدا هەیە.

چونکە پێغەمبەری خۆمان ﷺ بە جەسەد و لەشی موبارەکی چوو بۆ میعراج، بەهەشت و جەهەننەمیان خستە بەرچاو (فأوحى إليه ما أوحى)یەی بۆ دەس دا وە بە شەرەفی دیتن بە چاو فائز بوو، ئەم جۆرە معراجە خاصەی ئەوە ئەولیایەکیش لە ژێر قەدەمی ئەودابن و تابعی ئەوبن، وە بە کەماڵی موتابەعەی مشرّف بوبن بەشیان هەیە لەم پایە تایبەتیەدا (وللأرض من كأس الكرام نصيب) ئەمما ئەوەندە هەیە بە چاو دیتنی زاتی حەق لە دونیادا مخصوص بۆخۆیەتی أولیایە لە ژێر قەدەمی ئەوان رؤیەت و دیتنیان نیە، جیاوازی میانەی دیتن و ئەو حاڵەتی ئەوانە وەك فەرقی بەینی أصل و فرع یا سێبەر و شەخص وایە. نە سێبەرەکە شەخصەکەیە و نەشەخصەکە سێبەرەکەیە.

به کورتی ویلایەتی عامە لەلای صعودەوە پەڕی ئەو پەڕی تا خفی ئەڕوا بەلاّم ویلایەتی خاصەی محمدی لە لای صعودەوە فنای أتم و بقای أتمی هەیە هەر پێنجی ئەبڕیٚ وە لەلای نزولەوە بەشی لە شەش دەرەجاتی کەمالاتی ئەو ویلایەتەدا هەیە...

**فەقیر/ دەروێش:** مشایخ و گەورە پیاوانی تەریقەکان عادەتیان وایە لە نوسینا ناوی خۆیان بە وشەی (فەقیر) یان (دەروێش) دیاری ئەکەن. بەم بۆنەیەوە حیکایەتێك ئەگێڕینەوە دوایی دێینەوە سەر ئەم باسە.

لە شاری (سنە) پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند و بەناوبانگ هەبوە پێی وتراوە **(ئاصەف أعظم)** من ئەم پیاوەم نەدیوە، بەلاّم ڕەنگە لە تاریخی ئێستاوە کە سالّی (١٤١٠ی هجریە) ٤٠- تا ٤٥ سالّ بێ کە نەماوە. وەك ئەگێڕنەوە ئەوەندە دێهات و أملاکی بووە وا ڕێکەوتوە هەندیٚ جار دیٚی کڕیوە، بە أوتومبیل یان بە سواری بەلایا ڕۆیشتوە پرسیاری کردوە ئەمە دێی کێیە. وتویانە دێی ئاغایە (یعنی خۆی). ئەم پیاوە (شاطر)ی هەبووە ئەم شاطرانە عادەتیان بووە ئەگەر ئاغا بەگوزەرێکا ڕۆیشتبیٚ یان چوبیٚ بۆ بازارێك یان هەر شوێنێك، چەند دەقیقەیەك پێش ئەو کەوتون، کوتەکیان گرتووە بە دەستەوە پێتاویان بەستوە و شێوە کلێتەیەکیان لەسەر کردوە، بەلای خەلّکیدا ڕۆیشتون لەو گوزەر و بازاڕەدا بانگیان کردوە: هەستن ئاغا هات ... دەی هەستن وا ئاغا تشریفی هێنا. هەروەها بۆ جێگای دەرویش پۆستەچی بون پۆستەیان بردوە، ڕێز و ئیحترامیان نەبووە لەناو خەلّکیدا.

یەکیٚ لەم شاطرانە کە لای (ئاصەف) ئەبێت لەبەر زیری و عەقلّی ئەکەوێتە بەرچاوی، ئەیکا بەسەر کار ئەینێرێتە یەکێك لەدێکانی کە موڵکانەی سالاّنە وەرگریٚ. دوای یەك دو سالّێك سەرکاری ئەیکا بە (گەورەی سەرکارەکان). ژمارەیەکی زۆر دێهاتی ئەکەوێتە بەردەست، دوای چەند سالّێك خۆی ئەبێت بە ئاغایەك موڵك ئەکڕی تا بە ماوەیەك چەند دێیەك بەیەکەوە ئەنیٚ و دوکان و موڵکێکی زۆر پێکەوە

ئەنێت، تا وای لێ دێت ئەبێ بە شخصێکی مجلس نشین، بە عەباوە لە مجلسی ئاصەفا دائەنیشێ.

ماوەیەکی زۆر بەم جۆرە ئەبێت دوایی ئەم و ئەو بە (ئاصەف) ئەڵێن: ئەم پیاوە شاطر بو لە دەرگای تۆدا تا وای لێهات بە قەدەر تۆ دەوڵەمەند بوە، موڵکەکانت ئەم ئەیخوات، تۆ هیچ حسابی لەگەڵ ناکەی، بزانە چەند ساڵە چی وەرگرتوە بە پێی دەفتەر وە چی تسلیم کردویت، ئاصەف مجبور ئەکەن داوای تقدیمی حسابی ئەو چەند ماوەیەی لێ بکات. ئاصەف دێتە مجلسەوە ئەویش ئامادەی مجلس ئەبێت. ئاغا پێی ئەڵێ: ساڵەهایە هیچ حسابێ لە بەینا نەبوە نازانم چیت وەرگرتوە و چیت تسلیم کردوە. ئەویش ئەڵێ: کەی ئەمر ئەکەی حازرم بۆ حساب. ئاغا ئەڵێ: سبەینێ فلان سەعات حازر بە. ئەویش لە کاتی دیاری کراوا بە جل و بەرگی زەمانی شاطریوە کوتەك بە دەستەوە و بەپێتاوەوە حازر ئەبێ. کە دێتە دیوەخان سەلام پێشکەش بە ئاغا ئەکات، ئاغاش سەر هەڵ ئەبرێ وەلامی سەلام ئەداتەوە و ئەڵێ تۆ کێی؟

ئەڵێ قوربان من فلانم. ئەڵێ ئەی ئەمە چ حاڵێکە چ بەرگێکە، بۆچی لەم حاڵەدای؟ ئەڵێ قوربان نەت فەرمو لە فلان سەعاتا وەرە حساب بکەین. ئەڵێ بەڵێ. ئەویش ئەڵێ: حسابی من ئەمەیە. کە من لە خزمەت ئاغادا بوم هەر ئەمەم هەبوە ئەوی تری لە سایەی ئاغاوەیە. من وام لەسەر کار و فرمانی زەمانی خۆم وە هەرچی هەیە لە موڵك و سەروەت و دەوڵەت عائیدی خۆتە و هی خۆتە. ئەمە هەمو حسابی من ئیتر حسابی چیت لەگەڵ بکەم. ئاصەف ئەڵێ: ئافەرین برۆ هەرچیەکت هەیە موبارەکت بێ، تۆ کە ئەوەندە ژیر بیت هیچ حسابێکم لێت ناوێ.

ئینجا بێ گومانە کە پێشەوایانی دین لەو پیاوە ژیرترن. خوای تعالی (جلّ شأنه) خۆی لە قرآنی پیرۆزدا ئەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ ۖ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ)[١].

---

(١) سورة فاطر: ١٥.

ئینجا وشەی (فەقیر) بەگشتی بە انسانی بێ نان و ئاو و بێ دەسەلات و داماو ئەوترێ، وە فەقیر واتە (موحتاج).

بەلام ئەهلی خوا بە یەقینێك كە هیچ غوباری وەهمی بەلادا نەچێ ئەزانن أصلیان (عدم) بووە، خوا هێناونیەتە وجود. یانی موحتاج بە (وجود) بوون خوا إیجادی كردوون، موحتاجن بە مانەوەی لە وجودا هێشتونیەتەوە، هەموو كات و هەمیشە موحتاجن بە هەناسەدان رێی هەناسەی داونێ. بەڵكو هەموو زەڕاتی جیسم و خەلایا بۆ پێكەوەنوسان موحتاجن پێكەوەی نوسانون ئەگینا دەست بە جێ ورد ئەبێ و (تفتت) ئەكا. موحتاجن بە یەكەیەكەی ئەندامی دەر و ناو، بە حەرەكاتی دڵ و نەبضی دەست، محتاجن بە جولانەوەی دەم و زبان بۆ خواردن و وتن و تام كردن. موحتاجن بۆ بینین، بیستن، بۆ شت قوتدان، بۆ ماڵ و منالی، بۆ رزق، بۆ ترقیات و ترفیعات لە كەمالات و دەرەجاتی قوربا.

ئەمانە هەموی هەمیشە لەبەرچاوی (نصب العینی) أولیایە، چونكە ئەوانە ئەهلی بێ ئاگایی و غەفڵەت نین، دائم الحضورن، پەردەی غەفڵەت لەسەر چاوی بصیرەتیان لاچوە. زۆر بە فەخرەوە وەك حدیث ئەفەرموێ: (الفقر فخري) فەخر بەو كلمەی (فقر)ەوە ئەكەن وە هەڵیان بژاردووە بۆ خۆیان، وە فقیر نازناوی ئەو گەورە گەورانەیە.

اللّٰهمّ أنتَ العزيز وأنا الذليل وهل يرحمُ الذليل إلاّ العزيز. اللّهمّ أنتَ الغفور وأنا المذنب وهل يغفر للمذنب إلاّ الغفور. اللّهمّ أنتَ الغنيّ الكريم وأنا الفقير العديم وهل يعطي الفقير العديم إلا الغنيّ الكريم. يا وهّاب مواهبك السنيّة نسأل في الدنيا وفي الآخرة وفضلك العظيم وجنّة النعيم يا رؤوف يا رحيم وما ذلك على الله بعزيز وصلّى الله على سيّدنا محمّد وآله وصحبه وسلّم

حەز ئەکەم وە بە پێویستی ئەزانم کە ئاگادارتان بکەم بۆ ئەم حقیقەتەی لە خوارەوە بۆتان باس ئەکەم:

چەند کتێبێکی تازە دەرچون لە میصر و لبنانەوە دێن. ناوی تصوفیان لە خۆیان ناوە، وە عنوانەکەی ناونراوە بە التصوف الإسلامي یان التصوف فی الإسلام. ئینجا هەر لە عنوانەکەیا وایان دەرخستوە کە تصوف لە أدیانی تریشا هەبێ (حاشا لله) شتی وانیە تەنیا ئەوەندە هەیە هەندێ لە کفار بە هۆی ریازەت کێشانەوە کشفی صوری مخلوقاتیان بۆ پەیدا ئەبێ، یانی صورەتی مخلوقاتیان بۆ کەشف ئەبێ. بەلاّم هەرگیز حقیقەتیان بۆ کەشف نابێ. ئایەتی قرآن ئەفەرموێ:(لا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ)[1]، ئەوانە ناوچاویان بە ئاگری کفر داغ کراوە وە بە سیغی بلێسەی قەهری خوا دیاری و دامغەی بێ ئیمانی لێ دراوە، رۆحی ناپاکیان بۆ ئاسمانی أرواح رێگای لێ مەنعە. رێگا بۆ لای خوا (الطریق إلی الله) بۆ هەمو جگە لە إسلام داخراوە. بەلاّم چۆتە (مانگ یان مەریخ) باسێکی ترە، ئەم ئاسمانی عالەمی مشاهدەیە هیچ پەیوەندیەکی بەوەوە نییە.

کشف چوار جۆری هەیە: الکشف الکونی/ الکشف القلبی، الکشف القبری، والکشف الإلهي. کەشفی قبور و کەشفی إیلاهی بتاتا بۆ کفار دەست نادات. رێگایان بۆ عالەمی وجوب نییە و لێیان داخراوە. لەم عالەمی ئیمکانەدا کەشفی (صور)ی مخلوقات بۆ ریازەت کێشانیان دەست ئەدات. سلوك ئەوەیە کە حقیقەتی بەشەری ئەکا بە ئیبریز یانی ئاڵتونی زاخاو دراوی خالیص، وە بە حوکمی ئایەتی (اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ) أولیاء الله کە موئمنی کاملن ئەبنە یەك پارچە نور. بەلاّم ئەوان یانی (کفار) سلوکیان نییە تەنیا ریازەتیان هەیە وەك نان و ئاو نەخواردن ماوەیەك. بەلاّم حقیقەتەکەیان وەك (تۆپەڵ)ێك پیسی بە کەمێ هەنگوین

(١) الأعراف: ٤٠.

سواغ بدرێ وایە، یان پارچە ئاسنێکی ژەنگاوی بە کەمێ ئاڵتون زرکفت بکرێ، ئەو توێکلانە هیچ لەجەوهەر و حقیقەتەکە ناگۆڕن.

ئیتر ئامان و دەخیل برایانی موسڵمان شوێن ئەو جۆرە بیروباوەڕە کوفرە مەکەون وە ئاگاتان لە ژەهری پیسی ئەو جۆرە کتێبانە بێت کە مەبەستی نوسەرەکانیان تەنیا گێرەشێوێنیەیە لە دینی پاکی ئیسلامدا.

لە کۆتاییدا ئەڵێم:

لە سایەی بەرەکەتی موئەلەفاتی گەورە پیاوانی دینەوە کە ماوەیەك بە تەماشاکردن و خوێندنەوەیان سەرکەوتوو و کامەران بووم، الحمد لله ئیمان و عقیدەم بە هەموو فەرمایشتیان هەیە، وە هەرچەندە کە بەشم لە دەرگای بزورگاندا نەبوو بەلاّم بێ گومان بە مەقام و پلەی بەرزیان موئمینم و باوەڕی بێ گەردم هەیە. لە بێ طالعی خۆشم و کەم بەختیم و پەست فیطرەتی خۆم زایقەی گیانم لە نمەکی خواردنی خۆش و بە لەزەتی ئەم خوانە پڕ نیعمەتەی نەچەشت. دڵۆپێ لە (ماء الحیاة)ی ئەم کانیاوە هەمیشە ئاوی هەرگیز نەبڕاوە نەکەوتە سەر زبانی إشتیاق و ئارەزوم، بەلاّم بە حوکمی (ذکر العیش نصف العیش) ویستم ماوەیە لە کاتم بە باس و زیکری ناوی أهلی ذیکر و أوصافی أهلی ذیکرەوە خەریك بکەم. بەڵکو بە ئومێدی شمولی (من أحبّ قوماً فهو منهم) نائل ببم، وە بە مەفادی (المرء مع من أحب) ئەمڕۆ و سبەی لە سایەیاندا بحەسێمەوە وە بەرەکاتی نظر و توجهاتیانم لە هەردوو لا دەستگیر بێ.
والسلام.

پ/ لە زەمانی أصحابدا ڕەزای خوایان لێ بێ، بۆچی کەرامەت کەم بوە؟

و: زەمانی أصحاب ڕەزای خوایان لێ بێ، پێویستیان بە کەرامەت نەبوە، چونکە کەرامەت بۆ ئەوەیە بیکەی بە بەڵگە لەسەر ڕاستی ئەو ئایینە، وە بیروبڕوای پێ پتەو و دامەزراو بێ، ئەوانەی بەبێ فێڵ و فزول ئەهاتنە خزمەتی ئیمانیان بە پێغەمبەر ﷺ ئەهانی لە تأثیری بەرەکەت و فەیز و ئەنواری حەزرەتی رسول الله ﷺ وە وای لێهات

سەراسەری وجودی دەبوو بە نور، وە لە سایەی خۆری بێ سایەی حەزرەتی پێغەمبەردا ﷺ سورەت و حقیقەتی ظاهیر و باطنی مادە و مەعنای بە هەیئەت و خوڵق و خووی ئەو زاتە پیرۆزە منصبغ ئەبوو یانی ئەو ڕەنگەی ئەگرت ... وەك (مەحوی ئەڵێ):

بە شێوە و خوڵقی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە منعکس بووبون
غەریبی تازە چوو دەیووت ئەمە پێغەمبەرستانە

ئینجا لە پاش دورکەوتنەوەی زەمانی أصحاب ڕەزای خوایان لێ بێ، بەرە بەرە وەك جەماعەتی لەشەو چراخان دوورکەوێتەوە تا بڕوا تاریکتر ئەبێ وە پێویستی بە ڕووناکی‌یە، وە پێغەمبەری تر لە پاش پێغەمبەر ﷺ نابێ.

خوای تعالی بە بەرەکەتی ئەو زاتە و بە نیابەتی ئەو لە هەر زەماندا ژمارەیە زۆری لە أولیاء الله لەناو عالەمی ئیسلامدا بەم موهیمە گرنگە بەهرەوەر کردوە.

تا عالەمی ئیسلام بیروباوەڕیان پارێزراو بێت وە بە تشکێك و شوبوهاتی دوژمنانی ئیسلام ئاقیبەتیان نەشێوێ، وە هەمیشە بەڕاستی و دروستی ئەم ئاینە بەرزە دڵ پتەو و دامەزراو بن.

دیسان بێجگە لەمەش وە نەبێ لە زەمانی أصحاب کەرامەت هەر نەبووبێ، وە کەسێ بچێ تەماشای کتێبی جامع الکرامات للأولیاء کە جەنابی شێخ نەبهانی مصطفی إسماعیل دایناوە[1]، چەندە کەراماتی أصحابی تێدایە کە لە سەرچاوەی ڕاستەقینەوە ئەیگێڕێتەوە بۆ نموونە:

---

(١) خاوەنی جامع الکرامات شێخ مصطفی ماوەیەك لە ترابلسی شام حاکمی جزا بوە، دوایی لە بیروتدا بوە بە رئیسی محکمەی حقوقی ئەوێ، کە کاتێ خۆی لای خۆمان پێیان ئەوت حاکمی مەحکمەی کوبرا، ئەنجا ئەم زاتە بە پێی حروفی هیجا١٤٠٠ أولیای لەو کتێبەدا باس کردوە، وە کەراماتی گێڕاوەتەوە وە ئێستە لە مەکتبەکاندا دەست دەکەوێ.

دوو نەفەر لە أصحاب شەو بە لێزمە و تاریکی پێکەوە ئەڕۆنەوە بۆ ماڵ شێوە چرایەك لە پێشیانەوە ئەبێ، بە شەوقی ئەوەوە ئەڕۆن کە ئەگەنە ئەو دووڕێیانەی کە لە یەکتر جیا ببنەو، چراکە ئەبێ بە دوو هەریەك یەکێ لەبەر دەمیەوە ئەبێ تا ئەگەنە ماڵەوە. وە هەروا کەراماتی زۆر لە صەحابەکان بەیان دەکا.

# باسیٚ لە ژیانی

# حەزرەتی مەولانا خالیدی کوردی نەقشەبندی

ئینجا ئیتر نۆبەی ئەوەیە بێینە سەر مەبەست کە بریتیە لە گێڕانەوەی ئەو کەراماتانەی کە لە فارسیەوە وەرمگێڕاون بۆ کوردی وە ئەبوا بەهۆی ئەوەی کە حەزرەتی شێخ عوسمان سراج الدين یەکێکە لە خەلیفە بەناوبانگەکانی حەزرەتی مەولانا خالیدی شارەزووری قدس سرهما باسمان لە حەزرەتی مەولاناوە بکردایە کە لە سەرەتای مریدییەوە تا تەواوکردنی پایەکانی تصوف هەر لە خزمەت ئەودا بەهرەمەند بووە بەڵام چونکە مامۆستا مەلا کریم بەرگێکی (یادی مەردان)ی بە باسی ئەو زاتە پیرۆزە تەواوکردوە، ئەبوو بە دووبارەکردنەوەی دووجار ووتنەوە ئەمما لەگەڵ ئەوەشدا چەن کەرامات و بەسەرهاتێکی حەزرەتی مەولانا کە لە کتێبیٚ کە مەرحومی مەلا حامیدی کبیر[1]، دایناوە، وە باسی مەولانای بە درێژی تیا کردوە وە کتێبەکە (خەتی)یە یەك نوسخەیە لە لای شێخ محمد أمین کاردۆخی‌یە، وا ئەزانم مامۆستا ئەو کتێبەی بەر چاونەکەوتبیٚ بۆیە ئەوانە لە کتێبی یادی مەرداندا نیە، بە پێویستم زانی بە

(١) مەلا حامیدی کبیر: عالمێکی زۆر فازیل و بە نرخ و سەنگین وە دانایەکی خاوەن تمکین بوە کاتبی حەزرەتی شێخ عوسمان سراج الدين بوە (قدس سره) وە کبیر لەقبی ئەو زاتەیە. کتێبێکی بە ناوی ریاض المشتاقین هەیە وە چەند نامیلکەی تریشی لە تەنیشت ریاض المشتاقین‌دا هەیە وە لەو کتێبەدا باسی کەراماتی حەزرەتی مەولانا و حەزرەتی سراج الدينی تێدا نوسیوە.

کورتی لە هەوەڵی ئەم کتێبەوە باسیان بکەم وە بیان خەمەڕوو بە کۆمەکی خودای بێ هاوتا تا هونەر و فەزڵی گەورە گەوران نەکەوێتە پشت گوێی نەزانی هەتا هەتاییەوە وە هەروەها بێگومان لە باسی پیاو چاکان رەحمەت و بەرەکەتی خودایی ئەبارێ، باسی حەزرەتی مەولانا خالید (قدس سره) ئەوەندەی کە لە یادی مەردانـدا نیە وە ئێمە باسیان بکەین ئەمانەن کە بریتیە لە (١٤) مەوزوع:

١- حەزرەتی مەولانا یەکەم ڕۆژ باوکی کە ئەیباتە لای مامۆستا بە یەك دەرس یا بە دوو (٢) ئەگاتە سورەتی (إذا جاء نصر الله والفتح)[1]، پێی ئەڵێ ئەبێ بە باوکت بڵێی مریشکێ ڕەش بنێرێ، ئەویش ئەفەرموێ روم نیە عەرزی باوکم بکەم بۆم بنوسە. مەبەس ئەخاتە سەر کاغەز. مەولانا تەماشای کاغەزەکە ئەکات لێوی ئەبزوێنێ مامۆستا ئەفەرموێ بۆچی لێوت ئەجوڵێنی ئەوە چیە ئەویش ئەفەرموێ نوسراوە (مورغ سیاه)[2].

٢- حەزرەتی مەولانا قورئانێکی پیرۆزی بەدەستەوە گرتوە، بەبێ تەفسیر، وە فەرمویەتی هەرکەس پرسیارم لێ بکا لە هەر ئایەتێ ئەتوانم بەبێ حەرفێ زیاد و کەم بە تەواوی تەفسیرێ کە لە ئەمرۆدا هەیە، تەفسیری بکەم.

- ئەمە خۆم بیستومە، کە وەختێ لە سولەیمانی مودەریس بوە لە ماڵی خۆیانەوە تا مەدرەسە بە سواری تەشریفی چوە، وە تەرپۆش و پێکەوتو، وە سوار چاکێ لێهاتو بوە.

---

(١) عادەتی قوتابیانی پێشو وابوە هەر قوتابیەك گەیشتە ئەم سورەتە ئەبێ مریشکێ ڕەش بیات بۆ مامۆستا: زۆر لە قوتابیان بە کەمتر لە (٢٠) دەرس نەگەیشتون. وا بوە بە مانگێ گەیشتوە وە ئیتر بەم سورەتەیان وتوە سورەتی مریشکە ڕەشە. کە ناوی سورەتەکە خۆی سورەی (الفتح)ە.

(٢) مورغ سیاه: یانی مریشکی ڕەش، لە پاش ئەم نوسراوەیە لە ریاض المشتاقین صحیفه (..........) دیم نوسراوە بە هەوەڵ رۆژ الحمد لله معوذتین، وقل هو الله وتبّت یدا و إذا جاء نصر الله ی خوێند.

٣- هەر لەو کتێبەدا ئەفەرموێ عەلامەی زەمان مەلا قاسمی پایگەلانی فەرموی لە مەکەی موکڕەمە (خوا گەورەتری بکات) بە حەڵقە دەرسی بە عولەما و زانایانی مەککە ئەفەرموو لە حدیسی (بخاری شریف) وە منیش یەکێ بووم لە گوێ گران.

جەنابی (شێخ عبدالصمدی محدّث)[1] شەرحێکی لە بوخاری شریف کردبوو باری هێستریێ بوو لەگەڵ ئەوەشدا لە حەلقەی دەرسا دادەنیشت بۆ إستفادە و کەڵك وەرگرتن لە حەزرەتی مەولانا، وە ئەم زاتە پیرۆزە کە شێخ عبدالصمدە ئەفەرموێ علامە ملا قاسم ئەی فەرموو (بێجگە لە ووشەی بەڵێ) یەکێکیان جەسارەتیان نەدەکرد قسە بکەن من جارجار بە هۆی ئەوەوە کە ئەو کورد و من کورد وە هەروەها حەزرەتی لە تەوێڵە مستعید[2] بوو، من سوختە[3] بووم، پرسیارێکم لێ ئەکرد وەلامی ئەدامەوە، وە پرسیار و وەلامەکەشی بۆ ئەوان ئەفەرموو بە عەرەبی سەریان سوڕ ئەما کە چۆن گوستاخی ئەکەم پرسیاری لێ بکەم.

٤- وە هەر لە کتێبی ریاض المشتاقیندا جەنابی بەڕێز مەلا حامیدی گەورە ئەفەرموێ: کاتێ حەزرەتی مەولانا ئەگاتە ناوچەی حەوش و بەدرانی[4]، جەنابی شێخ فەتاحی برازای مەولانا ئەمەی بۆ گێرامەوە قازی زەکی سنە لە لایەن حوکمداری ئەوێوە هاتبوو چەند سوارێك بوون ماوەیەك مانەوە، من منداڵ بوم سواری ولاخەکانیان ئەبووم ئەمبردن ئاوم ئەدان ڕۆژێ غارم کرد کەوتمە خوارەوە دەستم شکا جراحیان هێنا بۆیان گرتمەوە، شەوێ درەنگێ مامم کە

---

(١) شێخ عبدالصمد: لە روی هەڵەییەوە نوسراوە عبدالصمد نییە عبدالوهاب ناویەتی

(٢) مستعید: یانی ئەو قوتابی‌یە ئایینی‌یە کە لە دوا پلەی خوێندیا بێ.

(٣) سوختە: یانی ئەو قوتابی یە ئاینی‌یە کە لە سەرەتای خوێندنا بێ.

(٤) کە لەمەودوا باسی حەوش و بەدرانی بە درێژی دێتە بەرچاوی ئازیزان.

حەزرەتی مەولانایە هات خەیاری پاکراوی دامێ ووتم قوربان ناخۆم، فەرموی بۆچی؟

ووتم جەراحەکان ئەڵێن تا چاك ئەبی نابێ ساردی بخۆی، فەرموی بۆ خۆیان ووت من لە کەیەوە خەریکی ئیشی تۆم.

٥- دووبارە عەرزیم کرد لە شتێ ئەترسم فەرموی چی؟ هەموو جارێ مارێ دێت لە لای سەرما (پەپۆکە) ئەخوات، فەرمووی مەترسە ئەوە جنّە مریدی خۆمانە بۆ پارێزگاری تۆ ئەی نێرم. وە فەرموی (٥) (جنی)م کردوە بە ئاگاداریکەری منالەکانی کاکە حەمە[1].

٦- وە هەروەها بۆ فەزڵ و گەورەیی حەزرەتی مولانایە کە لە کتێبی ریاض المشتاقین ئەفەرموی[2]: جارێ دوو ئامۆزا کە هەردووکیان خەڵقی دێیەك[3] ئەبن لە نزیکی شاری سولەیمانی دوو بە دوو پێکەوە ئەگەڕێنەوە بۆ دێکەیان، کە یەکێکیان مریدی حەزرەتی مەولانا ئەبێ و ئەوی تریان مریدی یەکێکیتر ئەبێ لە مەشایخ، لە رێگا یەکیان بە ووی تریان ئەڵێ تۆ بۆچی لە خزمەت شێخی مندا تەمەسوکت وەرنەگرت؟ ئەوی تریان ئەڵێ ئەی تۆ بۆچی لە خزمەت شێخی مندا تەریقەتت وەرنەگرت؟ هەریەك بە باسی باشی و چاکی و شێخی خۆیدا دێتە رێزەخوانیان، لە پڕ مریدی شێخی ناوبراو بە مریدەکەی مەولانا ئەڵێ یا شێخ بیگرە کوتوپڕ بێهۆش ئەکەوێ وە لەو لەهۆش خۆچوونەدا ئەبینێ ئەو شێخە تەشریفی هێناو دەستی دایە یەخەی و بەرەو ئاسمان بردی و زۆری سەرخستم وە

(١) ریاض المشتاقین: ١٨٤.

(٢) سەرگوزشتە و بەسەرهاتی ئەم دوو ئامۆزایە ئەوە ئەگەیەنێ کە پێشوازی بەرێزمان کات و ساتی خۆیان بە باسی شتێکەوە خەریك کردوە کە نزیکی بۆ لای خوا گەیاندوە وە مەبەستیان تەنیا دین بوە بۆیە هەردەم لە خۆشی و دوور لە نارەحەتی و پەژارەدا بوون.

(٣) لە کتێبی ریاض المشتاقیندا لاپەرە ١٨٦دا ئەو دێیە نزیکی قەرەچەتان بوە.

فەرموی: لێرەوە ئەتخەمە خوارێ ئەڵێ منیش زۆر پاڕامەوە کە من هیچم نەووتوە، ووتی بێگومان تووڕت ئەدەم هەرچەند هاوارم کرد بێ سوود بوو.

لە ناکاو حەزرەتی مەولانام کەوتە دڵ و یادێکم کرد تەشریفی پیرۆزی حازر بوو لە هەوەڵەوە وەك پاشایەك لە گەدایەك تکا بکات داوای لێ خۆشبوونی بۆ کردم کە نەیزانیوە و بۆ خاتری من بیبەخشە تکای ئەویشی نەگرت، تا حەزرەتی مەولانا خاتری پیرۆزی ڕەنجا، دەستی پیرۆزی ڕاکێشا سووکێ منی لە دەست وەرگرت و هێنامیە خوارەوە ئیتر ئەوم لێ وون بوو بەڵام لە ڕێی هێنانە خوارەوەمدا فەرمووی چاکت نەکرد ئەم پیاوەت بە دەستی من لەناو برد[1].

کاتێ کە بە تەواوی هێنامیە خوارەوە هۆشم هاتەوە دیم وام لە ماڵی خۆمان خەڵکی زۆرم لە خزم و بێگانە لەسەر کۆبۆتەوە، یەکێ لەوانە کابرای ئامۆزام بوو، ووتم ئەوە چییە بۆ وادەکەن ووتیان: ئەی هوو خۆ تۆ مردبوویت و بە تەمات نەبووین، ووتم نەخەیر نەمردبوم بێخود کەوتبووم و ئێستە چاکم، ئامۆزاکەم ووتی ئەی کاکە نەمووت ئەی کاکە چاك بوو لە خزمەت شێخی مندا تەریقەتت وەربگرتایە، پێم ووت ئەی تۆ بۆ ئەگریت؟ ووتی بۆ تۆ؟ ووتم نە بەخوا بۆ من مەگری بۆ شێخەکەت بگری. ووتی چۆن؟ ووتم ئەی بینی. دوو سێ ڕۆژی پێ چوو یا نەچوو هەواڵ هات کە شێخی فلان جێ کە فلان کەسە وەفاتی کردوە إنا لله وإنا إليه راجعون.

٧- وە هەروەها ئەفەرموێ: جارێ یەکێ ئەیەوێ لە ڕووی گاڵتەپێ کردنەوە بە مەولانا لاساێی بکاتەوە، لە بەردەمی یەکێکا دائەنیشێ و وەکو بیەوێ توجە

---

(١) دووبارە ئەم بەسەرهاتە پڕ ئاکامەش جەنابی مەلا حامیدی گەورە لە کتێبی ریاض المشتاقین‌دا لە بارەی گەورەیی و پایەی بەرزی حەزرەتی مەولاناوە باس ئەفەرموێ لە تەریقەتدا هەروەکو لەشەریعەتیشدا بێ وێنە و بێ هاوتا بووە لە چەرخی خۆیدا ئەو زاتە بە کۆمەك مەشهور بوە کە وەفاتی کردوە.

بکات، دەستبەجێ حاڵی ئەگۆڕێ و ڕووو ئەکاتە چۆڵەوانی و پۆشاك بە خۆیەوە ناهێڵێ، کەس و کاری پەنای پێ ئەهێنن بە حەزرەتی مەولانا خالید و زۆری لێ ئەپاڕێنەوە، ئەویش فرمان ئەفەرموێ بە یەکێ لە خەلیفەکانی کە (بچۆ توجّهی لێ بکەوە شکت نەبێ کە چاك ئەبێتەوە).

٨- وە هەروەها لە کتێبی جامع الکرامات الأولیاء لە پیتی (خ)دا ئەم کەرامەتەی لە حەزرەتی مولانا خالید (قدس سره) ئەگێڕێتەوە ئەفەرموێ: جارێ حەزرەتی مەولانا تەشریفی موبارەکی بەڕێیەکدا ئەڕوا گاورێ بەدوایدا ئەڕوا ئاوڕێ لە ڕووی لوتفەوە ئەفەرموێ لە گاورەکە دەستبەجێ ئیمان ئەهێنێ و موسڵمان ئەبێ والحمد لله ربّ العالمین.[١].

٩- وە هەروەها حەزرەتی مەولانا کاتێك لە سلێمانی بەرەو هیندستان تەشریفی ئەبات وە بڕینی چەندەها ڕێگەی ترسناك و پڕ لە کۆسپ ئەگاتە قەندەهار دوو کەسی تر هاوڕێی ئەبن یەکیان شا دەروێش ئەبێ کە خەلیفەی حەزرەتی شێخ عبدالله دیهلەوی بوە، کە بەهۆی دیتنی ئەو لە سلێمانی عاشق و شەیدای دیداری بووە و ئەو سەفەرەی فەرموە، ئینجا ئەو ماوەیە لە قەندەهار ئەمێننەوە هاوڕێیان دەست ناکەوێ بۆ هیند، زۆر عولەما و زانایان لێیان ئەپاڕێنەوە کە بگەڕێنەوەو نەچن، وە پێیان ئەڵێن لێرەوە تا سنووری هیند (٢) دوو مانگە وە زۆری چۆڵەوانییە و ڕێگەیەکی پڕ لە ترس و بیمە، هەردوو برادەرەکەی لە چوون بۆ هیند پەشیمان ئەبنەوە بەڵام مەولانا ئەفەرموێ: (سەرێ هێناومە نای گێڕمە دواوە).

پاش ماوەیەك مانەوە لەگەڵ کۆمەڵێکا کە کاروانچی بوون ڕێك ئەکەوێ و ولاخێکیان لێ بە کرێ ئەگرێ سەر لە نوێ هاوڕێکانی بە نەبەزی و کۆڵ نەدانی

---

(١) دانەری کتێبی جامع کرامات الأولیاء (شێخ مصطفی إسماعیل النبهاني) وە ئەم پەرتووکە بەسوودە باسی ١٤٠٠ لە ئەولیا ئەفەرموێ وە (لە زیاتر لە ٧٠٠) لاپەڕەیە لە (٢) بەرگا.

مەولاناوە لەو پەشیمانییە پەشیمان ئەبنەوە لەگەڵیا دەڕۆن، ڕۆژێ لە ڕۆژان لەو چۆڵوانییەدا ئەسپەکە غار ئەدا ئەو وولاخە بە زمانێ کە خوا خۆی ئەزانێ و مەولانا تێ ئەگات ئەڵێ بە زەییت پیاما بێتەوە ئەوەندەم غار مەدە مەولانا ئەفەرموێ بە من مەڵێ بەو کەسە بڵێ ئەم ئاگرەی لە دەروونما هەڵگیرساندوە چل ڕۆژی ئەمێنێ بگاتە خزمەت پیر واریدات و بەرەکات پەیدا ئەبێ، وە لەوێوە حەزرەتی شا عبداللە ئەفەرموێ: شابازێ ئەوا هات ئەکەوێتە ناو داومانەوە کاتێ ئەگاتە بەرەوە سێ خۆزگە ئەخوازێ. ا- کاشکێ شێخ نەیفەرموایە (مەولانا)، خالیدی بفەرموایە. ب- نان خۆم وەرمبگرتایە لە فرن. ٣- ئاودەسم پاك بکردایەتەوە. کاتێ بە خزمەت گەیشتن ئەفەرموێ: مەولانا مەبە، خالید بە، نان خۆت وەری بگرە بەلام لەبەر گەورەیی و ڕێزی عیلم (شاهی نەقشبەند) ئاوهێنانی بۆ خانەقا بۆ داناوی نەوەك پاك کردنەوەی ئاودەس.

وە مەولانا ئەفەرموێ (٥) پێنج مانگ دوور لە بیرێ کە جێگەی شەڕ و ئاژاوەی ژنان بوو ئاوم ئەهێنا ئەزیەت و ئازاریان زۆر ئەدام، لێواری بیرەکەیان پیس ئەکرد پاکم ئەکردەوە، هەموو ڕۆژ ٤٠ چل کووپەم پڕ ئەکرد بۆ دەسنوێژ دیسان حەوشی خانەقاشم ئەشت.

(وە ئەمە حاڵی بووە تا پشتی موبارەك و پیرۆزی بووە بە برین).

وەئەی فەرموو لە باقی کاتەکانی ترا هەر خەریکی ئیشی خۆم ئەبووم ڕۆژێ نەبێ شاە رؤوف کە لە نەژادی حەزرەتی ئیمامی ڕەببانی‌یە ئەویش سالیك بوو دوو بە دوو پێکەوە قسەمان ئەکرد، حەزرەتی شاە عبداللە لە نزیکمانەوە تێپەڕی بۆ مەنزلەکەی خۆی گوێم لێ بوو لەبەر خۆیەوە فەرمووی: (ئەم پیاوە لەو ڕێیە دوورەوە هاتووە بۆ وولاتی غەریبی قەڵەمی نسیانی بەسەر ماڵ و منالیا هێناوە لێرەش ئەیەوێ هەر بە قسە و باس کاتی بە خۆڕایی بەسەر ببات کە گەیشتە مەنزڵ ناردی بە دواما چوومە خزمەتی فەرمووی: تۆ لەو ڕێگە دورەوە هاتوی خەتی نسیانت بەسەر لاپەڕەی ماڵ و منالتا

کێشاوە ئێستەش ئەتەوێت هەر بە قسە کاتت سەرف بکەیت، ڕازی نیم لەگەڵ هیچ کەسێ باسو دوانت بێ بێجگە لەم بەندە زەبوونە نەبێ کە هۆی پەیوەندیم لەمیانەی تۆ و خوادا[1].

١٠-حەزرەتی شێخ عبداللە ئەوەندە ڕێزی مەولانای لا بوو، وویستویەتی بیکا بە جێداری خۆی لە دەهلی مەولانا عەرزی کرد ئەم فرمانە ئەگەر ئیلزامی‌یە ئیطاعەی ئەکەم وە ئەگەر ئیختیاریە حەز ئەکەم وولاتەکەم بەم نووره ڕووناك بکەمەوە.

١١-وە لە پاش ئیجازەی خەلافەت وا مشهورە کە تەختی رەوان ڕەوانەی فەرموو بوو تا چەند ماوەیە خۆی تەشریفی فەرموو بوو لەگەڵیا[2]، ئەو ماوە مەنزڵ یەك مەنزڵ بوە.

١٢-کاتێ حەزرەتی مەولانا لە هیندەوە ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی یەك دوو جارێ بۆ بەغا تەشریفی ئەفەرموێ وە خوا لێ خۆشبوو جەنابی شێخ محمود صاحبی برای لەسەر خانەقای سلێمانی بە جێگەداری خۆی بەجێ دەهێڵێ.

● جارێکیان حەزرەتی شێخ عوسمان جەنابی شێخ علی تەوێڵەیی کە یەکێ بوو لە خەلیفەکانی خۆی ئەینێرێ بۆ خزمەت شێخ محمود صاحیب تا بزانێ ئیجازە هەیە بێت بۆ زیارەتی کە ئەگاتە (سید صادق) دەروێشێ لەناو قەبرەکانەوە دێتە خوارێ ئەڵێ جەنابی شێخ عەلی سید صادق منی ناردوە پێت بڵێم کە سەلامی شێخ محمد صاحب بگەیەنە، وە منیش ناوم (دەروێش سمایل)ە کاتێ ئەگاتە سلێمانی حەزرەتی شێخ

---

(١) ئەم باسە سەفەری حەزرەتی مەولانامان دووبارە لە کتێبی (ریاض المشتاقین)ەکەی مەلا حامیدی گەورە وەرگرتوە کە بە دەست خەتە، ئێستە لە خزمەتی جەنابی بەڕێز شێخ محمد ئەمینی (کاردۆخی)دایە.

(٢) تەختی رەوان: وەك ئەو تەختەی کە ئێستا لەوولاتی حیجازدا لەکاتی حەجدا بۆ تەوافی کەعبەی پیرۆز لە مەکەی پیرۆز بەکار ئەهێنرێ بە چوار کەس یا بە دوو کەسی بەهێز ئەچنە ژێر تەختەکە و ناساخەکەی تەواف پێ ئەکەن.

صاحیب ڕێزی لێ ئەگرێ سێ ڕۆژ ئەیهێڵێتەوە و ئەفەرموێ (ئیجازەی بۆچی‌یە تەشریف بهێنێ). جەنابی شێخ عەلی[1] ئەگەڕێتەوە بەڵام سپاردەکەی سید صادق لە یاد ئەچێ کاتێ ئەگاتە لای گردی سەیوان تووشی حەزرەتی شێخ عوسمان ئەبێ لەگەڵ جەماعەتێکا بۆ سلێمانی تەشریفی ئەهێنێ، دیسان ئەگەڕێتەوە وەختێ ئەچنەوە بۆ تەوێڵە ئەگەنە سید صادق بیری ئەکەوێتەوە عەرزی ئەکات لێرە شتێکیان ڕاسپاردووم بۆ خزمەت شێخ صاحیب لە بیرم چوو عەرزی بکەم شێخ دەستبەجێ ئەفەرموێ قسەکەی دەروێش سمایل[2]، عەرزی ئەکات ئەڵێ: بەڵێ. دەرئەکەوێ ئەویش بەم سفارشە ئاگادار بوە.

١٣-لە کتێبی (درّ المعارف)دا[3]، کە جەنابی شاە رؤوف لە نەژادی حەزرەتی ئیمامی ربانی کۆی کردۆتەوە ئەفەرموێ:-

شێخ خالیدی کوردی نامەیەکی عەرزی شا عبداللە کردوە کە ئەفەرموێ: لە کاتێکەوە هاتوومەوە لە هیمەتی بەرزی تۆوە، (٥٠٠)[4] پێنج سەد لە زانایانی خاوەن تصنیف و تألیف تمسکیان فەرموە وە تەریقەتیان وەرگرتوە وە لەوانە (١٠٠) سەدیان لە دوا پلەوپایەی مقاماتی تصوّفدان، ئیتر بێجگە لە سائری عولەما و پیاوی ژیر و باقی موسڵمانانی تر.

وە لە کتێبی (الأنوار القدسيّة في مناقب السّادة النقشبندية)دا ئەفەرموێ: حەزرەتی مەولانای کوردی خەلیفەکانی بلاوکردۆتەوە لە مەککەی موکەڕڕەمە و مەدینەی

(١) شێخ عەلی تەوێڵە: یەکێکە لە خەلیفەکانی حەزرەتی شێخ سراج الدین، نەخوێندەوار بوە بەرزترین خەلیفەی شێخ بووە لە کاتی خۆیدا.

(٢) دەروێش سمایل: خۆشی یەکێ بوە لەوانە کە لە گۆڕستانی سید صادق نێژراوە لە نزیك سید صادقەوە.

(٣) درّ المعارف: ئەم کتێبە لە ئەستەمبۆڵ بە زمانی فارسی لە چاپ دراوە، و لە سلێمانی هەیە.

(٤) ئەم پێنجصەد عالمە بریتی بوون لە عولەمای عێراق و سوریە و ئەردەن و حیجاز و ترکیە و سائری ولاتانی تر هەتا خەلیفەی ناردوە بۆ (باکۆ).

منوّره و قودسی شەریف و لە وولاتی شام و حیجاز و تورکیە و عێراق و ئێران و تەنانەت لە باکۆ خەلیفەی بووە، وە عولەماکانی ئەم جێگانە لە خزمەتیا تەریقەتیان وەرگرتوە و لێی بەهرەمەند بوون.

١٤- کاتێ حەزرەتی مەولانا خالید لە خزمەت شاە عبداللە دهلویدا ئەبێ، حەزرەتی شاە عبداللە ڕێز و ئیحترامی حەزرەتی مەولانای بەلاوە لە باقی زیاتر ئەبێ، وە ئەوی بەلاوە لەوان لە پێشتر ئەبێ، ئەوانیش بەگوێرەی سروشتی بەشەری لە لایان خۆشنابێ حەزرەتی شاە عبداللە (قدس سرە) ڕۆژێ هەموو خولەفا و ئیجازە دراوانی کۆ ئەکاتەوە ئەیەوێ کە هەموو ئەدەب و خووڕەوشتی بەرز و شیرینی حەزرەتی مەولانا و پێکەوتن و لیاقەتی ئەو زاتەیان بۆ ڕێزلێگرتن و ئیحترام لێ ئاشکرا بێ، یەکە یەکە بانگیان ئەکات بۆ خزمەت خۆی، هەرکەس سلاو دەکا و شێوازی ئەدەب بەجێ دێنێ ئەفەرموێ تۆ غولامی کێیت؟ [1] ئەویش ئەلێ غولامی شاهی دین پەناهم یانی (حەزرەتی شاە عبداللە)، ئەفەرموێ بڕۆ لەویا دابنیشە تا هەموو ئەچنە خزمەتی و ئەو پرسیارەیان لێ ئەکات، ئەوانیش هەر بەو فەرمودە وەلامی عەرز ئەکەن، تا لە دواجار ئەفەرموێ خالیدی ڕۆمیم بۆ بانگ بکەن، داوای ئەکەن ئەفەرموێ تۆ غولامی کێیت؟ لە وەلاما مەولانا عەرزی ئەکات ئەم پرسیارە لە لام ئیشکالە ئەفەرموێ چۆن؟ ئەویش ئەم بەسەرهاتی حەزرەتی بایەزیدی (خوا لێی خۆش بێ) عەرز ئەکات کە ئەم هۆنراوەیە دیاری ئەکات:

---

(١) غولام یانی بەندە لە زاراوەی پێشیناندا ووشەی من بەندەی تۆم بەکارهێنراوە بۆ زیادە ڕێز و پیشاندانی خۆشەویستی بۆ هەرکەس کە شایانی ئەو ووشەیە بێ کە بۆی بەکارهێنرێ بە تایبەت بۆ دەستگیر و ئامۆژگاری دڵ و دەروون.

وا ئەگێڕنـــــەوە لـــە گـــرۆی چـــاکان
لـــە ســـینە صـــافان لـــە دەروون پاکـــان
کـــانێ غەواصـــی بـــەحری مـــەعانی[1]
خـــاوەنی عیلمـــی جـــەهری و پنـــهانی
عـــاریفی بـــالله مورشـــیدی نـــامی[2]
رئـــیس العشّـــاق قطـــبی بـــەسـطامی
کەوکـــەبی بـــورجی فەلـــەکی توحیـــد[3]
گەنجینـــەی ئەســـرار ســـلطان بایەزیـــد
دای لـــە شـــەقەی بـــاڵ شـــابازی گیـــانی
کـــۆچی دوایی کـــرد لـــە دونیـــای فـــانی
ڕووی کـــردە شـــاخی عالـــەمی بـــەقا
نیشتـــەوە هـــەتا مەوعیـــدی لیـقـــا
فریشتـــەی خـــودا هـــاتن بـــۆ ســـوئال
لـــە پـــیری خـــاوەن ئـــەدەب و کـــەمال
ووتیـــان عەبـــدی کێیـــت؟ ووتی ئیشکالـــە
لای مـــن وەڵامتـــان بـــۆ ئـــەم سوئـــالە
لای کێـــوە هـــاتن بچـــن مەتـــرسن
لـــە ئـــەحواڵی مـــن هـــەر لـــەو بپرســـن
ئـایـــا تـــۆ ئـــەووت قبـــوڵ کـــردوە
بـــە خـــولامی خـــۆت نـــاووت بـــردوە
گـەر بـەڵێ، ی فـەرموو مـن بەنـدەی ئـەوم
بـــەڕاسی بـەنـــدەی شـــەرمەندەی ئـــەوم

---

(١) غواصی بەحری مەعانی: مەلەوانی دەریای خواناسی.

(٢) عارفی بالله: خواناسی بە ڕاستی.

(٣) کەوکەبی بورجی فەلەك: ئەستێرەی قەلاکانی گەردوون.

وه فـــەرمووی قبـــوڵ نـــەکراوە چـــە ســـوود
مـــن بڵێـــم عەبـــدم بـــــۆ خـــوای معبـــود

مـــنیش لـــە لای تـــۆ ئـــەی دیـــن پـــەناهم[1]
گـــــەر وەرگیـــــرابم غـــولامی شاهـــــم

(١) ئەمجار هەموو ئەو زاتە بوزرگەوار و هەڵبژێراوانە حقیقەتی مەولانای کوردیان بۆ دەرئەکەوێ و هۆی زیادە لوتف و مەرحەمەتی حەزرەتی شاه عبداللە یان لێ ئاشکرا ئەبێ، هەر لەبەر ئەو هەموو ئیخلاص و راستی و دڵسۆزی‌یەی بوە کە حەزرەتی شا عبداللە ویستوویەتی بیکا بە جێداری خۆی لەوێ.

ئیجازەی نامەی ئیرشاد لە لایەن (حەزرەتی شاە عبداللە)وە بۆ حەزرەتی مەولانا خالید (ڕەزای خوایان لیٚ بیٚ)، بۆ تبرك دەقی ئەو ئیجازە نامەیە ئەنووسین بە زمانی فارسی.

بسم الله الرحمن الرحيم

بعد حمد و صلوات فقیر عبدالله نقشبندی مجددی عفی عنه گذارش مینماید که سر امد علمای دین وگزیدهٔ طالبان راه حق الیقین حضرت مولانا خالد سلمه الله تعالی برای أخذ طریقه نقشبندی أز ملک کوردستان نزد این فقیر رسیده تا ده ماه در خلوت ترک بأذکار وأشغال طریقه بکمال جدّ وجهد پرداختند الحمدلله که بعنایت إلهی سبحانه بواسطهٔ پیران کبار رحمة الله علیهم بمدارج طریقه ترقیات کردند و بحضور و یادداشت و تهذیب لطائف عالم امر وفنا وبقا وبیخودیها فائز شدند وأنوار سیر عالم خلق وکیفیات وحالاتیکه بر هیئات وحدانه سالک در طریقهٔ حضرت مجدد رحمة الله علیهم فائز می شوند باطن إیشان را منوّر ساختند و از کمال بتکمیل آن رسیدند پس إیشان را باجازه وخلافت وتربیت طالبان ممتاز فرمودیم ودر طریقه قادریه وچشتیه وسهروردیه وکبرویه رحمة الله علیهم نیز مجاز ومأذون ساختیم چنانکه معمول این طریق است دست ایشان دست من است وإیشان نایب خلف الصدق پیران من اند رضای من و خلاف ایشان خلاف من بدوام ذکر و توجه و مراقبات و إتباع سنّة سنیّة واجتناب از بدعت ردیّه وجد و توکّل تسلیم و رضا و شغل علوم تفسیر وحدیث وصوفیّه وهدایت طالبان مشغول باشند اللهم اجعله للمتقین إماما

وصلّی الله علی سیّدنا محمّد واله وصحبه وسلّم

بسم الله الرحمن الرحيم

بعد حمد و صلوات فقیر عبدالله نقشبندی مجدّدی عفی عنه گزارش مینماید که سر آمد علمای دین، وگزیده طالبان راه حقّ الیقین حضرت مولانا خالد سلّم الله تعالی أی أخذ طریقة نقشبندی أز ملك کوردستان نزد إین فقیر سیده تا ده ماه در

خلوت ترك بأذكار وأشغال طريقة بكمال جدّ وجهد وأختند الحمد لله بعنايت إلهي سبحانه بواسطهپيران كبار رحمة الله عليهم.

بمدارج طريقة ترقيات كردند وبحضور و ياداشت وتهذيب لطائف عالم أمر وفنا وبقا و بيخود فائز شدند وأنوار سير عالم خلق وكيفيات و حالاتيكه بر بيئات و حدانه سالك در طريقة حضرت مجّد رحمة الله عليهم فائز مى شوند باطن إليشان رامنّور ساختند وأز كمال بتكميل آن رسيدند پس إيشان را بأجازه وخلافت وتربيت طالبان ممتاز فرموديم ودر طريقة قادرية وچشتيه وسهروردية وكبر ويّر رحمة الله عليهم نيز مجاز ومأذون ساختيم چنا نكه معمول إين.

طريق آست دست إيشان دست من آست وإيشان نايب خلف الصدق پيران من أند رضاي غيشان رضاى من وخلاف ايشان خلاف من بدوام ذكر توجّه ومراقبات وإتّباع سنّة سنيّة واجتناب أز بدعت رديّة وجدو توكّل تسليم ورضا وشغل علوم تفسير وحديث وصوفيّة وبدايت طالبان مشغول باشند, اللّهم اجعله للمتقين إماما وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه وسلم.

| | |
|---|---|
| فيدات بم نيشتمان بۆ شارەزورت | ڕووناكە شام و ئەستەمبوڵ بە نورت |
| چراى كۆڕى بە حق مەستانە خالد | نەمامى باخى كوردستانە خالد |

حەزرەتى مەولانا ئەفەرموێ: دواى ئەوەى حەزرەتى شا عبداللە ڕۆحمان فيداى، منى بە ئيجازەى ئيرشادى تەريقەت سەر بەرز و بەختەوەر فەرموو، وە بارى گرانى خەلافەتى خستە سەرشانم تا ماوەيە لە ميانەى حەزرەتى غوث الثقلين و حەزرەتى شاهى نەقشبەند ڕەزاى خوايان لىٚ بىٚ لە بارەى منەوە شێوە موناقەشەيەكيان هەبوو، وە هەريەك لەو دوو پادشاهى مقامى (حقّ اليقين)ە و لەو دوو خۆرى ئاسمانى بەرزى ميللەت و دينە منيان بۆ خزمەت بە تەريقەتى تايبەتى خۆيان داوا ئەكرد، وە ئەم

حاڵەتە لە میانەیاندا تا ماوەیەکی دوور و درێژ بەردەوام بوو، تا لە ئەنجاما موعامەلە بە صلح و ڕێکەوتن دروست بوو، حەزرەتی غەوث منی بە غولامی خۆی قبوڵ فەرموو وە بە شاهی نەقشبەندی بەخشیم.

وە فەرموویە: کە بۆ گەڕانەوە حازر بووم حەزرەتی شاهی دین پەنا فەرمووی خەرجی ڕێگە و وولاخی سواریت نیە ئەمما بە هیممەتی شاهی نەقشبەند ئەگات لەو کاتەدا پیاوێکی بێگانە لە لایەن حوکمدارێکەوە لە دەرگای خانەقاوە داوای ئیجازەی کرد، کە ماوەی درا هاتە ژوورەوە تەبەقێکی بەسەر سەرەوە بوو لە بەردەمی حەزرەتی شاە عبداللەدا داینا و عەرزی کرد ئەم دیاری‌یە لە لایەن فەرمانڕەوای فلان وولاتەوە پێشکەشتان کراوە، فەرمووی ئەوا خەرجیت بۆ هات کاتێ ژماردم ٦٠٠ شەش سەد ڕۆپیە بوو، بەدوای ئەوا لە یەکێ لە موسڵمانانەوە (ماین)ێکی سواری بە دیاری بۆ شا عبدالله هێنا و فەرموی: ئەوا خوا وولاخی سواریشی بۆ ناردی، ئینجا حەزرەتی شا عبدالله بە چەندەها دڵدانەوە و نەوازشی شاهانە، وە ووشیاری و ئامۆژگاری و دڵ نەوایی دڵ نەرمانە سەربەرزی فەرمووم.

وە فەرموی کاتێ بە خاکی رافزی تێ ئەپەڕی دەخیل سەد دەخیل خۆراکی دەست لێ دراوی ئەوان مەخۆ خۆت بە دەستی خۆت خۆراك دروست بکە.

ئینجا بۆ تبّرك لە قاپی تایبەتی خۆی جامێك و دەورییەکی مس و ئافتاوەیەکی[1]، پێ خەلات کردم، وە ئیتر دەرگای گەنجینەی شاهانەی ظاهری و باطنی بۆ کردمەوە، یەك ڕۆژە ڕێگە بۆ ماڵ ئاوایی و خواحافیزی تەشریفی پڕ فەڕ و پیرۆزی لەگەڵما هات، لە پاش ئەوەش تا سێ ڕۆژ ڕۆحی پیرۆزی جار جار ظهوری ئەکرد و ئەی فەرموو خالید شێت بووی من بەجێ دێڵی بۆ کوێ ئەچی[2]؟ ئیتر کە تەشریفی موبارەکی هاتەوە لە ساڵی ١٢٢٦ هیجریدا گەیشتۆتە شاری سنە لە کوردستانی ئێران.

---

(١) ئافتاوە: مەسینە.

(٢) دەقی فارسی‌یەکەی ئەمەیە: خالد مەگر دیوانە شدە مرای میگزاری کجا میروی.

لە هیندەوە تا سنە وە لە سنەوە تا سولەیمانی و تەشریفی چەند جاریٚ بۆ بەغا و هاتنەوە، وە ئینجا تەشریفی بۆ شام چەند بەسەرهات و چیرۆکی لەسەرە لەبەر درێژی باسیان لێرەدا ماوەی نایەت.

بەڵام هەر بۆ خۆشی کەرامەتیٚ عەرزتان ئەکرێت کە جەنابی شێخ ئەحمەدی سەرگەڵو کە یەکیٚ بووە لە ئیجازەدراوانی مەولانا خۆی ئەیگێڕێتەوە ئەڵیٚ: کاتیٚ لە بەغا لە خزمەت حەزرەتی مەولانادا شووتیمان ئەخوارد شووتییەکە زۆر سارد و شیرین و تامدار بوو فەرمووی ئەگەر لە فلان (شیو)دا شووتیەکی وا سارد و شیرین و بەتام و لەزەتت بخواردایە صفایە زۆر خۆش ئەبوو عەرزم کرد بەڵیٚ وە ئەم قسەیەم بە شتێکی ئاسایی لیٚ وەرگرت و عادەتی بوولام. لە دوای گەڕانەوەم گەیشتینە ئەو جێگە ئەوەندەم تینوو بوو هەرچەندمان کرد ئاومان چنگ نەکەوت وەختە بوو لەناو بچم، لە پڕ هاوڕێیەکەم ووتی ئاخر ئەو شوتیە لە بارەکەدا ئێستە نەی خۆی بۆچی باشە بۆ کەی هەڵ ئەگریت ووتم شووتی چی؟ ووتی ئەی ئەوە نیە ووتم بیهێنە کە هێنای و لەتمان کرد عەینی ئەو شووتییە بوو لە خزمەتیا خواردم لە عەینی شیو کە ناوی هێنا(١).

ئینجا مەشایخانیٚ کە لە کوردا هەڵکەوتوون لە ژمێرە نایەن:

هەندێکیان ناویان نەچۆتە ناو کتێبەوە هەندیٚ نووسراونەتەوە، بەڵام ئەوانەی بێجگە لە کوردستاندا ژیاون بە زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی و بێجگە لەمانە موناقەباتیان بەیان کراوە.

وەك لە جامع الکراماتی الأولیاء کە ناوی ١٤٠٠ ئەولیای بە تەرتیبی حروفی (هجاء) نوسراوەتەوە وە کورتەیەکیش لە موناقەباتیان، وە لە هەندێکیانا دیاری کراوە کە ئەم زاتە موبارەکە کە کورد بووە، ئینجا ئەوانەش کە لە کوردستانا ژیاون زۆریان باسی ژیان و چۆنیەتی بەسەربردنی ژیان و کەرامات و خەواریقاتیان نەخراوەتە سەر

---

(١) حەزرەتی مەولانا لە ڕووی مکاشەفە و کەرامەتەوە ئەمەی فەرموو.

کاغەز وە دەماودەم شتیان لیٚ گیٚڕاونەتەوە، بەڵام ئەوانەی لەم نزیکانی خۆمانە بـوون بـە ناوبـانگ و مەشـهورن موناقـەبات و خـەواریق و کـەراماتیان بـە قـەدەر توانـا و دەسـەڵات کۆکراونەتـەوە لـەم زاتـە پـیرۆز و موبـارەك و پڕ فەڕانـە حـەزرەتی شـێخ عوسمان سراج الدین و شێخ محمد بهاء الدینی کوڕی وە حەزرەتی شێخ عمرضیاء الدین خوا لیٚیان خۆشنود بیٚ کە ئەویش کوڕی عەزیز و خۆشەویستییەتی، دوو کـەس کەراماتی حەزرەتی شێخی سراج الدینی کۆکردۆتـەوە، یەکـەم مـلا حامیـدی کـبیر کـە کاتب و نووسەری تایبەتی خۆی بووە، دووەم شێخ محمدی سەمڕانی کە یەکیٚ بوە لـە خەلیفەکانی خۆی، کتێبی ملا حامدم دیوە بە دەستنووس بە ناوی (ریاض المشتاقین) بەڵام زۆر لـە لام نەماوەتـەوە، وە کتێبی شێخ محمـدی سـەمڕانی کـە نـاوی (بارقـات السّرور)ە چاپ کراوە ئێستەش لە لامە بە زمانی فـارسی گۆڕیومەتـە سـەر کـوردی وە هەر لە مناقباتی حەزرەتی شێخ عمر ضیاء الدین (قـدس سـره) کـە ئـەویش دوو کـەس کۆیان کردۆتەوە، یەکەم حاجی ملا یوسفی متخلّص بە مجمر کە کاتبی بووە، ئـەدیب و خوێنـدەوارێکی قابیـل بـووە لـە سـاڵی ١٣١٤ی کۆچیدا کـۆی کردۆتـەوە، دووەم جەنابی بەڕێز زانا و پایەدار ملا محمودی متخلّص باکی لە ساڵی ١٣١٨ کۆچیدا کۆی کردۆتەوە، ئەویشم لە لایە و گۆڕیومە بۆ کـوردی ئـەوا گـەر خـوا حـەز کـات ئـەیان نووسینەوە تا برایانی کورد زمان لیٚیان بەهرەمەند بن، لـە پێشـەوە دەسـت بـە پـەڕاوی بارقات السّرور ئەکەین کە باسی کەرامەتەکانی حەزرەتی شێخ عوسمان سراج الـدین و حەزرەتی شێخ محمد بهاء الدینی کوڕی (قدس سرهما) ئەکات ئـەنجا دەس ئەکـەین بـە نوسینەوەی کەرامەتی حەزرەتی شێخ عمر ضیاء الدّین (قدّس سرّه) لە دوای ئـەوانیش لە هەر کەسی باوەڕپێکراومان بیستبیٚ لە بارەی گەورە پیاوانەوە ئەی خەینە بەرچـاو، وە خۆیشم کەراماتی حەزرەتی شێخ محمد علاء الدین و حەزرەتی غەوثی وەقت قطـبي زەمان و مرشدی عظیم محمـد عثمـان سرج الـدین (قـدس سرهما) چیم لـە زانایـانی باوەڕپێکراوەوە بیستبیٚ نووسیمەوە و ئەی خەینە پێش چاوی برایانی کورد زمان گـەر

خوا حەز کات ببێتە هۆی بەهرە و بەرەکەت بۆ کەسانێ کە تەماشای ئەکەن وە ببێ بە هۆی دامەزراوی عقیدە و بیروباوەڕ و پتەوی ئیمانیان بە ئاینی پاکی ئیسلام، خوای تەعالا بە لوتفی خۆی کۆکەر و نووسەر و خوێنەرەوەیان وە ئەوەش کە گوێیان لێ ئەکەن و گوێیان لێ ئەگرن لە فەیز و بەرەکاتیان فائض و بەخشندە بفەرمون إن شاء الله تعالی آمین یاربّ العالمین...

# حضرەتی شێخ عثمان سراج الدین قدس الله سره العزیز

یەکێکە لە گەورە گەورانی مەشایخ لە ساڵی ١١٩٥ی هیجری لـە دێـی (تەوێڵـە) کە تابع بە قەزای هەڵەبجەیە لە دایکبوە.

باوکی ناوی (خالد) ئاغا[1] کوڕی محمود ئاغا کـوڕی عبـدالله ئاغـا کـوڕی سـیّد محمد درویش کوڕی سید طاهر کوڕی سید جمعـە وە لـە سـاداتی (**نعیم**)ن. حـەزرەتی (شێخ عوسمان) (قدس سره) لە تەمەنی حەوت ساڵیدا خراوەتە بەر خوێندن، قورئـانی پـیرۆز و هەنـدێ ووردە کتـێبی خوێنـدوە، ئینجـا بـۆ فێربـوونی عـیلم و شـەریعەت تەشریفی فەرموە بۆ (**بیارە**)و خەرپانی و خورماڵ لە پاشان تەشریفی چووە بۆ بەغدا، لەوێش ماوەیە زۆر خۆندویەتی تا بە خزمەت حەزرەتی (**مولانا خالیـد**) (قدس سره) گەیشتوە، لە خزمەتیا کەسبی (تەریقـەت)ی کـردوە، لـە ئـەنجامی تـەواوکردنی سیر و سلوك حەزرەتی مولانا کە خۆیشی یـەکێ بـوە لـە أکـابر و گـەورە گـەورانی تەریقـەتی نقشـبندیە وە ئیجـازەی إرشـادی لـە خزمـەت حـەزرەتی (شـاە عبـدالله دیهلـەوی) وەرگرتـوە ئیجـازەی خەلافـەتی پێ مەرحەمـەت ئەفـەرموێ بـۆ ئیرشـادی ڕێگـەی موسڵمانان تەشریفی دێتەوە تەوێڵـە دەسـت ئـەکات بـە ئیرشـاد تـا لـە سـاڵی ١٢٨٣ی هیجریدا وەفات ئـەکات عـومری موبـارەکی (٨٨) سـاڵە وە هـەر لـە تەوێڵـە مەدفونـە. شێخ محمد بهاء الدینی کوڕیشی قدس سرهما هەر لە تەوێڵە لە تەنیشت خۆیـەوە دفن کراوە. مەرحومی حاجی شێخ أحمدیش هەر لە خزمەت باوکیا دفن کراوە.

---

(١) کاتی خۆی بە زۆری لە ئێراندا سید بە ئاغا بانگ کراوە، وە بووە بە لەقەب (نازنـاو). یـان لـە چـۆڕا کە دێیەکە لە مەریوان و بە زۆری دانیشتوانی ئەو دێیە سیّدن، ئاغا محمد و ئاغا حسـین لـە (أولادی مـەلا أبو بکری مصنّفن) کە زۆرتـری سـادات ئەچـنەوە سـەر ئـەو، هـەروەك لـە (هینـدسـتان)دا سـید بـە (میر) لەقەبدار کراون (میر نعمان) یانی سید نعمان بۆیە بەوە لەقەبـدار کـراون چـونکە حـەزرەتی علـی کـرّم الله وجهە أمیر المؤمنین هەروەك بەو ئەڵێن (أمیر) أولادەکانیشی بە (میر) مولەقەبن.

**کەرامەتی -١- لە کتێبی بارقات السرور لاپەڕە (٣١)**

دانەری کتێبی **(بارقات السرور)** [١] ئەفەرموێ پێش ئەوە بەزیارەتی حەزرەتی شێخ عثمان (قدس سرە) فائز ببم، لەخزمەت خەلیفەیەك لە خەلیفەکانی کە ناوی شێخ محمد صادق بوو تەریقەتم وەرگرت و تەعلیمی ذیکری إسمی **(ذات)**ی کردم، لەپاشا حەلاوەت و دڵخۆشییەك روی تێکردم بەجۆرێ سەرگەرمی لە ذیکرکردن روی تێکردم هیچ رۆژێ بە کەمتر لە ٢٧٠٠٠ تا ٣١٠٠٠ ذیکری قەلبی رازی نەئەبووم، بەم جۆرە بوم تا نزیکەی (٩) مانگ کە دڵم هێزێکی تێهات بەقەصدی زیارەتی حەزرەتی پیر ری‌ی تەوێڵەم گرتەبەر. پاش ماوەیە کە لەوێ مامەوە روخصەتی هاتنەوەم وەرگرت، بەلام ئەم سەفەرەی هەوەڵم لە (بیارە) بەخزمەتی گەیشتم، کاتێ کە لە دێ دەرچووم عەیانەت بە ئاشکرا ئەم بینی حەزرەتی پیر لەگەڵما ئەهات وەکو سێبەرێ وابوو لە کاتێ رۆژ بەدەرەوە بێ دیار بوو. جارجار لەلای رەفیقەکانم ئەمدرکاند گاڵتەیان پێ دەهات، جارجار کە لە بیت الخلادا ئەمبینیایە تەریق ئەبوومەوە. ئەمە دەوامی کرد تا گەیشتینە (سەرنۆدێ)[٢]. کە گەشتینە ئەو جێگە نوێژی نیوەڕۆم کرد وە سەلامم دایەوە ئیتر حەزرەتی شێخ لێم غایب بوو، هەرچەند چاوم ماڵی و دەستم بە چاوما هێنا نەمدیەوە.

---

(١) دانەری بارقات السرور: کە مەرحومی حاجی شێخ محمدی سەمرانی‌یە. وە یەکێکە لە خولەفای حەزرەتی شێخی سراج الدین (قدس سرە)، باوکی ناوی رۆستەم بەگی میر ئاخورە، زەوی و زاری بوە، بەبۆنەی کەسبی تەریقەتەوە بە شێخ مەشهور بوە، دێی سەمران و گەزگەزارە، بەموڵکایەتی عائیدی ئەم بوە. لە ساڵی ١٢٦٦ی هیجری لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا بەخزمەت حەزرەتی شێخی سراج الدین گەیشتوە. لە پاش وەفاتی ئەم زاتە عالی جەنابە هاتوچۆی حەزرەتی شێخ محمد بهاء الدین کە کوڕی گەورەی حەزرەتی شێخ سراج الدین بوە (قدس سرهما) کردوە. خوا دەرەجەی بەرزتر بکات، آمین . . .

(٢) سەرنۆدێ: جێگەیەکە بۆ ناو شاری سنە سەعاتە رێیەکە بەپێ.

**ك ٢ بص ٤٦**[1]: حاجی شێخ محمد ئەفەرموێ:

جارێ لە جاران حەزرەتی شێخ لە (حەوش و بەدرانی)[2] مەشغوڵ بە خواردنی دارچینی بوو لەوێ کە پزیشك بۆیان نواندبوو بەکاری بهێنێ چووم بۆ خزمەتی، ئاوی ئەو ناوچەیە یەکجار سارد بوو لە نوێژی نیوەڕۆدا بۆ دەست نوێژ گرتن بێتاقەتی ئەکردم، بە قەزاو قەدەر (٥) شەو لەسەر یەك إحتلامم ئەبوو، بەو ئاوە ساردە خۆمم ئەشت.

لە پاش جاری پێنجەم بەیانیەك بە خزمەتی گەیشتم فەرموی سەرمایە زۆرت بوو عەرزم کرد: بەڵێ ئیتر لە تاقەتما نەماوە لە پاش ئەوە تا یەك مانگ لەوێ مامەوە موحتاجی خۆشوشتن نەبووم.

وە هەر لەو سەفەرەدا مەبلەغێ نەقدم بە دیاری بردبوو بەڵام گەیشتمە ئەوێ شتێکم بۆ خەرجی خۆم لێ گێڕایەوە، دەس بە جێ دڵ تەنگییەکی زۆر ڕوی تێ کردم تا ماوەی (٢٠) ڕۆژێ لانەچوو دوایی تێ گەیشتم بێ ئەدەبیم کردوە، بە دڵ داوای لێ بوردنم کرد وە زۆر ئیستمداد و إلتجام کرد لە جەنابی، بۆ سبەینێ کە چوومە مەجلیسی، فەرموی ئەمە چ حاڵێکە کێ محاسبەی کردووی خۆ لێت نادەن دوایی بە پێکەنینەوە عینایەتێکی لەگەڵ کردم ئەو دڵ تەنگییە بوو بە بەسط و سرور و خۆشی.

---

(١) ك: کەرامەت، بص ٤٦: یانی لە کتێبی بارقات وسرور لە صحیفە و لاپەڕەی ٤٦دا نوسراوە.

(٢) حەوش و بەدران: دەشتێکی خۆش و باصەفایە لە خوار دێی (دەرەکێ) لە بەشی ئێران کەوتۆتە ئەودیوی کەلی کەماجاڕ. وە کەلی کەماجاڕیش شاخێکی بەرزە ئەم دیوی عێراقە سەرگەت و دەرەی مەرە کە سەر بە ناحیەی خورماڵە و سەر بە قەزای هەڵەبجەیە وە ئەو دیوی ئەم چیایەش ئێرانە یانی کەژی کەماجەڕ سنوری میانەی هەر دولایە بە کورتی.

**ك ٣ بص ٥:** فخرالدين مرحومی مبارەك (حاجی شێخ عبدالرحمن)[1] قدس سره لە دێی (گوڵپ)ی شارەزور خانویەکی دڵگیر و خۆش ئەکاتەوە، کە کاتێ تەواو ئەبێ حەزرەتی پیر یانی شێخی دڵ مونیر شێخ عوسمان تەشریف ئەباتە ناوی بۆ پیرۆزی و زۆری فەیز و بەرەکەت پێیدا ئەگەڕێ، ئەفەرموێت موبارەکە بەلام عبدالرحمن تێی دانانیشێ، مقدّەر چوار مانگ تەواو ناکات پاش ئەو فەرموودەیە حەزرەتی شێخ عبدالرحمن تەشریف دەبا بۆ بەغا لەوێ کۆچی دوایی دەکات وە لە بارەگای حەزرەتی غوث الثقلين سلطان الرجال عبدالقادر گەیلانیدا مەدفونە قدّس الله أرواحهم.

وە هەر لە بارقات السرّور لە لاپەڕەیەکی تردا شێخ محمدی سەمڕانی ڕەحمەتی خوای لێ بێ نەقڵ ئەکا ئەفەرموێ:

شێخ سراج الدين قدّس سرّه فەرموی: لە کاتێکا حەزرەتی شاهی نەقشبەند و عبدالقادری گەیلانی تەشریفیان هانی، حەزرەتی غەوث فەرموی فلانی محمد بۆ تۆ عبدالرحمن بۆ من، هەروا بوو کە بوو.

**ك٤ بص ٥٢:** شەهزادەی گێتی ستان، ناوی شەخسێ بوو لە نەجیب و خانەدانی شاری هُرات[2].

لە مەجلیسی حەزرەتی شێخدا دانیشتبوو گوایە ئارەزووی حەجی هەبوو، عەرزی کرد قوربان (٤) ژن و (٤) کوڕم هەیە، وە فلان دێ موڵکی منە، حەزرەتی شێخ فەرموی یەکێ لە کوڕەکانت مردوە؟ ئەو شەخسە (هُرات)ی‌یە لە دڵا دیار بوو

---

(١) حضرەتی حاجی شێخ عبدالرحمن کوڕی حەزرەتی شێخ عوسمانی تەوێڵەیە لە ساڵی ١٢٥٣ لە دایك بوە، وە لە ساڵی ١٢٨٤ کۆچی دوایی فەرموە، تەمەنی موبارەکی (٣١) ساڵ بوە وە لەقەبی موبارەکی (أبو الوفا)یە بیستومە کە ئەم زاتە مرادی خوا بوە زۆر کات بە توّجه إنسانی پێ گەیاندوە، وە شتی زۆر گەورەی لێ ئەگێڕنەوە (قدس الله روحه وأعلى الله مقامه).

(٢) هوڕات: شارێکە لە ماوراء النهرين.

تێکچوو، پاش نەختێ ووتی یا شێخ ئەمەوێ بۆ حەج بچم ڕەفیقم نیە، فەرمووی (٥) ڕۆژی تر لێرە دانیشە ڕەفیقت بۆ ئەبێ.

(٣) ڕۆژ لەو ماوە تێپەڕی کرد، دوو کەس خەڵکی دێکەی گەیشتن وە لەگەڵ شەخصی ناوبراو زۆر بە ئەدەب بوون، دەست بۆ سی و موصافەحەیان لەگەڵ کرد و زۆر بە حەیا و شەرمەوە بەرماڵ و چەبغ و کەوشیان بۆ هەڵ ئەگرت وە هەروەها خەبەریان دایە کە فلان کوڕت دوای خۆت وەفاتی کردوە.

شەخصێ هوراتی مولاقاتی کردم وە ووتی فلانی تۆ ئەزانی وەعدەکانی شێخ هەمووی ڕاست دەرچوون.

لــــە پــــاش مــــەئیوسی ئومێــــد زۆر زۆرە

لــــە دوا تــــاریکی ڕوونــــاکی و خــــۆرە

**ك٥ بـص ٦٠:** حـاجی شـێخ محمـد خـاوەنی کتـێبی بارقـات السـرّور بـاسی نەخۆشییەکی خۆی ئەکات ئەفەرموێ: کە کاتێ لە خزمەت حەزرەتی شێخدا بوە زۆر ئارەزوی خەیارم ئەکرد، سیّد علی ناو کە بە ئەمری حەزرەتی شێخ چاودێری ئەکردم لە کاتی ئەو نەخۆشیەدا دەرمان و دەوای بۆ پێك ئەهێنام.

پێم ووت بڕۆ عەرزی شێخ بکە زۆر مەیلم لە خەیارە، کـە ئـەو ڕۆشـت دوا بـە دوای ئەو وەستا جامی تفەنگ ساز[1]، خەڵکی ئەوێ بـوو کـە لەگـەڵ منـا ڕەفیقـی و میهرەبـانی و خۆشـەویستی و ئولفـەتی زۆری هـەبوو چـەند دانـە خـەیار و هەنـدێ هەڵوژەی بۆ ناردبووم.

سید علی کاتێ ئەگاتە خزمەت شێخ وە بۆ خەیار عەرزی ئەکات ئەفەرموێ بڕۆ تا تۆ ئەچیتەوە ئەوێ خەیاری بۆ چووە، وەختێ هاتەوە خـەیاری دی زۆر عـەجایب ما وە ووتی سبحان الله ئەمە چ فەزڵ و گەورەییەکە خـوا بـە شێخی داوە مـن عـەرزم

---

(١) وەستا جامی تفەنگ ساز خۆی خەڵکی تەوێڵە بوو.

کرد فەرموی بڕۆ تا تۆ ئەگەیتەوە لای، خەیاری بۆ چوە، ئەمەیە کە ئەیبینم دیسان هەر لەو نەخۆشییەدا شەوێ لە نوێژی عیشادا خوێنی لووتم بەربوو بە جۆرێ بە شیدەت بوو هەر چەند هەوڵیان دا و إهتمامیان کرد نەوەستایەوە، تا نوێژی بەیانی وە هەتا چێشتەنگاو دەوامی کرد هیچ جۆرە دەرمانێ چاری نەکرد بە جۆرێکم لێ هات نائومێدیم لە ژیان پەیدا کرد، وەك پەیکەرێ بێ گیانم لێ هات وە لەسەر خۆم چووم.

کاتێ بەهۆش هاتمەوە جەنابی سید محمد أمین و مەلا حامید و وەستا جامی کە هەرسێ ئولفەتیان لەگەڵما بوو وە منیان خۆش ئەویست لە دەورم حازر بوون، هەرچیان توانی و هەرچیان زانی لەگەڵیان کردم سوودی نەبوو خوێن دوایی نەهات تا ئەنجامی وەزعم ڕووی کردە مردن، لەو کاتەیا ئەوەندە هات بە زوبانما ووتم حالم عەرزی شێخ بکەن کەسێکیان حەواڵە کرد فەرموبوی ئایەتی (مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ) [1] لەکاغەزێکا بنووسن بیکەن بە لووتیا چاك ئەبێ.

جەنابی مەلا حامید فەرموی ئەمە نابێ فەرمایشتی شێخ بێ چونکە خیلافی شەرعی ئەنوەرە مانیع بوو، چونکی خوێن پیسە.

دیسان چوونەوە خزمەتی فەرمایشتی مەلا حامیدیان عەرز کرد، خێرا حاجی شێخ أحمدی کوڕی خۆی داوا کرد وە پێی فەرموو:

أحمد حەرفی (ت) مەنقوت [2] زیاتر لە ١٠ بنووسە بیکە بە کونی لووتیا لە پاشا (توّجە)ی لێ بکە، جەنابی حاجی شێخ أحمد بە قەراری فەرمودەی حەزرەتی شێخ تەشریفی هات وە عەینی عەمەلی بەجێ هێنا دەسبەجێ خوێنەکە وەستایەوە منیش دوبارە هاتمەوە هۆش.

---

(١) سورة الحشر: ٥.

(٢) مەنقوت: یانی نوختەدار، خاوەن خاڵ مەبەست (ت)ی درێژو کراوەیە.

**کەڵك:**

حەزرەتی شێخ عوسمان سراج الدین قدّس سرّە چوار کوڕی بەناوبانگی بوە[1]، حەزرەتی شێخ محمد نازناوی بهاء الدین بوە[2]، وە کونیەی أبو البهاء بووە، حاجی شێخ عبدالرحمن[3]، کونیەی أبو الوفا بوە، حەزرەتی شێخ عمر[4]، قدّس سرّە نازناوی ضیاء الدین وە کونیەی أبو عبدالله بوە حاجی شێخ أحمد[5]، کوڕی هەرە بچووکی بووە ئینجا مەرحومی زۆر فازڵ علامەی زەمانی خۆی حاجی ملا أحمدی نۆدشی کە کوڕی حاجی ملا عبدالرحمن مفتی نۆدشی‌یە، ئەم زاتە زۆر زانا بوە هەروەك وەصفی لە چەند لایەکەوە کراوە نەك تەنیا لە کوردستاندا بەڵکو لە روبعی مەسکوندا وێنەی نەبوە لەزانایەتیدا، ئینجا ئەم زاتە لە بارەی موناقەبەی مەرحومی حەزرەتی حاجی شێخ أحمدی کوڕی حەزرەتی پیر دوو فەقەرە ئەگێڕێتەوە:

یەکەم: ئەفەرموێ لە بیارە لە مەجلیسی حەزرەتی شێخ عوسمان قدّس سرّە حازر بووم جەنابی شێخ أحمدی کوڕی کە لە دایك بوو شەو بوو، شێخ لە بەیانی ئەو شەوەدا ئەفەرموێ ئەمشەو کوڕێکمان بوە یا شێخی إرشادی زەمانی خۆی یا قوطبی إرشادی زەمانی خۆی ئەبێ.

---

(١) کوڕانی حەزرەتی شێخی سراج الدینی تەوێڵە قدّس الله أسرارهم ئەم زاتانەن:

(٢) جەنابی عالی شێخ محمد بهاء الدین لە ساڵی ١٢٥٢ لە دایکبوە، وە لە ساڵی ١٢٩٨ فەوتی فەرموە تەمەنی موبارەکی (٤٦) سال بوە.

(٣) دووەم جەنابی عالی حاجی شێخ عبدالرحمن أبو الوفا لە ساڵی ١٢٥٣ تەشریفی هاتۆتە جیهانەوە وە لە ساڵی ١٢٨٤ فەوتی فەرموە، تەمەنی موبارەکی (٣١) سال بوە.

(٤) حەزرەتی ضیاء الدین الشیخ عمر لە ساڵی ١٢٥٣ تەشریفی موبارەکی هاتۆتە دونیاوە، وە لە ساڵی ١٣١٨ متوفی بوە تەمەنی موبارەکی ٦٣ ساڵ بوە، وە نازناوی شیعری (فەوزی) بوە.

(٥) حاجی شێخ أحمد تولّدی لە ١٢٦٦ بوە، وە لە ساڵی ١٣١١ کۆچی دوایی فەرموە تەمەنی موبارەکی ٤٥ ساڵ بوە قدّس الله أسرارهم العلیّە.

جەنابی مەلا ئەحمەد لە لەفزی قوطبی وە شێخی لە شکدا بوو ئەی فەرموو نازانم حەزرەتی شێخ شێخی إرشادی فەرموو یا قوطبی إرشاد.

دووەم: فەرموی کاتێ حەزرەتی بەرێز و شەوکەت شێخ بهاء الدین قدّس سرّه عازمی سەفەری حەج بوو لە باسی ئەو سەفەرە پیرۆزەدا فەرموی: أحمدی برام خەبەری داومێ کە لەم سەفەرە بە سەلامەت ئەڕۆین و ئەگەڕێینەوە[1].

جەنابی علاّمەی نۆدشی ئەفەرموێ: ڕۆژێ لە ڕێگەدا حاجی شێخ أحمد ئەسپی غار ئەدا بەم لاو بەولادا لەدڵی خۆمدا وتم لە لایەکەوە خۆی بە خاوەن کەشف ئەزانێ، لە لایەکەوە وەك منالێ یاری ئەکات و ئەسپ غار ئەدا، فەرموی ڕووەو من تەشریفی هێناو فەرموی: بە خەتەرەکەتم زانی لە مەککەی موعوزەمە ئەمبینی وە خەتەرەکەت نامێنێ، کاتێ گەیشتینە مەکە ڕۆژێ لە نزیکی کەعبە موڕاقەبەم ئەکرد تەماشام کرد مەرحومی حاجی شێخ أحمد خەریکی تەواف کردنە چاوم کردەوە دوبارە مەشغوڵ بوومەوە دیسان دیم مەشغوڵی تەوافە کاتی سێیەم کە دیم تەواف ئەکات هەستام چووم بۆ خزمەت شێخ بهاء الدین عەرزم کرد فەرموی لە فەزڵ و کەرەمی خودا بۆ تعجّب ئەکەی؟ هەرچی بیەوێ بیکا ئەیکا[2].

**لك٦ بص ٧٥:** ڕۆژێ لە خزمەت حەزرەتی شێخدا خوا پایەی بەرزتر بفەرموێ حازر بووم وە حەزرەتی شێخیش کاتی (خۆشی) بوو بە هەلم زانی کە داوای توجّهێکی لێ بکەم دەربارەی باوکم، لەگەڵ عەرزم کرد تا ماوەیەك بێ دەنگ بوو، دوایی

---

(١) لەم سەفەرە موبارەکە حاجی شێخ أحمد هەر بۆ بەدرەقە و بەڕێ کردنی کاکی تا ماوەیە لە خزمەتیا بوە، بەلاّم حاجی ملا أحمدی نۆدشی رەفیقی سەفەر بوە، پێکەوە حەجیان کردوە لە خزمەتی حەزرەتی شێخی بهاء الدیندا.

(٢) سەفەری پیرۆزی لە ساڵی ١٢٩٠ی کۆچی دەس پێکردوە و لە ١٢٩١دا، گەڕاوەتەوە لە حەج، ماوەی سەفەری ٩ تا ١٠ مانگ بوە.

فەرموی باوکت ئەهلی عەزاب بووە، بەڵام بە هۆی ئەم تەریقەتەوە عەفوو کراوە، دیسان موڕاقیب بوەوە و سەری بەرزکردەوە وە فەرموی بەڵێ باوکت ئەهلی عەزاب بوە، بەڵام عەفویان کردوە بە هۆی ئەم تەریقەتەوە بە تەواوی نەجاتی بووە، موقارنی ئەم حاڵەتە باوکم دی لە خەوما بەم جۆرە وام زانی بوو دوو ژوور هەن یەکیان باوکمی تیایە و ئەوی تر عائید بە خۆمە و تیا دانیشتووم، لەناکاو یەکێ ووتی بڕۆ دەستی باوکت بشۆ، مەسینە و دەس شۆرم هەڵگرت رۆشتم ئاوم کرد بە دەسیا تا بە تەواوی دەستی شوشت ئەوسا بێدار بوومەوە.

**ك ٧ بص ٥٥:** جارێك لە ماڵی خۆمانەوە بۆ زیارەت هاتم بۆ خزمەت حەزرەتی پیر قدّس سرّە دایکی مناڵەکان حەوت دانە (نەبات)ی گەورەی دامێ ووتی: ئەمەم بۆ بدە خزمەتی، شەو لەو ژورەیا خەوتم کە عائید بە مەلا محمودی سنەیی بوو، وا رێکەوت شەو دڵئێشە و غازات بێ ئارامی کردم پارچەیەکم لەونەباتانە خوارد.

مەلا محمودی ناوبراو زانی نەبات ئەخۆم (ئح ئحێك)[1]ی کرد بەڵام نەم توانی بیدەمێ وە بەجەسارەتم ئەزانی لەوە زیاتر دەسکاری دیاریی ئەو بکەم.

بە رێکەوت بۆ بەیانی لە کاتی نیوەڕۆ لە قاپی خۆیاندا هەلێکم دەس کەوت نەباتەکانم پێشکەش کرد، وە عەرزم کرد قوربان جەسارەتم کرد نەباتێکم لێ خوارد، ئەویش بە زەردەخەنەو پێکەنینەوە فەرموی ئاخر رەفیقەکەشت مەیلی لێ بوو بۆچی بەشی ئەویشت نەدا وە دووبارە فەرمویەوە، عەرزم کرد لەوە زیاتر جورئەتم نەکرد تصرّف بکەم وە خەیانەت بە عەمەل بێنم نەباتەکانی وەرگرت و تەشریفی فەرمووە حەرەم.

---

(١) ئح ئح: یانی نەرمە کۆکە، وە مەبەس ئەوە بوو کە ئەزانم شت ئەخۆی بەشم بدە.

**ك٨ بص ٧٠:** ئامان الله خان[١] والی کوردستانی سنه که له تیرەی بەنی ئەردەلان بوو لەناو میری ئێراندا مەشهور بون بە شووم و بەدیومن لای پاشاکانیان، وا رێکەوت ئەم (ئامان الله خان)ە نیسبەت بە حەزرەتی شێخ عوسمان قدّس سرّه زۆر منکر و دەرحەق بە خۆی و مەنسوبانی ئەم زاتە پیرۆزە بێ ئەدەبی و شێوەی بێ عەدالەتی و کاروباریێ کە لایقی شأنی ئەم زاتە نەبوو بە چەنەها جار بەجێی هێنا، وە ئەم ئیشە نالەبارانەیان زۆر جار عەرز ئەکرد کە والی ئاوا ئەکات و ئاوا ئەڵێ، ئەم زاتە پیرۆز و پڕ فەڕەش بێجگە لە نزای خێر و تۆفیق و عاقیبەت بە خێری موسڵمانان هیچی نەئەفەرموو، تا کاتێ زاتێکی خاوەن شانس و بەختەوەر میرزا کەریم[٢] ناوێ کە کاربەدەستی میرزا محمد ڕەزای وەزیر بوو، ڕۆژێ حەزرەتی شێخ رووی کردە ئەو میرزا کەریمە، فەرمووی لە والی ئێوە شتی ئاوا و ئاوا ئەبیسم ئەیڵێ و ئەیکا، میرزا کەریم گوێ بگرە:

محمود پاشای بابان و تەبەعە و دەست و پێوەندەکەی نیسبەت بە حەزرەتی ئیمام الطریقة مولانا خالد رضي الله عنه منکر بوون جارێ ووتبویان،( شێخ ئەبێ وەك دەروێش مصطفی کۆیی بێ، کاتێ دڵی لە پاشاکانی کۆیە یەشا تایەفەی ئەوانی بە فەنا برد وە کەسی نەهێشتن هەموو بەربا بوون مولانا خالید کەی شێخە؟) ئەم قسەیان لە خزمەت حەزرەتی مەولانا گێڕایەوە.

حەزرەتی مەولانا خالید قدّس سرّه العزیز لەوەڵاما فەرموی قەسەم بە خوا شەش هەزار نەفەر مریدی وەك دەروێش مصطفی کۆییم هەیە واز بێنن با ووتبێتیان زۆری

---

(١)ئامان الله خان: پشت بە پشت ماوەی ٣٠٠ ساڵ فەرمانداری کوردستانی سنه بوون.

(٢) میرزا کەریم: ئەم پیاوە بەختەوەرە لە دوا داوای ژیانیا تەوبەی کرد وە وازی لە کارو فەرمانی دەوڵەتی هێنا لە خزمەت حەزرەتی قطبی زمان حەزرەتی سراج الدین شێخ عوسمان قدّس سرّه نیشتەجێ بوو، وە هەر لەوێش بە رەحمەتی خوا شاد بوو.

دانەر ئەفەرموێ: بیستم کە حەزرەتی شێخ فەرمووی مەلائیکەی کرام بە شەوق و سرورێکی تەواو گیانی پاکی ئەو شەخسەیان بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و بردیان.

پێ نەچوو محمود پاشا و دەس و دایەرەکەی لە پاشایەتی عەزڵ کران فێراریان کرد وە حکومەتی ئەوان بە یەکجاری لە سولەیمانی لادران.

تـا دلـی مـردی خـوا نامـد بـررد
هـیچ قـومی را خـودا رسـوا نکـرد
تـا ئـەولیای خـوا دڵیـان نەیەشـا[1]
هـیچ کـەس کلـۆڵی بـە کـۆڵ نەکێشـا

ئێمەش با بزانین چۆن ئەبێ، لە پاش ئەو فەرمایشتە نەگەیشتە دوو ساڵ ئامان اللە خان بە ئەنواعی دەرد و نەخۆشی و ئێشو ئازاری بە شیدەت گرفتار بوو، بە چەشنێ وا پزیشکان و أطبای شارەزا حەکیمانی کارامە لە چارەسەرکردنی عاجز و بێ دەسەڵات مان، هەر چەند ئەم لاولایان کرد بێ سوود بوو تا لە دنیا دەرچوو.

وە بە ماوەیەکی کەم جمیعی مومتەلەکاتی لەناوچوو، وە نەوە و کەسوکاری بە گشتی لە فەرمانڕەوایی کەوتن و نان بڕاوبوون ئیتر نەوەی بەنی ئەردەڵان پایە بەرزیان نەدییەوە پاش ئەوە کە ٣٠٠ ساڵ بوو فەرمانڕەوا بوون.

علیٌّ حمی الإسلام من قتل مرحبٍ غـداهُ اعـتلاه بالحِسامِ المهنّـد[2]

(١) ئەو هەڵبەستە فارسی‌یە بەم واتایەش ئەکرێ بە کوردی
تا دڵی ئەهلی خودا نەیەشا
بەردی بەد بەختی هیچ کەس نەیکێشا

(٢) بەکوردی ئەبێتە عەلی ئیسلامی پاراست لە حەربا، کەتیغی هیندی دا بە (مەرحەبا) (مەرحەب) یەکێکە لە پاڵەوانی جولەکەی (خەیبەر).

**ك ٩ بص ٤٧:** ماوەیە لە خزمەتیا مامەوە نانێ لەو کاتە ئەکرا لە ئاردی جۆ بوو منیش بەهۆی ئەوە مایەسیریم بوو، وە تووشی نارەسایی مەعیدە و سوء الهضم بوبوم ئاردی گەنمیان لە لایەکی تر بۆ دروست ئەکردم بە نان ئەوەم ئەخوارد (بەلام بە شێوەی ظاهیر مەعلومی خزمەت پیر نەبوو) چەند ڕۆژێ بوو هیچ فەیز و بەرەکەتی ظهوری نەدەکرد وەکو تەختەی بێ گیان و یەخی سارد و بەرد کەوتبووم، ڕۆژێ حەزرەتی شێخ لە ماڵ هاتە دەرەوە منی دی ڕووی کردە شەخسێ تر فەرموی: ئەڵبەتە مورید ئەبێ طەعامی ماڵی ئێمە بخوات وە هیچ جۆرە طعامێ تر قبول نەکا چونکە ئێمە سرێکمان (نھێنی) لە طەعامی خۆماندا دەرج کردوە (یانی سرێکی خوایی لە طعامی ئێمەدا شاراوەتەوە)[١]، لە پاش نەختێ بەتوندییەوە بۆی ڕوانیم حاڵەتم تێکچوو ئەوسا بەخۆشی و گەرمی بە شەوق و سرور گۆڕا وە بەرەو چاکی حاڵ وەزعم گۆڕا، بە دوای ئەوەدا زۆری پێ نەچوو یەك دیزە[٢]، خواردن لە ماڵی حەزرەتی شێخەوە هاتە دەرەوە کە بریتی بوو لەنیسك و نۆکی کوڵاو سەبرم نەگرت تا پیاوێ کە لەگەڵم بوو بچێ بۆم بێنێ خۆم قاپێکم[٣]، برد بە ئارەزوویەکی[٤]، تەواو و مەیلێکی زۆرەوە رام کرد و بەشی خۆم وەرگرت، لە پاش ئەوە بە هەزار منەتەوە نانی جۆی ئەوێم ئەخوارد هیچ تووشی زەرەر و زیانیش نەدەبوم.

| | |
|---|---|
| نفس نتوان کشت إلاّ ظلّ پیر | دامن آن نفس کش را سخت گیر |
| نەفس کوژ تەنیا هەر سایەی پیرە | داوێنی بگرە، نەفست ئەسیرە |

(١) پێغەمبەری موبارەك ﷺ: (طعام البخيل داءٌ وطعام السّخي شفاءٌ) یانی: خواردنی کەسێ کە پیسکە بێ دەردە، وە خواردنی کەسێ کە دەست گوشاد و سەخی بێ شفایە.

(٢) دیزە: مەنجەڵی گڵین.

(٣)قاپ: ظرف.

(٤) ئارەزوو: ئیشتیها.

**ك١٠ بص٥٣:** جارێ شەخصێ هات هاوار و دادێکی زۆری کرد ووتی قوربان دەخیل هەر چیم بوو دز بردی فەرموی چی بردوی هەر گوێ درێژێکی بردوی کە هەر پێنج قران ئەژیا شەخسەکە ووتی قوربان ڕاست ئەفەرموی بەڵام هەموو کاروبارم بەو وولاغە دروست ئەبوو کاروانم ئەکرد باراشم پێ ئەهاڕی دارم پێ ئەهێنا کاروبارم هەموو بەوە تێ ئەپەڕاند، بە کورتی زۆر زۆر لە کارکەوتویی و عاجزی خۆی دەرخست حەزرەتی شێخ زۆر بەزەیی پیا هات فەرمووی بڕۆرەوە سێ ڕۆژی تر ئەی دۆزیتەوە هەروا بوو کە فەرمووی.

**ك١١ بص٦٥:** جارێکی تر دڵ تەنگی و پەستی و قبوزیەتێکی زۆر روی تێ کردم وە ماوەیە زۆر دەوامی کرد بەجورێ ووتم کە هیچ نیسبەت و فەیضێ ڕوی تێ نەئەکردم، جارجار خەطەرەم ئەکرد و ئەموت کە هەروا وەزعم بڕوا وا چاکە بچمە ماڵە کاولەکەی خۆم، عەسرێ تەماشام کرد ئیزدحام و قەرەباڵخییە زۆر بە دانیشتن و وەستان لە خزمەتیان، منیش بەو حاڵە پڕ لە تەنگەڵانیەوە نزیك بوومەوە و بە پێوە وەستام لە دورەوە چاوم لێکنا لەو خەتەرە و ناڕەحەتی‌یەی خۆم دابووم لە پڕ نیسبەتێ لە حەزرەتی پیرەوە بۆم هات وە هەر شەش لای گرتم بەڵام بە چەشنێ هەموو ئەندامیان وەك بە مێخ بە ئەرزا داکوتابێم وەها سینەم قورس و گران و دڵم توند و سامناك بوو خەریك بوو جمگە و دەمارەکانم لەت لەت هەموو هەڵ وەرێ، هەرچەند هەوڵمدا قاچێ لە جێگەی خۆم حەرەکەت پێ بکەم نەمتوانی پێیەك بەرەو پێش بڕۆم، جارجار ئەمڕوانی بزانم بۆم ئەڕوانی نەخەیر هەر لەگەڵ ئەهلی مەجلیس لە گفتوگۆدا بوو، لە ڕۆژئاوادا مجلیس چۆڵ بوو من هەر بەو حاڵەوە لە جێی خۆمدا بە پێوە مامەوە تا بانگی ئێوارەیان فەرموو دوو سێ نەفەر لە خەلیفەکانی حەزرەتی شێخ کە بە حاڵیان زانیم هاتن و هێنامیانەوە هۆش و بردمیان بۆ جەماعەت، ئەلحەق نوێژێکم کرد لەگەڵ حضوردا وەك ئاگر داگیرسابووم، پاش ئەوە ئەو سەنگینی‌یە تا چەند

ڕۆژ هەر ما هەر ئەو شەوە لە واقیعەدا دیم نورێ وەك ئاگر زۆر روناك و بێ دووکەڵ شەوقی ئەدا و هەڵ گیرسابوو، وە پێنج شەش جانەوەر[1]، لە وێنەی بێچوە پشیلە خۆیان خستە ناو نوورەکە پاش ماوەیە ئەوانیش لەگەڵ نورەکە هاوڕەنگ بوون، بۆ بەیانی کە بە هۆش هاتم بەسط و فەرەحیەکی زۆر بە غایەت گەورەم هەبوو وەزعم وای لێ هات تا ماوەی یەك مانگ هەر دەوامی کرد، وە لەو ماوەدا ئەحوالاتی عەجایب و سەیر بۆی دەست ئەدام و شتی غەریب ئەبینرا، بۆ نمونە پەلەوەر و باڵندە بەلایاندا دەچوم نە ئەڕۆیشتن وە مردوان لەگەڵما قسەیان ئەکرد وە بە گوێ دەنگی ئەوانم دەرك ئەکرد هەر کات چاوم لەیەك بنایە بە خزمەت حەزرەتی شێخ ئەگەیشتم، وە هەر موشکیلە و ناڕەحەتییەکم ببوایە عەرزم ئەکرد و جوابم وەرئەگرت[2].

**ك ١٢ بص٦٧**: وە هەروەها کاتێ تر ڕۆژی جمعە بوو لە مزگەوتا بەڕیز دانیشتبووین لە پڕ واردێ هات دای بە دڵما بە چەشنێ هەرچی رەگ لە وجودما هەیە کەوتە حەرەکە و جولان و لەرزە و هاتوچۆ وەك سەعات هەموو گیانم لە جووڵە و حەرەکە دابوو، بە بەشێکی زۆر گەورەوە و لەزەتێکی خۆشەوە هەستامەوە سەرپێ، لەو کاتە حەزرەتی شێخ لە قاپی مزگەوت هاتە ژوورەوە تێگەشتم کە ئەم واردە لەوەوە هات خۆمدا بەسەر قاچیا بە نەرم و نیان و تواضعەوە فەرموی بۆ وا ئەکەی؟ بەلام حاڵەتێکم بۆ پەیدا بوو شەوق و زەوقێ ڕووی تێ کردم غافلانی بێخەبەر ئەبێ

(١) جانەوەر: دەعبا.

(٢) کەسێ کە نەختێ نەختی بەختی بێ وەختێ لە پڕا نەمێنێ دیار
کەی بەختیارە کاکە بەختیار ئەوەیە دەستی گەیی بێ بە یار
چ یار ئەو یارە یارێ بێ دیار یارمەتی دەربێ بۆ هەر دو دیار

چی لێ بزانن و یا من به چه زوبانێ تقریری بکەم وە چۆن بۆ کەسی بەیان بکەم: ئەم هەڵبەستەی مجنون بۆ ئەم جێگە مناسبە:

ربّ ورقاءٍ هتوف بالحمی ذات شجو صرخت في فنن
ولقد أشكو فما أفهمها ولقد تشكو فما تفهمني
غير أنّي بالجوی أعرفها وهي أيضاً بالهوی تعرفني
ذكرت ألفا ودهراً صالحاً فبكت شجواً وهاجت شجني
فبكائي ربّما أرقها وبكاها ربّما أرقني [1]

کۆتر ئەیان ووت بە ناڵە و گەرمی لەسەر چلانا بە خەم بە نەرمی
شکاتم ئەکەرد نەیان ئەزانی شکاتیان ئەکرد لێم نە ئەفامی
تەنیا بە گڕی دەڕوون ئەم زانی ئەوانیش هەروا لە من بە گەرمی
کاتی ئولفەتیان بە زاری ئەووت ئەیان هێنامە ڕیزی ماتەمی
زاریم ئەوانی دڵ نازك ئەکرد زاری ئەوانیش ئەی خستمە خەمی

**ك ١٣ بص ٦٨:** جاریٚ بۆ زیارەتی ئەو مورشیدە عظیمە وە ئەو زاتە کەریمە بەرەو هەورامان لەگەڵ چوار پێنجێکا ئەڕۆیشتین گەیشتینە ملەیەك[2]، نۆ نەفەر ڕێگرمان[3] بەدی کرد کە نزیك بووینەوە لێیان و لەیەك ئاشکرا بووین دوان لەوانە

---

(١) ورقاء: حمامە: کۆتر، هتوف: ئاواز، شجو: خەم، صرخ: هاوار، فنن: لقی درەختەکان، جوی: گڕی دەرون و شەوق و زەوق ، هوی: عەشق، هاجت: ڕووتێکردن بە شیدەت، ألف: ئولفەتی گرت، أرق: دڵ نازکی ، حمی: حاڵەتی گەرمی.

(٢) مله: بەینی دوو گرد، وە یا کێوێکی پچکۆلەیە لەناوەڕاستی سەر گردەکە تەختێ یەکی بێ یا ناوەڕاستی ئەم بەرەو بەری بەرزایی یەکی کەمی بێ.

(٣) ڕێگر: چەتە، قطاع الطریق.

هاتنه پێشەوە ووتیان چیتان پێیە داینێن و بڕۆن، منیش بە شێوەی پاڕانەوە و تکا پێم ووتن نە بازرگانین نـە تجـار بـەڵکو دەروێشـین و ڕێبـوارین وازمـان لـێ بێنن و ڕۆزی خۆتان لە خوا داوابکەن، ئەو دوانە لە شوێنی خۆیان وەستان، ئەوی تر بە تونـدی و تیژی و تووڕەیی‌یەوە وەك تیر لە کەوان دەرچێ ڕووبەڕوومان هات بە جوێن و قسـەی سووکەوە ووتی تا من ئەگەم زۆر زوو ڕووت بنـەوە کەلوپـەل و ئەسـبابتان دانـێن ١٥ مەتری مابوو پێمـان بگـات، هـیچ چارەم نـەدی بێجگـە لـەوە ڕووم کـردە مەڵبەنـدی پیری دەسگیر و هاوارم کرد یا شێخ عوسمان فریامان کەوە بمانگەرێ.

بمـان گەیـە ئـەی دۆسـتی حـەق نـــەجاتمان دە لـــە دەس چـــەتە
دڵمـــان بـــە دەســـتی ناکەســـان خوێنینـــە ســـینە لـــەت لەتـــە

أشهدُ باللّه سبحانه لەگەڵ ئەم فەریادە هاوارە کرا دزی شەریر جەردەی شـەریر لە جێگەی خـۆی ووشـك و مەحتـەل ما بە تـەواوی لـە جموجـووڵ کـەوت و زمـان درێژی نەما و ڕەنگی زەرد بوو هەیئەتی گـۆڕا دەمی بە یـەکا چەسـپی وەك بـە دەرزی دوو لێوانیان دروویێ، بەڵکوو وای لـێ هـات وەك شـێرێ هەڵمـەتی بـۆ بـردبێ ئەصـلا نەیتوانی بەرەو ئێمە بێ نەیتوانی بـەرەو پـاش بڕوا وەك داکـوترابێ بـە ئـەرزا بـەڵام ئـەم دوانـەی تـر کـە ئـەویان بـەو جـۆرە دی ئێمـەیان بـەجێ هێشـت و ڕۆیشـتن و زۆریش مەعزەرەتیان کرد و داوای لێ بووردنیان لێ کـردین ئێمـەش ڕازی بـووین، ماوەیـە زۆر ڕۆیشتین ئاوڕمان دایەوە تەماشامان کرد ئەو دزە بەد بەختـە دڵ شـکاوە هـەر لـە جێـی خۆی وەستاوە ئەبەدا بە رو داوی‌یەکی نەکردوە.

ئەی برا کەی هەیبەتی خەڵقە ئەمە بێگومان بە دەهشەتی حەقە ئەمە

**ك ١٤ بص١٤٠:** ڕۆژێ لە بەیانیدا تەواوی خولەفا و مرید و مەنسوبینی خۆی داوا ئەفەرموێ پێیان ئەڵێ ئەمشەو لەگەڵ گرۆهی جنّ وشیاطین عهد و پەیمانمان بەستوە و شەرتیان کردوە کە هەرگیز زەرەر و زیان نەگەیەنن بە مرید و منسوب و ئەوانەی پەیوەندیان بە ئێمەوە هەیە وە بە نیازی ئەزیەت نزیکیان نەکەون.

وە من ئەم باسەم لە جەنابی زۆر بەڕێز و بەنرخ مەلا حامید[١] بیست.

**ك ١٥ بص١٤٣:** ڕۆژێ ئەم زاتە عظیمە بۆ جەنابی مەلا عەزیزی نەوسودی فەرمایشتی ئەفەرموو: پێی فەرموو پێنج گوناح هەیە هەر کەس (یەکێ لەو پێنج گوناهە بکات خەتێ لە سنگی ئەو کەسەیا ئەنووسرێ، ئەگەر تۆبە بکات بە محضی فەضل مەحوی ئەفەرمون، مەلا عزیز عەرزی کرد ئەو خەطە هەر ئەم خەتەیە فەرموی نەخێر نەوعێکی ترە) هەر کەس بێ ئەو خەتەی ئەخوێنمەوە بە قەرینەی ئەو خەتە ئەزانم ئەو گوناهەی کردوە.

**ك ١٦ بص١٤٣:** ئەم زاتە عالی جەناب و پڕ قەدرە ئەی فەرموو بۆ هەر نوێژێ کە هەڵ ئەسمە سەر پێ تا بە خزمەتی حەزرەتی رسول الله ﷺ نەگەم نیەتی نوێژەکە نایەنم، وە هەر کاتێ کە بموێ بە خزمەت ئەو سەروەری دین و دنیایە ئەگەم وە هەر مەبەستێکم بێ عەرزی ئەکەم وە لەو حەزرەتە سەڵەواتی خوای لەسەر بێ جواب

---

(١) جەنابی بەڕێز خوا لێ خۆشبوو مەلا حامید بە مەلا حامیدی گەورە بە ناوبانگ بووە وە ئەو زاتە عالم بوە وە زاتێ فاضل و محترم و کاتب الأسراری حەزرەتی شێخ عوسمانی سراج الدین بوە، وە ئەو زاتە کتێبێکی لە موناقەباتی حضرەتی شێخدا هەیە بە ناوی (ریاض المشتاقین)ەوە. (وەرگێڕ)

وەرئەگرم نەك بە غایبی یا بەخەو بەڵكو ئا بەم بێدارییە[1] ، هەر كەس باوەڕ ئەكات باشە باوەڕ ناكات خۆی ئەزانێ.

لە كاتێ ترا ڕووی كردە جەنابی شێخ زادەكان حەزرەتی شێخ بهاء الدین و حاجی شێخ عبدالرحمن فەرموی تا ئەتوانن قربەت و نزیكی لە خوای تعالی بكەن من كەمێ نزیكم كرد ئەمەم دەس كەوت كە ئەی بینن ئەگەر تقرّب بە خودای تعالی بكەن بە مراتبی أعلی وعظمی ئەگەن.

ألا إنّما الدّنیا كمنزل راكبٍ أناخَ عشیّاً وهو في الصّبح راحلُ

(ربّنا آتنا من لدنك رحمةً وهيئ لنا من أمرنا رشداً) آمین.

**ك ١٧ بص١١٥:** ڕۆژێ ئەم هەژاری داماوە كاغەزێكم بە نیاز و تواضع و دڵشكاوی نووسی و ناوەڕۆكی نوسراوەكە ئەمە بوو هیوادار و چاوەڕانم كە لە دنیا و ئاخیرەتدا كەمترین خزمەتكاری قاپی خۆتە دەسگیری بفەرمووی وە چاودێری و محافظەم بفەرموی وە لە كاتی تەنگی و نارەحەتیدا فریاد رەسیم بكەی وە لە هەموو كاتا بە هاوارمەوە بێ و رزگاریم بفەرمووی كاتێ دامە خزمەتی مطالعەی فەرموو تەماشای پشتی كاغەزەكەی كرد فەرمووی بۆچی مۆرت نەكردوە عەرزیم كرد كە لە وولاتی ئێمەدا عادەت وایە كە نامە خاوەنەكەی تەسلیمی بكا ئیمزا ناكرێ، جارێكی

---

(١) زۆر لە ئەولیاء الله لە حالّی هۆش و ئاگاداریدا هەروا بە ظاهیر بە خزمەت گەورەی پێغەمبەران رسول الله ﷺ گەیشتون، حەتتا یەكێ لەو گەورە گەورانە فەرمویەتی ئەگەر یەك لەحزە حەزرەتی رسول الله لەبەر چاوم نەبێ خۆم بە موسڵمان نازانم، وە شێخی ابن حجر علیه الرحمه لە فەتاوای حدیثی یە ص ٢١٦ ئەفەرموی لە جوابی پرسیارێكا، بەڵێ پێغەمبەر ﷺ بە ئاشكرا دەبینرێ، تەنانەت ئەفەرموێ جارێ واعیزێ وەعزی دەكرد حدیسێكی خوندەوە یەكێ لە چاكانی فەرموی ئەمە حدیث نیە وتی چۆن ئەزانی وتی پێغەمبەر ﷺ بەسەرتەوە وەستاوە ئەفەرموی ئەمە قسەی من نیە ئینجا توجّهی كرد واعیزەكەش بە زیارەتی شەرەف دار بوو.

تـر خوێندیـەوە و ماوەیـە مراقـب[1] بـوو ئـەنجا سـەری هـەڵبڕی فـەرمووی هەرچـیت نوسیوە و داوات کردوە إن شاء الله هەر وا ئەبێ، وە لە روی هەیبەتەوە فەرموی مـن لەوانـە نـیم هەرکـەس بێـت بـۆ لام بڵـێم بـڕۆ خـوا بـت بەخشـێ، بـەڵکو هەرکـەس مەنسوبم بێ سبەی تا لەگەڵ خۆما نەیبەم ناڕۆم دیسان سـەری موبـارەکی بـە مراقبـە[2] برد و سەری بڵند کردەوە فەرمووی: بەڵێ هەر وایە کە ووتوومە وە ئەڵێم مـن لەوانـە نیم هەرکەس بێتە لام بڵێم بڕۆ خوا عەفوت بکات بەڵکو هەرکەس مەنسووبم بێت تـا ئەویش بەیانی لەگەڵ خۆمدا نەبەم ناڕۆم.

دوشم نوید داد و بشارت که حافظا      بازاکه من بعفو گناهت ضمان شدم

دوێنێ بـە مژدە فـەرمووی حـافظ مـنم پـەناهت

وەرە کە مـن کـەفیلی عـەفوی هـەموو گوناهـت

**ك ١٨ بص١١٦:** جـارێکی تـر عـەرزم کـرد قوربـان دایکـی منالـەکان هـەر بـەم هەیئەتو شێوەیە لە رابیطەدا بە خزمەت پیر ئـەگات فـەرموی بـە تـەنیام ئـەبینێ عـەرزم کرد بەڵێ فەرموی من تەنیا نیم بەڵکو لەشکرێکم وە ئەوەی کە مریدم هەیـە لـە خـۆر هەڵات تـا خـۆر ئـاوا هـەر یـەکێکیان یـەك میثـالـی خـۆمم لەگـەڵ خسـتوە و هەمیشـە هاوڕێیەتی هەر کردەوەیەکی چاك یا خـراپ بکـات ئـەیزانم وە هـەموو ڕۆژ چـەن جـار خۆیشم ئەیبینم وە بە تەواوی ئەفعال و ئـەعمالی ئاگـادار ئـەبم و پێی ئـەزانم جـا ئایـا ئەو مریدە خۆی پێی بزانێ یان نەزانێ.

---

(١) **مراقب:** مونتزیری فەتحی دەروازەی مەطلوب.

(٢) **مراقبة:** چاوەڕوانی و إنتزاری بۆ کردنەوە گشاد بوونی قاپی مەبەس

ئەم دنیا هەروەك وشتر سوارێ، ڕێبوارێ شەوێ لە جێیە لادا

بەیانی هەستا سوار بێ نەوەستێ، بۆ ڕۆین چاکی بکا بەلادا

**ك ١٩ بص١١٧:** خولەفا و مریدان لە زەمانی حەزرەتی سراج الدین قدّس سرّە و نوّر الله ضریحەوە ئەیان ووت حەزرەتی شێخ ئەفەرموێ هەرکەسێ بە إخلاصی کامل بێت و من ببینێت ڕۆژی قیامەت بەبێ حساب تێ پەڕی پێ ئەکەن من بەم فەرمایشتە عقیدە و باوەڕم بوو بەلاّم ئەم ویست بۆ دڵنیایی[1]، خۆم لە حەزرەتی پیر ببیستم کاتێ فرسەتم هێنا کەس لە خزمەتیا نەبو عەرزم کرد بەشاراتێکی غەیبی بەعزێ لە رموزی کنوزی لا رەیبی کە بەم مەعنایە بۆم بەیان کراوە ئایا فەرمایشتی حەزرەتی شێخە فەرموی بەڵێ هەرکەس بە ئیخلاصی کاملەوە بێ، خەبەریان داوەمەتێ کە بەبێ حساب و لێ پرسینەوە بە مەحضی فەضل لە قیامەتدا تێ پەڕی پێ ئەکەن لە پاشا شەرحی داو فەرمووی ئەم حاڵەتە بۆ من واقیع بووە بۆ شاە مظهری بوخارایی شاە واقیع بوە بەلاّم ئەو رەحمەتی خوای لێ بێ ئەو مژدەیەی بلاّونەکردۆتەوە تا کاتی نەخۆشی کۆچکردنی لە دنیا، ئەو کاتە نزیکانی بارەگای حزوری بانگ کردوە و پێ فەرموون لە پاش مردنی من کە کفن کرام ڕووم با بە دەرەوە بێ وە هەموو ئەهلی بوخارا خەبەردار بکەن بێن ڕوی من ببینن ئەوجا بە خاکم بسپێرن لەبەر ئەوەی خەبەرێ وایان داومێ تا ئێستە مژدەم بە کەس نەداوە ئێستا خەبەرتان ئەدەمێ ئەمجار حەزرەتی شێخ فەرمووی: بەلاّم چونکە ئەمەیان بە مەحزی فەضل داومێ، پێیان ووتوم بە خەڵکی بگەیەنە شەرم مەکە منیش ووتومە و ئەیڵێم هەرکەس باوەڕ ئەکا بیکا هەرکەس باوەڕ ناکا خۆی ئەزانێ (وما علی الرّسول إلاّ البلاغ)[2].

---

(١) دڵ نیانی: إطمئنان قلبي

بەشاراتی غەیبی: مزگێنی خوایی.

رموزی کنوزی لارەیبی: هێمای گەنجینەی بێ گومانی.

(٢) لێرەدا حەز ئەکەم چەند شتێ هەیە عەرزتان بکرێ:

شەخسی وا هەیە کە تەماشای ئەم کتێبە بکا وە ئەم جۆرە شتانە ببینێ متحیّر و عەجایب ئەمینێ کە چۆن شتی وا ئەبێ، هیچ جێگەی سەرسووڕمان نیە چە بە عەقڵ و چە بە نەقل.

نەقڵ جاریْ هەر زۆرە إنّ المتقین فی جنّات ونهر فی مقعد صدقٍ عند ملیك مقتدر یا ئایەتی والسابقوت السابقون أولئك المقرّبون عەجەبا کەسیْ مەقامی مەقعەدی صیدق بیْ وە خوا خۆی عیندیەتی لای مەلیکی بۆ ثابت کردبیْ و وەصفی ئەو مەلیکەی بە موقتەدیر و زۆر بە دەسەلاّتدار کردبیْ.

بەلاّم هیچ قسەیەکی لیْ وەرنەگیریْ وە تەبەعە و عەلاقەمەندی ئەو شەخسە لەگەلْ باقی ئەشخاصی تردا جیاوازی نەبیْ وە خۆیشی سوودی بۆ کەس نەبیْ، ئیتر نازانم ئەم پایە بلندی و عیزەتە وە ئەم تقرّب و نزیکییە کەلْکی چی بوو، وە بە کاری چی هات؟؟؟

هەر تەنیا وەکوو هەموو خەلْکی تر نان و ئاو و تریْ و هەناری بەهەشت بخوا ئەم خاوەنی عەقلی سەلیم و مرۆڤی زانا و تیْگەیشتوو شتی وا قبولْ ناکات.

هەر لە دنیادا ئەبینین ئەگەر پیاویْ بە ئەمیریْ یا وەزیریْ یا زانایە یا دەسەلاّتدار و داراییەکەوە پەیوەندی بیْ بە گویْرەی هیْزی ئەو پەیوەندییە، بە پیْی قوەت و دەسەلاّتی ئەو پیاوە گەورە، زاتە خاوەن عەلامە کە ئیشی خۆی و خەلْکی بۆ ئەکریْت، هەم ئەتوانیْ زەرەر و بەلا لە خەلْك بگیْریْتەوە وە هەم سوود بە خەلْك بگەیەنیْ جا مەگەر بگاتە سنوریْ ئەو گەورە لە چوار چیْوەی دەسەلاّتی دەرچیْ و لە توانایدا نەبیْ، بەلاّم خۆ خوا ئەو مەلیکەیە کە هیچ شتیْ لە دەسەلاّتی ئەو نە لە دنیادا نە لە ئاخیرەتدا دەرناچیْ، هەروەك وەصفی مەلیکایەتی‌یەکەی خۆی بە مقتدر ئەکات وە ئەفەرمویْ عند ملیكٍ مقتدر یانی لە خزمەت پادشای خاوەن دەسەلاّتدا، وە ئەمە ستایشیْ وە مەدحیْ گەورەیە بۆ ئەو متقی و خواناسانەی کە خوای تەعالا مەکانەت و مەنزیلەتیان بە عیندیەتی پادشای دەسەلاّت و خاوەن تصرّف وەصف دەکات، ئەگەر کەسیْ بلْیْ ئەمە بۆ قیامەتە لە وەلاّمدا ئەلْیین ئەم مەرتەبەی لە کویْ چنگ کەوت؟ دیارە لە دنیادا چنگیان کەوت، خوا لە دنیایش و لە قیامەتیشا ڕیْزمان لیْ ئەگریْ (ولله الآخرة والأولی) خوا خوای دنیا و قیامەتە، لە حەدیثا ثابتە کە بۆ بەعزیْ لە ئوممەتی خۆی خوای تەعالا بە قەدەر مەڕ و بزنی طایفەی ڕەبیعە و موضەر لە گوناهبارانی ئوممەتی پیْغەمبەری پیْ ئەبەخشیْ ﷺ.

وە لە ئاثاری ئەم جۆرە بەسەرهاتە زۆرە: ئاثاری بە کردار یا ووتاری جەماعەت و کۆمەلْیْ یا کەسیْ ئەبیْزریْ لە گەورە گەورە و باوەڕ پیْ کراوانی ئاینی خوا لیْیان خۆشنوود بیْ وەك لە تەفسیری روح البیاندا ئەگیْریْتەوە سلطان محمود ئەچیْ بۆ دیدەنی و زیارەتی شیْخ أبو الحسن خەرقانی قدّس سرّه لە نیْوان گفتوگۆدا ئەپرسیْ لە شیْخ کە ئایا مەکانەت و پایەی بایەزیدی بەسطامی قدّس سرّه تا چە ئەندازەیە بوو؟ شیْخ أبو الحسن لە جوابا ئەفەرمویْ بایەزید زانیْ وابوە هەرکەسیْ ماوەیە زۆر کەم ڕەفیقی کرد بیْ بە سەعادەت و کامەرانی تا سەر و ئەبەدی گەیشتوە، سولْتانیش ئەلْیْ بۆچی مەگەر شیْخ بایەزید بەسطامی لە پیْغەمبەر ﷺ گەرورەترە، ئەو هەموو کافرانی مەکە و مەدینە ڕەفاقەتیان کرد و چاویان پیْ کەوت و هیچ جۆرە سەعادەت و بەختەوەری‌یەکیان دەست نەکەوت، لە وەلاّما شیْخ فەرمووی ئاخر ئەوان

ڕەفیقی محمد رسول الله یان نەکرد ڕەفاقەتی محمدی کوڕی عبدالله یان کرد، ئەگەر هاوڕێی محمد رسول الله یان بکردایە بە سەعادەت ئەگەیشتن، بەڵام أصحابی کرام علیهم الرحمة والرضوان چونکو ڕەفیقی محمد رسول الله بوون بە پایە گەیشتن لە پاش پێغەمبەران (علی نبیّنا وعلیهم الصلاة والسلام) هیچ کەس نیە هاوتایی‌یان بکا، وە بە سەعادەت و بەختیاری‌یەکی وا گەیشتن هیچ تیرە و تایفەیەکی تر نەبوە و نابێتەوە هاوشانیان بێ.

وە هەروەها حەزرەتی ئیمامی ڕەبانی ئەفەرموێ: حەتا حەزرەتی حەمزە کە مامی پێغەمبەر ﷺ بووە ڕەزای خوای لێ بێ وە خۆشەویستی ئەو حەزرەتە بووە، وەحشی کە قاتلی ئەو بوو بە مەحزی ئەوە ئیسلام بوو، وە بە خزمەت حەزرەتی رسول الله ﷺ شاد بوو پایەی لە ڕەئیسی تابعین و حەزرەتی وەیسی قەرەنی (علیه الرحمة) بەرزتر بوە، وە إجماعی ئوممەت لەسەر ئەوەیە أصحاب (رضوان الله عیلهم أجمعین) لە غەیری ئەنبیا ئەفضلی ئوممەتن وە وەحشیش یەکێ بوە لە أصحابی پێغەمبەر ﷺ.

ئەنجا کە کەسێکیش هاوڕێی بایەزیدی بەم باوەڕەوە کردبێ کە ئەم زاتە یەکێکە لە محبوبان و مجذوبانی إلهي وە یەکێکە لە بحّارانی دەریای مەعانی زاتێکە عارف بە ئەسرار وە یەکێکە لە علمای ربانی ئەوە بە پایەی سەعادەت گەیشتووە، وە کەسێ کەوای زانیبێ بایەزید شەخصێکە هیچ جیاوازی‌یەکی لە باقی کەسان و خەڵکانی تردا نیە، وە یا خوا نەخواستە بە شەخصێکی دەس بڕو نالەباری زانی بێ، ئەوە زیاد لەو هیچ إستفادەی لێ نەکرد بێ مومکینە وە ئەگونجێ تووشی زیانی گەورەش بووبێ نعوذ بالله من الأنکار ومن معادات الأولیاء.

ئایا ئەم حەدیثە قدسی‌یە ئەوەی کە بە خزمەتی گەیشتبێ یا بیستبێتی شایەت نیە لەسەر ئەوە کە خودای تعالی ئەولیای خۆی زۆر خۆش ئەوێ وە بەبێ ئەوە ئەوان نیازی ئەزیەتی دوشمنانی خۆمان بکەن خودا خۆی ناوی خۆی بە محارب ناو ئەبا وە بە وەصفی محارەبە و بەشەڕ هاتن لەسەریان هەڵ ئەداتێ وەکوو ئەفەرموێ (من عادى لي وليّاً فقد آذنتُهُ بالحرب) یانی کەسێ دوژمنایەتی وەلی‌یەك بکا کە وەلی من بێ بەڕاستی ئیعلانی حەربی لەگەڵدا دەدەم، پەنا ئەگرم بە خوای تعالی لەبەر بەرەکانە و شەڕکردن و ئینکاری ئەولیای خودا.

وە هەروەها ئادەمیزاد بە نەزەری إعتبار بیر بکاتەوە و زۆر بە ووردی لێکی بداتەوە، لە دەورەی (تابعین)ەوە تا ئێستا زانایانی زۆر گەورە و خاوەن ڕێز مەگەر زۆر بە دەگمەن ڕێکەوتبێ وەرنا هەموو پەیوەندیان بە عارفان و أولیاء الله وە بوە هەتا پێشەوا و ئیمام فخر الدینی ڕازی خوا لێی بێ ڕازی وەك خۆی مشهورە داخلی زومرەی منتسبین نەبوە بۆ کەسبی طریق بەڵام عقیدە و بڕوای پێیان بوە، لە کاتی خۆیدا چۆتە خزمەت شێخی فاضل جەنابی شێخ نجم الدین کبری ڕەئیسی طەریقەی کوبرەوی قدّس سرّە داوای فەرموە کە داخڵ بە طریقەتی شێخ ببێ فەرمویەتی تحملی ناکەیت ئیمام ئیلحاح ئەکات و زۆر

لەسەر باسەکە گەرم ئەبێ تعلیمی ذکری طریقەی ئەکات وە متوجّهی ئەبێ سەلبی هەموو علومی لێ ئەکات دەستبەجێ ئیمام ئەفەرمووێ تحمّلی ناکەم، بە کورتی عولەما و زانایانی ئیسلام بە عیلمی تصوّف زۆر معجب و مسرور بون وە هەموو مدحیان کردوە، وە إعترافیان فەرموە و دانیان ناوە بە گەورەیی و پایە بەرزی و هەڵگری ئەو عیلمە.

وەك ئیمامی شافیعی و ئیمام أحمدی حەنبەلی وەك ئیمامی غەزالی، وە هەروەها دێتە خوارەوە. زانایان و عولەمایان کەسیان منکیر و دژی طریقەت و تصوّف نەبوون، تەنیا ئەوەی مشهور بێ ابن تیمیە ئەویش إنکاری تصوّف ناکات تەنیا ئەوەی توسّلی لەلا نیە وە هەر عیبادەت ئەکا بە وەسیلە.

ئەنجا ئەگەر کەسێ هات مونکیری ئەحواڵی ئەولیا بێ وە یا نەفی مەقاماتی ئەهلی تصوّف بکا زیاد لەوە کە بێ بەهرە ئەبێ لە بەرەکاتیان العیاذ بالله تکذیبی أئمە و عولەما و زانایانی ئیسلام و مشایخانی ئەکات ئەبێ بڵێ حەزرەتی غەوثی گەیلانی یا شێخ جونەیدی بغدادی یا ئیمامی غەزالی یا ئیمامی شەعرانی و ئیمامی ربّانی و نموونەی ئەم بزورگەوران و پیاوە گەورانە بە سەدان و هەزاران کە لە جیهانی ئیسلامدا بوون وە بە هەزاران زانا و بەرز و پیاو ماقوڵ و ژێر سەر بەم زاتانە بوون و سەری إطاعە و مل کەچییان بۆ دانەواندون، راستیان نەکردوە بە هەڵەیا چوون ئەوەی لە دژیان بێ و بەربەرەکانییان بکا جا بێ تەماشای ئەم نەفامی و قوڕ بەسەری و شەناعەتە بکە بۆ کابرای نەزان و پەست بەم بازارە راستەقینەیە.

ئەگەر راستی‌یەکی گرنگ و حەقیقەتێکی نەبێ پیاوی وەك ئیمامی غەزالی خوا لێی خۆشنوود بێ لە کاتێکا کە عالەمی ئیسلام ئاتاج بە زانستی و زانیاری ئەو بون لە قوتابخانەی نظامیە یەکەم پایە بەرزی عولەما لە (دار الخلافة)دا خۆی بوو، وە هەردەم هاتوچۆی ئەو زاتە لە سنورێکا بووە بۆ کەم کەس لە عولەما دەسی داوە بە خزمەتی بگا لە قەرەباڵخی جمعیەت و گرۆی عولەمایان.

ئەم زانایە هەستا ئەو لێپرسراوی ئەرکەی خستە لاوە بۆ کەسبی ئەم عیلمە کاتێ کە بەو بەهرەیە گەیشت فەرمووی تا ئێستە ئەو عومرەمان بە ضایع چوو.

زاتی وەك حەزرەتی مولانا خالد قدّس سرّه بەو هەموو عیلمەوە ئەگەر پایەیەکی بەرز لەو عیلمەدا نەبینێتەوە رەوایە تەرکی ماڵ و مناڵ بکات بەبێ ئوتومبێل و فڕۆکە بە وولاغ یا بە پێ بەرەو دهلی هیندستان لە رێی کابل و غەزنەین قەندەهارەوە، وە بە چەندەها ڕێگەی ترسناك و پڕ خەتەر و چۆڵەوانی و دوور لە ئاوەدانی بڕوا وە لەوێ دەس بکا بە ئاوکێشان بۆ خانەقای حەزرەتی شێخ عبدالله دهلی قدّس سرّه، وە بە ئەنواعی ریازەت و کەم خەوی و کەم خۆراکی و بێ ئیسراحەتی هەر دڵشاد و مسرور بێ، ئەو هەموو ئەزیەتە پڕ خەتەر و ترسناکە قبووڵ بکات، پیاوی زانای بە إنصاف هەرگیزاو هەرگیز شتی وا ناچێتە دڵیەوە.

ئەنجا لە ڕووی (عەقل)یشەوە دوور نیە، خوا بە دەسەلاتە ئەگەر بەندەیەك لە بەندەكانی خۆی هەڵ بژێریٚ و چەندەها لطف و مەرحەمەت و كەرەمی لەگەلا بكات وە لە ڕیزی كەسانیٚ كە لە بارەیانەوە فەرمویەتی (ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء)دا حسابیان بكات چی تیٚدایە، یا كیٚ دەستی ئەگریٚ اللّهم لا مانع لما أعطيت هەرچی بە هەر كەس كەرەم بكەیت ئەیكەیت، كیٚ هەیە هەناسە هەڵ بیٚنیٚ بتوانیٚ ریٚ لە دەسی كەرەمت بگریٚ. هەروەكو كەس ناتوانیٚ هیچ بە هیچ مەخلوقی لە سود و قازانج بگەیەنی هەتا تۆ ئیجازە نەدەیت چونكە ولا معطی لما منعت.

كەوابو كەسانیٚ ألعياذ بالله قاپی دڵیان بە قوفڵی ئینكار داخرابیٚ، و ەصفحەی ناوچاویان بە داخی بیٚ روشدی مۆر كرابیٚ باسی كەرامەت و بەیانی بەرزی شەئنی أوليا سودیٚكیان پیٚ ناگەیەنیٚ وإن يروا كلّ آيةٍ لا يؤمنوا بها شاملی حاڵیانە، لە كەماڵی هیدایەت ناقص. وە كەمالی نقص أساسیاتی ماڵیانە.

بە گەورە گەورانی ئەو مقامە بەرزانەت عطا و خەلات كردوە، وە بە جەماعەتیٚ بڕوایان بە وان هەیە كە بڕوا بەوان خۆیشی بەشیٚكە لە ویلایەت اللّهمّ أحشرنا معهم آمين يا ربّ العالمين.

ئەمەش دیسان پیٚویست بە باسە:

حەزرەتی رسولی أكرم محمد المصطفی ﷺ كە پیٚغەمبەری ئاخر زەمانە و ئیتر پیٚغەمبەری تر لە پاش ئەو نایەت خودا لە شەئنی ئەودا ئەفەرمویٚ: [وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ] وە هەروەها نیسبەت بە ئوممەتی ئەو ئەفەرمویٚ بە خیطاب لەگەڵیاندا [كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ] ئەگەر لە ئوممەتی ئەودا ئەم جۆرە پیاوانە كە ئەوە پایە و مەنزیلەتیانە دەس نەكەویٚ و نەبیٚ چە خەیریەتیٚكی هەیە نیسبەت بە ئوممەتە پیٚشوەكان كە تەمەنی دریٚژ و عیبادەت و طاعەتی زۆریان بوە كە هەر لەو پیاوانەی پیٚشوو هەڵ كەوتوە كە لە حەدیثی صحیحدا حەزرەتی رسولی أكرم ﷺ ئەگیٚڕیٚتەوە كە مەلائیكەی ناردوە لە ریٚگاكەیا وەستاوە پیٚی ووتوە بۆ كویٚ ئەچی؟ ووتویەتی بۆ فلان دیٚ. بۆ لای كیٚ؟ بۆ لای فلان. لەبەر ئەوە خزمن؟ نەخەیر. ئەی موعامەلەتان هەیە لەگەڵ یەك؟ نەخەیر. ئەی لەبەر چی ئەچی؟ كە ئەچم لەبەر محبّەتی خودا ئەچم؟ ئەویش پیٚی ئەڵیٚ من مەلائیكەم مژدە بیٚ بۆ تۆ، خودا تۆی خۆش ئەویٚ وە یا ئەو سیٚ كەسە كە چوونە غارەكە، وە بەردیٚ گەورە بەردەمی دەرگای ئەشكەوتەكەی گرت هەریەك بە كردەیەك لە كردەكانی خۆی پاڕایەوە لە خوا خودا بەردەكەی لابرد.

ئوممەتی پیٚشوو ئەمانەیان بوە، خودا بەمانیش ئەفەرمویٚ (كنتم خير أمةٍ أخرجت للناس تأمرون بالمعروف وتنهون عن المنكر) ئەڵبەت لە ئوممەتی حەزرەتا ﷺ پیاوی زۆر گەورە هەیە (العلماء ورثة الأنبياء) پیٚغەمبەران على نبيّنا وعليهم الصلاة والسلام خاوەنی عیلم بوون جا عیلمی أحكام كە هەڵگری ئەم عیلمە عولەمای ظاهیرە وە چە عیلمی ئەسرار كە عولەمای باطن هەڵگری ئەم عیلمەن.

**ك ٢٠ بص١٢١:** سەفەرێ لە خزمەتیا بووم فەرمووی هەرچی خۆشی و ناسازییە وە هەرچی دەرد و عیللەتە جەسەد و لەش و لار و ناویان هەیە بۆ هەر کەسێکی حەواڵە بکەن وەکوو مەئمووری ظاهیری کە ئومەرا و حاکمان ئەی نێرنە سەر خەڵك بۆ تەمیەکردن و تۆڵە وەرگرتن ئاوایە، وە من جیسمیان ئەبینم بۆ هەرکەسێ بچن ئەزانم، لەو بەینا فەرمووی ڕۆژی لە شاری سولەیمانی هاتنە خزمەتی حەزرەتی مەولانا

---

ئەنجا کەسێ هەڵگری هەردوویان بێ بە معنای أتمّ وأکمل بە گوێرەی پایە و ویسعەت لەهەردو عیملەکەدا مەعنای ورثة الأنبیاء تحقّق ئەکا تێیدا چەندە لە هەردویاندا زانایە ئەوەندە بەشی هەیە لە میراثی ئەنبیادا.
وە هەروەها لەو ئایەتەدا کە خوا فەرمویەتی [فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا] لە تفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزە دوو شت دەرئەکەوێ یەکەم ئەم عیملی ئەسرارە، دوەم کەسانێ ئینکاری حصولی عیلمی ئەولیا بە طریقی إلهام لە خوداوە وە خەبەردان لە مغیباتیان لە لا غیر واقیعە، هەرسێ شتەکە غەیب بوو (١- پاشایەکی زۆردار،٢- ئەو منالە ئەگەر گەورە بێت، ناموسلمان ئەبێت، ٣- ئەو دیوارە خەزنەی لەژێردایە). ئەو زاتە خەبەری داوە خودا خۆیشی ئەیگێڕێتەوە، حەزرەتی موسی علی نبیّنا وعلیه الصلاة والسلام پاش ئەوە باسی بۆ کرد مەعزەرەتی بۆ کرد لەوە کە ئینکاری کردبوو.
هەروەکو ووتمان لە ئوممەتی پێشوو پیاوی گەورە هەڵ کەوتوە، وەك ئەو عەبدە بینا لەسەر فەرمایشتی ئەو عالم و زانایانە کە ئەو عەبدە وەلی بوو.
ئەنجا وەك ووتمان خودا دەرحەق بە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (وما أرسلناك إلاّ رحمةً للعالمین) لە پاش أصحابی ڕەسولی ئەعظم دوژمنانی ئیسلام بۆ تەفرەقە و دووبەرەکی وە گومراکردن و سەرلێشێوان دوژمنانی دین زۆریان هەوڵ دا، وە مولحید و بێ بڕوا و فیتنە هەڵگیرسێن دڵبەقینی ئەم دینە جوان و پاکە هاتنە مەیدان ئەولیای ئەو ئوممەتە خێرە ئەم ئوممەتە مەرحومە بە توجّهات بۆ دڵ و دەرون پاکردنەوە وە إظهاری کەرامات و خرق العادە وە تصفیە و پاکردنەوە لطایف و ناو سینە سەد ساڵ بە دوای سەد ساڵ خەریك بوون، وە ئەمان بەم چەشنە و عولەمای ظاهیر بە أدلەی قاطعة لە خزمەت و خۆبەخت کردن کۆڵیان نەدا بەڵام هەروەك ووتراوە:

پای إستدلالیان چو بین بود      پای چو بین سخت بی تمکین بود

مەعلومە کەشف و موشاهەدە لەگەڵ دەلیل و بەڵگەدا جیاوازی‌یە زۆری هەیە وە لەسوود و قازانجدا تەفاوتیان گەلێکە.

بەڵام ولکلّ رجال مقام بەشی ئەهلی إستدلال ئەبێ بیێ وە ئەو لاش هەروا جزاهم الله عن الإسلام خیرا آمین.

خالید قدّس سرّە بۆ شیفای نەخۆشێك، مەولانا منی داواکرد فەرمویی عوسمان بڕۆ بۆ سەر فلان نەخۆش بەلاّم هۆشت بێ باری نەخۆشیەکەی نەکەوێ بەسەر تۆدا، کە ئەچی باش ئاگاداربە ئەگەر نەخۆشییەکە کە هەیەتی بە تەواوی ڕۆیشت تۆش **توجّە** بەنیەتی شفا و چاك بوونەوەی ئەو شەخسە بکە وە ئەگەر دیت باری نەخۆشیەکەی هێرش بۆ تۆ دێنێ وە ئەیەوێ بێتە سەرت ئیتر هیچ عەلاقەی ئەو نەخۆشە مەکە و بەجێی بهێڵە ئەفەرموێ حسب الأمر لەسەر فەرمایشتەکەی چووم بۆ لای نەخۆشەکە، کاتێ داخلی چوار دیواری ماڵەکە بووم دیتم دەرد و نەخۆشیەکە لەسەر کابرای نەخۆش هەستا وە کابراش هەستا و دانیشت وە بە ئەدەبێکەوە لە کەنارێکی خانوەکە وەستا بەلاّم نەچوە دەرەوە، وەختێ ویستم بە نیەتی شیفا توجّە لە نەخۆشەکە بکەم، نەخۆشینەکە بە هەیبەت و سامێکەوە بەرەو ڕووم هات و ویستی بەسەر مندا بکەوێ ووتم ئاسوودە بە راوەستە تا من لێرە ئەڕۆم ساتێ لەسەردانی نەخۆشەکەدا مامەوە هەستام هاتمە دەرەوە گەیمە حەوشە ئاگام لێ بوو دەردەکە چوەوە سەر کابرای نەخۆش، تا من گەیشتمەوە خزمەتی مەولانا خەبەر گەیشت کە نەخۆشەکە لە دنیا دەرچوو، منیش چیم دی عەرزی مەولانام کرد وە لە خزمەتیا گێڕامەوە.

ڕۆژێ لە ماناى: ألا طالَ شوق الأبرار إلى لقائي وأنا إلى لقائهم أشدّ شوقاً

عەرزی پیرم کرد، فەرموی شەوق بۆ ئەبرارە، مقرّبینی حضوری حق جلّ شأنە شەوقیان نامێنێ تۆ خۆت نابینی ئەوەندە بێ شەوق ئەبن کەس لەگەڵ بێگانە و ئەجنەبیاندا جیایان ناکاتەوە.

**ك ٢١ ص ٢٩٠ لـه رياض المشتاقين**[1]: خـاوەنی پایـە بـەرزی لـە عـیلم و مەعریفەت و فەضلا مەلا حامیدی کبیر کـاتبی حـەزرەتی شێخ عوسمـان سـراج الـدین رودراوی خوا لیٚ خۆشبو مەلا محمود بەم جۆرە دەگێڕێتەوە ئەڵێ شێخی سراج الدین قدّس سرّه فەرموی کاتێك لـە قـەلاّی جـوانڕۆ بـوم مـەلا محمـود عـالمێکی کامیـل وە زیـرەك و هوشیار بـو، نـەخۆشی‌یـەکی گـرانی هـەبو شـەویٚ لـە خـەوا دیم، عـاجیز و مەلول لە جێگەیەکدا دانیشتـوە عـالمێکی تـر لـەو زانـا و هوشـیارتر موناقشـەی لەگـەلّ دەکا ماوەیە پرسیار و وەلاّم بە بەینیانا ڕابورد لە پاشا ئـەو عالمە پرسیارێکی لـیٚ کـرد ماتلّ ما وە نەیزانی وەلاّمی بداتەوە لەگەلّ ئەوەشـدا پرسـیارەکە سـوك و ئاسـان بـو وە ئەو زانا بوو کاتیٚ کە بە هۆش هاتم زانـیم مـردوە وە ئـەو عالمە ملـك المـوت بـوە، لـە کاتی گیان کێشانی پرسیار و مناقشەی لەگەڵدا کردوە پیاوێکم نارد بۆ خەبـەر پرسـینی هاتەوە وتی وەفاتی کردوە، ئەنجا فەرمووی کـاتیٚ لەگـەلّ جەنازەکـەی چـوین بـۆ سـەر قەبران دیم روحانیەتی ژنیٚ لە قەبرێکەوە هاتە دەریٚ یەخـەی مـەلا محمـودی گـرت وتی ئەمڕۆ ڕۆژی عەدلە چۆن لە دەسم رزگار ئەبی فەرموی پرسیم لە (مەلا قطـب الـدین برای مەلا محمود) ئەم قبرە قەبری کێیە و وتی ژنێکـە لـە قـەوم و خوێشـانی ئێمـە ووتم شـتیٚ وام دی وتی بـەلّیٚ ڕاسـتە بوهتانێکیـان بـۆ هەلّبەسـت کوشـتیان مـەلایش تێیـدا بەشدار بوو.

**دیسان بص١٢٢**: دیسان فەرموی سالّیٚ بۆ ئیشێکی پێویسـت چـووم بـۆ جـوانڕۆ مەلا محمودی خەلّکی ئەویٚ نەخۆش بوو بەیانییەك دوای نوێژی صبح موراقیب بووم وام دی کـە مـردوە مەلائیکـە وان لـە پرسـیارلێکردنیان ئـەویش بـە تـرس و دەهشـەتیٚ

---

(١) ئەوانەی شێخ محمدی سەمرانی لە باریقاتـدا نوسـیویەتی زۆری مـوافیقی ریـاض المشتاقینـە بـەلاّم ئـەم واقیعەیە لەگەلّ باریقات کە لەودیو لە صحیفە (١٠٠)دا نوسراوە ئەندازەیـە جیاوازیـان هەیـە ئـەویشم لـە لای ئەو نوسی، هەرچـەند هـەر دو هـەر یـەکن. مـەلا قطـب الـدین بـرای مـەلا محمـود مریـدی حـەزرەتی مەولانا خالدە.

زۆرەوە جوابیان ئەداتەوە، کاتێ لە موڕاقەبەکە بوومەوە پیاوێکم نارد بۆ هەواڵی مەلا محمود، ووتیان لە دنیا دەرچووە، لە پاشا لەگەڵ تەرمی موبارەکیا چووین بۆ سەر قەبران. کە گەیشتینە لای گۆڕستان دیم ئافرەتێ لە قەبرێکەوە دەرپەڕی وە یەخەی ملا محمودی گرت و ووتی ئەمڕۆ لە چنگ من ڕزگار نابی بۆچی بە ناحەق منت کوشت؟ فەرموی لە برای ملا محمودم پرسی کە لەگەڵیان بوو ئەمە قەبری کێیە، ووتی قوربان ئەمە قەبری ژنێکە لە ماڵی مەلا مەحمودا بوو، بوختانێکیان بۆ هەڵبەست مەلا محمود کوشتی، ووتم شتێ ئاوام دی فەرمووی بەڵێ بەڵێ ڕاستت دیوە.

من کە دانەری ئەم کتێبەم حەوت جەژنی قوربان لە ئاستانەی عەلیەی حەزرەتی شێخ عوسماندا قدّس سرّە حازر بووم، أشهد بالله سبحانە لە هەر حەوت جەژنەکەدا دیومە لە واقیعەیەکدا کە لە ڕووناکی بەیان ئاشکراتر بوە بە طوافی کەعبەی معظمە فائیز بووم وە تەواوی شەرتەکانی حەج طواف و ئەرکان و إستلامی حجر الأسود لەو خەوەدا بەجێم هێناوە.

ڕۆژێ بەقاڵێ لە خزمەتی حەزرەتی شێخدا بوو وە تەنیا داوای کۆکردنەوەی ماڵ و سامانی دنیای بوو، حەزرەتی پیر فەرموی ناوی چییە؟ ئیشی چییە؟ منیش عەرزم کرد، فەرمووی سبحان الله ئەم إنسانە سێ بەشە، یەکەم بەشی ئەوەیە هەر خۆیان دنیا بە مجسّمن یانی پەیکەرێکن هەر دنیای ڕووتن، دووەم طالیبی دنیان سێیەم ئەبەدا مەیلیان بەدنیا نیە ئەم پیاوە بە دنیایەکی مجسمی ئەبینم خوا توفیقی لەسەر خێر بداتێ.

زۆر خۆشە بەم بۆنەوە باسی کەسانێ بکرێ کە هەرگیز مەیلی دنیایان نیە، أولیاء الله قدّس الله أرواحهم بە هیچ ڕوویەك پەیوەندیان بە دنیاوە نیە، وە مەبەست لە پەیوەندی پەیوەندی حوببی و خۆشەویستیە، ئەگینا دنیاداریان کردوە وە وابوە زۆر دەوڵەمەند و ساماندار بووە، نەوەك تەنیا ئەولیا بەڵکوو زۆر لە أنبیاء الله على نبیّنا وعلیهم الصلاة والسلام دونیایان بووە، بۆ نموونە حەزرەتی سلیمان، حەزرەتی أیوب حەزرەتی شعیب کە حەزرەتی موسی پێشی نبوّەت شوانی ئەو بووە، وە هەروەها

حەزرەتی داود و حەزرەتی یوسف و حەزرەتی ئیبراهیم ئەگەر حەزرەتی نوح علیە السلام دەولەمەند نەبوایە لە کویٚ کەشتییەکی دروست ئەکرد ئەو هەمو عالەمە بگری.

بە کورتی ئەو زاتە گەورە گەورانە هەژار و کەم دەست نەبوون، وە لە ئەولیادا قدّس الله أسرارهم دەولەمەندیان زۆر تیٚدا بووە وەك حەزرەتی شیٚخ محمد أبو الوفا وەکو حەزرەتی شیٚخ عبیدالله أحرار کە شەخسیٚ لە یەکیٚ لە عامیلەکانی پرسی لە بارەی کیٚلگە و مزارعیەوە ووتی شیٚخ ١٨٠٠ هەزار و هەشت سەد مەزرەعەی هەیە، وە ئەو مەزرەعە من وام لەسەری ٣٠٠ فدّانە مەبەست لەوەیە بوون و دنیاداری ئەهلی دنیا زیان نادات لیٚیان بەلاّم ئەوەندە هەیە بەشەر بە حوکمی طەبیعەتی بەشەری حەز لە دنیا دەکات لە فەقیری و نەبوونی یاسە وەك لە سەرەتاوە باسمان کرد بەشەری خاوەن ڕەزیلە و حبّ الدنیا رأس کلّ خطیئةٍ مەشهورە ئەلبەتە سەری هەموو خەتایە کوفرە العیاذ بالله.

ئەنجا مرشیدی حقیقی و شیٚخی بە پایە گەیشتوو کەسانیٚ بە ڕەسمی مریدی بچنە خزمەتی بۆیە ئەچن تا لە حالەتیٚکەوە بچنە حالەتیٚکی تر، پزیشك بۆیە نەخۆش سەری لیٚ ئەدات و پەنای بۆ ئەبات کە لە باری ناساخی و نەخۆشییەوە بیباتە صحەت و لەش ساخی، کەم کەس هەیە نەخۆشی قەلبی واتە (ڕەزائیل)ی نەبیٚ، ئەنجا ئەم مورشیدە عەزیزە کە ئەو مریدە لەگەلّ إخلاص و صداقەتدا خۆی گەیاندە مستشفی طبي إلهي وە لیباسی نەفسی خۆی خستە ئاوی گەرمی طەریقەتەوە و بە صابونی زیکر و هەلّ گلۆفینی ریازەت و زەحمەتی مرید زەحمەتی ئەزیەت و ناڕەحەتی چلکی پەلەی قصور و غەفلەتی پاك ئەکاتەوە. وە طبیبی قەلب و نەفسی بە توجّهات و تعلیمات رەویە و رەوشتی و ئادابی مەعلومە لە میانەی مرشید و مریدا بە پیٚی تەبیعەت و میزاج وسروشتی وە خووڕەوشتی ئەو موریدە پلە بە پلە لە دەرەکانی پلەی پەستی نەخۆشی رەزائیل بەرەو پایە بەرزی صحەت و رەحمەت و کەسبی قوّەی

فضائل گەیشتن بە ئەوجی سەلامەتی و صەفای قەلبی ئەبیات بە شێوەیەك كە ئەو دڵە لە هەموو ظوڵمەت و تاریكییەكی تعلّقات بە غەیری حەزرەتی باری تەعالاوە پاك ئەكاتەوە ئەوجا قابیلی ئەوە ئەبێ كە بە تجلّیاتی ئەنواری قیدەم ساحەی دەروونی منوّر بێ ئەوسا (پارێزی) لەكاتی نەخۆشیدا لێی كرابوو بە دوور خستنەوەی لە دنیاداری و خوودان بە بەكارهێنانی جل و بەرگی قەشەنگ و خۆراكی پڕ تام و لذیذی لەسەر هەڵ ئەگیرێ بەڵكو پارێزكردن ئیتر لەم كاتەدا ممكینە و ئەگونجێ زەرەری هەبێ وەك لە چەندەها كتێبدا نوسراوە.

إنسان نابێ قیاسی چاكان لە خۆی بكا، بلێ منیش وەك ئەو، شێخ جلال الدین رۆمی ئەفەرموێ قدّس سرّە:

كار پاكان را قیاس أز خود مگیر — گر چ با شد در نویشتن شێر شیر
آن بود شێری كە أندر بادیە — وان بود آن شیری كە اندر بادیە
آن بود آن شێر كآدم میخورد — وان بودآن شیر كآدم میخورد

قەت ئیشی پاكان وەك خۆت مەزانە — سەد كە شێر و شیر بەخەت یەكسانە
ئەم ئەو شێرەیە وا لە بادیە — ئەو ئەو شیرەیە وا لە بادیە
ئەم شێرە بەلام خۆراكی إنسان — ئەو شیرە بەلام خۆراكی إنسان

بەڵێ ئەم زاتە بەرزە بەڕێزانە كە بە ڕاستی بەرزی و بەڕێزی ئەشێ هەر بۆ ئەمان بەكاربهێنرێ ئەگەنە پلەیەكی وا تەنیا نەك عەلاقەی حوبی لەگەڵ دنیا تەرك بكەن خۆشەویستی بەهەشتیش لەدڵا ئەشۆرنەوە، هەر بۆ ئەوە بەهەشتیان خۆش ئەوێ كە ئەو جێگە موحەلی ڕەزامەندی مەوقیعی ڕەحمەتی خوایە وإلا هیمەتیان ئەوەندە بەرزە بەهەشت بە جێگەی حەیوانی ئەدەنە قەڵەم إنّ الله یحبّ معالي الهمم, معالي الهممي بەڕاستی ئەوانن بەلام حەزرەتی ئیمامی ربّانی خوا لێی خۆشنوود

ئەفەرمویٚ: لە حدیثی قدسی‌دا هەیە (أولیائي تحت قبابي لا یعرفونهم سوائي) یانی خۆشەویستانی من وان لە ژێر قوبەی مندا کەس نایان ناسن من نەبیٚ یانی من ئەیان ناسم وە ئیمام ئەفەرمویٚ ئەو قوبەیە دنیایە بە ظاهیری دەست ئەکێشنە دنیاداری خەڵك قیاس ئەکا ئەڵیٚ ئەوان دنیایان هەیە ئێمە بۆ نەمان بیٚ، ئەوان ئەگەر تەواوی دنیا هی ئەوان بن لە ئانێکا مەحویێتەوە کار ناکاتە سەر دڵیان چونکە حوبّی دنیا نەچەقیوە بە دڵیاندا نمونەی علوی هیممەت بەرزی پایەی ئەمان وایە، شەخصێکی خاوەن شەهامەت بەرزی و ئیحتیرامیٚ لە وجودیا بیٚ ویڵ و سەلیقە و شەخصیەتێکی یا موجود بیٚ دایما ڕەفاقەتی پیاوی گەورە و إنسانی خاوەن شەئن و شکۆی پیٚ خۆشبیٚ وە ڕەفاقەت موصاحەبەی أمرا و ناودارانی لا مطلب بیٚ ئەو پاشایەکی خاوەن دەسەلات بانگی کرد بۆ مواجەهە لە کاتێکا برسی بوو ئەم شەخسە ئەگەر لە باغێکا ئەنواعی طعام رازابێتەوە وە لەو ڕەفاقەتی سوڵتانا بە ڕێکەوت خواردنێکی نا بە دڵی خۆی پیٚی خۆشە لە خزمەت مەلیکدا ئەو نانە نا بە دڵە بخوات یا بچێتە باخەکە بە تەنیا ئەو طعام و خۆراکانە بخوات دیارە واز لەو طعامانە دیٚنیٚ وە هەر نایەتە خەیاڵی، لەگەڵ ئەوەشا کە مەلیك بەشەرێکە وەك خۆی ئیتر شەهامەتی أولیاء الله لە دەرەجەیەکایە بۆ تقرّب بە حضوری إلهی جلّ سلطانە وە بۆ گەیشتن بە مەکانەتی فی مقعد صدقٍ عند ملیكٍ مقتدر هەر لابەلای بەهەشتیشا ناکەنەوە لەگەڵ ئەوەشا خوای تعالی بەهەشتی ئەوانیشی لە بەهەشتی خەڵکی تر جیا کردۆتەوە کە بریتی‌یە لە فردەوسی أعلی اللّهم إنّك وليّ التوفیق وعلی کلّ شيءٍ قدیر فاجعلنا في زمرتهم وأرزقنا محبّتهم وما ذلك علی الله بعزیز.

ڕۆژیٚ فەرمووی بە مریدان لە قسەی بیٚ بەفائیدە وە بیٚ بەهرە و سەمەر خۆتان بپارێزن چونکە ئەوەی بەلا و موصیبەت بەسەر خەڵکا دیٚت بە هۆی قسەی بیٚ کەڵك بیٚ سوود و مالایعنی‌یەوەیە لە ووتەی پڕ و پوچ. دیارە کەسیٚ وورد بێتەوە لە ئایەتی

پیرۆزی (إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمٌ) اللّهم احفظنا يا حافظ من جميع آفات الدنيا والآخرة وبرحمتك يا أرحم الراحمين اجعلنا تحت كنفك وحمايتك.

**ك ٢٢ بص١٣٠:** وه هەروەها فەرمووی: هەر کەسێ ئیشێکی هاتە پێش إحتیاجیەك یا موشکیلەیەك هەمو بەیانیەك لە دوای بەجێ هێنانی نوێژی صُبح لە جێگەیەکی خۆی نەجوولێ بە حضوری دڵەوە یانی دڵی لە لای خوێندنی دۆعاکە بێ کە لە خوا داوا ئەکات وە لەگەڵ ئومێدەواری ١٧٤[1] جار بڵێ یا حيّ یا قیّوم برحمتك أسغیث إنّ شاء الله ئیشەکەی زۆر بە ئاسانی بۆ حەل و جێ بەجێ ئەبێ.

شێخ محمدی سەمڕانی ئەفەرموێ لە پاش ئەم فەرمایشتە کە بیستم چەندەها جار موشکیلەی نارەحەتم تووش بوە دەوامم لەسەر ئەم دۆعایە کردوە شوکر بۆ خوا بە ئارەزوی خۆم ئیشەکەم بۆ دروست بووە.

وە هەم فەرمووی: لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەقڵ کراوە ئەم کەلیماتە بۆ لابردنی هەر جۆرە نەخۆشی‌یەك بنووسرێ ئەگەر قەزای موبڕەم نەبێ شفای بۆ دێ بە زوویی: أعوذُ بكلمات الله التامة من شرّ كلّ شيطانٍ وهامّة ومن كلّ عينٍ لامّة لە ئاخری دۆعاکەوە بنوسرێ الله محمد علي دیسان حاجی شێخ محمد سەمرانی فەرموویەتی ئەم دوعایەم لە کتێبی الحصن الحصين دیوە بە عەینی عیبارەت زۆر بە تأثیر و مجرّبە.

**ك ٢٣ بص١٣١:** ڕۆژێ صۆفی خاڵەکە ناو کە زۆر شەخسێ گوساخ و جەسوور بوو لە خزمەت شێخدا عەرزی کرد قوربان چی باشە إنسان بیبێ بۆ قیامەتێ؟ فەرمووی:ـ دڵێکی هوشیار عەرزی کرد ئەگەر ئەوی نەبوو؟ فەرمووی دوو

---

(١) حي قيوم
١٧٤ = ١٥٦ + ١٨

چاوی ڕووناك یانی بینەر ووتی ئەگەر ئەوەیشی نەبوو؟ فەرمووی گوێیەکی بیێ ببیسن ووتی ئەگەر ئەوەشی نەبوو؟ فەرمووی هەرکەس ئەم سێ ئەوصافەی نەبوو وە لە جمیعی ئەم صیفاتانە خاڵی بوو دوو مەتر کراس و قەبرێ تەنگو تاریك کیفایەتی ئەو کەسەیە والحال ئەم فەرمایشتە لە مانای ئەم ئایە کەریمەدایە (وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيراً مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ)[١]، وە هەروەها ریوایەت کراوە لە شەدادی کوڕی أوس ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ:- ألكيّس من دان نفسه وعمل لما بعد الموت والأحمق من أتبع نفسه هواها وتمّنى على الله المغفرة, وفي رواية وتّمنى على الله الأماني. وە هەروەها حەزرەتی عمری کوڕی خطاب درو‌ودی خوای لەسەر بێ ئەفەرموێ: حاسبوا أنفسكم قبل أن تحاسبوا وزنوها قبل أن توزن وتهيّئوا للعرض الأكبر[٢].

---

(١) لە سورەتی الأعرأف: ١٨٩. مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەیە:
زۆرمان دروست کردوە بۆ جەهەننەم لە جنی و ئادەمی چونکە ئەوان خاوەنی دڵێکن هیچی پێ نافامن یانی دڵیان هیچ نافامێ و تێ ناگا، وە بیروبڕوا و حەقیقەتی ئایین ناچێتە دڵیان وە چاوێکیان هەیە پێی نابینن یانی چاوی ووردبونەوە و چاوێ عیبرەتی پێ بگرن چاوێ مصنوعاتی ئیلاهی دەرك بکا وە ببێتە هۆی لێکدانەوە و وەرگرتنی سوودی بیروباوەڕ لێی بێ نصیب و بێ و بەهرەن. وەگوێیەکیان نیە پێی ببیسن یان گوێیە موعیظەی واعیظان و کلیمەی حیکمەت و پەند و ئامۆژگاری‌یەك بیان هێنێتە سەر ڕێگای حەق و شەریعەت نیانە وە شت وەرناگرن و ناچێتە گوێیانەوە، ئەوانە وەك حەیوان وان بەڵکو ڕێ لێ گوم بووترن.
(٢) إحياء علوم الدين,
الكيس: العاقل، مرۆڤی ژیر و دانا.
دان نفسه: أی حاسبها، لێی پرسی بێتەوە.
أئنّا لمدينون: أئنّا لمحاسبون ژیر ئەوەیە محاسەبەی نەفسی خۆی بکا بۆ دوای مردن نەفام نەفسی ئەخاتە دوا ئارەزوات چۆن مەیلی بێت و بیەوێ وە کەیفی لێی بێ ئەیکات وە بە تەمای ئەوەیە خوا لێی ببورێ...
سارية: قائدی جەیشی ئیسلام.

**ك ٢٤ بص ١٤٠:** ڕۆژێ کە لە حضوریدا بووین فەرمووی نازانم چە حیکمەتێکە کە تەواوی بەرد و دار بەڵکو ئەجزای دەر و دیوار وەختێ کە من دەرئەکەوم لە ڕووی تعظیم و ویقارەوە بە زمانی حاڵ سەلامم لێ ئەکەن وە إحترام و ڕێزم لێ ئەگرن قدّس الله سرّه العزیز.

**ك ٢٥ بص٢٦٦:** جەنابی شێخ ئیبراهیمی جوانڕۆیی فەرموی لە سەرەتای شێخایەتی حضرەتی پیرەوە، جارێ حەزرەتی شێخ تەشریف دەبا بۆ قەڵای جوانڕۆ (محمد صادق خان) حوکمداری ئەوێ دەبێ لە مەجلیسدا عەرزی حەزرەتی شێخ دەکات ئەوە چۆن بوە حەزرەتی عمر علیه السلام لە مەدینەوە ساریە لە نەهاوەند[1] بانگی (یا ساریة الجبل)ی بە گوێی ساریە گەیاندوە، لە وەڵاما حەزرەتی پیر ئەفەرموێ من کە یەکێکم لە ئوممەتانی محمد ﷺ موریدێکم هەیە (علی) ناو لەدێی طەوێڵە ئەگەر بانگی بکەم بەو دەنگەوە بێت ئیتر بەوە بڕوا ئەکەیت ئەڵێ ئەمە عەجایب ترە حەزرەتی شێخ بە دەنگی بەرز ئەفەرموێ علی علی بۆ سبەینێ خۆت بە من بگەیەنە بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە شێخ علی طەوێڵەیی کە ناومان برد لە پاش نیوەڕۆ بە بەرچینە (ترێ) وە کە تەنیا سێ هێشوی تێدا دەبێ حاضر دەبێ سەبەتەکە دادەنێ دەستی شێخ ماچ دەکا، ئەفەرموێ علی چۆن هاتی؟ ئەڵێ دوێنێ لەناو باخ بوم گوێم لێ بوو بانگت کردم ئەم سێ هێشوە تازە پێ گەیشتوە حازر بو خستمە ئم بەرچینەوە بێ ئەوە بچمە ماڵەوە هاتم.

بە ڕێکەوت حاکم لە مجلیسی شێخدا دەبێ قریوە لە مجلیسەوە هەڵدەستێ. وە خانی حاکم تەصدیق ئەکات وە ئەڵێ ئای والله صەحیحە. بۆ زانینی مسافەی بەینی قەڵای جوانڕۆ تا دێی طەوێڵە دو ڕۆژی بەهارییە کە بە سواری چارەوێ ببڕدرێ. ئەم حیکایەتەم هەوەڵ جار لە مەلا إبراهیمی جوانڕۆی بیست پاشتر چەنەها جار لە

---

(١) نەهاوەند: شاخێکە لە ئێران نزیکی تاران.

نەفسی شێخ علی ناوبراو خۆیم بیست. مەلا حامید ئەم حیکایەتە لە ریاض المشتاقین‌دا ئەگێڕێتەوە[1].

**ك ٢٦:** جەنابی شێخ عمری کوڕی حاجی شێخ أحمدی عەرەب[2]، خەڵکی دیرزوری (سوریە) کە خاڵی شێخ أمین و شێخ ثابت ی کوڕانی شێخی علاء الدین ن لە ساڵی (١٤٠١)ی هیجری لە شاری بغداد بۆی گێڕامەوە. ووتی خۆم لە حەزرەتی شێخی گەورە شێخ علاء الدین بیستم فەرموی ساڵێ حاکمێ دێتە کرماشان. ئەو حوکمدارە زۆر بە توند و زاڵم و بە شیدەت مەشهور و بەناوبانگ دەبێ. ئەمر ئەکات بە سەندنی خەراجی (٧) ساڵ لەو گەل و ڕەعیەتە. کۆمەڵێ لە مەنسوب و موریدینی حەزرەتی شێخ عمر ضیاء الدین قدّس الله سرّە العزیز بۆ ڕزگار بوون لەم زوڵم و

---

(١) ئەگێڕنەوە کە حەزرەتی بایەزیدی بەسطامی خوا لێی خۆشنود بێ چاوی کەوت بە شەیطان بە بەردەمیا تێ ئەپەڕی وە چەند لەغاوێکی بە دەستەوە بوو، حەزرەتی بایەزید فەرمووی ئەوە بە پەلە بۆ کوێ دەچی؟ ووتی مەشغوڵم مەکە ئەی بایەزید، پیاوێ لەسەرە مەرگایە ئەڕۆم فریبی بدەم و نوری ئیمان لە دڵی دەرکەم، وتی ئەی ئەم لەغاوانە چین. ووتی خەڵکی پێ لەغاو ئەکەم، وە هەر چۆنم پێویست بێ و بۆ هەرچێ بمەوێت رایان ئەکێشم فەرموی ئەی لەغاوی من کامەیە.

ووتی من لە کوێ و لەغاوی تۆ لە کوێ. خاوەنی تذکرة الأولیاء ئەفەرموێ ئەمە لە بایزیدەوە تواضع بوە وإلا پیاوێ وێنەی بایزید رفیع المقام بوە.

حضرەتی عیسی ﷺ فەرموی بە شەیتان کاروبارت لەگەڵ بەندەکانی خودادا چۆنە وتی ٣ جۆرن چینێکیان لێیان مەئیوسم نزیکیان ناکەوم، چینێکیان سەریان بۆ شۆر کردوم بە هەمو جۆر تسلیم بوون. جۆرێکیان زۆر ماندوم بە دەسیانەوە هەر کات ئەیان خەمە داوی خۆمەوە خەریکم دڵنیا بم داوەکەم ئەدڕن بە تۆبە و إستغفار و پەشیمانی کەڵەکی هەڵچنراوم ئەڕوخێنن. في کتاب مستحب الاستعناء من حاشية تذكرة الأولياء.

(٢) شێخ أحمدی عەرەب یەکێ لە مریدەکان بەڵکو لە مەئزونەکانی حەزرەتی شا عمر ضیاء الدین بوە. کچی خۆی رابیعە خان داوە بە حەزرەتی علاء الدین قدّس سرّە شێخ أمین و شێخ مظهر و شێخ ثابت لە رابیعە خانن شێخ عمر برای شێخ عبدالله ی دیرزورە خەلیفە بو خاوەن خانەقا بەڵام شێخ عمر وابزانم لە سوریە مفتی بوە.

ستەمە پەنا دێنن بە خزمەت قطبی زەمـان حـەزرەتی ضیاء الـدین ئـەویش فـەرموی بە من: علاء الدین ڕۆڵە بڕۆ بەڵکو قسە لەگەڵ ئەو پیاوەدا بکەیت و ڕجای لـیٚ بکـەیت شایەد واز لەم هەژارانـە بهێـنن مـنیش عـەرزم کـرد قوربـان ئـەم حاکمـە وا مەشـهورە هەرچی بڕیاردا تخفیف و چاوپۆشی کـردنی لـە مەزهـەبا نیـە زۆر بـە تـیژ و تونـدی نـاو ئەبەن فەرموی بڕۆ ئەت ناسیٚ. منیش بە پێی فەرمانی بـاوکم ڕۆییشـتم کـاتیٚ گەیشتمـە جێگـە و خەبـەریان دایـە زۆر بـە قـەدر و ئیحتـرام پێشـوازی لـیٚ کـردم. وە هـات بـە پیرمەوە. تەنانەت لە کاتی دانیشتنما بەرابـەرم بـە پێـوە دەوەسـتا. مـنیش پـێم ووت بـەم حەددە تواضع, وە خۆ بە کەم گری، وە بەم جۆرە ڕێز لیٚ گرتن نیسبەت بە خۆم لە تـۆوە پـێم خـۆش نیـە، ئـەویش دەسـتی بـرد لـە ژێـر جلەکانیـەوە وەرەقەیـەکی کـە پێچابووی لە دەسماڵێکەوە لە قۆڵی کردەوە و کاغەزەکـەی لـە نێـو دەسڕەکە دەرهێنـاو پیشانی دام خەتی حەزرەتی سراج الـدین بـو قـدّس سـرّە، ووتی ئـەوە مـن ئەیکـەم زۆر کەمە سەد یەکی حەقی ئێوەم بەجیٚ نەهێناوە، من حـەیات و حورمـەت و مەنصـەب و مەنزیلەتم لە سایەی خانەدانی ئێوە، پایەدار و بەرقـەرارە. بـاوکی مـن ولیعەهـدی کـاتی خۆی بـو بـە حـوکمی قـەزا و قـەدەر بـاوکم بـە دەس مـن چـو، کـاتیٚ بـاوکی خـۆمم کوشت لە لایەن پادشای ئێرانەوە وە حوکمی ئیعدامم سادر کرا، منیش فیرارم کرد، وە هەر چۆن بو خۆم گەیاندە ماڵی سەردار لە بۆکـان لـە پـاش ماوەیـە مەشـوەرەتم پیٚ کرد چیبکەم، ووتی بە گوێرەی بڕیاریٚ کە لە بەینی ئێران و تورکیـە و روسـیادا هەیـە پەنا بە هەرلایەکیان ببەیت ئەتدەنـەوە بـە دەس حکومـەتی ئێرانـەوە بـەڵام چارەسـەری ئەم قەزییە ئەبیٚ لەلایەن کەسانێکەوە بیٚ کە لە لای خـوداوە خـاوەن دەسـەڵاتن، ئێمـە خۆمان کە بۆ هەموو علاج و حەلّلی موشکیلات و ڕوودراوێکی گرنگ جێگەی پەنا و هانامـان بیٚ، وە هیممـەتی بـەرزی بـۆ دەردی گـران دەوا و دەرمانمـان بیٚ حـەزرەتی شـێخ عوسمـان سـراج الـدین،ە لـەدێی (تەوێڵـە)ی هـەورامان. جـا بـۆ چـارەی ئـەم دوچارییە وە بۆ عیلاجی ئەم ئیشە ناهـەمواری‌یـە ئیلتجـا بـە قـاپی ولایـەت پـەناهی ئـەو

ئەبەین. بە کورتی شەرح و بەیانی ئەم واقیعە بە نامەیەکی موخلیصانەوە نێررا بۆ خزمەتی، لە وەڵاما فەرموو بووی: بچێتەوە خۆی تەسلیم بکات ئەیگرن ئەیبەنە (تاران) بۆ تنفیذی بڕیاریٚ کە بۆ ئیعدامی درا بو ڕۆژ دیاری ئەکریٚ (سێدارە)ی بۆ نەسب ئەکەن پادشا خۆی بەرگی قەهر ئەپۆشیٚ، وە لەگەڵ وزەرا حەواشی خۆی و گەورە پیاوانی پایتەخت بۆ تەماشای ئەو واقیعەی ئیعدامە دادەنیشن، کاتیٚ کە بەدەستی بەسراوە بەرەو قەنارە ئەیبەن یادیٚ لەم دەروێشە بکات پادشا نزیکی خۆی ئەخاتەوەو ئەیبەخشیٚ وە سیٚ خەلاتیشی ئەکات وە ئەم کاغەزەش لە ژێر لیباسەوە ببەستێتە باڵی، کە سەیرم کرد ئەمە نوسرا بوو.

إنّا فتحنا پێشەوا. نصرٌ من الله درقفا سالم بروَغانِمْ بیا. فالله خیرُ حافظاً[1]،منیش بەبیٚ تردید حسب الامری حەزرەتی شێخ خۆم تسلیم کرد تا بردمیانە تاران، کاتیٚ کە لە ڕۆژی دیاری کراو بۆ کوشتنم بەرەو (سێدارە) بردمیان وە پادشا خۆی و ئەرکانی دەولە و جەماعەتیٚ گەورە لە ڕێز لیٚ گیراوانی ئەهلی شار حازری سەیری ئەم قیاسە بوون، ئیتر کاتی هەرە تەنگانەی دەورەی ژیانم بوو، دەستم کرد بە داواکردنی هیممەت ئیمداد لە ڕۆحی پاکی حەزرەتی شێخەوە فریادم ئەکرد یا سراج الدین یا سراج الدین، لەناکاو پادشا دەنگی هەڵبڕی، فەرموی بۆ لای منەوەی بهێنن، هەرچەند ئەچومە پێشەوە وەسەر ڕەسمی تعظیمم بە جیٚ ئەهێنا ئەیووت وەرە پێشتر، تا بە تەواوی گەیشتمە بەردەمی، دەستێکی ماڵی بەناو شانما وە بە پێکەنینەوە وتی (خوب کردی آن پدر سگ راکشتی) یانی چاکت کرد ئەو سەگبابەت کوشت (خەلعت بدایید) خەلاتی بدەنیٚ تا سیٚ جار تکراری کردەوە وە رزگار بوم وە (٣) خەلاتیشم وەرگرت، کەوابو ئیتر زۆر زۆر لەمە زیاتر من ئەدەب بکەم وە ڕەسمی خولامی ئێوە بە جیٚ بێنم، ئیتر لە پاش ئەوە ئەمری دا بە لابردنی هەرچی داواکرا بو لا

---

(١) بەڵام شێخ نوسراوەکەی بەم جۆرە خوێندەوە لە باتی سالم صحّتی فەرمو وە لە باتی غانم سالم (إنّا فتحنا پێشەوا، نصرٌ من الله در قفا. صِحَتْ بَرَوْ سالِمْ بیا. فالله خیرٌ حافظاً).

ببریٚ، وه دەستی کرد به تەرزیەی دڵی ئەو گەل و رەعیەتـە وه هـەموو جۆره أسبابِ ئاسایشی بۆ دەستوردان.

ئەنجا من ئەم حیکایەتەم لە خزمەت حەزرەتی قوطبی زەمان شێخ محمد عوسمان (سراج الـدین)ی دووەمدا عـەرز کـرد، فـەرموی خـۆم لـە حـەزرەتی شـێخی بـاوک بیستومه وه خۆیشی به تفصیل گێرایەوه، وه هەروا عەرزی شێخ مولانا خالیدم کر فەرموی بەڵیٚ ئەوە کە بـاوکی خـۆی کوشـت کـاتیٚ بـو کـه بـاوکی لـه شـاری تـەورێ حوکمدار بوه وه ناوی یانی لەقەبی ظلّ السلطان بوو.

**ك ٢٧ بص٤٥:** زستانێك لە خزمەتیا بووم به هۆی ریازەتـەوه زۆر لاواز و کـه هێز و بیٚ تاقەت بوبوم وەك مردوم لیٚ هاتبوو لـەناو بـەفر و سـەرمادا، ڕۆژیٚ نـاردی بەدواما بۆ حضوری پڕ فەڕ و بەرەکەت و نوری خۆی، لطف و هیممەتێکی لەگەڵ کردم دوایی فەرموی ئیجازەبه پڕۆرەوه بۆ ماڵی خۆتان، له دڵـی خـۆمـا ووتم مـن بـه هەموو زەعیف و بیٚ هێزییەوه ڕێگەی هەورامان بەو گشت سەختی و پڕ لـه بـەفرەو کەی له ووزەی من دایه، وه بەڕاسـتی بەفریٚ گـەورەیش بـاری بـوو، ناکـا فـەرمووی بڕۆ و هیچ باکت نەبیٚ هاتمه دەرەوه نوێـژی نیوەڕۆم بـه حـازری کـرد و کەوتـمه ڕیٚ شاخێکی بەرز که کەوتۆتـه میانـەی هـەردوو دێـی دزاوەر، وه نۆدشـەی محاڵی هەورامانه وه یەك سەعات زیاتر ڕێرەو بەرزی هەیه، له لای خوارووپاینی ئەم کێـو وەستام تەماشام کرد وەك پەیژەیه وەهایه بەرەو ئاسمان دانرابیٚ ئەم کەژه ئەوەنـده پایە و بەرز و پڕ له بەفره هەڵوێستەیەکم کرد، وه وام دانابوو که بڕینی ئەم کێـوه و ئـه ماوه بەرز و دور و درێژه له توانای مندا نیه. ناچار إستمدادم کـرد و داوای هیممـه له حەزرەتی پیر کرد و ڕۆیشتم أشهد بالله سبحانه به چەشنی کـۆتریٚ وه یـا پـووش پەلاشیٚ که با بیبا به ئاسمان چـوومه سـەر کێوەکـه و بـۆ نوێـژی عەسـر گەیشتمه دێـ

نۆتشه[1]. وه ئەو هێز و ووزەیەم تەنیا بەهیممەت و دەسەلاتی حەزرەتی پیر ئەزانی و بەس.

والاولياء ذو كراماتٍ رتب       وما أنتهوآ لولدٍ من غيرِ أب

یانی ئەولیا خاوەنی ئەنواعی پایە و پلەی کەراماتن بەلاّم نەگەیشتونەتە ئەوە لە دایك بن بە بێ باوك.

**ك ٢٨ بص:** حەزرەتی پیر لە دێی بیارە بوو ڕۆژێ پاش نوێژی جومعە بۆ لای حەوزێ چوو منیش قۆڵم گرتبو[2]، لە ڕێدا لە کاتی ڕۆیشتندا کاغەزێکیان هێنایە خزمەتی دای بە دەستمەوە فەرموی کە بیخوێنمەوە. کە سەیرم کرد بە چەشنێ نوسرابو کەسەرم لێ دەرنەکرد و لێی تێ نەگەیشتم و هیچی لێ حاڵی نەبووم کە زانی داماوم و بە دەستیەوە مەحتەلم ڕووی کرد بەولاوە هیچ ئەبەدا سەیری ئەو کاغزەی نەکرد لە هەوەڵەوە تا دوایی ئەو کاغزەی خوێندەوە مەعلومم بوو کە تەنها بەنووری فەراسەت بوو.

هەوا خوا هی توئم جاناو میدانم مکە میدانی

کە هم نادیدەمی بینێ و هم نتویشتەمی خوانی[3]

بەدل عاشق بەلاّم گیانم ئەزانم پێی ئەزانی تۆ

نـەبینراویش ئـەبینیتۆ نەنواسراویش ئەخوێنیتۆ

---

(١) نۆتشە: نۆدشە بۆ یەك واتا بەکارئەهێنرێ کە دێیەکە لە هەورامانی ئێران، کە هەندێ کەس ئەنوسن نۆتشە وە بەعزێ ئەنوسێ نۆدشە هەردووکی یەکە.

(٢) قۆڵ: یانی بازوو.

(٣) وە ئەصلی ئەم شیعرە ئاوایە کە حافظ علیه الرحمة ئەفەرموێ:

هوا خواهی تو أم جانا و میدانم که میدانی       که هم نادیدەمی بینّی وهم نتویشته میخوانی

وە بە عەرەبی لە کأس الشاربین نووسیومە:

لقد أهواك يا روحي وأدري أنك تدري       ترى ما لم تُرَ تقرأ معان ليس في السطر.

السطر: الخط على القرطاس بە کوردی یانی دێڕ (مترجم رحمة الله علیه آمین).

**ك٢٩ بص٩٣:** جاریٚ فرج الله ناوێکی سەمڕانی کە ئەچوو بۆ تەوێڵە بەودا دیارییەکم نارد بۆ خزمەت پیرم (خوا لێی خۆشنوود بێ) ئەو ناوبراوە لەبەر هەرزەیی قڕانێکی[1]، لێ دەرهێنا بوو، کە دابوویە خزمەتی فەرمو بوی ئەم نەقدە شتێکی لێ دەرهاتوە، هەڵگری دیاری‌یەکە دانی نابوو بە خەتاکەی خۆیدا و عەرزی کرد بوو بێ ئەدەبیم کرد لە ڕێگا قڕانێکی لێ دەرهێناوە. ئەمە جەنابی بەڕێز مەلا حامید بۆی نووسیبووم.

**ك ٣٠ بص٩٤:** باخێکم رواند لە دێی سەمڕان ئەهلی ئەو دێ زۆر بێ ڕەحمیان ئەکرد بە پەنهانی لە دزی کردنی میوەی ئەو باخە کەمتەرخەمیان نەبوو، شەکوای حاڵی خۆم بۆ خزمەت پیرم نووسی، فەرموبوی لەهەتیو و ساوا درێغی نەکات باقی تری ئێمە چاودێری ئەکەین ئەو ساڵە چەندەها ساڵی تریش هەر کەس بە ناڕاستی و دەست پیسی دەستی بۆ میوەی ئەو باخە ببردایە بە جۆرەها دەرد و بەسەرهات گرفتار ئەبوو، کاتێ ئەم کارەیان زانی یەکە یەکە ئەهاتن بۆ داوای لێ بوردن و لێ خۆشبوون وە بڕیاریان ئەدا هەرگیز ئیتر ئیشی وا نەکەن.

**ك ٣١ بص٩٤- ٩٥** : ڕۆژێ صۆفی علی ناو خەڵکی دێی دەروێشان[2]، هاتە خزمەتی زاتی خاوەن بەرەکەتی حەزرەتی شێخ عەرزی کرد، برایەکم چوە بۆ لای شاری (ئاینە)[3]، هاوڕێکانی هاتونەتەوە خەبەری مردنیان داوە.

ئەفەرمووی چی؟ بچم بە شوێن شتومەکەکانیا بیهێنمەوە یان نا؟ لە وەڵاما فەرموی نەچوە بۆ ئاینە بۆ ئەستەموڵ چوە وە نەش مردووە، وە مەبلەغی نەقدینە و

---

(١) قران: دراوێکی ئێرانە نزیکی (١٠) دە فلسی خۆمانە

(٢) دەروێشان: دێیەکە سەر بە شاری سنەیە لە کوردستانی ئێران.

(٣) ئاینە: شارێکە لە تورکیە.

ئەموال و ئەجناسی پەیدا کردوە وا بەڕێوەیە دێتەوە، پیاوەکە دووبارە عەرزی کرد ڕەفیقەکانی هاتونەتەوە قوربان گیان عەرزت ئەکەن مردوە.

ئەنجا فەرموی ئەگەر باوەڕت هەیە و تصدیق ئەکەیت ڕاستە کە نەمردوە براکەت ناوی علی مرادە وە خاڵێ بە لای ڕوومەتی چەپیەوە بەڕێوەیە ئەموالێ باشی پێیە، صوفی ناوبراو تصدیقی کرد بە ئەدەب زەمینی بەردەمی زیارەت کرد.

لە پاش دوو هەفتە یا زیاتر براکەی گەیشتەوە دێی دەروێشان لەگەڵ ئەموال و دەوڵەتی زۆرا وە ئەم ڕووداوە بوو بە هۆی بیروبڕوا پەیا کردن بۆ زۆر کەس لە ئەهلی ئەو وولاتە بە ئەولیا و دۆستانی خوا.

وە هەروەها کەسێ تر عەرزی کرد قوربان برام وە یا ووتی کوڕی چوار ساڵە بێ شوێن و هەواڵە بچم بە دوایا بگەڕێم ماوەیە بێ دەنگی فەرموو دوایی فەرمووی خوا عەفوی بکات.

لە کاتی ئەم دوو پرسیارە جەنابی فاضل ملا محمدی دزاوەری کە زاوای بوو[1]، حازر بوو عەرزی کرد قوربان ئەمانە چۆن ئەزانی؟ فەرمووی دوو لەوح هەن یەکێکیان پێی ئەڵێن لەوحی حەیات ئەوی تر پێی ئەڵێن لەوحی ممات سەیری ئەوانە ئەکەین، ئەگەر زیندو بێ لە لەوحی حەیاتا ئەی بینم و ئەزانم ماوە، وە ئەگەر مرد بێ ئەوا لە لەوحی مەماتا ئەی بینم و ئەزانم کە نەماوە عەرزی کرد یا شێخ لەوحەکان لە ئاسمانن؟ فەرموی نەء وان لە فوق العرش وهذا العلمُ عطاءٌ من الله, ئەم جۆرە زانستیانە دیارە خەلاتی خوایە.

---

(١) زاوای بوو: یانی زاوای حەزرەتی شێخ بوو.

مترجم ئەڵێ: ملا محمد إستغرابی نەکردوە لەوە کە ئەیزانێ بەڵام پرسیاری لە چۆنیەتی زانینەکە کردوە بە چ نەوعێ ئەیزانی؟ ئایا پێت ئەڵێن یا ئەی بینی؟ وە یا چۆن حەزرەتی شێخیش بۆی بەیان فەرموو چۆنیەتی دیتنەکە.

ك ٣٢ بص٩٦- ٩٧: ڕۆژێ حەزرەتی شێخ لە دێی تەوێڵە خانووی بۆ سیا
بینا ئەکرد مرید و مەنسوب هەموو خەریکی بەرد هێنان و قوڕ کێشان بوو
حەزرەتی شێخیش لە بەینی دەرگای خانوی قاتی سەرو دانیشتبوو هەردوو پێ
مبارەکی شۆڕ کردبووەوە لەو کاتەدا محمد سعید سلطان حوکمداری لهۆن
هەورامان لەگەڵ کۆمەڵێ لە تفەنگچی زۆر و بێ سامان لە لای ژووروی دێوە ها
خوارەوە لەشکرەکە بەر لەوە هەموویان بە بەردەمی حەزرەتی شێخا تێ پەڕێن
ئاخری هەموویان سلطان بوو کە گەیشتە نزیکی ئەوە بە بەردەمی شێخا بڕوا زۆر
گەورەیی و ڕێزەوە إحترام و قەدری لە شێخ گرت و سەلامی عەرزی شێخ کر
حەزرەتی شێخیش بە دەستی موبارەکی مەرحەبایەکی لێ کرد، لەناکاو سوڵ
لەرزی وە هەر لەوێدا پاڵیدا بە دیوارێکەوە لە دیواری ئەو خانووەوە وەستا لە نوێژ
عەسرەوە تا ڕۆژ ئاوابوو شێخ تەشریفی هەستا چووەوە بۆماڵەوە، سوڵتانی بێچارە
ڕێگەی خۆی گرتە بەر و ڕۆیی. حازرانی ئەو جێگە زۆر سەریان سووڕما لە
دەسەڵاتە و هێزی شێخە کە ئەمە چی بوو؟

وە هەروەها لە ساڵی ١٢٧٩ کۆچی حەزرەتی شێخ تەشریفی هات بۆ حەوشر
بەدرانی هەورامان ڕۆژێ حەسەن سوڵتان حوکمداری ئەوێ کە زۆر شەخصێ
لووت بەرز و نەفس زل بوو خاوەنی ٢٠٠٠ تفەنگچی بوو، بە تەهەوور
کەشخەیەکی زۆر لە خۆ زیادەوە داخڵی مەجلیسی حەزرەتی شێخ بوو دانیشت
پاش کەمێ لە هەیبەتی ئەو زاتە لە قسە کردن کەوت زمانی بۆ هەڵ نەهاتەوە وە لەس
یەك دەسی کرد بە ئارەق سڕین و ئارەق هەڵڕشتن وە کەوتە جووڵە و سەر سڕماز
سەراسیمە بوو تا کاتی نوێژی شێوان، ئیتر شێخ هەستا و تەشریفی بەرەو حەر
فەرموو سوڵتانیش خێرا چوو کەوشەکانی شێخی هێنا و بە پێی پەتی چوە ژێر باڵی
بەردەرگای حەرەم، لەویا حەزرەتی شێخ فەرموی خوا لێی خۆشنوود بێ کەوشەک
سوڵتان بێنن، ئەو کاتە کەوشەکانیان بۆ هێنا و کردیە پێی وە خوا حافیزی

ـزرەتی پیر کرد، حازرانی مەجلیس بە گشتی لەو بەرەکەت و حەرەکە سەریان
ـما وە بیروباوەڕیان نیسبەت بەو زاتە و بە دەسەڵاتی دوو چەندان زیادی کرد.

ئەو گشت هەیبەتە کەوا لەوایە      معلوم بزانە هەیبەتی خوایە

من کان لله فقد کان الله له، اللّهم کن لنا ولا تکن علینا بجاه سیّد المرسلین محمد
ـ وآله وصحبه.

**ك ٣٢ بص٢٦٤:** حاجی شێخ محمدی سەمڕانی تا ئێستە هەرچی خۆی دیبووی
ـیان کرا، ئەمجار هەندێ کەرامات ئەفەرموێ کە هاوەڵەکانی خۆی بۆیان
ـراوەتەوە، وە خۆی لەوێ حازر نەبووە بەیانی ئەکا و ئەفەرموێ:

جەنابی شێخ علی[1] کە زاتێ خاوەن کەشف و کەرامات و خاوەن تصرّفە ڕۆژێ
ـەوە دانیشتبووین بە بۆنە و هۆیەکەوە فەرمووی: فلانی ڕۆژێ بەناو گۆڕستانی بابا
ـرهەنگدا ڕابوردم ناڵە و هاوارێکی زۆر لەقەبرێکەوە کەوتە گوێم چوومە سەر ئەو
ـرە، کاتێ موڕاقیب بووم دیم کە ئەژدەهایەکی ڕەش بەناو قەدی ئەو مردوەدا ئاڵاوە
ـلای چەپیەوە سەری نابوە ناو (ناوك)ی مردوەکە لەگەڵ ئەیگەزی مردوەکە
ـەوتە هاوار و لەگەڵ سەری هەڵ ئەبڕی بێدەنگ ئەبوو، و لە هاوار ئەکەوت،
ـیان سەری ئەنایەوە بە ناوکیا ئەکەوتەوە هاوار و داد و ناڵە ناڵ سەری لائەبرد بێ
ـگ ئەبوەوە کاتێ گەڕامەوە بۆ ناو دێ، پرسیارم کرد کە ئەو قەبرە گۆڕی کێیە؟
ـتیان سەرکاری دێی تەوێڵە بوە لەوێ نێژراوە.

---

ـجەنابی شێخ علی: یەکێکە لە هەرە خەلیفە پایە بەرز و گەورەکانی حەزرەتی شێخ (شێخ محمدی
ـڕانی).
ـسەرهەنگ: قەبرستانێکە لە گۆڕستانی دێی تەوێڵە.
ـاقیب یان: تێفکریم وە ڕوچوم بۆ عالەمی مەعنا.

وه فەرمووی هەروەها جارێکی تر بەلای قەبرسانی بیارەدا تێ پەڕیم لەوێش داد و ئەفغانێ زۆرم گوێ لێ بوو، کاتێ چوومە سەر قەبرەکە وە متوجّهی[1] ئەحواڵی بووم کە بینیم دوو موکلی[2] کوێر و کەڕ بەسەر ئەو مردووەوە زاڵ کراون هەریەك گورزێکی ئاگرین یان بە دەستەوەیە لەگەڵ یەکێکیان بە مردووەکەیدا ئەکێشا هاواری ئەکرد، ئەم گورزەکەی لەسەر لائەبرد ئەو پیا ئەکێشا و هاواری ئەکرد، دوبارە یەکەم هەڵی ئەبڕییەوە دوەم پیا ئەکێشایەوە و ئەکەوتە هاوار بەم جۆرەم دی، تا گەیشتمەوە ناو دێی بیارە بە ناونیشان پرسیاری ئەو قەبرەم کرد، ووتیان گزیری بیارە بووە و لەوێ نێژراوە.

جەنابی گەورە و بەڕێز دەریای علوم و زانیاری مولانا حاجی مەلا أحمدی نۆتشەیی کەمەشهورە بە مەلا أحمدی مفتی، دانیشتوی دێی نۆتشە فەرموی:

حەزرەتی شێخ تەشریفی لە دێی بیارە بوو وام خەیاڵ بوو کاتێ خوا حافیزیم لە خزمەت حەزرەتی شێخ کرد لە تەوێڵە لابدەم (لەسەر ڕێوە کە نزیکی ماڵی شێخە) دیدەنی لە جەنابی عالمی زۆر زانا و گەورە و پایە بەرز مەلا نذیر بکەم، ئەوسا بچمەوە بۆ لای خۆمان کاتێ کە ئیجازەم وەرگرت حەزرەتی شێخ فەرموی کە ئەڕۆی مەچۆرە دێی تەوێڵەوە لێت قبووڵ ناکەن بە دیدەنی بچیت.

کاتێ کەوتمە ڕێ و ڕۆیشتم تا گەیشتمە بەردێی تەوێڵە إشتیاق و محبّتی دیداری مەلا نذیر منی ڕاکێشا بچمە خزمەتی، ڕووم کردە دێ دەسبەجێ دیانم هاتە ئێش، هەرچەند پێیەکم بەرەو ناودێ هەڵ دەهێناوە زیاتر ئەبوو ئێشەکە تا نزیك بوومەوە بەتەواوی ئێشی ددانم بێتاقەتی کردم بە چەشنێ توانای ئەوەم نەما قاچ هەڵ بڕم

---

(١) متوجهي بووم: ڕووم تێکرد، تێفکریم.

(٢) موکل: مەئموری سزا .... فریشتەی دیاری کراو بۆ تۆڵە لێ سەندنی خراپەکار.

گزیر: مختار، کوێخا، دەم ڕاست.

لەناكاو ملا نذير[1]، هاتە پێش و ووتی قبوولیان نیە من ببینی وە نایانەوێ چاوت بە من بکەوێ دەسبەجێ حاڵی بووم کە ئەم ئازارە لە بێ قەولی حەزرەتی شێخەوەیە،

(١) کەسێ خەیاڵی ئەوە نەکا بڵێ ئەگەر قەبرەکە هەڵ بدرێتەوە و گڵ و بەردی لەسەر لاچێ تەماشا بکرێ هیچی تیا نیە (ئەمانە شتێکن تایبەت بیستن و دیتنی گوێی دڵ و چاوی دڵە) پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: النومُ أخُ الموتِ خەو برای مەرگە تەماشا بکە پیاوێ لە لاتا ئەخەوێ پاش ماوەیە ووشیار ئەبێتەوە و بە خەبەر دێ ئەڵێ ئێستە لە خەوما لەگەڵ فلانا لە فلان شارا بۆ فیسار باخ ئەچوین یا بۆ فلان جێگە ئەڕۆیشتین، وە یا ئەڵێ شێرێ هات بۆم، یا مارێ پەلاماری دام یا حەپسیان کردم، وە ئەو پیاوە راست ئەکات خەوەکەی بەو شێوە دیوە یا لە خۆشیدا یا لە سزا و ئەشکەنجەدا بوە، تۆش کە لە لایدا دانیشتوی نە چاوت لە هیچەوە بوە، نە گوێشت لە هیچەوە بوە، ئەمە پێزانین و ئیدراکاتێکی گیانی و رۆحی‌یە چشتێکە لە تایبەتی عالەمی ئاخیرەتەوە پەیوەندی بە حەواسی ظاهیری دنیایی‌یەوە نیە.

ئەولیا کە مەشهورە کەشف و کەراماتیان هەیە ئەویش (٤) چوار جۆری هەیە:

١- **کشف القلوب**: یانی دەرخستنی ناو دڵی خەڵك کە بزانن چی تیایە.

٢- **کشف القبور**: یانی داپشکانی ئەحواڵی قەبر تا بزانن لە خۆشی‌دایە یا لە ناخۆشی خاوەنی ئەو قەبرە، وە کباری ئەولیا توانای لابردنی نارەحەتی ئەو مردوەیان هەیە.

٣- **الکشف الکوني**: یانی داپشکانی وەقایع و بەسەرهاتی کەونی ئەو شتانە کە لەم گەردون و جیهانەدا رووئەدات.

٤- **الکشف الإلهي**: بە مانای حصولی مەعریفەت بە مەراتبی عالەمی وجوب وە موکاشفەی عالەمی ئولوهیەت، وەك موشاهەدەی وەحدەتی خوا، وە موشاهەدە و بینینی فریشتەکان وە بینینی أرواحی پاکی ئەنبیا و ئەولیا، یا بینینی بەهەشت و دۆزەخ کە ئەمانەیە هۆی هێز و پتەوی بیروبڕوا وە إطلاع و شارەزابوون بەسەر زۆر لە ئەسرار و نهێنی‌یەکاندا وەك لە سەرەتاوە ووتمان **دین** دوو بەشە، بەشی أحکام وە بەشەکەی کە أسرار، وە عولەمای علمی ظاهر هەڵگری عیلمی ئەحکامن وە زانایانی عیلمی باطن مکلفی عیلمی أسرارن، یانی شەریعەت زاناکان هەڵگری عیلمی ئەحکامن، ئەحکام وەك زانینی عیلمی عقائد وەك زانینی فەرزی نوێژ و رۆژوو زەکات و حەج و موعامەلاتی صحیح و فاسد (دروست و نادروست) لەسەر کڕین و فرۆشتن و سەلەم و مارەیی و تەلاق و رەهن و شیرکەت و ساقات و ئەنواعی موعامەلە.

وە ئەسرار نموونەی ئەوانە و بەرزتر مەعریفەت و زانین و ناسینی زات و صفات و أفعالی حەزرەتی ربّ العزە جلّ وشأنە.

کەوابوو مسڵمان ئەبێ بڕوا و عقیدەی ببێ بە (أولیاء الله) وە کە معلوم بوو یەکێکە لە أولیای خوا وە کەسبی مەقاماتی طەریقەی کردوە، وە هەمموو ئەو ئەزکار و أفکار و موراقەباتە کە پێویستە لە ژێر دەستی مرشیدێکی حقی بە پایە گەیشتوودا ئەنجام داوە ئەگەر یەکێ لەم بابەتانە وە وەك شێخ علی مرحوم گێڕاویەتەوە ئەبێ هیچ تردید و تصورێ کە زەرەری بۆ ئیمان وە باوەڕ بێ نەیبێ، ئەی مانای چی لە دۆعادا ئەخوێنین و لە نوێژ و غەیری نوێژدا لەسەر فەرمودەی حەزرەتی رسول الله ﷺ کە ئەفەرموێ:
اللّهم إنّي أعوذُ بك من عذاب القبر ومن عذاب النار ومن فتنة المحيا والممات ومن فتنة المسيح الدجال,
یانی خوایە من پەنا ئەگرم بە تۆ کە بمپارێزی لە ئازار و ناڕەحەتی قەبر و لە ئاگری دۆزەخ و لە ژیان و مردن و لە فیتنەی دەجال.

چاك وایە هەمموو موسڵمانێ لە دوای تەحیاتی گەورە ئەم دۆعایە بخوێنێ ئەوجا سەلام بداتەوە وە مانای ئەوەی کە عەزاب و سەختی قەبر حەقە، خۆ ئەگەر ئێمە چاوی دڵ و ڕۆشناییمان کوێرە و نابینێ ئەهلی خودا ئەی بینێ، خوای تعالی لە قرآندا ئەفەرموێ: (أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ) ئایا وا ئەزانن کە ئێمە ئێوەمان بێ هوودە و بێ کەڵك دروست کردوە و لێ پرسینەوەتان نیە و ناگەڕێنەوە بۆ لامان فالله خيرٌ حافظاً وهو أرحم الراحمين.

باسێ هەیە بۆ ئێرە جێی خۆیەتی لە جەنابی عالی قەدر و بڵند پایە و شارەزا لە عیلمی أسرار گەورە و بەڕێز مەولانا خالید کوڕی حەزرەتی شێخ علاء الدين قدّس سرّه بیستم فەرموی:

کەسێ بوو ناوی فەرەج بە فەرەجە شێت بەناوبانگ بوو، چیرۆکی پیاوێ کە بە (فەرەجە شێت) بەناوبانگە بە کورتی ئەمەیە:

مەولانا خالیدی برای شاهی عوسمان گیان (قدّس سرّه) کە کوڕی حەزرەتی شێخ محمد علاء الدينی بیارەی شەریفە ئەمەیە ئەفەرموێ جارێك لە نزیکی گۆڕستانێ لەناوچەی (..........) گوێم لێ بوو ئەم زاتە کە بە فەرەجە شێت ناسرابوو لەسەر قەبرێ دانیشتبوو، وە پشتی لە من بوو ئەی ووت لەبەر خۆیەوە: دەڵێی خۆشبە پێ بەخشە عفوی بکە عەبدی خۆتە جار جاریش ئەگریا و ئەی ووت جا من هەقم چیە بەسەرەوە من کوێخای کوێم.

چەند جار ئەم پاڕانەوە و لالانەوەی بەکارهێنا لەدوا جار ووتی: ئا واباشە پێ بەخشە دەڵێی خۆشبە ئاوا باشە.

کاتێ ئاووڕی دایەوە منی بینی ڕووی تێ کردم ووتی: عەبدەکە بەو خوایەی ڕۆحی هەمووانی بەدەستە تا من ماوم ئەم قسەیە بگێڕیتەوە.

جا یەکێ لە قسەکانی ئەم فەرەجە ئەوە بوو بە هەمموو کەسی ووتوە (عەبدەکە) تەنیا بەمەرحوومی حەزرەتی شێخی علاء الدين (قدّس سرّه) نەبێ کە ووتویەتی (ریش سپی) چونکە لە زەمانی ئەودا ژیاوە.

ناچار گەڕامەوە و ڕێگەی نۆتشەم گرت، کە لە دێ دەرچووم کوتو پڕ دیانم ئارامی گرت و ئێشەکەی نەما.

**ك ٣٣ بص٢٧٢:** جەنابی خوا لێ خۆشبوو ملا محمودی سنەیی کە یەکێ بوو لە خەلیفە و قبوڵ کراوانی حەزرەتی شێخ گێڕایەوە ووتی: کاتێ چووم بۆ حیجاز بەر لەوە چوومە میصر پیاوێکی أصل کوردستانی کە ناوی گولاوی بەگ بوو بردمیە ماڵی خۆیان لەوێ خورما و ڕۆنێکی دەرخوارد دام پاش ماوەیە بەرەو مدینەی منوّرە کەوتمە ڕێ و ماوەی شەش مانگ لەوێ مامەوە و تووشی خەتەرە و وەسوەسەیە بووم لە ماوەی ئەو ٦ مانگە هەرچەند کۆششم کرد ئەو خەتەرەیە لانەچوو لە دوایی هەر بەو چەشنە مامەوە تا بە خزمەت حەزرەتی شێخ گەیشتمەوە، ڕۆژێ لە خزمەتیا عەرزم کرد حیکمەت چی بوو ئەو ماوە بەو خەتەرەوە مامەوە بە هیچ شێوەیەك رزگاریم لەدەست نەبوو فەرمووی بەهۆی دوو شت یەکەم لە ماڵی گولاوی بەگیکا لە میصر خورما و ڕۆنێکت خوارد دووەم نەم ویست لە من دور بکەویتەوە مەیلم وابوو بێیتەوە بۆ ئێرە...

**ك ٣٤ بص:** جەنابی مەلا ئیبراهیمی تەوێڵەیی فەرموی: حمە سعید سوڵتان ئەرزێکی لە دەوروبەری شارەزور ئیجار کردبوو، میرزالە ناوێکی بۆ سەر جێگە جووت و مەزرەعەی حەزرەتی شێخ ناردبوو کە رسووماتی وەربگرێ ئەم میرزالە خادمان و وەزیرانی شێخی زۆر ئەزیەت ئەکرد ناڕاستی و بێحیسابی لەگەڵ ئەکردن، حاجی إبراهیم ناوێ کە خزمەتکاری زووی ئەم زاتە پیرۆزە بوو گەلێ هاوار و داد ئەکات لە دەس براله و کرداری، حەزرەتی شێخیش ریشی سپی پیرۆزی خۆی بە دەس ئەگرێ و ئەفەرموێ لەم ئاخری عومرەدا سەگ کوژیم پێ ئەکەن لە پاش چەن ڕۆژ هەر ئەو میرزالە ناوەی شروری بێ نووره[1]، مەڕێ لە پیاوی شێخ داگیر ئەکات و سەری ئەبڕێ و کەبابێ زۆری لێ ئەکات و لە کاتی ئێوارەدا تێر و پڕی لێ ئەخوات

---

(١) مەزرەعە: کێڵگە.

بەیانی کە ئەچن بۆ لای تەماشا ئەکەن لەسەر جێگەکەی خۆی گیانی دەرچووە و مردوە، تەرمەکەی ئەبەن بۆ لای حمە سعید سوڵتان ئەویش ئەوە بە هیچ نازانێ، رەسوڵ ناوێ بە عەینی دەستوور ئەنێرێ بۆ سەر مەزرەعەکانی[1]، شێخ، رەسوڵی ناوبراویش بێ ئەدەبانە ئەجووڵێتەوە دەس بە جێ ئەویش نەخۆش ئەکەوێ و ئەمرێ و جەنازەکەی ئەبەنە لای حمە سعید سوڵتان، ئەنجا سوڵتانی بێ دەوڵەت ووریا ئەبێتەوە و واز لەو هەرزەیی‌یە ئەهێنێ.

**ك ٣٥ بص١٤١:** لە کاتی فەرمایشتدا کە ئەی فەرموو کەمێ زوبانی ئەو حەزرەتی (سراج الله والدین)ە کە حەزرەتی (شێخ عوسمانی سراج الدین)ە خوا لێی خۆشنوود بێ ئەگیرا یەکێ لە موخلیصان و مەحرەم بە حزوری عەرزی ئەکا کە هۆی ئەم زمانگیرییە چی‌یە؟ ئەفەرموێ لە عالەمی ئەعلاوە مۆرێکیان بە عینوانی قبووڵ بوون و عەبدایەتی بارەگاهی حەزرەتی ربّ العزة جلّت قدرتە ناوە بەسەر زوبانما جا هەمیشە ئەثەری ئەوە باقی‌یە عەرزی ئەکات سەجعی چی‌یە؟ ئەفەرموێ بەندەی خوا عوسمان.

**ك ٣٦ بص٢٧٧:** جەنابی زانا و پێشەوای زەمان حاجی ملا أحمدی نۆتشەیی مفتی فەرموی، جارێك حاجی عبدالکریمی بلّبەری[2]، خوازبێنی کچی مەلا حامیدی بۆ خۆی کردبوو، مەلا حامید ڕازی نەبووە کچی خۆی نەئەدایە لەو کاتەدا حەزرەتی شێخ مەلا حامیدی بۆ ئیشێك ناردبوو بۆ سلێمانی لەو بەینەدا کە ئەو لە سلێمانی بوو شەوێك لە خەوما مەلا حامید هاتبووەوە لەگەڵ حاجی عبدالکریمی ناوبراو پشێوی تێکهەڵچوونێکیان لێ ڕوودا، بۆ بەیانی کە بە خزمەتی شێخ گەیشتم و لە خزمەتیا دانیشتم ناکا فەرمووی کێ ئەمشەو لەخەویا مەلا حامید هاتبووەوە؟ من لەبەر سام و هەیبەتێ کەبووی لە دڵما لە بیرم چووبوو دووبارە فەرمووی کێ ئەمشەو لە خەویا

---

(١) شروری بێ نور: خراپی بێ فەڕ.

(٢) بلّبەر: دێیەکە لە هەورامان.

مەلا حامید هاتۆتەوە لەگەڵ حاجی عبدالکریم شەڕ و جەدەلیان کردوە؟ ئەنجا بیرم کردەوە هاتەوە یادم بە درێژی خەوەکەم عەرز کرد و بۆم گێڕایەوە.

**ك ٣٧ بص٢٧٨:** جەنابی پایە بەرز و خاوەن مەعریفەت وە گەیشتوو بە مقامی بەرزی طەریقەت سید قطب الدینی کەلجینی پایەبەرز بۆی گێڕامەوە فەرموی: لە خزمەتی حەزرەتی پیرا سلوکم ئەکرد خوا لێی خۆشنوود بێ داوای کرد چوومە خزمەتی فەرمووی لە ماڵەوە چاوەڕوانتن بچیتەوە بۆ لایان چاك وایە ماوەیە بڕۆیتەوە، ئیجازەم وەرگرت و هاتمەوە نوێژی مەغریب بوو لە میانەی قامەت و أللە أکبری نوێژ دابەستندا نەوعێ کەشف بۆی دەس دام، وام دی کۆمەڵێ لە مەشایخ پەیدا بوون ئیجازەیان دام توجّە[1]، بکەم وە ئیزنیان دام ئیرشادی ڕێگەی طەریقەت بکەم کاتێ کە لە نوێژەکە بووینەوە توجّهم لە چەند کەسێ کرد.

لە پاش ماوەیە تر هاتمەوە خزمەت حەزرەتی شێخ لەگەڵ منی بەدی کرد فەرمووی: تۆیان ئیزن داوە لە لایەن مەشایەخانەوە ئیجازەت وەرگرتوە لەمە بەدوا توجّە بکە وە لای ئێمەشەوە مەئذون بە.

جەنابی سیّدی بەڕێز فەرموی لەسەرەتای موریدیمەوە تا کاتی ئیجازەدرانم (٧٠) حەفتا ڕۆژی پێچوو کە لە فەڕ و بەرەکەتی توجهات و ئاثاری چاوەدێری عینایەتی حەزرەتی شێخەوە فەناو بەقای[2] أتمّ کە موستەڵەح و زاراوەی گەورە گەورانی

---

(١) **توجّە:** ڕو تێ کردن بە هیممەتی معنوی بۆهەر مەبەستێ أهلی توجّە بیەوێت.

(٢) **فەنا** بریتیە لە نیهایەتی سەیری إلی اللە. **بەقا:** إیشارەتە بە بیدایەتی سەیری فی اللە فەنا لە کاتێ تەواو ئەبێ کە بیابانی وجود و هەستی إنسان بە سواری بوراقی راستی بڕێ وە سەیری فی اللە کاتێ دەس ئەدات وە سەر ئەگرێ کە بەندە لە پاش فەنای تەواو زاتێکی پاکی لە پەیوەندی دنیا و ئاخیرەت بدرێتێ کە بە هۆی ئەوەوە لە عالەمی اتصافدا بە أوصافی إلهی وأخلاقی رەبانی تەرەقی بکات.

نەقشبەندی‌یە قدّس الله أرواحهم بۆی ڕوودام و بە تەواوی حاصڵ بوو دەستم کەوت ئەوەی کە دەستم کەوت الحمد لله ربّ العالمین.

**ك ٣٨ بص٢٧٨:** ساڵێ وەرزی هاوین بوو بەرەو ئاستانی پیرۆزی مرشید و دڵسۆزی ئوممەتی محمد المصطفی ﷺ حەزرەتی سراج الدین الشیخ عوسمان کەوتمە ڕێ وەختێ گەیشتمە ئەوێ حەزرەتی شێخ نەخۆش بوو، لە پاش چەن ڕۆژێ لە جەنابی زانای بەڕێز مەلا محمدی دزاوەری[1]، کە پیاوێکی صالح و وارع و زۆر بەدین بوو وە لەگەڵ مندا گەلێ بەمحبەت و میهرەبان بوو وەکو عەرز کرا زاوای شێخ بوو لێم پرسی نەخۆشی حەزرەتی شێخ لە چی‌یەوە بوو، لە وەڵامدا وتی: ئەمساڵ دوو مانگ لەسەر یەك پێکەوە خواردنی نەخوارد عەجایەب بوو کە حەیاتی قطع نەبوو، وە بەم نەخۆشی‌یە پاش چەن ڕۆژ شیفای بۆ هات[2].

---

(١) جەنابی مەلا محمدی دزاوەری زاتێکی حەق وێژی نیکتەزانی شەریعەت ڕەو بوو، وە ئەمەی لە خەڵوە و یەکیەتی و مەحرەمانە بۆ گێڕامەوە.

(٢) بەسەرهات و باسێکی خۆش **(فصل بالخیر)**

نموونەی نەخواردنی حەزرەتی شێخ لەم بەسەرهات و ڕووداوە ئەچێ کە ئەبینین حەزرەتی مولانا خالید قدّس الله روحه فەرموویە کاتێ لە سەفەری هیندستان هاتمەوە ڕێگەم کەوتە دێیەك، خەڵکی ئەو دێیە پێیان ووتم لەم دێیەدا (زاتێکی زۆر عەزیز هەیە) ماوەی ١٤ چوارده ساڵە هیچی نەخواردوە و نەخەوتوە، وە ڕوو بە قیبله لە حوجرەکەی خۆی دانیشتوە لەگەڵ هیچ کەس هیچ قسە ناکات، بەڵکو دەوروبەری ئەو جێگەی نزیکی ئەوە وێرانە لە سام و هەیبەتی ئەو زاتە کەس ناتوانێ بەو گەڕەکەدا تێپەڕێ.

حەزرەتی مەولانا خالید فەرمووی من زۆر بە ئارەزووەوە بۆ چاوپێکەوتنی دیداری ئەو نیەتی زیارەتم کرد ئەوانە کە لەوێ حازر بوون نەیان ئەهێشت ووتیان مەڕۆ ئەمریت گوێم پێ نەدان و ڕووەو مەنزڵەکەی کەوتمە ڕێ لە هەوەڵەوە هەیبەتێ لێی ڕوودام قاچم بە یەکا پێچرا وە ئەندامم سست بوو داوای کۆمەکی و ئیستیمداد و بە هانا چوونم لەهیممەتی گەورە گەورانی طەریقەی نقشبندی کرد وە خۆمم گەیاندە قاپی حوجرەکەی لەوێدا دوو ئەوەندە ترس و دەهشەتم بۆ پەیا بوو، دووبارە پەنام بە ڕۆحانیەتی زنجیره و

سلسیلەی مەشایەخان بردەوە داخلّی حوجرەکەی بووم، بە ڕاستی بە دەستی ئەو زاتە لەناو لیباسەکانیا کە کۆن بوو هەروەك چرایەکی زۆر ڕووناك ئەدرەوشایەوە، بە ئەدەبەوە ووتم السلام علیك لە جێی خۆی هەستا و فەرمووی وعلیك السلام ورحمة الله تعالی وە دانیشتەوە ئیتر هیچی نەووت، لە پاش ماوەیە چاوەڕوانی عەرزم کرد ئەمانەتێکیان داوە بە دەستمەوە کە بڕۆم بیگەیەنم بە وانەی کە داواکاری ڕێگەی خواناسینن لطف و توجّهی بفەرموو شایەد لە بەرەکەت و فەڕ و ئەنفاسی شەریفی تۆوە ئەم ئەمانەتی‌یە بە ئەهلی خۆی بگەیەنم لە وەلاما فەرمووی: مەولانا خالید بۆ بەغدا بڕۆ ماوەیە تر بە پێوە وەستام، زۆر متحیّر و عەجایب و سەرسام مان چۆن بە سەلامەتی گەڕامەوە.

وە ئەم ڕووداوە نیشانەی ئەوەیە ئەو ماوە هیچی نەخواردوە کەس نەیتوانیوە هاتوچۆی بکات.

بەسەرهاتێکی تر لە زەمانی حەزرەتی شێخ عوسمان لە سابلاخ

لە زەمانی حەزرەتی شێخ عوسماندا خوا لێی خۆشنوود بێ لە شاری مەهاباد لە دێی حەمامیان پیاوێ بوو ئەیانوت ماوەی ١٥ ساڵە نە هیچی خواردوە نەخەوتوە بە غەیری سەبیل (چوبوخ) کێشان خۆراکێ تری نەبووە.

جارێ: **شجاع الملك** سەردار و حاکمی ئەوێ بۆ تاقیکردنەوەی لە هۆدەیەکدا تووتن و چوبوغی بۆ ئەخەنە هۆدەکەوە، وە قاپی ژوورەوە بە گەچ و بەرد مەحکەمەم ئەکەن تا ماوەی یەك مانگ لە پاش ئەو ماوە قاپی ئەڕووخێنن و ئەی هێننە دەرەوە بێ دەرد و زەحمەت هەروەك جارانی خەرکی سەبیل کێشان ئەبێ.

حەزرەتی شێخ ئەی فەرموو: ئەو شەخسە یەکێکە لە ئەبدال والله تعالی أعلم بحقیقة الحال وبأمرهُ والوقائع من الأمور في الأزمنة والدهور.

وە هەروەها لە بەرواری شەوی پێنج شەممەی بیست و شەشەمی مانگی شەوال (شەشەلان)ی ساڵی ١٣٠٨ کۆچی سلاو و درودی بێ پایانی خوا لە خاوەنی کۆچ و یارانی بێ.

لەم بەروارەدا لە مەهاباد لە مزگەوتی خوا لێ خۆشبوو میرزا محمد ڕەزای وەزیر حاجی حمە صالح بەگی کوڕی فیض الله بەگی تیکانتەپەیی موکریم چاوپێکەوت ئەیووت:

ئەو پیاوە حەمامیانی‌یە کە لە خواردن و خواردنەوە بێ مەیل بووە ناوی مامە علی بوو، خوا لێ خۆشبوو عەزیز خانی سەردار کولی لە شاری تەوریز چۆنیەتی ئەم زاتەی لە چەن کۆڕ و مەجلیسدا بەیان کردوە کە لەوەو بەر بڕوایان پێی نەبوو بوو ناردویانە بە دوایا بردبوویانە ژوورێکەوە ماوەی ١٠ دە ڕۆژ چەند سەربازێکیان دانابوو بە دەوریا پاسداری‌یان کردوە بەلام تووتن و سەبیلیان بۆ دانابوو، پاشتر بۆیان دەرکەوتبوو کە پێویستی بە نان و ئاو نیە بە ڕێز و قەدرەوە ڕەوانەیان کردبووەوە وە هەروەها حاجی حمە صالح بەگ ئەیووت:

**ك ٣٩ بص٢٨١:** برای عەزیز جەنابی مەلا إبراهیمی تەوێڵە فەرمووی لە چەند کەسی باوەڕ پێ کراوم بیست کە بۆیان گێڕامەوە: عەزیز پاشا ناوێ لە ئەستەمبۆڵەوە دێت بۆ سلێمانی بەشێوەی حوکمداری ئەم شارە، لە خزمەت حەزرەتی شێخدا إظهاری إخلاص و ئیرادەت ئەکات، وە دیاری و نیاز لەگەڵ عیجز و خۆ بە کەم زانی لە حوکمداریەتی سولەیمانی ئەینێرێتە خزمەتی، دوا بە دوای ئەوە خۆیشی ئەچێ بۆ دیدەنی حەزرەتی شێخ، شێخ ئەفەرموێ ماوەیەکی تر پاشا بە روتبەی موشیر بۆ شاری مەککەی پیرۆزت ئەنێرن، لە پاش شەش مانگ تەلگراف ئەکات پاشا بۆ ئەستەمبوڵ کە لە حوکمداری سلێمانی واز ئەهێنم کە ئەگاتەوە ئەوێ یەکسەر بە ڕووتبەی موشیری ئەینێرن بۆ جیدە و مکەی مکرّمە وە حوکمداری و فەرمانڕەوایی ئەوێ ئەدرێتە دەستی وە تا ماوەیە دوور و درێژ لەو مەقامە ئەمێنێتەوە.

**ك ٤٠ بص٢٨٢:** جەنابی سەید محمد أمینی کوڕی سید قطب الدّینی کەلچینی (خوا بیان بەخشێ) بۆی گێڕامەوە فەرمووی: (ماین)ێکی زۆر بە نرخم هەبوو، تووشی نەخۆشیەکی زۆر گران و بە شیدەت بووم ئومێدی ژیانم نەما، ڕۆژێ حەزرەتی شێخ تەشریفی ئەچوو بۆ باخی (هانە سێو) منیش بە هیوای شیفا و ڕزگاری حاڵەتی نەخۆشیەکەی خۆم عەرز کرد، ئەو زاتە لەناو ڕێدا ماینەکەی منی بەدی کرد فەرموی ئەمە ماینی کێیە؟ عەرزیان کرد قوربان ماڵی سەییدە، هەر لەوێدا وەستا خۆیدا بەسەر گۆچانەکەی خۆیا وە بە توندی و تیژی سەیرێکی منی ئەکرد و

---

چەندەها جار دیومە بەناو دێهات و خێڵی دەوارنشیندا گەڕاوە لە هیچ کاتێکا سەگ لێی نەئەوەڕی وە بۆی نە ئەچوون بەڵکو کلکە سووتەکەیان بۆ ئەکرد یانی کلیان بۆ رائەوەشان وە ئەو زاتە هەمیشە بێ دەنگو بێ قسە بوو رحمة الله تعالی علیهم وجعل الله عاقبتنا بالخیر آمین.

لە قودرەتی خوا عەجەب مەمێنە — پڕ بە دڵ بڕوا بەمانە بێنە

عەجەب لە ئەهلی هەوا ونەفسانی — خۆی نەی بوو ئەوی وەکو خۆی زانی

سەیرێکی ماینەکەی ئەکرد، دووبارە سەیرێکی منی ئەکرد و تەماشایەی ماینەکەی ئەکرد، تا چەند جار دووپاتی ئەکردەوە، دوایی تەشریفی پیرۆزی ڕۆیشت، دەسبەجێ من لەش سووکیم لە خۆما هەست کرد وە هەر ئەو ڕۆژە بە تەواوی نەخۆشیم لە لەشدا نەما، بەڵام ماینەکە بە دەرد و بەڵایەکی گران دوچار بوو، تا سێ ڕۆژ بەو دەردەوە ئەتلایەوە، لە پاش سێ ڕۆژە بە هیلاکەت گەیشت و گیانی تەسلیم بە گیانبەخش کردەوە ئیتر تێگەیشتم کە ئەو قطبە خاوەن دەسەڵاتە بەهێزی تصرّف ئەو بەڵایەی لە من ڕەد کردەوە و بۆ ماینەکەی نارد لله الحمد والمنّة.

ئەقطاب ئەتوانن لە لای خوداوە　　　کە گوللەی دەرچوو بێننە دواوە[1]

**ك ٤١ بص ٢٨٥:** جارێ جەنابی حجةُ العلماء حاجي ملا أحمدی نۆدشی علیه الرحمة فەرمووی: بە هۆی ناکۆکی و شەڕ و شۆڕی هەورامی من بە ماڵەوە کۆچم کرد و چوومە بیارە، وە حەزرەتی شێخ لەو کاتا هەر لە بیارە بوو، قەزا و قەدەر کوڕێکم لەوێ وەفاتی کرد، کاتێ تەسلیم بە خاکمان کرد و دوای بەجێ هێنانی ئادابی پرسە و سەرخۆشی چووم بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ پێی فەرموم لە ئێستەوە تا ١٠ دە مانگی تر خوا لە باتی ئەم کوڕە کوڕێکی ترت پێ ئەبەخشێ لە پاشا هەر لەو کاتەوە حیسابم کرد خودای تعالی بە عەینی ماوە و کات کوڕێکی پێ مەرحەمەت کردم ناوم نا عارف وە لەو مەجلیسەدا کە ئەم فەرمایشتەی گێڕایەوە عارفی بانگ کرد وە بە ئەندازەی چارەکە جزمێ قورئانی پیرۆزی بە تیلاوەتێکی خۆش خۆند، وە کوڕێکی ظریف و تازە پێگەیشتوو بوو منیش کە هاتمەوە کتێبی (سلسلة الذّهب)م بە دیاری بۆ ئەو کوڕە نارد.

---

(١) ئەمەش دەقی فارسییەکەیەتی (نصّ):

أولیارا هست قودرت أز إلاهـ　　　تیری جەستە باز گرداند زراه

**ك ٤٢ بص ٢٨٤:** محمد سليم ناو خەڵكی (تیلەكۆ) بۆی بەیان كردم ووتی جاریٚ ویستم لە وولاٚتی خۆمانەوە بچم بۆ خزمەت شیٚخ شەویٚ لە مەنزلیٚكا بووم ئافرەتیٚ لەگەڵما داوی فەسادی بۆ نامەوە، منیش مەیلی بەشەری و ئارەزووی نەفسانی پاڵی پیٚوەنام بۆ كردەوەی ناهەموار و ئیشی نالەبار، لەناكاو دڵم دالەرزی وە لەو لەرزەوە هەموو ئەندامم كەوتە تەپە تەپ و دالەرزین وە هەموو رەگی بەدەنم سست بوو تیٚگەشتم كە ئیش لە جیٚگەیە ترەوەیە وە ئەم حاڵە لە لایە ترەوە ڕوویدا دەسبەجیٚ پەشیمان بووم، وە بە تەوبە و إستغفارەوە دەرپەڕیمە دەرەوە، هەر بەو نیوە شەوە ڕیٚگەم گرتە بەر لە پاش چەن ڕۆژیٚ گەیشتمە مەنزڵگای حەزرەتی شیٚخ وەختیٚ بە زیارەتی نایل بووم و عەرزم كرد هیوادارم لە هەموو وەخت هۆشت پیٚمەوە بیٚ فەرمووی ئەگەر موراقەبەی ئەحواڵی تۆم نەكردایە فلاٚن شەو لە فلاٚن مەنزڵ لەو فەسادە ڕزگار نەدەبووی.

**ك ٤٣ بص ٢٨٦:** مەلا ئیبراهیمی تەویٚڵەیی گیٚڕایەوە ووتی: لە دایكی خۆم[1] بیست كە حەزرەتی شیٚخ عوسمان حەرەمیٚكی بوو سیّد بوو ناوی (خاتوون) بوو، فەرمووی: نووریجان هەمیشە پشیلەیەك دیٚت بۆ لام شكاتی لە تۆ هەیە، ئەویش عەرزی ئەكات من ئیشم بە پشیلە و پشیلە ئیشی بە من چیە؟ وە ئەفەرمویٚ: پشیلەكە ئەڵیٚ بە ناحەق منی كوشتوە ئەویش ناچار دان بە ڕاستی ئەنیٚ و ئەڵیٚ والله شیٚخ ڕاست ئەفەرمووی ڕۆژیٚ لە ماڵی باوكی خۆما نانم ئەكرد پشیلەیەك هەر ئەهات دەمی ئەخستە هەویرەكە و ئەی خوارد منیش هەر دەرم ئەكرد و دوورم ئەخستەوە، دووبارە ئەهاتەوە ئەمجاریش دوورم ئەخستەوە وازی نەهیٚنا ئەمجا وام لیٚدا گیانی پیا نەهاتەوە، تەوبە ئەكەم.

(١) دایكم ناوی (نوریجان) بوو.

**ك ٤٤ بص ٢٨٦:** خوا لیٚ خۆشبوی خاوەن بەرەکەت شێخ عبدالکریم ی سەرگەتی[1] بۆی بەیان کردم فەرمووی: لە خزمەت حەزرەتی شێخ عوسمان، بەرەو شاری سلێمانی کەوتینە ریٚ لە بەینی بەیانی و نیوەڕۆدا لە چێشتەنگاودا گەیشتینە مەنزڵی حەزرەتی شێخ لە بنکی دارێکا دانیشت بۆ حەوانەوە، منیش قلیانێکم ئامادەکرد و بردمە خزمەت حەزرەتی شێخ و تقدیم کرد، ئەو زاتە پڕ فەڕ و لطفەش لەو قلیانە چەن نەفەسێکی لێدا، لەو کاتەدا جوولەکەیەك هات بۆ خزمەتی و دانیشت، جەنابی حەزرەتی پیر، قلیانەکەی دایە ئەویش وەری گرت و دەستی کرد بە قلیان کێشان، شێخ عبدالکریم ووتی دڵم زۆر نارەحەت بوو کە بۆچی شێخ کە ئەو قلیانەی منی دا بە دەس ئەو جوولەکەیەوە بۆی پیس کردم دوایی قلیانەکەم وەرگرتەوە چوومە جیٚیەکی پەنامەکی جێگا دەمی کابرای جوولەکە چەندە بوو ئەوەندەم لیٚ بڕیەوە، ئەنجا قلیانێکی ترم تێکرد بردمەوە بۆ خزمەتی شێخ پاش ئەوە کە ئاگرم خستە سەری ئەو زاتە لەگەڵ دیمی بە زەردە خەنەیەکەوە سەیر کردم و نەفەسی لیٚ داو دوبارە دایەوە بە دەس جوولەکەکەوە، من سەرم سڕما لەو کارەساتە جەسارەت بووم نەم توانی بڵێم بۆچی؟ تا کاتیٚ کەوتینە ڕیٚ ئەمجا جوولەکەکە عەرزی کرد قوربان سبەینیٚ بۆ چێشتەنگاو تەشریفت لەکویٚ ئەبیٚ وە لە چ مەنزڵێك لائەدەیت.

فەرموی لە فلان جێگە ووتی قوربان ماڵ و منالی دێنە خزمەتت، کە وەختیٚ گەیشتینە ئەو جێگە لە کاتی ناوبراودا جوولەکەی بەختەوەر خۆی و ماڵ و منالی هێنا هەموو مسلمان بوون الحمد لله الّذي هدانا لهذا وما كنّا لنتهدي لولا أن هدانا الله.

---

(١) ئەم زاتە پیرۆزە سیّد بوو، وە یەکیٚ بوو لە قبوڵ کراوان و خلیفەی حەزرەتی شێخی سراج الدین وە هەروەها حەزرەتی شێخ کچی خۆی پیٚ بەخشیوە، هەروەکو لە سەرەتاوە بەیان کراوە.

**ك ٤٥ بص ٢٨٧:** جەنابی بەڕێزی ئەمجەد فضیلەت مەدار مەلا أحمد[١] بە دورو درێژ بۆی باس کردم وتی: جەنابی ئەدیبی پایە بەرز عالمی فاضل سیّد عبدالرحیمی مەولەوی تاوەگۆزی[٢] کتێبی لە عقائدی إسلامی دائەنێ و کە تەواوی ئەکات ئەیبا بۆ خزمەتی حەزرەتی شێخ عوسمان سراج الدین قدّس سرّە عەرزی ئەکات ئەم کتێبەم تەواو کردوە بە زمانی کوردی وە وا لە باخەڵما وە هەتا ئێستا پیشانی کەسم نەداوە، وە ئێوە چەند جار فەرمووتانە هەر کاتێ بمەوێ بە خزمەت حەزرەتی رسول الله ئەگەم ﷺ وە مطالب و پرسیاری خۆمی عەرز ئەکەم، وە وەڵام لەو حەزرەتە وەرئەگرم، ئێستەش ئەم کتێبەم هۆنیوەتەوە یانی هەڵبەستە و بە شیعر دامناوە وە هێناومەتە خزمەتت داواکارم لە خزمەتتانا کە لە خزمەت حەزرەتی رسول الله علیه الصلاة والسلام بۆم پرسیار بفەرموو ئایا ڕاستە و دروستە یان نا؟ ئەگەر صحیحە و موافقی حقّە با نوسخەی لێوە بگیرێ نەشر بکرێ وە ئەگەر بێ سوودە و بە کەڵك نایە چاك وایە ڕازێنراوەی من کەس نەی بینێ. ئەنجا حەزرەتی پیر ماوەی نیو سەعاتێ تەواو چوە حاڵی موڕاقەبەوە لە پاشا سەری بوڵند فەرموو: ووتی مەولەوی بە خزمەت حەزرەتی پێغەمبەری خوا گەیشتم ﷺ وە لە داواکاری‌یەکەی تۆ پرسیارم عەرز کرد فەرمووی هەمووی صحیح و من لێی ڕازیم و جێگەی ڕەزامەندی ئێمەیە بێجگە لە پێنج شیعری. دووبارە عەرزم کردەوە هەموو کتێبەکە سەراپا لەو (٥) پێنج شیعرە خاڵی نیە لوطف بفەرموو بەڵکو ڕوون ببێتەوە کامانەن، ئەنجا حەزرەتی پیر ماوەیە تر موڕاقیب بوو سەری هەڵبڕی و فەرمووی: مەولەوی حەزرەتی رسول الله ﷺ

---

(١) ئەم زاتە بەڕێزە أصل جوانڕۆیی بووە، وە مەشهور بە (مەلاباشی) بە کوردی یانی نازناوی (مەلا چاك)ی وەرگرتوە.

(٢) نازناوی مەولەوی پایەبەرز لە هەڵبەست وە هۆنراوەدا بە (مەعدوم) بەناوبانگە کە خاوەنی دانراوەی کوردی (العقیدة المرضیة) کە بە ئیمان وە باوەڕ بەناوبانگە، وە لە عەرەبیدا خاوەن کتێبی (الفضیلة)یە کە بە ڕاستی هەردووکیان زۆر بەرز و بە نرخن. وە چەند هۆنراوەی تری هەیە، وە کتێبێکی لەعقائدی إسلام بە زوبانی کوردی ئەهۆنێتەوە.

ئەفەرمویٚ ئەو پێنج شیعرە لە ئەصڵێ پێنجەم دایە، مەولەوی دیسان عەرزی ئەکاتەوە ئەڵێ قوربان ئەصڵی پێنجەم لە ٣٠٠ سێ سەد شیعر زیاترە ئەبێ ئەوە بە تەواوی لابەرێ لوطف بفەرموو با ئاشکراتر بێ و ڕوونتر ببێتەوە ئەفەرمویٚ مەولەوی کتێبەکە دەربێنە، مەولەویش لە باخەڵیا ئەبێ دەری ئەهێنێ حەزرەتی شێخ پەنجەی موبارەکی ئەخاتە سەر بەرگی کتێبەکە وە موڕاقەبەیە زیاتر لەوانی پێشووتر ئەکات، ئەنجا بە حاڵەتێکی زۆر عظیمەوە بە چاوێ نێرگس ئاساوە سەر هەڵ ئەبڕێ وە ئەفەرمویٚ مەولەوی حەزرەتی رسول الله ﷺ ئەفەرمویٚ ئەو پێنج شیعرە لە بەیانی کفرەوە بوە شتێکیان لە خەودا پێ ووتوە بە گومانی خۆی بەیانی ئەو خەوەی خۆی کردوە بە شیعر، وە داخڵی کتێبەکەی کردوە کاتێ کتێبەکەیان کردەوە، ئەو خەوەیان دی کە لە پێنج شیعرا هۆنرا بوەوە، ئەنجا مەولەوی ئەڵێ گیانم بە قوربانت بن ڕاست و دروستت فەرموو لە مانگی ڕەمەزاندا ئێوارەیەك لە پاش بەربانگ کەمێ چاوم چوە خەو، پێیان ووتم هەروەك بیروباوەڕی ئیسلام، سێ پلەیە یەکەم لە کوفرەوە بۆ ئیسلام دووەم عەمەل کردن بە کاروباری ئیسلامەتی سێیەم تورەقی کردن و سەرکەوتن بۆ مقامی پایە بەرزی هەروەها کوفریش (٣) سێ پلەیە کاتێ بێدار بومەوە هەر بەو گومان و خەیاڵی خەو بینینەوە ئەم مانایە لە (٥) پێنج شیعرا هۆنیەوە[1]، حەزرەتی شێخ فەرمووی ئەو پێنج شیعرە لە کتێبەکەت دەربێنە ئیتر باقیەکەی (جێی ڕەزامەندی) ئەو سەروەری دنیا و دینەیە و لێ ڕازیەیە صلوات الله وسلامه عليه وعلى آله الطاهرين وأصحابه أجمعين وأزواجه أمهات المؤمنين و ذريّته إلى يوم الدين.

جا هەر لەبەر ئەوە کە فەرموی مەرضی جەنابی فەخری عالەم سەروەری أولادی ئادەمە کتێبەکەی ناونا (العقيدة المرضية)[2].

---

(١) یانی (٣) پلەکەی کوفر بە خیاڵ و گمانی خۆم دروستم کرد.

(٢) کە بە عەرەبی بە (جێ ڕەزامەندی) ئەووترێ **مرضي**.

خاوەنی بارقات السرور شێخ محمدی سەمرانی ئەفەرموێ لە پاش ئەوە مەلا أحمدی مەلا باشی ئەمەی بۆ گێرامەوە خۆشم چەند جار بە عەینی شێوە و بەیان ئەم بەسەرهاتەم لە جەنابی مەولەوی بیستوە بێ ئەوەی هیچ زیاد و کەمێکی بێ"[1].

وە جەنابی مەولەوی لە کتێبی (العقیدة المرضیة)دا بەم چەن شیعرە عەرەبی‌یە باسی ئەکات و ئەفەرموێ:

رسـالة جامعـة المسـائل    یحبّهـا قلـب ذوي الفضـائل

وبعـدما نظّمتـها وأخـبرا    وسـیلة الخلـق لخـالق الـدری

قطـب الزمـان شـیخنا عثمـان    فـاضَ علـی جنابـه الرّضـوان

بأنّـه رأی الـنبيّ الأکرمـا    صـلی علیـه ربّنـا وسـلّما

یقـول ذي رسـالة الینـا    محبوبـة مرضـیّة لـدینا

سمّیتـها عقیـدة مرضّـیة    لـدی جنـاب افضـل البریّـة

صـلی علیـه الله مـن نوالـه    وصـحبه وحزبـه وآلـه

بـه لناقـد عمّـت العوائـد    صـحّت وتمّـت بهـم العقائـد[2]

---

(١) وەرگێڕی ئەم کتێبە لە فارسی‌یەوە بۆ کوردی ئەحمەدی بێ ناونیشان خەتاباری هیچ نەزان، بێ طاعەتی سەرگەردان ئەڵێ: فضیلە کە ئەویش کتێبی هۆنراوەی (مەولەوی)یە بە زمانی عەرەبی ٢٠٣١ شیعرە هەر لە مەعنای (عقیدة المرضیة) دایە، وە کتێبێکیش بەمانای بەفارسی هەیە وە ئەم کەرامەتی ناوبراوی تیادا بەیان کراوە.

وەك ئەڵێ: أشعارُها جائت طباق الغرضِ    إشعارُها شافٍ لکلِ مرَضٍ

(٢) یانی بە کوردی ئەم نامەی منە هەرچی مەسەلەی کەلامی و باوەڕە تێ‌ی دایە وە دڵی مرۆڤی خاوەن ڕێز و بەنرخ ئەم ڕیسالەیەی خۆش ئەوێ، ئەنجا پاش ئەوە ئەم کتێبەم هۆنیەوە وە بەهۆی دەسگیرو وەسیلەی مەخلوق بۆ لای خالقی کە حەزرەتی شێخ عثمانە و قطبی زەمانە فەیزی خواو ڕەزای خوای بەسەرا بڕژێ خەبەری دا کە حەزرەتی ڕەسولی ئەکرمی دیوەو فەرمویەتی ئەم ڕیسالەیە لەلای ئێمە زۆر خۆشەویست و پەسەندەو لێ‌ی ڕازین لەبەر ئەمە کە ووتمان ناوی ناوە (عقیدەی مرضیة) لە خزمەت

**ك ٤٦ بص ٢٨٨:** دیسان جەنابی مەلا أحمدی مەلا باشی گێڕایەوە ووتی من و شێخ محمدی فخر العلماء هەردوومان لە شاری تاران لە لای مەرحومی والی شێوەی کەنارگیریمان گرتبوو، وە ماڵ و کەلوپەلمان بردبوە دێی (ڕۆستەم ئاوا) لە قەراغی شار، ئاگاداریان کردین کە لەلایەن شاوە فەرمان دراوە هەرچی خەڵکی کوردستانی سنە هەیە بە پەل بەستراوی بنێردرێن بۆ سنە و بدرێنە دەست (نەجەف قولیخان)ی دادگەر ناچار بووین من و فخر العلماء لە دێی سەڵتەنەت ئاوا لە نزیك چەمێ لەژێر دارێکی بێ خۆمان شاردەوە، بە دەرونێکی پاك و دڵێکی ساغ پەنامان بە ڕۆحانیەتی شێخ عوسمان خوا لێ خۆشنوود بێ برد ووتمان یا شێخ هیممەتێ لە کاروباری ئێمەدا بفەرموو ئەگەر ئەمجارە رزگار بووین نەزر بێ لەگەڵ لەم سەفەرە گەڕاینەوە هەردووکمان سەرمان بکەین بەپێ وە بێین بۆ خزمەتت لە پاشا رزگار بووین و گەڕاینەوە بۆ سنە وە بەسەر دەوڵەت و سامانی خۆماندا کەوتین پەیمان و نەزری خۆمان لە یاد چووەوە، وا ڕێکەوت پاش ماوەیە من بەخزمەتی گەیشتم وە دەستی موبارەکیم زیارەت کرد فەرموی هاوڕێکەت لەکوێیە؟ عەرزم کرد فلان و فلانی جوانرۆیی‌یە بە خزمەت ئەگەن، فەرموی ئەوانە نالێم ئەو ڕەفیقەت ئەلێم کە لە سەڵتەنت ئاوای نزیکی تاران نزیکی ئەو چەمەی لە ژێر بی‌یەکدا خۆتان شاردبوەوە، وەنەزرتان کرد ئەگەر ئەم سەفەرە رزگار ببین بچین بۆ لای شێخ عوسمان ئەو ڕەفیقەت ئەلێم، ووتم قوربان وەڵلاهی ڕاست و دروست ئەفەرموی وابوو بەلام من هاتم شێخ محمدی فخر العلماء بەنصیبی نەبوو.

---

پێغەمبەر سەڵەواتی خوا لە خەزێنەی عەطا و بەخشین بەسەر خۆی و آل و ئەتباع و صەحابە یارانی‌دا برژێ، هەر بەهۆی پێغەمبەرەوە بەرەکات و واریداتی ظاهری و معنوی عام بوو بۆ هەمو کەس، وە بەهۆی صحابە و ئال و ئەحزابی ئەوەوە دروست بوو وە تەواو بوو عقائید و بیروباوەڕی ڕاست و دروستی ئیسلام والسلام.

**ك ٤٧ بص ٢٨٩:** هەروەها هەمان پایە بەرز مەلا أحمدی مەلا باشی فەرموی لە خزمەت شێخ بووم دوو نەفەر هاتن و دەستی حەزرەتی شێخیان ماچ کرد یەکێ لەو دوانە ووتی قوربان ئەمە بزنێکی منی دزیوە فەرموی بچن بۆ لای مەلا حامید شەرع بکەن ڕۆیشتن و هاتنەوە، شێخ لێی پرسین چیتان کرد؟ کابرای خاوەن بزن ووتی ویستی سوێند بخوا منیش عەفوم کرد و لێی خۆشبووم وسوێندم نەدا شێخ فەرمووی **سبحان الله** سوێندت ئەخوارد؟ عەرزی کرد بەڵێ قوربان بە ناحەق داوا ئەکات ئاگام هیچ لە بزن نیە، بۆچی سوێند ناخۆم، شێخ فەرموی باشە منیش شتێ ئەزانم بیلێم؟ ئەمە بزنەکە بە فلان نیشانە و بەڵگە لێرە حازرە ئەڵێ شەوی ٤ چوار شەممە بوو هات منی دزی لە ژێر فلان دارگوێز سەری بڕیم وە وورگ و ریخۆڵە و پێستەکەمی لە ژێر ئەو دار بەهێیە کردوە بە ژێر خاکەوە گۆشت و باقی ماوەکەمی بردەوە لەگەڵ براژنەکەی و باقی خێزانی ناو ماڵ خواردمیان عوسمان ئەگەر لەوێ نەبوە ئەمە بزنەکە خۆی حازرە وا ئەڵێ ئەو پیاوە بە ناچار دانینا بەکارەکەیدا وە ووتی والله یا شێخ هەرچیت ووت ڕاستت فەرموو کەس ناتوانێ لەگەڵ بزن قسە بکات مەگەر تۆ هەر ئەڵێی خۆت هاوڕێم بووی ئەوا إقرارم دا تەوبە ئەکەم دەسبەجێ، وە زوڵف و کاکۆڵی تاشی و تەریقەتی وەرگرت وە هاتە ناو گرۆی مریدانەوە[(١)].

**ك ٤٨ بص ٢٩٠:** مەلا عبداللەی ئامۆزای هەمان مەلا أحمدی مەلا باشی گێڕایەوە ووتی: لەگەڵ دوو نەفەری تر بەڕێیەکدا دەڕۆیشتین گەیشتینە شوێنێ پێیان ئەووت ملەی زەماوەند لەوێ کاتی نوێژی مەغریب بوو، ڕەفیقەکانم نوێژەکەیان نەکرد، وە لەسەر منیش رانەئەوەستان نوێژەکەم بکەم، بەو بۆنەیەوە نوێژەکەی منیش فەوتا پاش چەند ماوەیە بە زیارەتی حەزرەتی شێخ گەیشتین، فەرمووی تۆ بۆچی تەرکی نوێژ ئەکەی؟ عەرزیم کرد تەرکی نوێژم نەکردووە، فەرمووی بەڵێ: لە ئاوی

(١) إتقوا فراسة المؤمن فإنّه ينظر بنور الله.

زەلان لە ملەی زەماوەند کاتی نوێژی مەغریب هات تۆ خۆت و دوو ڕەفیقەکەت گەیشتنە ئەوملە و تێ پەڕین و نوێژەکەتان نەکرد، جارێکی تر تەرکی نوێژ مەکە.

**ك ٤٩ بص ٢٩١:** یەکێ لە ئەعیانەکانی سنە بۆی گێڕامەوە ووتی: والی سنە لەگەڵ میرزا رەزا علی ناکۆك بوو، وە ڕق و کینەیەکی زۆری لەو میرزا ڕەزایە بوو لەبەر ئەوە گرتی و خستیە بەندیخانەوە لەگەڵ ئەوەشدا کەلەپچە و زنجیری لەپێ خست وە بەشێوەیەکی بێ ڕێز و نرخ حەپسی کرد، وا بە تەمابوو هەمو سامانەکەشی داگیر بکات وە خۆشی لە سێدارە بدات و ڕەوانەی شاری خامۆشانی بکات، وە داوای بڕیاردانی کوشتنی لە پاشا کرد بە هۆی ئەو ڕاپۆرتەی کە پڕی کردبووەوە لەسەری، وە میرزا عەلی ناوبراو وەزیفەکەی وەك بەڕێوەبەری تحریر بوو، ئەمجا ئەم میرزای دیوان بەگی‌یە لە دڵا بڕوای بە شێخی تەوێڵە بوو، بە دزی‌یەوە کاغزێکی نووسی و بە پیاوێکی ئەمیندا داد و هاواری خۆی گەیاندە خزمەتی بەڵکو هیممەتێکی دەربارە بفەرموێ، حەزرەتی پیریش دەسماڵێکی سپی خۆی بۆنارد وە فەرمووبوی ئەمە بخاتە ملی وە ئیتر هیچ باکی نەبێ إن شاء الله ڕزگار ئەبێ بەگەیشتنی دەسماڵەکە بەبێ هیچ مانەوەیەك میرزا ڕەزا عەلی بەربوو وە لەو نارەحەتی و بەلایە ڕزگاری بوو أشهدُ بالله سبحانه من کە نووسەری ئەم کتێبە کە شێخ محمدم[1]، ئەو ڕۆژە کە بەربوو لە ڕێگە تووشی بووم ئەچووەوە بۆ ماڵی خۆی دەسماڵەکەی لە دەم و لووتی هەڵپێچابوو وەك یەکێ بڵێن (ددان)ی دێشێ ولا حول ولا قوةَ إلاّ بالله العظیم دیسان لە پاش ١٥ پانزە ساڵ لە دوای وەفاتی حەزرەتی شێخ سراج الدین قدّس سرّه دیوان بەگی دیدەنی لێ کردم خۆی هەمان بەسەرهاتی بۆ گێڕامەوە دەسماڵەکەی پیشان دام سپی ڕووت نەبوو سپی‌یەکی خەت خەت بوو.

(١) دانەری کتێبی بارقات السرور بە فارسی کەجەنابی ملا شێخ محمدی سەمرانی کۆی کردۆتەوە و نوسیویەتی.

**ك ٥٠ بص ٢٩٣:** میرزا عەلی أکبر کوڕی خوا لێی خۆشبوو میرزا عبدالله مۆنشی باشی ووتی: ساڵێ چووم بۆ زیارەتی حەزرەتی شێخ عوسمان لە ماڵی شێخ علی کە یەکێ بوو لە جێگە دارە گەورەکانی حەزرەتی شێخ میوان بووم، چونکە میوانی ئەو بووم ئەوم کردبوو بە واسیتەی خۆم کە لوطفی زیاد بێ لەگەڵما، لوتفێ زۆری لەگەڵ کردم وە نێرگەلەیەکی بە تبرك پێ بەخشیم لە کاتێکدا عەرزم کرد ووتم قوربان باوکم قەزا و بەلای حەزرەتی شێخی بردوە لطفاً متوجّهی ئەحواڵی ببە ئاخۆ حاڵی چۆنە؟ لە پاش ماوەیەك موڕاقەبە سەری بەرز کردەوە ووتی باوکتیان بەخشیوە خۆش رائەبوێرێ وە ئەوەش بە هۆی ئەوەوە هەتیوی بردۆتە لای خۆی خزمەتی کردوون تا پێ گەیشتوون أرحم الراحمین بەو بۆنەوە لوطفی لەگەڵدا کردوە عوسمان کە لەوێ نەبوە و قەت ماڵی ئێوە نەهاتوە تا خەڵك بڵێ لە خۆیەوە وا ئەڵێ نیشانی قسەکەم ئەوەیە لەگەڵ یەکێ لەو هەتیوانە زیاتر دڵ نەوا و میهرەبان بوە، بەو هۆیەوە تورەقێیەکی زیادیان بە باوکت داوە، علی أکبر ووتی راستە و دروستە فەرمایشتی شێخ ڕاست بوو، باوکم خزمەتکارێکی بوو مرد بێجگە لە دوو سێ بەرەکە ماڵ[1] نەبێ هیچی نەبوو فرۆشتی دای بە ٢٠ بیست تمەن[2] دای بە یەکێ کە بیگێڕێ بە قازانج وە عائید بەو منالانە بێ، وە ئەو دوو منالەی سەرپەرشتی کرد تا بالق بوون و لە خەم رەخسین لە خوا بە زیاد بێ پارەکەیان لەو ماوەدا گەیشت بە ٢٠٠ دوسەد تمەن وە پارەکەی بە تەواوی دایەوە دەستیان بەڵێ: (ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ).

**ك ٥١ بص ٢٩٥:** جەنابی بەڕێز شێخ شمس الدین کە بە کاکە شێخ بەناوبانگە لە دێی دەوسێنە کە سە ربە شاری بانەیە ساڵێ لە زستانا ئەچوو بۆ کرماشان شەو میوانی من بوو ئەم کتێبەی دی ووتی لە لای منیش دوو کەرامەتی شێخ هەیە بینووسە.

---

(١) بەرەکە ماڵ: بەرەکە خانوو.

(٢) تمەنێکی ئێران جاران بە ٥٠ فلس و بەرەو ژوو ئەچوو.

یەکەم: خانمی ژنە گەورەی ئەحمەد بەگی سەقزی بۆ موضوعی ئەولاد بە مەلا عبدالحکیم بانەیی ڕای سپارد بوو هیممەتی بفەرمویٚ بەڵکو لە منالْ بیٚ بەش نەبیٚ ئەویش کە ئەگاتە خزمەتی شیٚخ لە بیری نابیٚ عەرزی بکا، ڕۆژیٚ شیٚخ ئەفەرمویٚ: حاجی ڕاسپاردەیەکیان کردویت بۆچی نەت گەیاند؟ عەرزی ئەکات وەك ئەزانی ڕایان سپاردووم ڕاسپاردەکەش ئەزانی خۆتان بیفەرمون ئەفەرمویٚ ژنی أحمد بەگ بە تۆی واووت وە فلان قسەی پیا ناردی بۆ من، وەلامی لە منەوە پیٚ بدەرەوە خوا مقدّری نەکردوە منالی بداتیٚ لەم خەیالە واز لە خۆی بیٚنیٚ و ئارەزووی نەکات وە نیشانەی ڕاستی قسەکەم ئەوەیە ددانیٚکی لە لای ڕاستەوە وەك ئالتون وایە، وە هەروەها خالی ڕەشیش لە لای چەپی ژیٚر بالی بە لەشیەوە، حاجی عبدالحکیم بۆ خۆشی عەرزی ئەکات ئەلیٚ قوربان ئیٚوە ئیٚمە مەنع ئەکەن لە ڕوانین و تەماشاکردنی نامەحرەم بەلام خۆتان تەماشای دان و خالی خەلك ئەکەن، ئەفەرمویٚ ئەمە نظر نیە ئەمە کەشف و موڕاقەبەیە[1] گوناهیٚکی تیٚدا نیە وە دوورە لە حەرەج، حاجی کە خەبەر بە خانمی ناوبراو ئەدات ئەلیٚ بە خوا هەردووکی ڕاستە و وەهایە، وە ئەم باسە ئەبیٚ بە هۆی پەیدابوونی باوەڕی زۆر کەس لە خەلکی سەقز.

دووەم: قادر بەگی کوڕی ڕۆستەم بەگ لە خیٚلی جاف وە لە گەورە گەورانی ئەوتیرەیە داوای کچی محمد پاشای جاف ئەکات[2]، بەلام پاشا مەیلی بەو خزمایەتی‌یە نابیٚ قادر بەگ پەنا بە حەزرەتی شیٚخ عوسمان ئەبات و لەم بارەوە داوای هیممەت و کۆمەك ئەکات، شیٚخ ئەفەرمویٚ ماوەیەك ئارام بگرە ئەو کچە بە تۆ ئەدریٚت، ماوەیە بەسەر ئەمەدا تیٚ ئەپەڕیٚ عزیز خان سەردار کول خوازبیٚنی هەمان کچ ئەکات و پاشا بڕیار ئەدات قبولی مەرامی سەردار کول ئەکات و خوازبیٚنی‌یەکە

(١) کەشف و موڕاقەبە: یانی بە چاوی سەر نیە کە لە شەرعدا قەدەغەی لیٚ کرابیٚ بە چاوی دلە، وە چاوی دلْ بەرگیری لیٚ ناکریٚ.

(٢) محمد پاشا جاف باوکی محمود پاشا ووەسمان پاشای جافە.

قبووڵ ئەکات، کاکە شێخی دەوسێنە ووتی قادر بەگ بە ئاهو ناڵەیەکی زۆرەوە منی نارد بۆ خزمەت شێخ خوا بەرەکەتی زیاتر بفەرموێ کە ئەمە چەند ساڵێکە چاوەڕوانی ئەو کچەم وە بە هیوام کە بۆ من بێ، وە بە پەیمانی حەزرەتی شێخ زۆر دڵنیا بووم ئێستەش باسەکە ئاوایە چارم چییە؟ کاتێ گەیشتم و ئەم ڕووداوە و شکاتی قادر بەگم عەرز کرد فەرمووی: چەند جار ووتومە و جارێ تریش ئەڵێم فەرمانە و دراوە دڵنیا بێ ئەو کچە ئەبێ بەو بگات وە هەر بۆ ئەو بێ وە پێی بڵێ دڵگران نەبێ لەو بارەیەوە، وە ماوەیەکی تری پێ چوو کە قادر بەگ هەروا مایەوە وە بە ئاواتی خۆی نەگەیشت وە خەڵکی بێ ئاگا چەندەها ووتەی بێ باوەڕانە و ناڵەباریان ئەووت و کەوتنە ڕەخنەگرتن و بێ بڕوایی نیشاندان، وە زۆر ووتەی ناجۆر و ناشیرینیان لێوە ڕوودرا کە لەگەڵ ئەوەش عزیز خان بۆ گەیشتن بەو ئافرەتە لە هەوڵ و تێکۆشان دابوو، بەڵام قادر بەگیش بە پەیمانەکەی حەزرەتی شێخ هیوادار و دڵنیا بوو بەسەر ئەوەشدا ساڵێك تێپەڕی، لەناکاو محمد پاشا پەشیمان ئەبێتەوە قادر بەگ بانگ ئەکات و کچەکەی لێ مارە ئەکات ئەڵێ بەر لەوە سەردار کول بزانێ تەدارەکی بکە و بیگوێزەرەوە، وە ئەم ئیشە کە شێوەکەی وا دیارە ناشیرین دەربکەوێ لەناو عەشیرەتدا کە شتی وا ڕووبدات بەو هۆیەوە بوە چ قادر بەگ و چ عێلی جاف بەجارێ پڕ باوەڕ و موخلیسی ئەو زاتە بوون وە هەندێکیان تەمەسوکیان کردوە و بوون بە مریدی گیانی بەگیانی[1].

**ك ٥٢ بص:** خواجە محمدی کوڕی حاجی میرزای سنەیی لەگەڵ مندا هۆگری و خۆشەویستی هەبوو تاڕادەیەکی وا پەیمانمان بۆ یەکتر کرد بۆ ڕۆژی قیامەت کە هەر کەسێکمان خوا لطف و مەرحەمەتی لەگەڵ کرد بەبێ ئەوی تر نەچێتە بەهەشت،

---

(١) تمسّك و بوون بە مرید یانی: وەرگرتنی تەریقەت و بەڕێوەبردنی ئادابی تصوّف لە ژێر دەست پیری لە ڕێ شارەزا: مریدان چو طفلان بە قوەت کمند مشایخ چو دیــوار مستحمکمند
مورید وەك منـال لـە هێزا کەمن پیران بە چەشنی دیوار مەحکەمن

گوایا ئەم خواجە محمدە پێش لەوە باڵق بێ سەری کەچەڵ بوو بوو، ئەو زاتە بە ڕەحمەتی خوا چوو ڕۆژێ لە خزمەت حەزرەتی شێخا بووم بۆ بار سووکی ڕۆژی قیامەت رجا و لاڵەیەکم بۆ کرد شایەت توجهێکی بۆ بکات و هیممەتێ لە کاروباریا بکات[1]، گەلێ موراقیب بوو دوایی سەری بەرزکردەوە فەرمووی ئەم ڕەفیقی تۆیە کەچەڵیش بووە، عەرزم کرد ئەبێ وابێ وایە، پێکەنی بەزەردەخەنەیەکەوە فەرمووی هەردەم دۆعای خێری بۆ بکە.

**ك ٥٣ بص ٣٦:** لەسەرەتای چونە طەریقەتمەوە زانا و وێڵ و ڕەوشتی طەریقەت نەبووم، وە ئەوە کە پێویستە لە حەیاکردن لە دەستگیر چ لە کاتێکا لە خزمەتیا بێ یا لەدووری حضوری ئەمانە بە تەواوی لێم حاڵی نەبوو کلاوێکمان بە نیازی دیاری بۆ حەزرەتی شێخ دروست کرد وە ناوی پیرۆزی ئەومان بە چنراوی لە کلاوەکە نووسی، فەرمانی خوا وابوو ئەو کلاوە بدرێ بە یەکێکی تر وە بە چەقۆیەك ناوەکەی ئەوم هەڵکەند وە ناوی یەکێ ترمان لێ نووسی کە ئەبوایە کلاوەکەی بدرێتێ، دەسبەجێ چەقۆکە وون بوو کەسیش لەوێ نەبوو گومانی ئەوەی لێ بکەم کە بردبێتی، هەرچەند گەڕام نەبوو[2]، وەکوو وتراوە هەرکەس تێکەڵی ئولفەت لەگەڵ خەڵکا بگرێ نیشانەی ئەوەیە لەنەختینەی مەعانی و حقیقەت وە لەسەر مایەی ئاداب و گەنجی مەعریفەت کیسەی دڵی و قاسەی سینەی بەتاڵە.

تێ گەیشتم کە دژی دەستوور و پێچەوانەی ڕەوشت و أصولم کردوە، زۆری پێ نەچوو کاروباری طەریقەتم شێوا وە لە کاروباری دڵدا گۆڕانی گەورە ڕوویدا هەروەکو بۆنی زیکر و فیکرم قەت نەکردوە، بە دوای ئەوە ئیشوکاری دنیاشم دیسان

---

(١) پەیمان و معاهدە بەستن بۆ قیامەت یانی: دوان پەیمان ئەبەستن لە دنیادا ئەگەر خوا بە رە حم و کەرەمی خۆی رەحمی کرد بە یەکێکیان داوا بکات ئەو هاورێیەشی لەگەڵ عەفو بکات و داخلی بەهەشتی بکات.

(٢) عەرەبیەکەی (الأيناس بالناس من علامات الأفلاس)،

کەوتە شێوان و پشێوی ئەویش هەروەها پەرێشانی سەری لێدا، ئەو دێی سەمرانە[(١)] کە دێی خۆم بوو کەوتە وێران بوون و خراپی وە لە لایەن میریشەوە بە ناوی زەریبەوە پەلاماریان دامێ وە چەندەها خەڵکی خۆیان کرد بە خاوەنی کە ئەم دێ موڵکی ئەوانە و لێم ڕاست بوونەوە وە بە تەواوی سەر لێ شێواو و سەر سڕماو بووم بە کورتی گەیشتمە پلەیەك کە لە توانا و ئارام دەرچوو.

لێــی ئــەدام زەمـــان بـــە زللـــەی مـــەزبوت
لە چاومی ئەڕشت فرمێسك بە جووت جووت[(٢)]

بە تەواوی لێم ئاشکرا بوو ئەم هەموو کارەساتە بەهۆی ئەو بێ ئەدەبی‌یەوە بوە کە لە ڕووی نەزانی و بێ ئاگایی‌یەوە لێی ڕوودام تۆبەو پەشیمانی‌یەکی زۆر زۆرم کرد شەوێ لە نوێژی شێواندا چوومە هەیوانی مزگەوتەکەی سەمران بەتەنیا بۆ خۆم دەستم کرد بە گریان و زاری، وە بە هۆی پیری دڵ منیر مشغوڵ بوم داد و هاوارێکی زیادم کرد وە لە کردەوەی ناشیرین و بێ ئەدەبی خۆم پەشیمانی و عەرزی لێ بوردن و لێ خۆشبونم دەربڕی، وە بەم ناڵان و هەزار سوزی دڵەوە توجّهی لطف و إحسانی حەزرەتی شێخم داواکرد ناکا لە طرەف حەزرەتی پیرەوە نیسبەتێ ڕوویدا وە واریدێ دای بە دڵما هوشیاریەکی تەواوم بۆ بەدی هات وە لەسەر خۆم چووم[(٣)]، کاتێ بە ئاگا هاتمەوە بە کەیف و خۆشی و شادی‌یەوە چوومەوە بۆ ماڵەوە

(١) سەمرانی دێیەکە بە موڵکایەتی سەر بەحاجی محمد بوە و هەر لەوێ دانیشتوە.

(٢) تصفعني الأيام صفعاً صفعاً    صفعاً يفيض الدّمع شفعاً شفعا

تصفعني: یانی زللەی لێ دام.

صفعاً صفعاً: زللە لە دوای زللە.

صفعاً يفيض الدّمع: زللەیەك ئاوی لە چاو دەرئەپەڕاندم.

شفعاً شفعاً: یانی جووت جووت پێکەوە.

(٣) ئەم لەسەر خۆچوونە بوورانەوە نیە حاڵەتێکە بۆ ئەهلی طەریقەت دەس ئەدا.

خەوتم، لە خەوما پیاوێکی خاوەن روتبە و نیشان لە لایەن میریەوە لەگەڵ دوو کەس لەگەڵیا بوون هاتن و منیان بەند کرد بەڵام بە بەزەیی و میهرەبان بوون، کە خەبەرم بووەوە کەوتمە پەرێشانی و پەژاری ترسام کە لە لایەن والی‌یەوە تووشی دەردی سەری‌یەك ببم، چەند ڕۆژێکی پێ چوو جەنابی سیّد محمد أمین کوری سیّد قطب الدینی کەلجینی[1] لەگەڵ دوو کەسی تر بەمیوانی گەیشتن، وە جەنابی سیّد بە فەرمانی حەزرەتی پیر هاتبوو کە هەم زاوا و هەم ڕێگە پێ دراوی توجّە و تعلیمی طریقە بوو وە دەری بڕی کە بە ئەمری حەزرەتی شێخ بۆ کۆمەکی تۆ هاتوین نازانم چی بڵێم لە بەیانی ئەو هەموو خۆشی و سرورە کە ڕوویدا لێم کە نەئەوترێ و نەئەنووسرێ.

دوای خەمو خەفەت چەندها سروره ... لە پاش تاریکی ڕووناکی و نووره

لطف و شەفەقەت و بەزەیی واڕوویدا لەتوانای نوسین و لە دایرەی باسکردن دەرچوو[2]، بەکورتی ئەگەر پاشاکان بەو حاڵەیان بزانیمایە بۆیان ببرایە بە لەشکرەوە ئەهاتن و ئەو حاڵەتەیان ئەبرد بەڵام دیارە حاڵ بردن لە دەسەڵاتی ئەهلی دنیادا نیە.

**ك ٥٤ بص ٣٨:** جارێ لەکاتی ئەو خۆشی و مەستی‌یەدا شەوێ لە خەتما لە مزگەوت مجذوب بووم نزیکی چارەکە سەعاتێ کەوتمە سەر ئاگری مزگەوت وە لەناو ئاگرەکەدا بە دەس و پێ ئاگرەکەم ئەشێواند، وەختێ هاتمەوە هۆش چوومە دەرەوە نە لەش و لارم نە جل و بەرگم هیچی لێ نەسووتابوو بە مفادی (إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ

(١) ئەمە ئەو سیّد محی الدینەیە کە زاوای حەزرەتی شێخەو ماینەکەی تۆپی و خۆی لە نەخۆشی‌یەکە رزگار بوو باوکیشی هەر خەلیفەی حەزرەتی شێخ بوە، وەلە ماوەی ٧٠ حەفتا رۆژدا طەریقەتی تەواو کردوە.

(٢) لە عەرەبیدا ئەڵێن: (إذا تضايق أمرٌ فانتظرْ فرجاً)، یانی هەر کات کاروبار گەیشتە تەنگەلانی چاوەڕێی دەروو بکە.

السّيّئاتِ)[1] کلاوێکی ماووتی فاخیر بە ڕوشتەی زەرکفت بە شێوەیەکی زۆر جوان دروستمان کرد بە چنین ئەم چوارینەیەمان لێ نووسی کە ئەمە کوردی یەکەیەتی:

کاتێ کە چنیم تاجی سولتانی | بە دڵی خۆم ووت من بە پەنهانی
لەدنیا بە تاج کێیە شایانی | پێی ووتم تەنیا عوسمانی ثانی[2]

ئەمجا لە خزمەت سیّدا ئەو ماوە کە مایەوە چەندها شتی سەیر و سەرسووڕهێنەر ڕوویدا حاڵم لله الحمد زیاتر لە جاران باشتر بوو، وە جەنابی سید ماوەی ٧٠ حەفتا ڕۆژ لە خزمەتیا بووین (٤) چوار شت لەوانە کە لە خزمەت ئەودا بووین ڕووی دا. بەیانی ئەکەم:

**یەکەم**: لە کاتی خەو لە شەوا مشغوڵی ذیکر نفی و إثبات بووم هێشتا غایب نەبو بوم دیم لە سینەمدا (٥) چرا هەڵکرا[3]، وە نورەکانیان یەك گیر بوون وە چراخانێکی لێ پەیدا بوو ماڵەکە بە تەواوی ڕووناك بووەوە، وە بەو حاڵەوە خەوم لێ کەوت.

**دووەم**: شەوی سێ شەممە ١٦ مانگی ڕەجەب ساڵی ١٢٧٢ هەزار و دوو سەد و حەفتاو دووی هیجری[4] جەنابی سید محمد أمین توجهێکی لێ کردم بێ هۆش بووم،

---

(١) بێگومان چاکە کردن خراپە دەبات.

(٢) فارسی‌یەکەی ئەمەیە کە هی جەنابی شێخ محمدە:

زەدەم چون بخیە إین تاج کیانی | بگفتم با دل خود در نیهانی
در این عالم کە بر تاج است لایق | بگفتا حضرت عثمان ثانی

(٣) دوور نیە ئەو پێنج چرایە لطایفی خمسە بێ قلب روح سرّ خفی أخفی.

(٤) ئەمساڵ ١٤٠١ هیجریە یانی ١٢٩ سەد و بیست و نۆ ساڵ لەمە وپێش (خودا دەوامی دۆستی خوا بفەرموێ ئامین)

هەزار داخ بۆ ئەو کاتو زەمانە | کە لەبەر (چاو) بون ئەم دیمەنانە
أولئك چون أنعام مایەوە | بل هم أضلّ یش وا بە دوایەوە

لەو بێهۆشی‌یەدا دیم کەوتمە ناو دایرەیەکەوە وە لەو جێگا چەند ئەشکاڵی بە شێوەی قەوس دەرکەوت بەڵام شکڵەکان زۆر ڕووناك و نوورین بوون لە بەینی ئەو ئەشکاڵە قەوسیانەدا ظولمەت و نور دەرئەکەوت، لە میانەی دایرەیەکدا ڕووناك وە لە دایرەیەکی تر تاریك بوو، وە لە قەوسی هەر ئاخردا قاپی‌یەکی ڕووناك بە شێوەی مانگی نیوە تەواو کەنیوەی پڕ بووبێ و نیوەی مابێتەوە بەڵام زۆر لە مانگ ڕووناك تر هاتە پێش چاوم، لەو کاتەدا جەنابی سید ئایەتی ئاخری سورەی البقرەی دەسپێکرد کە گەیشتە (آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ) هەر لە سەرەتای آمن الرسول پیاوێکی شێوە جوان و زۆر شیرین و نازك پێی ووتم هەر کەس بگاتە کەماڵی ئیمان ئالەم ئاوێنەوە کە ڕووناك و نوورانی‌یە مشاهدەی زاتی حق تعالای بۆ دەس ئەدات وە لەوێدا بە شەرەفی وصولی عریانی نائیل[1] ئەبێ اللّهم أرزقنا بجاه الموصلين وبحرمة الواصلين والمكّملين من العارفين والكاملين.

**سێیەم:** ڕۆژێ لە پاش خەتم بێهۆشی‌یەك بۆی دەس دام، وە لەو بێهۆشی‌یەدا دیم کە لە لای ڕاستی میحرابی مزگەوتەکە شەقی برد، وە لەو جێگەوە حەزرەتی سیّدی کائنات محمد رسول الله عليه أفضل الصلوات والتسليمات بە ئاشکرا و واضح لەو جێگەوە تەشریفی ظهوری فەرموو بەسەر ئەهلی خەتمەکەدا، وە ئەهلی ئەو خەتمەی بە (فوو)ی پیرۆزی پڕ فیض و فەڕی فائیز کرد وە نەفەسی موبارەك و پیرۆزی بەسەریاندا ئەبەخشی، جەنابی سیّد چووە خزمەتی لە بارەی ئەو ضعیف حاڵەوە کە منم تکایەکی کرد وە تمنّای بەذلی فیض و ئیحسانی بۆ کردم ئەو حەزرەتە ﷺ بە

---

(١) وەصڵی عوریان: بریتی‌یە لە قطعی تەواوی عەلاقە و پەیوەندی بە غەیری خواوە، وە بە کوللی و تەواوی متوجهی حەزرەتی زاتی حق بوون بە شێوەیەك حەتتا پەیوەندی بە صیفاتیشەوە نەمێنێ، حەزرەتی إبراهیمی ئەدهەم فەرمویەتی هەر کەسێ لەو سێ جێگەدا دڵی خۆی حازر نەکات نیشانەی ئەوەیە دەرگایان لەسەر داخستوە نعوذ بالله من ذلك: ١- لە کاتی قران خوێندن، ٢- لەوەختی زیکرکردن. ٣- لە حاڵی نوێژکردنا.

کەماڵی کەرەم و لطف و مەرحەمەت تەشریفی فەرموە پێشترەوە، ناوچاوی ئەم خاکەسارە نیازمەندی ماچ کرد تا دوو جار ئەو لطفەی فەرموو، لە ئەثەری ئەو لطف و میهرەبانی‌یەوە مجذوب بووم وە بە دەم جەزبەوە ئەمانەم ئەخوێندەوە[1].

| | |
|---|---|
| یار ئەوا هات بەخێر بێ | سەر خول ئەخۆم لە ژێر پێ |
| دوژمن لە داخی خۆشیم | با هەر دوو چاوی کوێر بێ |

**چوارەم**: ڕۆژێ لە پاش خەتم هەر لە حەلقەکەدا مشغولێ بە زیکری نفی و إثبات بووم کاتێ ووتم لا إله إلاّ الله دەنگێ وەك دەنگی گا کە جوتیار بە هێزی پڕ لە تینی خۆی لێی بدا ئەو گایە بقۆڕێنێ لە دەروونی منەوە دەرچوو، وەك شتێ کە بە زەویدا بچێ و بڕواتە خوارەوە بە زەویدا ئاواچوە خوارەوە بە ئەرزا وە تا ماوەیەك دەنگ و سەدایەکی درێژەدار و بە ماوە بوو، وە ئەو دەنگیشە هەموو گوێیان لێ بوو بە ئاشکرا بیستیان، بە گومانی خۆم دەنگی شیطانی لەعینی من بوو کە لە ضربەتی یاد و زیکری حەزرەتی حەق تەعالا کەوتە داد و ناڵە و هاواری لێ هەستا.

**ك ٥٥ بص ٥٠:** میران ئاغە کوڕی عەبدول ئاغە برای حەزرەتی شێخ بوو ڕۆژێ لە ڕووی حەسەدەوە نیسبەت بە حەزرەتی مستطاب حاجی شێخ عبدالرحمن کوڕی مەولانا سراج الدین عوسمان هێرش ئەکات و قسەی پێ ئەڵێ، حەزرەتی شێخ دەسبەجێ سوار ئەبێ و تەوێڵە بەجێ دێڵێ وە لە دێی گوڵپ مەنزڵ ئەگرێ وە سوێند ئەخوا تا میران لە حەیاتا بێ نەچێتەوە تەوێڵە، لە پاش سێ چوار ڕۆژ میران ئاغا

---

(١) بە فارسی:

| | |
|---|---|
| دوست مرا کردباد | عکس خورم سرفتاد |
| یا ربّ أزین خرّمی | چشم عدو کور باد |

نەخۆش ئەکەوێ حەفتەی پێ ناچێ کۆچی دنیا ئەکا شێخ خەبەر ئەزانێ دەسبەجێ سوار ئەبێ دێتەوە تەوێڵە:

نە تێغ ئاشکرا نە قاتیل دیارە          گیان ئەدا لەناو خوێنا بێچارە[1]

**ك ٥٦ بص ٨١:** جارێ لە دێی خۆمانەوە بە إشتیاقی مەقامی پیری بوزرگەواری خۆم حەزرەتی سراج الدین لە وەرزی زستانا هاتم و ماوەیە مامەوە، لە لای خۆمانەوە لە هەندێ لە شیرینی و حەڵوا[2] وە دو سێ جووت گۆرەویم بۆ ڕەوانە کرابوو هەندێکم لەوانە بە دیاری برد بۆ خزمەتی لەسەر بانی خانوی خۆیان بە تەنیا دانیشتبو، کاتێ نزیکەی مەتر و نیوێکم مابوو بگەمە خزمەتی سەری بەرزکردەوە و بە توندێکی پڕ لە لوطفەوە بۆی ڕوانیم لە تأثیری ئەو نظرەوە سنگم وەك مەقەڵی‌یەکی پڕ لە ئاگری لێ هات و دڵم کەوتە جۆش وە لە هەر دوو چاومەوە ئاو جاری بوو، کە گەیشتمە خزمەتی دیاری‌یەکانم دانا ئیتر تواناى قسە و زمان کردنەوەم نەما لەبەر جۆشی دڵ و فرمێسکی چاو، وە تەئسیری ئەو حاڵە هەتا چەن ڕۆژێ دەوامی کرد.

پیرۆز بە ئەهلی خۆشی بێ خۆشی          وە یا دڵ مەستی هەژار کە نۆشی[3]

حاڵەتێکم بوو هەر ئەتوت خوای تعالی‌م بە چاو ئەبینی بەڵام **من لم یذق لم یدر** (یانی ئەوەی لێی نەچەشێ نازانێ تامی چی‌یە) لە فەرمودەی پێغەمبەری موبارەکدا ﷺ ە کە ئەفەرموێ: الإحسان أن تعبد الله كأنّك تراه فإن لم تكن تراه فإنّه يراك یاني:

(١) ئەصڵی شیعرە فارسی‌یەکە ئەمەیە:

تیغ ناپیرا و قاتیل نا پدید          کشته درخون دست و پای میزند

(٢) کە حەڵوا لە قتوی تایبەتی خۆیدا بوو.

(٣) کە فەرمویانە: هنيئاً لأرباب النّعيم نعيمها          وللعاشق المسكين ما يتجرّعُ

لەبەرئەوەیە خاوەنی مثنوي مەولانا جلال‌الدینی رۆمی رەحمەتی خوای لێ بێ ئەفەرموێ:

ئەگەر ئەتەوێ لەگەڵ خوابی لە ئەولیای حەق نابێ جیابی[1]
أولیاء الله لەگەڵ ئیخلاسی گەر دەسکەوت خوات دەسکەوت بە ڕاسی

**ك ٥٧ بص ٩٦**: لەگەڵ ئەوەدا کە جەماوەرێکی زۆر لە زانایان و سادات و کۆمەڵێکی زۆر زۆر لە پیاوانی بە وێڵ و نەجیب و خاوەن دەسەڵات لەگەڵ کەماڵی عقیدە و خۆشەویستی‌یەکی پڕ لە دڵەوە ئیخلاصێکی تەواوەوە لە حضوری پڕ لە نوری سراجی دین و دنیا متمسك بوون وە هەر لەوان گەلێکیان بوون بەخاوەنی بەهرە لە طریقەت، بەڵام بۆ ئەوەی ڕێگەی قسە بە هیچ جورێ نەبێ بڵێن ئەمانە هەر خۆیان لە أصلا خاوەنی پایە و مەقام بوون، وە سەرۆك و پێشەوای وولات بوون، بە چاوی بەصیرەت چاوی گێرا بە شاری کوردستانی سنەدا لەناو ئەو هەموەدا میرزا شکر الله ناوێ کە لە بچوکترین خزمەتکارانی هەندێ لەو دەسەڵات دارانە بوو کە پیاوێ بوو بە هەمەچەشنە رای ئەبوارد و ئەهلی هەواو هەوەس بوو هەمیشە لە فەرمانی شەیتان و نەفسی پیسی خۆی دابو وە کردار و ڕەفتاری لەناو خەڵکی ئەو وولاتەدا بەناوبانگ بوو، وەکوو ووتراوە زۆر لە ڕەووشت و خوی سەیر سەیر هاودەمی ڕۆژانی لاوییە[2]، وە لەودا ئاشکار بوو نالەباری وکرداری ناپەسەند وە لە ڕۆژ دیار تر بوو، ناکا دەستی باطنی خۆی خستە جووڵە کەمەری ئەو بەد کرداری پاشەڕۆژ بەخێریەی گرت لەناو برادەرانی خراپی خۆی رای کێشا وە لە چنگ تێکەڵی

---

(١) ئەمەیە فەرمایشتە فارسی یەکەی مەولانا جلال الدینی مثنوی:

هر کەخواهد هم نشینی باخدا گونشیند در حضور أولیا
أی پسر گر أولیا را یا فتی با یقین میدان خدا را یا فتی

(٢) وەك لە فارسی‌یەکەدا ئەڵێ: بس طور عجب لازم أیام شباب آست.

ڕەفیقەکانی هەمیشە مەست و سەرخۆشی بێهۆشی خواناسی ڕزگاری کرد، وە لە خزمەت خۆیدا بە تربیەی عاریفانە و تعلیماتی صادقانە چەند ئێوارە و بەیانیەك بەشداری کرد، تا لە ئەثەری سعادەت نظری سعادەت ئەثەری[1] لە شولاری مسی ژەنگاوی ئەوی گۆڕی بە ئاڵتونی تێزاب وە بە پرتەوی ئیمداد و کۆمەکی و توجهاتی یەك لەسەریەك وە بە تیشك و ڕووناکی بەرەکات و فیوضاتی غەیبی لاریبی لە حاڵی پەستی بەرەو پایەی بەرزی و سەرمەستی لەسەر خستنی قصوری هیچ لێ نەفەرمو تا بەمایەی پلە و پایەی پیرۆزی ویلایەتی گەیان وە بە ئاواتی پلەی دەرك و تصرفات و درایەت سەرکەوتوو بوو دیارە کە ئەم کارە لە (ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ)ەوە هاتوە وە تا خەڵك ماناى فەرمودەی حەزرەتی رسولی أکرم ﷺ لە لایان یەقینی بێ وە بێ بە موژدەی خۆشی و شادی بۆ گرۆی گوناهکاران کە فەرموویەتی (التائب من الذنب كمن لا ذنب له) یانی هەرکەس تەوبە بکات وە لە گوناح باری بگەڕێتەوە وەك ئەوە وایە گوناحی قەت نەبوبێ، وە حافظی شیرازی خواوەندی لێ بێ رازی لەم بارەوە فەرمویەتی: ئەوانە کە خاك بە سەیرکردنێکی خۆیان ئەکەن بە ئاڵتون ئایا ئەبێ جارێ گۆشەی چاوێ بۆ ئێمە بخەن، بە کورتی لە پاش ئەوە کە تربیە و تعلیماتی تەواو ئەبێ وە بە روتبە و مقامی کەماڵ ئەگات ئیجازەی إرشاد و شێخیەتی ئەداتێ وە بە مقامی تعلیماتی طالبان و داواکارانی ڕێگەی خوا تا حەدی وصول ئەگەیەنێ، ئەمجا ئەم زاتە کە کاتێ گەڕایەوە غەوغایەکی خستە شارەوە و ئاگرێکی هەڵ گیرساند کە چەند خەواریق و کەراماتی بێ ژمارەی لێ

---

(١) حەزمان کرد دەقا و دەق (نصّ)ی فەرمایشتەکەی بنووسین کە کوردیەکەی وا ئەگەیەنێ تا بە بەرەکاتی پڕ بەختەوەری و کامەرانی وە بە سەیرکردن و مرحمەت و لطفی عاقیبەت بەخێری گۆڕی لە مردنەوە بۆ زیندو بونەوە و ژیان چونکە بە حقیقەت بە ألطاف روانینیان بۆ هەرکەس و بۆ هەرکار مایەی ئەو پەڕی کامیاب و شادی و گەشانەوەیە بۆی وە گۆڕینیەتی لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر پڕ لە چاکە و خۆشی.

گەڕاوەتەوە وە دەستەڵات و توانای دەرکەوتوە و بەناوبانگ بووە و خەڵکی بە ئیرشادی دڵخۆش بوە، کە کاتێ حەزرەتی شێخ ئەمر ئەکات بگەڕێرەوە بۆ شاری سنە وە داواکارانی ڕێگەی حەق ئیرشاد بکە، ئەفەرموێ تۆ وەکو باقی خەلیفەکان ئیجازە نامەی ئیرشادت ناوێ بۆت بنووسم، عەرزی ئەکات قوربان جا چۆن ئەبێ بڕۆم کە زیاترینی خەڵك منکیر[1] و والی مدّعی یە، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی ئەوێ هەموو ئەزانن من چی بووم، کە ئیجازە نامەم بۆ نانووسی کاغزێکم بۆ والی و فخر العلماء بۆ بنووسە کە پشتم بگرن، کەمێ چاوانی پیرۆزی لێك ئەنێ دوایی بە هەیبەتێکەوە[2]، سەربەرز ئەکاتەوە ئەفەرموێ: خوا و پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموون ڕووی لە خۆمان بێ و باکی نەبێ بەم فەرمایشە دڵنیا ئەبێ و دێتەوە، کە دێتەوە ئەبینێ ئەوەی کە ئەی بینێ.

**ك ٥٨ بص:** جەنابی سید عبدالمجید ناو دانیشتوی ناوچەی خوڕخوڕە بۆی گێڕامەوە ووتی سید جافر ناوی ئامۆزام و لەگەڵ حاجی بەکە ناوێ چوون بۆ حیجاز سەفەرەکەیان ماوەی دوو ساڵی پێچوو، بێ تاقەت بووم چووم بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ عوسمان خوا لێ خۆشنوود بێ لە دوای ئەوە کە بە زیارەتی شەرەفدار بووم عەرزیم کرد قوربان خەبەرێکم لە ئامۆزاکەم نیە، ماوەیە زۆرە ڕۆیشتوە زۆر دڵم تەنگە حاجیەکانی باسی مردنی ئەکەن ماوەیە بێ دەنگ بوو فەرمووی حاجی بەکە ناو هاوڕێیەتی مردوە بەڵام ئەو ساخ و سەلامەتە وا بەڕێوەیە تاتۆ ئەگەیتەوە ماڵی خۆتان زۆری پێ ناچێ ئەویش دێتەوە، کاتێ گەیشتمەوە چەن ڕۆژێکی پێچوو ئەو بە

---

وە شیعرە فارسی‌یەکەی شیرازی ئەمە:

آنانکه خاکرا بنظر کیمیا کنند — آیاد بود که گوشهٔ چشمی بما کنند

(١) مونکیر: بێ باوەڕ، مدّعی: داواکار و ناحەز.

(٢) هەیبەت: سام، غەوغا: دەنگە دەنگ و قەرەباڵخی.

سەلامەتی هاتەوە، وە هەواڵی لە دنیا دەرچوونی حاجی‌یەکەی دا، کۆمەڵێکی زۆر بەم کەرامەتە ئاگادار بوون وە بڕوا و ئیخلاسیان پەیدا کرد.

**ك ٥٩ بص ٣٠٠:** شێخ محمدی سەمڕانی: فەرمووی شەوێ فاتیحەم خوێندەوە یەکەیەکە هەدیەم کرد بۆ گیانی ئەو کەسانە کە دۆستایەتیمان هەبوو لە خەلیفەکانی حەزرەتی شێخ، لەناو ئەوانە حاجی مەلا محمودی سنەیم لە فیکر چوو کاتێ خەوم لێ کەوت پەیدابو، ووتی ئەوە کوڕە بۆچی منت لە بیرچو کە خەبەرم بوەوە سەر لە نوێ فاتیحەم بە تایبەتی بۆ خوێند، منیش وێنەی ئەمەم لەم ڕۆژانەدا[1].

**ك ٦٠ بص ٢٧٣:** جەنابی مورشیدی ڕێگەی طریقەت گەیشتوو بە پلەوپایەی حقیقەت حاجی شێخ شکرالله کە بە کورتی باس و بەیانی کرا فەرموی: لە سەرەتاوە کە چوومە خزمەت حەزرەتی ئەو زاتە خاوەن بەرەکاتە هاوین بوو، ڕۆژێ لە قەراخی حەوزێکا دانیشتبوو وە منیش باوەشێنێکم بە دەستەوە گرتبوو باوەشێنی شێخم ئەکرد کۆمەڵێ حازر بوون وە لە هەموو باسێکەوە قسە کرا حەزرەتی شێخ فەرمووی من لە هەموو ئاسمانەکان تا فوق العرش هەم وە لە زەمینەکان تا تحت الثرى هەم وە لە چوار دەور و گۆشەی هەمو جیهاندا هەم لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا هەم لە باکور و

---

(١) لە مامۆستا مەلا عینایەت بیست ووتی لەگەڵ حاجی ڕەشیدی مەلا برایم عەلاقە و پەیوەندیمان بوو چەن سەفەرێکی حەجمان پێکەوە کردبوو، کە ئەمری خوای کرد فاتیحەم بۆ ئەخوێند یانی ناوم بە تایبەتی ئەبرد، پاش ماوەیە لە أحباب خۆشەویستان ئەوەندە زۆر بو ناوی هەمویانم بۆ نەدەبرا تەرکی ناو هێنانم کرد بەلام ئەم ووت بۆ هەموو دۆست و خۆشەویستان. شەوێ لە خەوما دیم بە هەژاری و کزی و مەلولیەوە دانیشتوە وەك گلەیی بکات، وتی رفیق و کەسێ دۆست بێ بەکار بێ نەماوە کە بە خەبەرم هاتم وتم گلەیی ئەوە ئەکات ناوی ناهێنم دیسان ناوم وەك جاران ئەهێنایەوە، پاش ماوەیە دیم بە پەلە و ڕاکردن هات بە خۆشیەکەوە دەستی کردە ملم ئەم لاولای ماچ کردم کە خەبەرم بوەوە زانیم ناوبردنی پێخۆشە.

باشـوردا هـەروەها بـە بەهەشـتدا ئـەڕۆم و بـە جەهـەننم و دۆزەخـدا تێ ئەپەڕم نـە بـە بەهەشت دڵشاد و دڵخۆشم نە بـە دۆزەخ خـەمبار و پـەژارەم ئیشارەیـەکی بـۆ ئـەرزی جێگەکەی کە تەشریفی تیا دانیشتبوو کرد فەرموی لەگەڵ ئەم خاکـەم، موویـەکی لـە غەدەکەی ژێر خۆی دەرهێنا و گرتی بە دەستەوە فەرموی لەگـەڵ ئـەم مووەشـدا هـەم باوەڕتـان هەیـە باشـە نیتانـە خۆتـان ئـەزانن لـەم فـەرمایشتی شـێخە ئینکـاری و بێ باوەڕیەکی توندم بۆ بەدی هات وە بـە خـەیاڵ ووتم شـێخ عوسمـان إدعـا و داواکـاری خودایی ئەکات من بۆچی هاتمە ئێرەوە خۆمم کافر کرد، لەم خەیاڵانەدا بـووم لـە ناکـا شێخ علیه الرحمة والرضوان بە توندو تیژیەکـە وە سـەیرێکی کـرد لـەو تەماشـاکردنە دڵ تـەنگییەکی زۆر ڕووی تێ کـردم، وەهـا دڵ قـەبز بـووم باوەشێنەکەم دانـا و بـە هەزار خەیاڵاتی پڕ و پووچ و بێ سوود چوومە گۆشەیەکەوە ئـەو ڕۆژە و ئـەو شـەوە و ڕۆژێکـی تـر وا قـەبزی دڵتـەنگی ڕووی تێ کـردم خـەریك بـوو خـۆم بکـوژم، وە ئەموت بۆچی هاتمە ئێرە و خۆم کافر کرد لەوەختێکا ووتیـان شـێخ تەشـریفی چـوە بـۆ باخی هانە سیێو[1]، بەو حاڵە دڵ گوشراویەوە منیش ڕۆیشتم کە چووم سەیرم کرد کۆمەڵێکی زۆر وەك پەروانە بە دەوری چرادا لە دەوری ئەو زاتە کۆمەڵن، مـنیش لـە گۆشەیەکەوە وەستام لەناکاو گۆشەیە[2] چـاوی بـۆ لای مـن بـە تـیژی هاویشـت لـەو نظره کیمیا ئەثەرەوە دیم کە دووکەڵێکی ڕەش لە پێمەوە تـا تـەوقی سـەرم بـەرز بـوەوە وورد وورد سـەر بـەرەو ژوور ئـەبوو تـا بـە تـەواوی لـە مـن جیـا بـوەوە دەسـبەجێ دەنگێکـی بـەرزی بێ ئیختیـاریم بـە شـیدەت لێـوە هـات لـە خۆشـیا کەوتمـە ئـەرز وە

---

(١) هانە سیێو: جاوگە و کانییەکە کە لـە لای ژووری دێی تەوێڵەی موبارەکەوەیە. پـیرۆزی تەوێڵـە بـە هۆی بوونی قەبری چەن کەس لە گەورە گەورانی أولیاوەیە.

(٢) گۆشەی یەکەم یانی کەنار — یا سووچ یا لە لایەکەوە. گۆشەی دووەم یانی: تیلەی چاوی گرتە بەندە بسط: پێچەوانەی قەبزە، قبض دڵ تەنگی و بسط ویسعەت و شادی و فەرەحـە ئـەم دوانـە یـانی (قبض, بسط) لە إصطلاح و زاراوەی ئەهلی طەریقەتە.

بەسطیکی بەغایەت گەورە ڕووی لێ دام لە خۆشی و شادی‌یەوە دەستم کرد بە شیعر خوێندنەوە و دەربڕینی شەوق و زەوق، وە بە دەنگی بالا هەڵبەستی عاشقانە و پڕ ئەڤینم ئەخۆندەوە، کاتێ حەزرەتی پیر دەنگی منی بیست لەگەڵ ئەوەدا خۆی لەحاڵی ئەزانیم فەرموی ئەوە کێیە؟ عەرزیان کرد شوکراللەی سنەیی‌یە، بە دەست ئیشارەی فەرموو خۆتان لابدەن، خەڵکەکە کە بەرچاویان گرتبوو خۆیان لادا وەمن کەوتمە پێش چاوی تەماشام کرد زۆر بە توندی سەیرم ئەکات وە تا سەیری ئەکردم شەوقەکەم زیاتر ئەبوو تاوام لێ هات کەوتمە حاڵێکەوە ئەمبینی هەر لە ئاسمانەوە هەتا ئەم زەمینە هەموو زەڕەیەك لە زەڕەکانی ئەم جیهانە لە سەر صورەتی شێخی منە گەڵا و لقی دار و درەختەکان وە بەرد و گڵمۆت لە تەواوی ئەو کێو و بیابانانە هەموو بوون بە شێخ ئەو کۆمەڵە کە لە خزمەت شێخا بوون هەر یەکێ لەوان چوە سەر صورەتی شێخەکەی من، وە هەر یەك شێخ عوسمان بوو بۆ خۆی، لیباس و پۆشاکی خۆم وە شکل و شێوەی خۆم سەیر ئەکرد ئەو لەسەر شێوە و صورەتی شێخ بوو، موویەکم لە ریشی خۆم کردەوە و سەیرم کرد هەروەك شێخ عوسمان، بە کورتی تەماشای هەرچیم ئەکرد بەرامبەر بە شێوەی ئەوبوو، بە کورتی زاتی شێخ خۆیم لێ گوم بوو نەم زانی لەم هەموە جیهانە زاتی شێخ خۆی کامەیانە؟ سەرسام بووم دار چنارێ بەرامبەرم بوو بە خەیاڵی خۆم ئەوم بە شێخ زانی لە شەوق و زەوقی خۆمدا باوەشم پیاکرد وە بە توندی و هێزەوە گرتم نەوەك لە دەستم دەرچێ وە ئەشم دی بێ دوایی هاتن و کۆتایی کلور کلور[1]، و ملیۆن ملیۆن بە شێوە و صورەتی شێخ دێن و تێ ئەپەڕن، بەڵام من وام ئەزانی شێخ خۆیم گرتوە و لە باوەشمایە وەختێ هۆشم بە خۆم هاتەوە تەماشا ئەکەم ئەمە دارچنارە، وە حەزرەتی شێخ لەگەڵ جەماعەتی دەوری چۆتەوە بۆ حەرەم منیش لەگەڵ داخ و خەم و پەژارەیەکی زۆرا ئەمە چنار

(١) لە زاراوەی کوردیدا کلور یان کرور.

بوو وازم لە چنار هێنا و دوایان کەوتم تا گەیشتمە قاپی حەرەمی شێخ لەوێدا لە داخی دووری و شەوقی ئەو زاتە بڕێ خاکم کرد بە سەری خۆما وە ووتم[1]:

گەر لە یـارم بستە رێـیە دورکەوم وەقرەم نیە
موو لـە چاوا گەر لەتێکیش بێ بەلامۆ کەم نیە

**ك ٦١ بص ٣٧٥:** هەروەها ئەو مرشیدە عالی قەدر و بەڕێزە یانی حاجی شێخ شکراللە فەرمووی: کاتێ کە لە خزمەت حەزرەتی سراج اللّە والدین دابووم، قەبزی و نارەحەتی و دڵتەنگی‌یەکی زۆر زۆر رووی تێ کردم چەن ڕۆژێکی زۆر خەستە و پەرێشان بووم لە دواجارا ئارەزووی فیرارم کرد، کاتێ ویستم بڕۆم خۆم بەخۆم ووت چەن ماوەیەکە کە لەم مقامە گەورەدام وا چاکە بە خزمەت شێخ بگەم جا بڕۆم، بەبێ ئیجازە بڕۆم جوان نیە، کە چوومە خزمەتی و دەستم ماچکرد عەرزم کرد ئیجازە بفەرموو تا بڕۆم فەرمووی بۆ کوێ ئەڕۆی؟ عەرزم کرد تەمام هەیە بچم بۆ حەج، فەرمووی تۆ کاتی حەجت نیە لێرە دانیشە، عەرزیم کرد هەر ئەبێ بڕۆم، فەرمووی مەڕۆ ئارام بگرە، دوبارە لەسەری ڕۆیشتم زۆرم لێ کرد کە ماوەم بفەرموی ئەڕۆم ماوەم نەفەرموی هەر ئەڕۆم بە هێواشی فەرموی خوا و پێغەمبەر قبووڵیان نیە بڕۆی ئەبێ هەر لێرە بی لەگەڵ ئەم فەرمایشتە من زیاتر جەسارەتم کرد وە ووتم قوربان ئەڵبەتە هەر ئەڕۆم.

---

(١) دیارە ئەگەر کەسێ ئاگادار بێ لە حدیثی قدسی کە شێخی بوخاری و ترمذی علیهما الرحمە ریوایەتیان فەرمووە لەم باسە سەرسام نابێ (ولاینو وما تقرّب إليّ عبدي بشيء أحبّ ممّا افترضه عليه ولا يزال عبدي يتقرّب اليّ بالنوافل حتى أحبه فإذا أحببته كنتُ سمعه الّذي يسمع به وبصره الّذي يُبصر به ويده التي يبطش بها) تا دوایی فەرمودە پیرۆزەکە.

که ئەمانەی بیست نەزەرێکی لێ کردم وە بە تووڕەیی‌یەکەوە فەرموی بڕۆ دانیشه بێ دەنگ بە، من لەم تووڕەیی شێخە هیچ باکم نەبوو ئەمجا چووم لە لایەکەوە دانیشتم وە لە دڵی خۆما ووتم ئەڕۆم، لەو کاتەدا جەنابی جەننەت مەکان حاجی شێخ عبدالرحمن کوڕی حەزرەتی شێخ حازر بوو بە هێواشی فەرمووی مێخێکت بە خۆت داکوتا و خراپت کرد، قسەی جەنابی حاجی شێخ عبدالرحمن هیچ لە لام کاریگەر نەبوو ئەثەرێکی نەکرد، هەستام چووم بۆ شوێنەکەی خۆم بە پەرێشانی دانیشتم و خۆم دانا بۆ ئەوە کە بەیانی بڕۆم، نەختێکی پێ چوو تەماشام کرد تا دای گرتم وە گەرمیەکی زۆرم بۆ هات، وورده وورده زیادی کرد تا کەوتمە زەوی وە بێ ئاگا لێی ڕاکشام، بە کورتی سێ شەو و سێ ڕۆژ وەها نەخۆش و بە دەردی گرانەوە دووچاری بووم هەر ئەتوت لەناو زێ‌یەکی ئاگریندا بە زنجیر بەستراوەمەتەوە، باری لەشم وای لێ هات وەسیەتم کرد و بێ حاڵ مام تا ڕۆژی هەینی لە هاوڕێ و برایان پاڕامەوە لە ڕێی خوادا بە هەر جۆر بوە ببەن لە قاپی مزگەوتا لەبەر پێی حەزرەتی شێخدا دامنێن، چەن کەسێ لەناو پەلاشێکا[1] هەڵیان گرتم بردمیان لەوێ دایان نام، کاتێ نوێژی جومعە تەواو بوو حەزرەتی شێخ بە وێنەی مانگی درەخشان لە مزگەوت تەشریفی هاتە دەرەوە فەرموی: ئەمە کێیە؟ عەرزیان کرد شوکر الله کوردستانی‌یە حەزرەتی حاجی شێخ عبدالرحمن فەرمووی قوربان ئەمە مریدەکەی (٣) ڕۆژ لەمەو پێشە کە ئەڕۆیشت و ئەی ویست بڕوات حەزرەتی پیر قدّس سرّه فەرموی بۆچی نەڕۆییوە؟ دەستم برد چاکی کەواکەیم گرت ووتم یا شێخ دەخیل، فەرموی لێی پرسن ئەڕوات یا لێرە دائەنیشێ وە لە ڕۆیشتن تۆبە ئەکا و پەشیمان ئەبێتەوە؟ حەزرەتی حاجی شێخ عبدالرحمن فەرموی شێخ وا ئەفەرموێ، منیش بەبێ هێزی و لاوازی‌یەوە ووتم تۆبە ئەکەم ناڕۆم بەڵکو سەد جار تۆبە بێ لە ڕۆیشتن، ئەویش عەرزی کرد، فەرموی دە کەوایە هەڵی بگرن و بیبەنەوە جێگەکەی خۆی منیش

---

(١) پەلاش: گوێنی یان پێ خەف یان نوێن.

دۆعای شیفای بۆ ئەکەم ئەو تەشریفی چووەوە بۆ حەرەم[1]، وە رەفیقانیشم منیان بردەوە بۆ سەر جێگەکەی خۆم پاش نەختێ هەستم کرد باری نەخۆشیەکەم سووك بوو، وە کەم کەم رووم کردە حەسانەوە، تا کەوتمە بەیانی بە تەواوی چاك بووم وە چوومەوە سەر ئەو ئیشەی کە پێی مشغولّ[2] بووم وە وازم لە مەیلی ڕۆیشتن هێنا هەروەك فەرموویانە "ئارام بگرە چونکە خۆگرتن کلیلی قاپی فەرەحی و خۆشییە"[3]، وە لە ئاکاما فتوحەهام دەست کەوت[4]، وە خونچەی ئومێدم بە گولاڵە پشکووت، وە وام لێ هات کە ئێستە هەموو کەس ئەزانێ و لە هەموو کەسێکەوە دیارە الحمدُ لله حمداً طیّباً مبارکاً فیه وصلی الله علی خاتم الأنبیاء محمد وآله وصحبه وسلّم.

**ك ٦٢ بص:** جارێك لە پاش ئەوە کە بە صیفەتی إرشاد و مەشیخەت لە شاری سنە دائەنیشێ وە مرید و مەنسوبێ زۆر لە خزمەتیا ئەبن وە خانەقای بە دەنگی جذبە و شۆڕش و سلوکی سالیکان ئاوەدان ئەبێ، لە هەموو لایەکەوە دێنی گەران و هاتووچۆکەران بۆ فیض و بەرەکەت وەرگرتن لە خزمەتیا پەرەئەسێنێ، ڕۆژێ کۆمەڵێ لە بازرگانە گەورە و ناودارەکانی ئەو کاتە لە دانیشتوانی تاران و ئەصفەهان و تەورێز و هەمەدان تەنیا هەر لەبەر تاقی کردنەوەی چووبوون بۆ دیدەنی حاجی شێخ شکر الله و لێی ئەپرسن وە ئەڵێن یا شێخ لەکەرامات[5] و خرق العادە و مکاشەفاتی[6] حەزرەتی شێخ عوسمان ئەوەی کە دیبێتت وە لێت ئاشکرا و دیار بێ بێ

---

(١) حەرەم: یانیماڵی خۆیان و شوێنی حەوانەوە و ئارامگای تایبەتی خۆی.

(٢) مشغولّ: خەریك.

(٣) فارسی‌یەکەی ئەمەیە: (صبرکُن الصبر مفتاح الفرج) و عەرەبی‌یەکەی (إصبروا الصبرُ مفتاح الفرج).

(٤) فتوح: یانی چاوی دڵ ڕوون بوونەوە.

(٥) کەرامات: یانی ڕێز گرتنی خوا لە بەندەی خۆی بە هۆی تەواو ڕاستی و ڕاست بونەوەی ئەو بەندە لە خزمەت ئەودا.

(٦) خرق العادە: ڕوودانی شتێ کە بە پێی عادەت نەگونجێ.

زەحمەت بۆمان باس بفەرموو، لە وەلامدا ئەفەرمویٚ ئەی عەزیزانی خۆشەویست ئەوەی کەدیبیٚتم لە ژێر پەردەی غەیبدا گەر بە ئاشکرا بۆتان باس بکەم ئەگونجیٚ باوەڕ نەکەن ئەمما نەفسی خۆم ئەگەر لەڕووی ئینصافەوە، وە مروەت و ڕاستی بکەویٚتە ڕوو بە کەرامەت و خەواریقی بزانن و بە کەرامەتی بژمێرن نزیکترە بۆ قبوڵ و چاتر بڕوای پیٚ ئەکریٚ چونکە ئێوە هەموو لە أطوار و کردار و خووڕەوشتی ڕابوردووی من ئاگادارن وە ئیٚستە هەمووتان بە ئەدەب و ویٚڵ و ویقارەوە بەڕیٚزەوە لە مجلیسی مندا دانیشتوون، ئەمە بەسە بۆ گەورەیی و هیٚزی شیٚخیەتی و ئیرشادی حەزرەتی شیٚخ عوسمان، هەموو بڕوای پیٚ ئەکەن و پیاوەتی ئەخەنە کار و ئینصاف ئەدەن ئەڵیٚن والله وەلامیٚکی ڕاست و دروستت فەرموو[1].

---

مکاشفە: پەردە لادان لەڕووی کاروبارێکی نهێنی.

غەیب: بە هەر شتیٚ ئەڵیٚن لە پشتی پەردەوە بیٚ.

(١) وەرگێڕی ئەم موناقیبە لە فارسی‌یەوە بۆ کوردی ئەڵیٚ لە بارەی کەرامەتێکی حاجی شیٚخ شکر الله ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ لە پیاوێکی قەدیمەم بیست کە ماوەیە زۆر لە شاری سنەدا مابووەوە بۆی گێڕاومەتەوە وای بە چاك ئەزانم دۆستانی خوا بە چاکی بزانن کە لێرەدا بینووسم وە ئەوەش ئەمەیە:

یەکیٚ لە شاکانی ئیٚران ناصر الدین شاە ئەبیٚ یان یەکیٚ تریان، داوای علی أکبر خان ی والی سنە ئەکات کە لەقەبی شرف الملك بوە، ئەم والی‌یە خۆی و دەست و پیٚوەندەکەی مەترسی لەم داواکاری‌یە ئەکەن وە بە داواکردنێکی دۆستانەی نازانن، والیش بە چەند دۆستێکی خۆی پرس و ڕا ئەکا کە بچم یان نەچم و تەکبیر چی‌یە، ئەوانیش هەر کام بە گوێرەی لیٚ زانینی خۆی شتیٚ ئەڵیٚ، لە ئەنجاما یەکیٚ بە والی ئەڵیٚ: حاجی شیٚخ شکر الله وەختی خۆی پیاو خولامی ئێوە بوو بەلام ئیٚستا خولام و بەندەی بەڕاستی خوایە چاك وایە پرس و ڕا بەو بکە ئەگەر ئەو فەرمووی بڕۆ مەترسە ئەوا بەگویٚ بکە ئەویش قسەکەی پەسەند ئەکات خەبەر ئەدەن بە حاجی شیٚخ شکر الله کە والی دیٚت بۆ زیارەتی جەنابت، کاتیٚ والی ئەگاتە لای و زیارەتی ئەکات وە ماوەیە ئەمێنیٚتەوە ئەڵیٚ پرسیارێکم هەیە ئەویش ئەوەیە پاشا لە تارانەوە داوای کردووم وە لەم داواکردنە بە هۆی چەن ڕووداوێکەوە دڵنیا نیم کە شانیەتی لەگەڵم چاك بیٚ ئیٚستەش من وا ئەزانم لەم بارەیەوە پرس و ڕات پیٚ بکەم چونکە لە لایەن خواوە بیٚ ئاگاداری نین شیٚخیش ئەفەرمویٚ ئەگەر بە قسەم بکەی بڕۆ هیچت بۆ نابیٚ بەلام ئەتنیٚرن بۆ جیٚگەیەکی تر نایەیتەوە بۆ ئیٚرە، والیش دڵنیا ئەبیٚ بە فەرمایشتی حاجی شیٚخ شکر الله و ئەچیٚ بۆ تاران، ڕۆژی چاوپیٚکەوتن چاوی بە شا ئەکەویٚ و عەلی

**ك ٦٣ بص ٣١٢:** خاوەنی پایەی بەرز لە عیلم و معریفەت و ئەخلاقا جەنابی مەلا حامید کە بە مەلا حامیدی گەورە بە ناوبانگە ئەم زاتە هەم مەلا بوە لە تەویلە وە هەم نووسەر و کاتب الأسراری حەزرەتی شێخ بووە، فەرمووی: حەزرەتی شێخ ئەی فەرمو مۆرێکیان بەسەر زمانما ناوە هەمیشە ئەثەری ئەو مۆرە دیارە عەرزم کرد سەجعی[1]، ئەو مۆرە چی‌یە؟ فەرمووی بەندەی خودا عوسمان وە هەروەها فەرمووی هەرکەسێ گوناهێ بکات خەتێ ڕەش لە سینەی ئەو کەسە ئەنوسرێ ئەگەر پەشیمان بوەوە تۆبەی کرد ئەکوژێتەوە، بەلاّم وەك برینێ خۆش بێتەوە و پاشماوەی بمێنێ وایە، عەرزیم کرد بە چی ئەو ئەثەرە بە تەواوی لائەچێ فەرمووی بە زۆر بەجێهێنانی شەونوێژ[2].

**ك ٦٤ بص ٣٠٣:** چەن کەسێ لە خەلیفە و مریدانی خاوەن ڕاستی و صحیح الروایە بۆیان گێرامەوە کە ڕۆژێ سیّدێکی فەقیری بەرگ دڕاو هاتە خزمەت حەزرەتی شێخ و عەرزی کرد یا شێخ لە سلێمانیەوە بە هیوا و ئومێدی جەنابی تۆوە هاتووم کە گیروگرفتم لەسەر لاببەیت ئەویش فەرموی سید موشکیلەت چی‌یە؟ عەرزی کرد قوربان شجرەی تایفەی ئێمە وون بوە، وە ماوەیەکی زۆر سیادەی ئێمە پۆشراوە ئێستە هەندێ کەس لە سیدی من بێ باوەڕن وە ئینکاری سیادەتمان ئەکەن،

---

ئەکبەرخان ڕێزی تایبەتی وەکو جاران بۆ پادشا بە جێ دێنێ، پادشا لە دورەوە بانگی ئەکات و ئەڵێ علی أکبر خان ئەوە کێیە لەگەڵتا ئەوە شا شرف الملك هەر خۆی بە تەنیا ئەبێ، تێ دەگا و دەڵێ شاهم شێوە و لیباسی چۆنە، شایش بەیانی ئەکات، علی أکبر خان ئەڵێ شاها ئەوە یەکێکە لە مشایخانی نقشبندی و خەڵکی شاری سنەیە ناوی حاجی شێخ شکراللە یە، پادشا ئەڵێ عەلی ئەکبەر خان تۆم بەو زاتە بەخشی، وە ئەوا بڕیارم دا بەو مەنصەبەی خۆتەوە بچی بۆ ئەردەبیل بەڵێ ئیتر شرف الملك ناگەڕێتەوە بۆ سنە و ئەبێ بە والی ئەردەبیل.

(١) سجع یانی عینوان، ناونیشان، ئەم کەرامەتە لە لاپەڕە (٧٥) نووسراوەتەوە.

(٢) یانی شەونوێژ (التهجد) بە تەواوی ئاثارەکەی مەحو ئەبێتەوە و نامێنێ.

به ڕادەیەك من خۆیشم لـە سیدی خـۆم کەوتومـە شـك، لەبـەر ڕەزای خـوا هـەرچی ئەزانی لە بابـەت سـەییدی منـەوە ڕوونی بکەنـەوە، فـەرمووی سـەیید سبـەی وەڵامـت ئەدەمەوە ئەمشەو مۆڵەتم بدە، کەوتە بەیانی حەزرەتی پیری دەروون منیر دێتـە دەرەوە خوا لێ خۆش بوو ملا حامیدی کبیر لەگەڵ کۆمەڵێ لە خولەفا و جێنشینانی زانا داوا ئەکات و فەرمووی ئەمشەو بە ئاشکرا و بێداری نەك بە خەو[1] بە خزمـەتی حـەزرەتی رسول الله ﷺ گەیشتم لە باو باپیری[2] ئەم سەییدەم لە خزمەت ئەو سەروەرەدا عـەرز کرد لە وەڵاما فەرمووی بەڵێ لـە ذریـەتی منە سیدی داواکـرد وە فـەرمووی بـە مـەلا حامید بەم عیبارەتە نامەیەك بۆ ئەم سیّدە بنووسە و تەسلیمی بکە بە سـیّد بـە فـەرمانی ئـەو بـۆی نـووسی و دای بـە دەسـتی‌یـەوە، ئیتـر سـیّد بـەرەو سـلێمانی گەڕایـەوە، بێ بڕوایان و سارد گۆیان دەستیان کرد بە قسەی پڕوپوچ ئەمجا جەنابی پێشـەوای زانایـان پێشڕەوی زەمان حاجی مەلا أحمدی مفتی نۆدشی کە لەو کاتەدا مفتی شـاری سـلێمانی ئەبێ کۆڕێ گەورە لە زانا و گەورە پیاوە بەرز و بەڕێزەکانی سلێمانی پێك دێـنێ وە بـە بەڵگەی تەواو پێیان ئەسەلمێنێ کە فەرموودەی حـەزرەتی شێخ ڕاسـت و دروسـتە، وە موافقی شەرع و حەقانیەتە، ئیتـر بێ بـاوەڕان دەم بـەس و بێ زمـان درێـژی ئەمێننـەوە وەهیچیان بە دەسەوە نامێنێ.

**ك ٦٥ بـص ٣٠٤:** جـەنابی عەلامـەی زەمـان حـاجی مـەلا ئەحمـەدی نـۆتشی فەرمووی ڕۆژێ مەلا سلێمانی کەیمنەیی کە لە مەقبوڵان و مـەنظورانی حـەزرەتی شـێخ بوو هات بۆ خزمەتی ئەو بەدرە منیرە ئـاهو ناڵەیـەکی زۆری کـرد لـە دەس کابرایـەکی هەرزە و زیان بەخشی خەڵکی هانەگەرمەڵە[3]، وە زۆر بێتاقەت و دڵـپـڕی و بێـزاری خۆی دەربڕی گۆیـا هـەرزە گـۆیی و قسـەی ناشـرینی بەرامبـەر کـردوە بەسـەر شـێخا

---

(١) فەرمایشتەکەی ئەو وەهابوو (يقظةً لا نوماً).

(٢) فەرمایشتەکەی ئەوزاتە عالی قدرە (لە نەسەبی ئەم سیّدەم).

(٣) هانەگەرمەڵە: لەگەڵ کەیمنەدا پێکەوە وان لە خاکی ئێران لە ژووروی بیارەی شریفەوە.

دەستی کرد بە گریان، حەزرەتی شێخ فەرمووی نارەحەت مەبە بەم زوانە تۆڵەت ئەستێنم لە پاش پێنج ڕۆژ حەزرەتی شێخ دانیشتبوو هەمان داواکار و ناحەزی مەلا سلێمان پەیدا بوو لەگەڵ حەزرەتی شێخ چاوی پێکەوت فەرمووی ئای بۆ تۆ ئێشتا نەمردووی؟ ئەو کابرایشە ووتی بۆچی بمرم شێخ بێ دەنگ بوو بۆ سبەی نەخۆش کەوت سێ ڕۆژ ما ئیتر مرد.

**ك ٦٦ بص ٣٠٥:** سیّد مصطفی کوڕی خوا لێ خۆشبوو سیّد عبدالکریم لە گەورە گەورانی خولەفا و ماقوولانی حەزرەتی شێخ و لە گەورە و ساداتی خانەقا بووە[1] گێڕایەوە لە کاتێکا بوو بە میوانم و ئەم کتێبەمی تەماشاکرد ووتی: وەختێ من لە سکی دایکما بووم باوکم برایەکی ترمی لەگەڵ خۆی بردبوو بۆ زیارەتی حەزرەتی پیر کە ناوی سیّد أحمد بوو، وە داواکاری کردبوو لە حەزرەتی شێخ کە دۆعای بۆ بکات و هیممەت بفەرموێ کە چاك بێ تەمەن درێژ و سەرکەتو بێ بۆ وەرگرتنی ئەسبابی کامەرانی وە خوا پێی ببەخشێ، ئەفەرموێ دۆعای خێری بۆ ئەکەم بەڵام خێزانت بەم نزیکانە کوڕێکی ترت بۆ ئەبینێ ناوی بنێ مصطفی وە بزانە ئەم کوڕە بە ئەوپەڕی ئارەزوو مەیلی تۆ چاك ئەبێ وە زانایەکی عامل ئەبێ، وە بۆ تبرك سەرەکەللەیە شەکر و بە چوار قەدێی[2] جامانەیەکی بە دیاری بە باوکم خەڵات فەرمووبوو، وە فەرموو بووی ئەمانە بۆ ئەو کوڕە تازەیەت ببە بە دیاری هەر چۆنی فەرموو وابوو کە دێتەوە من لە دایك ئەبم و ناوم ئەنێ مصطفی وە ئەم سەرە کەللە شەکرەم ووردە ووردە دەرخوارد ئەدات وە ئەو جامانەیەش تا ئەم دوایی‌یە هەر لەناو سەرینی ژێر سەرما بۆ تبرك هەر مابوو.

---

(١) خانەقا: دێیەکە سەر بەناوچەی (پاوە)یە لە هەورامانی ئێران.

(٢) چوار قەدی جامانە: یانی جامانەیەکی چوار قەد کراو.

ك ٦٧ بص٣٠٥: حاجی ئیبراهیمی بیارەیی کە لە سەرەتای ژیانیەوە تا دوایی عومری هەر خادیم و موخلیسی حەزرەتی شێخ بوو گێڕایەوە بۆی باسکردین کە: حەزرەتی پیر مانگی (٥٠) قران[1] مووچەی لە لایەن میرییەوە بوو، هەموو مانگێ بە دەست من ئەگەیشت و منیش لە پێویستی ئەو زاتەدا خەرجم ئەکرد، جارێ لە شاری سلێمانی پارەکەم وەرگرت شتومەکێ کە پێویست بوو بۆ ماڵی شێخ کڕیم، وا ڕێکەوت (٢) دووشایی قەرزی جوولەکەیەکم لەسەرما، لەو کاتەدا ووردەم پێ نەبوو دوام خست و نەمدایە، کاتێ کە لە شار دەرچووم گەیشتمە دێی گرێزە[2]، ژنێکی جوان خەریکی مەشکەژەندن بوو، منیش بە بەهانەی دۆ خواردنەوە چەند جارێك بۆی ڕوانیم و سەیرم کرد، کە کەوتمە ڕێ تا گەیشتمە دێی چەقان تووشی گەلێ مەڕ و بزنی زۆر بوم سەگەلی کابرای شوان بۆم هاتن و هێرشیان بۆ هێنام زۆری نەمابوو بە پەلامارێ سکم پارە پارە بکەن، هاوڕێکەم کە ئەوەی دی هەندێ قسەی ساردی بە کابرای شوانی ووت شوانەکە لە سەگەکان تیژتر بۆم هات بە خۆی و گۆچانەکەیەوە، کە نزیك بوومەوە ناسیمی و ئارامی گرت، کاتێ کە گەیشتمە بیارە سەر و (نەبات)مان خوارد لەو نەباتانەی کە بۆ شێخمان کڕیبو حەزرەتی شێخ لە باخێکا بوو کە گەیشتینە خزمەتی دەسبەجێ بە درێژی هەر دوو شایی جوولەکەکە و سەیرکردن و ڕوانین بۆ ژنەکە و هاشاوڵی سەگەکان و خواردنی نەباتەکانی بۆ باسکردین، ووتم قوربان ئەڵێی چرایەکت بە دوامان هەڵکردووە حاڵی ئێمەی پێ دەرئەخەی ئاوا بەم چەشنە نهێنیمان ئاشکرا ئەکەی فەرمووی بڕۆ پارەی ئەو جوولەکە بەبێ تەفرە بۆی بنێرە ووتم: ئەمر ئەفەرموی ئیطاعەم هەیە.

---

(١) قران: دراوێکی ئێرانە بە (١٠) فلس زیاتر ئەچو، شایی: هەروەها دراوێکی ئەوی‌یە جاران بە فلسێك ئەچوو.

(٢) گرێزە: گرێزە و موان لەولا عەربەتەوەیە لە رۆژهەلاتی سلێمانی.

**ك ٦٨ بص ٣٠٦:** خاوەن ڕێز جەنابی شێخ إسماعیلی هەجیجی ووتی: خێزانم ئەمری خوای بەجێ هێنا، ماڵەکەم بێکەس ما هەر یەکە لە لایەکەوە کەلوپەلیان ئەبردم، لە سێ جێگە بە تەمای ژن هێنان بووم یەکەم لە دێی نۆدشە خوشکی حاجی مەلا ئەحمەد، دووەم لە دێ سلێنی هەورامان خوشکی مەلا یەعقوب، سێیەم لە دێی وەڕائی پاوە، وە بۆ هەڵبژاردنی یەکێ لەم سێ ئافرەتانە عەرزی شێخم کرد، لە پاش موراقەبەیە تەواو فەرموی کچە سلێنییەکەم دی ڕەنگی زەردە خوشکی حاجی مەلا ئەحمەد نەفسێکی بەرز و زلی هەیە بەرەنگاری ناکەی ئەوی وەڕائیش لەناو خێڵەکانی دەر و دەشت گەورە بووە ژیری و سەلیقەیەکی وای نیە ووتم دەی قوربان چی بکەم، دووبارە موراقیب بووەوە دوایی فەرمووی: هەر لە دێی هەجیجدا کچێکی تیایە خوای تەعالا ئەوی بە هاوبەشی ژیانت نوسیوە عەرزم کرد کچێ ئاوەها بە کاری من بێ شك نابەم فەرموی باوکی ناوی مصطفییە وە ماڵەکەیان تفەنگ هاوێژێ لە مزگەوتەکەوە دوورە، کە بیرم کردەوە ئەو ئافرەتە بەقسەی خۆم دراوە بە کوڕێ بەڵام هێشتا مارە نەکراوە، خاوەنەکەی شیربایی لێ وەرگرتبوو وە هەموو کاروبارێکی تەواوکردوە مارەکردنی ماوە، چۆنیەتی ئەم باسەم عەرز کرد ووتم من تاقەتی بەد ناویم نیە ئەو مەسەلەیە بڕاوەتەوە، دوژمنایەتی کەسم بۆ ناکرێ، ئەوان کۆمەڵێکی ڕێکوپێك نین، فەرمووی باوەڕم پێ بکە خوای تعالی ئەو کچەی کردوە بە هاوسەر و هاودەمی تۆ وە بۆ خێزانی تۆی دروست کردوە، دووبارە من خۆمم بۆ دابین نەکرا نەم توانی خۆم بە خاوەنی ئەم باسە بزانم، لە پاش ماوەیە مصطفی ئیشی کچەکەی شێواند وە هەرچی ماڵێ کە بە شیربایی[1] وەری گرتبوو دایەوە، وە کوڕەکەش بە بێ دڵ زویری و دڵ گرانی لەو مەسەلەیە چوە دواوە وە بێ ئەوەی

---

(١) شیربایی: ئەگونجێ ئەم ووشەیە لە سەرەتاوە وە ئێستا بەو پارەیە یا هەر نەختینەیەکی تر ئەووترێ کە خاوەن ئافرەت وەری ئەگرێ وە ئەم کارە حەرامە و ناڕەوایە لە شەریعەت دا، خوا و پێغەمبەری خوا پێیان ناخۆشە.

کەسێ قسەی تیا بکات، ڕۆژێ لە دوای ئەم بەسەرهاتە صۆفی رحیم ناوێ خەڵکی نۆتشە لە لایەن حەزرەتی شێخەوە هات لەگەڵ دوو نامەدا یەکێکی بۆ مصطفی و یەکێ بۆ من، کە پێویست وایە مصطفی ئەو کچەت بداتێ ئیتر من ماوەی بێ ئەمریم نەما، مصطفیمان داواکرد و کاغەزەکانمان بۆ خوێندەوە ووتی بەڵێ باشە هەر لەو کاتەدا کچەکەی لێ مارە کردم، وە ئەو ئافرەتە زۆر زۆر هۆی خۆشی و حەوانەوەی من بوو، وە زۆر لەوەوە ویسعەت و شادمانیم دەست کەوت وە چەن منداڵێکی باش و صالح خوا پێی بەخشین.

**ك ٦٩:** خەلیفە عبدالباقی پاوەیی کە یەکێ بوو لەوەرگیراوانی خزمەت شێخ فەرمووی محمد ناوی هەورامی کە بە حەمەکە بەناوبانگ بوو وە یەکێ بوو لە قاترچیانی[١] ماڵی حەزرەتی پیر ووتی دیانێکم هاتە ئێش و زۆر بێتاقەتی کردم چووم بۆ لای دانساز کە دەری بێنم گازی خستە دەمم سێ جار بە هەموو هێز و توانایەوە رای کێشا لە جێی خۆی نەجوولا، گازەکەی فڕێدا و منی جواب کرد ناچار ڕام کرد بۆ بەرقاپی ماڵی حەزرەتی شێخ، بە هاوار هاوار و ناڵە و دادی منەوە تەشریفی لە حەرەم هاتە دەرەوە و فەرمووی چییە؟ چیت لێ بەسەر هاتوە حاڵی خۆم بۆ بەیان کرد، فەرمووی دۆعای خێرت بۆ ئەکەم من بێ ئەدەبانە هەستام خۆمدا بە زەویدا قاچم ماچ کرد ووتم سوێند بەو خوایەی ئەم هەموو ڕێز و گەورەیییەی داوە بە تۆ سەر هەڵ نابڕم هەتا ڕزگارم نەکەی فەرموی سبحان الله وە موڕاقیب بوو دەسبەجێ لە هۆش خۆم چووم و خەوم لێ کەوت، لەناکا شاخەیە[٢] لە دانمەوە هات، وە بەو دەنگەوە بە ئاگا هاتم تەماشام کرد دانەکەم کەوتۆتە دەممەوە، وە سێ چوکڵەی گەورەی هەیە ئیتر ئێشەکەم نەما، وە شێخم دی لەگەڵ چەن کەسێ کە لەویا بوون

---

(١) قاترچی: قەتارچی، وولاخدار.

(٢) شاخە: دەنگ، دێر وەخت: درەنگ وەخت.

دەورەیان دابوو فەرمایشتی ئەفەرموێ، بە هیچ جۆرێ تەماشای لای منی نەدەکرد، بە هێواشی و لەسەرخۆ دەس و دەمم شت و بە تەواوی ڕزگار بووم.

**ك ٧٠ بص ٣٠٩:** حاجی مەلا محمودی سنەیی گێڕایەوە کە لە سەرەتای مریدیمەوە حەزرەتی شێخ بۆ سەر شکێنی و پەروەردەی نەفسم شەوێ دێر وەخت داوای کردم فەرمووی ئا ئێستە مەوەستە بڕۆ بۆ دێی بەڵخە فەتاح بەگ لەگەڵ خۆت بێنە و وەرەوە لەگەڵ ئەوەشا من لەگەڵ فەتاح بەگ بەینمان خۆش نەبوو، وە ئەم فەرمانی شێخەم لەسەر برین لە لا ناڕەحەت تر بوو، بەڵام هەر ئەبێ بچم و کەوتمە ڕێ شەوێکی تاریك و ڕێگە لە بەرد و دار و درەخت، وە زۆر لە دڕەندە و زیانبەخشان ئەترسام دوو سەعاتە ڕێیەك ماوە ئەبوو وا ڕێکەوت گەیشتمە جێگەیەکی دارستان و ناهەموار دەنگە دەنگو خشە خشێ لەو دارستانەوە هات، لە ترسی گورگ وەك گیان دەرچوون وابوو بە لامەوە بە کورتی گەیشتمە بەڵخە بە هەر ترس و لەرزێ بوو، وە فەتاح بەگم لەگەڵ خۆم برد، وە نیوەشەو بە خزمەت شێخ گەیشتین لێی پرسیم چۆن ڕۆیشتی عەرزم کرد باش ڕۆیشتم فەرمووی لە دەنگە دەنگو خشە خشەکەی فلان جێگە چۆن بووی؟ ووتم وا دیارە شێخ بە چرایەکەوە لەگەڵم بوە و چاودێری ئەحواڵم بوە.

**ك ٧١ بص ٣٠٩:** صۆفی فەرەجی باقلاوایی[١] ووتی: ساڵێ کاتی پێگەیشتنی قەیسی بوو، چووم بۆ دێی زەروان ئەوەندەی ٤ چوار مەن[١]، قەیسیم چنی و

(١) باقلاو: دێیەکە کەوتۆتە میانەی مەریوان و سنە لە دەوروبەری کەلاتەرزانایە.

بە بۆنەی صۆفی فەرەجی باقلاوایی‌یەوە بەندەش (وەرگێڕ) حیکایەتێکم بیستوە لە چەن کەس بە بۆنەی ئەم دێی باقلاوایە کە ناوبراو ئەیگێڕمەوە:

لە دێی باقلاوا خانەقایەکی دوو قاتی خۆشی لێیە چوومە ناوی، لە کاتی حەزرەتی شێخ سراج الله والدین دەستگیری وەقت ئەبێ چەند خەلیفە و ئیجازە دراوانی ئەبن لە پاش کەسب و سلوك و گەیین بە پلەو

بردمەوە بۆ ماڵ هەر لەو ڕۆژەدا چووم بۆ زیارەتی شێخ حەزرەتی قطبی زەمان و تەمیە[2] هێنەری مریدان کە منی دی ملم کەچ کردوە وە چاوەڕوانی بەرەکەت وەستاوم ڕووی کردە مریدان و فەرموی خەڵك ئەچێتە باخی دێهاتەوە و قەیسی خەڵکی بە بێ ڕەزامەندی خاوەنەکەی ئەچنن و ئەیبەن دوایی دێن بۆ لای من وەك هەژار مل کەچ ئەکەن و چاوەڕێی فیض و بەرەکەتن.

**ك ٧٢ بص ٣١٢:** شێخ محمدی قەرەداخی ووتی یەعقوب بەگ حاکم زادە و فەرمانڕەوای ئێلی شەرەفیانی بوو وە هەم ئیجازە دراو و هەم ژن برای حەزرەتی شێخ بوو، وە مەلیك نیاز خانێ کە لەگەڵ یەعقوب بەگی ناوبراو دوژمنایەتیان ئەبێ وە

---

پایەی بەرز و بڵندی مەشیخەت یەکێ لەوانە شێخ حسین ناو ئەبێ کە لە باقلاوا جێگیر بوە و خانقا دروست ئەکات وە بە فێرکردنی ڕێگەی داخوازانی ڕێگەی مشغوڵ ئەبێ.

ساڵێ کاروانی بارە دەغلی ماڵی حەزرەتی شێخ عوسمان لە أطرافی سەقزەوە دێنەوە و لەوێ لائەدەن وە وولاخەکانی خانەقای تەوێڵە لەوێ تاقەت ئەکەن، لە کاتی ژەم و نان خواردن چاوەڕوانی خوا لێ خۆشبوو شێخ حسین ئەکەن دیار نیە هەرچەند ئەگەڕێ چ لە خانەقا و چ لەو ماڵە خزمانە کە ڕێی تێ ئەچێ چووبێ ئەگەڕێن دیار نابێ، بە کورتی شێخ وون ئەبێ و بە تەمای نامێنن، نزیکی نیوە شەوێ قاترچییەکانی ماڵی حەزرەتی شێخ عوسمان ئەچن بۆ ئالف پێدان و سەرلێدانی وولاخەکان، کە تەماشا ئەکەن ئەوا شێخ حسین دەستە و نەزەر و مل کەچ بەلای وولاخەکانەوە وەستاوە، زۆر سەریان لەم حاڵە سڕ ئەمێنێ و بە لایانەوە سەیر ئەبێ، خەبەر ئەدەن مرید و خزم و باقی دڵسۆزان ئەزانن و دێن و ئەپرسن قوربان ئێمە دنیامان پشکنی ئەوە تۆ تەشریفت چی ئەکەی لێرە، وە ئەمە چە حاڵێکە؟ لە وەلامیانا ئەفەرموێ: حەزرەتی شێخ عوسمان لطفێ وای لەگەڵدا کردوم بە هیچ چەشنێ پاداشتم بۆ نادرێتەوە هەرچی لە مەقامات و مەڕاتبی ئەم ڕێگە کە دەسم کەوتبێ وە ڕێزی دنیایی هەرچیم بێ لە هیممەتی ئەو زاتەوەیە و ولاخی خانەقای ئەو زاتە بێتە ئێرە، وە لە ماڵی من دابێ حەقی خۆمە ئەبێ تا بەیانی ئاوا دەستە و نەزەر بە دیاریانەوە بوەستم رحمة الله علیه وجزاه الله خیر الجزاء بە راستی زاتێکی زۆر زۆر بە وەفا بووە.

(١) چوار مەن: ئەکاتە ١٢ کلیۆ.

(٢) تەمیە یانی تنبیه، منبّە، ئەو تەمیەی خۆشەویستی ئەکات.

کوشتار لـه میانەیانـدا ڕوویـدابوو، ئـەم مـەلیك نیـاز خانـە لـە لایـەن فـەرمانڕەوایی کرماشانەوە کرا بە حاکمی وولاتی (شەرەفیانی) یەعقوب بەگی ناوبراو زۆر ترسی لـیٚ پەیدا بوو، چووە خزمەتی شێخ عەرزی کرد ئەم پیاوە کە کراوە بە حاکم لەگەڵ مندا دوژمنایەتی و دڵ ڕەقی هەیە کینەی ڕابوردووم لەگەڵدا بەکاردێنیٚ زۆرمـان تـرس لێـی هەیـە، لـە وەڵامـا فـەرمووی هـیچ ترسـت نـەبیٚ لەگـەڵ ئێـوە زۆر ڕێـك و ئاسـان کـار ئەجووڵێتەوە، بەڵام لە دواجار لەگەڵ یەکیٚ لە مەنسووبینی ئێمە بەد کـرداری ئـەکات و لەناو ئەچیٚ، مەلیك نیازخان تا ماوەی ٦ شەش ساڵ فـەرمانڕەوا بـوو لـە ناویانـدا، وە هەموو ئەترساین کە بەد کرداریەك لەگەڵ یەعقوب بەگ بکات، تـا ڕۆژیٚ لەگـەڵ ١٥٠٠ سـوار هاتـە نـاو ئێمـەوە بـە تـووڕەیی‌یـەوە فـەرمانی کـرد منیـان گـرت وە زۆر ئازاریان دام و ڕیشی مـنی گـرت پێچـای بـە دەسـتیا بـە شـێوەیەکی بیٚ ڕێـز و خـواری بردمیان بـۆ بەندیخانـە و خـۆیشی سـوار بـوو، لەگـەڵ کۆمـەڵیٚ لەگـەڵیا بـوو ڕۆیشـت لـەناکا یـەکیٚ لـە سـوارەی ئەحمەدەوەنـد (هەمەوەنـد)[1]، کـە لـەو کۆمـەڵی ١٥٠٠ نەفەرەدا چووە پێشەوە و دایە بەر گولله کوشتی، وە هەر ئەو پیاوە لـەناو ئـەو هـەموو لەشکرە زۆرە دەرباز بوو خـۆی دەرکـرد، مـنیش ئیتـر بـە سـەلامەتی چـوومەوە مـاڵی خۆم وە ئیتر ئەو فەرمایشتی شێخە بوو بە هۆی بیروباوەڕ پەیـدا کـردنی ئـەو تایەفـە و تیرەیە.

لە پاشی سەد ساڵ هەرچی بێتە ڕوو

پیر هەواڵ ئەدا یەك یەك لە هەموو

**ك ٧٣ بص ٣١٨:** بەڕێز جەنابی بەختەوەر و کامیاب شـێخ محمـد صـادق وەزیـر زادەی کوردسـتان ووتی: کـاتیٚ شـێخ تەشـریفی لـە شـاری سلێمانی دابـوو جـاریٚ بـە

---

(١) ئەحمەدەوەند: یانی هەمەوەند.

بۆنەیەکەوە فەرمووی هەر کات گیروگرفتێ[1] بێتە پێشەوە لە حاڵی ووشیاری و ئاگاداری بێ خەو[2] بە خزمەت حەزرەتی رسول الله ئەگەم پرسیارم هەرچی بێ عەرزی ئەکەم وە وەڵام لە خزمەتیا وەرئەگرمەوە بەدەمی لێی ئەپرسم، ئەم فەرمایشتە لە دڵی بێ بڕوایاندا زۆر گران و سەخت ئەبێ، بە هەموو جۆر وە لە هەموو بارێکەوە زمان درێژی ئەکەن تا کابرایەك ئەخڵەتێنن[3] قاترێکی[4] بارەبەری ماڵی شێخ ئەدزێ. بێ باوەڕان و ناحەزان دەس بە قسەی هەرزە ووتن ئەکەن و ئەڵێن: ئەگەر ڕاست ئەکات و لافی وا لێ ئەدات با بزانێ ئێسترەکەی کێ دزیویەتی، ئەم قسە ئەگاتەوە حەزرەتی شێخ: ئەفەرموێ لێیان بگەڕێن با وایان ووتبێ (موشکیلەیی نیە کە ئاسان نەبێ) پاش ماوەیەك کەم ئاگرێ ئەکەوێتە ماڵی کابرای دز ژنێکی و برایەکی لەگەڵ هەرچی یان بوو هەموو سووتا تەنیا خۆی دەرچوو بوو ووتبووی سوێند ئەخۆم بە خوا ئەم هەموو بەسەرهات و بەڵایە کە هات بە سەرما بەهۆی ئەو بێ ئەدەبیەوە بووە کە کردوومە، ئێسترەکە ناڵی تازە ئەکات و ئەیباتەوە خزمەت شێخ و تەوبە ئەکات وە ئەم کارەساتەش بوو بە هۆی ئیمان و باوەڕی کۆمەڵێ گەورە.

**ك ٧٤ بص٣١٨:** دیسان جەنابی شێخ محمد صادق کە یەکێکە لە خولەفای شێخ گێڕایەوە فەرمووی: لە شاری سلێمانی ڕۆژێ حاجی قادر ئاغا بە حەزرەتی شێخی عەرز کرد قوربان: ڕەحمە خان ناوی خێزانم لە دنیا دەرچوە تکا و پاڕانەوە لە خزمەت حەزرەتی پیردا ئەکەم کە هەواڵێکم لەبارەیەوە پێ بفەرموێ، حەزرەتی پیر تا

---

(١) گیروگرفت: تەنگو چەڵمە، موشکیلە.

(٢) لە حاڵی ئاگاداری و ووشیاری بێ خەو یانی (يقظةً لا نوماً).

(٣) ئەخلەتێنن: بە هەڵەیدا ئەبەن.

(٤) قاتر: ئێستر.

ماوەیە بێدەنگ بوو پاشتر فەرمووی رەحمە خان بەم شێوە و ڕەنگەوە حازرە و ئەڵێ: سوپاس بۆ خوا زۆر باشم و چاکم لێ ئەگوزەری[1]، بەڵام گلەییم هەیە لە ئاغا چونکە هەندێ ئەمانەتم لە لا داناوە و نایدا بە منالەکان حاجی ئاغای ناوبراو عەرزی ئەکات نیشانەکانی ژنەکە ڕاست و دروستە بەلاّم هیچ ئەمانەتێ شك نابەم، فەرمووی ئەمشەو بڕۆ بیری لێ بکەرەوە بەڵکو بێتەوە یادت، حاجی ئەڕوات و بەیانی دێتەوە عەرزی ئەکات بە خوا هیچ نایەتە یادم شێخ فەرمووی سەیرە تۆ خێزانی خۆت نابینی ئەمەیە حازرە ئەڵێ فلان خشلّ و فلاّن گوارە و کەمەرە داومەتە دەستی خستویەتە فلاّن سندوقی بچووك وسەری مۆر کردوە بۆچی لە یادی چووە؟ حاجی قادر ئاغا دەستی پیرۆزی ماچ ئەکات و دانی پیا ئەنێ ئەفەرموێ هەمووی ڕاست ئەفەرموی ئێستە هاتەوە یادم وە ئەو ئافرەتە حەقیەتی گلەیی بکات والسلام.

**ك ٧٥ بص ٣٠٩:** خوا لێ خۆشبوو میرزا غفاری کوڕی میرزا صالح لە سنە گێڕایەو ووتی: لە سەرەتای دەرکەوتنی شێخیەتی حەزرەتی شێخ عوسمان تەشریفی هێنا بۆ سنە باوکم بە شێوەی میوانداری حەزرەتی پیری دەعوەت کرد بۆ ماڵەوە وە کۆڕ و کۆمەڵێکی باش ئامادەبوو، باوکم عەرزی کرد، لەوانەی لەم مەجلیسەدا حازرن یەکێکیان خەوێکی ترسناکی دیوە هەرچەند ئەکات توانای نیە بیگێڕێتەوە، شێخ ئەفەرموێ من بڵێم کێیە؟ وە خەوەکەی چییە؟ باوکم لە ڕووی خۆ بە کەمزانیەوە عەرزی ئەکات خۆت بیفەرموو ئەفەرموێ خەوەکە خۆت دیوتە و خەوی خۆتە، وە ئەوەش ئەوەیە ئەمشەو لە خەوتا لەگەلّ دایکت جەمع بوویت وە فلاّن کردار و فلاّن قسەت کردوە، مزگێنی بۆ تۆ لە ئاخیرەتا[2] ئەهلی نەجاتی[3] نابینی یەکێ لە مەشایخ فەرموویەتی لەم واتایەدا:

---

(١) ئەگوزەرێ: تێ ئەپەڕێ.

(٢) ئاخیرەت: پاشەڕۆژ ، ڕۆژی دوایی، ڕۆژی قیامەت.

(٣) نەجات: ڕزگاری، ئیمان سەلامەت، بەختەوەر، بەهرەمەند.

موسڵمانان من ئەو گاورەم کە بتخانەم بینا کردوە

لە سەربانی کەنیشتە هەردوو دنیام من نیدا کردوە[1]

ئەمن لەو دایکە بووم جارێکی تر جووت بوم لەگەڵ ئەودا

بە من بۆیە ئەڵێن گاور لەگەڵ دایکم زینا کردوە

لە إصطلاحی ئەهلی تصوّف (گەور) واتە گاور عیبارەتە لە فانی فی الله لەو مەرتەبەوە کە بە عالەمی ئەرواح مەشهورە، وە بریتی‌یە لە عالەمی کبیر لە عالەمی أمری، وە لەو جێگەوە ڕۆح‌ظهوری کرد یانی هبوطی کرد بۆ عالەمی خەلق وە چوە بە جیسمی ئەو طیفلەدا کە لە سلك دایە، بە گوێرەی ضعف و قوەی سیر و سلوك بەرەبەرە بەرز ئەبێتەوە تا ئەگاتەوە عەینی مەرتەبەکە، کأنّە ئەو مرتبە دایکی بوە ئەمجا لیێ جیابونەوە دوبارە پێکەوە کۆ ئەبنەوە والله أعلم.

میرزا عبدالغفار ووتی لە پاش ئەم بەسەرهاتە ٤٠ چل ساڵی پێچوو کاتێ من و ملا فتح الله قاضی کە برای خوا لیێ خۆشبوو ملا عباس شێخ الاسلام بوو چووین بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ عوسمان کاتێ گەیشتینە دەربەند کەڵەوی[2]، هەمان حیکایەتی ئەوەڵم هاتەوە بیر بە دوورودرێژی بۆ خوا لیێ خۆشبوو بۆ مەلا فتح الله قاضی گێرامەوە زۆری پێ سەیر بوو، ڕۆژێ دوای ئەوە گەیشتین وە بە حضوری حەزرەتی شەرەفدار بووین لە پاش ماوەیە فەرمووی من ئەم دەوڵەتەم تازە دەس نەکەوتوە لە زەمانی زووەوە هەمە ئەمجا ڕووی کردە من فەرمووی میرزا عبدالغفار دوێنێ لە دەربەند چیتان ووت؟ منیش لەبەر سام و هەیبەتی ئەو زاتە لە بیرم چوو عەرزم کرد هیچمان نەووتوە فەرمووی نا، ترسی ناوێت حیکایەتی خەو دیتنی باوکت

---

(١) فارسی‌یەکەی ئەو مەشایخە بوزرگە ئەمەیە:

موسڵمانـان من آن گبرم کە بتخانە بینا کردم | شدم بر بام بتخانە دو عالەم را نیدا کردم

از آن مادر کە من زادم شدم بار دیگر جفتش | از آنم‌گبر میخوانند کە بـا مادر زنا کردم

(٢) دەربەند کەڵەوێ: یانی دەربەند دزلی لە هەورامان.

و تعبیر کردن و لێکدانەوەی، عەرزم کرد بەڵێ ئەوە بوو کە فەرمووت. فەرمووی ئێستەش بیڵێ تا بزانم دووبارە بە دوور و درێژی گێرامەوە لەم گفتوگۆی پێشوو دیسان باسکردنەوە ملا فتح الله بەتەواوی بیروباوەڕی بە حەزرەتی پیر زیادی کرد بەڵکوو بوو بە هۆی عەقیدەی کۆمەڵێکی زۆر بە گەورەیی و پایە بەرزی ئەو زاتە.

**ك ٧٦ بص ٣٢٢:** سیّد محمد عارف کوڕی سیّد علی سەرگەتی کە دایکی کچی شێخ بوو خوا لێ خۆشنوود بێ ووتی: کاتێ حەزرەتی شێخ تەشریفی موبارەکی بۆ حەوش و بەدرانی[1] هێنا بوو، باوکم ووتی عارف لە باخەکەدا درەختێ هەڵوژەی تازە پێگەیشتوومان هەیە بڕۆ هەڵووژەکەی لێ بکەرەوە و بیکە ناو بەرچنەیەکەوە چونکە نۆبەرەیە ببیە بۆ حەزرەتی شێخ ڕۆیم و هەموو هەڵوژەکم چنی وا ڕێکەوتبو ئەو درەختە کەوتبوە قەراخی باخەکە لە باخێکی ترەوە، لقو پۆپی هەڵوژەیەکی پێگەیشتوو هاتبوە باخەکەی ئێمەوە دەستم برد هەندێکیشم لەوە تێ کرد چونکە لەو کاتا کەمتر لە بارەی تصوّف شارەزا بووم بردم بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ، حەزرەتی شێخ داوای زەرفێکی گەورەی کرد کە بۆیان هێنا هەڵوژەکەی کردە ناویەوە کەمێ وەستا سەری هەڵبڕی دەنکە دەنکە ئەوەی کە هەڵووژەی غەیر بوو وە حەڕام بو وجیای کردەوە، وە بە جیا لە لایەکەوە داینا فەرمووی ئەمە ماڵی غەیرە حەرامە ئەمەش ببەنە ماڵەوە کێ لێی ئەخوات با بیخوا ئیتر من لە هەرزەییەکەی خۆم تەریق بوومەوە، وە زۆر شەرمەزار بووم وە سرّی مەعنای فەرموودەی پیرۆزی زانی کە

---

(١) حەوش و بەدرانی: سەرگەت دێیەکە سەر بەخورماڵ لە پارێزگای سلێمانی، کەژێ وا لە پشتی‌یەوە پێی ئەڵێن کەماجار، لەو شاخە بەرزە چووی بەو دیودا ئەگاتە دێیەك پێی ئەڵێن دەرەکێ، حەوش و بەدرانی لە بەردەمی دێی دەرەکێ دایە، دەشتێکی خۆش و ئاوێکی زۆر زۆر سارده هەموو کەس لە هاویندا ماوەیەك دەستی تیا ڕاگرێ ئەوەندە وە میوەی تیادا بنێ شەقی پێ ئەبات، وە زۆر کات حەزرەتی شێخ لە هاویندا چووە بۆ ئەوێ وە لە دەوور و پشتی ئەویشەوە (قەلاّ خانی)یە کە حەزرەتی مەولانا خالید (خوا لێی خۆشنود بێ) بینای لە قەلاّ خانی دروست کردوە

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی إذا جالستم أهلَ الصدقِ فاجلِسوهم بالصّدق فإنّهم جواسيس القلوب يدخلون في قلوبكم وينظرون إلى هممكم یانی هەر کاتێ لەگەڵ ئەهلی صدق و ڕاستاندا دانیشتن بە ڕاستی لەگەڵیانا دانیشن هیچ فێڵ و چەوتی چەوێڵی و نالەباریەکتان لە دڵا نەبێ لەگەڵیانا چونکە ئەهلی صدق ئاگادارن کە چی لە دڵتانا هەیە وە ئەچنە نێو دەرون و دڵی ئێوەوە، وە تەماشای قەصد و نیەتتان ئەکەن، ئەنجا هەر کەس لە ئێوە بە پاکی دڵ و دەروونەوە بە ئەدەب و خولق و خووی شیرینەوە بە نیەتی جوان و حوسنی موعامەلە وە صدقی یەقینەوە لەگەڵیان دانیشت پرتەوی ئەنواری دڵیان ووردە ووردە دڵی ئێوەش ئەباتە ڕیزی دڵ ڕووناکانەوە، وە لەزەتی ئەمەری فەرموودەی حەزرەتی ربّ العالمین کە فەرموویەتی وکونوا مع الصادقین ذایقەی چەشتەی دڵ و دەروون و گەرووی حەیات و گیانی هەتا هەتایە شیرین و پڕ تام مەزە ئەبێ سا خوا بە لوتفی بێ پایانی خۆی بەم وەصفە شیرینە خاوەن بەهرەمان بکات.

**ك ٧٧ بص ٣٢٣:** ئیمامی خانەقای[١] موبارەك **مەلا سلێمان** بۆی گێرامەوە ووتی: هەر چەند کەرامات و خەواریقی حەزرەتی شێخ ئەوەندە زۆرە لە سنوور دەرچووە منیش سێ چوار کەرامەتێ لەوانەی کە دیومە بۆت باس ئەکەم:

یەکەم: ئێمە لە شاری سلێمانی بووین خالید بەگی ئەحمەد بەگ کوڕانی وەلەد بەگی جاف گیران و بران بۆ لای والی کوردستان والیش پڕ بە دڵ لێیان بە داخ و کینە بوو، ئەمان بیست کە خەڵك ئەیان ووت ئەم دوو برا لە دەس والی ڕزگاریان نابێ وە بە حەپسی کاریان تەواو نابێ بە کوشتن نەبێ، خوشکی ئەو دوو برایە بە سەد ئومێد و هیواوە وەك مەشهورە بە دەغیلانەی عەرەبی‌یەوە ئەچێ بۆ حزوری پڕ لە نوری حەزرەتی شێخ وە بەسەریا ئەگری و داوێنی ئەگرێ، شێخ ئەفەرموێ ئێمە

---

(١) ئیمامی خانەقا: یانی خانەقای تەوێڵە.

دەروێش و گۆشەنشین هەقمان بەم جۆرە شتانەوە چییە، چ ئیشێکمان بەم جۆرە بابەتانەوە هەیە؟ دۆعای خێریان بۆ ئەکەین بڵێین چی؟ ئافرەتەکە زۆر ئەلالێتو ئەپاڕێتەوە و گریان و زاریێ زیاد ئەکا، حەزرەتی شێخ ڕەحمی ئەجۆشێ وە بەزەیی بە هاوار و داد و زاری خوشکەکەیانا دێتەوە، کەمەر بەندەکەی[1] خۆی هەڵئەگرێ و ئەیبەستێتەوە پشتی ئەفەرموێ عەهد بێ ئەوا کەمەر بەندم بە نیەتی ڕزگاری براکانت لە پشت بەست شەرت بێ نەیکەمەوە تا براکانت دێنەوە بۆ وولات بە دوای ئەوەدا ماوەیەکی پێچوو چەن جار هەواڵی کوشتنیان ئەهات، خوشکەکەیان رای ئەکرد بۆ خزمەت شێخ، شێخ ئەی فەرموو ئەمانە درۆیە من ئێستا کەمەربەندی خۆم نەکردۆتەوە، لە دواجارا خالید بەگ و ئەحمەد بەگ لە بەندی والی ڕزگاریان بوو هاتنەوە بۆ سلێمانی یەکەم جار بۆ خزمەت شێخ چوون، حەزرەتی شێخ خوشکەکەیانی داواکرد وە فەرمووی تا ئێستا کەمەربەندی خۆمم نەکردۆتەوە بەلام ئیتر ئێستە لە پشتما ئەی کەمەوە ئەوە خۆت و ئەوە براکانت.

دووەم: لەو کەرامەتانەی کە مەلا سلێمان کە بۆی گێرامەوە ئەفەرموێ: ڕۆژێ گەنجێ هاتە خزمەت شێخ عەرزی کرد ماوەیەکە ژنم هێناوە دەور و بەری ٤، ٥ مانگ ئەبێ، ئافرەتەکە هەر کچە و من پیاوەتیم نیە، شێخ فەرمووی دەس لە ئامۆژنەکەت هەڵبگرە تا بتوانی بچیتە لا ژنەکەت، لە لایەکی ترەوە قاپییان لێ داخستوویت، ئەو کوڕە ڕەنگی تێکچوو وای لێ هات وەك ئەوەی بڵێی مردوە، لە پاش سەعاتێ هاتەوە هۆش خۆی عەرزی کرد و چاکی کەواکەی گرت و ئەمان دەخیلی زۆری کرد، یا شێخ تۆبە ئەکەم شێخ فەرمووی خوای تەعالا تەوفیقت بدات، ئەو کوڕە تۆبەی کرد وە ماوەیە لە قاپی شێخا مایەوە.

سێیەم: ڕۆژێ حەزرەتی شێخ لە مزگەوتا دانیشتبوو بە إسحاق ناوی بازرگانی فەرموو تۆ قەرزت لە من ئەوێ ئەمڕۆ من لای تۆ دائەنیشم هەرچەندی خوا

---

(١) کەمەربەند: پشتێنێکی تایبەتە بۆ کاتی پێویست ئەبەسترێ و قایم ئەکرێ وەکو حەج و غەزا.

گەیاندی بۆ تۆ، ئەم دی زائرین و واردین[1]، لەم لاولاوە بە دیاری‌یەوە ئەهاتن و دایان ئەنا، تا یەکێ هات پێنج قرانی[2] دانا ووتی ئەمە دیاری فلان کەسە ناردوویەتە خزمەتت، فەرمووی من ئیمرۆ خۆم لە ڕەهنی قەرزی إسحاقدا داناوە، ئەو پارەیەم بە تەواوی تەسلیم بکە بۆچی بە تەواوی نایدەت، کابرا ووتی یا شێخ هەر ئەوەندەیە لەوە زیاتریان پێ نەداوم، فەرمووی ئەڵێم قەرزارم بە تەواوی بیدە، ووتی هەر ئەوە بوە زیاتر نیە، فەرمووی ئەی ئەوە چی بوو لە فلان کانی کیسەکەت کردەوە قرانێکت لێ دەرهێنا و خستە پارچەیە پەڕۆ کۆنەوە و ناتە کەمەربەندەکەت، کابرا خەجاڵەت و تەریق بوەوە دانی بە کردەوەکەیدانا و قرانەکەی دەرهێنا و تەسلیمی کردەوە فەرمووی چونکە لە ڕەهنی قەرزدا بووم وەوا مقدّر بوو بەو پارەیە ڕزگار ببم بۆیە ئەوەندەی لەسەر ڕۆشتم، فەرمووی ئیسحاق حیسابت بکە، کە حیسابی کرد بە تەواوی قەرزەکەی شێخی پێگەیشتەوە بێ ئەوەی پوولێکی بمێنێ.

چوارەم: کابرایەك بە ناوی سواڵەوە هاتە خزمەت شێخ ووتی یا شێخ ئاگر کەوتە ماڵم خانووم و هەرچیم بوو بە جارێ سووتا شتێکم پێ ببەخشە، فەرمووی ئەگەر نیشانەی ماڵ و مناڵ و دارایت هەرچی هەیە باسی بکەم واز لەم فێڵ و تەڵەکە بازی‌یە ئەهێنی؟ ووتی بەخوا یا شێخ درۆ ناکەم وە ویستی سوێند بخوا، شێخ ڕەنگی گۆڕا و فەرمووی سبحان الله ئەمە ژنەکەت و مناڵەکانت ئەمە گاو مانگاکانت ئەمە مەڕ و ماڵاتت ئەوە دەورات ئەوە قاپ و قاجاخت[3]، بە من ئەڵێن لە فلان کێو لە قەراخی فلان سەرچاوە ئاو کە لەبەر پارچە بەفرێکەوە دێتە خوارە نیشتەجێین وە هەموومان ساخین و هۆی ژیانمان تەواوە ئاتاجی سواڵ نین ئەم پیاوی ئێمە درۆ ئەکات و تۆی پێ تاقی ئەکاتەوە، کابرا ئەندامی هاتە لەرزین و جموجووڵ کردن وە لە

(١) زائرین و واردین: دێنی گەڕان و میوانان.

(٢) قران: دراوێکی ئێرانیە

(٣) قاپ و قاچ: بە کوردی زەرێ کە چێشت و شلەی تیا بخورێ وە خۆی تورکییە.

درۆکەی خۆی زۆر پەشیمان بوەوە وە شەرمەزاری گرتی و بە سەد خەجاڵەتی‌یەوە تۆبەی کرد.

**ك ٧٨ بص ٣٢٥:** برای بەڕێز میرزا محمد صادق کوڕی خوا لێ خۆشبوو میرزا الله وێردی (مستەوفی باشی)[1] بۆی گێڕامەوە ووتی: لە کاتی گەنجیما لە لایەن دیوانی[2] حوکمداری سنەوە کرام بە فەرمانڕەوا بۆ تحصیلات[3] و بەرهەم کۆکردنەوە لە هەورامان، وە ڕەمەزان عەلی بەگ ناوی[4] (مەرەندی – تەورێز)ی تورك بۆ ئەوەی پارەیەکی دیاری کراوی بدەمێ هاوڕێم بوو، کە گەیشتینە ناوچەی هەورامان بەکورتی بڵێن لەهەموو دێیەکدا ناوی پیرۆزی شێخ عوسمان ئەبرا و شتی عەجایەب و گەورەیان لێوە ئەگێڕایەوە، ڕەمەزانی عەلی بەگ ووتی: ئەمانە ئەڵێن چی؟ ووتم ئاوا ئەڵێن ڕەمەزان عەلی ووتی هەر لەبەرئەوەی کە ناوی (عثمان)ە بڕوام پێی نیە، هیچی تیا نیە، خوا وای هێنایە پێشەوە کە نزیك بووینەوە لەمەڵبەندی حەزرەتی شێخ من ووتم دێنی‌یەك لە شێخ بکەین ووتی دێم بەڵام من هیچ باوەڕم پێی نیە ووتم باشە من و تۆ هەر یەك داخوازێ بخەینە دڵمانەوە ئەگەر بە پێی ئەو دڵخوازی‌یە لەگەڵمانا جووڵایەوە چاکە ئەگینا منیش وەك تۆ بڕوام پێی نابێ بە کورتی من دوو چەشن میوەم خستە دڵمەوە، ئەو کابرایەش دوو جۆر خواردەمەنی، لەگەڵ گەیشتینە خزمەتی فەرمووی ڕەمەزان عەلی بەگ دانیشە، هەر لەگەڵ ناوی برد کابرا زۆری لا سەیر بوو سەرسام بوو، لە پاش ماوەیە بێ دەنگی فەرمووی ڕەمەزان عەلی بەگ

---

(١) مستەوفی باشی: یانی باشکاتب.

(٢) دیوان: پایەی سەرۆکایەتی فەرمانڕەوا (مقامی رئاسەتی حوکمدار).

(٣) تحصیلات: بەروبوم.

(٤) ڕەمەزان عەلی: بۆیە وای ووتوە چونکە شیعە بوە، وە شیعە قینیان لە حەزرەتی أبو بکر و عمر و عوسمانە (خوایان لێ ڕازی بێ)، وە خۆی تورك بوە کوردی تێ نەگەیشتوە.

گوێت لێ بێ جارێك حەزرەتی **نوح** علی نبینا وعلیه الصلاة والسلام بە گەڕەکێکا ڕابورد سەگێکی گەڕی دی هەموو ئەندامی بریندار خوێنی لێ ئەتکێ حەزرەتی نوح بۆ ئەوەی لە نوێژ نەچێ و گیانی پیس نەبێ خۆی لێ لادا وە لیباس و پۆشاکی خۆی کۆکردەوە لە ناکا سەگەکە هاتە زمان ووتی ئەی نوح ڕەخنە لە من ئەگری یا لە خالق و بەدی هێنەرەکەم ئەگەر لە منی ئەگری یەکێکی وەك من دروست بکە حەزرەتی نوح علی نبیّنا وعلیه الصلاة والسلام والتحیة بە هۆش خۆی هات و پەندی وەرگرت، وە لەو ڕەخنە و إعترازاتە پەشیمان بووەوە، ڕەمەزان عەلی بەگ تۆش ڕەخنە لە (بەندە)کانی خوای تعالی مەگرە چونکە ئینکار و إعتراض[1] لە أهل الله شوومە و نەگبەتی بە دواوەیە، تۆ وا دابنێ من لەو سەگە گەڕە کەمترم وە تۆ حەزرەتی نوحی، بەڵکو حەزرەتی حق جلّ جلاله منی بە بەندەی خۆی وەرگرتبێ.

بە دوای ئەوا مریدێکی داوا کرد هات سرتانی[2] بە گوێیدا و ڕۆیشت و هاتەوە، ئەو چوار خواردنە کە هەر یەك دوو شتمان لە دڵمانا بڕیار دابوو سێ چەشنی لە دوو قاپا هێنا، وە لەبەر دەممانا دانا، وە فەرمووی هەر چوار داواکاری‌یەکانتانمانم ئامادە کردبوو بەڵام بەر لە ئێوە میوانێ هات ئەو یەکەمان بۆ ئەو میوانە دانا، بەڵام ئیتر ئەم جۆرە تاقی کردنەوانە بەرامبەر بەندەکانی خوا مەخەنە ناو دڵتانەوە، ڕەمەزان عەلی بەگ هەستا و داوێن و چاکی کەواکەی حەزرەتی شێخی ماچکرد، وە زۆری خەجاڵەتی و پەشیمانی دەربڕی، وە لە ڕووی شەرمەزاریەوە گەلێ داوای لێ بوردنی کرد.

**ك ٧٩ بص ٣٢٦:** جەنابی خاوەن عیرفان صاحیب صفا شێخ عبدالله کوازی کە یەکێ لە ئیجازە دراوانی حەزرەتی شێخ بوو بۆ تعلیماتی طریقە لەناو کۆمەڵێ لە

---

(١) إنكار: بێ باوەڕی. إعتراض: ڕەخنە گرتن.

(٢) سرتە: چپە.

مریدان وایان فەرموو بوو، کە ئاخەبیگی باوکم تووشی فتق[1] بوە وە چەن کات و سات بەو ئێش و دەردەوە ئەتلایەوە، لە کاتی زۆر پیریدا بردم بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ، لە پاش ئەوەی تمسّکی کرد و چووە ڕیزی مریدانەوە ماوەیە لەوێ ماینەوە، شەوێکیان نەخۆشی فتقەکەی زۆری بۆ دێنێ تا دەمی نیوە شەو ئاهو ناڵەی بە شێوەیەك ئەبێ دانیشتوی خانەقا بێتاقەت ئەکات، ئەنجا دەست ئەکات بە داوای کۆمەکی و یارمەتی و بانگ ئەکا یا شێخ عوسمان هاوار فریام کەوە الأمان الأمان بگە بە هاوارم، دەسبەجێ ڕیخۆڵەکانی کە لە سکیەوە دەرچووبوون ئەچێتەوە جێی خۆی وە ئەو دەرد و نەخۆشی‌یە بە تەواوی نامێنێ و بە ڕەحەتی و ئاسوودەیی خەوی لێ ئەکەوێ، بۆ بەیانی ئەو شەوە چوومە خزمەت حەزرەتی پیری پایە بەرز بە زەردەوە فەرمووی ئەمشە و داد و هاواری باوکت دڵی پەرێشان کردم داوای ڕزگاری ئەوم لە بارەگای ربّ العزة کرد, خوای تەعالی قبووڵی فەرموو لێی وەرگرتم ئەویان لەو بەلا نەجات دا لە ڕووی تشکّر[2] و سوپاسەوە دەستیم ماچ کرد و چووم بۆ خزمەت باوکە پیرەکەم کە بزانم حاڵی چۆنە؟ لە ڕێدا توشی بووم ئەهات بە دەم ڕێگەوە حمد و ثنای خوای ئەکرد، حاڵیم لێ پرسی ووتی: ڕۆڵە ئەمشە و حازر نەبووی هەتا نیوە شەو لە هاوار و ناڵەدا بووم سکم پێچی ئەدا و ئێشی فتقەکەم زۆری بۆ هێنا بووم بە جۆرێ خەریکبوو بمرم لە دوایی شەودا بە سەد ئومێد و پاڕانەوە و تکاوە هاوارم لە شێخ کرد والأمان الأمانم[3] کرد بە ناکاو ئازار و ئێشم نەما وە فتقم چووەوە جێگەی خۆی وە بە تەواوی ڕزگار بووم، ئێستە ئەڵێی هەرگیز ئەو دەردەم قەت نەبوە دووبارە لەگەڵ باوکم گەڕامەوە بۆ خزمەت شێخ، باوکم زۆر زۆر لە خزمەت شێخا سوپاس و تشکری بەجێ هێنا، ئەوەندە لە خزمەت شێخا بە کەساسی ئەلالایەوە

---

(١) فتق: قۆڕی.

(٢) تشکّر: سوپاسگوزاری

(٣) الأمان الأمان: زاراوەیەکی عەرەبی‌یە بۆ تەنگانە بەکار ئەهێنرێ یانی: فریام کەوە فریام کەوە.

حەزرەتی شێخ فەرمووی ئیتر بەسە حەمد و سەنای خوا بەجێ بێنە وە بە خواناسی و ئیطاعەتی پەروەردگارەوە خەریك بە، شێخ عەبدوڵلای کوڕی ئەڵێ لە پاش ئەوە ئیتر باوکم لە ژیانیا جارێکی تر تووشی ئەو دەردە نەبوەوە.

**ك ٨٠ بص ٣٢٨:** بەڕێزی خۆشەویست جەنابی ملا عبدالقادر پێی ووتم لە کاتی ئیرشادی حەزرەتی مەولانا خالید قدّس سرّه لە کوێستانی قەلاخانی[1] کە جەنابیان خەریکی حەوز و دروست کردنی بینا و رێکو پێك کردنی جێ و ری‌ی هاتوچۆی میوان و دێنی گەڕان بوو، لەو کاتەدا مرید و مەنسوبی مەولانا بە چەشنەها خزمەت و کارگوزاری تێ ئەکۆشان بە بەرد هێنان و قوڕکێشان وەستا داود ناو کە لە تیرەی بادرونە و دانیشتوی شاری هەورامان بوو وەستایی عەمارەتەکەی ئەکرد ئەو کاتە حەزرەتی شێخ عوسمان کە مریدی حەزرەتی إمام الطريقة[2] مولانا خالید بوو مەشهور بوو بە (فەقێ عوسمان) ئەویش زۆر بە چالاکی و شادی و بە دڵ و بە گیان خزمەتی ئەکرد وە تێکۆشانێکی بە صەداقەت[3] و ڕاستی هەبوو، وەستا داودی ناوبراو عەرزی حەزرەتی مولانای کرد ووتی قوربان لەناو ئەم مریدانەدا فقێ عوسمان زۆر بە دڵسۆز و إخلاص[4] ئەبینم صلاحیەتی هەیە پیاوێکی صاڵح و ڕاستە ئەبێ لەناو هاوڕێیانی خۆیدا زیاتر چاوی نظر و لطف و مەرحەمەتت لەگەڵیا هەبێ، وە جێگە خەرجی توجّهاتی جەنابی شەریفت بێ، حەزرەتی مەولانا لە جوابیا ئەفەرموێ (ڕەحمەتی خوای لێ بێ): وەستا داود صاڵحان[5] حەدیان چی‌یە و چەیارایان هەیە بەن

(١) قەلاخانی: بەرزترین شوێنی ژوور حەوش و بەدرانە لە هەورامان کە باسکرا.

(٢) الإمام الطريقة: پێشەوای عیلمی ئەسرا.

(٣) صداقەت: بە ڕاستی.

(٤) إخلاص: دڵسۆزی.

(٥) صاڵحان: پیاو خاسان، صلاحیەت: بەکاراو دەست ڕۆیشتو و بە توانا.

بە فەقێ عوسمانی ئێمە، ئەم فقێ عوسمانی ئێمە بە وەلی‌یەکی کامل و مکمّل ئەبێ، گۆی ئەولیایەتی لە مەیدانی ئەمثال و هاوڕێیانی خۆیدا دەر ئەکا وە خەلایق هەموو موسەخەری[1] ئەو ئەبن (ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ).

**ك ٨١:** خوا لێ خۆشبوو حاجی مەلا محمود فەرمووی: لە سەرەتای سلوکم جارێ عەرزی شێخم کرد ووتم قوربان عینایەت و لطفت بێ توجهێکم لێ بفەرموو فەرموی: لە پاش نوێژی ئێوارێ چاوەڕێ بە دانیشە من لە پاش نوێژی مەغریب چوومە ژوورەکەی خۆم لە بیارەی شەریف بە هیوای ئەو توجهەوە دانیشتم لەناکا هەستم کرد لە پەنجەرەی ڕوو بە قیبلەی حوجرەکەم نورێ ڕەنگا و ڕەنگ وەك تیشکی خۆر کە سەر لە بەیانی لەسەر شاخەکانەوە لە ڕۆژهەلاتەوە هەڵدێ و لە پێش چاو دیارە، ئاوا هاتەنێو ژوورەکەمەوە، وە شەوقێ کەوتە سەر سنگم وە تا یەك سەعات ئەو نورە لەسەر دڵم پەخشان بوو، تا بەرەکەتی زۆر پەرەی لێ سەندم تا یەك حەفتە ئەو تأثیرات و حاڵەتەم لەگەڵ دابوو وە نوێژەکانم بە بێ خەیالات ئەکرد.

**ك ٨٢:** دووبارە هەمان حاجی مەلا محمود پاش ئەوە بە ڕەحمەتی خوا شاد بوو کۆچی لە دنیای فانی کرد، شەوێکی زستان لە پاش شەونوێژ[2] خەتمێکی کورتم بەجێ هێنا، وە بۆ ڕۆحانیەتی پاکی حەزرەتی شێخ ڕۆڵەکان و خولەفا و باقی ئەهلی خانوو دەستە و دایرەی حەزرەتی شێخ بەدیاری ڕەوانە کرد، لەو کاتا یەکە یەکە ناوی خەلیفەکانم ئەبرد وە هەندێ لە مریدانم بە ناوی خۆیان ناو ئەبرد بەلام ناوی مەلا محمودم لە یاد چوو، ئەمجا خەوتمەوە لە خەوما مەلا محمود پەیدا بوو وە بە زەردەخەنەوە ووتی: کوڕە چی بوو ناوی هەمووت ووت وە ناوی منت نەبرد منیش

---

(١) مسخەر: دەستەمۆ

(٢) شەونوێژ: تهجّد.

ماوەیەك خەجاڵەت بووم كە بە ئاگا هاتم بە فاتیحە و قل هو الله أحد وە صلاوەت لەسەر حەزرەت ﷺ ئەوم بە یاد هێنا و بۆم ڕەوانە كرد.

مردنی پیاو چاك قەت دوایی نایێە خەڵك ئەمرن، ئەوان گیانیان ئاگایە[1]

**ك ٨٣ بص ١٨٤:** جەنابی حجة العلماء حاجی ملا أحمدی نۆتشی یەكەم زانای چاخی خۆی ڕەحمەتی خوای لێ بێ فەرمووی: ئاغا محمدی ئەصفەهانی هات بۆ صەفەحاتی هەورامان، وە لەوێ پایە و مەقامی حەزرەتی دەستگیر سراج الدین شێخ عوسمانی بیست، بە خزمەتی مشرّف بو، وە لە تأثیری بەرەكاتی ئەو زاتە داخڵ بە كۆمەڵی مریدان بوو، وە ئەمجا بە تەواوی وازی لە بازرگانی هێنا وە شێوە و ڕێبازی سالیكینی گرتە بەر، وە لە كرداری مریدیدا وەهابوو نەی ئەهێشت كەس بەئالف و ئاودان و خزمەت كردنی وولاخ و باركێشانی ماڵی حەزرەتی شێخ بچێتە پێشەوە، هەر خۆی خزمەتی ئەكردن، وە بە چەشنێ بەهاربەندەكە[2] خۆی ئەی ماڵی و پاكی ئەكردەوە، بە كۆڵی خۆی دووری ئەخستەوە و ئەی ڕشت زۆر زۆر بە جۆرەها ریاضاتی شاقە و ئەزیەت و نارەحەتی خۆی ئەكرد و ئەی كێشا تا (٧) حەوت ساڵ خزمەتێكی لایقانە و سەركەوتووی كرد، لە پاش ئەوە ڕۆژێ چەند كەسێ لە مریدانی تایبەتی لە باخچەی ماڵی حەزرەتی شێخ بە دەورە ئەڵقە ئەدەن و چاوەڕێ ئەبن كە حەزرەتی شێخ تەشریف بهێنێ و توجّهیان لێ بكات، وە ئاغا محمدی ناوبراویش لەو هەڵقەدا كە بە كەماڵی ئیخلاصەوە[3] چاوەڕوان ئەبێ كاتێ كە تەشریف ئەهێنێ یەكە یەكە توجهیان لێ ئەكات پێنج شەش جار ئەچێتە بەردەمی ئاغا محمد و دەسبەجێ هەڵ

---

(١) عەرەبییەكەی: موتُ التّقي حياةٌ لا انقطاع لها قد ماتَ قومٌ وهمْ في الناسِ أحياءُ

(٢) بەهاربەند: تەوێڵەی وولاخ.

(٣) كەماڵی ئیخلاصەوە: ئەو پەڕی ڕاستی و دڵسۆزی ئیش كردن بە بێ هیچ مەبەستێكی دنیایی یا إظهاري خولامی یا ریایی

ئەستێ وە هیچ لەو چەن جارە توجّهی لێ نافەرموێ، کاتێ شێخ ئەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ ماڵ ئاغا محمد دوای ئەکەوێ بە گریانەوە عەرزی ئەکات قوربان بۆچی ئەم خولامەی دەرگای خۆتە بێبەش وە لە فیض و بەرەکاتی[1] علیەی خۆتان بێ بەشتان کردم؟ ئەفەرموێ: من لەگەڵ تۆدا بێ مەیل نیم، بەلام ئەم طریقەی ئێمە ئەچێتەوە سەر حەزرەتی أبو بکری صدیق ﷺ وە هەر فیض و بەرەکەتێ کە بە دەستی ئێمە ئەگات لەوەوە ئەگات هەر جارێ کە ئەهاتمە بەردەمت حەزرەتی صدیق خوا لێی خۆشنوود بێ ئەی فەرموو عوسمان ئەم مریدەی تۆ بوغزی منی هەیە ناچار لە بەردەمت هەڵ ئەستام، لەمەولا سینەی خۆت صاف و پاك بکە شایەد لطف و ترحّمێ دەربارەت بکەن من چی بکەم دەسبەجێ دان بە ڕاستیدا ئەنێ و ئەڵێ بە قوربانت بم ڕاست و دروستت فەرموو ئەم چەند ساڵە لەگەڵ ئەوەدا کە ئیخلاصی تۆم زۆر بوە ئەو دەمارە پیسەم هەر بوە وە سینەم لەکینە خالی نەبووە، سەر لە نوێ تۆبە ئەکات وە ئەبێ بە موسڵمانێکی پاك و ڕاست و صاف و ئەچێتەوە سەر کاری خۆی، وە بە ماوەیە کەم کامیل بوو وە بە ئاوات گەیشت وە هەر لەوێ بە رەحمەتی خوا شاد بوو، وە هەر لەو جێگا و شوێنە مایەوە و نەگەڕایەوە رحمة الله علیه.

لە مەرگا ئەیوت بە خۆشی و فەرەح      من دقّ باب الکریم انفتح[2]

---

(١) فیض و بەرەکات: ڕێژەی نور و رەحمەت و بۆن و بەرامی خۆشی خودایی کە هۆی تەرەقی و بەرزبوونەوەیە.

(٢) السّعید من سعِدَ في بطن أمه : ئەم فەرموودەیە مناسبە بۆ ئەم مەقامە. یانی بەختەوەر ئەوەیە کە لە سکی دایکیا بە بەختەوەر قەڵەمی لێ درابێ.

(مانا): کەسێ لە قاپی ماڵی خاوەن کەرەم و بەخشش بدات دەرگای بۆ ئەکرێتەوە.

ك ٨٤: حەزرەتی سراج الدین لە حاڵی حەیاتیا فەرموو بووی بە شێخ محمد شەریفی هەورامی لە مردنی من خەمگین مەبن، هەر چەن بە ظاهری بمرم بەڵام هەمیشە لەبەر خاتری ئێوە بۆ ئێوە زیندوو ئاگادارم وە بە هەموو صیفەتێ دەستگیرتانم، مؤیدی ئەم فەرموودە صۆفی ئەحمەدی بۆڕی دەری کە پیاوێ صالح بوو وە یەکێ لەم مقبولّ و وەرگیراوانی حەزرەتی شێخ بوو (قدّس سرّه) بۆ منی بەیان کرد ووتی شەوێ لە پاش وەفاتی حەزرەتی پیر (رحمه الله وأرفع مقامه) خوا لێ بەخشێ و مەقامی عالیتر بفەرموێ لە خەوا بە خزمەتی گەیشتم بە زەردەخەنەیەکەوە[1] فەرمووی ئەحمەد لە بۆ مەرگی من خەم مەخۆن من نەمردوم زیندووی ئەبەدیم وە هەموو ڕۆژ و سەعاتێ کردە و رەووشتی مریدان و مەنسووبانم بۆ دێنن، وە منیش بە هەزار ئومێد و هیواوە لە ئیقلیمی نورەوە بە بارەگای ئەقدەسی حەزرەتی ربّی غفوری ئەگەیەنم و تەسلیمی ئەکەم ئیتر مەڵێن عوسمان مرد و رۆی.

ألا إنّ أولیاء الله لا یموتون، ولکن ینقلون من دار إلى دار.

خۆشەویستانی خودا نامرن — لەم ماڵە ئەڕۆن ماڵێ تر ئەگرن
بە دەسەڵات و تەوانا و هێزن — لەولاوە چاکتر خاوەنی فەیزن

ملا حامید ئەفەرموێ: حەزرەتی شێخ عوسمان قدّس سرّه فەرمووی: جارێ یەکێ لە خەڵکی شارەزوور مرد بوو، ڕۆحانیەتی حەزرەتی مەولانا خالید حازر بوو فەرمووی کوڕێکی ئەم پیاوە نەخۆشە لە هیلاکەتایە بنێرە بۆ هێنن توجّهی لێ بکەم با چاك بێ ناردم هێنایان متوجّهی بووم لە سایەی خواوە و هیممەتی پیرم چاك بووەوە[2].

---

(١) زەردەخەنە: تبّسم.

(٢) ئەم لە لایەکەوە کەرامەتە بۆ حەزرەتی مولانا خالید قدّس سرّه لە لایەکی تریشەوە کەرامەتە بۆ حەزرەتی شێخ عوسمان قدّس سرّه.

وەرگێڕانی بۆ کوردی پەڕاوی ــ**بارقات السرور**- لە باسی حەزرەتی سراج الـدین ئەگـەر چی هێشـتا زۆر مـابوو بـەڵام ئەوەنـدەم لـێ هـەڵبژارد وە مشـتێ نموونـەی خەرواریکە.

ئەمەش (١٠) ئامۆژگاری‌یە لە وصایای حەزرەتی شێخ عوسمان بۆ موبارەکی و پیرۆزی و تەواوی بەهرە و سوود و کەڵك ئەیخەینە بەرچاو بە زمانی کوردی وما التوفیق إلا بالله.



لە وەسیەتەکانی حەزرەتی پیر

الحمد لله ربّ العالمين والصلاة والسلام على خير خلقة محمد وآله وصحبه أجمعين.

پێغەمبەری موبارەك صل الله عليه وسلم ئەفەرموێ الدينّ النصيحةُ. فەقیر و محتاجی دەستی کەرەم و لطفی حەزرەتی حق جلّ شأنه عوسمانی خالدی مجدّدی نەقشبەندی خوا لێی خۆشبێ و پایەی بەرزتر بکا و زۆر تر سوود بەخشی ئومەت بێ و کەڵکو سوودی گشتی بێ بۆ نەوە و مریدان و خاس و عام بە چەند ئامۆژگاری‌یەکی دڵسۆزانە ووشیاری ئەفەرموێ تا ئەوانەی بەختیارن بۆیان ببێ بە سەرمایە.

**ئامۆژگاری یەکەم:** بناغە و بنچینەی هەر ڕێگە بە (طەریقەتێ) لەو ڕێگایانەی کە مرید بە خوا ئەگەیەنن لەسەر پەیرەوی کردنی سوننەتی بە نرخی حەزرەتی رسول الله ﷺ وە خۆ پارێزی‌یە لەو شتانەی کە هۆی ناڕەزایی خوا و پێغەمبەرە.

ئەم طەریقەتە پایە بڵند و بەرزە کە نیسبەتی بە ئیمام و پێشەوای هەزاری دووەمەوەیە[1]، وە ئێمە خادیمی ئەم طریقەین وە لە ڕاستیدا نزیکتر و قایم و جوان و شیرینتری ئەم طەریقەتەیە کە لەم سەر تا ئەو سەری هەموو بە تەواوی بریتی‌یە لە

(١) هەزاری دووەم: مەبەست لە ئیمامی ڕەبانی‌یە (سید أحمدی سەرهەندی‌یە).

پەیڕەوی کردنی شەریعەت و هەڵبژادرنی خووڕەوشتە شیرین و جوانەکانی حەزرەتی ئیمامی ڕەببانی مجدّدی ئەلفی ثانی شێخ أحمدی فاڕوقی سەرهەندی کە پێشەوای طریقەیە خوا لێی خۆشبێ ئەفەرموێ: تەریقەت و حەقیقەت خادیمانی شەریعەتن. چونکە مەبەس ئەوەیە کە سالیك بەهۆی سلوکی طریقەوە إخلاصی کامل و إعتقادی صحیح لە بیروباوەڕ و لە ڕەوشت و خوو کرداریان پەیدا بێ چونکە ألا لله الدین الخالص یانی بۆ ئەوەی حقیقەتی شەریعەت کە بریتی‌یە لە خووگرتن بە خووڕەوشتی جوان و شیرین و پاك و تەمیز تا لە موسڵماندا نموونە پەیدا بکات، وە بیروباوەڕی لە شك و دوو دڵی و دانەمەزراوی پاك ببێتەوە وە کرداری لە ریا و روپامانی وە لە عوجب و خۆ بە شت زانین صاف بێ هیچ گەرد و پیسی‌یەکیان نەمێنێ.

ئەمجا کەوابوو پێویستە ئەوانەی کە حەز لەم طریقەتە ئەکەن بەر لە هەموو شت ئەبێ بناغە و بنچینەکانی ئیمان و ئیسلامی خۆیان لەگەڵ مەرجەکانیا بەجێ بهێنن چونکە بە بێ ئیمان و ئیسلام هەر کرداری بکرێت وەرناگیرێت وە دوورە لە کردەوەی ئەهلی وصول کە ئەمیان بەتەواوی بەجێ هێنا ئەمجا بە ذکر و ویرد و ئەفکار و ئادابی طریقەت دەست پێ بکەن و مشغوڵ بن.

چوار نیشان هەیە لە بۆ خواناسان
پەیڕەو لە حوکمی شەرعە یەکێکیان
دووەم هەرچیت بوو لە ماڵی دنیا
نابێ بۆ خۆتبێ هەموو بە تەنیا
سێیەمین بتبێ بۆ پەیمان وەفا
چوارەم ڕازی بە، بە جەور و جەفا

لە أبو عبداللەی خفیفی شیرازیان پرسیار کرد تصوّف چی‌یە؟ خوا لێ خۆشنود بێ لە وەڵاما فەرمووی: هەرچیت لە سەردایە دایبنێ وە هەرچیت لە دەست دایە بیدەی وە هەرچیت بەسەر دابێ نەجووڵێی.

**ئامۆژگاری دووەم:** گەورە گەورانی ئەم خانەدانە خوا پایەیان بەرزتر بفەرمویٚ لە ئادابی طەریقەتدا **رابیطە**یان بەمهم و گرنگترین ڕیٚگە داناوە ئەمەش ڕاست و دروستە وە نهێنی ئەم شاراوەش ئەوەیە لەم طەریقە پیرۆزەدا جەزبە خراوەتە پیٚش سلوك وە بە زۆری ئەم خەلاٚتە گەورەی بۆتە هۆی تصرّف و دەسەلاٚتی شیٚخی خاوەن پایە و مرشیدیٚ کە پیٚشەوابیٚ، وە شیٚخی خاوەن تصرفیش یانی تصرّفی شیٚخیش بەستراوە بەوە کە پەیوەندی و رابط لە میانەی مرید و مرشیدا بیٚ بە هۆی پەیوەندی هەردوو لاوە کە لە هەردوو سەرەوە بیٚ وە خۆشەویستییەکەش تەنها لەبەر خوا بیٚ، بە هۆی خۆشەویستی بۆ خوا و لەبەر خوا وە جیٚبوونەوەی لەدلٚی پیردا دەست ئەدات، بۆ لای بنەڕەتی ڕاستەقینەی جامیعەی ئەو، ئا لەمەوەیە کە ووتویانە: (جذبة من جذبات الرّحمن توازي عملَ الثقلين) یانی: (ڕاکیٚشەیە لە ڕاکیٚشەکانی خوایی هاوتایی ئەکا بە کردەوەی جین و ئادەمی بەلاٚم لەم موعامەلە و کاروبارەدا نهیٚنی و سیرِیٚ هەیە جیٚگەی هەلٚ خلیسکانە، ئەبیٚ سالیکی ڕیٚگەی ئەوەی ئەو ڕیٚگە ئەگریٚ ئەبیٚ ووشیار بیٚ لە خشتە بردنی شەیطان و تمثّلی ئەو لەعینە پاریٚزەراو بیٚ، ئەگەر چی گەورەکانی طەریقەت فەرموویانە شەیطان ناچیٚتە سەر شیٚوەی وەلی کامیل و مکمّل[1].

که مانگی یەك شەوە شیٚوەی لە ئەبرۆی تاقی ئەو ناچیٚ

ئەگەر بشچیٚ شەویٚ وایە شەوانی باقی لەو ناچیٚ[2]

بەلاٚم ئەم خەسلەتە و خاصیەتی نەگۆڕینی بەرزە تەنیا لە شانی ئەو وەلییە تایبەتییە دایە کە لە لای ئەهلی خۆی ئاشکرا و دیارە.

---

(١) کامیل و مکمیل: تەواو و تەواوکەر.

(٢) لە فارسییەکەدا ئەفەرمویٚ:

هیلال مەبأبروی کج دلبر نمی ماند		أگرماند شبی ماند شبی دیگر نمی ماند

ئەگینا ڕێی تێئەچێ بە کەمتر خۆ گۆڕینێ خۆی بباتە سوڕەت و شێوەی، وە ئەو مریدە بێچارە تووشی سەر لێ شێوان و ڕێ لێ گوم بوون بکات، هەروەك ئێمە ئەم معاملە و کاروبارەمان چەند جار باش تاقی کردۆتەوە، کەوابوو ئەبێ مریدی خاوەن رابیطە ووتە و کردەوە و فەرمانی رابیطە ئەگەر چی بە شێوەی کامل و مکملیش بێ بە تەرازووی شەریعەت بکێشێ دروودی خوا لەسەر خاوەنی شەریعەت بێ، ئەگەر پەیڕەوی شەریعەت نەبوو ئەوە لە لەخشتە بردنی شەیطانەوەیە ئەگینا لە دوای چەند جار إمتحان و تاقی کردنەوە جا قبووڵی بکات، بەڵام کامیل و مکمیل لە عصری شرّ العصورا زۆر دەگمەن و نایابە.

پرسیار: ئەگەر کە إدّعای کەمال و تکمیلی کرد مریدی بێچارە چۆن بزانێ لە إدّعای خۆیە درۆی ئەم جیا بکاتەوە، وە یا ئەو مدّعی‌یە چۆن بزانێ لەم إدّعای خۆیە پێکاویەتی یا نەپێکاوە لە داواکەیدا ڕاستە یان بە هەڵەدا چووە؟ وەڵام: پایە و مەرتەبەی کەمال و تکمیلی بوزگەوارانی طەریقەتی مجدّدی‌یە قدّس الله تعالی أرواحهم لە ویلایەتی کوبرا، و کە شوێنی فەنای نەفسە قەراریان داوە، کاتێ بەختەوەر و سەعادەت مەندێ گەیشتە ئەم مەرتەبە ئیتر عەلاقە و پەیوەندی لەگەڵ شەیطاندا ئەپچڕێ، یانی شریتی پەیوەندی‌یان بە یەکەوە بە مقەستی فەنای نەفس ئەبڕدرێ ئەنجا عیلم و فەنای نەفس هەر کەسێ خاوەنی کەشفی صحیح بێ ئاسان و مسیّر ئەبێ، و بە چاوی دڵ ئەیزانێ و ئەی بینێ هەروەك لە لای ئەربابی خۆی ئاشکرایە و دیارە، وە لەسەریان پۆشراو و مەخفی نیە وەلی خاوەن کەشفی ڕاست و دروست لەم زەمانە حوکمی عەنقای پەیدا کردووە، ئەنجا ئەبێ موڕاجەع بە ویجدانی خۆی بکا، چونکە خاوەنی فەنای نەفس دەقا و دەق خوو بە کرداری شەرعیەوە ئەگرێ کە

ئەوەش گەیشتنە بە پایەی حقّ الیقین[1] جا ئەگەر لە خۆیا مەیلی خیلافی شەریعەت نەبینێ علی مصدرها الصلاة والسلام والتحیة وە لە بەجێ هێنانی فەرمانەکانی شەریعەت بێ تەکلیف بوو هیچ نارەحەت نەبینی بەم مانا بە جێ هێنانی کرداری شەرعی لە لا ئاسان و پێچەوانەکەی یانی نەکردنی لە لا زەحمەت بوو وە ئیمان ئیسلام بوو بوو بە جزئی تەبیعەتی ئەو کەسە وە مەعلوم خاوەنی ئەم مەقامە عەجایەبە وە دیسان جیاکردنەوەی ئەم حاڵە موشکیلە کەم کەس ئەم عەقڵی وا تەواویان داوەتێ کە ئەحواڵ و ئەطواری خۆی لێ موشتەبیە نەبێ یانی لە خۆی إشتباە نەکا ربّنا لا تؤاخذنا إن نسینا أو أخطأنا.

ئەگەر حاڵەت لەسەر خۆی مشتبە بێ[2]، چۆن ئیتر لە طالبی بێ چارە مشتبە نابێ، لەم کاتەدا چارە هەر پەنا بردنە بە حەق سوبحانە، وە بێجگە لە بە خوا و پەنا بەو زاتە مقدسە عزّت قدرتە چارەیەکی تر نیە (اللّهمّ أرنا الحقّ حقاً وارزقنا إتباعه, وأرنا الباطلَ باطلاً وارزقنا إجتنابه).

بەڵێ سەعادەت و بەختەوەرێ کەوا بە ضمنیەتی کوبرا مشرّف بوو بێ، کە (ضیمنەتی کبری)یش بریتییە لە ضمنیەتی رەسولی ئەکرەم ﷺ گەر خاوەنی ضیمنەتە کبری کە کەسێکی تر بگرێتە ضیمنی خۆی ئەو کەسە هەرچەند نەش گەییبێتە فەنای نەفس حوکمی خاوەن ضیمنیەتەکەی هەیە، شیطان بە شێوەی ئەویش ناتوانێ خۆی بنوێنێ وە ئەمەش لەبەر ئەوەیە رەوییەی سەعادەت مەندەکە چونکە

---

(١) پایەی یەقین یانی دڵنیایی سێیەم علم الیقین حقّ الیقین وە ضیمنیەت لەعەرەبیدا بە مانای لە ذیمە گیراو، بۆ نموونە تۆ ئەبی بە ضامن و کەفیلی یەکێ وە ئەڵێی فلان لە زیمەی من هەر شتێکی بێ عائیدی منە.

وە هەروەها فەناش دوو جۆرە، فەنای نەفس هەیە فەنای قەلب هەیە، مهم فەنای نەفسە کە ویلایەتی کبری ی لێوە نەشئەت ئەکات بەلام لە فەنای قەلبدا نەفس هەر سەرکێشە و ناچێتە ژێر إیطاعە.

(٢) یانی: خۆی وەصفێ کە بۆ ئەهلی کەمال و تکمیلە بۆ خۆی قراردراوە لە راستیدا وا نەبوو ئەوە (اشتباهە).

مظهری حقیقەتی محمدی‌یە حوکمی خاوەنی ئەو حقیقەتەی هەیە کە حەزرەتی رەسوولی ئەکرەمە ﷺ وە کەسێکیش لە ضیمنی ئەودابێ حوکمی ئەصحابی کیرامی هەیە رضوان الله تعالی علیهم أجمعین.

(ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ). وە ئەم فەقیری محتاجی مسکینی ئەلطافی بەرزی خوالی‌یە بە فەرموودەی وأمّا بنعمة ربّك فحدّث ئەڵێ لە مێژووی ساڵی ١٢٧٢[1]ی هیجری ئەم داماوەی شەرمەزارەیان بەم سەعادەتە عظمی‌یەیان شەرەفدار کردم وە بەم پایە هەرە بەرزەیان گەیاندم کاتێ کە لە میانەی حەزرەتی غوث الثقلین و پێشەوای طەریقە خواجە محمد بهاء الدین نەقشبەندی (خوا لە هەردووکیان خۆش نود بێ) لە بارەی ئەم فقیرە پڕ تقصیرەوە کێشەیەکیان لێ پەیدا بوو کە هەریەك لەم دوو بزورگەوارە منیان بۆ خۆیان را ئەکێشا منی شەرمەندەش لەبەر دەسیانا وەك بێ ڕۆح و گیان خۆم بێ عەلاقە کرد و مەیلم نەئەدا بە هیچ لایەك لەناکا حەزرەتی رسولی ئەکرەم ﷺ تەشریفی هێنا وە بەندەی لەبەر دەست هەردوویاندا دەرهێنا و فەرمووی عوسمان بە هیچ کام لە ئێوە نادەم وە بۆ خۆمم ئەوێ، جامنیش هەروا کوڕانی عەزیز و دوو خۆشەویستی بەڕێزم محمد[2] و عبدالرحمن[3]م لە ضیمنی خۆم گرتوە، ئەنجا ڕێگەی ئیحتیاطم ئەوەیە کەمریدانی ئەم خانەدانە هەرکەس رەفیقی ئەم فەقیرەی کردبێ ڕابیطەی خۆم بکات، ئەگەر نا رابیطەی ئەو دوو کوڕە بەختەوەرانە حوکمی رابیطەی ئەم فەقیرەی هەیە، ئومێدم هەیە کە شەیطان ئابەم صورەتانە نەتوانێ تمثّل بکات فالله خیرٌ حافظاً وهو أرحمُ

(١) ساڵی ١٢٧٢ هجری یانی (١٢٩) ساڵ لەمەوبەر کە ئێستا ١٤٠١ی کۆچی‌یە.

(٢) محمد یانی حەزرەتی شێخ بهاء الدین (قدس سره) کە لەمەو دوا باسی دێ کە تەشریفی مبارەکی لە تەوێڵەی پیرۆزە.

(٣) عبدالرحمن جەنابی خاوەنی فضل (شێخ عبدالرحمن)ە کە تەشریفی موبارەکی لە مەرقەدی گەیلانی لە بەغا مەدفونە.

الراحمين. پرسيار: تۆ له پێشەوه بەيانت كرد كه سوود و كەڵكى رابيطه دەستكەوتن و زياد بوونى محبەته و خۆشەويستى، وه خۆشەويستى موجبى[1] سەعادەتى ضمنيەته، وه ضمنيەت ئەبێته هۆى جەزبه، كەوابوو مريدانى خاوەنى جەزبه ئەم ضمنيەتەيان هەيه؟ وەلآم ئەو ضمنيەته كه له پێشەوه بەيان كرا صورەتى ضمنيەيه كه به حوكمى ئيندراج النهاية في البداية[2] بەتايبەتى هى ئەم خانەدانەيه، بەلآم ئەم ضمنيەته حقيقەتى ضمنيەته وه جياوازى زۆره لە ميانەياندا، لەم جوان تا ئەو جوان جياوازى زۆره.

**ئامۆژگارى سىٚيەم:** لەم خانەدانه زۆر بەرێزه و به نرخه كه (جەزبه پێش سلوك كەوتوه) صورەتى جەزبەى حقيقىيه، چونكه جەزبەى حقيقى جەزبەى ڕۆحىيه كه بۆ كاميلان له دواجارى سلوكا دەس ئەدات، ئەمما صورەتى جەزبه جەزبەىٚ قەلبىيه كه له تێكەڵ بوونى ظولمەت و نوور پەيدا ئەبێ كەوابوو له دەخلى نەفس و شەيطان دوور نيه، لەبەر ئەوه ئەبێ جێگەدارانى ئەم دەروێشه[3]، كه تا إختيار به خۆيان بێ له هاوار و جووڵه و دەنگى بەرز خۆپارێزى بكەن وه مەيلى نەفسى خۆيان لەو جەزبەدا ڕێگه نەدەن، به تايبەت له نوێژا ئەگەر نەختە ئيختيارێكى تێدا بێ نوێژەكەى بەتاڵ ئەبێ، وه ئەگەر به هۆى غەڵەبەى ئەحواڵەوه بێ حوكمى كۆكه و پژمينى هەيه، كه زۆرەكەى نوێژ بەتاڵ ئەكات و له كەمى عەفوه وەكوو له كتێبى شەرعا بەيان كراوه.

حەزرەتى مەولاناى ئێمه (خوا پايه بەرزى بكات) مەجزوبانى له ئەلفاظ و قسەى نا مشروع ووتن به حەتمى قەدەغه ئەفەرموو، چونكه زۆربەى ئەو ڕەوشت و ئەو

---

(١) موجب: پێويست.

(٢) حكم إندراج النهايه فى البدايه: ئەحواڵى ئەولياى گەوره عەكس بێتەوه له دڵى مريدا كه هێشتا نەگەيشتوه به پايه.

(٣) جێگەدارانى ئەم دەروێشه: يانى خولەفاى حەزرەتى شێخى سراج الدين.

خووە لە مەیل و ئارەزووی نەفس و شەیطان پاك نیە، هەروەها خۆ فێرکردن بەو حاڵەتە ئەبێ بە هۆی داخستنی قاپی بەرزبوونەوەی لطیفەی قەلب.

**ئامۆژگاری چوارەم:** چونکە لەم طەریقی گەورە و بەرزەدا ئیندراجی نیهایەتی فی البیدایەت دەس ئەدات وەك حەزرەتی ئیمام و پێشەوای طەریقەت شاهی نەقشبەند حەزرەتی بهاء الدین فەرموویەتی ئێمە نیهایەت لە بیدایەت دەرج ئەکەین لەبەر ئەوە ئەحوالاتێ کە هێنی ئەهلی کەماڵە وە تایبەتی کەسانێکە کە بە دوا پلەی سلوك[1] گەیشتبن لە سەرەتای ئەو کەسانەوە پەیدا ئەبێ کە تازە ئیبتیدایانە وەك شهودی وەحدەت لە کثرەت وە توحیدی وجودی وە کەشف وتن وە کەشفی قەبر و بێجگە لەمانە وە لە ڕاستیدا ئەم حاڵەتانە لە عەکسی دڵی پیرەوەیە یانی لە دڵی مورشیدەوە عەکس ئەبێتەوە بۆ دڵی مرید، و مرید هی خۆی نیە، کە ئەو عەکس بونەوەیە لە موریدا بە هۆی صورەتی ضمنیەتە کە لە ئەثەری ڕابیطەوە حاصڵ بووە ڕوو ئەدا ئەو مریدە ئەمانە لە خۆیەوە نەزانێ وە لە إنعکاساتی پلە و پایەی پیریەوە بناسێ، ئەم حاڵیشە جێگەی هەڵ خلیسکانە کە لە تێکەڵ بوونی وەهم و گومان وە دەخلی نەفس و شەیطان پاك نیە، کەوابوو هەموو دەمێ مستغفر بێ وە دەم و دڵی بە أستغفر الله و داوای لێ خۆشبوونەوە بێ، وە بەم شتانەوە دڵ نەبەستێتەوە وە ئەگەر وا نەبێ قاپی ڕێگەی سەرکەوتنی لێ بەست ئەبێ.

**کەڵك:** کاتێ شەیطان خرایە خوارەوە و لەناوفریشتە و مەلائیکەتان، وە مەقام و پایە بەرزی لێ سەنرایەوە وە کەوتە چاڵی خزی و ریسوایی ووتی: ئەی خوا بە عیززەت و گەورەییت سوێند ئەخۆم من لەمڕۆ جیا نابمەوە تاگیانی لە لاشەی جیا

---

(١) سلوك: عەمەل کردن بە ئادابی طەریقەت. جەزبە: ڕاکێشان، جەزبەی ڕۆحی یانی ڕاکێشانی و سەرخستنی ڕۆح بۆ پایەی بەرزتر لە مەرتەبەی خۆی، نامشروع: بێ شەرعی حەتم.

دەبێتەوە[1]، وە خودای گەورە جلّ جلالە فەرمووی بە عیززەت و جەلال و گەورەیی خۆم ڕێگەی تۆبە ناگرم لە بەندەی خۆم تا ئەکەوێتە غەرغەرەی گیان دەرچوون، گەورە گەورانی طەریقەت فەرموویانە ئەمە یانی ئەم شت بینینە مندالانی طەریقەتی پێ پەروەردە ئەکرێ ئەگینا لە ڕاستیدا مەبەس لە طەریقە ئەوەیە تەنیا خووگرتنە لە نهێنی و ئاشکرادا بە نهێنی و ئاشکاری شەریعەت و بەس، کەوابوو نابێ طالب و داواکاری هەوا و هەوەس بێ، وە ئەبێ کۆشش بکا و هەوڵ بدات کە هەمیشە دڵی ڕووناك بێ بە نووری حضور وە خەیالات و خەتەرەی خۆشەویستی بێجگە لە خوا لە ساحەی سینەیا دوور بخاتەوە تا خۆشەویستی وە هەروەها کینە و بەخشش و هەروەها قەدەغەی هەر لەبەر خوا بێ سبحانه وتعالى (من أحبّ لله وأبغض لله وأعطى لله ومنعَ لله فقد استكمل إيمانه).

**ئامۆژگاری پێنجەم:** سادات و گەورە پیاوانی طەریقە وجودیان بە هاوبەشی پەیداکردنی گەورە داناوە فەرموویانە (وجودك ذنب لا يُقاس به ذنبٌ آخر) کەوابوو داواکاری ڕێگەی ڕاستی ئەبێ هەموو وەختێ هەوڵ بۆ ئەوە بدات کە هیچ کاتێ هیچ فەردێ وە هیچ نەفسێ لە خۆی کەمتر نەزانێ وە هیچ وەختێ خۆی لە هیچ تەنیا یەکێ لە عالەمدا بەزیاتر نەزانێ بەڵکو خۆی بە چاکتر نەزانێ لە مەی خۆران و باقی گوناهکاراندا نەك بەو مانایەی کە شەراب خواردنەوە پەنا ئەگرم بە خوا خراپ نیە بەڵکوو بەو مانایە کە دواڕۆژ نادیارە، چونکە زۆر کات وا ئەبێ مەست و سەرخۆشان وبێ بڕوا و خوانەناسان لەدواڕۆژی ژیانیان وە ئاکامی بەریان دەس بە کاری چاك و داوێنی پەشیمانی و تۆبە ئەپێچن وە بە داوای لێ خۆشبوون و لێ بوردن ئەچنە پێشەوە لە ڕوشتەی چاکان و لیستەی سەعادەت مەندان و کامیاباندا

---

(١) وفي الحديث: لما هبط إبليس عليه ما يستحقّ قال: فبعزتك وعظمتك إنّي لا أفارق إبن آدم حتى يفارق روحه جسدهُ قال الرّب عزّ وجلّ وعزّتي وعظمتي لا أحجب التوبة عن عبدي حتى يغرغر بها. له کتێبی الهادی للمهتدی.

داخلٚ ئەبن، و بالعکس بە پێچەوانەی ئەوەوە رێ ئەکەوێ چەندەها پیاوی باش و خواناس و خاوەن عیبادەت و زوهد و چاکە و باشی ئەکەونە شیو و دۆڵی تێکچوون و زیان و چارە ڕەشی و رێ لێ گومبون و سەر لێ شێوان.

خوایەکی گەورە و زۆر بێ نیازە هەم سەبەب سوتێن هەم سەبب سازە

هەرگیز سالیکی ڕێگە و ڕێگری خواناس و شەونوێژ و عیبادەت و ڕۆژو چاکەکردن و باشی خۆی نەنازێ بەڵکو و ترس و لەرزی لێیان بێ.

تاوان و گوناهی مل کەچی و ترس و خۆ بە کەم زانینت پێ ببەخشێ چاترە لە خواناسین و چاکە کردنێ کە لووت بەرزی خۆ بە زل گرتنت پێ ببەخشێ[1]، نەوەك بە أسفل السافلین و دووری مەحروم و بێ بەشی تووش بێ وە بە دەردی دەرکراوی تا سەری گرفتار بێ پەنای ئەگرین بە خوا لەوە.

**ئامۆژگاری شەشەم:** لە حاڵی حەیاتی خۆمدا بە مەیل و ئیختیاری خۆم بەڵکو بە ئیشاراتی غەیبی و باطنی هەردوو کوڕی پایە بڵند و خەلیفەی سەعادەتمەندی خۆم محمد و عبدالرحمن وەك لە پێشەوە بەیانم کردبوو کە سەعادەتی ضمنیەتی ئەم دەروێشەیان دەسکەوتوە کردمن بە نائیب و خەلیفە و جێداری خۆم وە لەسەر بەرماڵی ئیرشاد جێنشینم کردوون، ئەبێ تەواوی خولەفا و مریدان بەڵکو هەموو پەیوەندی گەران و مەنسووبینی من ئەم دوو کوڕەی بەختیارانی منە وەك یەك نەفسی تەنیا بەنائیب و جێداری خۆشەویستی منیان بزانن، وە لە فەرمان و نەهی ئەوان بە هیچ جۆر لانەدەن وە هەر لە حاڵی حەیاتم و پاش نەمانیشم ئەبێ ڕوشتەی عەلاقە و پەیوەندی‌یان لە گەردنی خۆیان ئاوێزان بکەن، وە چاودێری ئەدەب لێیان بە مایەی بەختەوەری خۆیانی بزانن، نەوەکوو کەسێ لە میانەیاندا بە شێوەی دوو زمانی و

---

(١) فەرمایشتەکە ئەمەیە: معصیة أورثتك ذلاً وإفتقاراً خیر من طاعة أورثتك عزاً وإستکباراً.

فیتنەیی قسەهێنان و قسەبردن سەر هەڵدا کە ئەوە پەنا ئەگرم بە خوا بێ بەهۆی گومڕایی و سەرلێشێوان بۆی، چونکە وە بە بێ فرمان و ڕەزامەندی ئەوان لە لابردن و دانانی جێدار و خەلیفە و ردّ و قبوڵی مریدانی هەڵ نەدەنێ، چونکە ئەمر و نەهی ئەوان لەم جۆرە شتانەدا ئەمر و نەهی منە وە ئیخلاص و محبەت و ئەدەب و حورمەت گرتنی ئەوان عائید بە منە وما على الرّسول إلاّ البلاغ وصلى الله على سيّدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم أجمعين.

**ئامۆژگاری حەوتەم:** حیکمەت و دانایی پڕ سود و گەورەی بە جێ گەیشتووی حەق تەعالا لەناردنی پێغەمبەران على نبيّنا وعليهم الصلاة والسلام ئەمەیە بەندەکانی خوا لەم پەڕ تەدەنوسەوەن[1] وە حەق تەعالا لەو پەڕ تقدّسەوەیە کەوا بەرزەخێکی ذوالجهتين لە بەینا لە کارایە تا لەبەر ئەو بەرزەخە (ذوالجهتين)ەوە فەیضی ئەقدەس لە حەزرەتی مقدّس عزّ إسمه بە بەندەکان عائید بێ، ئەنجا چونکە لە پاش حەزرەتی ڕەسوولی ئەکرەم دەرگای پێغەمبەرایەتی داخرا أولياء الله ئەم ئوممەتە مەرحوومە بە نیابەت و خەلافەتی ئەو سەروەری دنیا و دینە سەدە لەدوای سەدە ئەم فەرمانە گەورە ئەرکی سەر شانیانە وە سەر ئەنجامی ئەم ئەمرە ئەدەن، وە وجودی پڕ فەڕ و مسعودی ئەوان تا ظهوری مەهدی[2] موعود ﷺ دەرگای فەیض بەخشین و

---

(١) تدنس: چلکو چەپەڵی لەم جێگەدا چلکو چەپەڵی مەعنویات مەبەستە، تقدّس: پاکی و خاوێنی نظیفی تەواو، بەرزەخ: بەین، ذوالجهتين: خاوەنی دوو لا وەکو ئەوە دوو شت لە یەك دوور بن وە یەك نەگرن ئەنجا شتێ لە بەینیانا دابنرێ کە لە سەرێکەوە بەم بشوبھێ وە لە سەرەکەی ترەوە بەو مناسب و گونجا و بێ، ئیتر ئەوە ئەبێتە هۆی پێ ڕاگەیشتنی ئەو دوو شتە کە لەیەك دوورن.

سەدە یانی قرن وە مانای زەمان بە زەمان سەدە بە دوای سەدەدا ئەم موهیمەیە ناهێڵن نوشوست بهێنێ لە باتی پێغەمبەران ئەمان ئەو ئیشە ئەکەن.

(٢)ظهور: پەیدابوون. **مەهدی:** یەکێکە لە أولياء الله کە زۆر زۆر گەورەیە لە ئاخر زەمانا پەیدا ئەبێ وە حوکمداری گەورەش ئەبێ وە دەست بەسەر جیهانا ئەگرێ عدل و داد بڵاو ئەکاتەوە، وە ئیسلام سەرئەکەوێتەوە گەش ئەبێتەوە.

وەرگـرتن کراوەیـە وە چـونکە کامـل و مکمـل کـە بـە دوا پلـەی دوا پلـەی بـەرزی گەیشتبێ و دووبارە رجوعی قەهقەری[1] کردبێتەوە تا بە غایەی نزول گـەیشتبێ یـانی گەڕابێتـەوە وە مناسبە و مجانەسـەی لەگـەڵ سـائری بەشـەری تـرا حاصـل کـردبێ بـە وێنەی ئیکسیر نادر و کەمیابە وە دیارە بەبێ مناسـەبە و مجانەسـەی سـوود وەرگـرتن و سوود بەخشین ئاسـان و ئاسـایی نیـە، لەبـەر ئەمـە بـە پێـویستی وەقـت ئـەم فـەقیرە بـە پـەیڕەوکردنی قطـب العـارفين وغـوث السـالكين الكامـل الواصـل إلى الحقيقـة والنـازل السافل إلى الخليقة حەزرەتی قطبی طـریقە مولانای ئێمە خالیدی ئێمە قـدّس الله تعـالی سرّە العزیز ئەو کەسانەی کە لە پاش جەزبە و فەنای ئەتـەم لـەم طـەریقـە وەثیقـەدا بـە حـوکمی ئینـدراج النـهایـة في البدایـة حـوکمـی بەرزەخیـەتیان پەیـدا کـردوە وە مشابهەیەکیان بە واصیلی کامیلی مەرجوعی باقی الله حاصل کردوە هەر چەند تکمیـل نەبوون بەڵام ئەوانمان روخصەت داون و ئیجازەمان داونێ کە طالبانی طریق تـەلقینی

---

إفاضة: رشتن لە لای سەرەوە، إستفاضة: داواکردن بۆ ئەوەی بە سەریا بڕێژن.

کامل: بە پایە گەیشتوو، مکمّل: خەڵك بە پایە گەیێنەر، رجوع: گەڕاوە.

(١) قەهقەری: پاشە و پاش، غایە: نیهایەت، مجانسە: هاوجنسی، مناسبە: پێکەوە یەك کەوتن و لەگـەڵ یەك ڕێکەوتن.

إکسیر: دەرمانێکی تایبەتی‌یە نەختێکی ئەکرێتەوە ناو مس ئەیکا بە ئاڵتون بەڵام زۆر کەمە و دەس ناکەوێ لەبەر ئەوە هەر شتێ زۆر کەم دەس بکەوێ پێ ئەڵێن وەك ئیکسیرە.

مسکین: فەقیر ، هەژار، أولیاء الله لە نوسین و فەرمایشتیان خۆیان بە فقیر ناو ئەبەن وە لێرەدا بۆیـە ئـەو ووشە بەکار ئەهێن چونکە بۆ هەموو شتێ هەر لە خەلقی وجودەوە تـا بچـوکترین شـت کـە پێـی ئاتـاجن لەخواوەی ئەزانن، محتاجن بەمان، محتاجن بە ساخی، محتاجن بە ئیمان، محتاجن بە هەناسەدان، محتاجن بە چاو بە گوێ بە دەم وە هەتا باس بکەی نیعمەتی خوا هـەر تـەواو نـابێ وە هـەمویشی هـەر هی خوایـە، کەسێ بە مانە هەموی إحتیاجی بێ فەقیرە وە خوایش جلّ شأنە ئەفەرموێ (وأنتم الفقراء) ئەو ناوەیان بـۆ خۆیان بە فەخر هەڵگرتوە.

إندراج النهایة في البدایة: یانی ئەحواڵی ئەولیای گەورە عەکس بێتەوە لە دڵی مریـدا کـە ئێشـتا نەگـەیشتوە بە پایە (یاأیها الناس أنتم الفقراء إلى الله والله هو الغني الحميد).

ئادابی طەریقە بکەن چونکە إفادەی ئەوانە لە دەرحەق عەوام لە إفادەی متوسطانێ کە لە عالەمی آفاق الأنفس تێ پەڕیون وە هێشتا بەفەنای حقیقی نەگەییون بە هۆی ئەوە کە مجانەسەتی ئەوان زیاترە بەڵکو لە کامیلانی نەگەڕاوە[1] و واصیلان و فانیانێ کە هێشتا روتبەی تنزّل‌یان دەس نەکەوتوە مفیدترن کەوابوو ئەوانەی ئیجازەیان پێ دراوە لەم دەرەجەدا بەو ئیجازە مەغرور نەبن وە خۆیان بەکامل و مکمّل حیساب نەکەن وە بە گومان بردنی کاملیّەت خۆیان نەخەنە حەپسخانی دووری و وەبالەوە ............

ئیتر:

مەبەستم ئامۆژگاریت بوو کردم جەزای نصیحەت پێویست بوو بردم[2]

**ئامۆژگاری هەشتەم:** نەسیحەتتان ئەکەم و ئەمانەت ئەدەم بە مریدان بە گشتی بە خولەفا و ئیجازە پێ دراوانی خۆم بە تایبەتی کە بەرامبەر یەکتر هەروەك پێویستی‌ی طەریقەتە یەك دڵ و یەك لایی بن، وە زمان بە غەیبەت و زەم و خراپە ووتنی یەکتر پیس نەکەن، وە هیچکام خۆی لە یەکتر بەڕێزتر و چاکتر گومان نەبا، حەزرەتی ئیمامی رەبانی کە مجدّدی ئەلفی ثانی‌یە (قدّس سرّە) ئەفەرموێ: (مەعریفەتی خودای تەعالی لەسەر ئەو کەسە حرامە کە خۆی لە کافری فەرەنگ چاکتر بزانێ) چ جایە لە برایانی دین و طەریقەتی خۆی، وە ئەم دەروێشە کە پاشماوە خۆری إحسانی ئەوانم خۆم لە هەموو تاك تاك و یەکە یەکەی عالەم بە کەمتر ئەزانم، بەڵکو گوناهو خراپە و قصوری جمیعی عیباد نیسبەت ئەدەم لە خۆم، کەوابوو ئەبێ کەسانێ تابیعی من بن و تەبەعیەتی منیان هەیە پەیرەوی من بکەن وە لە زەللە و هەڵەی خەڵك چاو بپۆشن،

---

(١) نەگەڕاوە: بە مقامی فەنای ئەتەم گەیشتون بەڵام نەگەڕاونەتەوە بۆ بەقای ئەتەم کە لەگەڵ مخلوقاتدا علاقە مجانسە بکەن.

(٢) فارسی‌یەکەی ئەمەیە:

مراد مانصیحت بود گفتیم حوالت با خودا کردیم ورفتیم

وه تەنیا سەیری کەموکوڕی خۆی بکات، وه کاروباری بەندەکانی خوا حەواڵەی مەعبودی حەقیقی بکات لەگەڵ ئەوه کە (علاّم الغیوب) ئاگاداره طەعنە و لۆمە و خراپە ووتنی بەندەکانی ئەو جەسارەتەوه بە ئیشی ڕازی نەبوونە.

**ئامۆژگاری نۆیەم:** ئەم مسکینە فەقیرە کە مەرکەزی دائیرەی ضعف و تەقصیرم زۆر زۆر بە دڵنیایی‌یەوه چاوەڕوانم کە هەرگیز بە دۆعای خۆتان و داوای تەندروستی و عافیەت بۆ دنیا و لێ خۆشبوون و عەفوی ئاخیرەت لە بیرتان نەچم وه هیچ کات لە داواو پاڕانەوەی خێر و إحسان لە حضوری خوادا بەو دۆعایانەی کە مأثورن بێ بەشم مەکەن، وه مەڵێن فلاّن کەس پێویستی بە دۆعا و داوای ئێمە نیە.

هەر پیرەژنێکی کە ئەدی رسول ئەیوت دۆعاکە، کە ببم قبوول[1]

هۆشیار بە کاتی بای بێ پەروایی فەرمانی طاعەت نای مێنێ بایی[2]

بێجگە لەوەش من خۆم زۆر لە گوناهکارانی روی زەوی بە خراپتر ئەزانم لە هەموو کەس زیاتر بۆ دۆعای خێر محتاج ترم چونکە لە نامەی ئەعمالی خۆما عەمەلێ کە شایستەی قبوڵی بارەگا بێ شك نابەم کەوابوو زۆر محتاج بە دۆعای خێرم لە دۆعاتان غافڵم مەکەن (دعاء الغائب للغائب مُستجاب).

یانی پاڕانەوه بۆ یەکێ کە خۆی لەوێ نەبێ ئەو نزایە وەرگیراوه.

ئامۆژگاری دەیەم: جەمیعی ئەولاد و خولەفا و مریدان و محبّین و مخلصین ئاگادار ئەکەم کە ئەم وەصیەتانەم بە دڵ وەربگرن وه بەڕاستی و دروستی تەواو ئاوێزانی گوێی هۆشی خۆیانی بکەن مەیخەنە پشت گوێ وه بە مایەی سەعادەت و

---

(١) فارسی‌یەکەی: پیش هر پیرەزن رفتی رسول که دوعا کن تا شود أحمد قبول

(٢) یانی ئەبێ ئاگات لە خۆت بێ بە عیبادەتی زۆر و کردەوەی چاك مەغرور مەبە چونکە لە کاتی بێ باکیدا هەزاران خەرمانی عیبادەت و طاعەت نرخی نامێنێ، بەڵکو (بایی) بوون یەکێکە لە تاوانە خراپەکان، وه شەیتان بە لە خۆ بایی بوون زنجیری نەفرەتی خوای لە گەردن کرا.

بەهرەمەندی هەر دوو دنیای خۆیانی بزانن وە بە هۆی ڕزگاری و خەلاصی حیساب بکەن وصلی الله علی سیّدنا محمد وآله وصحبه عدد ما خلقه الله وسلّم تسلیماً کثیراً آمین.

**ك ٨٥:** (ئەمە تەرجەمەی ریاض المشتاقین مرحومی ملا حامیدی کبیر لە مناقباتی حەزرەتی سراج الدین خستمانە مابەین میانەی بارقات السرور وە ئەم صحیفەی خۆی جیایە).

شاهی عثمان سراج الدینی یەکەم فەرمووی:

حەزرەتی مەولانای ئێمە بەر لەوە ئیجازەی خەلافەتی مطلقم بدات، زۆر لە دووچار بوانی حەوالە ئەکردم کە ئەیان هێنایە خزمەتی:

جارێ ئافرەتێ لە کۆمەڵی ئەعیانەکانی سلێمانی کە مونکیری ئەو زاتە هەڵکەوتوە بوون و بێ بڕوا بوون بەرامبەری، بە شێوەی گاڵتە پێ کردن ژنانی کۆکردبوەوە وە چووبوە بەردەمیان توجّهی لێ کردبوون، ژنەکە شێت بوو تا گەیشتە ڕادەیەك خۆی ڕووت ئەکردەوە ئەچوە سەر سەرەنگوێلك بە چنگ پەیێی ئەکردە عەیبی خۆیەوە، بە ناچاری کەس و کاری هێنابوویان خستبوویانە دەرگای حەزرەتی مەولاناوە قدّس سرّه، ئەم زاتەش فەرمانی پێ کردم کە بە چارەسەری هەڵسم کە نەزەرم لە وەزعی کرد، کۆمەڵێ جنّی حاڵیان پەرێشان کردبوو گرتمن و لەسەربانی خانەقا حەپسم کردن و پرسیم هۆی چی‌یە ئەم ژنە وا لێ ئەکەن ووتیان ئێمە بە ئەمری شاهی نەقشبەند (قدّس الله سره العزیز) ئەم ژنەمان وا لێ کردوە لێمان بگەڕێ با دەمار لە ڕۆزگاری بێنینە دەر وە بە هیلاکیا ببەین، کاتێ ئەمەم بە حەزرەتی مەولانا گەیاند فەرموی هەرچیانی فەرموە دروست و صحیحە بەڵام چونکە لەبەر خاتری ئێمە ئەم کارەساتەیان بەسەر ئەو ژنەیا هێناوە ئەزیەتیان مەکە بەڵام تۆبەیان پێ بکە جارێ تر نەچنەوە سەر ئەو کارە، ئەبێ ئێمە لە تۆڵەی خراپە چاکە وە لە تۆڵە و سزای نا ئەهلی لێ بوردن و خۆشبوون و نەرمی بەکار بهێنن، ئەمجار تۆبەم پێ کردن وە

ژنەکەش چووەوە سەر حاڵی صحەت و تەندروستی و سروشتی خۆی، وە خۆی و کەسوکارەکەی پەیوەندی ئەدەبیان فەراهەم هێنا الحمد لله.

فیدای بازووی هیممەت بم کە ڕیشەی دژ لە بن دێنێ
لە کاتێکیش پەنا بێنێ کەماڵی لوطفی ئەنوێنێ

یەکێ لە پاشا زادەکان کەمەکێ ئیخلاصی هەبوو، بە دەردی گران دووچار بوو کەسوکاری هاتنە خزمەتی حەزرەتی مەولانا ئەمری فەرموو بە من کە بچم و متوجّهی حاڵی ببم بەڵام فەرمووی کە ئەچی باش تێ فیکرە ئەگەر قەزای موبڕەم بوو[1]، دەسکاری مەکە وە گیانی خۆت بە فیڕۆ مەدە ئەگەر بینیت کاتێ توجّهی لێ ئەکەیت ئەو نەخۆشی‌یە هەڵمەتت بۆ دێنێ وە ئەیەوێ شیشەی وجودت بە بەردی نابوتی بشکێنێ ئیتر لێی بگەڕێ وە هەستە وەرە دەرێ کاتێ کە چووم و گەیشتمە حەوشی خانوەکە دیم نەخۆشی‌یەکە لە شێوەی پیاوێکی ناشیرین لەسەر کابرا هەستا چوە سووچێکەوە وەستا وە کابرای نەخۆشیش هەستاو دەستی بە قسە کردن کرد، کاتێ ویستم توجّهی لێ بکەم دیم ڕووبەڕووم بزوا بە هەیبەت و سامێکەوە ویستی بەسەرما بکەوێ دەرکەوت کە قەزای موبڕەمە، وە چنگی ئەجەل لە گیانی ئەوا مەحکەمە ناچار هەستام و لەو جێگە هاتمە دەرەوە، گەیشتمە حەوشەکە دیتم نەخۆشی‌یەکە چووەوە سەر نەخۆشەکە پاش ماوەیەك هەواڵ گەیشت کە کۆچی دنیای فانی کرد وە گیانی بە خوای باقی سپارد.

---

(١) قەزای موبڕەم: یانی لە لایەن خوای تبارك و تعالاوە بڕیاری قەتعی درابێ کە ئەمە چارەسەر نابێ.
قەزای معلّق: مانای کارەساتێ کە بونی بە شتێکی دیاریەوە بە سرابێ ئەگەر ئەو شتە هاتە جێ لەو بەلا ڕزگار ئەبێ، ئەگەر نەهاتە جێ ڕزگار نابێ، بۆ نموونە: وەك ئەم نەخۆشە لەم ڕۆژدا فریای عەمەلیات کرا ڕزگار ئەبێ فریا نەکەوت ئەمرێ، یا ئەگەر ئەمڕۆ فلان بچێ بۆ بەغدا لە سەیارە وەرئەگەڕێ نەڕوا سەلامەت ئەبێ.

نوسەری ئەم کتێبە (ملا حامید) ئەفەرموێ:

یەکێ لە نەوەی پاشاکان نەخۆش کەوت پزیشکی‌یان هێنایە سەری، ئەو پزیشکە موخلیس و خۆشەویستی حەزرەتی شێخی سراج الدینی هەبوو بە دزیەوە پرسیاری لێ کردبوو ئەگەر ئەو نەخۆشە چارەسەر ئەکرێ نەخۆشیەکەی با زەحمەتی لەگەڵدا بکێشم وە گەر نە با خۆم بە بەهانەیە ڕزگار بکەم فەرمووی چاری نیە هەرچی لەگەڵ بکەی بەبێ هوودە ئەڕوا ناچار خۆی ڕزگار کرد، حەکیمی تریان هێنایە سەری چاری بۆ نەکرا کۆچی دوایی کرد.

وە فەرمووی: دوو لەوح هەن لەوحی ژیان (حیاة) وە لەوحی (مردن) (ممات) هەرکەس بەوانە بزانێ و دەرکی ئەوانە بکات ئەگەر ئەو کەسەی لە لەوحی حەیاتا دی ئەزانێ نامرێ، وە ماوەی نەخۆشی‌یەکەشی بە نیشانە تیا دیاری کراوە، وە ئەگەر لە لەوحی مەمەتا بینی ئیتر ئەوە چارەسەر ناکرێ، ئەمجا منیش عەرزم کرد ئەو لەوحانە لە چ جێگەیەکن فەرمووی (لە لا مەکان کە فوق العرش)ە عەرزیم کرد ئەی لوح المحفوظ[1]، لە کووێیە؟ فەرمووی لە کەناری عەرشە.

وە دیسان فەرموی: نیشانەی گوناح لە ئینسانا دیارە هەر گوناهێ نیشانەیەکی سەربەخۆی هەیە، فەرمووی من کەسێکم دی لە ژیانی خۆیدا یەك جار شەرابی خواردبوو وەك جێگە برینێ لەو کەسەدا ئاشکرا بوو.

(١) **لوح المحفوظ** چی‌یە: ژمارەی لەوحەکان (٣٦٠) لەوحە ئەمانە گۆڕان بەسەریانا دێ بە گوێرەی قەزا و قەدەری معلّق، بەلاّم لوح المحفوظ بۆیە پێی ئەووترێ لەوحی پارێزراو چونکە گۆڕان بەسەریا نایەت، بڕیاری دوایی لەوانا چۆن بێ لەدوایدا لەمدا وەهایە وە تەنیا یەك لەوحە، وە شوێنەکەی کەناری (عەرشی خوایە).

**ك ٨٦ رياض المشتاقين ٢١٦:** دوباره حەزرەتی شێخی سراج الدين فەرمووی[1]:

کاتێ کە حەزرەتی مەولانا لە بەغا بوو سەرگەرمی ئیش و کاری موریدان و موستەرشیدان بوو، وە منیش لە تەوێڵە لە جێگەیەکی چۆڵی دوور لە بێگانە خەریکی کاروباری باطنی بووم، خۆم لە خۆم فارغ کردبوو[2]، موراقەبەی وجودی موطلەقم ئەکرد کۆمەڵێکم ئەبینی کە بە مەلائیکەم ئەزانی ئەهاتنە ئەو ناوە خەریك ئەبوون بە نوێژ و قورئان خۆندن، بەلآم لەبەر ئەوە سەرگەرمی ئیشی خۆم بووم وە إستغراقی تەواوم لە حەزرەتی محبوبی حقيقيدا[3] بوو ئەوانە كأن لم يكن شيئاً مذكوراً وابوو لە نەزەرما، لەم کاتەدا ڕۆحیانەتی حەزرەتی مەولانا تەشریفی هێنا وە فەرمووی: ئەوانەی کە چاوت لێیانە و دێن بۆ لات کێن؟ ووتم قوربان گیان چیت عەرز کەم لەوە ئەچێ فریشتە بن، دێن نوێژ و عیبادەت ئەکەن و قورئان ئەخوێنن لە ڕووی لۆمە و سەرزنشتەوە فەرمووی ئەی کەودەن چۆن نازانی ئەوانە شیاطینن ئەوانە دوژمنی ئەهلی میللەت و دینن، عەرزم کرد قوربان نوێژ ئەکەن فەرمووی: ئەی لە خۆمانا نیە قورئان ئەخوێنێ و نوێژ ئەکا ئەگەر بێ دەسەلآتێکی چنگ بکەوێ پێستی سەری ئەگرێتەوە وە لەسەر ناوچاو رای ئەکێشێ.

تۆ سبەینێ بڕۆرەوە ئەو جێگە و خەریکی ئیشی خۆت ببە ئەو سەگانە دێنەوە، دەرگای منافقی ئەکەنەوە تۆ ئیستمداد لە پیران بکە وە مشغوڵی ذیکر ببە ڕووی نەفی دڵ لەوان بکە دیارە ئەگەر مەلائیکە بن لە جێی خۆیان ثابت ئەبن ناجۆڵێن وە ئەگەر شیاطین بن بزانە چۆن دەماریان لە ڕۆژگار دەرئەهێنێ بۆ سبەی چوومەوە وە بە هەمان کار خەریك بومەوە، ئەوانیش لەسەر شێوەی پێشووی خۆیان هاتنەوە دەستیان بە نوێژ و قورئان خۆندن کرد، إستمدادم لە ڕۆحی مەولانا و هەموو

---

(١) ئەم کەرامەتە لە رياض المشتاقين بەيان کراوە، ژمارەکان ژمارەی صفحەی رياض المشتاقينە.

(٢) خۆم لە خۆم فارغ کردبوو: ئاگام لە خۆم بڕی بوو.

(٣) محبوبی حقيقی: یانی زاتی أقدسی إلهی جلّ شأنە.

مەشـایخەکان کـرد و تـوجّهم بـۆ لەناچـوونیان کـرد دەسـبەجێ وەك ئـاگر لـە پـوش و پەلاش بەربێ ڕوویان کردە ڕاکردن و وون بوون، هەلاتن ئیتر نەم دینەوە.

جەنابی علاّمەی زەمان حاجی ملا أحمدی نۆدشە فەرمووی: تـازە تەمەسـوکم بـە حەزرەتی سراج الدین شێخ عوسمان کردبوو، بەلاّم بە تەواوی دڵ دامەزراو نـەبووم، وە خەیالّم کرد کە ئەبێ ئەم زاتە تصرّف و مەقامی تاج حەدیّ بێ وە چۆن بێ؟؟؟

شەوێ لە خەوا دیم زاتێ لە روضەی مطهرة درودی خوا لەسەر حەزرەتی رسـول الله بێ، لە میانەی قەبری رسول الله و حەزرەتی أبو بكر صدّيقدا خەوتوە، کـاتێ ئـەو شتەی بە خۆیا دابوو لە ڕووی خۆی لایدا تەماشام کرد حەزرەتی شێخ عوسمـان بـوو هەستا و فەرمووی با توجهێکت لێ بکـەم وە ئیکسـیری ئەبـەدی[1] لەمسـی وجـودت بدەم چـاوم نـا بەیـەکا وە چاوەڕوانی لـوطف بـووم لـە ناکـاو نظرێکـی فـەرموو وەك مریشکی سەربڕوام لێ هات دەستم بـە هـاوار وگریـان و زاریِ کـرد تـا ماوەیـە زۆر، کاتێ بە هۆش هاتمەوە دیم ماڵ ومناڵ هەموو لێم کۆبوونەوە چرایان هەڵ کردوە زۆر و نارەحەت بوون وایان زانی من تێکچووم.

**ك ٨٧ ریـاض المشـتاقین ٤٢٤:** سـیّد هیدایـەت[2]، فـەرمووی یەکـەم جـار کـە لەسەر ئەمر و فەرموودەی حـەزرەتی **پـیر** ئەچـووم بـۆ تـاران حـەزرەتی پـیر بـە ڕێگـەی ڕۆحانیەت ظهوری فەرموو، فەرمووی تا خۆر گەرم نەبێ مەجووڵێ چونکە چەتەو ڕێگر لەسەر ڕێ بۆت دانیشتوون لە بەیانیدا هەر چـەن هاوڕێکـانم وتیـان دەرەنگە با بڕۆین کاتێ خۆر گەرم بوو گەیشتین بە مەڵبەندیان زانیمان دانیشتبوون وە بۆ ماوەیەك تر لە دوور بەدیمان کرد بەلاّم ئاوێ گەورە لە بەیندا بوو ئاوەکە نەی هێشـت دەسـتیان پێمان بگات.

---

(١) إکسیری ئەبەدی یانی: سعادەتی هەتا هەتایی.

(٢) ئەم زاتە موحتەرەمە: لە ماڵی خۆیدا بە خەنجەر ناحەزی ئیسلام شەهیدی کرد. رحمەتی خوای لێ بێ.

**ك ٨٨ رياض المشتاقين ٢٤٢:** دیسان سیّد هیدایەت ئەفەرمویّ:

جاری دووەم کە چووم بۆ تاران لەسەر فەرمانی پاشا میوانی أمیر الدیوان بووم، کاتیّ بۆیان دەرکەوتبوو کە من سنّی مذهبم أمیر الدیوان لەگەلّ دەستەیە لە ئەعیان و گەورە گەوران بڕیاریان دابوو کە لە ڕووی تاقی کردنەوەوە چەن شتێکی ناڕاست بەناوی ڕاستی‌یەوە لەبەندە بپرسن تا ڕیسوا و شەرمەزارم بکەن، شەویّ دیم کۆمەڵیّ هاتن و بە ئەدەب لە لام دانیشتن.

أمیر الدیوان ووتی سەروەرا من ژنم هەیە منالّمان نیە لە ڕووی لوتفەوە دۆعایەکمان بۆ بنووسە خوا منالّمان پیّ ببەخشیّ، وە هیممەت بکە کە خوای تەعالی کوڕمان بداتیّ.

منیش چونکە کردبووم بە عادەت پێش وەلاّمی هەموو پرسیاریّ تا متوجّە نەبوو بم لە ڕۆحیانیەتی پیر و مستمد نەبوو بم وەلاّمی کەسم نە ئەدایەوە، دەسبەجیّ متوجّە بووم، ڕۆحیانەتی حەزرەتی شێخ پەیدابوو فەرموی:

بلّیّ تۆ درۆ ئەکەی وە ئەتەویّ تەجرەبە و إمتحانی دەروێشان بکەی ژنەکەت ئێستا دوو کچی هەیە، وە ئێستە سکی هەیە نزیکە منالّی ببیّ، پێنج ڕۆژی تر ئەزیّ وە کوڕێکی ئەبیّ و نیشانەیەکیش وا بە پشتی گویّیەوە.

أمیر الدیوان: کە ئەمەی بیست لالّە و دەخیل و دامان گیری‌یەکی زۆری کرد وە داوای بەخشین و لیّ بوردنی کرد، ئەمجا پاش پێنج ڕۆژەکە ئەوەی پیر فەرمووبووی بە راس گەڕا، وە ئەم ڕووداوە بوو بە هۆی عقیدە و باوەڕ و ئیخلاصی أمیر الدّیوان و زۆر لە ئومەرا و ئەعیان.

**ك ٨٩ رياض المشتاقين ٢٤٢:** جارێکی تر سیّد هیدایەت[١]، فەرمووی:

متسوفي المماليك هات بۆ لام داوای دۆعای منالّی کرد بۆی بنووسم کاتێ دەستم دایە قەلّەم بۆی بنووسم و متوجهی ڕۆحی حەزرەتی پیر بووم ظهوری فەرموو نیشانەی تووڕەیی لە ناوچاوانیا دیار بوو، پلّتوکێکی[٢] دا لە قەلّەمەکە لە دەستم کەوتە خوارەوە فەرموی چی ئەکەی؟ ئەو ژنەکەی نەزۆکە هەرگیز منالّی نابێ، واز لەم ژنە بێنێ فلان ئافرەت بەو نیشانە مارە بکات، لەوە منالّی ئەبێ، ئەمجا ئەو شەخسە کە پێم ووت، بە پێی ئەم فەرمودەیە ڕەفتاری کرد و جوولایەوە، وە لەو ژنە بوو بە خاوەنی منالّ.

**ك ٩٠ رياض المشتاقين ٣٤٧:** شێخ محمدی کورد کە یەکێ بوو لە مەقبوولان و مەئزونانی حەزرەتی پیر گێڕایەوە فەرموی:

زەویەکم هەبوو هەموو سالێ ئەمان کێلا و ئەمان چاند بەرهەم بهێنێ بەرهەمی نەئەهێنا خەلّکی پێیان ووتم دەست لەم زەمینە هەلّ بگرە ئاشکرایە هیچ کشتوکالّی تیا ناکرێت، کتو پڕ ڕۆحانیەتی پیر ظهوری فەرموو، فەرموی ئەو دوو بەردە لەناو زەوی‌یەکەتا لاببە و دووری بخەرەوە چونکە لە شوومی ئەو دوو بەردەوە کشتوکالّی تیا ناکرێت.

عەرزیم کرد هۆی چی‌یە؟ فەرمووی پیاو و ژنێکی نامەحرەم هەرکات مەیلی ناشەرعیان کردبێ، ژنەکە بە بەینی ئەم دوو بەردەدا ڕۆیشتوە ئیشارە بووە بۆ ئەوە، وەرە کاتی ئەوەیە یەك بگرن.

---

(١) سیّد هیدایەت: ئیجازە دراو و مەئذونی حەزرەتی پیر بوە وە یەکێ بوە لە وەزیر زادەکانی کوردستانی ئێران لە ناوچەی سنە پیاوێکی ماقولّ و بەناوبانگ بوە.

(٢) پلّتوك: پەلە پیتکە، یانی پەنجەیەکی تێ سرەواند.

من ئەم مەبەستەم بە برادەرانی خۆم گەیاند، کە هۆی بێ بەرهەمی ئەو زەوییە ئەو کارە ناڕەوایە یە کە لەوێدا پەیمان وەرگیراوە ئەوانیش ووتیان ئەم دوو بەردە چۆن لا ئەچێ؟ هەر بەردی بە ۲۰ بیست کەس لە جێی خۆی ناجوولێ، ووتم فەرمودەی پیر بێ حیکمەت نیە دوو سێ کەس بووین دەستمان دایە بە ئاسانی دوورمان خستنەوە، پاش ئەوە بەرهەمێکی باشی ئەهێنا.

**ك ٩١ رياض المشتاقين ٣٤٧:** وە هەروەها شێخ محمدە گردە ئەفەرموێ: هەموو کاتێ ئەچووم بۆ دێی هرشل، ئامۆژگاری و نەسیحەتم ئەکردن هیچ کەس تمسك و بەیعەتی نە ئەکرد، شەوێ حەزرەتی پیر ظهوری کرد فەرموی: شەو چوومەتە خەوی پیاوێکی هەرشلی پێم ووتوە سبەینێ بڕۆ بۆ فلان جێگە پیاوێك بەونیشانە ئەبینی لەسەر دەسیا تۆبە بکە ئەنجا تۆش بڕۆ بۆ ئەو جێیە، یەکەمجار کە دیت ناونیشانی ئەوەیە ریشی نیوەی سپی و نیوەی ڕەشە تەلقینی تەریقەی بکە، بۆ بەیانی لەسەر فەرمایشتی حەزرەتی پیر ڕۆیشتم وە پیاوی دیاری کراوم دی دەستی ماچکردم ووتم من حەزرەتی شێخ بۆ لای تۆی ناردووم، ئەویش ووتی منیش حەزرەتی شێخ بۆ لای تۆی ناردووم تەلقینم کرد و بەیعەتی وەرگرت لە پاشا مجذوب بوو.

**ك٩٢ رياض المشتاقين ٢٤٩:** جەنابی مەلا حامید ئەفەرموێ: حەزرەتی پیر فەرمووی جارێ یەکێ لە ئەهلی (شارەزوور) مردبوو ڕۆحانیەتی حەزرەتی مەولانا حازر بوو فەرموی: کوڕێکی ئەم پیاوە نەخۆشە لە هیلاکەتایە بنێرە بی هێنن توجّهی لێ بکە با چاك بێ، ناردم هێنایان لەسەر فەرموودە و فرمانی حەزرەتی پیرم حەزرەتی مەولانا خالید، متوجّهی بووم خوا شفای بۆنارد چاك بوو لە سایەی خوا و هیممەتی دۆستانەوە قدّس الله تعالی أرواحهم.

**ك٩٣ رياض المشتاقين ٢٤٩:** حاجی رسول گێڕایەوە فەرمووی: حەزرەتی پیر نامەیەکی نووسی بۆ یەکێ لە زۆردار و زاڵمەکان چونکە زۆرداری بەرامبەر بە یەکێ لە خەلیفەکانی کردبوو کە زۆردار نەبێ و زۆرداری نەکا، منیش نوسراوەکەم لەگەڵ ئەو خەلیفەدا برد بۆ لای زاڵمەکە، کابرای زۆردار کاتێ کاغزەکەی خۆندەوە تووڕە بوو دەستی کرد بە جنێودان بەو خەلیفەیە پاش دوو ڕۆژ خۆی و کوڕی و برای و براژنی نەخۆش کەوتن بە پەلە پەل ناردیان بە شوێنما وە زۆر هاوار و دادیان کرد، ئەو ڕۆژە برا و براژنەکەی مردن، خۆیش و کوڕەکەشی زۆر زۆر هاوار و دادیان کرد ووتم ئیشێ خراپت کرد ئەگەر ئەم هەموو هاوار و پاڕانەوەت نەبوایە خۆشتان ئەمردن وەك ئەوان.

**ك ٩٤ رياض المشتاقين ٢٤٩**

دوبارە حاجی رسول ئەفەرموێ: کاتێ شیاطین زۆریان بۆ هێنام ڕۆحانیەتی پیر حازر بوو فەرمووی: آية الكرسي بخوێنە دیم قەلایەکی ٤ چوار پایەیی بە دەورم دابیناکرا وە لەسەر هەر پایەیە لەو چوار پایە ١٠٠ سەد نەفەر چەکداری لەسەر دانرا وە فەرمووی بلێ ألله هەر کات ئەم ووت (الله) ئەو چەکدارانە شەیطانەکانیان ئەدایە بەر تفەنگ تا هەموو پەرتەوازە بوون.

**ك ٩٥ :** حاجی رسول[1]، فەرمووی یەکێ لە مەنسوبانی حەزرەتی شێخ بۆی گێڕامەوە فەرمووی: خۆم بە تەنیا لە سەفەر بووم وولاخم بە بارەوە کەوتبوە قوڕ، هیچکەس نەبوو یاریەم بدات بارم لەگەڵا باربکات کاتەکە شەو بوو، چارەم نەما هاوارم لە شێخ کرد، ناکا پیاوێ هات لە تەکیا بار کردم و ئیتر دیار نەما کاتێ

---

(١) جارێ دوکتۆرێ ئیجازە نامەیەکی پێ بو بردیە لای قاضی شێخ محمدی خاڵ ووتی ئەمە ئیجازەی خەلافەتی باپیری منە کە ناوی (حاجی رسول) بوە، وە حەزرەتی شێخ عوسمانی تەوێڵە بۆی نوسیوە کردویەتی بە خەلیفە، زۆر گومانم بۆی ئەچێ ئەو حاجی رەسوڵە ئەوە بێ. وەرگێڕ.

گەیشتمە خزمەت شێخ فەرمووی ئەو پیاوە کێ بوو کۆمەکی پێ کردی؟ عەرزم کرد نازانم فەرموی من بووم چونکە رەفیقت نەبوو بۆ کۆمەکیت هاتم.

**ك ٩٦:** شێخ سعید بۆی گێرامەوە فەرمووی:

سەرچاوەیەکمان بوو ووشك بو بوو، ئیستمدادم کرد سەرچاوەکە بژیەتەوە رۆحانیەتی پیر ظهوری فەرمو، فەرمووی: بەیانی لەسەر سەرچاوەکە بە نیەتی ژیانەوە دوو سێ جار پێ بدە بە ئەرزا ئاوەکەی پەیدا ئەبێتەوە و سەرچاوەکە ئەژیەتەوە لە پاش دوو سێ رۆژ ووشك ئەکات دیسان ئاوی تێ دێتەوە ئیتر ووشك ناکات.

**ك ٩٧:** دووبارە جەنابی شێخ سعید گێرایەوە فەرمووی:

لە دێیەکی ترەوە پیاوێ هات کە دۆعای بۆ نەخۆشێکیان بۆ بنووسم بۆ چاك بوونەوە و شیفای، یەکێکم نارد قەڵەم و مەرەکەبم بۆ بێنێ کە لە دوعاکەی بۆ بنوسم حەزرەتی شێخ بە رۆح حازر بوو فەرمووی: دۆعای بۆ مەنووسە ئەو نەخۆشە ئەمرێ دۆعاکەم بۆ نەنووسی کاتێ پیاوەکە گەڕابووە نەخۆشەکەی بە مردووی دیبوو.

**ك ٩٨:** جارێکی تریش لە پیاوە گەورەکانی دنیایی ناردی بە دواما کە خێزانەکەی نەخۆش بوو، بۆ ئەوەی دۆعای بەسەرا بخوێنم کاتێ هاتمە دەرێ ویستم بچم سەیر ئەکەم هەموو گیانم ئەلەرزێ کە مشغوڵ بووم حەزرەتی پیر حازر بوو فەرمووی مەڕۆ ئیتر گەڕامەوە، ئەو شەوە ئەمری خوای بە جێ هێنا.

**ك ٩٩:** فەقێ حوسەینی پێنجوێنی مریدی حەزرەتی مەولانا بوو ووتی: ساڵێ چووم بۆ بەغا بۆ زیارەتی پیرم کە حەزرەتی مەولانایە کە تەشریفیان لەوێ بوون شێخ محمدی فیراقی لەسەر ئەوەی کە تەرکی نوێژێکی جومعەی کردبوو بۆ تەمیەی ئەمری

فەرموو بوو کەس قسەی لەگەڵا نەکەن، وە ڕەفاقەتی نەکەن، تا جاریْ جەنابی شێخ بە بەر حوجرەیەکا ئەڕوا و ئەم دێڕە هەڵبەستە ئەخوێنێتەوە:

بیستوومە زنجیر ئەکەی سەگانت

ئەی بۆ پەت ناکەی ملی عوسمانت[1].

لە پڕ شێخ محمدی فیراقی هاتە دەرەوە و دەس و دامێنی حەزرەتی شێخ بوو تکای بۆ بکات و وتی ئێستا لە خەوما حەزرەتی مەولانا سەگێکی پەت کردبو دابووی بە دەس ئەم خولامی خۆیەوە رام ئەکێشا بە دەنگی ئەم شیعرەی تۆوە خەبەرم بووەوە.

**ك ١٠٠ رياض المشتاقين ٢٩٥:** جەنابی شێخ عەلی ئەفەرمویْ: [2]

لە هەرەتی گەنجی و تەمەنی لاویدا بووم، کەمیْ نەخۆشیم بوو، چوومە سەرمەزاری یەکیْ لە دۆستانی خوا بەرامبەری قەبرەکەی دانیشتم بە چاوی خۆم لەو قەبرە دیم مەشخەڵی نوور وەك خۆر بەرزبووەوە وە بۆنی خۆشیش لەو قەبرە بە من گەیشت، کاتیْ گەڕامەوە چوومە باخی وەستا ئەحمەد ناویْ کە بەندە باخەوانی بووم، شێخ تەشریفی لەویْ بو وەستا فەرمووی بڕۆ هەندیْ تریْ و هەنجیری جوان بێنە، میوان لەمە عەزیز تر نابیْ[3]، چووم هێنام دامنا و چوومە لایەکەوە وەستام لەویْ بە خەتەرەی دڵ ووتم با ئەوەی دیومە لە خزمەت شێخا بیگێڕمەوە لە پڕ ڕووی کردە وەستا ئەحمەد فەرمووی ئەگەر جاریْ کەسیْ بچێتە سەر قەبریْ نوریْ ببینیْ یا بۆنی خۆشی بەسەرا هات لای کەس نایڵیْ.

---

(١) ئەمە فارسی‌یەکەیەتی: شنیدئم کەسگان را قلادە میبندی

چرا بە گردن عوسمان نمینی رسنی

(٢) جەنابی شێخ عەلی خەلیفەیە مهم و گەورەی حەزرەتی سراج الدین بوە، شێخ عەلی‌یەکەی درویش سمایلی سیّد صادق رحمة الله علیهم أجمعین.

(٣) میوان لەوە عەزیز تر نابیْ، حەزرەتی سراج الدین بۆ مەزاح میوانەکە مەبەستی لەخۆی بووە.

**ك ١٠١:** شێخ محمد صادق ووتی: جارێ عەرزی حەزرەتی شێخم کرد کە دایکم و براژنم ئەمری خوایان بەجێ هێناوە، هیممەتێ دەربارەیان بکە، ساتێ بێدەنگ بوو فەرمووی: قەبری‌یان لە جێ‌یەك دایە دوو درەخت لە خواریانەوە هەیە ئەمجا یەك یەك نیشانەی جێگە قەبر و شێوە و هەیئەتی خۆشیانی بەیان فەرموو، وە فەرمووی ماشاء الله براژنت ئیمانێکی ئەستووری بوە، دایکیشت باشە خوای تەعالا بەخشویەتی بە خۆی ئەوە کە چەن ئەولادێکی باشی مردوە ناشکوری نەکردوە، وە هەرچی کە ئەی فەرموو وابوو.

**ك ١٠٢ رياض المشتاقين ٣٠٥:** جارێ لە خزمەت شێخدا لەگەڵ جەماعەتێ لە پشتی حەزرەتی پیرەوە لە نزیك قەبری شێخ عمرەوە کە لە خوار خانەقا و باخچەیەکەوە ئەڕۆیشتین شێخ تەشریفی وەستا فاتیحەی خۆند بۆ شێخ عمر[1]، ئەمجا من هەموو جارێ بەوێدا بچوومایە فاتیحەم نەئەخوێند، شێخ دوای فاتیحاکە لای کردەوە بەلامەوە لە ڕووی تانە و لۆمەوە فەرمووی شێخ عمر گلەییت لێ ئەکا ئەڵێ بۆ بێرەدا تێ ئەپەڕێ فاتیحەم بۆ ناخوێنێ؟ بۆ بۆی ناخوێنی؟

**ك ١٠٣:** وە هەروەها ڕۆژێ عبدالله ئاغای برای حەزرەتی شێخ لە خزمەت شێخدا بوو، نزیکی مەزاری شێخ عمر وەستا بوون، عبدالله ئاغا ڕووی کردە قەبرەکەی شێخ عمر فەمووی کاکە شێخ لە حاڵی حەیاتا لەگەڵ من هیممەتت بوو نازانم ئێستە چۆنی؟ حەزرەتی پیر فەرمووی نازانی چۆنی وەڵام دایتەوە؟ فەرمووی چۆنی وەڵام دامەوە؟ فەرمووی بەڵێ لە وەلامەکەیا ووتی ئەگەر لەگەڵ تۆدا هیممەتم نەبوایە ئەمڕۆ ئەو مارە کە تووشت هات پێوەی ئەدای!!! عبدالله ئاغا فەرمووی ڕاست ئەکات ئەمڕۆ چووم بۆ ناو باخی خۆمان توشی مارێ گەورە بووم وەختە بوو پێمەوە بدات.

---

(١) ئەو شێخ عمرە خەلیفەی خۆی بو، ماوەیەك بوو وەفاتی فەرموو بوو.

**ك ١٠٤ رياض المشتاقين ٣٠٨:** ملا محمدی وولّووبه[1] نەخۆش بوو، کەسێکیان نارد بۆ دۆعا بۆی بنووسێ، نەختێ بێدەنگ بوو حەزرەتی شێخ ئەوسا فەرموی دۆعا هیچ سوودێ بەو نادات بەم نەخۆشی‌یە ئەڕوات بۆ بەیانی تەرمەکەیان هێنا بۆ خانەقای سلێمانی چونکە وەصیەتی کردبوو لە خانەقا بمشۆن.

**ك ١٠٥:** عبدالرحمن ئاغا لە کوڕە ئەعیانەکانی سلێمانی بە تێکچوون دووچار ئەبێ، هێنایانە خزمەت حەزرەتی شێخ، فەرمووی ئەو کولۆنجە لەبەری دایە حەرامە دۆشەك وسەرینێ لە ماڵیایەتی حەرامن، ئەوانەی لیێ دووربخەنەوە، ئەوانەی لەگەڵیا بوون دانیان بەڕاستی دانا کە ئەمانە (ماڵی باپیری بووە) حەقی وەرەسەی بە سەرەوەیە لە بەرەکەتی حەزرەتی شێخ هەر ئەو ڕۆژە چاك بوەوە.

**ك ١٠٦ رياض المشتاقين ٣٠٨:** کۆمەڵێ لە دانیشتوانی سنە نووسیبوویان:

قوربان میرزا هیدایت الله بە فەرمانی وەزیر بەڕێوەیە، بەڵام ئێمە سەرگەردانین لەم کارە ئەگەر بە قسەی وەزیر بکەین ئەترسین رضا قلیخان جارێ تر بێتەوە ئێمە تاوان بار ببین، وە ئەگەر بە فرمانی وەزیریش نەچین بەڕێوە نازانین سەرەنجامی کاری رەزا قولیخان چۆن ئەبێ، حەزرەتی پیر منی بانگ کرد فەرمووی: ئەم نامانە بخوێنەوە، خۆندمەوە فەرمووی هەندێ لەمانە حەز بە رەزا قولیخان ئەکەن بە هەر چەشنێ بنووسم هەندێکیان زویر و دڵگران ئەبن، عەرزم کرد حەزرەتی پیر چۆن مەیل ئەفەرموێ بینووسە، هەر کەس دڵگران ئەبێ با ببێ شێخ ئەحمەدی هەولێری لەوێ بوو ڕووی کردە شێخ ووتی بنووسە من هیچ نازانم إظهاری کەشف مەکە لەطەریقەدا ممنوعە شێخ فەرمووی ئاخر واز نایەنن، ئەمجا ڕووی کردە من فەرمووی تۆ ئەڵێی چی؟ عەرزم کرد شێخ خۆی ئەزانێ، بەڵام لە کتێبی طەریقەدا ئەفەرموێ

---

(١) وولّوبە: دێیەکە لە باشووری خواری سلێمانی، نزیکی ١٠ دە دەقیقە ڕێ ئەبێ لە گەڕەکی (خەبات)ەوە.

ئەگەر کەسێ بۆ دەربڕینی گەورەیی و پایە بەرزی خۆی دەری بخات قەدەغەیە بەڵام ئەگەر بۆ بەرژەوەندی و مەسڵەحەتی موسڵمانان بێ دروستە شێخ أحمد فەرموی دروست نیە بە هیچ جۆرێ.

ووتم ئەی جەناب ئەم هەموو کتێبی کەشف و کەراماتانە چییە نوسراونەتەوە ووتی کوا؟ کشوفات، ووتم تۆ کتێبی مقاماتی حەزرەتی شاهی نەقشبەندت دیوە ووتی بەڵێ، ووتم دیوتە ووتی بەڵێ ووتم لەوێدا نافەرموێ[1] ئەمجا شێخ فەرمووی لە وەلاما بنووسم الله أعلم ئیشی ڕەزا قوڵیخان مەحکەم تر و قایم ترە، با ڕەزا قوڵیخان لە دەس خۆیان دەرنەکەن.

لە ئاکاما فەرمایشتی شێخ بە دی هات، وە ئەوانە لایەنگیری وەزیریان گرتبوو هەمو پەشیمان بوونەوە، کاتێ نامەکەی شێخ ئەچێتەوە وەزیر کاغەزەکەی دەست ئەکەوێ نامەیەکی توند و تیژ ئەنووسێ بۆ خزمەتی شێخ وە کاغەزەکەی حەزرەتی شێخ ئەخاتەوە ناو، هەندێ بێ ئەدەبیشی تێدا ئاشکرا کردبوو، شێخ فەرمووی ماوەی ژیانی کەم ماوە مردنی نزیکە شێخ فەرمووی وەڵامەکەی بەم چەشنە بۆ بنووسەوە:

(١) ئەمە چیرۆکی دانەری ئەم کتێبە جەنابی مامۆستا ملا حامید کە لە خزمەت شێخی سراج الدین بۆ جەنابی شێخ ئەحمەدی هەولێری ئەگێڕێتەوە ئەفەرموێ لە کتێبی مقاماتی حەزرەتی شاهی نقشبند وا ئەفەرموێ کە (مریدێکی حەزرەتی شاە لە کۆشکی عارفان)ەوە هەموو جارێ بۆ کەلوپەل کڕین ئەچوو بۆ بوخارا بۆ حەزرەتی شاە، ئافرەتێ لەم سەرە و سەری هاتوچۆکەیدا رێی پێ ئەگرت قسەی پێ ئەووت، دواجار شکاتی لە خزمەت شاە کرد، فەرموی ئەمجارە ئەگەر جنێوی دایتێ بڵێ تۆ زینات لەگەڵ فلان کرد منالت بوو منالەکەت کوشت وە لە فلان جێ تەسلیم بە خاکت کردوە، ئەمجا کە لە قەسرەوە چوو بۆ بوخارا تووشی هەمان ئافرەت بوەوە کە هاتە سەر ڕێگای بە قسەی ناشرین و جنێودان ئەوانەی پێ ووت دەسبەجێ ژنەکە تۆبەی کرد وە بوو بە مریدێ باش ئەمجا جەناب لە جێیە دەرختنی زینا و قەتڵ بە کشف إظهار بکرێ جائیز بێ بۆ مەسڵەت بۆ جائیز نیە ئیتر بێ دەنگ بوو.

ژیانت لەدنیادا ماوەی کەم ماوە، کۆچت نزیکە واز لە هەوای دنیایی بێنە خەریکی ئامادەکردنی سەفەری ئاخیرەتی ببە، الحمدلله کوڕانی بە قابیلیەت و بە توانات هەیە کاروباری دنیا بەوان بسپێرە زیادە لەوە داخڵی هەوا و هەوەسە.

وەزیر هەر لەو ساڵەدا فەوتی کرد، وە ڕەزا قولیخان بوو بە حاکم و فەرماندار وە زۆر بەرامبەر موریدانی حەزرەتی شێخ موخلیس و میهرەبانی بوو.

**ك ١٠٧ رياض المشتاقين ٣٠٧:** مەلا أحمدی حمزەیی و دوو کەس لە خانەقای سلێمانی سلوکیان ئەکرد، لەو کاتەدا خانەقا لە بارەی کاروباری ژیانەوە لە تەنگیدا بوو تەگبیریان کردبوو لەمیانەی خۆیاندا کە هەر کەس بڕواتەوە بۆ شوێنی خۆی، هەر کات خوا دەرووی کردەوە کاروباری خانەقا چاك بوو بێنەوە، لە کاتی ئەو تەگبیرانەدا حەزرەتی شێخ فەرمووی:

ئێستا بە ئاشکرا چاوم لێیە شەیطان خەریکە ملا أحمد و ڕەفیقەکانی فریو ئەدا و هەڵیان ئەخلەتێنێ، ئەیەوێت (عليه اللعنة) جیایان بکاتەوە خێرا هەستا تەشریفی چوو بۆ حوجرەکەیان فەرمووی: تەگبیری چی ئەکەن، عەرزیان کرد وامان بڕیار داوە، وەخەیاڵ و مەبەستەکەی خۆیان عەرز کرد و بەسەرهاتیان گێڕایەوە، فەرموبوی لە جێی خۆتان جێگیر بن وە بە ئیشی خۆتانەوە خەریك بن ڕۆزی دەری ئێمە و ئێوە حەزرەتی حەقە (جلّ شأنه):

| | |
|---|---|
| ئـــەی باخـــەوانی بـــاخی تمنّـــی | کلیل بە دەستی گەنجینەی معنی |
| قـاپی بکـەوە گـەنج بێنـە مـەیان | بێنە دی هیوای بە قیمەتی گیان |
| دەروون پڕ لە نوور دڵشادمان بکە | لەم شەوی خەما ئازادمان بکە |

**ك ١٠٨ رياض المشتاقين ٢٦٥:** ملا حامید ئەفەرموێ حەزرەتی پیر فەرمویەتی تەنیا یەکجار لە ژیانما لەسەر ئیشی خۆم تصرّفم کردوە. ئەویش ئەوەبوو حسین ناوێ بێ لووت ما، دواییش زۆر پەشیمان بووم ئیتر بۆ خۆم هیچم نەکردەوە[1].

یەکەم: ملا حامید ئەفەرموێ لە لاپەڕە ٢٦٥دا کە أحمد ئەفەندی یەکێ بوو لە مونکیر و بێ باوەڕان کە ملا حسینی بیارەیی کە یەکێ لە زانایان و صالحان داخلی دەفتەری خەرجی کردبوو لەگەڵ ئەوەشا کە زۆر بێ دەرامەت بوو، جەنابی حەزرەتی شێخ چەن جارێ ناردی‌یە لای کە ئەم پیاوە بێچارە داخلی خەرج نەکات هیچ بە گوێ‌ی نەکرد و قسەی مونکیرانەی کردبوو، زۆری پێ نەچوو تفەنگێ دای لە قاچی لە دنیا دەرچوو.

دووەم: لە شێخ عەلی تەوێڵەم بیست عمر ئەفەندی کەساڵێ دێی تەوێڵەیان بە تەوێڵی[2] پێ دابوو وە شێخی ئێمە لەو کاتە لە سلێمانی لە خزمەت حەزرەتی مەولانا سلوکی ئەکرد، یەکێ لە پەیوەندی دارانی پیر چوو بۆ سلێمانی لەتەوێڵەوە عەرزی کردبوو، عومەر ئەفەندی ئەڵێ یا ئەبێ لە تەوێڵە بچنە دەر یا ئەبێ خەرج بە من بدەن، حەزرەتی پیریش فەرموبوی خوای پەروەردگار یا چارەسەری ئێمە ئەکات یان هی ئەو بۆ سبەینێ هەواڵ گەیشتە سلێمانی کە دوێنێ کاتی عەسر کوڕی میرزا عومەر کوژرا دیار بوو کە لەو کاتەدا ئەوەی فەرموو بو لە سلێمانی لێرە ئەو بەسەر هاتە ڕوویدا وە هەر لەو ساڵەدا هەردوو گوێ‌ی کەڕ بووە لە فەرمانی میر دەرکرا وە لە نۆکەری لابرا.

---

(١) وەرگێڕ ئەفەرموێ یانی هەرچی لەسەر خۆم کرابێ، خوا بێ خواستی خۆم بە حوکمی حدیثی قدسی (من عادَ لي ولياً فقدْ آذنته بالحربِ) خوا خۆی تووشی ئازار و نەمانی کردوە هەروەکو ئەگێڕنەوە لەسەر زمانی جەنابی ملا حامید لە لاپەڕە (٢٦٥) باسی فەرمووە.

(٢) بە تەوێڵی: یانی بە ئیجارە.

سێیەم: هەروەها شێخ عەلی تەوێڵەیی فەرموی:

خالید ناوێکی تەوێڵەیی زۆر بێ بڕوا و بێ ئەدەب بوو، قسەی ناجۆر و نالایقی لەم لاو لەولا زۆر ئەکرد، جارێ لەناو کۆمەڵێ خەڵکی تەوێڵە قسەی خراپ ئەکات خەڵکەکە لۆمەی ئەکەن و تانەی لێ ئەدەن، ئەویش ئەڵێ من جنێوی خۆم ئەدەم ئەگەر زەرەرم کرد ئێوە تەمیە بێن ئەگەر هیچم لێ نەهات وازم لێ بێنن مەنعی قسەم لێ مەکەن، ئەو ڕۆژە ئەکەوێتە بەیانی ئەچێ بۆ ناو باخی خۆی وە هەڵ ئەگەڕێ بەسەر توویەکی بچوکدا بۆ توو خواردن ئەکەوێتە خوارەوە خێرا مۆخی مێشکی لەسەر دێتە دەرەوە ئەو کارەساتە بوو بە هۆی پەند و ئامۆژگاری بۆ خەڵکی تر.

دوو نامە بۆ حەزرەتی شێخی سراج الدین لە سلێمانییەوە

یەکەم لە جەنابی کاك أحمدی شێخەوە و ئەوی تریان لە جەنابی مەولەویەوە (خوا لێیان خۆشنوود بێ)[1].

جارێ یەکێ لە دانیشتوانی سلێمانی هات دوو کاغزی لە خزمەتی حەزرەتی شێخی سراج الدیندا دانا:

یەکەم: لە لایەن جەنابی حاجی کاك أحمدی شێخ کوڕی شێخ معروف رحمها الله دووەم لە لایەن خوا لێ خۆشبوو مەلا عبدالرحمن تاوکۆزی مەولەوییەوە، وەرگێڕاوەتە دەقی فارسییەکان وایە:

لە نامەی یەکەم: کاك ئەحمەدی شێخ ئەفەرموێ: ئەم موسڵمانە ئیدیعای سیّدی ئەکات خزمانی ئەم پیاوە لە تۆوە نزیکن ئەگەر کۆشش بفەرمووی گرێی ئیشی ئەم پیاوە بکەنەوە، وە بەڵگەیە بۆ سەلماندنی مودەعای ئەو دەس بخەنە نیهایەتی ئیحسانە.

لە نامەی دووەم جەنابی مەولەوی ئەفەرموێ:

---

(١) دەقی فارسی: دو نامە یکی أز جناب شێخ أحمد شێخ معروف و یکی أز جناب مولوی سید عبدالرحیم.

ئەگەر جەنابی شێخ لە بابەت سیّدی هەڵگری نامە لە عالەمی باطندا شتێکی بۆ ئاشکرا و دیاری بفەرموون بۆ ئەوەی ببێتە هۆی دڵنیایی ناوبراو ئیشارەی بفەرموون تا بەڵکو لە ظاهریشا بۆ سەلمان و إثبات بوونی هەوڵ بدات هۆی گەورەییتانە.

ئەمجا ئەو زاتە حەواڵەی جوانڕۆ کرا بۆ ناو ئەو سیّدانە کە ئەم خۆی بە خزمی ئەوان لە قەڵەم ئەدا، شایەت لە بحر الأنساب و شەجەرەی ئەوانا ئەگەر بێ شتێ دەس بخات، پاش ماوەیە هاتەوە لە خزمەکانیەوە شایەت نیمچەیەکیان بۆ کردبوەوە، وە ئومێدەواری‌یەکی بۆ خۆی دەس خستبوو. ئەمجا داوای وەڵامی نامەکانی کاکە ئەحمەدی شێخ و مەولەوی لێ کردم لەو کاتەدا تەشریفی حەزرەتی شێخ هاتە دەرەوە نیشانەی مژدە و خۆشی لەناو چاوی موبارەکیان ظاهیر بوو عەرزم کرد ئەم پیاوە داوای وەڵامی کاغزەکان ئەکات ماوەیە موڕاقیب بوو دوایی فەرمووی: لە وەڵامی جەنابی کاکە شێخ ئەحمەدا[1] بەئەدەبێ تەواو بنووسە بەم جۆرە بە شێوەی ظاهر معلوماتێکم لە نەسەبی پاکی ئەم پیاوە نیە بەحەسەب باطن ئەوەندە ئەزانم کە نوری سیادەت لەناو چاویا ئەدرەوشێتەوە العلمُ عند الله سبحانه.

بەڵام لە وەڵامی مەولەوی بە صەراحەت بنووسە کە ئێستە بە خزمەت شەرەفی دیداری حەزرەتی خاتم الرسل بە بێداری نەك بە خەو گەیشتم لە زوبانی پیرۆزیم بیست فەرمووی ئەم شەخسە لە ئەولادی منە، هەر کەس باوەڕ ئەکا بیکا هەرکەس باوەڕ ناکا، إختیار بە خۆیەتی کە کاغەزەکان ئەبا و هەندێ لە بێ باوەڕان چاویان بە کاغەزەکەی مەولەوی ئەکەوێ غەوغایە دروست ئەکەن.

عەلامەی زەمان خاوەنی عیلم و عیرفان حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشە مفتی مەجلیسێ دروست ئەکات بە بەڵگەی تەواو پێیان ئەسەلمێنێ فەرمایشتەکانی وە هاواری بێ باوەڕان بە زللەیە لا ئەدات و والسلام.

---

(١) حەزرەتی کاکە أحمدی شێخ لەو کاتەدا بەوچەشنە ناوبراوە و شۆرەتی وابوە.

**ك ١٠٩ رياض المشتاقين ٢٦٦:** جەنابی شێخ عەلی فەرمووی حەزرەتی سراج الدین فەرموی حەزرەتی مەولانا فرمانی دا لە بابەت یەكێ لە زۆرداران كە بێ پروابیەكەی و ئینكاری لە سنوور دەرچوو بوو كە شەو بە تیغی هیممەت حەرفی وجودی لە لەوحی دنیا بتاشم.

ئەو شەوە متوجّە بووم هیچ ڕووی نەدا، حەزرەتی مەولانا پرسیاری فەرموو بوو كە ئەمشەو بۆچی فرمان نەهاتە جێ حەزرەتی شێخ عەرزی كرد قوربان دەروێشێ نەی هێشت لە وەلاما فەرمووی: نامەردیت كردوە ئەبوایە دەروێشەكەیشت لەگەلا بە هیلاك بگەیاندایە شەوی دووەم متوجّە بووم بە تیغی باطن ئەو زالمە بە هیلاك چوو.

**ك ١١٠:** شێخ محمد صادق برای میرزا رەبیع ووتی: پیاوێ لە خەلكی بیارە مردبوو، كەسەكانی هاتنە خزمەت شێخ لە ئەحوالی ئەو شەخسەیان پرسی. فەرمووی: ڕۆحانیەتی ئێستە حازرە ئەلێ الحمد لله حالم باشە بەلام مەنجەلێ لە مالمانایە هی خەلكە لەسەر ئەوە ئازارێكم هەیە.

دانەری ئەم كتێبە ملا حامید خۆی ئەگێرێتەوە ئەلێ: دایكی حسین بەگی قایمقام مردبوو، حسین بەگ بە هۆی ئەوەوە كە ئیخلاصی حەزرەتی شێخی بوو بە نامە پرسیار و هەوالی دایكی لە حەزرەتی شێخ پرسی بوو حەزرەتی پیر فەرمووی: وەلامی وا بۆ بنووسە دایكی الحمد لله ئەهلی ئیمانە، بەلام لە بارەی یەك مەسینەوە كە لە ژیانیا دەست نوێژی پێ گرتوە ئازاری هەیە چونكە ئەو مەسینەیە هی خەلكە بیدەنەوە بە خاوەنەكەی وە گەردن ئازادی لێ داوا بكەن، وە ئەوە بوو بە هۆی زیادبوونی بیروباوەری حسین بەگ دوای ئەوە كە نامەكە گەیشتەوە دەستی حسین بەگ وە مەسینەكە درایەوە بە خاوەنەكەی و گەردن ئازادی لێ داواكرد.

**ك ١١١ رياض المشتاقين ٢٦٣:** وه هەروەها فەرمووی: ئازاری بۆ هەرکەس حەواڵە بکری بە وێنەی ئەوەیە کە لە لایەن دادگەرێکەوە مەئمور بنێرنە سەرتاوان باری: أهل الله لەگەڵ ئەو دەردە قسە ئەکەن، وە هۆی حەواڵە بوونی لێ ئەپرسن کە بۆچی نێردراوی بۆ سەر ئەو کەسە، وە وەڵامی وەرئەگرنەوە[1].

ئەمجا وەك کەسوکاری کابرای تاوانبار هەوڵ ئەدەن بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی ڕزگاری وە ئەو واسیطەش کە سوودی هەیە بۆ لای دادگەر دەس ئەکات بە پشکنین و لێ دوان بزانێ ئەندازەی تاوانەکەی وە تووڕەیی دەربارەی ئەو تاوانکارە چەندەیە، ئەگەر ئاسان بوو ئەوە دەست بە تکا کردن ئەکات، ئەگەر بەخشی و لێی خۆشبوو ئەوە باشە ئەگینا ئەڵێ فلانی تۆ نازانی سووچو خراپەکاری ئەو چۆنە و چەندەیە؟ ئەوە و ئەوەی کردوە شایانی بەخشین و لێ بوردن نیە لە بابەت ئەوەوە هەر قسە نەکەی چاکە و باشترە، ئیتر ئەو تکاکارە لەو بابەتەوە بێدەنگ ئەبێ وە ئەگەر بێدەنگ نەبێ تەمیەی ئەکەن.

ئەو (أهل الله)یشە متوجّە ئەبێ ئەگەر بشێ ڕزگاری بۆ داوا ئەکا وە ئەگەر وانەبوو لێی ئەگەڕێ.

**ك ١١٢ رياض المشتاقين ٢٦٣:** جەنابی ملا حامید ئەفەرموێ: ڕۆژێ بۆی باس کردین کە هەندێ نەخۆشی وەکوو لیباس و پۆشاکی ڕزیو و پووکاو بێکەڵکو چڵکن وای لێ کردوە ئەگەر کتوپڕ بیخەیتە ئاوی گەرم و بە سابون بی شۆیی و هەڵی گلۆفی ئەو پۆشاکە بە سەلامەتی نایەتە دەرەوە، جا کەوابوو کەم کەم ئەبێ خەریکی بێ، ئەگەر گەیشتە ئەوە توانای چارەسەری هەبوو بکرێ ئەگەر عەلاجی نەهات بە حاڵی خۆیەوە لێی ئەگەڕێین نەوەکوو بە تەواوی لەناو بچێ.

---

(١) ملا حامید ئەفەرموێ: حەزرەتی سراج الدين ئەوەندە تصرّفی لە دەردی گران و شێتی و باری ناجۆری خەڵکیدا ئەفەرموو بۆ لابردنیان لە ژمێرە نایەن، کەم جارێ کەوتبێ ناسازی چارەسەر نەکردایە مەگەر أمری قطعی و موبرەم بوایە.

ئەگینا تصرّف و کار و فرمانیان هەمیشە لە کارایە بەڵام بە توانایی و ناتوانایی نەخۆش و دەردەدار و شێتەکەش لە ئارادایە.

وە فەرمووی: شێتی گەلێ جۆری هەیە لە عیشقی زۆرەوە وە لە زۆر سەندنی سەودایی شەوە ڕوودەدات، وە هەروەها لە دەست لێ وەشاندنی (جنّ)ەوە ئەبێ، ئەم جۆرەیان لای ئەهلی باطن ئاسان ترە، وە فەرمووی من جنّی‌یەکم لە میصرەوە هێنا بۆ ئێرە.

وە هەروەها مەلا حامید فەرموی: حەزرەتی شێخ گفتوگۆ و حیکایەتی خۆی لەگەڵ جنی‌یاندا زۆر بۆ باس کردووین، ئەگەر بیان نووسمەوە پەڕاوێکی ئەوێ بەڵام بە تەنیا بەم بەسەرهاتە کۆتایی ئەهێنین:

فەرمووی لە سەرەتای شێخیەتیمەوە ئافرەتێ بە دەردی شێتی گرفتار و دووچار بوو بوو، هێنایان بۆ لام، کاتێ سەرنجم لە حاڵی دا تەماشام کرد جنّی‌یەك شێتی بوە و حەزی لێ کردووە، ئەو جنی‌یەم راکێشا وە حەپسم کرد، کە حاکم و فەرمانڕەوای تایەفە و تیرەیەکی جنی‌یەکان بوو کە لە زەڵم[1] نیشتەجێ بوو بوون، هەرچەن کۆششم کرد کەدەس بەرداری ئەو ئافرەتە بێ قبوڵی نەکرد، ناچار بووم لەناوم برد و فەوتاندم ژنەکە چووەوە باری سروشتی خۆی، چەن ڕۆژێکی پێ چوو تەماشام کرد ژنەکە وەك لە دەس کارەسات و بەڵایە ڕابکات هات و خۆی خستە پشتمەوە، ووتم چی‌یە بۆ وا ئەکەیت؟ ووتی بڕوانە تا ببینی چی‌یە؟ کاتێ تەماشام کرد دیم لەشکری جنی دەور و پشتی ئێمەیان گرتووە وە ئەو ئافرەتە بە حەوت ئەندام لە لەرزین دابوو، وە ووتی ئەمجارە تۆیش و منیش بەهیلاکا ئەبەن ووتم مەترسە ئارام بگرە با نزیك تر ببنەوە، خۆت بگرە مەترسە لەوە زیاتر لێمان نزیك ببنەوە ئەو کاتە ئەزانی چی بەسەر ڕۆژگاریاندا دێت وە چی‌یان لێ ئەکرێ، پێشڕەوی ئەو جنی‌یانە ئەڵماسی ناو بوو کە لە کاتی کوشتنی حاکمەکەیاندا لە ماڵ نەبوو بوو، کاتێ هاتبووەوە

(١) زەڵم: سەرچاوە و ئاوێکە لە پشتی گوڵ عونبەرەوە کە ئێستە خورماڵی پێ ئەڵێن.

پرسی بووی بۆچی وا تەعزیە بار و ماتەمینن ووتبوویان دادگەری ئێمەیان لە بارەی ئەو ژنەوە کوشتوە وە ئەم ماتەمینەی ئێمە بەو هۆیەوەیە، ئەویش وتبووی بۆچی ئێوە بێ غیرەتیتان کردوە لە پاداشیا نەتان کوشتوون؟

تۆپزێکی هەڵ گرتبوو وتبووی دوامکەون با لە ناویان ببەین، کاتێ نزیك کەوتبوونەوە بە دەستی باطن ئەڵماس ناوم گرت خۆی و تۆپزەکەیم نابووت کرد وە ژیانیم لە لیستەی دنیادا کوژاندەوە، ئەمجا ڕووی دڵم کردە جنیٚیان هاوار و قیژەیشم خستە ناو ئەوان وەك ئاگر لە پووش و پەلاش بەربێ زۆربەیان سووتان وە بۆ شاری بێ دەنگان ڕەوانە کران، کەمێکیان کە مابوون بەسەر لێ شێواوی چووبوونەوە مەڵبەندەکەی خۆیان دەستێکی باطنم بە ڕووی ژنەکەدا هێنا بۆ ئەوە ئیتر جنی نەبینێ، وە فەرموی: ئەوەی لە هەمو زەحمەت و گرانتر بێ نەخۆشی فیٚیە یانی صەرع، ئەگەر سەودا و شەیاطینی کۆ ببێتەوە زۆر گرانە چارەسەری مەگەر قطبی عەصر ئەو کەسە چارەسەر بکات.

**ك ١١٣ رياض المشتاقين ٣٢٨:** جارێ یەکێ لە ئەهلی سەقز هات بۆ خزمەتی حەزرەتی سراج الدين (خوا لێ خۆشنود بێ) عەرزی کرد ژنێك لە سەقز مێردەکەی مردوە، وە یەکێ لە مریدانی حەزرەتی مەولانا قدّس سرّە داوای ئەوە ئەکات کە حەزرەتی پیر متوجّە ببێ کە ئەحواڵی چۆنە؟ فەرموی بەو ژنە بڵێ کە بەو ناونیشانە فلان شەو فلان کەسی دراوسێیان لە خەویا مێردەکەی دیبوو پێی ووتبوو الحمد لله ئەحواڵم زۆر باشە مزگێنی بدەرێ کە لە گرۆهی ئەهلی ئیمانە و لە وەرگیراو و مەقبوولانە ئەمجا ئەو کەسەی کە ڕاسپاردەکەی هێنا بوو ووتی: من خۆم ئەو خەوەم لەو دراوسێیانە بیستوە.

**ك ١١٤ رياض المشتاقين ٢٩٦: جەنابی شێخ عەلی تەوێڵە ئەفەرموێ**[1]:

ڕۆژێ حەزرەتی شێخ قدّس سرّە لە گۆڕستانی خزمەکانیدا تەشریفی‌یان حازر بوون بەشێوەی ظاهری و منیش لە خزمەتیا بووم، لەو کاتەدا کەشفی ئەحواڵی قەبر و مردوانم بۆ بوو دیم بە حەڵقە دانیشتبون شێخ توجّهی لێ ئەکردن زۆریان مجذوب بوون.

گێڕاندنەوەی (٤) کەرامەت:

**یەکەم**: لە حەزرەتی محمد بهاء الدین کوڕی گەورە و جێگەداری حەزرەتی سراج الدین لە پاش خۆی کە لە باوکی پیرۆزی خۆیە دەیگێڕیتەوە.

**دووەم**: لە حەزرەتی حاجی شێخ عبدالرحمن کوڕی حەزرەتی سراج الدین کە لە باوکی گەورەی خۆیەوە نەقلی ئەکات وە مەرقەدی پیرۆزی لە بغداد لە خزمەت سلطان الأولیاء حەزرەتی عبدالقادر گەیلانیدایە قدّس اللہ سرّہ ونوّر اللہ ضریحه.

**سێهەم**: لە حەزرەتی ضیاء الدین مەولا عمرەوەیە کە نەقلێ لە باوکی پیرۆز و گەورەی خۆیەوە دەکا.

---

(١) جەنابی شێخ عەلی لە گەورە گەورانی خولەفای حەزرەتی پیر بووە، وە نەخوێندەوار بوە، جەنابی ئەم زاتە بوە کە سیّد صادق ﷺ بە دەروێش سمایلدا سەلامی ناردبوو بیگەیەنێ بە شێخ صاحیب.

ئەمەش نوسخەیەکە کە لەمناقیب و ژمارەکانی أولیاء الله کە چەند کەسن وە هەریەك خاوەنی چە روتبە و پایە و مەنصێبکن بە خەطی خوا لێ خۆشبوو فخر الزمان جەننەت مەکان أبو الوفا حاجی شێخ عبدالرحمن کوڕی عالی شانی حەزرەتی شێخ عوسمان سراج الدین (خوا لێیان خۆشنود بێ) دیوومە بە کوردی بۆ بەرەکەت ئەی نووسمەوە لە پاش ئەوە کە حاجی محمدی سەمڕانی لەکتێبی بارقات السروردا لە لاپەڕە ١٦٠ تا ١٦٢ بە فارسی نوسیویەتی:



أ- **أقطاب:** بزانە کە ئەقطاب ئەو تەنیا شەخصەیە کە لەمەولا بەیان ئەکرێ وە دڵی لەسەر دڵی حەزرەتی (**إسرافیل**)ە، سەلامی خوای لێ بێ.

ب- **أفراد:** بەڵام ئەفراد ٣ سێ کەسن کە بە تجلّی فەردیەت متحقّق بوون لەبەر ئەوە کە لە غایەتی کەماڵ دان خارج لە دائرەی (قطب الأقطاب)ن.

ت- **أوتاد:** چوار کەسن کە چوار روکن و گۆشەی عالەم بەوان وەستاوە وەکو (کەشتی) لە بۆ ئەرز بوون بە لەنگەر.

ث- **بدلاء:** حەوت کەسن کە (**أمناء الله**)یشیان پێ ئەڵێن.

ج- **نجباء:** ٤٠ کەسن کە (**رجال الغیب**)یشیان پێی ئەڵێن.

ح- **نقباء:** ٣٠٠ سێصەد کەسن وە (**أبرار**)یشیان پێ ئەڵێن، لەم مەراتبانە (**نقباء**) خوار هەموویان کەوتوە وە ئەم بەشانە لە پیاو چاك تا ڕۆژی قیامەت ئەبن. وەك لە (فتاوی الحدیثیة)ی **شێخی ابن حجر أحمد الهیتمی**دا نوسراوە.

نموونەیەك لە كەراماتی

# حضرەتی شێخ محمد بهاء الدین

# أبو البهاء

قدّس الله سرّة العزیز

## كە جێ نشین و جێگەداری حەزرەتی شێخ عوسمانی سراج الدین تەوێڵە بووە.

لە دایك بوونی (١٢٥٢) ك، چونی بۆ حەج (١٢٩٠) ك، وەفاتی (١٢٩٨)، تەمەنی (٤٦) ساڵ بوە.

## أبـو البـهاء حـەزرەتی شـێخ محمـد بهـاء الـدین جێ نشـینی حەزرەتی شێخ عوسمانی سراج الدین[1]

حەزرەتی شێخ محمد بهاء الدین کوڕی حەزرەتی شێخ عوسمانی سراج الدین لە ساڵی ١٢٥٢ هجری تەشریفی موبارەکی هاتۆتە دنیاوە، وە لە ساڵی ١٢٩٠ تەشریفی فەرموە بۆ حەج ١٠ دە مانگی پێ چووە، وە لە ساڵی ١٢٩٨ کۆچی، شەوی جمعە ٤ ربیع الأول لە دنیای بێ وەفا و بەقا کۆچی دوایی کردوە، قدّس الله سرّه العزیز. وأنالنا ببرکاته.

ماوەی ئیرشادی چواردە ساڵ بوە، ئەو بەینە زۆر کەسی بە پایە و پلـەی بـەرز و مایە گەیاندوە، زاتێکی زۆر خاوەن حەیا و صاحیب کەماڵ و بە تمکین و ویقـار بـوە لـە تـەنیشتی مەرقـەدی موبـارەکی پڕ لـە ئـەنواری بـاوکی لـە دێـی تەوێڵـە نێـژراوە، حەزرەتی قوطبی زەمان شاهی علاء الدین قدّس سرّه العزیـز فـەرموی: شـێخی سـراج الدین فەرموویەتی محمد خوای خۆش ئەوێ عبدالرحمن خوا خـۆشی ئـەوێ ئـەم دووە لە لایـەن بـاوکی عەزیزیانـەوە دانـرا بـوون بـە جێـدار[2] بـەڵام حـەزرەتی حـاجی شـێخ عبدالرحمن تەشریفی چوو بـو بۆ بـەغا[3]، وە لـەوێ لـە سـاڵی ١٢٨٤ کـۆچی کـۆچی فەرموە وە مەرقەدی لە بارەگای حەزرەتی گەیلانیدایە، حاجی شێخ محمـدی سـەمڕانی لـە کتێبی (بارقـات السـرور و لامعـات النـور)دا لـە لاپـەڕە ٣٤١ نووسـیویەتی ئـەڵێ: حەزرەتی شێخ عوسمان سراج الدین فەرموی: بەیانیەك لە پاش نوێـژی صـبح محمـد و عبدالرحمن حازر بوون لـە لام لـەناکاو حـەزرەتی ئیمـامی طـەریقـە خواجـە محمـد بهـاء الدینی نەقشبەند وە حەزرەتی غوث الأعظم شێخ عبدالقادر گـەیلانی قـدّس الله تعـالی

(١) وەك لە وەصیەت نامەکەدا (ئامۆژگاری) بەیان کراوە.

(٢) لە لاپەڕە (٩)دا باسکراوە.

(٣) لە لاپەڕە (٧)دا بەیان کراوە، لە ریاض المشتاقین لە باتی ١٢٨٤ ، ١٢٨٥ ئەڵێت.

سرّهما هەردوویان ظهوریان فەرموو، وە هەر بەو ئیشارەت و بەشارەتە، تەشریفی چو بۆ بەغدا لەو سەفەرا وەفاتی فەرموو رحمة الله تعالى عليه وە لە نزیکی حەزرەتی گەیلانی دفن کراوە، نازناوی موبارەکی (أبو الوفا) وە تەمەنی موبارەکی (۳۱) ساڵ بووە، وە حەزرەتی شێخ محمد بهاء الدين لە پایەی بەرزی ئیرشادا بە جێگەداری بردە سەر خوا پاداشتی چاکەیان بداتەوە لە جێگای گرۆی موسڵمانان.

**ك ۱۱۵ بص ۳٤۷**: لە پاش ئەوە کە حەزرەتی قطب العارفين حەزرەتی سراج الدين دنیای بێ بەقای بەجێ هێشت گرۆی جنّ و شیاطین بە جارێك غەڵەبەیان لێ کردم منیش عەریزەی پەرێشان حاڵی خۆم نارد، نووسیبووم: ئەمانە لە زەمانی حەزرەتی باوکی پایە بەرزت أعلى الله مقامه دەستیان لە من کورت کردبوو، وە هەرگیز ئازاریان نەئەدام، وە ئێستا گوایا جێگەیان بە خاڵی زانیوە وە هەل بە دەستکەوت ئەزانن، وەلامیان فەرموو بۆ خۆی بە پەلە بێت منیش خێرا چوومە خزمەتی ماوەی پانزە ڕۆژ ئەم بێچارەیە لە ژێر سایەی خۆیدا لە خزمەت خۆی بە پەرێزراوی و سەرپەشتکردنی باطینی هێشتمیەوە(۱).

شەوێ وام دی کە بۆ قاپی مەقامی بەرز و بەرێزی خۆیان داوای کردم، کە چووم ئەمدی یەکێکی تر هەم شێوە و وێنەی خۆم لەگەڵم دایە، ئەمری فەرموو کە ئەو ڕەفیقە هاوشێوەی خۆمەیان لە سێدارەدا، وە لەبەر قاپی بەرزی خۆیان هەڵیان واسی بە دیوارا وە منیان ڕوخسەت دا، وە منیش بە وێنەی باڵندە و پەلەوەر بە باڵ بە هەوادا ئەڕۆیشتم وە بە حاڵەتی ووشیاری دڵەوە ألله ألله م ئەوت تا گەیشتمەوە ماڵی خۆمان، کاتێ بە ئاگا هاتم زۆر خۆشحاڵ و شادمان و خاوەن زەوق و وەجد بووم پاش ئەوە ئیتر جارێ تر ئەو هێرشی جنّ و شیاطینەم نەدیەوە.

---

(۱) ئەم باسە جەنابی حاجی شێخ محمدی سەمڕانی ئەیفەرمووێ لە بارقات السرور لە بارەی خۆیەوە.

**ك ١١٦ بص ٣٤٨:** کاتێ **حەزرەتی بهاء الدین** قدّس سرّه نیازی تەشریف فەرمووتی حیجازی هەبوو من بە هۆی چەند مەعزەرەتێکەوە نەم توانی بڕۆم بۆ خزمەتی بۆ خوا حافیزی و ڕەوانەکردنی، کوڕی خۆشەویست و نوری چاوی خۆم **محمد أمین**م نارد لەباتی خۆم، بەیانی پێنج شەممەی ٢٥ ی مانگی رەجەبی سالّی ١٢٩٠ ی هیجری لە پاش بەجێ هێنانی نوێژی بەیانی لە واقیعەیەکی[1] ڕووناکدا بە خزمەتی گەیشتم تەماشام کرد تەشریفی لە ڕۆیشتنایە بۆ سەفەر، وە منیش بۆ ڕەوانەکردنی ڕۆژە ڕێگەیە لە خزمەتیا بۆ بەدرەقە[2] کردنی ڕۆیشتم لەو زاتەوە چەندەها لطف و میهرەبانیم لەگەڵ کرا، کە گەیشتە مەنزڵ بۆم دەرکەوت ئەمە دێی گوڵپە ئەمجا بانگی کردمە خزمەت خۆی دەستی پیرۆزیم چەند جارێ زیارەت کرد، عەرزم کرد قوربانت بم بە سەلامەتی ماوەی سەفەری ئێوە چەند مانگی پێ ئەچێ لە وەلاما فەرموی وەك خەبەریان بە من داوە ماوەی ١٠ دە مانگ ئەخایەنێ، وە هەر لەو ڕووداوەدا لە دڵما ئەترسام نەوا خوا نەخواستە لەو ڕێگەدا تووشی نارەحەتی و بەسەرهاتێ بێ، بە زەردەوە فەرمووی مەترسە هیچ لە من ڕوونادات وە بە سەلامەتی ئەگەڕێمەوە، وە ماوەیەك پێکەوە ئەبین و ئەمێنینەوە، ئەنجا هەر کات خوای تعالی مەیل بکات یەکە یەکە لەم گەردوونە ئەچینە دەرەوە[3]، لە پاش ئەوە هەر بە گوێرەی ئەو ڕووداوە بوو، ڕۆیشتنی حەزرەتی شێخ محمدی بهاء الدین خوا لێی

---

(١) واقیعە: لەگەڵ خەودا یەك شێوەیان هەیە، بەڵام واقیعە لە کاتێکایە سالیك بەرەو قیبلە مشغولّ بە رابیطە یان ذکری تایبەت یا موڕاقەبە ئەبێ لەوا شت ئەبینێ پێی ئەڵێن واقیعە.

(٢) بەدرەقە: ڕەوانەکردن.

(٣) مامۆستا حاجی شێخ محمدی سەمرانی ئەفەرموێ: لەم ڕووداوەدا زۆربەی خەلیفەکانی حەزرەتی سراج الدینم ئەدی (قدّس سرّه) لەگەڵما جیا جیا خۆشەویستی و میهرەبانیان دەرئەبڕی، شێخ مەعرووفی باقلاوایی لە ڕووی شۆخی و گاڵتەوە پێی ووتم حاجی محمد بە هەر فێڵ و حیلەیە بوو خۆتت داخلی ئەم گرۆی نەقشبندیە کرد ناکا بێدار بوومەوە.

خۆشنود بێ لە ساڵی ١٢٩٠ کۆچی دابوو لە مانگی شەعبانا وە تەشریف هێنان و گەڕانەوەی لە مانگی ربیع الثانی ١٢٩١ هیجریدا بوو.

**ك ١١٧ بص ٣٥١:** پێش ئەوە کە حەزرەتی شێخ محمدی بهاء الدین تەشریفی بفەرموێ بۆ سەفەری حیجاز دوو کتێبی دانراوی خۆم یەکەم معدن النّور، دووەم ئەم بارقات السروزە بۆ خزمەت جەنابیم بردبوو، کاتی گەڕانەوەی حەزرەتی بهاء الدین کتێبەکانی هەڵگرتبوو فەرموو بووی نوسخەی لەبەر بگرنەوە، کاتێ ئەکەوێتە ڕێ بۆ حەج ئەفەرموێ ئەم کتێبانە بگەیەننەوە بۆ حاجی محمد، حەزرەتی شێخ أحمدی برای حەزرەتی شێخ بهاء الدین کتێبەکان ئەدات بە دەس شێخ جەلیلی طالیشی‌یە بە ئەمانەت کە لە شاری سنەوە بۆم بنێرێتەوە، ناوبراو یا لە بیری ئەچێ یا لەبەر هۆیەکی تر کتێبەکانی لەگەڵ خۆی ئەبا بۆ طالش، کە بیستم زۆر پەرێشان بووم تا شەوێ لە خەودا لە کەعبەی معظمە خوا شەرەف و بەرەکەتی زیاد کات بە خزمەت حەزرەتی شێخ محمد بهاء الدین شەرەفدار و کامیاب بووم، باسەکەم عەرز کرد، دەسبەجێ دەستی کێشا و کتێبەکانی حازر کرد و فەرمووی: (ئەمە کتێبەکانتە هەڵیان بگرە و لەمەولا قسەی خۆشیان تیا بنووسە)کاتێ بە خەبەر هاتم نامەیەکم نووسی بۆ خزمەت جەنابی حاجی شێخ ئەحمەد[1] و بۆم نارد بۆ کتێبەکان، ئەو ڕۆژە نوسراوەکەم نارد لە ڕۆژئاوادا بە هۆی میرزا براهیمی برازای حاجی محمودی سنەیی‌یەوە هەردوو کتێبەکەیان لە لای طاڵیشەوە بۆ هێنامەوە و دایان بە دەستمەوە، وە ئەمەم بە دەستەڵاتێکی گەورەی حەزرەتی شێخ بهاء الدین زانی، چونکە لە طالیش تا وڵاتی ئێمە ماوەی ١٥ ڕۆژ ڕێگە دوورە لە هیممەتی ئەوەوە بە ئاسانی پێم گەیشتەوە.

---

(١) میانەی سەمەرانی تا تەوێلە کە کاغەزی بۆ حاجی شێخ أحمد نووسیوە سێ ڕۆژ زیاترە وە لە سەمەرانەوە تا طالیش کە لەسەر دەریای سەوزە لەسەر سنوری ئێران بۆ روسیاوە ١٥ ڕۆژ ئەبێ بە سواری وولاغ ڕەنگبێ زیاتر بێ.

وە ئەم ڕووداوە لە ڕووداویٚ ئەچیٚ کە لە کتێبی (رشحات)دا دانەرەکەی کە مولانا علی کوڕی مولانا حسینی واعیظی (هرات خاوەنی تفسیری مواهب)ە دیومە کە ئەمەش ئەو کەرامەتەیە کە ئەفەرمویٚ: حەزرەتی شیٚخ عەلی رامەیتەنی کە یەکێکە لە مەشایخە گەورە گەورەکانی نەقشبەندی قدّس الله تعالی أسرارهم لەگەڵ سید (أتا)کە ئەویش یەکیٚ بووە لە مەشایخی تورك و هاوچەرخی یەك بوون کەمیٚ ساردی و ناکۆکی ئەکەوێتە بەینیان، حەزرەتی خواجە[1] علی رامەیتەنی بە هۆی ئەو ساردی و ناکۆکی‌یەوە کە خوا لیٚ خۆشبوو شیٚخ ئەتا[2] لەگەڵیا ئەی کات دڵی ئەڕەنجیٚ، ڕۆژیٚ لە سەحرا تاقمی تەراکمە[3]، کوڕی سید ئەتا ئەگرن و ئەیبەن بە دیل، باوکی هەر چەن هەوڵ ئەدا و کۆششی ئەکا مەڵبەندی نازانیٚ و بۆی پەیدا نابێتەوە.

ئەنجا لە ڕووی ئینصافەوە ئەڵیٚ ئەم بەلا بە هۆی لیٚ زویر بوون و ڕەنجانی حەزرەتی عەزیزانەوەیە[4]، پێویستی میوانی پێکەوە ئەنیٚ و دەعوەتێکی جوان ئەکات،

---

(١) خواجە: ووشەیەکی تورکی‌یە یانی گەورە.

(٢) أتا: بە تورکی یانی باوك وە شیٚخ أتا یانی شیٚخ بابە بەلاّم لە زمانی کوردی شیریندا پێچەوانە ئەبێتەوە و ئەڵێن بابە شیٚخ لە جیاتی شیٚخ بابە.

خواجە عەلی رامەیتەنی قدّس سرّە خەلیفەی شیٚخ محمودی ئەنجیر فەغنوی‌یە وە خۆی مرشید و دەستگیری بابا محمدی سەماسی‌یە، کە ئەم بابا محمدە خەلیفەی شیٚخ محمودە، وە دیسان بابای سەماسی مرشید و دەستگیری شیٚخ ئەمیر کولال بوە، کە حەزرەتی شیٚخ أمیر کولال مرشید و دەستگیری حەزرەتی شاهی نەقشبەند بوە، مەرقەد و ئارامگای حەزرەتی بابای سەماسی لە ناوچەی گەرمیانە لە کوردستانی عیٚراق لە نزیکی کەلارە لە پارێزگای سلێمانی لەگەڵ حەزرەتی پیر خۆی لە ساڵی ١٤٠١ کۆچی کە تەشریفی فەرموو بۆ گەرمیان و زیارەتی فەرموو دوو جار بە کورتی چوین وە زیارەتی کرا.

(٣) تەراکیمە: یانی کۆمەڵێك لە تورکمان.

(٤) حەزرەتی خواجەی عەزیزان: نازناوی حەزرەتی شیٚخ عەلی رامەیتەنی‌یە. (وەرگێڕ).

خواجەی عەزیزان (قدّس سرّە) لە رامەتین لە دایکبوە، ئەم دێیە دوو قوناخ لە شاری بوخارای شەریفەوە دوورە، وە لەو دێیەش گەورە بووە و پێگەیشتوە، لە ساڵی ٧٢١ هیجری لە رۆژی دوو شەممە

وه زۆر له ئەکابیران و گەوران بانگ ئەکاتە سەر ئەو دەعوەتە، کاتێ کە حەزرەتی عەزیزان، تەشریف ئەهێنێ وه سفره و خوان بە طعام و خواردنی بەتام و لذیذ ئەرازێنێتەوه ئەفەرموێ: عەلی دەس بۆ طعام نابا و لەم نمەکە[1]، ناچێژێ تا کوڕی سیّدی ئەتا حازر نەبێ، حازرانی مەجلیس بەسەر سوڕمان و تەعجوبەوه دەس بۆ خواردنەکە نابەن، له پاش ماوەیه زۆر کەم لەناکاو کوڕەکەی شێخ أتا پەیدا ئەبێ و له دەرگاوه دێته ژورەوه، دەنگ و خرۆشی خۆشی و شادی و سرور لە مەجلیسەکە بەرپا ئەبێ وه شادمانیەکی زۆر ئەکەوێتە ماڵ و مەجلیسەکەوه ئەنجا دەس بە نان خواردن ئەکەن دوایی کە نان و طعام خواردن تەواو ئەبێ لە کوڕی **سید ئەتا** پرسیار ئەکەن ئەمه له کوێ بووی؟ وه چۆن گەشتیتەوه؟ ئەڵێ نازانم هەر ئەوەندە بوو تاقمێ تورك گرتمیان بردمیان بۆ فلاّن شار و فرۆشتمیان ئەمجا بردمیانە دێیە لە ماڵی ئەو کەسەیا بووم کە منی کڕیبوو، گۆزەیەکی دا بە دەستمەوه ووتی بڕۆ ئاو بێنە منیش لە دێ دەرچووم، وه ئێستە خۆم لێرە ئەبینم[2].

**ك ١١٨ بص ٣٥٢:** میرزا ڕەشیدی برام لە سەر زەوی و زار کە ساڵەهای ساڵ بوو ئەزیەتی ئەدام وه هەردەم هەوڵی ئەدا کە بمخات بە ناحەق، وه چەن جار پەلاماری ئەدام و فڕوفێڵی دروست ئەکرد بۆ ئەوەی هەلێکی دەستکەوێ نابووتم بکا و بێ خایە و مایە بمێنمەوه لە موڵکی سەمڕان و گەزگەزارە و لە هەر بارێکی ترەوه بۆی ڕێکەوت چنگێکم لێ بدات، منیش بە ئیستیمداد و داوای کۆمەکی لە ئەرواحی

١٨ ذوالعقده له تەمەنی ١٣٠ ساڵیدا بە ڕەحمەتی خوا چوه. یانی بەینی خواجەی عەزیزان تا **شاهی نەقشبەند** دوو واسیطە هەیە.

(١) نمەك: بە فارسی یانی خوێ وه لەناو خۆمانا ئەڵێین نمەکی ناکەم، یانی خوێی ماڵی ناچەژم.

(٢) حاجی شێخ محمدی سەمڕانی ئەفەرموێ: ئەم کەرامەتی خواجەی عزیزان (خواجە عەلی رامەیتەنی) (قدّس سرّه) کە لە کتێبی ڕەشەحاتدا عەرزتان کرا وەك هێنانەوەی کتێبەکانی من وایە.

مەشایخانی گەورە گەورە و پاڕانەوە و داواکاری لە هیممەتی بەرزیان هەموو فێڵ و داوێکی بەتاڵ ئەبۆوەو، وە کەڵەکی نالەباری و بێ بەزەیی‌یانەی ئەڕووخا، لەم دوایی‌یەدا دوای وەفاتی پیر وەك پڵنگی بریندار شاولی هێنایەوە بەو پەندەی کە ووتراوە (نوقوم بوو دەست ئەبات بۆ هەموو پووشێ)[1] یان نقوم بوو لە ئاوا شاوڵ ئەبا بۆ هەموو پووش و پەلاشی، چوو پەنای بە یەکێ لە وەزیران برد بو، بە بۆنەی پارێزگاری وەزیری بێ محبەت وە بە هۆی صندوق عەدالەتی پادشا بە هەزاران فێڵ و ناجۆری بە عەریزەیەکی بێ ڕەحمانە و هەڵمەتێکی بێ بەزەیی‌یانەوە هاتەوە مەیدان، وە شازادە حشمة السلطنة کە لەو کاتەدا فەرمانڕەوا بوو حەوالەی شەرعی کردین و ناردینی بۆ لای جەنابی ملا هیدایەت الله شێخ الإسلامی کوردستان لە سنە، چونکە ئیشی نالەبارانە بوو بێ ئەوەی بترسێ وە یا شەرم بیگرێ لەو کۆڕە بە شەرەفەدا هەتا توانی خۆی و ڕۆستەمی کوڕی جوێن و ووشەی نالایق و ناڕەوایان پێ ووتم بەلام من هیچ قسەم نەکرد و کارەکەی بۆ نەچوە سەر، کەوتە شەو لەماڵەوە بە حاڵی دڵتەنگی و ناڕەحەتی و بێ دەسەلاتی نامەیەکی شەرحی ئەحواڵم نووسی و ناردم بۆ خزمەت حەزرەتی پشت و پەناهم شێخ محمد بهاء الدين وە ئەم هەڵبەستەم نووسی[2]:

لە فیرنە گول کەمترم، دوژمن کەوتۆتە سەرم
تۆ نجم الدینی وەقتی، نەظەرێ بفەرموو عەمرم

بە ئەم تاقە شیعرە دەردی دڵی خۆم نووسی و ڕەوانەم کرد، چونکە ئەم شیعرە خۆی هێمایە بۆ ئەم ڕووداوە کە ئەویش ئەمەیە:

ڕۆژێ حەزرەتی شێخ نجم الدینی کبری (قدّس الله سره العزیز) کە ڕەئیس و پێشەوای طەریقەتی کوبرەوی‌یە لەبەر هەیوانی خانەقای خۆی تەشریفی دائەنیشێ،

---

(۱) لە عەرەبی‌یەکەدا ووتراوە: الغريقُ يتشبث بكلّ حشيش.

(۲) ئەمە فارسی‌یەکەیەتی: من أز ان صعوە ئم کمتر عدو چون بازم أندر سر
تو نجم الدين صفت جانا بأين صعوە نظرآ وەر

چاوی لیّ ئەبیّ ئەوا (باز)یّ کەوتۆتە دوای باڵندەیەکی بچووك و بە هەوادا ئەی هێنیّ تـا ئەگاتـە بەرامبـەری حەوشـە و حەسـاری خانەقاکـەی، لـەوەدا ئـەبیّ کـە بیگـریّ، حـەزرەتی شـێخ نجـم الـدین لـە ڕووی غیرەتـەوە نـەظـەریّ لـە صـەعوەکە[1] ئـەکات دەسبەجیّ توانایەکی بۆ دێتە دی وەرئەگەڕێتەوە بازەکـە ئـەگریّ لـە هـەمان حەوشـە و حەسارا لەبەردەمی شێخدا دای ئەنیّ لەم تصرّفی حـەزرەتی شـێخەوە هـاوار و هـەرا لـە حازرانەوە ڕووئەدات[2].

منیش هەروا بۆ حەزرەتی شێخ بهاء الدینم نووسی پەنام پیّ برد، چونکە خۆم لـە صعوە کەمتر و بیّ هێز و لاوازتر ئەزانی و و ئەهاتە پێش چاو، وە بۆ ئـەم مەبەستەیە کە بوێژیّ لە هەڵبەستەکەیدا ئەفەرمویّ:

بە سووك مەگرە فەقیری بەڵکو بە ماوەی ئانیّ
نوێژیّ بکا و سەری خا دەستی قەدەر زەمانیّ[3]

بەڵیّ ئەو شەوە کە ڕۆژەکەی نامەکـەم نـووسی بینیم لـە خـەوما دوو قـاپی پڕ لـە هەنگوینم هەیە هەردووکیان گەورە و ئەستورن وە بەسەر یەکا کەوتبوو لە لای بەشی

---

(١) صەعوە: پەلەوەرێکی بچووکە کە لە ریزی چۆلەکە بەلاّم ئەمیان بچووکترە کەمیّ.

(٢) وەرگێڕ ئەڵیّ ئەم ڕووداوەی حـەزرەتی شـێخ نجـم الـدین لـەم ڕووداوە ئـەچیّ کـە عـەرزتان ئـەکریّ: یەکیّ لە ڕیزی خواناسان و پیاوچاکاندا شێریّ ئەخاتـە ژێر دەسـەلاّتیەوە بـە سـواری ئـەو بـەم لاو لادا ئەچیّ، کە هاوچاخی حەزرەتی گەیلانی ئەبیّ (خوا لیّ خۆشنود بیّ، قەبری پڕ نوور بیّ) وە ئەچیّ بـۆ بـەغا بە سواری شێرەکە و میوانی حەزرەتی گەیلانی ئەبیّ، کە ئەی بینیّ ئـەو بـازاڕەی لا جـوان نـابیّ حـەزی پیّ ناکات.

توولەیەك کە لە قاپی ئەو زاتەدا ئەبیّ بە ئیشارەی معنوی هەڵمەت ئەدات لە شێرەکە وە ئـەو شـێرە بێچـارە سك ئەدڕیّ و لەناوی ئەبا، ئیشارە بەمە ئەم شیعرە ووتراوە:

سەگبە لـە قـاپی غـەوثـا بـۆ فـەیـز ئـەگـەر بتـوانی
بە شەرەف ترە لە شێران سەگەکەی دەرگای گەیلانی

(٣) ئەمە دەقی عەرەبیەکەتی: لا تهین الفقر علّك أن     ترکع یوماً والدهر قد رفعهُ

سەرەوەی قاپەکە کەمێکی لێ شکابوو، بە (محمد أمین)ی کوڕم ووت وەرە با نەهێڵین ئەمە خەسار بێ ناکا مارێکی ڕەش وەکوو تیرەگێکی ئەستوور وەهابوو[1]، دوو گوێی درێژیشی هەبوو لە لای هەنگوینەکە حازر بوو بەرەو نزیکی ئەهاتە پێشەوە لە پڕ بە هەوادا دەر ئەپەڕی وە بەرز ئەبووەوە لەم لا بۆ ئەو لاو خۆی ئەدایەوە بە زەویدا، دووبارە هەروا هەڵمەتی ئەدا و ئەکەوتەوە زەوی، زۆر ترسام و ناڕەحەت بووم کتوپڕ یەکێ لە دۆستان حازر بوو بەوم عەرز کرد ئەم مارە بکوژە، دەسبەجێ بە گۆچانەکەی دەستی چەند جاری دا لە مارەکە و خستییە سەر زەوی تیغی لێ دەرهێنا و سەری بڕی، ماوەیەکی پێچوو حەزرەتی شێخ ئەمری فەرموو بە کاتب و نووسەرەکەی کە وەڵامی بەندە بەم جۆرە بنووسەرەوە.

(فإنّ مع العسر یسراً إنّ مع العسر یسراً)

کاروبار لە کوێ زەمانە ئەیکا      هیممەتی بەرزی مەردانە ئەیکا[2]

وە فەرمایشتی حەزرەتی شاهی نەقشبەندە (قدّس سرە) کە فەرموویەتی:

لە ڕیزی غولامـان بە مەترسە      خاکی بەردەرگامان بە مەترسە

عالەم گشت قەصدی گیانی تۆ بکەن      دڵت بێ و هی خۆمان بەو مەترسە[3]

لە هیممەتی ئەو زاتەوە بە چەشنێ ڕزگارم بوو هەموو خەڵکی سەریان سڕما بوو زۆری نەبرد لە ڕۆژی دوو شەممە کاتی نیوەڕۆ ٢٠ بیستەمی مانگی جمادی دووەم

---

(١) تیرەگ: کۆڵەیەکەیە ئەی دەنە ژێر داری سەقف و بنمیچی خانوەکە کە شکابێ.

(٢) ئەمەش دەق (نص)ی فارسییەکەیە: کار نە إین گنبد گردان کند    هر چە کند همّت مردان کند

(٣) ئەفەرموێ لە فارسییەکەدا:

رود در صف بندگان ما باش و مترس      خاك در استان ما باش و مترس

عالم همە گر قصد بجان تو کنند      دلداری قوی ازان ما باش و مترس

ساڵی ١٢٩٤ هیجری (هەزار سڵاو و درود بۆ ڕۆحی پاکی پێغەمبەر) بە ڕەحمەتی خوا چوو (وكان أمر الله قدرا مقدورا) صدق الله العظيم[1].

غـەیری تەسـلیم و ڕەزا كـوا چـارەیە    قەت لە دەست شێرێکی وا خونخوارەیە

---

(١) شێخ سیف الدین باخرزی خەلیفەی حەزرەتی شێخ نجم الدینی کبری (قدّس سرّهما) ئـەم چـوارینەی بە شێوەی (تەڵقین) بەسەر مردوویەکەوە خۆندۆتەوە:

گەر من گونـاحی دنیـام کردووە    لـە هیوای لوطفت هانـام بردووە
فەرمووت دەستگیرتم لە تەنگانەدا    لەمە تەنگتریش کە لـەش مردووە

ڕاستە هەرچی أولیاء الله و خۆشەویستانی خوایە ئـەیکات (وما رمیت إذ رمیت ولکنّ الله رمى) ئەگـەر ئەمیرێ دەستوور بدات بەسەربازێکی بۆ کوشتنی یەکێ دروستە بڵێی فلان سـەرباز فـلان کـەسی کوشـت وە دروستە بڵێی ئەمیر کوشتی هەروەها (قل یتوفکم ملك الموتِ الّذي وکلّ بکـم) ڕاسـتە بـە مجاز [الله یتوفی الأنفس حین موتها]ڕاستە حقیقةً، یانی یەکـەم مـەجازییە دووەم حقیقـییە، هـەروەها کاروبـاری أولیاء الله قدّس الله أرواحهم نیسبەت لەوانەوە ئەدرێ بەڵام حەقیقەت هەر لە خواوەیە.

لێرەدا بەم بۆنەوەیە فەرموودەی حەزرەتی شاه عبدالله دەهلیم لە یادە کـە لـە (درّ المعـارف)دا فەرموویـەتی: هەندێ لە ئـەولیا کـاتێ (ملـك الموت) گیـانی ئەکێشێ و لـە ئـاوریشمی بەهەشـتییەوە ئەیپێچی لـەناکا لـە دەسیان دەرئەچێ وەخۆی بە حضوری خوا ئەگەیێنێ، وە هەندێ لە أولیـاء الله کـاتێ ملائکة الـرحمن دێـن ڕۆحی بکێشن خۆی ئەگەیێنێتە مقامێ لە قوربی إلاهیدا، ئـەو فریشتـە راسـپێراوانە مجـال و مـاوەی گـەیشتنە جێگەی ئەویان نابێ خوا خۆی گیانیان وەرئەگرێ و ئەی مرێنێ وە ئەو دوو ئایەتـە پـیرۆزە بـەم مانایـەش دەس ئەدەن، ئەوەی یەکەم (قل یتوفاکم ملك الموت) لەگەڵ باقی خەلایق لـە شـأنیانایە، وە بـۆ دەسـتەی دووەم: (الله یتوفی الأنفس حین موتها) خەلاتی گیانیانە (ربّنا لا تؤاخـذنا إن نسینا أو أخطأنـا) پێغەمبـەری موبارەك ﷺ ئەفەرموێ: (إنّ أحدکم یجمع خلقه في بطن أمه أربعین یوماً نطفةً ثمّ یکون علقةً مثل ذلك ثمّ یکون مضغةً مثل ذلك: ثمّ یرسل الله الملك فینفخ فیه الـروح ویؤمر بـأربع کلمـات رزقه وأجلـه وعمله شقي أم سعید فوالله الّذي لا إله غیره إنّ أحدکم لیعمل بعمل أهـل الجنـة حتی مـا یکون بینه وبینها إلاّ ذراع فیسبق علیه الکتاب فیعمل بعمل أهل النار فیدخلها, وإنّ أحدکم لیعمل بعمـل أهـل النـار حتی ما یکون بینه وبینها إلاّ ذراع فیسبق علیه الکتاب فیعمل بعمل أهـل الجنـة فیدخلـها. رواه البخـاري ومسـلم. نسأل الله اللطف.

**ك ١١٩ بص ٣٧٠:** ڕۆژێ لە مەجلیس حەزرەتی شێخ محمد بهاء الدیندا حازر بووم، تەزبیحێکی لە گیرفان دەرهێنا دڵم چوو لەو تەزبیحە ووتم لە دڵی خۆما کاشکێ ئەو تەزبیحەی بە من ببەخشیایە ماوەیە بەسەر ئەو خەیاڵەدا چوو فەرمووی وەری بگرە و هەڵی بگرە خەلاتی کردم ماوەیەکی پێچوو چوم بۆ کوردستان لە سنە، ڕۆژێ چووم بۆ ماڵی میرزا عبداللەی کوڕی میرزا جافر کە برازایەکی خێزانی ئەو بوو کچێکی بچووکیان بوو هێنایان بۆم لەو کاتا شتێ وام پێ نەبوو بیدەمێ، تەزبیحەکەم لە گیرفان دەرهێنا و ووتم تەزبیحی حەزرەتی شێخە (بە گومانم پاش ئەوە من لەوێ نەبووبم گاڵتەیان بە تەزبیحەکە کردبێ وە بێ وێڵییان بەرامبەر بەکارهێنا بێ) لە شەوێ ترا لە خەوا بە خزمەت حەزرەتی شێخ بهاء الدین گەیشتم بە هەیبەت و سامێکەوە تەماشای کردم ووتی تەزبیحی حەزرەتی شێخە کە خەبەرم بووەوە مەعنایەکم وەرگرت، وە بارێ قورس کەوتە سەر شانم، لە پاش چەن ڕۆژێ هەواڵم بیست تەزبیحەکە پچڕابوو، دوا بە دوای ئەوە کچەکە مرد پاش ساڵێك باوکیشی ئەمری خوای بە جێ هێنا وە ئەو ماڵە بە تەواوی وێران بوو **(ذلك تقديرُ العزيز العليم)**.[١]

**ك ١٢٠ بص ٣٧٢:** ڕۆژێ کوڕی دڵبەندی خۆم شێخ محمد أمینم نارد بۆ خزمەتی حضوری دڵ پڕ لە نوری حەزرەتی شێخ بهاء الدین لە جیاتی خۆم کاتێ گەڕایەوە ووتی کارێ زۆر سەیر و کەرامەتێ زۆر گەورەم لە حەزرەتی شێخ چاو پێکەوت ووتم بیلێ بزانم چیت دیوە ووتی پیاوێکی خەڵکی تەوێڵە بە قەزا و قەدەر یەکێکی تری کوشتوە، کەسوکاری کوژراوەکە کۆبوونەوە بە مەبەستی تۆڵە وەرگرتن لە بکوژەکە و بە تۆڵەی خۆی بگەیەنن، کاتێ هێرشی بۆ ئەبەن ڕائەکا خۆی ئەخاتە خانەقاوە و فرسەت ئەهێنێ خۆی ئەگەیەنێتە سەر مەزاری سراج الدین ئەنجا ئەو کۆمەڵە بە نیەتی ئەوەی کە دەری بکێشنە دەرەوە و بیکوژن ڕوو بە خانەقا هێرش ئەهێنن، بەلام کۆمەڵی مرید و مەنسوب کە لە خانەقادا ئەبن بڕیار ئەدەن کە ئەو

پیاوە نەدەن بە دەستەوە و تا ئەتوانن بەربەرەکانیان بکەن و لەگەڵیان بە شەڕ بێن[1]، لەم دوو تاقمە ئاشووبێ گەورە بەرپا بوو، حەزرەتی شێخ (قدّس سرّە) کە بەمەی زانی لە حەرەمی خۆیانەوە تەشریفی بەرەو خانەقا هێنا و مریدەکانی بێ دەنگ کرد خۆیشی ڕوو بەناو دێی تەوێڵە و کۆمەڵێ مدّعی کرد بە ماوەی دوو سەعاتی تەواو چووە موراقەبەوە بە دانیشتنەوە، لە هەردوو لاوە خەڵکی دڵتەنگ حەیران بوون و چاوەڕوانی پشێوی و ئاژاوەیەکی گەورە ئەکرا، لەناو کۆمەڵی خێڵی کوژراوم دی کە لە سەد کەس زیاتر ئەبوون کە زۆربەیان مەست و مەجذوب بە ناڵە ناڵ و هاوارەوە هاتن ڕووی خۆیان ئەسوو لە خاکی ئاستانەی حەزرەتی شێخ، وە دەستیان بە دامان و چاکی حەزرەتی شێخ پێچا و دەست و پێیان ماچ کرد وە بەسەد گەردن کەچی و جۆشی دڵەوە لە خوێنی کوژراوەکە خۆشبوون وە براکانی کوژراوەکە بێ وەستان ڕۆیشتن لە حوجرەی مەزاری حەزرەتی سراج الدین هێنایانە دەرەوە و بردیانە خزمەت حەزرەتی شێخ وە بە دەوریا گێڕایان و لە حەقی خۆیان خۆشبوون و بە تەواوی بەخشیان، وە بە سەد میهرەبانی و خۆشەویستی‌یەوە دەستیان گرت و بردیانەوە ناو ماڵ و منالی خۆی، ئەمجا لەم تصرّف و توانا و دەستەڵاتی حەزرەتی شێخەوە چ لەناو خانەقا و چ لە دەوروبەری کە ئەمەیان بە چاو دی لەگەڵ هەزاران ئیخلاص و باوەڕ دەستیان ماچ کرد بە سوپاس و مەرجی ئەو قوطبی زەمانە وە هەموو لایەك دڵشاد و کەیف خۆش بوون لەم هیممەتە بەرزەوە و لەم کەرامەتە گەورەیە:

کۆبوونەوە گشت گرۆی دڵ بەقین | لە قاپی شێخا دەم بە پێکەنین
دەورەیان لێدا ئەو وەك چرایە | لەناو ئەوانا هەریەك لە لایە
ئەیوت فریشتەی یا پەری وێنە | کە دڵی ئێمەت کرد بە ئاوێنە

(١) چونکە خۆی فڕێ داوەتەوە خانەقاوە غیرەتیان قبووڵی نەکردووە.

هەرچی هەی گیانمان بێ بە قوربانت		دەستو بردت کرد گیان فیدای گیانت
بە ئاوی هیممەت ئاگرێ وا زووت		لەناوبرد خۆشبی بۆدەستوبازووت[1]

**ك ١٢١ بص ٣٧٥:** پیاوێ نوێنەری حکمداری جوانڕۆ ئەبێ، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا ڕووداوێ دێتە پێشەوە هەندێ لە مرید و مەنسوبانی حەزرەتی شێخ بهاء الدین تیادا تووش کران بە ناڕەوا، ئەوە بوە هۆی ئازار و ناڕەحەتی مریدان و هاوپەیوەندی‌یان شێخ لە دەس ئەم کابرایەوە، جەنابی شێخ بە شێوەی ئاشکرا و دیار هەوڵیدا لەم بارەوە بۆ لابردنی ئەو گیروگرفتە، بەڵام کابرا لە ئەزیەت دانی خۆی ناکەوێ واز لە ئەشکەنجە پێدانی مریدان ناهێنێ هەتا ئەتوانێ وە لە دژایەتی شێخ کەمتەرخی ناکا، لەگەڵ ئەوەشدا زوتر لطف و هیممەتی شێخی دەربارەی خۆی دیبوو، وە خودی خۆی دانی بە گەورەیی ڕێزی ئەو زاتە کردبوو بەڵام إذا جاء القضاء والقدر ذهبَ السمْعُ والبصر چاوی لەو هەموو چاکە و نیعمەتانەی کە دەربارەی کرابوو لەو زاتەوە کوێر بوو، وە بە ئارەزووی خۆی چی نالەباری و بەد کرداری بوو کرد، حەزرەتی شێخیش لە دوای بەکاربردنی نەرمی و چاوپۆشی و لێ بووردنێکی زۆر ئیتر کاسە پڕ ئەبێ دەستی باطنی و کوورەی ئەولیا دێتە جۆش.

---

(١) دەقی فارسی‌یەکە:

جمـع گشـتند ان گـروه پـر فسـاد		بـر در شـيخ جهـان خنـدان و شـاد
حلقـه بستنـد أو چـه شمعـی در ميـان		سجـده أورد نـدش انصـحرائيان
تـو فريشتـەی اسمـانی يـا پـری		كـين كـدورت أز مـاميبری
هـر چـه هسـتی جـان مـا قربـان تسـت		دست و بردی دست و بازويت دروست
رانـد حـق ايـن اب را در جـوی تـو		افـرين بردسـت و بـر بـازوی تـو

ئــەوليا لـــە جێــی پێغەمبــەرانن بــەو جێــداریـیــە زۆر کامــەرانن

هەڵمــەتی دەسی ئــەولیای خــودا لە هەڵمـەتی حـەق کـەی ئـەبێ جـودا

فـــبي يبصـــــر وبي يســـــمع وبي يـــــبطشْ لهـــــم يجمـــــعْ

وە بە چەند نەخۆشی‌یەکی دژی یەکتری گیرۆدە ئەبێ کە دەرمـانی ئـەمیان دژە بـۆ نـەخۆشی‌یەکـەی ئـەویان وە بـە جۆرەهـا بـەڵا کۆسپی دژی یـەکتری تـووش ئـەبێ بـە چەشنێ پزیشکەکان چارەسەریان بۆ ناکرێ و بە هیچ تەکبیرێ ڕزگـاری نـابێ وە هـەر لەو کاتەدا دوو برای گەورە و بەڕێزی مـەولانا ئەحمـەدی نـۆدشی جـەنابی مـلا جـلال الدین وملا أفضل الدين بـوون بـە میوانم، ووتیـان ئێمـە لـە خزمـەت حـەزرەتی شێخ محمد بهاء الدين بووین لە خزمەتیا قسەی بێ ئەدەبانە و کرداری ناشیرینی فەرمانـداری جوانڕۆیان بە شکات عەرز کرد، شێخ فەرمووی شەرت بێ بیکەمە گریان.

ملا أفضل الدين ووتی: من لە خزمەت شێخ ئیجازەم وەرگرت و چووم بـۆ لای حاجی ملا أحمدی کاکەم پێکەوە ڕۆیشتین بۆ سەردانی حـاکمی جـوانڕۆ، کـە چـووینە ئەوێ بە هـۆی بێچـارەیی دەردە هەمـە چەشـنەکانیەوە لەبـەر ئـازار و ئێشـی کـە بـووی ئـەگریا و ئـەی ووت ئەترسـم خـەڵك وا بـزانن و بڵـێن ئـەم ناڕەحـەتی و بێحاڵیـەم کەرامەتی شێخ محمدە.

ئاخری کـاکم بـە چـەند پـەند و ئامۆژگـاری‌یـەکی شـیرین و ڕەنگین لـەم بـارەوە وەری گێڕا بۆ بارێکی تر چەند پەشیمانی و داوای لێ بوردنێکی پێ نووسی بۆ شێخ و پێی نارد بەڵام دۆعـا و داواکـاری پێشـان کاریگـەر بـوو جێگـەی خـۆی نەگرتـەوە تـا کاری بە دەردێ چوو بردیان بۆ بە دەربەدری لەوێوە بۆ کرماشان و لـەوێوە بـۆ تـاران و لەوێوە بۆ تەورێز و لەوێوە بۆ هەولێر بردیان و ئیتر نەگەڕایەوە بۆ نـاو مـاڵ و منـاڵ و خێزانی والله لا يحبّ المستهزئين[1].

---

(١) حیکایەتێ وە بەسـەرهاتی لـە کتێبی —نفحـات-دا هەیـە لـە بـارەی لـووت بەرزیـەوە عـەرزتان ئـەکرێ ئەفەرموێ: شـێخ أبـو بکری نیشاری پیـاوێکی گـەورە بـوە سـامان و خـێڵ و کەسـوکارێکی زۆری بـوە،

ك ١٢٢ بص ٣٨٤: خێزانێکی (سەمڕانی)م بوو قەزا و قەدەر لێی جیابوومەوە و تەلاقمدا وە بە بۆنەی پەرێشانی حاڵ و منالی زۆر و شکستە بالیەوە عەریزەیەکم نوسی و ناردم بۆ خزمەتی حەزرەتی پیر، بەیانییەك لە دوای نوێژ لەبەر نارەحەتی هێزم نەبوو ویردەکانی دوای نوێژ بخوێنم ڕوو بە زەوی کەوتم لە هۆش خۆم چووم حەزرەتی شێخ ظهوری فەرمووو وتی

مەخۆ خەم مەخۆ بەختی شیرین خوو　　　پەچەی بە پەنجەی لائەدا لە ڕوو

فارسییەکەی ئەمەیە:

غم مخور غم مخور که شاید بخت　　　عاقبت برکشد زچهره نقاب

بە حاڵەتێکی خۆشەوە بە خەبەر هاتم بەدوو سێ ڕۆژی دوا ئەمە چووم بۆ شاری سنە بۆ ئافرەتێکی باشی وا کە لەگەڵ حاڵ و ماڵما بگونجێ کەوتمە پرسیار بۆی چەند کچ و بێوەژنیان بۆ هەڵدام یەکێ لەوانە زبیدە ناوێکی بێوەژنیان بۆ هەڵدام کە پێیان ئەووت کچی خواجە سەعدی دایك و باوکی مەنسووبانی خانەدانی نەقشبەندی بوون لەگەڵ ئەوەم دی دڵم چوە سەری ناردمە خوازبێنی ڕەزامەندی پیشان نەدا بە کورتی تا نزیکەی چل شەوێ لەسەر یەك پیاو و ژنم ئەنارد نەرم نەبوو، هەر ئەوەم بە چارە

---

خۆیشی ئەهلی ئەحواڵ و دڵی صاف بووە، زانێ تر خواجە سهل ناو خاوەن سەلاحەت و خواناسی ئەبێ بەلام بۆ دنیا کەم دەست و هەژار بووە، وە هەروەها گوێی بە دنیا نەداوە و کەم ئەحواڵ بوە، ڕۆژێ لە جێگەیە تووشی یەك ئەبن بە سەهل ئەڵێ نایەیت بۆ لام ئەویش ئەڵێ دێم لەبەرم هەڵ ناسی تەماشام ناکەی خۆت بە زل ئەگریت و من پەست تەماشا ئەکەی، ئەویش ئەڵێ وەرە لەبەریشت هەڵ ئەسم و ڕێزیشت لێ ئەگرم لە کاتێکا ئەچێ بۆ لای هەڵ ئەستێ و ڕێزی لێ ئەگرێ، کاتێ کە هەڵ ئەسێ بڕوا و خوا حافیزی ئەکا هەڵ ناسێ خواجە سهل هەڵ ئەگەڕێتەوە ئەم چوارینە ئەخوێنێتەوە:

ئەمن ئەگەر چی عەیالم زۆرە　　　سامانم نیە و قەرزم لە لایە

بە ڕۆزی خودا گوزەران ئەکەم　　　پێویستیم لە بەین خۆم و خودایە

ئەمەی ووت و چوە دەرەوە ئیتر نەهاتەوە بۆ لای جارێکی تر.

وەرگێر ئەڵێ خواجە سەهل ئەمەی خۆندەوە:

إنّي وإن كنت ذا عيال, قليل مالٍ كثير دين, لمستعف برزق ربّي, حوائجي بينه وبيني

ئەزانی کە حاڵی خۆم بە عەریزەیەك لە حەزرەتی شێخ بهاء الدین بگەیەنم چۆنیەتی باسەکەم نووسی و ناردم، بە گەیشتنی نامەکە دڵی هاتە نەرمی دەستبەجێ ڕێگەی مارەکردنیدا[1] منی هەژار و داماو لە تەمەنی ٥٧ ساڵیا ئەم ئافرەتە مەستورەم مارە کرد، وە هەرگیز هێزم لە خۆمدا نەئەبینی بەڵام لە بەر چەن هۆیەك بەوە ناچار بووم

(١) لە کتێبی (نفحات الأنس) کە خوا لیٚ خۆشبوو مەولانا ملا عبدالرحمن جامی دایناوە نوسراوە: کە جەنابی شێخ الإسلام أحمد زەندەفیل قدّس سرّه لە شاری هورات بووە خاوەنی خانەقا و دەستگیر و مرشیدی طەریقەت بوە، لەو کاتا زاهید و خواناسێکی هەراتی کە ماوەی ١٢ ساڵ ژنێکی بە کچیەتی هێناوە و هەر وا ماوەتەوە توانای چوونە لای نەبووە، ئەچیٚ بۆ دیداری شێخ، وە لەویٚ لە روی بلیمەتی و دانایی‌یەوە شێخ بە حاڵەکەی ئەزانیٚ پێی ئەفەرمویٚ: ئەی زاهید ئێستە تۆ بۆ دیدەنی ئێمە هاتووی بڕۆ لە دوکانی محمد قصاب مروزی گۆشتی برژاو بکڕە وە لە فلانە جیٚ ڕۆن و دۆشا و بە دەستی خۆت هەڵ بگرە بیبەرەوە بۆ ماڵی خۆتان چونکە لە حەدیثایە **پێغەمبەری موبارەك ﷺ** ئەفەرمویٚ: **(مَنْ حمل سلعته بيده فقد برئ منَ الكبر)** یانی هەر کەسیٚ شتومەکی خۆی بە دەستی خۆی هەڵبگریٚ ئەوە لە لووت بەرزی و خۆ بە زلگرتن دوورە و پاکە وە بلیٚ تا لەو گۆشتە (قلیە)یە (یانی گۆشتاویٚ کە بە قەیسی و کشمیش بکریٚ) ساز بکەن وە لە ڕۆن و دۆشاوە کە شیرینی دروست بکەن ئێوارە بەوە ئیفطار بکەن وە ئەوەی کە ماوەی ١٢ ساڵە لەسەرت پێویستە بە جیٚی بهێنی بە جیٚی بهێنە دوایی حەمامیٚ بکە و خۆت بشۆ، ئەوەی کە ساڵە های ساڵە داواریت و دەستت نەکەوتوە ئەگەر دەستت نەکەوت داوێنی أحمد بگرە تا بۆت چارەسەر بکەم لە دڵی خۆیدا زاهیدەکە ئەڵیٚ شێخ فەرمانم بە شتیٚ پیٚ ئەکات کە لە ماوەی ٣٠ ساڵ لە توانا و دەسەڵاتی مندا نەبوە ئێستە من لەگەڵ ژنێك کە هێشتا هەر کچە چی بکەم وە بە چە هێزیٚ کاری وام بۆ ئاسان ئەبیٚ، شێخ بەم خەتەرەی زاهیدەی زانی ئەفەرمویٚ: بڕۆ ئاسانە مەترسە ئەگەر پێویستت بوو هاوار لە أحمد بکە، بە فەرمودەکەی شێخ ڕەفتار ئەکات ئێوارە لە کاتی شێو کردنا هەوەسی ئەجووڵیٚ ئافرەتەکەی مۆڵەت ئەخوازیٚ تا لە خواردن ئەبنەوە لە پاش ئەوە دەست بە کاری شەرعی ئەکەن لە خۆی ڕانابینی سەرکەوتوو بیٚ داوای کۆمەك لە شێخ دەکا لەو کاتەدا شێخ لە ئارامگای خۆیدا ئەبیٚ زەردە ئەیگریٚ و ئەفەرمویٚ: ئەی زاهید مەترسە و خەریکی کاری خۆت ببە ئیشت دروستە، زاهیدی دڵ صاف ئیشی سەری گرت و هەڵسا چوو بۆ حمام غوسڵی کرد، لە دوای خۆشتن میانەی ٤ دیواری شاری هەراتی لەبەر چاوا کەشف بوو کاتیٚ چوو بۆ خزمەت شێخ فەرمووی خەتای ئەحمەد چی‌یە ئەگەر هیممەتی خۆت لەوە زیاتر بوایە لە باتی ٤ دیواری شاری هەرات بەینی ٤ دیوار دنیات لەبەر چاوا کەشف و دیار ئەبوو.

که ژن بهێنم، ئەنجا لە بێ هێزی و ناتەواوی خۆم کەوتمە بیرکردنەوە کە چۆن ژیان لەگەڵ ئەم ژنەدا بەسەربەرم، دیسان ناچار بووم کە باسی حاڵی خۆم بۆ حەزرەتی پیر و پیرزادەی خۆم شێخ محمد بهاء الدین بنووسم وە هەر بە هیمەتی ئەو پەنا بەرم وە بە ڕۆحی پڕ فتوحی إلتجا بکەم، جا هاتم ووتم زەندەفیلی ئێمە بهاء الدینە ئەم بەسەرهاتەی کتێبی (نفحات الأنس)ی زاهیدەکەم بۆ نووسی ووتم:

| | |
|---|---|
| ئەی دەوایی حورمەت و نامووسی من | ئەی تۆ ئیفلاطون و جا لینۆسی من |
| ئەی پەنا بۆ ئیشوکاری زۆر گرنگ | وەك مەڕێ کەوتومە ژێر چنگی پڵنگ |
| حاڵـــەتم تاریکـــە ڕۆژم وەك شـــەوە | جێی ئومێدی من ئەتۆی فریاکەوە |

بە گەیشتنی عەریزەکەم بۆ خزمەتی ئەو زاتە عەزیزە بەیانی پێنج شەممەیەك بوو هاتووچۆیەکی دەروونی و دڵ گەرمی‌یەك ڕووی لێدام تا نوێژی ئێوارە لە مەستی و ئەحواڵ و گریانا بووم، بە کورتی شەو بە ئەحواڵی سەیرەوە خەوم لێکەوت، لەو شەوەدا لە خەودا بە حضوری پڕ نوری پیر شێخ محمد بهاء الدین سەرکەوتوو بووم بە پێکەنین و خۆشی‌یەوە فەرمووی:

جوانی کاتی لاوی لە خەویا پەیدا ئەبوو

دیسان بە کاتی پیریش عاشق و شەیدا ئەبوو[1]

بە مانای (وأمّا بنعمةِ ربّك فحَدثْ) کاتێ ئەو ئافرەتەیان هێنا هەڕەتی جوانی و هێزێ کە لە خۆمدا ئەمدی و دیاری ئەدا بە ٣٠ سی ساڵی لەوە پێشتر نەمبوو بوو.

(١) لە هەڵبەستە فارسی‌یەکەدا حەزرەتی پیر ئەم شیعرەی حافظ ی خۆندەوە:

شاهد عهد شباب امده بودش به خواب باز به پیرانه سر عاشق و دیوانه شد

**ك ١٢٣:** ساڵیٚ پاشای روس لەشکری بۆ رۆم، هێنا بوو شەڕ و هەرایەکی توند و بەهێز ڕووی دابوو، وای لیٚ هات ڕووس سەرکەوت، وە کوشتاریٚ زۆر لەهەردوو لا ڕوویدا گەلیٚ لە گەورە گەورانی شاری سلێمانی چوونە خزمەت شێخ وە زۆر پاڕانەوە و تکایان لیٚ کرد بۆ تەواوکردنی ئەو کارەساتە و عەرزیان کرد پاشای رۆم لەڕێزە کەوت هیممەت بفەرموو فەرمووی هەر ئەم ساڵ کە ساڵ تەواو بوو ئەم شەڕە ئەوەستیٚ لە هیممەتی ئەو زاتەوە کە ساڵ تەواو بوو ئاشتی کەوتە بەینیان و شەڕ وەستا، ڕوسەکان سەر گەورەکەی خۆیان کوشت.

**ك ١٢٤ بص ٣٨٨:** دەروێشێك ڕۆژیٚ دێتە خزمەت شێخی بهاء الدین و عەرزی ئەکات لە کاتی خوا حافیزیدا ئەبیٚ قوربان هۆشت پێمەوە بیٚ حەزرەتی شێخ تا (٣) سیٚ جار لە وەڵامیدا ئەفەرمویٚ چاودێریت ئەکەم و لێت بیٚ ئاگا نابم، وا قەدەر ڕێکی ئەخا کاتیٚ ئەگاتە شارەزوور لەدەشتێکی چۆڵدا ژنێکی فێڵباز و مەکرزانی جوان تووشی ئەبیٚ بە فێڵ و قسەی لووس دەروێشەکە فریو ئەدا و لە خۆی نزیك ئەکاتەوە، لەناکا حەزرەتی بهاء الدینی لیٚ ظاهر ئەبیٚ وە بە سام و هەیبەتێکی تەواو بانگ لەدەروێش ئەکا هەی دەروێش چی ئەکەی؟ چاوم لێتە دەروێش لەم دەنگو دیتنی شێخە لە هۆش خۆی ئەچیٚ، کە دێتەوە سەر حاڵی خۆی هەڵ ئەستیٚ و ئەگەڕێتەوە بۆ تەوێڵە بە سەد پەشیمانی‌یەوە، پەشیمانی و مل کەچی بۆ خودای تعالی ئەکات و دێتە ڕیزی مریدانی بە ڕاستی‌یەوە.

گەر خوا ویستی کاریٚ بکا    هۆیەکەشی بۆ ڕێك ئەخا[1]

**ك ١٢٥ بص ٣٨٩:** لەبەر ئەوەی تووشی نەخۆشی مایەسیری بو بووم، جارجار تریاکم بە شێوەی هۆقنە بەکار ئەهێنا بەدەرمان چونکە سوودی هەیە نەك بۆ خواردن (بۆ خواردن حەرامە) ڕۆژیٚ وا ڕێکەوت مریدیٚ بە چپە لەگەڵ حەزرەتی شێخدا

---

(١) إذا أراد الله شيئاً هيّئ أسبابه.

قسەی کرد، ئەنجا حەزرەتی شێخ مریدەکەی نارد بۆ لای من، وە ووتی نەخۆشێکمان هەیە پزیشك تریاکی بۆ تیماری چاك بونەوە بۆ داناوە عەرزی شێخم کرد فەرمووی: بچۆ بۆ لای فلان لێی وەربگرە، وە ئەو تریاك بەکار هێنانەم بێجگە لە خوا لەو باوەڕەدا نیم کەس زانیبێتی هەندێ تریاکم دایە و لێم ئاشکرا بوو کە ئەو زاتە بە نهێنی خەڵکی زانایە.

**ك ١٢٦:** لەدێی چەقەڵ ئاوا[1]، حەزرەتی شێخ ئاشێکی دامەزراند بوو بەلام قەراخی ئەو چەمە چەقەڵێکی زۆری هەبوو، کەشتیارانی ئەو ناوچە بە شەو ئەچوونە سەر بانی ئاشەکە ئەخەوتن، وا ڕێکەوت شەوێ سەرما ئەبێ جووتیارەکان ئەچنەوە بۆ ماڵ، ئاشەوانەکە و باراش هاڕێ ئەمێنێتەوە، ئاشەوانەکە ئەڵێ من ئەمشەو ئەڕۆمەوە بۆ ماڵی خۆمان کابرای خاوەن باراش ئەڵێ منیش لێرە بە تەنیا ناتوانم بمێنمەوە ئەویش ئەڵێ تۆش وەرە بۆ ماڵی ئێمە و بەیانی دێینەوە، ئەڵێ ئەترسم چەقەڵ ئاردەکەم بخوات، ئەویش ئەڵێ تۆ ئەڵێی چی؟ ئەمە شێخ بهاء الدین خاوەنیەتی نە چەقەڵ و نە هیچ شتێ ناتوانێ هیچ زیانێ لەم جێگایەدا بدات، بە کورتی پێکەوە ئەڕۆنەوە بۆ بەیانی کە ئەگەڕێنەوە تەماشا ئەکەن دوو چەقەڵ لە دەوری بەرداشەکە کەوتوون هەر یەك لە دەور و پشتی بەردەکە کەمێ ئاردیان خواردوە، چەقەڵەکان ڕائەکێشنە دەرەوە کشتیارەکان و هەندێ لە دەوار نیشانی ئێلی جاف لەو دەورەدا ئەبن کۆ ئەبنەوە، ئەبێ بە هۆی بیروباوەڕی گەلێ کەس بە دەسەلات و تصرّف حەزرەتی شێخ بهاء الدین بە خەواریقێ گەورەی دائەنێن.

(١) دێیەکە لە لێواری چەمی (زەڵم) لە شاری سلێمانی وە دێی حەزرەتی شێخ بوو.

**ك ۱۲۷ بص ۳۹۱:** جەنابی بەڕێزی خاوەن تەمیز فەضیلەتی مەلا عبدالعزیز نەوسوودی هەورامان فەرمووی: ڕۆژێ لە خزمەت شێخ بهاء الدیندا بە ڕێگەیەکدا ئەڕۆیشتین بە ناوی دێی تەوێڵەدا، تا گەیشتینە گەڕەکی فلان، کۆمەڵێ پیاو و ژن پێکەوە لە باخچەیەکدا دانیشتبوون و هەریەك بە فرمانێکەوە سەر گەرم بوون کەپرێکیان لە دار و پووش و گەڵا بۆ سێبەر دروست کردبوو، کە ئەو زاتە بینی ئەو دیمەنە کە ژن و پیاو تێکەڵ بوون بە یەکاتێکچوو تووڕە بوو فەرمووی: ئەمە چ بێ ئەمری‌یەکی شەریعەتە بە جێی دێنن وە ئەم بەدکرداری‌یە چۆن قبووڵ ئەکەن و لە خوای خۆیان جلّ وعلا ناترسن، وە بەزەیی‌یان بە حالّی خۆیانا نایەتەوە، تا بەم شێوە ژن و پیاوی نامەحرەم بە یەکەوە بێ پەروا دائەنیشن ئەمانەی فەرموو و ڕووی لێ وەرچەرخاندن، دەسبەجێ کەپرەکە بێ هۆیەکی ئاشکرا ئاگری تێچوو و گڕی چوو بەئاسمان هەر چەن ویستیان بیکوژێننەوە بۆیان نەگونجا تا هەموو لەیەك جیا بوونەوە مەلا عەزیزی ناوبراو ووتی: من ئەو ڕووداوەم تەنیا بە هۆی دڵ ڕەنجانی حەزرەتی پیر شێخ محمد بهاء الدین نەبێ بە هیچ شتێ ترم نەزانی.

**ك ۱۲۸ بص ۳۹۲:** ساڵێ علامەی زەمان کانگای عیلم و زانستی حاجی مەلا أحمدی نۆدشی تەشریفی پیرۆزی هات بۆ دیدەنی ئەم هەژارە بۆ سەمرانی وە بە تشریفی گەیشتنی سەربەرزی کردم لە ماوەی مانەوەی لەو دیدەنی‌یەدا لە هەموو باسێکەوە قسەکرا، بەو بۆنەیەوە لە بارەی حەزرەتی شێخ محمد بهاء الدینەوە و خۆشخولقی و ڕەووشتی شیرین و جوانیەوە گفتوگۆ هاتە پێشەوە، حاجی مامۆستا فەرمووی: لە سەفەری حیجاز کە لە خزمەتیا بووم کۆمەڵێ لە مریدانی ناڕەسا و ناتەوان و صۆفیانی بێ هەست و وێڵ دڵی حەزرەتی شێخیان ئازاردا و ناجۆری‌یان گەیشتە سنورێ ئەگەر ئەوانە لەبەر دەستی پاشایەکی سەر زەویدا بوونایە تۆڵەی لێ ئەکردنەوە وە بە چەشنەها سزا پاداشی ئەدانەوە، ڕۆژێ حەزرەتی شێخ ئەو کۆمەڵە

بانگەواز ئەكات و ئەفەرموێ: داوای لێ بوردن ئەكەم لێتان كە لەم سەفەرەدا ئێوە زۆرتان زەحمەت و نارەحەتی هاتە ڕێ وە ئەزیەتی ڕێگە بێتاقەتی كردوون پێم خۆشە لە ڕەفاقەتی من كەنارگیری بكەن و لە ڕێگەیە ترەوە ئێوە بڕۆنەوە:

دەشت بەر بلاوە ئەی برا تۆ ڕێگەیە من ڕێگەیە
مەنزڵ فراوانە كوڕم، من جێگەیە تۆ جێگەیە[1]

من لە (حەلەب)ەوە ئەبێ بچمەوە، چاك وایە ئێوە لە ڕێگەی جبل شمّر و كەربەلا و نەجەف و بەغداوە بگەڕێنەوە، ئەمجا شێخ جلالی مەهابادی بەردەسی خۆی داوا ئەكات و پێی ئەفەرموێ (میقداری ٨٠ لیرەی عوسمانیان بدەرێ با بۆ ڕێگە پێیان بێ و لە ڕەفاقەتی ئێمە دووربن بە ئاسوودەیی و ڕەحەتی بگەن پارەكەیان پێ ئەدات و جیا ئەبنەوە، ئەگەر هێزی خواناسی و ڕووناكی نزیكی لە خواوە نەبێ و بەرزی پایە و پلە نەبێ كێ لە كاتی تووڕەیی و ڕقدا ئەتوانێ ئاوا بە سینەیەكی فراوانەوە فەرمان بدات و شتی وا بكات.

**ك ١٢٩ بص ٣٩٣:** وە هەروەها زانای پایە بەرز جەنابی حاجی ملا أحمد فەرمووی: لەكێوی أبو قبیس لە شاری مەكەی پیرۆز سوالكەرێ هاتە خزمەتی خەلاتێكی كرد ڕۆیشت و دیسان هاتەوە ئەمری فەرموو دیسان شتێكی تریان دایە چەند جارێ هەروەها ئەهات لە زیو و لە ئاڵتون كە سكە و دراوی ئەو زەمانە بوون خەلات ئەكرا، دوا جار بەردەستێكی ماڵی حەزرەتی شێخ كە لە خزمەتیا بوو عەرزی كرد قوربان ئەمە چەن جار هات و بەشی خۆی برد تاكەی، فەرمووی ئاخر بۆچی خێر

---

(١) فارسی‌یەكەی ئەمەیە: صحرا فرح است أی پسرتو گوشەء من گوشەء
همچون ملخ أز كشت شە تو خوشەء من خوشەء

نیە، وازی لیْ بیْنن با بیْت و بەشی خۆی ببا ئیْوە بە خیْر و چاکەکردن بۆ دلْتەنگ ئەبن و بە إحسان لەگەلْ هەژار بیْزارن.

ئەولیا لە گەرد ڕەزیلی پاکن ئەوان بە ڕاسی ئەسخیای چاکن[(١)]

(گەورەتر خولْقی خودا خاوەن کەرەمی و سەخاوەتە)[(٢)] وە لە فەرموودەیەك لە فەرموودەکانی پیْغەمبەری موبارەك ﷺ ئەفەرمویْ: شەخسی خاوەن سەخاوەت نزیکە لەخوا نزیکە لە خەلْك نزیکە لە بەهەشت دوورە لە ئاگر. ڕەزیل و پیسکە دوورە لەخوا دوورە لە خەلْك دوورە لە بەهەشت نزیکە لە ئاگر. خوا پەنامان بدات لە ئاگر[(٣)].

**ك ١٣٠ بص ٣٩٣:** شیْخ سعد الدین جامی کە یەکیْك بوو لە نەوەی سید أحمدی زەندەفیل، کە شەرحی حالْی زاهیدەکەی بۆ گیْڕامەوە: ووتی جاریْ لەگەلْ خواجە محمد ڕەسولْی باوکم بۆ سەفەر ئەچووین، لە عیشقی کچیْکی ئامۆزام کە ناوی (قەلْەم) بوو ئەسووتام، هەر بەو ئەوین و شەوقەوە، بەو ئاگری دووری و فیراقەوە، ئەسووتام بەو دەرد و دلْ گەرمیەوە بە خزمەت حەزرەتی شیْخ بهاء الدین گەیشتم، ڕۆژیْ بە پیْوە لە خزمەت ئەو دەستگیرە پڕ کەمالْەدا وەستا بووم چاوی هەلْبڕی بە زەردەیەکەوە فەرمووی شیْخ سعد الدین عاشقی؟ ئیتر من ماوەی ئەوەم نەما پەردەی بەسەردا بدەم زانیم کە بە حالْم ئەزانیْ وە کەشف لیْی ئاشکرا بووە، سەر لە نویْ بە ئەدەبەوە زیارەتم کردەوە و شەرحی ئەحوالْ بەیانی شەوقی دەروونی

---

(١) ئەسخیا کۆمەلْ و جەمعی سەخیە یانی خاوەن کەرەم.

(٢) السّخاء خلق الله الأعظم.

(٣) يقول الرسول الكريم ﷺ (السخي قريب من الله قريب من الناس قريب من الجنة بعيد من النار والبخيل بعيد من الله بعيد من الناس بعيد من الجنة قريب من النار).

خۆم کرد ئەمجا نەختێ بێدەنگ بوو فەرمووی: پێغەمبەری موبارەك ﷺ ئەفەرمویٚ:
(مَنْ عشقَ وكتم وعفَّ وماتَ فقد مات شهيداً) .
یانی:

کەسێ عاشق بوو لە لای کەس نەی ووت
داوێنی خۆیشی بە پاکی راگرت
هیچ بێ شەرعی‌یەك یا خۆ ناپاکی
لەوا ڕووی نەدا و مایۆ بەچاکی
رەسوولی ئەکرەم فەرمووی شەهیدە
بێ بەشمان نەکەی خوای کەس نەدیدە

ك ١٣١ بص ٣٩٤: دیسان جەنابی پێشەوای ئایین و گەورە و زانایان حاجی مەلا أحمدی نۆدشی فەرمووی: کاتێ گەڕانەوە لە مەکەی پیرۆزەوە بۆ شاری ڕووناکی[(١)]، (خوا شەرەفیان زیاتر کات) و گەیشتنە مەدینەی منّورە یەکێ لە پیاوچاکانی میصری کە هەردەم لە مدینەی منورە مابووەوە و لە ماڵ و منالّی بڕابوو پێیان ئەوت مجذوب النبي یانی کێش کراوی پێغەمبەر ﷺ کاروانی حاجیەکانی کورد و عەرەب و تورك و فارس و ئەوانی تر نزیکەی ٢٥٠٠٠ بیست و پێنج هەزار ئەبوو، لەگەڵ ئێمە لە خزمەت شێخا گەیشتینە جێ ئەو پیاوە مجذوبە میصری‌یە گەیشتە ئەوێ وە لەناو ئەو هەموو کۆمەڵە حاجی‌یەدا شێخی بهاء الدینی دۆزیەوە دەستی کردە ملی و ئەو زاتەی ماچ کرد و بۆنی پێوە ئەکرد و ئەکەوتە شەوق و زەوق و ئەحواڵەوە دەستی ئەکرد بە قسە لەگەڵی هەتا ئێمە لەوێ بووین هەموو ڕۆژ ئەو مجذوبە ئەهات وەك پەروانە بە دەوری چرادا چۆن ئەگەڕێ ئاوا دەورەی شێخی ئەدا و هۆنراوەی شەوق و محبّتی

---

(١) شاری ڕووناکی: المدينة المنّورة.

بەسەرا ئەخوێندەوە بەڵام ئیتر گوێی بە کەسی تر نە ئەدا وە گەورەیی حەزرەتی قطب العارفین و ووشیاری ئەو مجذوبە لە خەڵکی ئەو کاروانە ئاشکار بوو.

**ك ١٣٢  بص ٣٩٥:** هەروەها جەنابی حاجی ملا أحمدی نۆدشی فەرمووی: دانیشتوانی وولاتی سعودی لە حیجاز زۆر تر خەریکی خواپەرستی و عیبادەتی ظاهری و خەریکی فێربوونی عیلمی (تفسیر و حدیث)ن کەمتر داخوازی طەریقەت و مریدین، لەگەڵ ئەوەشا کاتێ کە ئێمە لە خزمەت شێخدا لە لای ڕێگەی ئەسکەندەروونەوە بە ڕێی ئاویدا گەیشتینە بیلان من شەوێ لە ڕووداوێکا بینیم کە حەزرەتی جوبرەئیل سلاوی خوای لێ بێ نامەیەکی لۆك کراوی مۆر لێ دراوی هاورد بۆ جەنابی مستطاب حەزرەتی شێخ محمد بهاء الدین خوا پایەی بڵندتر کات و دای بە دەستییەوە کەوتینە بەیانی ئەو شەوە لە هەموو عەرەبی ئەو وولاتە لە خەڵکی شار و دێ و بیابان (چۆڵەوانی) وەکو مرۆچە و کوللە دەورەیان لە حەزرەتی شێخدا وە هەمووشیان بە إخلاصەوە زۆربەیان مجذوب و نەعرەگۆ و هاوارەوە خۆیان ئەدا بەسەر دەس و پێی حەزرەتی شێخ دا، وە لە ڕێگەدا شێخ بەسەر تەختێکەوە[1] بوو منیشی لە خزمەتیا سوار کردبوو، کە عەرەبەکان بە مجذوبی ئەهاتن و هەڵ ئەپەڕین، یابووەکە ئەچوو بە ئاسمانا و بە هەر چوار پەل سەمای ئەکرد، ناچار حەزرەتی شێخ لەو تەختە هاتە خوارێ حاجی سیّد بایەزیدی کردە هاوڕێم خۆی سواری ئەسپێ تر بوو، ئیتر هەتا گەیشتینەوە شاری حەڵەب هیچ ساتێ حەوانەوەی نەبوو نە شەو نە ڕۆژ وە شێخیان بەجێ نەئەهێشت و دەوری چۆڵ نەبوو، وە لە حەڵەبیشەوە تا وولاتی خۆمان کات لەگەڵ کات قەرەباڵخی خەڵکی زیاتر ئەبوو، وە پێشوازی جەنابی شێخ خوا پایەی بەرزتر بکات هەر لەزیاد بوون بوو.

---

(١) تەخت: بە عەرەبی (محفّە)ی پێ ئەڵێن ئێسترێ رای ئەکێشێ، لە شێوەی عەرەبانەدایە وە بۆ جێگەی حەوانەوەو ئیستراحەتە، بۆ سواری بەکار ئەهێنرێ.

**ك ١٣٣ بص ٣٩٥:** دیسان جەنابی پێشەوای زانایان بەڕێز مەولانا أحمدی نۆدشی فەرمووی: لە وەختێکا ملا محمدی برام بە ڕەحمەتی خوا چوو شتمان و کفنمان کرد و بردمانە مزگەوت وە حەزرەتی قطب الأعظم مرشید و دەستگیری گەورە شێخ محمد بهاء الدین قدّس الله تعالی روحە تەشریفی دانیشتبوو، خۆشم دانیشتبووم بەلام چەند کەسێ لە میانەی من و ئەودا بوو بەدڵ ڕوانیم بۆ جەنازەی ملا محمدی برام دیتم ڕۆحی خاوەن دەسەلات و بەرەکەتی شێخی گەورە حەزرەتی شێخ عوسمان ظهوری فەرموو وە کەماڵی لطف و کەرەمی لەگەڵ ملا محمدی برامدا بەجێ هێنا ئەمجا سەرم هەڵبڕی چوومە خزمەتی حەزرەتی شێخ محمد و عەرزم کرد (متوجّە)ی محمدی برام ببە بزانە حاڵی چۆنە و لە چ وەزعێکایە؟ لە وەلاما فەرمووی ئێستە تۆ خۆت لە مراقبەدا بووی وە ئاگادار بوویت بینیت کە خوا لێ خۆشبووی باوکم حەزرەتی شێخ هاتە سەرینی محمدی برات وە ئەوپەڕی لطف و میهرەبانی و بەخشندەیی دەربارەی کرد ئیتر بۆچی ئەوەندە کەوتوویتە ناڕەحەتی و دڵ گرانییەوە.

# داوێنی ئەم کتێبە

هەرچەن کە خەواریق وکەراماتی حەزرەتی شێخ بهاء الدین وتصرّف و دەستەلاتی ئەم زاتە وە خۆشخولقی رەووشتی جوانی ئەم دەستگیرە پایە بڵندە (خوا لێی خۆشنوود بێ) زیاترە لەوەی کە بنوسرێ یا باس بکرێ چونکە لە ژمارە نایە بەلام پێشینانی موسڵمان و دڵ پاکمان فەرموویانە: (مشتێ نموونەی خەرواریکە، وە لقێ نیشانەی درەختێکە) لەبەر ئەوە بەم چەند کەرامات و خەواریقانە کۆتاییمان پێ هێنا بۆ بەرەکەت و پیرۆزی و دڵ گەش بوونی نەوەی برایانی ئایینی، سا خوا تۆش ئاکامی هەر کارمان بە خێر بگێڕی وە لەسەر شۆڕی و نزمی و پەستی دنیا و سزا و تۆڵە و ئەشکەنجەی ئەولاش بە وەسیلەی دەستگیر ممان پارێزی، خوا بە بۆنەی ناوبردن و نوسینەوەی پاداشتیان و خۆشەویستی‌یان لەگەڵیانا لەقیامەتا کۆمان بکەیتەوە هەزار درود و سلاو لەسەر پێشەوای پێغەمبەران و سەرداری خواناسان و مایەی رەحمەت و خۆشی بێ هەتا ڕۆژی دوایی وآخر دعوانا أن الحمد لله ربّ العالمین[1].

---

(١) عبدالرحمن بەگی تارانی تفەنگ داری (نواب والاشەهزادە) فرهاد میرزای معتمد الدولە پیاوی بو لە مەزهەبی خۆی کە شیعە گەری بوو زۆر بە تەعەصوب و غیرەت دار بو، لە کاتێکا بە مەئموریەت هاتە سەمران بۆی گێرامەوە ووتی پار ساڵ جەنابی معتمد الدولە ناردمی بۆ تفتیش و بۆ منطیقەی هەورامان و لهۆن، وە بە تایبەتی پێی ووتم تەماشای هەڵسان و دانیشتنی شێخ محمد بهاء الدین بکە وە بروانە بۆ أخلاق و کردەوەی بزانە چیت دەستگیر ئەبێ وە بزانە چۆن شێخێکە، کاتێ گەیشتمە تەوێڵە وە شێخم دی بەدیقەت تێ ئەفکرام ألحق ئەوەی بیست بوم زیاتر بو، قەحتی بو یانی گرانی بوو نان دەست نە ئەکەوت فەقیر و بێ عنوان تا دوو هەزارم ئەدی بێجگە لە مرید ئێوارە و بەیانی لە دەسگای ئەودا نانیان ئەخوارد وە زیاتر خۆی سەرپەرشتی نانداني ئەکرد ٥٠٠ نەفەر لە گەورە گەورانی وەك سید شهابی طالیشی و شێخ جلالی کوری قازی سابلاخ و غەیرە لەوێ بون تا خۆی قسەی نەکردایە کەس نەیئەتوانی قسە بکا پاش ٣ رۆژ ئیجازەم وەرگرت عەرزم کرد کە هاتم خێزانم حامیلە بوو دڵم مشوەشە فەرموی خێزانت سەلامەتە تا ئەچیتەوە کوڕێکتان ئەبێ کە هاتمەوە سەلامەت بو وە کوڕێکمان بو بوو ئیتر عقیدە و ئیخلاصم بۆ جنابی شێخ زۆر بو وە ئەمەم بە تفصیل بۆ جنابی شەهزادە فرهاد میرزا بەیان کرد.

# سوودی نزیك بوونەوەلە ئەولیا و پیاوچاكان

باسی بەهرە و سوودی خۆشەویستی و دۆستایەتی و پەیمان و مەرج
بەستن لەگەڵ چەن كەسانی خاوەن بەرەكەت بۆ یاریەدان و كۆمەكی
بەیەككردن لە ڕۆژی دواییدا وە سەرەتاكەی بە پێشكەش كردنی
پێشەكی پاشان بەیانی یەكەیەكی ئەو دۆستانە



بزانە ئەی برام خودا سەرکەوتووت بکا ئەم ئەستێرە پڕ لە شەوق و پڕ لە درەخشانەوەی مشایخ و پیران و أولیای حقّ تعالی، وە ئەم زەمزەمەی مریدی و مەنسوبییە بۆ ئەو زاتە گەورانە (قدّس الله تعالی أرواحهم) مەشخەڵێکە وەرگیراوە لە روناکی زۆر بەتین و تەوژمی خۆشەویستی حەزرەتی ربّ العالمین جلّ جلالە، وە ئاشکرایە کە هەر موغناتیسی خۆشەویستی هۆی ڕاکێشانی دووانی جیاوازن، یانی لە میانەی دوو شتا ئەگەر هیچ بۆنەیەك نەبێ لە میانەی ئەو دووەدا بە یەکی ئەگەیینێ وەکو هێزی ڕاکێشان (قوة الجاذبیّة) کە هەم لە مغانتیسدا وە هەم لە هەر شتێکا وە هەر مادەیەکدا کە لەو هێزەی تێدا بێ ئاسن یا هێزێ کە لە کارەبادا هەیە بۆ ڕاکێشانی پووش و کا.

وە هەروەها خۆشەویستی و محبەت بۆ خۆی هێزێکە دڵدار و دڵخواز هەردوو خۆشەویست لە یەك نزیك ئەخاتەوە وەکوو کوڕ و باوك، دایکی و منداڵەکەی، برا و خوشك ئەمانە و دوو دڵدار نزیکیان لە یەك بەبێ محبّەت هەرگیز ناگونجێ.

ئەمجا ئەم گەورە گەورانەش، ئەم کیباری ئەولیا و پیاو چاکانەش هێزێکی پەیوەندی و خۆشەویستین لە میانی بەندە و خوادا، پەیوەندی لەگەڵ ئەم زاتانە ئەبێتە هۆی نزیك خستنەوەی بەندەگان لە حەزرەتی ربّ العالمین کە ئەوەش سەرمایەی سەعادەت و هۆی بەختیاری و کامەرانی دنیا و قیامەتە، ئەمانیش لە سەرەتاوە مورید بوون لە قوتابخانەی خۆشەویستی یا بە هەوڵی کۆششی ئامۆژگاری زانکۆی (أستاذی جامعة) ڕەووشت و خوو[1] محبەتیان لێ هەڵکەوتوە، وە هۆی هەزاران دەر هەزار کەس بوون بۆ گەیشتن بە کامەرانی و بەختیاری هەتا هەتایە، تا بتوانین بە هۆی ئەو

---

(١) ڕەووشت و خوو: أدب و أخلاق.

شۆرش و محبەتەوە رەسمی خزمەت و بەندایەتی و شێوازی[1] شێوەی خواپەرستی و خواناسی بەڕێوەبەرن وە هیچ کات و ساتێ بێ ئاگایی‌یان[2] لە گەورە و مەولای خۆیان نەبێ، وە بە پلەی الأحسانُ أنْ تعبد الله كأنّك تراهُ, فإنْ لم تكن تراهُ فإنّه يراك, مشرّف بن[3], وە لە پەیوەندی غەیری خوا و روشتەی پەیوەندی غەیری خۆشەویستی ڕاستەقینە (محبوبی حقیقی) ئازاد و رزگار بن هەروەکو هۆنەر ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| مەبەسم لە نوێژ ئەوەیە تاوێ | بە دڵ بەندەیە خزمەت گوزار بم[4] |
| وەگەرنە چیە ئەمن بە بێ تۆ | ڕوو بە میحراب و دڵ لە بازاڕبم |

بەڵام بۆ گەیشتن بە ئەوپەڕی پلەی خۆشەویستی (گەورە و خۆشەویستی) ڕاستەقینە[5] ئەبێ بە بێ پەلە بە پلە پلە بە پەیژەی دەستگیر و وەسیلەدا سەرکەوی، یانی پلەی یەکەم ئەبێ بڕێ جا ئەگاتە دووەم، ئەویش بڕێ جا سێ‌یەم، سەرەتا موریدی یەکسەر بەبێ هیچ موناسەبە و هۆیەك یا پەیوەندی‌یەك بەو پلە و دەرەجە بالایە بێگانەیە مرشدی وەسیلە و پلەی یەکەمە تا ئەگاتە هۆیەك بۆ پلەی دووەم کە خۆشەویستی رەسوڵی ئەکرەمە ﷺ وە لەوێشەوە هەر کەس خوا بیداتێ بە شەرەفی گەیشتنە بەمحبەتی محبوبی حقیقی. حەزرەتی مولانا خالیدی کوردی نەقشبەندی (خوا لێ خۆشنود بێ) نووسیویەتی بۆ یەکێ لە خەلیفەکانی:

---

(١) شێواز: ئەدەب.

(٢) بێ ئاگایی: غەفڵەت.

(٣) یانی چاکەکردن بە راستی ئەوەیە بە چەشنێ خواناسی بکەی هەروەك خوای پەروەردگار ببینی وەها، خۆ ئەگەر تۆ چاوت لە خوا نەبوو، خوا بێ شك و بێگومان چاوی وا لە تۆوە ئەتبینێ زۆر بە ووردی و ئاسایی.

(٤) فارسی‌یەکەی ئەمەیە

| | |
|---|---|
| مرا غرض ز نماز آن بود كه يكساعت | غم فراق ترا با تو باز بگزرام |
| و گرنه إين چه نماز ليست كه من بی تو | رو به محراب و دل به بازارم |

(٥) ئەوجی محبەتی حقیقی: لوتکە و ئەوپەڕی پلەی خۆشەویستی ی بە گەورە و خۆشەویستی راستەقینە.

هیچ کویْ ئارامگا و بە مەنزڵ مەکەن

بە هیچکەسیش دڵ هەرگیز قەت مەدەن[1]

چونکە جێ گۆڕە و محبوبی تۆ حەق

لەم دنیا هەرگیز دڵ مەدە بە خەلق

ئەمجارە دیارە هەر کەسیْ هەر کەسی خۆش ویست عەلاقە و پەیوەندی دارانی ئەو کەسی خۆش ئەویْ لەبەر خاتری ئەو، جا لەبەر خوای پەروەردگار هەر چیت خۆش بویْ و گەرەکت بیْ خوا پیْی خۆشە.

پیْی سەگی ماچکرد مەجنون، خەڵك ووتی چی بوو ئەوە

پیْی ووتن جار جار بە بەردەم دەرکی لیلی ڕۆییوە[2]

هۆنەر ئەفەرمویْ: هەرچی غەیری عەشق خوای دەروێشانە[3]

شەکرۆك خواردن بیْ وەك گیان کێشانە

لە پیْویستی خۆشەویستیدا خوای تعالی بە حەزرەتی (داوود) ئەفەرمویْ (دورووودی خوا لەسەر پیْغەمبەری ئیْمە و هەموو پیْغەمبەران بیْ أنا بدُّك اللازمْ فالزَم

---

(1) ئەمە فارسی‌یەکەی حەزرەتی مولانای کوردی‌یە:

هیچ جای بهر خود موطن مخوان    هیچ کس بالذات محبوبت مدان

چونکە جا قبر است و محبوبِی تو حق    در جهان دلرامده با کس علقْ

(2) فارسی‌یەکەی ئەمەیە:

پای سگ بوسید مجنون خلق گفتااین چە بوو

گفت این سگ گاە گاهی کوی لیلی رفتە بود

(3) فارسی‌یەکەی: هر چە جز عشق خدای أحسن أست    گر شکر خواردن بود جان کندن است

شەکرۆك بە کوردی هەولێر یانی شیرین و نقل و نەبات.

هەرچی غەیری عیشق خوای دەروێشانە    گەر شەکریش بخوا وەك گیان کێشانە

بُدّكَ یانی من بت و پەرستراوی پێویستی و تۆم غافلْ مەبە لە پەرستن بۆ زاتی علیّەی من، پەرستنم بە دەوام بە پێویست و لازم بزانە.

أنا المطلوبُ فاطلبْني تجدْني
وإنْ تطلبْ سوائي لم تجِدْني

دووکەس پێکەوە لەبەر خوا یەکتریان خۆش بویْ مانای ئەوەیە هەردووکیان خوایان خۆش ئەویْ وەك ئەفەرمویْ (يحبّهم ويحبّونه) خۆشی ئەوێن و خۆشیان ئەویْ. هەروەك لە حدیثایە، ئەفەرمویْ جاریْ یەکیْ ئەچیْ بۆ سەردانی برایەکی دینی خۆی لە دێیەکی تر خوای پەروەردگار فریشتەیەك لەسەر ڕێگەکەی دائەنیْ لە شێوەی بەشەرا کە ئەگاتە لای پێی ئەڵیْ بۆ کویْ ئەچی؟ بۆ لای کیْ ئەچی؟ ئەڵیْ بۆ لای فلان ئەچم لە فلان جیْ ئەڵیْ خزمتە، ئەڵیْ نەء ئەڵیْ موعامەلەیەکی دنیایی‌تان لە میانا هەیە؟ ئەڵیْ نەء ئەڵیْ ئەی بۆچی ئەچی؟ ئەڵیْ لەبەر خوا، ئەڵیْ دەی مژدە بیْ من مەلائیکەم لە لایەن خواوە هاتوم تۆش خوا خۆشی ئەوێت.

وە هەروەك لە حەدیسایە پێغەمبەری موبارك ﷺ ئەفەرمویْ لە قیامەتا[1] حەوت تاقم لە ژێر سێبەری عەرشان، تاقمێکیان لەوانە المتحابين في الله یانی ئەوانەن کە لەبەر خاتری خوا یەکتری‌یان خۆش ئەویْ لەبەر ئەوە رفیق و دۆست بگرن لەبەر خوا ئەجر و پاداشتی زۆر گەورەی هەیە، بەڵکو ڕێکەویْ زانای تەواو[2] بن دۆستی‌یان

---

(١) زانای تەواو: العلماء الكاملون.

(٢) سبعةٌ يظلّهم الله في ظلّهِ يومَ لا ظلّ إلا ظلّه:

إمامٌ عادلٌ وشابٌ نشأ في عبادةِ الله عزّ وجل, ورجلٌ قلبُهُ معلقٌ بالمساجدِ ورجلٌ تحابا في الله إجتمعا عليهِ وتفرقا عليه, ورجلٌ دعتْهُ إمرأةٌ ذات منصبٍ وجمال فقال إنّي خافُ الله ورجلٌ تصدّقه بصدقةٍ فأخافها حتى لا يعلمَ ما تُنفقُ يمينهُ ورجل ذكر الله تعالى خالياً فقاضتْ عيناه. متفقٌ عليه.

لەگەڵا بگرن وە برای ئایینی برایەتی لەبەر خوا بکەن لە عیبادەتی سنەت و نافیلە لای خوا گەورەترە، فەرمویەتی پێغەمبەر ﷺ هەر کەس لە ریَی خوا دۆستی خوایی بگرێ و برای دینی پەیدا بکا لە بەهەشتا جێگەیەکی ئەدەنێ کە بە هیچ کردەوەیەکی تر ئەوەی لە بەهەشتا نادەنێ.

أبو إدريسی خلاّنی بە معاذی فەرموو (خوا لێیان ڕازی بێ) من زۆرم تۆ خۆش ئەوێ، ئەویش فەرمووی مژدە بێ بۆ تۆ من لە رسول الله ﷺ بیستوە کە لە ڕۆژی قیامەتا بە دەوری عەرشا کورسی دائەنێن، تاقمێ لەسەر ئەو کورسیانە دائەنیشن ڕوویان وەك مانگی ١٤ چواردە ئەبێ عالەم لە ترس و هەراسا ئەبن ئەوان بێ ترس و لەرزەوە، ئەوانە بە ڕاستی دۆستانی خوان نەترسیان هەیە نە خەم عەرزیان کرد یا رسول الله ﷺ ئەوانە کێن؟ فەرمووی المتحابّون في الله ئەوانەن کە یەکتریان لەبەر خوا خۆش ئەوێ.

حەزرەتی ئیمامی ڕەبانی مجدّدی ئەلفی ثانی (خوا لێ خۆشنوود بێ) لە مەکتوباتەکەیا لە بەرگی یەکەم مەکتوبی ٢٣٨دا لە بارەی خۆشویستنی برای دینیەوە ئەفەرموێ: لەبارەی زۆری برایانی دینیەوە زۆر جێی ئومێدە، وە هەروەها ئایەتی پیرۆزی خوای پەروەردگار کە ئەفەرموێ ( سنشدّ عضُدَكَ بأخيك) پشتگیری مانای زۆرکردنی برایەتییە لە دیندا.

ئەنجا کۆمەڵێ لەو پیاوەگەورە گەورانە بە هۆی تکا و داخوازیم لە مەرحەمەتیان بە بەستنی پەیمانی (الأخوة الإسلامية) برایەتی ئیسلامی دەستی بەزەیی و دڵ نەرمی و خۆشەویستییان ڕاکێشا و پەیمانی برایەتییان لەگەڵ بەستم وە بە برای دنیا و قیامەتی خۆیان قبووڵیان کردوم.

پیرۆز بە ئەهلی خۆشی بێ خۆشی

وە یا دڵ مەستی هەژار کە نۆشی[1]

---

(١) هنيئاً لأرباب النعيم نعيمها وللعشاق المسكين ما يتجرّع

ئێستەکاتی ئەوەیە کە ناوی پیرۆزی کۆمەڵێ لەو برا دینییانەی کە ئەم خزمەتکارەی خۆیان بە برادەری هەردوو دنیا قبوڵ کردوە بەیان بکەم لە سەرەتاوە ساداتی عالی جەناب ئەمجا ناوی زانایانی بەڕێزو گەورە بەیان بکەم[1].

١- یەکەم لەوانە جەنابی مستطاب، بە پایەی زۆر بەرزی ویلایەت کامیاب پیرزادەی ئەعظەم هێزی پشتم و نوری چاوم کانی گەوهەر شێخ عمر خوا بیپارێزێ وە سەرکەوتووی بکات لەسەر سەعادەت و بەختەوەری، کە بچووك نەوازی فەرموو بە کەماڵی عینایەت و ئیحسان ئەم خادیمی دەرگای باوکی عەزیزی خۆیە بە برای دنیا و قیامەتی قبوڵ فەرموو، وە بەو لوطفە گەورەیەوە شادمانی کردم.

٢- وە لەوانە حەزرەتی سیّدی پێشەوا و گەورە زانایان سیّد قطب الدینی کەلجینی بو (قدّس سرّه) کە ئەویش بەرامبەر بەم هەژاری مسکینە کە ماڵی خۆشەویستی و دڵ نەرمی و بەزەیی بەکارهێنا، وە پەیمانی برایەتی لەگەڵ بەستم، وە لە ناوەڕاستی مامەڵەی مرشیدی أکبر سراج الدینی گەیاندم، وە ئیجازە نامە و کراسی موبارەکی قبوڵ کردنی حەزرەتی شێخی بۆ وەرگرتبووم و بۆی ناردم خوا پاداشتی خێر و چاکەی بداتەوە.

کەرامەتێکی ئەو زاتە ئەگێڕمەوە، لە خزمەت حەزرەتی پیر جارێ گەڕامەوە زۆر نەخۆش و زەبوون بووم، گەیاندمیانە ماڵی جەنابی سیدی خاوەنە بەخت و نگین سیّد قطب الدین کە بە خزمەتی گەیشتم عەرزم کرد کە هەنجیری تەڕ و پزیشکی باشم ئەوێ، پێکەنی و فەرمووی: عەجەب حوکمێ ئەکەی هەردوو نایاب و دەست نەکەوتوون، ووتم هەر ئەمەوێ، تۆزێ بێ دەنگەی لێ کرد، ووتی ئارام بگرە تا کاتی عەسر بەڵکو خوای پەروەردگار بیگەیەنێ، هێشتا عەسر نەبوو بوو پیاوێ هات و سەبەتەیەکی دانا[2]، نزیکی دوو کیلۆیەك هەنجیری کردبوە ناوی لە خزمەت سیّدا

(١) لێرەشدا دەرئەکەوێ طائفەی حەزرەتی سراج الدین (سەیید)ن وە لە نەوەی حەزرەتن.

(٢) سەبەتە: بەرچنە.

دای ناو وتی قوربان به بێ هیچ مەبەست و نیازێ کە بوو بێتم لە پڕ هەستام بە ناو درەختەکانا گەڕام ئەم نەختە هەنجیرە کەمەم پەیدا کرد و هێناومەتە خزمەتت کە نۆبەرەیە و تازە پێگەشتوە، نەختێ تری پێ چوو لای ژووررووی ساراوە (صحراوە) کە ئێشتا چاوکاری نەئەکرد کێیە پیاوێ بە بار و وڵاخەوە دەرکەوت فەرمووی خۆش ئەبوو ئەمە ئەگەر میرزا نادری حەکیم بوایە، کە گەیشتە بەرەوە هەروا بوو کە فەرمووی، لێیان پرسی لە کوێ بووی، ووتی بە خوا ڕۆژە ڕێ دوور لێرە لەناو فلان تیرە[1] بەسەر نەخۆشێکەوە خەریکی تیمار کردن بووم، بێ ئەوەی بە تەما بووبم لە دەور و پشتی نیوەڕۆ ئارەزووی ئێرەم کرد، بارم پێچایەوە و ئامادەی ڕۆیشتن بووم هەر چەن کەسوکاری نەخۆشەکە هەوڵیان دا نەم توانی دانیشم ئیتر ئەوا هاتم بۆ ئێرە، سید فەرموی بە پێکەنینەوە زۆر چاکت کرد هاتی بەخێر بێیت ئێمەش نەخۆشێکی عەزیزمان هەیە بوونی تۆ لێرە زۆر پێویستە، چەند ڕۆژێ لەوێ مایەوە، مداوای باشی کردم تا هاتمەوە سەرخۆ ڕەوانەی بۆ ماڵی خۆمان کردمەوە خوا پاداشتی چاکەی بداتەوە.

٣- وە هەر لەوان زۆر بەڕێز صدیق الطالبین سیّد محمد أمین کوڕی سیّدی بە گەورە ناوبرا و سیّد قطب الدین کە ناومان برد، کە زاوای حەزرەتی شێخی سراج الدین (خوا لێ خۆشنود بێ) بوو وە یەکێ بوو لە ئیجازە دراوان و وەرگیراوانی حەزرەتی پیر باوکیشی هەم خەلیفە و ئیجازە دراوی حەزرەتی پیر بو، هەم نزیکی بارەگای ئەو زاتە بوو (خوا پایەیان بەرز بکات) وە ئەم جەنابە وەختێ بوو کە ئەم بەندەیانە زۆر بە پەرێشان زانی بە دوور و درێژی ئەحواڵی منی عەرزی حەزرەتی شێخ کرد بوو ئیجازەی لێ سەند بوو تەشریفی هات بۆ دێی سەمڕان وە ماوەی دوو مانگ و دە ڕۆژ تەشریفی مایەوە بە سلوك و حەلەقەی خەتم و توجّە کاتمان پێکەوە بەسەر برد (یادگار بۆ ئەو زەمانە یادگار). چەند فتوحاتێکم بەهۆی ئەوەوە دەس کەوت

---

(١) تیرە: طائیفە, هۆز.

کتێبێکی تایبەتی ئەوێ باسی بەڵام کەرامەتێکی گەورەم لێ چاو پێکەوت ئەویش ئەمەیە، لە کاتی ڕۆژئاوادا ویستی دەست نوێژ تازە بکاتەوە[1]، بەندە گەرمی‌یەك ڕووی تێ کردم بەدڵ شکاوی و پەژارەیەکەوە چەند دۆعایەکم بۆ خۆم کرد وە گریانێ ڕووی لێ دام هەندێکی بە دڵ و هەندێکی بە دەم، کە هاتەوە سەیرێکی کردم فەرمووی فلانی دۆعایەکی زۆر کاریگەرت کرد وەرگیراوی بارەگای خوای تەنیا بوون، تێگەیشتم کە خوا بە حاڵی منی ئاگادار کرد بوو.

٤- وە لەو کۆمەڵە پیرۆزە یەکێ تریان جەنابی گەورە پیاوان سیّد عبدالكريم بوو کە دانیشتووی دێی (سەرگەت)ە و زۆر لوطفی لەگەڵما بوو زاوای حەزرەتی شێخ بوو، وە لە خولەفا و جێدار و وەرگیراوەکانی ئەو زاتە بوو، بەو پەڕی لوطفەوە بە برای هەردوو دنیای خۆی قبوولی فەرمووم، وە بەندە چوار شتم لێ دی، دوانی لەسەردەمی ژیانیا، وە دوانی لە دوای وەفاتی، ئەوەی زەمانی ژیانی:

أ- لە خزمەت حەزرەتی شێخ لە بیارە بووم بۆ دێی سید عبدالكريم چووم بۆ سەرگەت سێ شەو لەوێ بووم شەوی یەکەم توجّهێکی لێ کردم لە کاتی خەتما بە ڕووداو لە شەودا دیم کۆشك و تەلارێکی گەورە ڕووە قیبلە دوو ژوور و هۆڵێکی هەبوو تاقێ هەبوو یەك جلد قرآنی تیا بوو لەگەڵ (دلائل الخيرات)ێ وام بۆ دەرکەوت کە هی بەندەیە و دز بردوویەتی زۆر بە خۆشی‌یەوە دەستم دایە هەڵی بگرم، پیرەژنێکی چارەگران و ناشیرین پەیدا بوو هەڵی گرتن، زۆر بە پەلە دەستی پیرێژنەکەم گرت و زۆر بە توندی لێم وەرگرت و لە چنگم دەرهێنا، وە خستمە باخەڵم و بە شادی و گوشادی‌یەکی گەورەوە بەخەبەر هاتم.

ب- شەوی دووەم توجهێکی لێ کردم باڵەخانەیەکم دی زۆر خۆش بو لە چوار دیواری شوورەی ئەو باڵەخانەیەوە چەند ژووری سەر و خواری هەبوو، دەر و ژووری گەچ کاری بوو، لە حەوشەدا ئەسپێکی سپی بەسرا بووەوە، ئاگاداریان کردم

---

(١) لە ماڵی ئێمەوە تا حەوزەکە ١٠٠ سەد پێ زیاتر بوو، وە دۆعاکانیشم بە دەنگی بەرز نەکرد.

که ئەمانە هەمووی بۆ تۆیە، زۆر بە ناویا گەڕام کە بێداربوومەوە بە فتوحی[1] خۆش بە هۆش هاتم، وە ئەو دوانەی کە لە دوای لە دنیا دەرچوونی لێم دی:

أ- لەم لای دێکەوە مەرقەدێ بەسەر گردێکەوەیە، گردەکەش زۆر بەرز نیە لە خەودا چووم بۆ دێی سەرگەت پرسیم سیّد عبدالکریم لە کوێیە ئەشم زانی وەفاتی کردوە، ووتیان وا بەسەر ئەو کەژەوەیە لە پشتی دێ، چووم بۆ ئەوێ دیم بە هەڵقە لەناو کۆمەڵێکا دانیشتوە، سلاوم لێ کردن هەموو هەستانە سەر پێ وەلامی سلاویان دامەوە یەك یەك تەوقەیان لەگەڵ کردم، کاتێ دانیشتم جەنابی خوا لێخۆشبوو سیّد عبدالکریم ڕووی کردە کۆمەڵەکە فەرمووی ئێوە هەمووتان بە شایەت بن من لە حالی حەیاتما لەگەڵ ئەم حاجی محمدی سنەیی‌یە پەیمانی برایەتیمان بەستوە، چ لە دنیا و چ لە قیامەتا برای یەکین وە تکای بۆ ئەکەم، دەسبەجێ بە هۆش هاتم، (لە کتێبی حاشیە المصابیح)دا ئەگێڕێتەوە:

کە (سەهلی کوڕی عەممار) یەزیدی کوڕی هارونی چاوپێکەوت لە خەویا ووتی خوا چی پێ کردی ووتی: دوو فریشتەی توند و تیژ و ترسناك هاتنە قەبرەکەم ووتیان کێیە خوات، دینت چی‌یە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ ریشی سپی خۆم گرت و پێم ووتن لە پیاوی وەك من پرسیار ئەکەن ٨٠ هەشتا ساڵە وەلامی ئەم پرسیارە فێری خەڵك ئەکەم ئیتر ڕۆیشتن[2].

(١) فتوح: کرانەوە و ڕوون بوونەوەی چاوی دڵ.

(٢) عن سهل بن عمار أنّه رأى يزيد بن هارون في منامه بعد الموت فقال له ما فعل الله بك قال أنّه أتاني في قبري ملكان فظان غليظان فقالا من ربّك وما دينك ومن نبيّك فأخذت بلحيتي البيضاء وقلت لهما ألمثلي يقال هذا وقد علّمت الناس ثمانين سنة فذهبا.

ب- له خەوما وام زانی له جێگەیەکدا له خزمەت شێخا بووین (خوا لێی ڕازی بێ) کۆمەڵێ زۆر لـه خولـەفا و مرید لـەوێ بـوون جێگـه دەس نەئەکـەوت، لـه پڕ شێخ عبدالکریم تەشریفی هێنا و بردمی بـۆ ماڵی خۆیـان لـه ژوورێکـی خۆشـدا دایـنام، وه زەرفێ هەنجیری تەڕی لەبەر دەمما دانا فەرمووی بخۆ هەندێکم خـوارد خەبـەرم بـوەوه بەسطێ[1] زۆر گەورەم بۆ پەیدا بوو.

٥- وه هەروەها لەو برا دینی‌یانه یەکێکی تریان خوا لێ خۆشبوو شێخ علی بـوو ئـەمیش بـرای سـیّد عبـدالکریم بـوو کـه زیـاده لـوطفـی براکـەی دی پـەیمانی بـرایی بـۆ هەردوو لا بۆ کردم بەڵام سید عبـدالکریم زۆر ئاگـادار و خـاوەن ئاسـتانه بـوو[2]، و جـەنابی شێخ عـەلی کتێبی آداب الأصحابی دامێ ماوەیـه بـه خۆندنـەوەی خـەریك بووم چەند بەرەکەتێکم لێ وەرگرت.

٦- وه له ڕیزی ساداتی پایه بەرز خوا لێ خۆشبوو سیّد شهاب الـدین طالشـی بوو که ماوەی ١٢ دوانزه سـاڵی تـەواو بـه جۆرەهـا ڕیـازەتی[3] نارەحـەت و خزمـەت کردن له خزمـەت حـەزرەتی پـیرا خـەریکی سـلوك[4] و بڕینی پله و پایەی صـۆفیەتی بوو، وه چەشنەها مجاهده و ئەزیەتی له ڕێگـەی خـوای تعـالی‌دا کێشـا، وه خەلیفـەی حەزرەتی عوسمان و زاوای بوو، ڕۆژێ له سەرمای زستانا چـوو بـوو بـۆ کێـو کـۆڵێ داری به پشتی خۆی هێنا بوو بۆ ماڵی حەزرەتی شێخ، مێزەرێ سەوزی که کۆن بـوو بوو به دارەکەوه لـه مـاڵی حـەزرەتی شێخ بـه جێ مـابوو، حـەرەمی[5] حـەزرەتی شێخ لەسەر کەندووی ئارد بۆ بەرەکەت دایـنا بوو، ئیتر بۆی نـەناردبوەوه، ئـەم زاتـەش لـه

---

(١) بەسطێ زۆر: دڵ کراوەییەکی زۆر و گەش بونێکی فراوان له دەروندا.

(٢) ئاستانه: قاپی.

(٣) ریاضەت: ئازار به نەفس دان به کەم خوراکی و کەم خەوی و عیبادەتی زۆر.

(٤) سلوك و مجاهدة: کەسبی ئاداب و أخلاقی پیاو چاکان له ڕێی دیاری کراوی خۆیەوه.

(٥) حەرەم: خێزان.

ڕووی لوطف و مەرحەمەتەوە پەیمانی برایەتی لەگەڵ بەستم، ئەوەندە خۆمم بە نالەبار و نا لایق ئەزانی ناچار خۆم کرد بە بار بەسەر ئەم زاتە گەورانەوە.

بە ماری عەشقی جگەر زامارم — نیە پزیشکێ بێت بە هاوارم
مەر خۆشەویسیێ کە بۆی پەژارم — هەر ئەوە دەرمان هەر ئەوە چارم

٧- هەر لەو کۆمەڵی برایانە سید شا کەرەم زەهاوی خوا بی بەخشێ کە لە وەرگیراوانی حەزرەتی شێخ بوو لە ڕیزی پەسەندەکانا، زاتێکی لەخوا ترس و مل کەچ بوو وە تاقەتی نەبوو لەگەڵ کەسا دابنیشێ هەتا لەگەڵ مریدەکانیشا، ڕۆژێ بە تەنیا چوومە خزمەتی هەڵ نەسا بڕوا تێگەیشتم لوطفی هەیە، ڕۆژێ تر چوومە خزمەتی زۆر پەژار و خەمبار بوو بێدەنگ و سەنگ حەدیث و فەرموودەی حەزرەت کە ئەفەرموێ ﷺ[1] (خوای پەروەردگار زۆر بەندەی چڵکن و کوڵکن و تۆزاوی و پۆشاك دڕاوی وای هەیە ئەوەندە بە نازە لە قاپیەکەیدا کە ئەگەر سوێند لە خوا بخوا بڵێ نابێ وا بکەی ئەبێ وا بکەی دڵی ناشکێنێ و بە قسەی ئەکا) شامیلی حاڵی بوو، لە پاش ٢، ٣ دوو سێ سەعات سەری هەڵبڕی فەرمووی: من نیسبەتی سیادەتت لێ ئەکەم، ووتم بڵێم چی تۆ باشتر ئەزانی ووتی بەڵێ تۆ سیادەتت هەیە و سیّدی هەستام چووم عەرزی حەزرەتی شێخم کرد فەرمووی: دوای ماوەیە بێدەنگی دوایی فەرمووی ڕاستی ووتوە، دایکی باوکت لە سادات بووە، وە خۆیشت تجدیدی سیادەتت کردوە بووی بە قەومی سیّد[2]، عەرزم کرد قوربان بۆچی لە دایکەوە إنسان ئەبێ بە سیّد فەرمووی: بەڵێ حەزرەتی فاطمە (سلاوی خوا لەسەر باوکی و خۆی

---

(١) حدیثەی پێغەمبەری موبارەك ﷺ ئەفەرموێ: (وربّ أشعث أغبر مدفوع بالأبواب لو أقسم على الله لأبّره).

(٢) یانی لە ژن خواستنەوە.

بیْ) سیّد بوه وه حەزرەتی عەلی سیّد نەبوه (کرّم الله تعالی وجهه) بەم مژده زۆر خۆشه شەوق و شادیم بۆ هاته دی و شادمان بووم.

خوا بــه هەر دوو کوڕی فــاطمه — بــه ئیمـانـەوەم بیْ خاتیـمه
گەر دۆعام ڕەدکەی وەیا خۆ قبوول — دەسم به داوێن ئەولادی رسول[1]

ربّنا آمنا فاغفر لنا ذنوبنا وقنا عذاب النّار آمین.

٨- وه یەکیْ تر لەوانه عەهدیان بۆ کردووم جەنابی سیّد محمدی باینچۆیی‌یه برای خوا لیْ خۆشبوو سیّد هیدایەت اللەی باینچۆیی‌یه.

٩- وه یەکیْ تر لەوان برای بەڕێزم حاجی شێخ محمدی ئەسکەندەری‌یه کوڕی حاجی شێخ ئەحمەدی ئەسکەندەری که ئەم سیّدەش پەیمانی برایەتی بۆ کردوم وه یەکێکه له ئیجازه دراوانی حەزرەتی شێخ.

١٠- وه یەکیْ تر لەوان که سیّد و محبوب و مقبولی حەزرەتی شێخه وه علومی ظاهر و باطندا مشهور و بەناوبانگی جیهان که هەڵبەستی شیرین و جوانی هەیه به زمانی عەرەبی و فارسی کوردی وه ئیمان و باوەڕ (القعیدة المرضیة)ی هەیه به هەڵبەست یانی جەنابی سیّد عبدالرحیم تاوەکۆزی (مەولەوی) نازناوی هۆنەری (مەعدوم) ئەویش پەیمانی برایەتی بۆ کردووم که له دونیا و قیامەتا (برابین)، هەرچەن له زاناییشدا بیْ وێنه بووه.

تا ئێره ساداتی عالی دەرەجاتن ئیتر لەم لاوه عولەما و زانایانی کیرام و بەڕێز و به نرخن: ئەمەش دیسان له ساداتی عالی دەرەجاتە.

١١- زانای بەرزی خاوەن ڕەوشتی شیرین له ذوریەتی سید المرسلین ﷺ جەنابی سیّد سعد الدینی کانیسورانی‌یه که برازای سید قطب الدینی کەلجینی‌یه خوا لێیان خۆشبیْ که دانیشتوی دێی ناوبراوه، به حوسنی ظن و بڕوای تەواو پەیمانی

---

[1] إلهي بحق بني فــاطمة — كه بر قول إيمــان كنــم خــاتمه
أگر دعوتم رد كني ورقبول — من و دست و دامان آل رسول

برایەتی لەگەلا بەستم، کە ئەو بوو بە هۆی دۆستایەتی و ئاشنایی بەینی بەندە و سید قطب الدین و سیّد محمد أمینی کوڕیدا (خوا پاداشتیان لە جیاتی بەندە بداتەوە).

١٢- وە یەکیٚ تر لەوان جەنابی سید سعیدی کوڕی مەلا مهدی بۆڕیدەری‌یە وە لە ڕیزی ساداتن خوا پایە و سایەیان بلّند تر بکات.

١- ئەنجا یەکیٚ لەوانە کە لە ڕیزی زانا و عولەمای کرامن کە العلماء ورثة الأنبیاء خوا لیّیان خۆشبیٚ کە ئەویش جەنابی زانای کامیاب مستغنی الألقاب حەزرەتی پیّشەوای زانایان قیبلەی أکرەم و ئەفخەم و ئەمجەد مەولانا أحمدی کوڕی ملا عبدالرحمن نۆدشی‌یە خوا پایەی بەرزتر بکا کە یەکیّکە لە ماقولاّن و مقبولاّن و بەڕیّز گیراوانی حەزرەتی شیّخ و ئیجازە دراوانیەتی، وە بە ڕاستی زانایەکی بە توانا و وە شارەزا و کارامەن لە زانستی ظاهر و باطندا بەلّکو تاقە زانای چەرخ و ڕۆژگارن، ئیمڕۆ لە هەموو وولاّتی کوردستاندا دووەمیّکی نیە وە دوور نیە لەناو تەواوی زانای ئیسلامدا یەکەم بیٚ، وە تەنیا شۆڕە سواری چەرخی خۆیەتی العلماء ورثة الأنبیاء بەڕیّز و خاوەن پایە ئەگریّتەوە والراسخون فی العلم سەرمایەی إقبالّ و نگینی ئەوە، لە ڕاستیدا یەکیّکن لە ئەولیای کامل بەلّکو کامیل ومکّمیل، لە گۆشەی گۆشە گیریدا بەلاّم بە پەردەی کەم خۆی شاردۆتەوە، وە بووکی حیلە باز و فیّلّزانی دنیای بە تەلاقی سیٚ بە سیٚ لە خۆی دوور خستۆتەوە بەلاّم گەورەیی و فضلی ئەو بەسەر علمای ئاخیرەتدا لە ڕۆژ ئاشکرا تر و دیارترە.

(ذلك فضل الله یؤتیه من یشاء والله ذو الفضل العظیم).

حیکمەتی مەحزە ئەگەر لوطفی جیهان ئافەرین

تەنیا کەسیٚ دروست کا بۆ صەلاحی عالەمین

ئەم بەندە کاتێ چوومە مەجلیسی پڕ فەڕ و بەرەکەتی ئەو زانا گەورەیە چەند مەرحەمەت و لوطفیکم لێ وەرگرت وە تامی شەربەتی بە خزمەت گەیشتنی ئەوم بە ذایقەی ئیخلاص و محبەت چەشت زیارەتیم کردوو ووتم:

که دیم خەڵکی ئەهاتن بۆ سەر دەریای لێشاوت

شەربەی ئومێدم هەڵگرت بۆ لوطفی وەك شەکراوت(۱)

بە زەردەخەنەیەکەوە فەرمووی ئەی تۆ چیت ئەوێ؟ عەرزیم کرد لە سادات و علما بەزەیی‌یان پێما هاتۆتەوە رەحمیان پێ کردوم بە لطف و میهرەبانی‌یەوە عقد و عهدێکیان بۆ کردوم بۆ ڕۆژی ترسناك و پڕ خەتەری ئاخیرەت سا بەڵکو بە بەرەکەتی چاکانەوە ڕزگاری یەك بە دەس خەم لەخزمەت جەنابی بەرزی ئێوەشدا ئومێدی ئەو عینایەت و لوطفەم هەیە:

| | |
|---|---|
| دانیشتوانی نعمان الأراك | ئێوە بزانن بە یەقینێ پاك |
| ئێوە لە روبعی مەسکونی دڵما | جێگیرن بێ شك، دانیشتوون بێ باك(۲) |

که نیاز و ئارەزووم حاڵی بوو بە لطف و شەفەقەت و میهرەبانی پەیمانی برایی هەردوو دنیای بۆ کردم وە فاتیحەی تبرّکی بە دوادا خۆند (اللّهم متع المسلمین ببرکاته).

| | |
|---|---|
| گەر عەشق نەبوایە خەمی نەئەخورا | قسەی خۆش لە کوێ ئەکرا و ئەبیسرا |
| ئەر با نەبوایە کە زوڵفی لادا | ڕووی یار بۆ عاشق لە کوێ ئەبینرا(۳) |

---

(۱) عەرەبیەکەی: فلمّا رأیت الناس شدّوا رحالهم الی بحرك السّهال جئتُ بقربَتي

(۲) عەرەبیەکەی: أسکان نعمان الأراك تیقنوا بأنّكم في ربع قلبي سکان

(۳) گر عشق بنودی وغم عشق نبودی سنحن نفزکە گفت یکە شنودی

ور باد بنودی کەسر زلف ربودی روخسارەی معشوق باشق کە نمودی

جەنابی حجة العلماء مولانا أحمدی ناوبراو ئەم حیکایەتە پڕ سوودەی خوارەوەی بۆ فەرمووین: لە زەمانی سلطان عبدالمجید سوڵتانی عوسمانی ساڵێ محمد منیب پاشا فەرمانداری شاری سلێمانی بوو، مەرحومی باوکم (ملا عبدالرحمن نۆدشی) مفتی شاری سلێمانی بوو، سیّدێکی بوخارایی کە یەکێ لە گەورە پیاوانی مەشایخی نقشی بوو زۆر بە تصرّف و لە طەریقەدا بە دەستەلات بوو لەگەڵ باوکی خوا لێ خۆشبووما ٤ چوار مانگ چووە خەڵوە و ڕەفاقەت و محبّەتێ گەرم لە میانیاندا بوو، محمد منیب پاشا کە ئەمەی بیست بە خزمەت گەیشتنی سیّدی داوا کرد، عەرزی سیّدمان کرد لە سەرەتاوە پێی خۆش نەبوو بەلام بە تکا و پاڕانەوەی زۆری باوکم ڕەزامەندی نیشان دا، وە ئەمجار لە جانتاکەی خۆی ٣ سێ ئەمووستیلەی پیرۆزەی دەرهێنا و فەرمووی ئەمانە بایی ٣ سێ تمەنە، چوون بۆ لای منیب پاشا بە ئیخلاصی کامیلەوە.

سێ کوڕی هەبوو داواکران بۆ خزمەت سیّد، دەسماڵێکیان هێنا هەندێ پارەی نەختینەی تیا بوو لە خزمەت دانا، جەنابی سیّدیش ئەموستیلەکانی کردە دەس کوڕەکان، کاتێ گەڕاینەوە، ئەو نەختینەیەمان ژمارد ٣ تمەنی تەواو بوو[1] بۆمان دەرکەوت سیّد بە کەشف ئەوەی زانیبو کە ئەو پارەیە دائەنرێ بۆیە سێ ئەموستیلەی بۆ بردن و نرخەکەشی فەرموو کە بایی ٣ سێ تمەنە، لە پاشان سیّد تشریفی رۆیی وە باوکیشم کۆچی بۆ ئاخیرەت کرد، ئەنجا لە پاش لە دنیا دەرچوونی باوکم ڕەسووڵ ناو پیاوی ماڵی حاجی قادر ئاغا بوو پێی ووتم، من لە سەر کێڵگەی ئاغا بووم لە خەوما دیم لە ناکا ئەم زەمینە لەریەوە و هاتە حەرەکە و لەرزە لە پڕ کۆمەڵێ سوارە هاتن هەموو سیّد بوون بەلام باوکی خوا لێ خۆشبووت مێزەری سپی بە سەرەوە بوو، پۆشاکێکی تازەی پۆشیبوو، ئالایەکی بە شانەوە بوو چوومە پێشەوە عەرزم کرد دەستی خۆتم بدەرێ با ماچی بکەم فەرمووی لە پێشا بڕۆ دەستی سیّد ماچ بکە

(١) تمەنێکی ئێرانی: ١٠ قرانە و جاران بە دەرهەمێ ئەچوو.

که ڕۆیشتم تەماشام کرد سەرۆکی ئەو کۆمەڵە سیّدە بوخارایی‌یەکی میوانی ماڵی ئێوە بوو دەستم ماچکرد هاتمەوە خزمەت باوکت عەرزم کرد ئەم بەیاخە چی‌یە؟ وە تشریفتان بۆ کوێ ئەچێ فەرمووی سولّتان عبدالمجید لەگەڵ کافرانی روس لە غەزادایە، سیّد بۆ کۆمەکی سولّتان ئەچێ وە پایەی عەلەم داری‌یان بە من داوە، هەر لەو کاتەدا زانیم ئەمە خەوە، وە ئەوەی دیتوومە لە خەوما بوە، عەرزی مەلا عبدالرحمنی مفتیم کرد کە باوکی جەنابتە، ئەمە من خۆم خەو ئەبینم ئەگونجێ لە بێداریدا عەرزی جەنابی ملا أحمدی کوڕت بکەم باوەڕم پێ نەکا، نیشانەیەکم بدەرێ با بە قسەکەم بڕوا بکات، فەرمووی بە ئەحمەد بڵێ ناونیشانی یەکەم ئەوەیە کتێبێکم بە دەسو و خەتی خۆم نوسیوە وە بەرگەکەیم سوور کردوە ئەحمەد لە تاقەکەی پشت سەری خۆیەوە دایناوە پێی بڵێ ئەو کتێبەی باش ئاگاداری بکات چونکە ئەوکتێبەم خۆش ئەوێ ناونیشانی دووەم ئەوەیە مەلا جەلالی کوڕم دوێنێ شەو لەگەڵ دایکیا شەڕ و معرکەی کردوە قسەی سارد و بێ مەزەی لە روی دایکیا کردوە، بە جلال بڵێ ئەگەر جارێ تر وا بکات بە یەکجاری لێی ئەڕەنجێم وە ئیتر کردەوەی ئاوای لێ قبووڵ ناکەم.

جەنابی عەلامەی پایە بەرزی حاجی ملا أحمدی نۆدشی فەرمووی: هەردوو نیشانەکانی ڕەسووڵ ڕاست بوون ئەو کتێبە بەرگ سووره مطول بوو کە مەرحومی باوکم بە خەتی پیرۆزی خۆی نووسیبوویەوە وە جلال الدینی برام هەر لەو شەوەدا لەگەڵ دایکم هەرا و بەزمێکی کردبوو.

بۆ ئەوەی ڕۆحی بە عەشق زیندو بوە مردن چی‌یە؟

مانەوەی ئێمە لە دیواندا بە دایم ڕەسمی‌یە[1]

---

(١) هرگز نمیرد إینکه دلش زندەشد به عشق ثبت آست بی جریدەء عالم دوام ما

وەرگێری ئەم کتێبە ئەفەرموێ:

لـه جـەنابی مـلا محمـد أمـینی کـانی سـانانم بیست فـەرموی: کـاتیٚ هیٚشـتا قوتـابی دیـنی بـووم ئـەم خۆنـد گەلەنبـەوی بورهـانم ئەخویٚنـد، لەخزمـەت علامـەی زەمـان پیٚشـەوای هـەردوو عیلمەکـە (شـەریعەت و طەریقەت) بیٚ هاوتای چاخی خۆی جەنابی مامۆستا مـلا بـاقر علیـه الرحمـة والرضوان لـە دیٚی بالـك لـە مەریوان ئەم خویٚند بە بیٚ ئەوەی هیچ باس و خواسیٚ لـەوە پیٚش هـەبوو بیٚ، شـەویٚ لـە خـەوا کـۆڕیٚکی زانایانم دی، لە لای سەرەوەی کۆنگرەکە زانایەکی زۆر بەرز و بـەڕیٚز سـەرۆکایەتی کۆمەڵەکـەی ئـەکرد، فەرمانی ئەدا و ئەی فەرموو بە یەکیٚ قورئان بخویٚنە بە یەکیٚ تر خەریکی فلاّن شـت بـە، مـنیش پرسـیارم کرد ووتم ئەوە کیٚیە؟ ووتیان حـاجی مـلا أحمـدی نـۆدشیـیە بـانگی لـیٚ کـردم بـە ئیشـارەی دەس چـوومە پیٚشەوە کاغەزیٚکی تەبەق پانی گەورەیدا دەستم یەك تەبەق بەلاّم دوو لیستەی نـاوی تیـا بـوو، فـەرمووی ئەمە ریزی ئەو زانا و عولەمایانەن کە لە عیلمَ و فتوایان ڕازیم وە ئـەوەش لیسـتەی ئـەو زانایانـەن کـە لـە عیلم و فتوایان ڕازی نیم ئیتر خەبەرم بووەوە، وە فەرموویی من لەو کاتەوە ئیخلاص و محبّـەتی خـوا لـیٚ خۆشبوو حاجی ملا أحمدی نۆدیشم هەیە.

وە مەرحوومی علامەی زەمان ئەکسـیری بیٚ ویٚنـەی شـارەزایان ( پـەڕیوە مامۆسـتا مـەلا بـاقر) لـە هـەموو زانیاری و زانستیـیەکدا لە عیلمی تصوّف و جبر و هندسە و فەلەك و باقی علومی قرئاندا هـەرگیز ویٚنـەی نابیٚ بیٚجگە لەوەی بە خەطی خۆی ئیجازەی (      ) کەس داوە لە ئیجازەی عیلمی ئەی فەرموو:

حاجی ملا أحمدی نۆدشی زۆر خاوەنی فضل و عیلم بوە، وە زاتی بوە بە ویٚنەی شیٚخ إبن حجر (خـوا لـیٚ خۆشنود بیٚ) کە ئەم زاتە زۆر زانا و عالم و مفتی مکّەی مکرمـە بـوە، وە لـە شـەرعدا لـە مذهبی ئیمـامی شافیعیدا قسەی موعتەبەر و فتوای جیٚگەی بڕوا و دڵنیایی بووە.

حاجی ملا أحمدی نۆدشەیی عیلم و زانینەکەی موهوب و خواداد بوە، ئەڵیٚن کاتیٚ لە کەشتیدا ئەبن کە بـۆ سەفەری حەج ئەچن لەگەڵ یەکیٚ لە (کەشتیـیەوان)ەکان قسە ئەکات کە کاتی حەوانەوە ئیسراحەتی ئـەبیٚ ئەفەرمویٚ بە عیلمیٚ کە خوا بە منی داوە و ئەی زانم ئەم کەشتیـیە نیـو سـەعاتە بـە هەڵـەدا دەڕوات کـاتیٚ تاقی ئەکەنەوە وەهایە.

وە هەروەها پیٚشەوایی زانایانی زەمـان جـەنابی زۆر بـەڕیٚز مامۆسـتا مـلا بـاقر ئەی فـەرموو مـەرحومی مـلا عبـدالرحمنی پیٚنجـویٚنی کـە یـەکیٚ بـوە لـە نـاودارانی عولـەمای ئیسـلام وە تعلیقـاتی و لـیٚ دوانی بەسـەر گەلەنبەوی بورهانەوە هەیە لە زانیاری منطیقدا, کە پایە بەرزی ملا پیٚنجویٚنی لە زانیاریـیەکانا بە ناوبانگە ئەگەر ئەم زاتە عـالی جـەنابـە گیروگرفتیٚکـی ببوایـە بـۆ لابردنی پرسـیاری لـە حـاجی مـلا أحمـدی نـۆدشی کـردوە، ئـەویش بـەیانی ئـەو حوکمـەی بـە ئایـا نـا بـووە، وە بـەبیٚ بـەیانی هـیچ دەلیـل و حوجـەتیٚ (یـانی باسـکردنی بەڵگـە و پیٚسـەلماندن وە یـا ڕوون کردنەوەیـەك فەرمایشتەکـەی وەرگرتـوە و فتواکـەی قبـووڵ کردوە.

٢- وه له ڕیزی زانایاندا جەنابی ئاکام بەختەوەر شەریعەت ڕەووشت کۆششکەر بۆ دەستخستنی ویلایەت عالی قەدری ماجید (مولانا حامید)ە کە ئەم زاتە زانا بە علومی ظاهیری و باطنی بەڵکو خواناس و عامیل زاهید و واریعە لە گرۆی ماقووڵان و وەرگیراوانی حضوری حەزرەتی سراج الدینه قدّس سرّه وه نیسبەت بە حەزرەتی پیر وەك وەزیرێکی ئەو وایە چونکە نووسینی هەرچی وەڵام و پرسیار وه نامە و صوحوف عائیدی ئەو بووە، حەزرەتی پیر هەمووی بەرەو ڕووی ئەو ئەکردەوە، دارشتێکی جوان و ڕێکخستنێکی ڕێکو پێك ڕستەکانی پڕ مەزە و شیرین بوو کە بە خامەیا ئەهات، گوایا خەزێنەی ئاداب و گەنجینەی ئەسراری حەزرەتی قطبی زەمان و غەوثی دەوران دەستگیری شێخ عوسمان بوو قدّس سرّه.

لەگەڵ ئەم کەمتر بچووکی خۆیەدا میهرەبانی‌یەکی زۆر و خۆشەویستی‌یەکی زیادی دەرئەبڕی، وه بێ حەد و ژمارە لطف ودۆستایەتی بە ڕاستی لەگەڵما بەجێ ئەهێنا، جا ئیتر ئەویش لەبەر ڕەزای خودای تعالی بە مەیل و لطفی خۆی عەقد و پەیمانی برایەتی هەردوو جیهانی لەگەڵ بەستم.

---

بۆ نموونە: جارێك مەرحومی ملا عبدالرحمن بە تەحریر و نوسراوێکی دور و درێژ باسی فتوای لێ ئەکات دەربارەی نذری مبیع قبل القبض ونذری صداق قبل القبض لە وەلاما ئەنوسێ عزیزا (نذرهما عینین لا یجوز ودینین یجوز).

پرسیارەکەبە کوردی ئەمەیە: ئایا دروستە فرۆشراو پێش وەرگرتنی کڕدراوە کە نەزر بکرێ؟ وه ئایا ژن نەزری مارەیی یەکەی بەر لەوە وەرگرتبێ ئەتوانێ نەزر بکا؟ جا ئەم پرسیارەی بە چەند حجەتێکی عیلمی یەوە لە جەنابی حاجی ملا أحمد کردووە. کە بەیانی حوکمی ئەم مەسەلەیە بفەرموێ:

وەڵامەکەشی ئەمەیە کە ئەفەرموێ: خۆشەویس نەزری ئەو دووە ئەگەر عەینی و نەختینە بێ دروست نیە، ئەگەر قەرز بێ دروستە.

کاتێ مەلای پێنجوێن ڕەزای خوای لێ بێ هەواڵی لە دنیا دەرچوونی حاجی ملا ئەحمەدی نۆدشی ئەبیسێ بێ هۆشانە بە گریانەوە بەرەو بازار ئەڕوات خەڵك عەرزی ئەکەن قوربان بۆ وا ئەکەی؟ ئەفەرموێ جێگەی بڕوام بە عیلمی هەبوو هەر حاجی ملا أحمد بوو، ئەوا ئەو وەفاتی کرد، نە ئیقەم بەعیلمی کەس هەیە، نە بە عیلمی کەس، ئەترسم لە فتوایەکا بە هەڵە بچم لێ پرسراوی لای خوا ببم.

حاڵەتی جەنابی ملا حامید وەهایە کە کاتی خۆی بە خۆڕایی ناباتە سەر وە هەموو تەمەنی خۆی بە خوێندنەوەی کتێبی علم و تەفسیر و حدیث و تصوّف و ئەمانەوە یا خەریکی کتێب نووسینەوە و کتێب دانان ئەبوو لە پەرتووکە شەرعی‌یەکاندا[1].

---

(١) حاجی شێخ محمدی سەمرانی دانەری ئەم کتێبە ئەگێرێتەوە ئەفەرموێ:

ئەم بەندەی هەژارە ڕۆژێ لە خزمەتیا دانیشتبووم باسێ لە بارەی قەزا و قەدەر هاتە پێشەوە من ووتم: لە ڕۆژی حشرا ئەگەر پرسیاریان لێ کردم لە وەلامدا ئەڵێم کاتێ من لە رەحمی دایکما ساوا و بێ ئاگا بووم فریشتەکانی خوا بە فەرمانی پەروەردگاری ذو الجلال لە سکی دایکما حازر بوون کەم زۆر کردار و ڕەفتاری منیان لەناو چاومدا ثبت کردوە، ئیتر هیچ حەرەجێکم لەسەر نیە، وە من دەسەلاتم چی‌یە؟

فەرمووی نەخێر ئەم ووشەیە دلێری و سەرپێچانە لە خزمەت ربّ العالمین دا: چونکە شەیتان لە خزمەت ربّ العالمین هەروا بێ باکانە چووە پێشەوە، وە عیبارەتی (بما أغویتنی) ووت یانی تۆ منت گومڕا کرد.

ئیتر من لەو قسەی خۆمە پەشیمان بوومەوە، دوایی ووتی حاجی محمد بە گوێی ئاگاداری ببیسە تۆ کە خاوەنی دێی سەمرانی بڵێ بە کەسێ لە ڕەعیەتی خۆت: ئەمشەو بڕۆ ماڵی فلان کەس بدزە و چی شتی بە قیمەتی هەیە بۆ بێنە ئەویش لەسەر قسەی تۆ ڕۆیشت ماڵی ئەو شەخسەی بری، بەڕێکەوت خاوەن ماڵ پێی نازانێ و بۆ بەیانی بە پەل بەسراوی بۆ شکات هێنای بۆ لای تۆ، تۆش بێگومان ئەڵێی هەی بێ ئەدەب!!! بۆچی ئیشی وات کردوە، یانی بە چ ڕویەکەوە ئەچی ماڵی خەڵك ئەبری؟

ئەنجا ئەگەر ئەوگزیرە لە وەلامدا بە دلێری هاتە پێشەوە زمان درێژی کرد ووتی تۆ خۆت منت نارد، وە من بە ئەمری خۆت چووم هێناومە، ناچار تۆ ئەو شەخسە بە دروزن ناو ئەبەیت وە زۆر تۆڵەی ئەکەی، وە بە ئەزیەت و ئەشکەنجە سزای ئەدەی وئەڵێیت:

بەوە ڕازی نابی پیاو خراپیت کردوە هێشتا بە من ئەڵێیت تۆ ناردمت؟ بەلام ئەگەر بەوێڵ و ئەدەب هاتە پێشەوە و داوای لێ بوردنی کرد زۆری مەعزەرەت هێنایەوە ووتی قوربان بێ شعور بووم و نەم زانیوە ئەمجارە ببەخشە شەیتان پێی کردم، جارێکی تر ئیشی وا نالەبار ناکەم.

بێگومان بە بەخشندەیی و مەرحەمەت و بەزەیی‌یەوە بە ڕەو ڕووی ئەچی، وە داواکەی وەرئەگری وە لە لای خاوەن ماڵەکە تکای بۆ ئەکەی، وە داوای لێ بوردنی بۆ ئەکەیت ئەڵێی نەفام بوە ئەمجارە با بڕوات جارێکی تر ئیشی وا ناکات.

بەڵێ حەزرەتی ئادەم (هەزاران سلاوی خوا لەسەر پێغەمبەری خۆمان و ئەو و هەموو پێغەمبەران بێ) بێ فەرمانی خوای کرد بۆ گەنم خواردن لە بەهەشت.

# چەند مەکتوبێکی ئیمامی غەزالی

## یەکەم مکتوب:

وە لێرەدا مەکتوبێکی ئیمامی غەزالی کە بەم بۆنەوە ووتراوە، بۆ ووریاکردنەوەی ترس و خەتەری خۆشەویستان ئەی نووسینەوە: گێژەلووکەیەك کە بە هێزی بای صاف لە زەوی بەرز ئەبێتەوە هەروەك منارە سەر ئەکەوێ خۆلێ و خاك بە دەور خۆیا هەلێ ئەسووڕێنێ کەسێ ئەگەر بۆی بڕوانێ وا گومان ئەبات کە ئەو خۆلێ و خاکە خۆبەخۆ هەلێ ئەسوڕێ. جوولان و سەرکەوتنی لە خودی خۆیەوەیەتی، بەلام وا نیە لەگەلێ هەر تەنیا گەرد و ڕیزەیە لەو خاك و تۆزە کە ئەوی بە هەلێ سووڕان و جوولە و خۆلێ هێناوە هەوایە بەلام ناتوانین هەواکە ببینین ئەتوانین تۆز و خاکەکەی ببینین، ئەنجا دەرکەوت بایەکە لەم ئیشەدا کار بە دەست ئەوە و خۆی بە نەبوو پشان دەدا.

و خاك و خۆلەکە کە خۆی لەو ئیشەدا دیسان بە کار بەدەست نیشان ئەدات بەلام هیچی بە دەس نیە، خاك لەو جمو جوولەی خۆی بێجگە لە بێ دەستەلاتی و بێچارەی هیچی لە دەستا نیە بەلکو سەلتەنەت و دەسەلات لە دەس هەوادایە و هەواش نادیارە.

مەثنەوی (جلال الدینی ڕۆمی) علیە الرحمة چاکی فەرمووە لەم شیعرە مەزەدارانەدا.

---

شەیتان بۆ سەجدە و کڕنووش نەبردن بۆ ئادەم لە بەهەشت سەرکێشی کرد و ووتی من لەو چاترم بەلام حەزرەتی ئادەم سلاوی خوای لێ بێ فەرمووی: **ربّنا ظلمنا أنفسنا** یانی ئێمە زولمان کرد لە خۆمان، ئەو ئەدەب و نیسبەتی گوناهدان لە (خۆی)ە بۆ ئەم بوو بە هۆی گەیشتن بە پایەی بەرزی نبوەت و خەلافەت بەلام سەرکێشی و خۆ بە زل گرتنی خۆی بۆ ئەویش بوو بە هۆی گرفتار بوونی بە نەفرین و لەعنەتی هەتا هەتایە پەنا ئەگرین بە خوای پەروەردگار لێی.

ڕەسمی عەبدی‌یەت و بەندەیی ئەدەب و خەجالەتی و مەعزەرەت کردنە

به بەخشین دیـار، بـه زات نادیـار        تۆ وەکو ئاوی ئێمە ئاشی کار

تۆ بە چەشنی با ئێمە وەك غوبار        بـا نیهانی‌یە و تۆزی ئـاشکار

یانی ئەی ئەوەی کە زاتی مقدس و بەرزت بە چاو دیار نیە بەڵام هەموو بەخشین و عەطا و نیعمەت و ئیشوکارت لە زەوی و ئاسماندا ئاشکرایە، تـۆ بـە وێنـەی ئـاوی کە ئاش بەو هەڵ ئەخولێ وە ئێمە وەك ئاشەکەین، تۆ وێنەی بـای وە ئێمـە وەك تـۆز و خۆڵی ئەو گێژ و لوولەین کە با گەرد و لولی ئەکا و هەڵی ئەسوڕێنێ بایەکە خۆی شاردۆتەوە تۆز و خۆڵ خۆی دەرخستوە.

**مکتوبی دووەم:** ڕۆح بووی بە نـەبوو، پیشـان دەرە چـونکە کـەس ڕێی پێ نابـا بـەڵام دەسـەڵات و سـەڵتەنەت و تصـرّف لـە دەس ئەودایـە بـەدەن ئەسـیر و دیـل و بێچارەی دەسی ئەوە، هەرچی خەڵکی کە ئەی بینن لـە لەشـەوە یـانی لـە قاڵبـەوە ئـەی بینن، بەڵام قاڵب لێی بێ ئاگایە هیچی لە دەسا نیە، نمونـەی هـەموو عالـەم لـە چـاو قیّومی کائنات جلّ جلاله بەم چەشنەیە قیّومی عالەم بـووی بـە نـەبوو خـۆ دەرخـەرە، لەگەڵ ئەوەشا جیهان زەڕەیەکی نیە إلاّ حەرەکە و جووڵـە و بـوون نـەمانی هەسـت و نەستی بە دەس قیّومی عالەمە.

ئەم هەموو ئەم لاو ئەو لای زەوی و ئاسمان و باو باران و دار و بەرد و گیانـدار و مـرۆڤ هـەموو بوەکـان (موجـودات) هـەروەکو بـەدەنی إنسـان لـە موعامەلـەی هەڵسوڕاودا سـووڕی خـۆی بێ خەبـەر و ئاگـا بـوو، هـەموو سـوڵتانی ڕۆح و هـەڵ سـووڕێنەر و تەگبیرکـەری بـوو هـەرواش ربّ العـالمین هـەڵ سـووڕێنەری جیهـان و جیهانیانە.

ربّ العالمین هەڵسوڕێنەری جیهان و جیهانیانە، کە ئەمانە خۆیـان بـە بـوو پیشـان ئەدەن وەك بەدەن کە .هەردوو بێ دەسەڵاتن، وە قیّومی عالەم خۆی بـە نـەبوو نیشـان ئەدا وەك ڕۆح بە نیسبەت قالبەوە، کە هەمو دەسەڵات و تصرّف بـەدەس ئەمەوەیە،

وجوود بە راستی و دروستی هەر وجودی قیّومی عالەمە باقی موجودات وجودیان مەجاز و ئیسمی‌یە.

(مع)[1] یەتی خوایە لەگەڵ هەموو شتێکا کە هەم هۆی بوون وە هەم هۆی مانیەتی بەبێ معیەتی ئەو مەحاڵە و مستحیل و نابێ و ناگونجێ مانی شت بە هیچ جۆرێ، وە خۆی (مع)یەت چوار بەشە، ١- بون و معیەتی جسم لەگەڵ جسم ٢- بوونی عَرض‌لەگەڵ عەرەض ٣- بوون و معیەتی عرض لەگەڵ جسم. ٤- معیەت و بوونی قیّومی عالەم لەگەڵ عالەم حقیقەتی معیەتی چوارمە، یانی معیەتی قیومە لەگەڵ عالەم بەلاّم بۆ کەس ئەو (مع یەت) نابینرێ (وهو معكم أينما كنتم)[2] صدق الله العظيم, ئەم مەعیەتەش بووی بە نەبوو پیشاندەرە کە قیّومی عالەمە[3]، کەسانێ ئەم مەعیەتە ناناسن لە قیّوم ئەگەڕێن و نای بیننەوە. لێرەدا هەردوو مەکتوبی ئیمامی غەزالی (خوا لێی خۆشبێ) جەنابی حەزرەتی حجة الإسلام تەواو بووە، لە تصوّفدا وە ئەم زاتە پڕ فەڕ و بەرەکەتە بەم چەشنەی خوارەوە پەیوەندی بە (تصوّف)ەوە[4] بوو.

---

(١) أ- معیّەتی جسم لەگەڵ جسم، وەکو دار لەگەڵ دار، بەرد لەگەڵ بەرد.

ب- معیەتی عرض لەگەڵ عرض وەکوو رەنگو بۆن و خۆی بە خۆی نەوەستێ، وەك بوونی بۆن لەگەڵ رەنگ.

ج- معیەتی عرض لەگەڵ جسم، وەکوو بۆن لەگەڵ گولاّو (عەتر) وە یان ڕەنگ لەگەڵ گوڵ وە هەروەها عرض لەگەڵ عرضی پێ ئەڵێن، بوونی بۆن لەگەڵ ڕەنگ، گوڵ هەم بۆنی هەیە هەم ڕەنگ.

(٢) مع بە کوردی یانی لەگەڵ، وهو معكم یانی خوا لەگەڵتانەیە لە هەرلایە بین، معیەتی خوا یانی لەگەڵ خوا بوون.

(٣) قیّومی عالەم: یانی کەسێ کە عالەم بە قودرەت و دەسەلاّت و توانای ئەو هاتۆتە بوون و ڕاگیراوە و وەستاوە.

(٤) ئیمام محمدی غەزالی ئینتیسابی بە ئیمام أبو علی فارمەدی‌یەوە بوە کە شێخ الشیوخی خوراسان ماوراء النهرین بوە (وە ووشەی ماوراء النهرین بەو وولاتە ئەڵێن کە دانیشتوانی تورکن وە کەوتۆتە پشتی دوو رووباری سەیحون و جەیحون) وە هەر بەم جۆرە موریدی ئەو بووە.



ئیمامی شافیعی ناوی (محمده کوڕی إدريس)ه

ئەم زاتە مبارەکە لەگەڵ کەماڵی و شغڵەت و کاروبار بە تـدریس و مرافعـه و مراجعـه بۆ خزمـەتی بـۆ فتـوا، هـەموو ڕۆژیٚ خـەتمێکی قورئـانی کـردوە، لـه مـانگی ڕەمضـانی پیرۆزدا دو خەتمی کردوە ئەمە دیارە یەکێکە لەکەرامەتی ئەم عالمە گەورە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ کەرامەتێکی ئەم زاتە هەیە باسی ئەکەم برای عزیـز حـاجی مـەلا عزیـزی کـوڕی حمە حاجی لە پێنجوێن کە مدیری برید بووە گێڕایەوە ووتی:

لە کاتێکا باوکم بە ڕەحمەتی خودا شاد بو من لە فەقێیەتیدا بوم لـە دەوروبـەری کتێبی جامیدا بوم بەناچار وازم لە خۆندن هێنا چوومەوە دەستم دایە کاسبی چەن سـەفەریٚ قاچاخچیەتیم کرد جاریٚ لەگەڵ دەسەیە لە ئەهلی پێنجوێن وە ناوی بەعزێکیانی باس کرد چوین بۆ (هەمەدان) بارو بارخانەمان لە کاروان سەرا داخستبو خەبەریان لێدایـن گرتینیـان ماوەیـە توقیـف بـوین بانگیـان کـردین بـۆ تحقیق یەکـە یەکـە بـانگ ئـەکراین هیچمان دانمان بەوەدانەنا کە خەڵکی عێراقین وە هەریەك ئیفادەی بـۆ جـۆریٚ دا، کە بانگیان کردم وتیان چیت خەڵکی کوێیت، وتم خـەڵکی بێلـوم لـە مریـوان فـەقێم بـۆ

وە بەڵگەمان بۆ ئەم ڕاستیە یەکەم لە موقاماتی خواجە بهاء الـدین محمـدی بوخـاری مەشـهور بـە شـاهی نەقشبەند خوا پلە و پایەی بەرزتر بفەرمویٚ وە دووەم لە موقاماتی حەزرەتی شاە شێخ صـلاح الـدین ابـن المبارك کە بە فەرمانی خواجە علاء الدین العطار کۆی کردۆتەوە، وە سێیەم لـە نفحـات کـە کتێبێکـە مـلا عبدالرحمن جامی قدّس سرّه لە موناقیبی ئیمامی غەزالی قدّس سرّه خۆیەتی بەم جۆرە بینراوە.

وە جەنابی شاە شێخ صلاح الـدین کـوڕی موبـارەك خـەڵکی بوخارایـە، وە جـەنابی خواجـە عـلاء الـدین عطار جێنشینی شاهی نەقشبەند و زاوای بوە.

خوندن هاتووم حاكم وتی تۆ سونی و كوردیت له مریوان دارالعلم چۆن دێیت بۆ ناو شیعه و فارس به كورتی قسەكانم معقول نەبو، ناردمیەوه توقیف خانه: وتم حەزرەتی إیمامی شافیعی با درۆش بكەم خۆم به منسوبی تۆ داوەته قەڵەم وتم فەقێم بۆ خاتری خوا ڕزگارم بكه زۆر زۆر پاڕامەوه خەوم لێ كەوت لە خەوما زاتێ هات بەسەرما تێ پەڕی وتم تۆ كێیت وتی ئیمامی شافعی وتم خودا بۆ خاتری ئەو خوا تۆی كرد به ئیمامی شافیعی مەڕۆ تا ڕزگارمان ئەكەیت فەرمووی به خوا ناڕۆم تا ڕزگارتان نەكەم چو لە جێگەیەكەوه دانیشت، ئەنجا لەگەڵ ئەوه كە كەس تەمای ڕزگار بونی نەبوو هەمو مانەوەمان (١٨) ڕۆژ بوو.

| | |
|---|---|
| إذا ألقى الصديق إليك عذراً | تجاوز عن معاصيه الكثيرة |
| فـإنّ الشافـعي روى حديـثاً | بـأسناد صحيح عن مغيرة |
| فقـد قال الرسول يغفـر الله | بعــذر واحــدٍ ألفي كبيرة |

یانی هەر كاتێ دۆستێ داوای لێ خۆشبون و لێبوردنی كرد له كردەوەی ناڵەباری خۆش ببه، چونكه ئیمامی شافیعی ڕەزای خوای لێ بێ حەدیسێكی به سەنەدی صحیحەوه له موغەیرەوه ریوایەت فەرمووه، كه موغەیره فەرموویەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی خوا له إنسان خۆش ئەبێ به تەنیا مەعزەرەتێ دوو هەزار گوناهی گەوره اللّهم يا من هو الله لا إله إلاّ هو يا من هو الله لا إله ألاّ هو الحي القيوم يا غافر الذنب يا ساتر العيب يا شافي الأسقام ورافع الآلام ومجيب دعوات المضطرين وكاشف الكرب ورافع التعب يا ذا البر والإحسان القديم يا من بيده ملكوت كلّ شيء و يا من إذا أراد شيئاً أن يقول له كن فيكون إغفر لي ذنوبي وستر عيوبي وآتني شفاءً كاملاً وصحة تامة وقوة كافية ودوام العافية وحسن العاقبة وأدخلني في رحمتك وارزقني من محبتك نصيباً وافياً ومن معرفتك خظاً وافرا وثبتني على الإيمان إيماناً آمن به سيدنا محمد ﷺ وصحابته الكرام وعلماء أمته الأعلام وخذ بيدي اليوم وفي الغد

بجاه ذلك النبي العظيم والرسول الكريم ﷺ وعلى آله وأصحاب وسلم, اللّهم إنّي ذليل وأنت العزيز فمن يرحم الذليل إلاّ العزيز اللّهم أصلح لي شئني وتجاوز عنّي وارحمني وألهمني الصواب, وأرني الحق حقاً وارزقني إتباعه وأرني الباطل باطلاً ورزقني اجتنابه اللّهم آتني سُئلي كله وزدني من جميع الخير واحفظني وارحمني من جميع الشر والضر, اللّهم اغفر لوالديّ وارحمها وارض عني وعنهما واغفر وارحم جميع الأصدقاء والأحباب ومن سئلني الدعاء أو دعا لي بخير وأجزهم عنّا خير الجزاء وصلى الله على سيد الأنبياء محمد وآله الأتقياء وأصحابه الكرماء وجميع العلماء والأولياء وسلّم تسليماً كثيراً إلى يوم اللقاء وآخر دعونا أن الحمد لله ربّ العالمين.

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين وقرة عين الأولياء والصادقين وعلى آله وصحبه أجمعين.

٣- وه یەکێ تر لەو برای زانا عەزیز و خۆشەویستانە جەنابی مەلا محمد مؤمن کوڕی خوا لێ خۆشبوو مەلا موبارەکی نۆدشی‌یە، کە یەکێکە لەو زاتە عالی جەنابانەی کە ئیجازە پێدراوی حەزرەتی سراج الدین بوو (خوا لێی خۆشنوود بێ) لە خزمەت حەزرەتی شێخ محمد بهاء الدين دابوو کە تەشریفی بۆ حەج فەرموو، لە پاش تەواوکردنی حەج لە مدینەی منّورە (على من دفن بها ألف صلاة وسلام) جێگیر بوو تا لە ژیان بوو هەموو ساڵ سەلام و تبّرکی بۆ ئەناردم، وە بۆی نووسیبوم (من لێرە زمانی تۆم دڵنیابە وە دۆعات بۆ دەکەم).

٤- وە هەر لەوانە یەکێکیتریان جەنابی فاضلی نەبیل خۆشەویست و میوان خۆشەویست شێخ إسماعیلی هەجیجی بوو، کە ئەم هەژارەی بە برای خۆی قبوڵ فەرموو بوو، وە یەکێ بوو لە مقبولان وە خولەفای هەرە پایە بەرز و زۆر زۆر چاکی حەزرەتی شێخ، بە راستی ئەم زاتە و (شێخ إسماعیلی هەجیجی) لە ماڵ سەرف کردن و میوانداری و کۆمەکی بە موسڵمانان و چاکەکردنا بێ وێنە و هاوتای نەبوو وە بۆ هەموو جۆرە یارییەدانێکی بە سود و کەڵك چاو گوشاد و شادمان بوو، خوا لێی خۆشبێ و پاداشتی چاکەی بداتەوە آمین.

٥- وە یەکێکی تر لەو زانایانە جەنابی ملا موسای هەجیجی کە ئەم زاتە پیرۆزە[1] خۆی دانیشتووی دێی هەجیجە زۆر بە تەمەن و زۆر خواناسە، زۆر

---

(١) حەجیج: بە کوردی پێی ئەڵێن هەجیج دێیەکە کە سەنگلاخ و بەردەلانی و سەخت داخلی دێهاتی لهۆنی هەورامانە نزیکی سێ سەعاتێ لە تەوێڵەوە دوورە، ئەو سەختەلان وگەرم و بەد هەوایە، سید عبدالله کوڕی حەزرەتی ئیمامم موسى کاظم خوا لێیان خۆشنوود بێ چۆتە هەجیج و بە دەستی پیرۆزی

ریازەت کێش بوون لە خوڵق و خوو خۆشی خۆی وە لە رەنگ و روو گەشی و گوشادی خۆی ئەم مسکینەی بە برای دنیا و قیامەتی خۆی قبووڵ فەرموو.

٦- وە یەکێ تر لەو کۆمەڵە پیرۆزانە برای طیب و طاهر لە رێی طەریقەت ماهر جەنابی شێخ محمد باقرە کە ئەویش لە رووی لطف و میهرەبانییەوە دەستووری برایەتی دنیا و قیامەتی بە فاتیحەی موبارەکەوە بەجێ هێنا، ئەم زاتەیش لە رێزە خوانانی حەزرەتی سراج الدین بوو، بەڵکو یەکێ لە نزیکانی بارەگای حضوری پیری دەستگیر

---

خۆی لەوێ مزگەوتێکی دروست کردوە، وە هەر لەوێ جێگیربوە تا وەفاتی کردوە، مەزاری پیرۆزی لە نزیکی دێیەکەیە وە خەڵکی ئەچن بۆ زیارەتی و بۆ شەرەفدار بوون بە بەرەکەتی، وە بە بەرەکەتی ئەم زاتەوە ژمارەی خانوەکانی ٤٠٠- ٥٠٠ چوار سەد تا پێنج سەد خانوو ئەبێ ئاوەدانە بە پیاوانی چاك و خواناس، دەستوریان وایە لەسەرەتای بەهارەوە لەبەر گەرمی و ناسازی هەوا کۆچ ئەکەن بۆ کۆسار، دوو سێ سەعاتە رێیەك دوور ئەکەونەوە کە هەمووی هەڵەت و بەردەلانی و سەخت و نالەبار و ناهەموارە، هەموو رۆژی هەینییەك دێنەوە بۆ ناو دێ بۆ بەجێ هێنانی نوێژی جومعە وە لەوێدا بەجێی ئەهێنن و دوایی ئەگەڕێنەوە بۆ مەنزڵی خۆیان، وە جەنابی مەلا موسا لەگەڵ ئەوەی کە تەمەنی لە هەشتا تێپەڕبوو هەموو جمعەیە لە مزگەوتی کۆسەی هەجیج جمعەی ئەکرد.

(حەزرەتی سید عبداللە بە کۆسەی هەجیج بەناوبانگە، وەبۆیە پێی ئەڵێن کۆسە بەر لەوەی مووی ریشی موبارەك و پیرۆزی دەربێ وەفاتی کردوە، مووی ریشی پڕ نەبۆتەوە.

خوا لێ خۆشبوو مامۆستا مەلا عارف بانەیی رحمة الله علیه فەرمووی: بە بەردەم مەرقەد و مەزاری پیرۆزیدا تێپەڕیم ووتم مەشهورە پیاوێکی گەورەیە (بە طریق و ئادابی صۆفیەتی دڵم بۆ گرتەوە وەك دەمانچەی حەوت تیر دڵی بە توجّە داگرتم، دڵم لاداو رۆیشتم بۆم دەرکەوت کە یەکێکە لەوانە لە قەبرا حەیاتی هەیە و زیندوە و ئەهلی ممات نیە بل أحیاء عند ربّهم یرزقون, خوا بە بەخشندەیی و کەرەمی خۆی لەویش و جەنابی مامۆستا مەلا عارف گیانیش خۆشبێ ئامین). (وەرگێڕ)

بەڵێ ئەم هەموو فیوضات و بەرەکات و إقتباساتە وە ئەم لطائف و ئەنوار و رموزاتە لە سایەی هیممەتی (أولیاء الله)وەیە.

وەك خواجە عبداللەی أنصاری هەڕاتی فەرموویەتی: خوایە ئەمە چییە کە لەگەڵ دۆستانی خۆتا کردوتە هەرکەس ئەوانی ناسی تۆی دەسکەوت وە تا تۆی دەس نەکەوت ئەوانی نەناسی.

وە ئـەم جـەنابی شـێخ محمـد بـاقرە کـوڕی خـوا لـیّ خۆشـبوو یوسـف بـەگی ئاخکەندی‌یە[1].

لێرەدا گوڵچینی‌یەك کە لە کتێبی بارقات السروردا بـە هیممـەتی خـوا و نـەزەر و مەرحەمەتی پیران کردم بە دوایی گەیشت، خودای تعالی پاداشی بەخێری حاجی شێخ محمدی سەمڕانی بداتەوە کە ئەم بەرەکەتەی لە پاش خۆی بەجێهێشت.

وە دڵ و دەروونی چەندەها زەبوونی وەکو ئێمە و هاوتامانی پێ دڵخۆش و دەماخ شادمان و مەسرور کرد، ئەگەر ئەویش بیشاردایەتەوە و وەکو هاوڕێیانی خۆی دەری نەخستایە ئەو گەنجینەی پڕ گەوهەرە لە ژێر خاکی مەحو و نسیانا شـاراوەی ئەبـەدی ئەبوو، دووبارە یا ڕبّی خوا پاداشتی بەخێری بداتەوە ئامین.

وصلی الله علی سّیدنا محمد وعلی آله وصحبه وسلم أجمعین.

ئەمجا بە بۆنەی باسکردنی ئەم زاتە ڕەوشت و خـوو شـیرینانەوە بـە جـوانی ئـەزانم باسی کەمیّ لە زانایانی ئەم وولاتی خۆمانە مـنیَ بێ فـەهم و نـا لایقـیش وەخـتی خـۆم مسرور بکەم، ئەوەندەی بە تحقیق بیستبێتم لە پیاوانی خـاوەن بـڕوا و جێگـەی بـڕوا و ثیقە پێکـراو و شـارەزا بـە ئـەحواڵیان، تـا پایـەی بـەرزیان شـاراوە نـەبێ وە لـە بـۆن و بەرامی فەیضـی ئەوانەوە ئێمـەی بێ نـاو و نـاوکیش دەماخمـانی پێ خۆشـبۆن بکـەین وە دەروونمان خەمڕەوێن بێ بە تام و لەزەی باسکردنیان، وە لە دنیا و قیامـەتا بـە لطف و بەرەکـەتیان فـائز و لـە هیممـەتی بـەرز و بـەهێزیان بەشـدار و بـە خۆشـەویستییان کامەران وە بە وەسیلەیانەوە لە هەموو کۆسپ و کەنەکیّ ڕزگار بن، وە هیوادارم بە

---

(١) ئەم جەنابی عالی قەدر شێخ محمد باقرە هەر لە گەنجیدا هاتبوە ئەو کارخانـەی مەعریفـەت عـارف بـە عەمەڵهێنەرە، بە نظری مخصوص و تایبەتی پیر گەیشتبوو.

ئیتر تا ١٥ پانزە سـاڵی تـەواو لـەویّ دانیشـت، جـاریّ لـە ڕووداوێکـا (واقعة) دیم خولـەفا و مریـدین لـە دەوری حەزرەتی پیر کۆمەڵن، بەڵام نورانیەتی عەجایب و گەورەم لەم زاتە دی، ئەو نورە لە سەریەوە تا پێی، وە لەسـەریشیەوە ٣ سێ گـەزیّ بـەرزتر بۆتـەوە وفقـه الله تعـالی (دانـەر جـەنابی حـاجی شێخ محمـد سەمڕانی).

مفادى المرأ مع من أحب[1] بە سوودى صوحبەت و تبعیەتى کاروانى پڕ لە شکۆیان نائیل و بەختەوەر بین وما ذلك على الله بعزیز.

١-یەکێ لەو زاتە گەورە و زانا بەرز و بەناوبانگانە لە وولاتى ئێمەدا خوا لێ خۆشبوو ملا عبدالرحمنى پێنجوێن بوو کە بە کورتى لەمەو پێش ناوێکى برا، ئەم زاتە باوکى بە ملا محمدى شێخەڵمارێنەوە بەناوبانگە وە لە بنەڕەت لە (بریفکان)ەوە هاتبوون وە سەیدن وە زانایى ئەم زاتە وەك دەریا شەپۆلى داوە بە تایبەت لە عیلمى منطق[2]دا کە زۆر گرانە، خۆى لە ئەصلا إجازەى عیلمى وەرنەگرتوە و ئیجازەى عیلمیشى[3] بە کەس نەداوە، لەبەر ئەو قوتابیانەى لە خزمەتیا تا کۆتاییان بە خوێندنى زانیارییەکان هێناوە لایان عارو نەنگ بوە بۆ ئیجازەى عیلمى بچنە لاى کەسى تر ئەمجا وەرع[4] و زوهدى ئەم زانا بەرزە لە هەموو لایەك بە داستان گێڕاویانەتەوە وە ئێستەش هەر ئەى گێڕنەوە.

محمود پاشاى وەسمان پاشاى جاف زۆر بە ئاواتەوە بوون کە مەرحومى ملا عبدالرحمن دیارى بەراتیان لێ قبوول بکات، زۆر کات بوە چۆتەوە بۆماڵەوە لە کاتى ژەم بۆ ماڵەوە فەرموویە چیمان هەیە، خێزانى فەرموویەتى بێجگە لە نانى روت هیچمان نیە نانەکەى پێ هێناوە ئاوى گەرم کردووە کەمێ خوێى کردۆتە ئاوەکە و نانەکەى تیا تریت کردوە و خواردویەتى گەلێ شوکرانە و سوپاسى خواى بەجێ هێناوە.

---

(١) ئەم فەرمووده شیرین و موبارەکى پێغەمبەر ﷺ بە کوردى یانى: گشت کەس لەگەڵ ئەوەیە کە خۆشى ئەوێت.

(٢) عیلمى منطیق: بەو زانیارییە ئەوترێ کە فێربوونى هۆى پارێزگارى مێشکە لە هەڵەبونى لە بیر و تێبینى (علم یحفظ به الذهن عن الخطأ في الفکر).

(٣) إجازەى عیلمى: بە وێنەى شهادەیەکە بە پێى ئەو پایە عیلمەیە کە هەیەتى.

(٤) وەرع: تەرێز لە حەرام و ئەو شتانەى گومانى حەرامیەتى لێ ئەکرێ، زهد: وازهێنان لە خۆشەویستى دونیا.

جارێ پیاوێ لە دەوڵەمەندان و دۆستی خۆی هەندێ پارەی بۆ ئەبات بە نیەتی زەکات و دای ئەنێ لە خزمەتیا ئەفەرموێ ئەمە چیە؟ عەرزی ئەکات ئەمە زەکاتە تۆیش جێی خۆیەتی وەری بگری، ئەفەرموێ راست ئەکەی بەلاّم لە من مستحق تر نییە؟ وەگەلێ لەوانە کە نەیان بوو ناشکوری ئەکەن من خۆم بۆ ئەگیرێ و نەیشم بێ ناشکوری ناکەم، با ئەوان تووشی ناشکوری نەبن، من وەری ناگرم ببیە بۆ ئەوان.

جارێ حەزرەتی شێخ حسەنی قەرەچێوار[1] قدّس سرّه تەشریفی ئەچێ بۆ پێنجوێن و میوانی خوا لێ خۆشبوو ملا ئەبێ، هەرچی دروست ئەبێ نسکێنە یا ماشێنە ئەبێ شێخ حەسەن ئەفەرموێ، من ئەزانم نان و چێشتی تۆ حەرام نیە و جێگەی دوو دڵی نیە کە حەلاڵە بەلاّم کاتی خۆی کە ئیجازەم لە خزمەت حاجی کاك ئەحمەدی شێخ (خوا لێی خۆشنوود بێ) وەرگرت چەند ئەندازەیەك گەنمی دامێ فەرمووی: ئەم گەنمە هەر بە ئیرسی دەس بە دەس بە حەلاڵی هاتوە، تۆش لەم گەنمە لە زەوی خۆتاندا بێ چێنە و هەر لەمە بخۆ ئێمەش لە زەوی حەلاڵی خۆمان کە پشت بە پشت بۆمان هاتۆتە خوارەوە لەو گەنمەمان چاندووە هەر لە بەرهەمی ئەوە ئەخۆم، وە بۆ هەر سەفەرێ بچم لەو نانە رەقە ئەکەمەوە، ئەی کەمە کیسە لەگەڵ خۆم ئەی بەم و هەر لەوە ئەخۆم، ئەمجا کیسە نانەکە داوا ئەکات لەسەر حەوزی مزگەوتی پێنجوێن لەگەڵ خوا لێ خۆشبوو مەلا نانەکە ئەکەن بە ئاوی حەوزەکەدا و ئەیخۆن.

گرنگی خوا لێ خۆشبوو مەلا تەنیا دەرس ووتنەوە و بلاّوکردنەوەی زانیاری دینیەکان و خزمەت بە شەریعەت بووە، ئەوەی کە هیچ بایەخ و نرخێکی نەبوە لە

---

(١) شێخ حەسەنی قەرە چێوار قدّس سرّه یەکێ بووە لە مەشایخی طەریقەی موبارەك و پیرۆزی قادری وە خەلیفەی حەزرەتی کاك ئەحمەدی شێخ بووە، خاوەنی مەعنا و حەقیقەت بوە صاحیبی کەشف و کەرامات بوە.

وە ئەڵێن حەزرەتی کاك ئەحمەدی شێخی سلێمانی (قدّس سرّه) دوو کەسی بە خوا گەیاندوە یەکێکیان حەزرەتی شێخ حەسەنە و دووەمیان حەزرەتی شێخ عبدالکریم کەسنەزانی وە بە پایە گەیاندن و بە خوای گەیاندن.

لای تەنیا دنیا بوە و بەس، لەگەڵ ئەوەشا زاتێکی زۆر دەروون گوشاد و روو خۆش و شیرین خوڵق و خوو بووە.

لە باوکی خۆم بیست کە خۆشکە زای بوو[1] فەرمووی لە کاتی مەرگیا پشتی نابوو بە ئەژنومەوە عەرزم کرد خاڵە گیان ئاو ناخۆی، فەرمووی: ئێستە هێشوویە تریێ م لە بەهەشتەوە بۆ هات خواردم ئاتاجم[2] بە ئاو نەماوە، پاش ماوەیە فەرمووی ئەوا چرای پێشوازییان هێنا، ووتم بۆچی؟ ووتی بۆ کێشانی گیانم وە ووتی واللە لە قیامەتا لە حەزرەتی رسول اللە ﷺ رازی نابم ئاوی حەوزی کەوثەر بداتە دەستم تا خۆی نەیکات بە دەممەوە چونکە لە رێی شەریعەتی ئەودا خۆمم کوشت.

شەوی جمعە نزیکی سەعات (١) یەك لە ساڵی ١٣٢٠ هیجری لە دنیای بێ وەفا کۆچی دنیای فەرموو، وە لە کاتی گیان دەرچوونیا گوێیان لە گرمەیە گەورە ببوو چ لە پێنجوێن چ لە دەرەوەی، حەزرەتی شێخ حسنی قەرەچێوار (قدّس سرّه) لە قادر کەرەم لە کاتی گرمەکەدا ئەفەرموێ ئای ئەوە مەلای پێنجوێن بە رەحمەتی خودا رۆی[3].

(١) مەرحومی مەلا عبدالرحمن خاڵی ملا محمدی قازی بوو کە باوکی دانەرە.

(٢) إحتیاجي: پێویستی

(٣) هەر بە بۆنەی وەفاتی خوا لێ خۆشبوو مەلاوە کە لە ملا محمدی باوکم بیستوە و لە میرزا أحمدی نوێ موسڵمان و لە میرزا قادری کوڕیم بیستوە کە بێ درۆ و زیاد و کەم بۆی گێراومەتەوە منیش بۆ خوێنەرانی بەڕێزی ئەنووسم کە بەسەر هاتەکە ئەمەیە: هەر لە قەزای پێنجوێن پیاوێ بوە فقێ محمد ناو لە گەڕەکی مەرحومی مەلادا ئەبێ کاسب و کاسبییەکەی دەست و ڕاست و لە خواناسیدا گەلێ ئەهلی إحتیاط بوە وە فەرمانڕەوا و گوێ ڕایەڵی ئەحکامی شەرع و ئایین ئەبێ وە نیسبەتی طەریقەتی بە کاکە ئەحمەدی شێخەوە هەبوە، نەخۆش ئەکەوێ و ماوەیە بەو نەخۆشییەوە ئەمێنێتەوە، شەوێ کۆمەڵێ لە دانیشتوی شاری پێنجوێن بۆ سەر لێدانی ئەچن بۆ لای لە نزیکی بانگی خەوتنان ئەڵێ ئەبێ هەستن بڕۆنەوە، هەرچەند ئەڵێن بۆ لای تۆ هاتوین و لەبەر خاتری تۆ کە بێتاقەت نەبێ هاتوین دوو قسە بکەین ئەڵێ نەخێر هەر ئەبێ بچنەوە هەموو ناچار هەڵ ئەستن و ئەڕۆنەوە.

خوا بە کەرەمی خۆی لە هەموو زانایانی دڵسۆزی شەریعەت و پەیڕەوی لە ئـاینی ئیسلام خۆشبێ و بیان بەخشێ، وە خوا لەبەر خاتری زانایانی پاك و راست و ڕێز و پایەیان ئێمەش ببەخشێ و لێمان ببورێ ئامین.

٢-یەکێ تر لەوانەی هەڵگری پلەی پڕ لە عیزەت و شەرەفی العلماء ورثة الأنبیاء وە رازاوەن بە بەرگ و نیشانەی إنّما يخشى الله من عباده العلمـاء خـوا لـێ خۆشـبوو زانای پڕ مانا دانای خاوەنی پایەی بەرزی دین حاجی ملا عبدالله وەلْزییە کە ئەم زاتـە یەکێك بوە لە هەڵ کەوتوانی رۆژگار زۆر زانا بوە، لە چاخی خۆیا بێ هاوتا بـوە هـەم لە زانیاری و عیلمدا هەم لە خواناسی و صـەلاحەتدا، ئەهلی صـفا و وەفا بـوە، بـە زۆری بـەهرەی کەشـف و کـەرامات شـۆرەتی گـەورەی دەرکـردوە، لـە حـاجی مـلا أحمدی هەمزە بەگ تەعریفی زۆریم بیستوە بەڵام زۆربـەییم فـەرامۆش کـردوە، بـەڵام

---

سەعات ئەگاتە نزیکی ٤ چواری عەرەبی نزیکی سێ سەعاتێ کەمتر دوای بانگی خەوتنان ئەنێرێ ماڵ بە ماڵ کە بێنەوە دیسان هەڵ ئەستن ئەچنەوە، هۆی ئەم حاڵەی لێ ئەپرسن، ئەڵێ میوانم هات، میوانەکان بە بۆنەی چەند هۆیەکەوە نەئەهاتنە ژوور لە دوای ئێوە هاتن، پەیمانیان داومەتێ کە کۆشکی تازەم یانی هەتاو بدات لەسەر شاخەکان هیچی نامێنێ ئیتر پێیان ووتم کە لەو وەختی هەتاو کەوتنەدا تۆ ئەبێ کۆچ بکەیت بۆ عەمارەت و کۆشکی تازەی خۆت، ئەمجا ناو بەناو ئەی پرسی سەعات چەندە؟ تا لە نزیکی بەیانیدا لە برایەکی خۆی کە حمە سعیدی ناو بوە سەعاتیشی پێ بوو، ووتی حمە سعید سەعات چەندە؟ ووتی بێ قەزا بی سەعاتێکە هەتاو کەوتوە، تێکچوو ووتی ملا محمد راست ئەکات بە باوکی منی ووت، ئەویش سەیری سەعاتی کرد ووتی هێشتا بۆ بانگی بەیانی ماویەتی، (ئەمجا زۆر عاجز بوو لە براکەی هەوڵیان دا ئازادی بکات بە گوێی نەکردین ووتی ئەمە کاتی ئەوەیە کە بە قسەی ئەو زاتانە گومانم پێ پەیدا بکات، بە خوا قەسەم لە قیامەتا لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ شکاتی لێ ئەکەم).

بە کورتی نوێژی بەیانی بوو، نوێژمان کـرد، دیسـان چـووینەوە بـۆ لای دانیشـتین، تـا هـەتاو دای لـە شاخەکان ئیتر لەو کاتەدا کورێکی بوو (قـادر) لەگـەڵ دایکیـا دانیشـتبـوون لای کـردەوە ووتی قـادر خـوا حافیز دایکی قادر خوا حافیز ئیتر وەفاتی کرد، وە ئەو میرزا قادری کوری ئەوسـا ئەوەنـدە گـەورە نـەبوو ئەگونجێ بۆیە ئەم مەجلیسەی کردۆتە دەرەوە چونکە لە میوانەکان یەکێکیان جوولەکە بوو رەنگبێ لەبەر ئەو ئەوەی کردبێ.

خوا لـیٚ خۆشبوو مـەلا عـارفی بانـەیی مامۆستای زانـا و دانـا و عـارف لەهـەر دوو عیلمەکەدا کە ئەم زاتە پیرۆز و پڕ فەڕەش خۆی یەکیٚ بوو لە زانایانی ئەهلی دەرك و دیرایەت وە خواناسانی ئەهلی سلوك و طەریقەت کە ماوەیە لە تەمەنی پیرۆزی پیٚوەی خەریك بـوو، ئـەم زاتـە نـەترس و پڕ شکۆیە ئـەی فـەرموو: ئیٚمـە فـەقیٚ بـووین لـە خزمەت حاجی ملا عبداللە وەلٚزیدا ئەمان خویٚند لە دیٚی تورجان[1] خۆی بەر نویٚژی نەئـەکرد، یـەکیٚ لـە فـەقیٚ کـانی ئـەکرد بـە پیٚش نویٚژ، لـە کـاتی نویٚـژکردنیا جۆش و خرۆشیٚ لە سنگی موبارەکیـەوە ئـەهات کأنّە إرثیـەتی حـەزرەتی رسـول الله ﷺ ی لـەو وەصفیشەوە وەرگرتبوو کە لە حدیث‌دا ئەفەرمویٚ: (حەزرەتی رسول الله ﷺ لـە کـاتیٚ نویٚژیا جۆشی سینەی پیرۆزی وەك جۆشی قازان لەسەر ئاگر کە دیٚتە کولٚ وەها بوو).

بەلٚیٚ زانای عارف ئەی فەرموو هـەر کـاتیٚ لـە شـانی ئـەوەوە لـە جەماعـەتی نویٚژا بوەستامایە منیش وام لیٚ ئەهات وە ئەگـەر دوور بومایـە وام لـیٚ نەئـەهات، دووبـارە مامۆستا عارف ئەی فەرموو حاجی مـلا عبـداللەی وەلٚزی ئـەی فـەرموو بـە فـەقیٚکان مەبن بە صۆفی کافر دەبن چونکە من ماوەیە زۆر لە مشاهدەی زاتی عليهٌ بووم [2]، تا زۆر لە خوا پاڕامەوە لە سەری هەلٚگرتم.

دیسـان مـەرحومی مـلا عـارف ئـەی فـەرموو: حـاجی مـلا هـەموو پـاش نویٚـژی عەسـران تەشـریفی ئەفـەرموو بـۆ چـۆلٚوانی وە بـیری لـە مـەخلوقاتی خـوا ئـەکرد کـە

---

(١) تورجان دیٚیەکە لە ناوچەی موکریان کە حاجی بایز أغای ئیٚلخانی علیه رحمة الله خاوەنی بووە.

(٢) ئەو مشاهدە چو بوە صورەتی روئیەت، لەبەر ئەوە کە لە شـەریعەت ثابتـە کـە رؤیـەتی زاتی عليـهٌ بـۆ غەیری رسول الله ﷺ لە دنیادا هەرچەند جائزە بەلاٚم واقیع نابیٚ، فەرموویەتی مەبن بە صۆفی کـافر دەبـن مشـاهدە بـە دلٚ ئـەکریٚ، بـەلاٚم مشـاهدەکەی ئەوەنـدە زۆر و بـە قـوەّت بـووە پرتـەو و جیلـوە و نـوری کەوتوتە سەرچـاوی وای زانیـوە چـاوە ئـەی بینیٚ، ئـەلٚێن یـەکیٚ لـە أولیـا لـە مجلیسـی حـەزرەتی غـەوثی گەیلانی‌دا ئەفەرمویٚ من بە چاو خودا ئەبینم کـاتیٚ کـە ئەچیٚتە دەرەوە عـەرزی حـەزرەتی گـەیلانی ئەکـەن ئەوە راست دەکا ئەفەرمویٚ بەلٚیٚ راست دەکا ئەشیعەی تجلّیات لـە دلٚیا ئەوەنـدە زۆرە شـەپۆلی ئـەدا بـە چاویا وا ئەزانیٚ بە چاو ئەی بینیٚ.

ئەهاتەوە جارێکیان فەرمووی گیای ئەو دەشتە زیکری خوا ئەکەن گیای ناو دێیش دیسان زیکری خوا ئەکەن بەڵام زیکری گیای دەشت تأثیری لە دلا زۆرترە.

رەنگە ئەوەی ناو دێ بە هۆی قەسوەتی گوناهی ئێمەوە بێ کە کەم تأثیرە.

دێی تورجان بە موڵکایەتی‌یەکێ بوو لە دێهاتەکانی حاجی بایزاغای ئێلخانی وە بێجگە لەم دێیە چەندەها دێی تری هەبووە، وە خۆی لە دێیەکی تر بێجگە لە تورجان نیشتەجێ بووە، حاجی بایز اغا[1] زۆر لە خزمەت حاجی مامۆستادا بە ئەدەب بووە، زۆر وەخت چوە بۆ تورجان کە گەیشتۆتە جێگە لەگەڵ کوڕەکانی و نۆکەر و خزمەتکاراندا خۆی رۆیشتوە لە قاپی حوجرەی حاجی مامۆستا چاوەڕوانی کردوە کە چۆتە ژوورەوە ماوەیە بە پێوە راوەستاوە، دوایی حاجی مامۆستا بە نەرمێکەوە فەرموویەتی فەرموو فەرموو حاجی بایەزید ئاغا رۆنیشە[2]، ئەویش لەگەڵ کەماڵی ئەدەبا لە خزمەتیا دانیشتوە.

ئەمجا ئەم جەنابی حاجی ملا عبدالله وەڵزییە جارێ لە پشتی مزگەوتەکەی تورجان قسە لەگەڵ حاجی بایەزید ئاغا ئەکات و ئەم نهێنییەی خۆی لە لای بە تەنیا دەرئەبڕێ بەڵام پەیمانی پێ ئەکات لای کەس ئاشکرای نەکات وە ئەوەش ئەمە ئەبێ ئەفەرموێ لله الحمد کە ئەچم بۆ سجدەدا لە کاتی نوێژ کردنا سەرم لەبەر دەمی کەعبەی مشرّەفەدا دائەنێم حاجی بایەزی ئاغا کە ئەمە لە حاجی مامۆستا ئەبیسێ، زاوایەکی خۆی ئەبێ سلیمان ئاغا ناو ئەویش پیاوێکی موسڵمان و خواناس ئەبێ لەو نزیکانە حازر ئەبێ،

---

(١) حاجی بایز اغا: یا حاجی بایەزید ئاغا خۆی یەکێ بوو لە ئاغا گەورەکانی وڵاتی موکریان لە کوڕانی حاجی ئێلخانی بووە، پیاوێکی زۆر خوّاس بووە، وە هەروەها زانا بووە، بە ئەندازەی مەلایەکی باش زانیار بووە وە کتێبخانەی تایبەتی بووە، جارێ لە فەقێیەتیدا چاوم کەوت بە حاجی بایز ئاغا ریشێکی ماش و برنجی هەبوو دوو پەنجە زیاتر بوو، شەخصیەتێکی دیاری هەبوو وە یەکێ بوو لە موریدانی حەزرەتی شێخ عەلی حسام الدین کوڕی حەزرەتی شێخ محمدی بهاء الدین خوا لێیان خۆشنوود بێ ئامین. دانەری پەرتووکی -باخچەی بۆنخۆشان-.

(٢) رۆنیشە: یانی دانیشە.

به هەلی ئەزانێ کە لەو دیوو مزگەوتەکەوە تووشی ئەبێ، لەبەر لەزەت و تامی قسەکە و حەز ئەکا سلێمان ئاغاش بزانێ و بیناسێ بۆی ئەگێڕێتەوە، کە حاجی بایزی ئاغا ئەچێتەوە خزمەت مامۆستا، کتو و پڕ ئەفەرموێ: حاجی بایز ئاغا بابم إنّ العهد کان مسؤولا[1].

---

(١) یانی بەڕاستی عەهد و پەیمانێ کە کرا لێی دەپرسێتەوە.

جەنابی حاجی مامۆستا یەکێ بووە لە موریدە ماقوڵە مەقبووڵەکانی حەزرەتی مجددی میئەی رابع عشر (تازە کەرەوەی سەدەی چواردەهەم) قوطبی دەوران غەوثی زەمان و مورشید و رەهبەر ضیاء و روناکی دیدە و دڵ مەولانای بەڕێز شێخنا عمر قدّس سره الأنوار.

به تەواوتر ثابت بوە کە حەزرەتی ضیاء الدین لە ئێوارەیەکا کە حاجی مەلا تەمەسوکی بە طەریقەت لە خزمەتیا کردبوو، بەیانییەکەی فەرمووبووی: ئیمشەو ٣٠٠ سێ سەد لە ئەولیای کبار موبارەکباییان لێ کردم بە مناسەبەی تمسك کردنی مەلا عبدالله وە.

حەزرەتی ضیاء الدین پێ فەرموو بوو (قدّس الله سرّه العزیز) ٤٠ چل شەو لێرە بمێنیتەوە تا مەرتەبەی قوطبیەت لە شأنتا هەیە.

کەشف و کەراماتی حاجی مامۆستا ئەگەر کۆ بکرێنەوە کتێبێکی پێویستە.

ئەگێڕنەوە کاتێ ئەم زاتە لە بیارەی شریف ٣ سێ هاوڕێی تری هەبوە کە ئەوانیش پیاو بوون وە ئەم چوارە بەناوبانگن بە —روفەقای أربعة— یانی چوار هاوەڵان کە ئەمانەن:

أ- حاجی مامۆستا مەلا عبدالله ب- ملا محمدی سنەتە ج- ملا محمدی کەستانەیی د- ملا أحمدی.

وا ئەگێڕنەوە هەروەك تحصیلی علومی ظاهیرییان کردوە مشغولی ئادابی تصوّفیش بوون، بە هەر چواریان تا ماوەیەك جووتێ کەوشیان بووە پێی رازی بوون بەو حاڵە سەخڵەت نەبوون رحمة الله علیهم رحمة واسعة.

باسی تریشیان هەیە گەر خوا مەیلی فەرموو لە کاتی گونجاودا باسییان ئەکرێت و ئەخرێتە پێش چاو بتوفیق الله.

حاجی مامۆستا وەڵزی ماوەیە لە پەسوێ تەدریسی کردوە، وە لە هەندێ شوێندا ئەم زاتە بە حاجی مامۆستا ملا عبدالله پەسوێ مشهورە، کە دێی قەرەنی ئاغایە لە لاجان.

ملا محمدی کەستانەیی کە ناوی هات: کەستانە سەر بە قەڵادزەیە لە پارێزگای سلێمانی.

حاجی مەلا فەرمووبووی: لەسەر بەردێ پان لە (بیارە) دانیشتبووم لە پاش تمسّك تەماشام کرد ئەوەندە گەورە بووم ئەوەندە گەورە بووم ئەو شیو و دۆڵەم پڕ کرد، وە سەرم لە شاخەکان سەرکەوت، وە زۆر سەرم سڕما لەم لەشمە بۆ وا گەورە بوو لە پاش ماوەیە بەرە بەرە بچووك بوومەوە تاوام لێ هات ترسم هەبوو بە درزی ئەو بەردە لە سەری دانیشتبووم بکەومە خوارەوە.

٣- یەکێ تر لەوانە کە بۆ بڕینی ڕێگەی والذین جاهدوا فینا تێکۆشاوە، وە کالآی بەرزی لنهدینّهم سبلنایان بە فضلی حەق پۆشیوە، جەنابی ملا محمدی مدرّس و ئیمامی دێی سونەتەیە، کە لە پاش تەواوکردنی خوێندنی زانیاریەکان تەشریفی چۆتەوە بۆ وولاتی خۆی، تەمەنی شیرینی بە بەجێهێنانی وەزیفە دینییەکان بەسەربردوە، وە هەتا لە ووزەیا بووە ئەحکامی شەرعیی پەخش و بلاوکردۆتەوە هیچ کاتێکی خۆی لە کیس نەداوە، یا خەریکی ووتنەوەی دەرس یا خەریکی کۆڕی ئامۆژگاری و موعظە یان نصیحەتی موسڵمانانی فەرموو یان خەریکی خواناسی و تەقوا بوە ئیتر خەریکی کار و پیشەی خۆی بوە.

بــــار خانــەیان بــەست شــیرین دولبــەران
قافڵــەیان ڕێ خســت کــوڕی ســەروەران
لــە بــۆ مــەنزلگای ئەصــڵی کەوتنــە ڕێ
بــە مــەتای[1] بــە نــرخ لــە گشــت بابــەتێ
بـــە بــاری ئیحســان تــەقوا و عیبــادەت
بــە گــەنجی شــەونوێژ کەســبی ســەعادەت
بـــە صــندوقی دڵ عیشقـــی ئـــەزەلی
سەرمایـــەی إجــلال ئــەنبیـــا و وەلـــی
بـــە سـەهلی وە یــا هــەر جــۆرە ڕەنجــێ
کــاروانی خۆیــان خـــاس گەیـــاندە جێ

جارێ جـەنابی شێخ زاهیـد کـوڕی خـوا لـێ خۆشـبوو مـەلا محمـدی سـوننەتە گێڕایەوە ووتی: منداڵ بووم ووریا و زیرەك لە نزیکی تەمەنی ١٠ دە ساڵ زیاتر ئەبووم یا کەمتر، لە وەرزێکا خەڵکی هەمووی لە دەشت بوون بە کشتوکاڵەوە خەریك بوون پیاوان مەگەر یەکێ وەك باوکم کە مەلا بو لـە ماڵـەوە ئەمایەوە، ئـەوانی تـر هەریـەك خـەریکی فرمـان بـوو، بـاوکم لـە مزگـەوت بـوو چـووم بـۆ لای ئـەویش دەزنوێـژی گرتبوو ڕووەو قیبلە خەریك بوو نیەتی نوێـژ بهـێنێ، هێشـتا نیەتەکـەی نـەهێنا بـوو لای کردەوە منی دی کە لە قاپی مزگەوت چوومە ژوورەوە ئەمجا فەرمووی زاهید ڕاکە بە پەلە بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە حەزرەتی عیزرائیل (سلاوی خوای لـێ بێ) بـە پەلـە چـوو بـۆ ماڵی ئێمە بزانە کێمان مردووە؟؟ کە چوومە وە ژنێکـی خـەڵکی ئـەو دێیـە منـاڵێکی تووشی گەشکە[2] بوو بوو، جارجار لەسەر خۆی ئەچوو بردبوی بۆ ماڵی ئێمـە وای

(١) مەتا یانی مەتاع، سوننەتە: دێیەکە لە لای سەقزە.

(٢) گەشکە: دەردێکە بە وێنەی (فێ) یا پەرکەم بەلام غەیری ئەوانە.

زانیبوو کە باوکم لەماڵەوەیە، دۆعای بۆ بنووسێ یا بە سەریا بخوێنێ بە باوەشی دایکیەوە لە ماڵێ ئێمە گیانی دەرئەچێ، کە ئەوەم زانی گەڕامەوە باوکم لە نوێژەکەی بوو بوەوە، منیش هەرچی رووی دابوو بۆ باوکم گێڕایەوە.

چ عەجەب لە بۆ ئەهلی نەفسانی
خۆی نەی بوو تۆیشی وەکو خۆی زانی
هەمو بێشەیەك[1] بە چۆل مەزانە
بەڵکو بۆ شێری بوێ بەلانە[2]

٤ـ وە یەکێ تر لە نەڕە شێرانی بێشەی ویلایەت و شابازی ئەوجی عیلم و فضلی دەرك و درایەت خاوەنی ویقار وریز، شەریعەت رەو میزاج مستقیم معریفەت ندیم خوا لێ خۆشبوو مامۆستا مەلا عبدالعظیم دانیشتووی شاری سنە بوو لە کوردستانی ئێران، کە نازناوی پیرۆزی مجتهد بوو، ئەم زاتە پیرۆزەش یەکێ بوو لە دڵسۆزی گیانی بە گیانی ضیاء الحقّ والدین مرشیدی أکبر حەزرەتی شێخ عمر قدّس الله سرّه الانوار، عالمێکی ممتاز فاضلیکی بێ نیاز بوو لە دنیا و دنیایی‌یان قووتی بە قەناعەت بوو پۆشاکی لە ئیطاعەت بوو، بە علومی ظاهری و باطنی ئاگادار بوو لە شێوەیا هەیبەتی لا یخافون لومة لائم[3]ی پێوە بە دایمی دیار بوو بە وەراثەتی انبیا موصوف بوو بە نەهی لە منکر وأمر بە معروف معروف بوو، زۆرێکی زۆر لە قوتابیانی علومی دینی بە أخلاقی شیرین و تربیەی ئایینی پێگەیاند.

---

(١) بێشە: بێشەلان، غابات.

(٢) لانە: هێلانە، کولانە، بە مەنزڵگای هەموو جۆرە گیاندار و باڵندەیەك ئەڵێن.

(٣) لا یخافون لومة لائم: یانی بە پەیوەندییان و خواناسان هیچ باکو خەیاڵیان بە کەس نیە و لە لۆمە و تانە و تەشەری کەس سڵ ناکەنەوە، تەنیا مەبەستیان رەزامەندی خوایە.

به چەن جار بیستوومە کە پیاوە گەورە ماقوولانی سنە و ناودارانی ئەو وولاتەی لەسەر مخالفەی بێ باکانە تەمبە کردوە پەڕوای لە زۆر داری هیچ کەس نەبووە، وە خوای تعالی جلّت عظمتە بە فەرمانی "من کان لله فقد کان الله لە" لە هەمو ئەمر و نەهیەکان کە کردویەتی گەورە گەورانی وولات سەری ملکەچییان بۆ دائەنەواند، ئەگەر بەرێگەیەکدا تەشریفی بڕۆشتایە یەکێ لە ئەشراف و گەورە پیاوانی ئەو شوێنە رووبەڕووی بهاتایە خۆی ئەگرتە قەراخ و کەناری ئەو رێگە تا مەرحومی مامۆستا ئەگەیشت، ئەمجا بە ئەدەبەوە سلاوی لە خزمەت مامۆستا پێشکەش ئەکرد و ئەمیش بە شێوەی کەریمانە و معاملەی حەکیمانە بەجوانی سەلامی بەو وەلامی کەلامی موقابەلە ئەکرد.

جارێ شخصێکی شیرازی کە گەورە و ئاخووندی شیعەکانی ئەو ناوچە بووە، وە لە لایەن دەولەتی رەزا شاوە نێردراو بوو بۆ گەڕان بە هەندێ لە شارەکانی ئێرانا وە بۆ هەر لا ئەچێ هەندێ لە خوێنەواران رێزی لێ ئەگرن و دەورەی لێ ئەدەن، کە دێتە "سنە" بە قەدرێکی زۆرەوە پێشوازی لێ ئەکرێ و بەخێرهاتنی لێ ئەکەن وە ئەچێ بۆ لای چەن کەسێ لە زانا و گەورە گەوران رۆژێ داوای ئەوە ئەکا بچێ بۆ خزمەت مامۆستا عبدالعظیم، وە ئەو پیاوە بە فاضلی شیرازی بەناوبانگ دەبێ، کاتێ لەگەڵ کۆمەڵێکا ئەچن و دائەنیشن، خوا لێ خۆشبو مامۆستا بەخێرهاتنیان ئەکات وە لەو کاتەدا کتێبێکی لە بەردەسا ئەبێ کە خۆی دای ئەنێ وە چەند گفتوگۆیەکی مذهبي دێنێتە مەیدان بەلام شیرازی بە شێوەیەکی نەفامانە و جاهیلانە و لە خۆبایی بوانە و بێ ئەدەبانە دێتە مەیدان وە وا ئەزانێ ئەمیش وەك هەندێ تر چاودێری ئەکەن لە ترسا یا لەبەر دەولەت وە هەرچی بیلێ لێی بێ دەنگ ئەبن، بەلام شێرانە لێی رائەپەرێ مەرحومی مامۆستا مَلا عبدالعظیم رحمە الله الکریم وە ئەفەرموێ هەستە هەستە هەی نالایقی نەزانی ئەحمەق عەسای لێ ڕاست ئەکاتەوە و جوێن ئەدات بەو کەسە کە ئەمەی هێنا بەو ولاتا و ئەفەرموێ ئەمە فاضلی شیرازی بێ ئەبێ کەری

شیرازی چی بێ؟ بێ ڕێزی ئەکات و هەڵی ئەستێنێ کاتێ کە ئەزانێ بێ ئەدەبانە ڕەخنە لە گەورە گەورانی عولەما و ئەولیای ئەهلی سوننەت ئەگری»[1].

ئەم زاتە پیرۆزە چەندەها وەقایع و ڕوداوی سەیر و گرنگ و گەورەی لێ ئەگێڕنەوە کە هەموو خەبەر لە قەناعەت و توکّل و شەجاعەت و حەق ڕەوی و پایە بەرزی لە مقامی تصوّف ئەدات.

صورەتێکی خاوەن هەیبەتی بوە، باڵای بەرز و مێزەری گەورە، ڕیشی موبارەکی درێژ و سپی، بە محبّەت لەگەڵ فەقیر و پیاوی خاوەن صلاحەت، بێ إعتنا و کەم موبالات لەگەڵ أشخاصی دنیایی.

ئەشگێڕنەوە هەندێ جار قیمەتی ٢ دوو قران چای ووشکی کڕیوە و بردوویەتیەوە بۆ ماڵ[1] خوا پاداشتی بەخێری ئەم زاتە و ئەمثالیان بەخۆشنوودی خۆی لێیان بداتەوە.

---

(١) ئاغا حیسامی کوڕەزای کە خطیب و مدرسی شاری سنەیە گێڕایەوە ووتی: کاتێ کە نەخۆش کەوت و لەو نەخۆشییەدا وەفاتی کرد، پاش عەسرێ لە حەوشەدا لەسەر جێ ڕاکشا بوو بێتاقەت بوو، عەرزمان کرد بێتاقەت دیاری، فەرمووی عومەر نەهات، مەبەستیان جەزرەتی ضیاء الدین بوو، ماوەیە بەسەر ئەو قسەدا ڕۆیشت گەشی و خۆشی لێوە پەیدا بوو فەرمووی عومەر هات ئەمجا جێگەکەمان بۆ بردە سەرەوە گەیشتە نزیکی وەفاتی تەماشام کرد ڕیشی موبارەکی بە هۆی حەرەکەی دڵ و سینە و هەناسەیەوە بەرز ئەبووەوە و حەرەکەی ئەکرد، دەستم کرد بە گریان کە زانایەکی وا فازڵ و خادیمی شەرعی محمدی ﷺ ئاوا لەم حاڵەدایە و بێتاقەت و زەبوونە، بە گۆشەی چاوی سەیرێکی کردم لەسەر زمان و شێوەی خەڵکی ئەو شارە فەرمووی: ڕۆڵە بوو چە بۆ مـن ئـەگریت مـن شێرێکم لـە شێرانی خـودا، ئەمەی کە فەرموو بە دوا ئەوا فەرمووی: [ربّنا لا تحملنا مالا طاقة لنا به واعف عنّا وغفر لنا وارحمنا أنت مولانا فانصرنا على القوم الكافرين].

یانی: پەروەردگارا مەیخەرە سەر شانمان ئەوەی لە توانامانا نەبێ مەحوی گوناهمان بکە سەرفی نظر بفەرموو خەتاکاری و بێ تاعەتیمان بپۆشە، بەزەییت پێماندا بێتۆ سەردار و گەورەی ئێمە هەر تۆی، سەرپەرشتیمان بفەرموو، کۆمەکمان بە، زاڵمان بکەو سەرمانخە بەسەر گرۆی کافراندا.

وە ئیتر وەفاتی کرد رحمة الله تعالى عليه.

٥- یەکێ تر لەوانە کە پایەیەکی بەرزی لە پلەکانی هل یستوي الذین یعلمون والذین لا یعلمون بۆ رازاوەتەوە وە بە إمتیازی خاص نەك تەنها لە مەرتەبەی والذین لا یعلمون بۆ جیاکراوەتەوە، بەڵکو بە دوو چەندان لەناو هاوچەرخی خۆیدا فضلی عیلمی بە دوو قات بە روشتەی علومی ظاهری و باطنی بۆ بادراوەتەوە خاوەنی علمینی باطن و ظاهر و مرحومی مفضال مامۆستا مەلا باقر کە ئەم زاتە رحمة الله علیه شەو و رۆژ لە ژیانی پیرۆزی خۆیدا بە بێ سوود و نەفع نەبردە سەر، هەتا لە گێرانەوەی بەسەرهات و مەزاح کردنیشا تعلیم و تەربیەی حازرانی مەبەست بوو، کە بە نیەتی سوود بەخشین و کەڵك لێ وەرگرتن ئەی فەرموو، هەردەم رووخۆش و خۆش خولق و بێ هەوا و سەخی سروشت بوو دەسکەوتی مانگێکی لە ماوەیەکی کەما سەرف ئەکرد هێندە دڵ فراوان بوو.

بێ زیادەڕۆیی ئەگەر علوم گوم ببوایە دروستی ئەکردنەوە هێندە زانیار بوو[٢]، هەر لە علومی عەرەبییەوە بیگرە لەنەحو و صرف و بەلاغە و ئاداب و منطق و کلام وە هەروەها لە فلکیات حساب و هەندەسە و عیلمی میقات وە لە کلام و فەلسەفەدا

---

(١) ئەڵێن کە گوایا جەرەس و بە ئاگا هێنەری تایبەتی ژوورەکەی خۆی گۆچانەکەی بووە، کە مالیویەتی بە تاکێ لە پەنجەرەی کراوەی ژوورەکەی، وە ئەوانیش منالیان ئەنارد تا بزانن چی پێویستە.

یــا ربی بــەحقی صفوەت و صفــای گروهی عــارفین
بــە جاهی عــەزم و صداقەتی عــالمــانی پــاکی دیــن
بــە پــەیــڕەوانی شەریــعــەتی حەزرەتی مصطفی
بــە دەروونی پــڕ لــە گڕی گەرمی محبانی بــاوەفــا
رەحمێ بفەرموو بەم بــەندە کەوا رووتە لە پۆشاکی صەفــا
عفوی کە بــە بــەریاکە عەبای پەیڕەوەی بۆ أهلی وەفــا

دانەر

(٢) باسی فەزڵ و هونەری علامەی مشهور مامۆستا مەلا لە شوێنی تریشدا هاتووە بە کورتی.

ممتاز بوو، له فیقها إبن حجری زەمان بوو، لـه تصوّفدا دەسـتی بـالآی هـەبوو حـالاً نەك مقالاً، عادەتی شەو و رۆژی وابـوو بـانگی شـێوان کـه ئـەیان فـەرموو نوێـژی بـه ئیمامەت ئەفەرموو ئەنجا خەتم و تەهلیلەی بە تەواوی هەموو شەو نەك تەنیا جومعە و سێ شەموان بە تەواوی بەجێ ئەهێنا تا لێ ئەبوونەوە لە کاتی نوێژی خـەوتن لای ئـەدا جەماعەتی خەوتنانی ئەکرد و ئەچوەوە ئەخـەوت بـەزویی، تـا دوو بـەش شـەو ئەچـوو هەڵ ئەستا دەزنوێژی ئەگرت و شەو نوێژی هەرچەن بتوانیایە بەجێ ئەهێنا، بەر لـەوە بانگی بەیانی بێ نان و چای بۆ حازر ئەکرا لە پاشـدا تەشـریفی ئەچـوو بـۆ مزگـەوت بەرنوێژی بەیانی ئەفەرموو و ئەمجا دەسـتی ئـەکردەوە بـە خـەتم و تهلیلـەی نقشـبندی و قادری کاتێ لێ ئەبوونەوە هەتاو ئەکەوت ئیتر نە ئەچـووەوە ماڵـەوە بـەڵکو دەسـتی بـه تدریس ئەفەرموو تا نیوەڕۆ، لە پاش نان خواردن دەرسی شەرعی ئەووتەوە تا عەسر، لـە عەسـر بـە دواوە لەگـەڵ میـوان و دۆسـت و ئـەحبابا کـاتی بەسـەر ئـەبرد ئەگـەر ئەوانیش نەبوونایە لەسەر دەسـتوور و یاسـای صـۆفیەتی لـە میحرابەکـەدا بـە موراقەبـە مشغوڵ ئەبوو، هەروەها بیستم هەموو مانگێکی رەمـەزان هـەموو ئێوارەیـە بـەربانگی بۆ ١٢ دوانزە ماڵی هەژار ئەنارد لە چێشتێ کە هـەیان بـوو، دوای ماوەیـە بـۆ بیسـتنم بۆ ئەو رەوشتە شیرینە بیرم کـردەوە ووتم مامۆسـتا هـەرچی بکـا لـە روی عیملەوەیـە، بۆچی دوانزە ماڵ بێ زیاد و کەم نـەبێ؟ وە ئـــەو ژمارەیـەی هـەڵ بژاردوە کـــە بـۆم دەرکـەوت لەبـــەر ئەوەیـــە ١٢X ٣٠=٣٦٠ وە خـۆی سـاڵ ٣٦٠ رۆژە مەبەسـتی ئەوە بووە، تەواوی ساڵ بەڵکو هـەموو تەمـەنی شـیرینی خـۆی لـە کاتێکـەوە کەوتۆتـە سەر ئەم خولق و رەوشتە هەر رۆژە بـە رۆژووگرێکـی بـەربانگ کردبێتـەوە وەهایـە، چـونکە لـە مانـای حـدیسێکا هەرکـەس رۆژووگـرێ بـەربانگ پێ بکاتـەوە پاداشـتی رۆژووگرێکـی دەس ئەکـەوێ بێجگـە لـەوە کـە رۆژووگرەکـە لـە پـاداش و ثـوابی رۆژووەکە هیچی لێ کەم ببێتەوە.

ئەخلاقی ئەوەندە شیرین بوو، هەر موسڵمانێ بکەوتایەتە هەر ناڕەحەتییەکەوە تا ئەو کەسە رزگار ئەبوو بە هەرکەس بگەشتایە لە دۆست و ئەحباب هەواڵی ئەو کەسەی ئەپرسی یا باسی بۆ ئەکرد یا ئەی ووت تەگبیر چییە؟ چۆنی رزگار بێ بە هەر هەوڵ و تێکوشانێ بوایە کۆششی ئەکرد لەو کۆسپە رزگاری بێ، ئەوەندە بەم رەوشتەوە خەریك ئەبوو هەندێ بە مامۆستایان ئەووت مامە خەمەیە[1] رحمة الله علیه رحمةً واسعة.

ئەم زاتە بەرز و بەقیمەتە زۆر لە عولەمای کوردستان سوودی زانستیان لێ کردوە یا بە شێوەی فەقێیەتی یا بە سەیرکردنی ئەو کتێبانەی کە داینا‌وون وە یا بە پرسیار و داوای فتوا لێکردن وە یا لە مجلسدا کە دانیشتوە و فەرمایشتی گەوهەرداری فەرمووە بە هەمە چەشنە جێگەی بەهرە و سوود و کەڵك بوو، دانراوی زۆرە هەندێکی گەورە هەندێ ناوەند و هەندێکی دیکەیان بچووك بە شێوەی رسالە و نامیلکەی پڕ سوود[2]، وە بە هۆی ئەوە کە هەردەم عاشق و سەودای مجلیسی خوا لێ خۆشبوو مامۆستا بووم بەختەوەر ئەبووم زۆر بە خزمەت گەیشتنی وە چەندەها فەرمایش و کەڵك و سوودی چاك چاك و حیکایاتی بە بەهرە و خۆشم لە خزمەتیا وەرئەگرت، گەر خوا مەیل بفەرموێ لێرەدا هەندێ بە موناسەبە ئەنوسم لەوانە بۆ وەرگرتنی لەزەت و خۆشی دڵی دۆستان ئەی خەمە پێش چاو:

یەکەم: یەکەم جارم بوو کە مناسبەم لەگەڵ کاك أحمدی شێخ[3] (قدّس الله سرّه العزیز) حاصل کرد پاش لە دونیا دەرچوونی مەلا محەمەدی قاضي لە پێنجوێن

---

(١) مامە خەمەیە: یانی خەمخۆری هەموو کەس.

(٢) کتێبێکی (الدّر الجلالیة) ی ناوە لە دوو بەرگی گەورەدایە ئەستور و پەڕە گەورەیە بەرگێکی هەموو (التهذیب الکلام) وە بەرگێکی تری بەیانی معلوماتی خۆیەتی.

وە یەکێك لە نامیلکە بەسوودەکانی "الدوائر العشرین" ە لە تصوّفدا دەست خەتە و لە چاپ نەدراوە.

(٣) کاکە أحمدی شێخ: کاکە أحمدی شێخە لە سلێمانی کە مەزاری پیرۆزی لە مزگەوتی گەورەدایە، کەتوەتە بەشی دەستە راستی سەروی مزگەوتەکە و أحمدی کاکی پێ ئەڵێن لە ناو دەرەوەدا، زاتێکی زۆر

(غفرالله له ورحمه) دانیشتوانی ئەو مزگەوتە کەوتنە هەوڵ و تێکۆشان بۆ ئەوە کە من لە دێی بالك لـە مـەریوان خـۆم بگوێزمـەوە بـۆ ئـەو مزگەوتـەی پێنجـوێن بـە شـێوەی مدرّسی خۆشم زۆرم پێ خۆشبوو لەبەر چەند هۆیەك شەو إستخارەم کـرد لـە خـەوما وام زانی من وام لە بالك وە پێم بەرزکردەوە بە یەك هەنگاو چوومە سلێمانی چـوومە ژووری مەرقەدەکەیەوە، بینیم حـەزرەتی کـاك ئەحمـەد پـاڵی دابـوو بـە بێشکەی سـەر مەرقەدەکەیەوە سەلامم کرد و رەسمی زیارەتم بەجێ هێنا، (وە وام ئـەزانی چـوونی مـن بۆ پێنجوێن ئەبێ بە رەزامەندی (حاجی کاکە أحمدی شێخ بێ) لەو بارەوە عـەرزم کـرد کـە رازی بێ مـن لـە بالکـەوە بـێم بـۆ سـلێمانی بـۆ مزگەوتەکـەی پێنجـوێن[1] نقـل بم فەرمووی نابێ ئەبێ هـەر لـە جێگـەی خۆت بی زۆرم لـە خزمـەتیا هـەوڵدا فـەرمووی مصلحەت وایە جێگەی خۆت بەجێ نەیەڵی هاتمەوە بە هەنگاوێ بـۆ بالـك و دووبـارە دڵنیاییم پەیدا نەکرد چوومەوە بۆ خزمەت کاکە ئەحمەدی شـێخ قـدّس سـرّە هـەر لـەو بارەوە لە خزمەتیا دووام قەناعەتی نەکرد عەرزم کـرد ترسـم لـە حکومـەتی رەزا شـای ئێـران هەیـە، فـەرمووی نامـاقوول ئـەکات ووتم کـەم رزقـم لـەوێ ژیـانم بـاش نـاچێ بەڕێوە، فەرمووی خوا رازیقە وە فەرمووی: (تۆ لەو بەرەوە مەئموری ئەو ئومەتە بێ سەرمەکە) گەڕامەوە بۆ ماڵـەوە دیسانـەوە سێ بـارە چـوومەوە بـۆ خزمـەتی لەگـەڵ لـە ژوورەکە کەوتمە بەرچاوی هەر لە قاپی دەرکەوتم فەرمووی سبحان الله خلـق الإنسـان من عجل تۆ وا ئەزانی ئەمە خـەوە ئـەی بـینی، ئەمـە خـەو نیـە حقیقەتـە، ئـەمجا شـتێ لەبەر دەمیا بوو بـە وێنـەی دوور بـێن بـەلام وەك دووری نزیـك ئەخسـتەوە قسـەیشی وەرئەگرت فەرموی سەیری ئەمە بکە بڕوانە بۆ لای خۆتان شتێ پێشبینی بکـە ئەگـەر لە (بێداری)یشدا وابوو ئەوە راستە ئەگەر واش نەبوو ئەوە ئیتر خۆت ئەزانی، کە نام

---

زۆر عالی جەناب و موبارەك بوە خاوەنی هەر چوار طەریقەکەشی کردوە لە تصوّف هاوکێشی کبریتی أحمر بوە.

(١) ملا محمدی قازی پێنجوێن: باوکی نووسەرەو خوشکەزای ملا عبدالرحمنی پێنجوێنە.

بە چاومەوە سەیرم کرد خێزانەکەم شیر ئەدات بەو منالەمان کە بچوك بوو لە بێشکەدا بوو، چەند قسەیە لە میانەماندا روویدا هەر لە دوای سەیرم کرد خوا لێ خۆشبوو ملا محمد أمینی باراماوایی هات بۆ مالمان لەگەلّ ئەویش چەند قسەیە لە بەینمانا رابوورد دوور بینەکەم دانا و بێدار بوومەوە، کە بە ئاگا هاتم مالەوەمان شیری بە منالەکە ئەدا و هەمان قسە لە میانەماندا روویدا، کەوتینە بەیانی دوای نان و چا خوا لێ خۆشبوو ملا محمد أمینی ناوبراو هات بۆ مالمان کە لەو کاتەدا مالیان لە نژمار بوو هەمان قسە و گۆمان لە بەینمانا رابورد کە لە خەوەکەدا دیبووم، ئیتر دلنیا بووم بۆ ئەوە کە چونم بۆ پێنجوێن رێگە نیە[1]، وە فەرمووی: زستانێ ریاضەتم کێشا لە بەهاردا چووم بۆ بیارەی شەریف بە سواری لە کەلی کەماجەر یا مەلەخوردی فەرموو کە لە پشتی بیارەوەیە سەرکەوتم لەسەر شاخەکەوە بە پێ هاتمە خوارەوە هەستی بێ هێزیم لە خۆمدا کرد خەریك بوو پەشیمان بمەوە لەو ریازەتە، دەنگێ هات هەموو ئەو دۆلّ و ناو شاخەی پڕ کرد، وە زانیم کە ئەمە دەنگی حەزرەتی غەوثە قدّس سرّه العزیز وە ئەم فەرموودەی پێغەمبەری مبارەکی ﷺ خوێندەوە (المؤمن یأكل بمعيٍ واحدٍ والكافر یأكل بسبعة أمعاء) و لەگەلّ خوێندنەوەکەی ماناکەی هاتە دلمەوە کە موسلمان و خاوەن ئیمان بە ریخۆلەیەك ئەخوات بەلام کافر بەحەوت ریخۆلە ئەخوات، کە مانای حەقیقییەکەیم بە دلا هات کە ئینسان پێکهاتوە لە عالەمی خەلق و عالەمی ئەمر، عالەمی خەلقەکە، یەکەمیان قالبەکەیە دووەمیان نەفسی ناطیقە وە عالەمی ئەمرەکە کە لطائفی خمسەیە کە قەلب و روح و سرّ و خفی أخفی کە ئەکاتە پێنج ۲ +۵ = ۷ موسلمانی تەواو هەر قالبەکە ئەخاتەکار بۆ دنیا ئیتر نەفسێ کە مطمئنەیە لەگەلّ پێنج لەطیفەکانی عالەمی ئەمر هەردوو لایان روویان لە خواو بەجێ هێنانی رەزامەندی خوان، ئەمجا ئەمە نموونەیە بۆی وەك یەکێ ناوچەیەکی بە کرێ گرتبێ ئەلێن فلان کەس فلان ناوچە ئەخوا، مانای خواردن لەوێدا تصرّف کردنە

---

(۱) رەنگبێ ئەوەبێ جیاوازی بەینی خەو و واقیعە.

تێیدا، یانی موسڵمانی راستەقینە هەوڵ و هەڵسووکەوتی بۆ دنیا هەر ریخۆڵەیە کە بریتییە لە لەش و لارەکەی، بەڵام کافر چونکە غافڵ و بێ ئاگایە بە دڵ بە نەفس بە بەدەن بە رۆح و بە هەموو لەطائیفەکان بە عالەمی خەلقەوە[1] حەوت ئەگرنەوە خەریکی دنیا دارییە، وە هیممەتی بە کلیّەتی وجود هەر لە تحصیلی ئەموال و ممتلەکات و دەستکەوتی دنیاییدا خەرج ئەکات خوای تعالی خۆی لە هەموو کەس زاناترە بە راستی لە هەموو کاری[2]، وە فەرمووی: کاتێ فەقێ بووم (جامی)م ئەخوێند لەسەریان کەپرمان کردبوو دوو فەقێ لە دواپلەی خوێندنا بوون یانی مستعید بوون هاتنە میوانمان، خزمەتم کردن ووتیان چی ئەخوێنی؟ ووتم جامی، چەند پرسیارێکیان لێ کردم لە نەحوا نەمزانی، دوایی پێیان ووتم تۆ بە "سەطحي"گەری بێ تێگەیشتن خۆیندوتە، ئەگەر هەروا بخوێنی بە هیچ دەرئەچی، وە ئەفەوتیی بگەڕێرەوە لە عەوامل و کتێبە ووردەکانی خوارەوە دەست پێ بکەرەوە، لەگەڵ کۆشش و تێ گەیشتندا، تا ئەگەیتەوە ئەم جێگە با نەفەوتیی کە ئەوان رۆیشتن بۆ حاڵی خۆم گریام و داخم خوارد، کاتێك لە دوای گریانەکە خەوتم لە خەودا بینیم حەزرەتی رسولی

---

(١) خوا لە قرآندا لە بارەی خەلق و ئەمرەوە ئەفەرموێ: (الا له الخلق والأمر تبارك الله ربّ العالمين).

(٢) لە راستیدا زۆر کەس لە حقیقەتی کار نەشارەزان لە وێنەی ئەم فەرموودە پیرۆزە لە شوێنی تردا هاتوە، کە خەڵکی لە راستەقینەی عالەمی ئەمر نا بەدڵن لە ژمێرەیا وە یا لە صورەتیا حەواڵەی تخمین و خەملانی زهنی ئەکەن. وە یا ئەگەر زۆر لە عقلیان دوور بوو ئەڵێن موضوع لە راستیدا فەرموودەیەك کە حدیسی پێغەمبەر ﷺ بێ بە تخمین و تقریب نای فەرموێ بەڵکو بە حقیقەت ئەی فەرموێ هەرچیەکی فەرموو تحقیقی‌یە وەك ئەم حەدیسەی پێشووە (المؤمن يأكل ...) یا وەك حەدیسێ کە لە تەفسیری خازندا ریوایەت کراوە، زەمین لەسەر پشتی گا جووتە، گا جووت لەسەر پشتی ماسی‌یە لێرەدا کەمێك وەستان پێویستە. حەزرەتی شێخ محی الدين ابن العربي قدّس سرّه ئەفەرموێ ئەو مەلائیکە و فریشتانە کە عەرشی خودایان لەسەر شانە لە حاڵەتی کەشفا بە شێوەی أوعال ئەبینرێن یانی أولياء الله کاتێ بە کەشف بیانبینن لەسەر شێوە و هەیئەتی گاکێویدا ئەیان بینن، ئەمجا ئاشکرایە عەرش و کورسی و ئاسمانەکان و زەوەی و ئەستیرەکان هەموویان بە قدرەت و دەسەلات و توانای خوا وەستاون و راگیروان ئەمجا ئەو مەلائیکە کە هەڵگری ئەرزە لەسەر شێوەی گادا بێ یان گاکێوی.

أکرم محمد المصطفی ﷺظهوری فەرموو، وە حەزرەتی شێخ علاء الدینی لە خزمەتا بوو، کە گەیشتن سیّد الکونین علیه الصلوات و التسلیمات کتێبێکی شرح شمسی بە دەستی موبارەکییەوە بوو، کتێبەکەی کردەوە هەر لە سەرەتایەوە فەرمووی بخوێنەرەوە ترکیبی بکە، سەرەتاکەی ئاوایە إنّ أبهی درر تنظّم ببنان البیان تا دوایی عەرزیم کرد نازانم ترکیب بکەم فەرمووی إنّ حەرفێکە لە حروفی مشبهە بە فعل وە أبهی إسم تفضیلی بەهایە، نصاب الصّبیانت نەخوێندەوە ئەڵێ ثمن چی بها وبها رەوشەنی لەگەڵ کەلیمەی رەوشەنی سینەی موبارەکی شەق بوو گڕاڵکەیە نووری لێ هاتە دەرەوە سینەم شەق بوو ئەو گڕاڵکە نوورە چووە سینەم کە خەبەرم بوەوە لله الحمد گەیشتمە ئەوە تعلیقاتم لەسەر هەندێ کتێب نووسی.

جارێ تر فەرمووی: لە کاتێکا کە من کەرامەتی زاتێکم بۆ گێڕاوە ئەویش هەر لەو زاتەوە گێڕایەوە کە من لێم دیوە، وە ئەو زاتەش خوا لێ خۆشبوو شێخ خالدی کوڕی حاجی شێخ محی الدین وە فەرموودەکەی ئەمەیە کە ملا باقر ئەفەرموێ: شێخ خالد هات بۆ لام ووتی مامۆستا فلان ئیشم هەیە بە خۆم جێ بەجێ نابێ جەنابت بە گوێت ئەکەن بۆم دروست بکە، ئەگەر تۆ ئەوەم بۆ بکەی منیش لە خزمەت حەزرەتی رسول الله ﷺ شتێکت بۆ ئەکەم، مامۆستا فەرمووی من درێغی ناکەم وە هەر چیم پێ بکرێ بۆت ئەکەم، وە ئیشەکەی خوا لێ خۆشبوو شێخ خالید لە بارەی موڵك و زەوی و زارەوە بوو، بەڵام من باوەڕم نەبوو شێخ خالید ئەوەندە دەستەڵاتی بێ لە خزمەت حەزرەتدا ﷺ ئیشم بۆ بکات، تا ماوەیەکی پێ چوو لە خەوما وام زانی لە مەدینەی منوّرە علی أکرم من دفنَ بها الصلاةُ والسلام هەروام ئەزانی زەمانی حەزرەتی رسول الله یەﷺ بۆ گەیشتن بە خزمەت حەزرەت چووم بۆ ماڵی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام کە گەیشتمە قاپی، قاپییەوان نەی هێشتم، هەرچەن تەقالام داو هەوڵ و کۆششم کرد لەگەڵیا خەریك بووم ڕێگەی نەدام ووتی ئیجازە نیە بچیتە ژوورەوە، تۆ بڕۆ بڵی مەلا باقر ئەیەوێ بێتە خزمەتت ووتی ناتوانم بچم، ئا لەم

گفتوگۆیەدا بووین تەماشام کرد شێخ خالید لە بازاڕەوە هاتەوە، هەندێ شتوومەکی پێ بوو وام ئەزانی کە هەر لە ماڵی حەزرەتایە و ئیشوکاریان بۆ ئەکات وە ئەو کەلوپەلانە هی ماڵی پێغەمبەرە ﷺ لە بازاڕ بۆ ئەوێی کڕیوە و ئەیباتەوە، لەگەڵ گەیشتە پێشەوە زۆر بە گەرمی سلاو و هەواڵ و محبّەتی پیشان دا، وە ووتی بۆچی نەچوویتە ژوورەوە ووتی ئەو شەخسە نەی هێشت، شێخ خالید لێی تورە بوو سەرزەنشتی کرد ووتی ئەمە یەکێکە لە عولەمای پێغەمبەر ﷺ چۆن نەت هێشتوە؟ لەگەڵ خۆیا بردمیە ژوورەوە ئەسبابەکانیدا بە دەست حەزرەتی عائشە رضي الله تعالى عنها ئەمجا لە خزمەت رەسوولی ئەکرەمدا تقدیمی کردم حەزرەت فەرمووی دانیشە، ئەدەبم کرد دانەنیشتم، فەرمووی أدب شنیدن است یانی ئەدەب بیستنە[1]، ئەمجا فەرمووی کە ئەم کەلیمەی أدب شنیدن است ی بە زمانی موبارەکیان هات ئیتر دەس بەجێ دانیشتم، ئیتر حەزرەتی رسول الله ﷺ دەستی موبارەکی کرد بە دڵی پیرۆزیا شتێکی دەرهێنا وەك دوڕێ کە بە گەوهەر ناو ئەبرێ سپی بوو بۆی هاویشتم دەستم بۆ گرتەوە بیگرمەوە نەکەوتە دەستم دڵم شەق بوو کەوتە دڵمەوە کە بەخەبەر هاتم ئەحواڵێکی زۆر خۆش و سرورێکی زۆرم پێ گەیشت، وە حاڵی بووم کە شێخ خالید دەسەلاتدارە الحمد لله.

وەدیسان فەرموی: زەمانی رەزا شای پەهلەوی[2] فەرمانێکی دەرکرد ئەو شایە کە لە هەموو فەرماندار و پەخشێکا[3] خەڵکی دێهاتەکان کۆبکەنەوە هەر پیاوێ لەگەڵ ژنەکەی بە پۆشاکی مۆدەوە بێت لە جێگەیەکی فراوانی دیاری کراوا وەکو ئاهەنگێك کۆ ببنەوە، ئەم پەچە و سەرپۆش و خۆ داپۆشینە هەڵ بگیرێ، وە لەم

---

(١) کەلیمەیەکە لە فارسیدا لە موناسەباتا ئەووترێ مامۆستا ویستویەتی لەبەر ئەدەب بە پێوە بێ فەرموویەتی ئەدەب بیستنە یانی بەگوێ کردنە چیت پێ ئەڵێن گوێ رایەڵ بە ئیطاعە بکە ئەوەیە ئەدەب.

(٢) باوکی شای دەربەدەر.

(٣) پەخش: ناحیە، فەرمان دار: قضاء.

بارەوە  بانگیان کردم بۆ قەلاَی مەریوان کە ئاگاداریم هەبێ لە کاتی دیاری کراوا ئەم فەرمانە ناڕەوایە جێبەجێ بێ، وە خەڵك هیچ دوانەکەون، کاتێ گەیشتمە مەریوان وام ئەزانی ئەو جێگە و هەموو شوێنەکانی تر بەم کارە بێ جێیە زۆر ناڕەحەتن، کە چی بالعکس کەسێکم نەئەدی نیشانەی پێ ناخۆشی پێوە دیار بێ، لەو کاتا سید عبدالقادر[1] لە مەریوان بوو، تۆزێکیش ساردی لە میانەماندا هەبوو، چووم بۆ مزگەوت هەر ئەو لەوێ بوو کە سەیرم کرد تەنیا هەر من و ئەو لە هەموو ئەو ناوچەدا بەو مەسەلەیە دڵگیر و عاجزین، روومان کردە یەك و دەستمان کرد بە گریان بە جۆرێ بانگمان هەڵدا و گریانمان بەرز بووەوە، ووتمان وای بۆ شەریعەتی ئیسلام ئای بۆ نەمانی ئایینی پاکی محمدی، هەتا توانیمان شیوەنی خۆمان کرد و داد و فریاد و بێدادێ زۆرمان دوو بە دوو بە عەمەل هێنا.

دەنگــی تــەپڵی جەنگــە ئــاخۆ گــەورە پیــاوان وان لــە کــۆی؟
حەربــە کــاتی دەســت و بــردە پاڵــەوانان وان لـــە کـــویێ؟
بــۆ نــەمانی زوعفــی ئیســلام مــەردی مەیــدان وان لــە کــویێ؟
بـــۆچی وا مەیـــدان بەتاڵـــە شـــۆڕە ســـواران وان لـــە کـــویێ؟

بەو هەمو خەموو خەفەتەوە گەڕامەوە، دیسان لە ماڵەوەش هەر گریان و بێتاقەتی و ناڕەحەتیم بۆ ئەو بێ شەرمی و پەردەی حەیا درینە دەربڕی، شەو بەو حاڵەتەوە خەوم لێ کەوت، لە خەوا بە حضوری سەراپا نوری حەزرەتی رسول الله ﷺ شەرەف دار بووم فەرمووی بۆ وا ناڕەحەتی؟ عەرزم کرد قوربان بۆئەم حاڵە کە رووی داوە، فەرمووی: ئیجازەت ئەدەم هەزار جار ربّنا آتینا من لدنك رحمةً وهیئْ لنا من أمرنا رشداً بخوێنە فەرمووی ئەم منطقە یا ئەم ناوە بە معنایە لەمانە لەم بەلاَیە محفوظ ئەبن.

---

(١) سید عبدالقادر ئەوسا شێخ الإسلامی مەریوان بوو.

فەرمووی بەیانی کە هەستام لەگەڵ چەن کەسێکا ١٠٠٠ هەزارەکەمان خوێند ولله الحمد ئەو ئەمرە بە نیسبەت وولاّتی ئێمە نەچوە سەر[1].

جەنابی عالمی مفضال مامۆستا ملا باقر رقة القلب ی بوو, جەزبەی بوو، گریانی بوو، باسی بەسەرهاتی تری زۆرە، إن شاء الله تعالی هەریەك لە جێی خۆیدا ئەخرێتە پێش چاو، با هەندێ تر لە پلە و پایەی عیلمیدا نەگەیشتبێ بە مەقامی ئەم زاتانە چونکە معلومە وفوق كلّ ذي علمٍ عليم کەلامی بە حقّی حەقّە بەلاّم لە تأثیری زۆر و صەلاّحەت و شەریعەت رەوی و گوێ بە پاشماوەی بێ قیمەتی دنیا نەدان، وە بە جدّی رووکردنە خوا، یان لە کاتی نارەحەتی و تەنگ و چەڵمەیەکەوە تووشیان بووە، لوطف و بەرەکەتی حەزرەتی فەخری عالەم شامیلی ئەحواڵیان بووە بۆ نموونە: چەن کەسێ لە عولەما رحمهم الله تعالی هەبوون کە بەزەیی و دڵ نەرمی سینەی حەزرەت و بە مەراحم و دڵنەوایی پاکی و بەرزی حەزرەتی خير البشر مشرّف و مفرّح القلب و مفتخر الحال بوون و بە مژدە و دڵنیا کردن بە رزگاری شادبوون.

یەکێ لەو زاتانە خوا لێ خۆشبوو مەلا محمد ئەمینی بالیکە دەرییە[2] لە رەووشت و خوی سەفەریەر، لەهەر گەڕەکێکا پیاوێکی ماقوڵی خاوەن دیوەخان بووە، کۆڕی شەوانی هەبوە بە چەشنەها چیرۆك و پەند و بەسەرهات و قسەی خۆش شەویان بەسەر بردوە کاتێ مەجلیس چۆل بوە کوڕ و کاڵی ئەو گەڕەکە و هەرزەکارانی تا ماوەیە لە دوای ئەوان لەو دیوەخانە دەستیان بە گۆرەوی بازی و پاشا وەزیر و چەشنەها یاری تری بەرێز کردووە، کە خەویان هاتبێ نەچوونەتەوە خانووی خۆیان هەر یەك لە جێی خۆی لێی راکشاوە تا بەیانی، لەم شەوانەدا

---

(١) الحمد لله وەك ئیجازەی عیلمیم لە مامۆستا وەرگرت، هەروەها ئیجازەم بۆ ئیمامەت و سائری أموراتی دینی بە تایبەتی ئیجازەم بۆ خوێندنی ئەم ئایەتەش لێ وەرگرت رحمة الله تعالی علیه آمین (دانەر)

(٢) ئەم ملا محمد أمینی بالیکە دەرییە ماڵیان لە سلێمانی لە گەڕەکی سەر شەقام بوە.

لەگەڕەکی سەر شەقام لە سلێمانی حاجی عبداللە ناوێ کە خاوەنی دیوەخانێکی ئاوا، شەوێ لە نیوە شەودا هەڵ ئەسێ ئەڵێ بەو گەنج و هەرزەکارانە کە لە دیوە خانەکەی دان ئادەی حازر بن و هەریەك شتێ هەڵگرن کە هەڵ ئەستن تەماشا ئەکەن چەند کیسە و تورەکە و جام و ئەسبابی تر حازرە وە هەمووشیان پڕن لە زەخیرەی جۆر بە جۆر، هەریەکە شتێ هەڵ ئەگرێ و خۆی ئەکەوێتە پێشیان و ئەوانیش بە دوایا تا ئەگەنە بەر دەرگای ماڵی خوا لێ خۆشبوو مەلا محمد ئەمینی بالیکەدەری و لە قاپی ئەدەن پاش ماوەیەکی زۆر دەنگێکی نزم دێت هەر چۆن ئەبێ دەرگا ئەکرێتەوە، خۆی ئەخا بەسەر قاچی مامۆستادا ئەڵێ تۆ بۆ خۆت وا لێ ئەکەیت؟ ئێمەش وا پێ ئەکەیت؟ بۆچی کە شتێك نابێ دەنگ ناکەیت؟ ئەفەرموێ حاجی ئابرووی شەریعەت نابەم بە پەلە سایلە و حەلوا دروست ئەکەن وە ئەی کات بە دەمی منال و ئەوانەی پەکیان کەوتووە، تا هەموو دێنەوە سەرخۆ، پاشماوەی زەخیرەکە بە جێ دێڵێ و دێنەوە بۆ ماڵ لە پاشا لە حاجی ئەپرسن چۆنت زانی کە ئەم خێزانە وایان بەسەرهاتوە؟

ووتی نەمزانی لە خەودا بە حضوری حەزرەتی سیّدی أکرم رسولی أعظم ﷺ گەیشتم فەرمووی: حاجی ماڵ و منالی مەلا حمەد أمین وان لە نارەحەتیدا هیچیان نیە فریایان کەوە، بە عیبارەتێ ئەی فەرموو لەم شێوەدا ئەم مانایە ببەخشێ ئیتر کە بە ئاگا هاتم بە پەلە زەخیرەم فریا خستن[١].

---

(١) وەك ئەمە جارێ: حاجی محمدی شاڵی باوکی حاجی عبداللە شاڵی نەخۆش ئەبێ بە حاجی عبداللەی کوری ئەڵێ رۆڵە جامێ ئاو بیە بۆ ماڵی مامۆستا ملا موسی کە ئیمام و مدّرسی خانەقای مولانا خالیدی نەقشبەندی بووە لە سلێمانی دۆعای پیا بخوێنێ بە نیەتی شیفا وە بۆم بێنە بیخۆمەوە حاجی عبداللە ئەڵێ جامەکەم هەڵگرت و بردم لە حەوشە چوومە ژوورەوە سەیر ئەکەم مامۆستا ملا موسی بە تەنیا دەسە سرێکی بە دەسەوە گرتوە و هەڵ ئەپەڕێ، بەڵام هەڵپەرینێ بە گەرم سەرچۆپی خۆی بۆ خۆی گرتوە، کە منی دی وەستا ووتی رۆڵە چیت ئەوێ؟ عەرزم کرد باوکم سلاوت لێ ئەکا نەخۆشە هاتوم دۆعام بە ئاوا بۆ پیا بخوێنە بۆ شیفا، لێی وەرگرتم دۆعای پیا خوێند و دایەوە دەستم فەرمووی ئەحەواڵ پرسی

| | |
|---|---|
| لــه هــەر دڵێکـا جـێگیر بێ ئیمـــان | هـەر چاوەڕوان بێ لـە لـوطفـی رەحمان |
| نـــەبوونیی کـارێ ناکـا لـە حـاڵی | هـیچ غـــــرور ناکا بـە زۆری مـاڵی |
| شوکرانـــە گۆیـە بـە بـوون هەمیشـە | نـەی بێ قەناعـەت ئەکـــــا بـە پیشـە |
| بـەعزێ بـە نـەبوون زیـاتر دڵخۆشـن | بـە بـوون شـەربەتی خەفـەت ئـــەنۆشن |

---

بکە، من وەستام ووتی دەی بۆچی وەستاوی ناڕۆی؟ ووتم قوربان ناڕۆم، ووتی ئەی چیت ئـەوێ؟ ووتم قوربان ئەوە بۆچی هەڵ ئەپەڕیت بە تەنیا؟ فەرمووی کوڕم جا تۆ بۆ ئەپرسی من ماڵی خۆمە؟ هەڵ ئەسـم دائەنیشم ئەگەڕێم هەڵ ئەپەڕم تۆ ئیشی خۆت تەواو بوە ئیتر حەقی پرسینت نیە؟

بەلام من زۆر لەو کارەساتە سەرسام مابووم ووتم بە خوا قوربان ئەبێ پێم بڵێیی؟ هەرچی ویستی مـن بڕۆم واز لە دەرکەوتنی ئەو نهێنییە بهێنم سوودی نەبوو وازم نەهێنا.

فەرمووی ئەگەر سوێند بخۆی لای کەس ئاشکرای نەکەی پێت ئەڵێم سوێندم بۆ خـوارد. فـەرمووی ئەمشەو یا ئەمڕۆ ۳ سێ رۆژە هیچمان نیە تەماشام کرد شێوەی ماڵەکەم لە مـاڵی ئەصـحابی پێغەمبەر ﷺ ئەچێ لە خۆشی ئەوە هەڵئەپەڕم.

کە ئەمەی فەرموو زۆر کاری تێ کردم وە منیش لەو کاتەدا فامم کردبووەوە و هەستم بە شـت ئـەکرد ئاوەکەم هێنایەوە دام بە دەست باوکمەوە، سەیری کردم ووتی رۆڵە بـۆ وا تێکچـووی؟ عـەرزم کـرد جـا کەی تێکچووم، فەرمووی رەنگت گۆڕاوە چی رووی داوە؟ زۆرم ووت و نـەی بیسـت چـونکە ویسـتم سوێندەکەم نەکەوێ و ئەو نهێنییە ئاشکرا نەکەم سوودی نەبوو، ووتم سوێندیان داوم قسە نەکەم، ووتی رۆڵە من نەخۆشم لێم ئەبێ بە مەراق بۆ نەخۆشییەکەم خراپە کەفارەتی ئەدەم ئەمجا باسەکەم هـەمووی بـۆ گێڕایەوە، ووتی بڕۆ فلان کوڵ هەڵگرم بۆ بانگ بکە، چووم بـە شـوێنیا ووتی ئەمشـەو سـەعات ئەوەنـدە وەرە بۆ ئێرە ئیشم پێت هەیە؟ لە کاتی دیاری کراودا هات هەرچی پێویستی ماڵ بێ لە زەخـیرە و خـواردن وە هەرچی خوا بە نصیبی کرد بێ خسـتییە کۆڵێکـەوە پێـی ووت: لـە حەوشـەی مـاڵی مامۆسـتادا دایـنێ بانگی بکە بڵێ ملا موسی ئەمە هی ئێوەیە ئیتر مەوەستە وەرە دەرەوە ئەویش بە ئامۆژگارییەکـەی کـرد و فەرمانەکەی بەجێ هێنا:

| | |
|---|---|
| بە شان و بازووی صبر و خۆگری | باخیشیان دانا و گەیین بە بەری |

جەنابی خوا لیٚ خۆشبوو ملا حسنی علاّف ووتی:[1]

خوا لیٚ خۆشبوو ملا محمودی مدّرس فەرمووی: ملا محمدی مشهور بە خاکی هەڵبەستێکی لە ستایشی حەزرەتی رسول الله ﷺ و خیر البشردا هۆنیبووەوە کە سەرەتاکەی ئەفەرمویٚ:

بباریٚنە خودا بارانی هەرچی فەیض و إحسانە
بەسەر ئەو باعثی خەلقە، گوزیدەی جەمعی ئەکوانە
دەمی صوبحی ئەزەل داکا، هەتا شامی ئەبەد بڕژیٚ
بە یەك تاو بیٚ، نەوەك تاو تاو، وەکو تاوی بەهارانە
بەسەوزەی نەو نەسیمی گوڵ، شەمیمی لوطفەوە داکا
نەسیمی نیسبەتی حەق، دانەیەکی کا بە صەد دانە

ئەمجا ملا محمدی خاکی لە ساڵی گرانی سەفەر بەری پیٚشوو نەخۆش ئەکەویٚ و هەر لەو نەخۆشی‌یەدا کۆچی دوایی ئەکات، ملا محمدی مدرس فەرمووی لە کاتی بەر لە وەفاتی چوومە خزمەتی زۆر ناڕەحەت و نەخۆش بوو، ووتم خاکی چۆنی، ووتی خەم لە دڵما نەما بە خزمەت حەزرەتی رسول الله گەیشتم ﷺ فەرمووی خاکی شیعرەکانتم قبووڵ کردەوە:

گەر وەکو عیسی لە پاش مردن بەسەرما رابوری
تجمع العظم الرّمیم تُحیني بعْدَ العدَمْ

مامۆستا شیٚخ بابە علی لە لای چەند مەلا گیٚڕابوویەوە، وە منیش لە مامۆستا مەلا رەحیمی پەرخیم بیست کە بۆ مەسەلەی نەقڵ لە سلیٚمانییەوە بۆ جیٚگەیە تر لە قەرەداخ جەنابی شیٚخ بابە عەلی ئیستیخارەی کردبوو: ووتی شەو لە خەوما لە قەراخ ئاوی سیراون لەسەر بەردیٚ پان حەزرەتی رسول الله ﷺ تەشریفی موبارەکی وەستا

---

(١) ئەم مەلا حسینی عەلافە باوکی برای هەردوو دنیامان حاجی عبدالغفورە.

بـوو، چـوومه خزمـەتی زیـارەتیم کـرد فـەرمووی تـۆ کێـی؟ عـەرزم کـرد بابـەعلی؟ فەرمووی شوغڵت چیەیە؟ عەرزم کرد تەدریس فەرمووی بەخ بەخ یا بـە هبەهـ ئـەمجا فەرمووی ئەوە وا لە دڵتا مەیکـە، فـەقێ هاتـە لات کـەمی خوێنـدبێ یـا زۆر دەرسی پێ بڵێ نوێژ بێ جەماعەت مەکە کە هەستام بۆ سەفەرەکە نەچووم[1].

جارێك فەقێیەك ئەچێتە خزمەتی دەرسی شەرع ئەخوێنێ سـەرەتای جلـدی کتێبێ ئەخوێنێ کە وەصیەتە باسی وەفاتی حەزرەتی رسول الله ﷺ ئەکات کە دەس ئەکەن بـە سەرەتای دەرسەکە مامۆستا بابە علی ئەوەندە ئەگری ئەوەندە ئەگری ئەڵێ دەرسـەکە بخە بەیانی، بەیانی هەر بەو دەستورە، گریان زۆری بۆ دێـنێ، ئەیخاتـە ڕۆژی سـێیەم، سێیەمیش هەر بەو دەستورە، ئـاخری ئـەڵێ بـە فەقێکـە، بـا لـە لایـەکی تـرەوە دەرس دەست پێ بکەین، لە باسی وەصیەتەوە نەبێ ناچار دەرسەکە ئەگۆڕن.

خوا لێ خۆشبوو مەلا محمودی بێخود لەبەر ئـەدەب نـاوی حـەزرەتی نەئـەهێنا وە ئەی ووت صـلی الله علیـه وسـلم فـەرمووی: ئـەمجا حـدیس بوایـە بـەیانی ئـەکرد، وە محبەتی بێ ئەندازەی حەزرەتی رسولی ئەکرەمی ﷺ بووە زۆربەی شیعرەکانی لـە مـدحی حەزرەتی پێغەمبـەری مویارەکـدا ﷺ بـووە یـا لـە مـدحی حـەزرەتی غـەوث بـوە (قـدّس سرّه).

خۆی مریدی حەزرەتی شێخ نجـم الـدینی کـوڕی حـەزرەتی ضیاء الـدین مولانـا عمری بیارە بووە (قدّس الله سرّهما العزیز)، وەك لە نیوە دێڕێکا لە ستایشی حـەزرەتی شێخ نجم الدین فەرموویەتی:

بە دەشتی شارەزورا بێخودی دێوانەکەی خۆت هات

---

(١) عادەتی وابوو هەر فەقێیەك کە ئەهاتـە لای بـۆ خوێنـدن نـەی ئەفـەرموو چی ئـەخوێنی؟ ئـەی فـەرموو کتێبەکەت بێنە، بشچوایە بۆ جێگەیە بە فەقێیەك لە فەقێکانی ئەووت نوێژ مەکە تا دێمەوە کـە ئەهاتـەوە بـە جەماعەت لەگەڵ ئەودا نوێژی ئەکرد.

جاریٚ هەردوو چاوی نابینا و کوێر ئەبیٚ، ماوەیە بەو حاڵەوە ئەمێنیٚ ئەچیٚ بۆ کەرکوك لە بیمارخانە ئەکەویٚ بەینیٚ تەداوی و دەرمانی ئەکەن چاری نایەت، شەویٚ هەڵ ئەسیٚ[1] پێنووس و تیانووس دەرئەهێنیٚ بە حاڵی بیٚ چاوییەوە ئەم چوارینەیەی بە فارسی بە شێوەی داواکردنی کۆمەك لە حەزرەت ئەهۆنێتەوە، کاتیٚ خەبەری ئەبێتەوە هەردوو چاوی چاك بۆتەوە و بینا بووە، هەروەکو کوێری بەسەردا نەهاتوە، ئەویش ناوەستیٚ دێتە دەرەوە و ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی وە لەوێوە بۆ بیارەی شەریف کە ئەگاتە هەڵەبجە ئەچێتە مزگەوتیٚ گویٚ ئەگریٚ فەقێیەك لەبەر هەیوانی مزگەوت شیعرەکانی ئەو ئەخوێنێتەوە زۆری لا سەیر ئەبیٚ ئەڵێن ئەم هۆنراوەی منە جێگەی سەرسوڕمانە خۆ نیشانی کەسم نەداوە، تۆ بڵێی کەسێکی تر ئەمانەی من ووتومە ئەویش ووتبێتی، ئەچێتە لای فەقێکە مەرحەبایی لیٚ ئەکا ئەڵیٚ ئەو هەڵبەستە هۆنراوەی کێیە؟ ئەویش ئەڵیٚ هەڵبەستی بێخودە ئەویش ئەڵیٚ چۆن کەوتۆتە دەست تۆ؟ ئەڵیٚ دوێنیٚ چووم بۆ بیارە حەزرەتی شێخ علاء الدین قدّس سرّه فەرمووی هەر کەس ئەم شیعرانەی بێخود بخوێنێتەوە و بیکا بە عادەت کوێر نابیٚ[2].

(ئەمە کوردییەکەیەتی):

چی ئەبیٚ ئەی رابەری گشت دەرکی لوتفت (وا) بیٚ
شۆڵەیە بۆ ماڵی تاریکی دڵم پەیدا بیٚ

---

(١) ئەم باسەم لە شێخ خالیدی مفتی هەڵەبجەم بیست، وە هەروەها خۆی چەندەها کەڕەت باسی کردووە.

(٢) ئەمەش شیعرەکانە کە بە فارسی فەرموویەتی:

یا نبی الله چە باشد باب مهرت وا شود
پرتوی در کلبۀ احزان من پیدا شود
دیدەی یعقوب روشن شد ببوی چون رواست
باغبان روضەی نعت تو نابینا شود

چاوی یەعقوب خۆ بە بۆیە روون بوو ئەی بۆ ئەبێ؟
بـــاخەوانی بـــاغی مـــەدحت کوێـــر و نـــابینابێ

(دانەر)

لە خوا لێ خۆشبوو مامۆستا مەلا محمد أمینی صۆفی خەڵکی پێنجوێنم بیست کە مامۆستام بوو ئەی فەرموو کە زاتێکی خاوەن تمکین و ویقار وە صاحیبی سعادەت و سیادەت کە کۆبوونەی ئەم دووە لەهەرکەسێکا بوو هۆی بەختیاری‌یە، بەڵکو سەعادەت و سیادەت وەکوو وتراوە تەواوکەری یەکترن:

سـادات و سەعـــادەت بـــە یـــەکـــۆ، وەك تـەن و گیـانن
ساداتـــــە بـــــەڕاسی کـــــە سەعـــاداتی جیـهانـــن
سەیـــری لـە ووشـەی خۆشی سـەعادەت کـە، کـە عـەینی
کـانـی شەرەفـــە[1]، کـانی ئـــەوەش دیـــارە ئەوانـــن
هـــەرکەس کـــە دژی کـا لـەگـەڵ ئـەو تاقمـە سـەد جـار
خـۆی بـــیژێ کـە مـن خـوا پـــەرسم وایـــە مـەزانـــن

ئەمجا ئەم زاتە باسی فەرموو کە خوا لێ خۆشبوو زانای بەرز و بەڕێز سیّدی أصیل نجیبی نبیل عابد و زاهید پڕ لە شەرافەت و کەرامەت ماقووڵ و مەقبول مامۆستا شێخ بابە رەسول مدّرسی دێی عەبابەیلێ[2] زاتێ بوو لە عیلما زانا و لە عەقلا دانا لە رەووشتی شیریندا بێ وێنە بوو، وە بەرامبەر بە هەموو موسڵمانێ دڵ

(۱) کانی یەکەم: یانی سەرچاوە و منبع.
کانی دووەم: یانی کانزا و معدن.

(۲) عەبابەیلێ: ناوی دێیەکە لە سەرو هەڵەبجەوە، بە پێ ۲۰ دەقیقەیەك ئەبێ لە هەڵەبجەوە بە ناوی أبو عبیدەی أنصاری ثقفی ناوبراوە ﷺ، خەڵکی ئەم دێیە زۆر غەریبیان خۆش ئەوێ و بە ماریفەت و خۆش خولقن، پیاوی گەورە گەورەیان لێ هەڵکەوتوە وەکو جەنابی شێخ حەیدەری گەورە و خاڵە شێخ کریم، وە بە دار العلوم مشهور بووە.

نەرم و بە بەزەیی مزاجیْ مستقیم سروشتیْ نەرم و سەلیم هەردەم کۆڕی خۆش و پڕ لەزەت بوو.

جەنابی ئەم زاتە خوا لیْ خۆشبووە بە زۆری وەخت لەگەڵ کۆڕ و کۆمەڵی مەلاکانی هەڵەبجە و دەوروبەری ئەو ناوچەیە پیْکەوە ئەبوون، وە ئەو زاتە چاك و پاکانە کە ئیْستە جیهان شانازییان پیْوە ئەکات و نموونەیان کەمە ئەمانە بوون: خوا لیْ خۆشبوو ملا شیْخ کریمی مدرسی دیْی ئەحمەد برندە، خوا لیْ خۆشبوو ملا قادری صۆفی، خوا لیْ خۆشبوو ملا عزیز مدّرسی پریس، خوا لیْ خۆشبوو ملا سەعیدی عەبابەیلیْ، مامۆستا مەلا عابد وە مامۆستا شیْخ رەسووڵی هەڵەبجە، وە چەند کەسیْ تر لە زانایان و پیاو ماقولانی ئەم شارە، وە هەمیشە باس و قسەیان هەر لە شەرع و تفسیر و حدیس و ناوبردن و یادی مەشایخ و پیاوچاکان بوو زۆربەی ئەو کاتەیان هەر باسی أولیا و دۆستانی خوایان ئەکرد بەلاّم مامۆستا شیْخ بابە رەسول عەبابەیلیْ سەرۆك و گەورەی هەمووان بوو.

ملا محمد أمين گیْڕایەوە فەرمووی: فەقیْ بووم لە مزگەوتی حسن ئاوای خوار هەڵەبجە چووین بۆ لای مەلا أحمد ناویْك کە برازای یاخۆ خزمی مامۆستا مەلا عزیز لە کاتی هاتنە دەرەوە من هەستام پیْلاوی مامۆستاکان جووت بکەم و بۆیان دابنیْم یەکەم جار دەستم دایە پیْلاوی مامۆستا شیْخ بابا رسوڵ و دامنا، وە مامۆستا مەلا عزیز فەرموی نەتزانی دای بنیْی هەڵم گرت و تەکاندم و دامنا فەرمووی هەر نەتزانی لە یەك تۆزیْ جیاوازیم لە دانان یانا بەکارهیْنا فەرمووی هەر نەتزانی عەرزم کرد لەوە چاکتر نازانم خۆی دەستی دایە هەڵی گرت ژیْری پیْلاوەکانی بابە رەسووڵی ماچ کرد و فەرمووی پیْلاوی بابە رەسووڵ ئەبیْ ئاوا دابنریْ.

مامۆستاکان لەگەڵ عیلم و فەزڵی کە بوویانە خۆیان لەناو خۆیاندا وابوون جەنابی بێخودیش رەحمەتی خوای لێ بێ لە مەدحی شێخ بابە رەسوڵ و مامۆستا شێخ کریمی ئەحمەد بڕندەدا ئەڵێ:

هیلاکی بازەکەی ئەوجی عەبابەیلێ وەکو بەغدام
پەشێوی شاهەکەی ئەحمەد بڕندەی وەك بوخارا خۆم
هەڵەستم دادەنیشم شێوەیانم هەر لەبەرچاوە
مریدێکو خەریکی رابیطەی دوو پیری دانا خۆم

هاوڕێیەتییان وەهابووە ئەگەر بە کۆمەڵ چووبن بۆ دیدەنی یەکێ تریان و لە ماڵ نەبووبێ خۆیان وەك خاوەن ماڵ دەستوری نان و چێشت و دروستکردنیان داوە ئەوەی لە خەیاڵیانا نەبووبێ خەم و خەفەت و باسی دونیا بووە، پیاو هەر کات بیر لە زەمان و چۆنیەتی رابواردن و هەڵسوکەوتی ئەوانە بکاتەوە راستی و صداقەت لە رەفاقەتی ئەم پیاوە چاکانەوە وەرئەگرێ وە لە خوو رەووشتی شیرین و جوانی ئەم پێشینانە پڕ لە بەرەکەتانەوە و خواپەرستی و محبەتی عولەما و مشایخانی پێشوو کە لەم زاتە بوزرگانەوە هاتوەتە دی بیر بکاتەوە، وە بەراوردێ لە زانایی و جەوهەری زانستی و مەعریفەتی ئەوان لەگەڵ زۆربەی خوێندەوارانی ئەم چەرخە ئەکەی بە هیچ جۆرێ پەیوەندی نابینیتەوە، هەتاوەکو لە پۆشاك وجل و بەرگیشا:

نە لەیل ئەو لەیلەن، نە مەیل ئەو مەیلەن
دڵ لە لێلاوی خەفەتا کەیلەن
مەر ناویان وەك یەك بێ بە زوباندا
چە نیسبەت ئەمان لەگەڵ ئەواندا



خـالی یـارانم رەش و ئاڵـەت رەشــە هــەردوو بــە جــویٚ
دڵ ئەسووتێنن بەلاّم ئەمیان لە کویٚ ئەویان لە کـویٚ!!! [١]

مامۆسـتا مـەلا محمـد أمـین فـەرمووی: رۆژیٚ عـەرزمان کـرد قوربـان وا دیـارە مامۆسـتا لـە خزمـەت حـەزرەتی شـێخ عـلاء الـدین‌دا (قدّس سرّه) تەمەسـوکت تـازە نەکردۆتەوە؟ فەرمووی: مەلاکان ئێوە خۆتان ئەزانن من مەلام سیّدم ریشم سپییە ئەم عالمانەی هەڵەبجە منیان بە برا گەورەی خۆیان قبوڵ کردووە وا نـازانم درۆ بکـەم دەی والله والله ئەگەر حەزرەتی شێخی علاء الدین ئەمرم پیٚ بکات ئەم جل و بەرگە دابنێم پێتاو ببەستم قەتارچێتی ماڵی شێخ بکەم ئەیکەم بـەلاّم خۆشـەویستی و محبّـەتی شـێخ نجم الدین بە چەشنیٚ کاری تیٚ کردووم بۆم ناپۆشریٚ.

وە یـەکیٚ لەوانـە ئـەوە بـوو ئـاخر مـادەم ئەخوێنـد لـە بیـارە شـەو موتـالام ئـەکرد شەیتان خەتەرەی پیٚ کردم دای بە دڵمـا کـە تـۆ عـالم تـۆ سـیّد بـە ئەندازەیـەك تـەقوات هەیە، شێخ نجم الدین با پیاویٚ ئەهلی مەعنا بیٚ، بۆچی تۆ ئەبیٚ ئـاوا دەسـەو نـەزەری بوەستی وە بەم چەشنە گویٚ رایەڵ و ملکەچی بی؟ هەرچەند وەلاّمی ئەم وەسوەسانەم ئەدایەوە دڵنیاییم پەیدا نەئەکرد، بـە کـورتی ئەوەنـدە زۆری بـۆ هێنـام نـەم تـوانی هـیچ بخوێنمەوە کتێبەکەم لێك ناو خەوم لێکەوت لە خەوا بە خزمەت حەزرەتی شـێخ نجـم الدین گەیشتم حازر بوو فەرمووی: ئەو خەیالاتە لە شەیتانەوە بوو پەنا بگرە بـە خـوا نەمرم ئەمشەو بە خزمەت رسول الله ت ئەگەیەنم، لە پـاش ئـەوە هـەر ئـەو شـەوە بـە خزمـەت حـەزرەت گـەیشتم فـەرمووی: بابـە رەسـولٚ وا مەزانـە بەبۆنـەی بـاوکو و ئەولادی‌یەوە هاتووم، بۆ ئەوە هاتووم کە نجم الدین بە درۆ نەکەوێتەوە[٢].

---

(١) فارسییەکەی ئەمەیە:

خالی محبوبان سیاه دانه فلفل سیاه   هردو جان سوزند أمما إین کجا و وآن کجا

(٢) حاجی میرزا تۆفیق خوا لێی خۆشنود بیٚ کە زاتێکی پیرۆز و پڕ جەوهەر و خۆشخولق و میوان پـەرێز بوو خەڵکی عەبابەیلیٚ بوو لە هەڵەبجە تەشریفی موبارەکی نیشتەجیٚ بوو گێرایەوە فەرمووی:

چەندەها جار لە مامۆستا مەلا عارفی بانەییم بیستوە کە ئەی فەرموو: بە خزمەت حەزرەتی رسول الله ﷺ گەیشتم جارێکیان ئاوا، جارێ تریان ئاوا بە کورتی لە فەرمایشتی‌یەوە دەرئەکەوت زۆر بە خزمەتی کامیاب و شەرەفدار بووە، هەتا جارێ من عەرزیم کرد کە سیّد سعیدی سێفی ووتی لە خەوا بە خزمەت رسول الله گەیشتم عەرزم کرد قوربان تۆ لە نوێژا (وأشهدُ أنّ محمداً رسول الله)تان فەرمووە (یا أنی رسول الله) مامۆستا مەلا عارف فەرمووی منیش ئەوەم عەرز کردوە خوا لێی خۆشبێ، حاجی میرزا تۆفیق زۆری شت بۆ گێرایەوە بەلاّم داخی گرانم زۆریمان فەرامۆش کردوە ربّنا لا تؤاخذنا إن نسینا أو أخطأنا.

جارێکی تر خۆی گێرایەوە فەرمووی: سەربازی عوسمانی بووم لە غەزای رووسیا بووم زۆر لە موسلّمانان شەهید کران و بە لیباسی خۆیانەوە نێژرابوون، شەوێ وردە تەقە لە هەردوولاوە هەبوو تەماشای ئەو لایەم کرد کە شەهیدەکانی لێ نێژرابوون بینیم نوور لە راستی هەموو شەهیدەکانەوە هەر یەك بە جیا لەسەرخۆیەوە بەرز ئەبووەوە، بەلاّم هەندێ زۆر رووناك هەندێ کەمتر هەندێ ئەستور هەندێ باریك جیاوازی هەبوو لەناویاندا، کە ئەوەم دی بە چاوی خۆم چوومە پێشەوە دەستم کرد بە تەقە لە دلّما بوو کە بکوژرێم بە پایەی بەرزی شەهادەت شاد بم،

---

کاتێ هەوالّی لە دنیا دەرچوونی مامۆستا شێخ بابە رەسولّم وەرگرت بێ ئاگایانە لە هەلّەبجەوە رام کردوە بە پێخاوس پێلاّوەکانم بە دەستمەوە بوو تا گەیشتمە عەبابەیلێ، لەو کاتەدا تەرمی موبارەکی مامۆستایان لە مزگەوت دانابوو زۆر لە خەلّکی ئەوێ و دەوروبەری ئامادەبوون، نەچوومە مزگەوت چوومە حوجرەی فەقێکان، وە لە حوجرەکەوە ناو مزگەوت دیار نیە، بەلاّم لە پێش چاوم ئەو دیوارە هەلّگیرا بوو بە چاو ئەمبینی دوو گلّۆپ بەسەر سینەی شێخ بابە رەسولّەوە بوو یەکێ سپی وە یەکێ سەوز سپیەکە نیشانەی عیلمی وە سەوزەکەش نیشانەی سیادەتەکەیەتی وە هەروەها جەنابی مەلا رەحیمی پەرخی کە خزمی زانای صالح و خۆشخولق و شیرین زمان ملا صالحی پەرخی‌یە ئەی ووت کە فەرموویەتی: ئاخ مالّە و مال سوالّم بکردایە، وە لە هەر مالّێ شەقێکیان تێ هەلّدامایە ئەمما شێخ نجم الدین لە دنیا دەرنەچوایە.

پیاوێ وەك چاوەش یا باشچاوەشی سەربازەکانی تورك بانگی کردم ووتی ئەوەی تۆ چاوت لێیە منیش ئەی بینم خۆت مەدە بە کوشت مانەوەت چاکترە وا بەچاك ئەزانرێ بمێنیتەوە ئیتر قسەکەیم پەسەند کرد[١].

خوا لێ خۆشبوو ملا ئەحمەدی شفیق[٢] مەلای دێی بێستان[٣] بوو دێیەك هەبوو ناوی هەنگەژاڵ وە دێیەك هەبوو ناوی سەیرانە لەولایەوە بوو لەسەردەمێکا لە مزگەوت حدیسی ئەخوێندەوە بەشێوەی ئامۆژگاری و مەوعیظە بۆ ئەو موسڵمانانەی حازر بوون لە جەماعەت و نوێژا، چەند کەسێ لە خەڵکی ئەو دێیە هەرچەن بە دیمەن نوێژکەر ئەبن بەڵام بە بڕوا بە بەسەرهاتێ کە لە قرآنایە و ثابتە بێ باوەڕ ئەبن، کاتێ خوا لێ خۆشبوو ملا أحمدی شفیق بە سەرهاتی نەتەوەی عاد و ثەموود ئەگێڕێتەوە ئەو چەند کەسە ئینکاری هێز و توانای ئەو با ئەکەن کە ئەو قەومەی لەناو بردووە، مامۆستای خوا لێ خۆشبوو دەست ئەکات بە گریان و لە خوا ئەپاڕێتەوە، بۆ بەیانی ئەو رۆژە بایەك هەڵ ئەکات هەندێ خانووی تێك دابوو، دابووی بەسەر گوێسەبانێکا هەڵی تەکاندبوو، ئەنجا جوانوو ئەسپی لەناو دێ بردبوو گەیاندبوویە چەمی رەشید، دار گوێزێ کە بە قەد پاڵی شاخی لای دێ کەوە بوو وە ساڵە های ساڵ و بە بیرەوەری خۆیان ئەو گوێزە لەوێ بوو بایەکە لە رەگ و ریشەوە دەری کێشابوو، وەك باڵندە بەسەر دێ کەوە ئەی سووڕاندەوە.

خەڵکی ئەو دێ هەموو دەسیان بە هاوار و داد و فەریاد کردبوو زۆر پەنایان بە حضرەتی ربّ العالمین گرتبوو گیانی پاکی چاکانیان کردبوو بە دەستگیر خوای تعالی باکەی خستبوو، لە پاشا کە چیرۆك و بەسەرهاتی ئەو دێیە ئەگاتە لای خەڵکی دێی

---

(١) ئەڵێم أشهد شتێکم نیسبەت بە خۆم بە رێگەی إخبار و وەعدە لێ بیست وە پێی ووتم: وە لێ فەرمووی نازانم زوو ئەبێ یا درەنگ هاتە جێ چۆنی ووت وابوو علیە رحمة اللە بجاە حبیب اللە آمین.

(٢) شفیق: نازناوی هەڵبەستی بو.

(٣) بێستان: دێیەکە لە باکوری پێنجوێن سەعاتە رێیەك لێوەی دوورە.

هەنگەژاڵ و سەیرانە کە هەریەکی نیو سەعات لەوەوە دووربوون زۆریان بە لاوە سەیر بووە وە عەجایب مابوون، کە ئێمە بای وامان نەدیوە وە حاڵی دوێنێ هەروەك ڕۆژانی تر وابوو[1].

---

(١) دانەر ئەفەرموێ خۆم بە خزمەت ملا أحمدی شفیق زۆر گەیشتوم زاتێکی زۆر خواناس و صالّح و سەخی تەبیعەت و هەردەم ڕووخۆش و قسە خۆش بوو، هۆنەرێکی جوان و مەجلیس خۆش بوو وە خۆی موریدی حەزرەتی ........... بوو (قدّس الله روحه) وە ئەمەش نموونەی هەڵبەستی‌یەتی:

زەلیلی زوڵمەتی نەفسم، بەبێ ڕەحمی خوادا چیبکەم
بەجیفە دڵ دەکەن مایل لە دەست نەفس و هەوا چیبکەم

ئەسیرەی نەفس و شەیطانم، غەریقی بەحری عیصانم
بەبێ کەشتی شەفاعەت و نەجاتی مصطفی چبکەم

عەمەل مادەر پدەر إحسان، قەبر گەهوارە تەقوا شیر
بەبێ ئەعمال و إحسان و بەبێ تەقوا خودا چبکەم

لە نێو تۆماری ئەعمالم، بە غەیری شەر نیە خەیرێ
منی بێ زاد و بێ تۆشە لە ڕێی بێ ئینتها چبکەم

دەمی قامی قیامەت گەر خەلایق دێنە سەر میزان
منی مەخجول و شەرمەندە خودا ڕۆژی جەزا چبکەم

بەبێ سەنگی محەك وەرناگرن نەقدی عەمەلە سبحەی
کە من خاڵی لە ئیخلاصم لەگەڵ تۆشەی ریا چبکەم

لەسەر پردی صراط مەردی خودا دێن و دەچن وەك بەرق
ئەمن ئەو ڕۆژە داماوم خودا بێ دەست و پا چبکەم

لە ڕۆژێکا کە دەستێنن جەزای گەنجی عەمەل جەننەت
بەبێ هیچ مایەو و نەقدێ، ئەمن لەو ڕۆژەدا چبکەم

دڵم بۆ فەیضی مەردێکی خدا زۆر طالیبە چونکە
لە خۆوە خونچە ناپشکوێ، بەبێ بادی صەبا چبکەم

ئەڵێی سەر هەڵگرم ڕۆژێ بڕۆم تەنیا بە دنیادا
هەتا ئەمرم بڵێم بۆ خۆم چبکەم خوا چبکەم

لە تاری زوڵمەتی نەفسا شفیق ئێستە بە داماوی
ئەڵێ هەردەم بەبێ شەمسی وجودی شای ضیا چبکەم

٧- یەکێ تر لە ریزی رێز لێ گیراوی عولەمای زەمان حەزرەتی فەخری زەمین و زەمان خوا لێ خۆشبوو سید حەسەنی چۆرە کە مامۆستای خوا لێ خۆشبوو ملا عبدالرحمنی پێنجوێن بوە، یەکێکە لە زانا زۆر بە ناوبانگەکانی کوردستان ئەم زاتە لە سەرەتای مەلایەتی و تەدریسەوە تا وەفات کردنی لە خزمەتی شەریعەتی ئیسلام درێغی نەبووە.

حاجی ملا حمە أمین کانی سانانی باسی وەفاتی کرد و ووتی: لە کاتی وەفاتیا ئەمر ئەفەرموێ بە ئاغا حوسەینی کوڕی کە یەکێ بوە لە پیاوە بەڕێزەکانی ئەو کاتە کەسانی خۆی کە حازر ئەبن ئەفەرموێ شێخ حبیب بانگ بکەن با پێ بخاتە سەر دڵم شایەد زوو بە ئاسانی گیانم دەربچێ.

وە ئەو (شێخ حبیب)ە کوڕی حاجی شێخ ئەحمەدی برای حەزرەتی شێخ عمری ضیاء الدین (قدّس سرّه)ی بیارە ئەبێ، لەو کاتا فەقێ ئەبێ لەوێ لە لای ئەو ئەخوێنێ کوڕەکانی عەرزی ئەکەن قوربان بۆچی وا ئەفەرموی تۆ عالمێ زۆر گەورە و سیّد و خزمەتێ زۆرت بە شەریعەت کردوە شێخ حبیبت بۆچی‌یە؟

ئەفەرموێ ئێوە چوزانن خۆ من مەبەستم خۆی نیە، بەلام لەگەڵ پێی ئەو پێی شێخ عمر حازر ئەبێ وە لەگەڵ پێی شێخ عمر پێی رسول الله حازر ئەبێ گەورە پیاوان لە عولەمای ئیسلامدا ئاوابوون.

# له كه‌راماتی شێخی پڕ هونه‌ر پیری هه‌ورامان

# مه‌ولانا عومه‌ر

المتواضع للفقراء مروّج الشريعة الشريفة الغرّاء مجّدد الطريقة المنيفة البيضاء نائب حضرة سيّد البشر فاروقيّ المناقب والسّير أبي عبدالله سيّدنا ومولانا حضرة الشيخ عمر الملّقب بضياء الدين.

چه‌ند شاده مرۆڤ پێنووس خاته‌كار
بۆ یاد داشتی دۆستانی نازدار
منی غولام و به‌نده و خزمه‌تكار
له ده‌ركی یه‌كه‌م شابازی رۆژگار
هه‌ژده‌ی ره‌مه‌زان دووشه‌ممه‌ی سه‌ركار
به فه‌رمانی دۆست خامه‌م كه‌وته كار
به محضی لطف و كه‌ره‌مت خوا جوان
خۆشبه له گشتمان تو ناز شا عوسمان

١٤٠١ هـ - ١٩٨١م



## پێشەکی [1]:

الحمدُ لله ربّ العالمين وصلّى الله على أشرف الورى خاتم الأنبياء محمد وآله أصحابه الأتقياء إلى يوم الحشر المعاد.

سوپاس و ستایشی بێ پایان هەر بۆ خوای پەروەردگاری عالەم، درووود بۆ رۆحی پاکی حەزرەتی سەرداری عالەم محمد المصطفی ﷺ.

بزانین چ بۆ روون بوونەوەی دڵ و دەروون، وە چ بۆ دامەزراندنی بیروباوەڕ بە ئاینی بەرزی ئیسلام تەماشاکرنی کەرامات و موناقەباتی ئەولیا و دۆستانی خوا یان گوێ لێ گرتنی سوود و کەڵکی زۆر زۆرە، چونکە ئەو کەراماتانە بەشێکن لە موعجیزەی حەزرەتی رسول الله ﷺ دیارە ئەو کەسەی خوا ئەو فەرمانەی لەسەر دەستا ئاشکرا ئەکا بە هۆی إتّباع و پەیڕەوییە لە شەریعەت و سنەت و خوڕەووشت و ئادابەکانی پێغەمبەر، وە دەرخستنی ئەو ئیشە گەورەیە گەورەیی پێغەمبەری موبارەك ﷺ دەرئەخات، چونکە یەکێکە لە موسڵمانانی ئوممەتی ئەو پێغەمبەرە نازدارە.

و خوای پەروەردگار بۆ سوود و کەڵکی ئەو جۆرە پیاوە بەرزانە لەسەر زەوی دیار ئەخا تا خەڵك بروایان زۆرتر بێ بە ئاینی بەرزی ئیسلام، وە بێ بڕواش بڕوا پەیدا بکات و رێگەی راست بگرێتە بەر.

وە لە باس و یادی دۆستانی خواوە چ لە موناقەباتیان وە چ لە کەرەماتیان زۆر زۆرە بە زمانی (عەرەبی فارسی تورکی هیندی) بەڵام بە زمانی کوردی شیرین و پڕ لەزەت زۆر کەمە، ئەوا ئێمەش بە کۆمەکی خوا و هیممەتی دۆستانی دەستمان دایە ئەم کارە بۆ گۆڕینی بەشێ لەو کەراماتانە لە زمانی فارسی‌یەوە بۆ سەر زمانی کوردی،

(١) ئەم پێشەکی‌یە سەرەتای نووسینی(دانەر)ە لە کاتی وەرگێڕانی ئەم پەرتووکەدا کە سەربەخۆ وەری گێڕابوو.

تا خوێنەرانی کورد زمان بەهرەی لێ وەرگرن و ئەمانەش کەرامەتەکانی جەنابی قطبی زەمان حەزرەتی شێخ عومەری ضیاء الدینکوڕی حەزرەتی شێخ عوسمانی سراج الدینی تەوێڵەیە (قدّس الله سرّهما العزیز) کەماڵی پیرۆزی وا لە بیارەی شریف لە هەورامانی عێراق و نزیکە لە خۆمان چ بە نیشتمان و چ بە زەمان و چ بە زمان، وە لە کاتی خۆیا لە ساڵی ١٣١٥ هیجری یانی سێ ساڵ پێش لە دنیا دەرچوونی و کۆچی دوایی پایە بەرز جەنابی حەزرەتی شێخ عومەری ضیاء مامۆستا مەلا یوسفی مەجمەر کۆی کردۆتەوە، پاش تەواوکردنی جەنابی حەزرەتی پیر خۆی مطالعەی فەرموە وە لە چەن جێگەدا بە خطی پیرۆزی خۆی، ناتەواوییەکانی تەواو کردوە، وە دانەر لە ژێریا نووسیویە ئەم ڕاست کردنەوەیە دەست خەتی موبارەکی حەزرەتی شێخ عومەر خۆیەتی.

وە ئێستە ئەم پەڕاوە بە فارسی لە ژێر ناوی المناقب الضیائیة لامان هەیە، داواکارین لە خوێندەواران و ڕۆشنبیرانی کورد زمان کە چاوێ بەم پەڕاوەماندا بخشێنن تا لە سوود و کەڵکی هەموو لامان بەهرەوەر ببین، وە ئێمەش لە نزای خێر و چاکەیان بێ بەش نەفەرموون(١).

حاجی مەلا أحمدی قاضی

چوارشەممە ١ ی رمضان ١٣٩١ هجری

پێشنوێژی خوێنی مزگەوتی نقیب

کوردستان - سلێمانی

---

(١) پشت بە خوا لەو شوێنانەدا ئاگادارتان ئەکەین.

ئەمجا نۆبەی ئەوەیە بێینە سەر باسی کەراماتی قطبی جیهان غەوثی زەمان نائبی سیّد المرسلین پیری ئەنوەر شێخی أکبر حەزرەتی شێخ عمر ضیاء الدین خوا لێ خۆشنود بێ.

ئەم زاتە پیرۆزە، ئەم دەستگیرە دڵسۆزە هەڵکەوتووی بەینی ئەولیا بوو، زۆر لە شێوە و هەیئەتا لە خوڵق و خوو هەیبەتا چۆتەوە سەر پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ باڵای موبارەکی نە کورت و نە درێژ بووە، سنگی پیرۆزی بەرین بووە، مووی رەش، چاوی گەورە و رەش و گەش، سەری پیرۆزی مەیل بە گەورەیی بووە تەوێڵی موبارەکی واسیع و کراوە بووە، برۆی هیلالی تا کاتی وەفات هەر بە شێوەی خۆی ماوەتەوە وە مووی برۆکانی رێك و پێکو کەوانەیی تێك نەچوو بوە و تاکو جووت نەوەستاوە.

دەمی پیرۆزی لەو پەڕی حوسن وجوانی واسیع و گوشاد بووە، رومەتی موبارەکی سور و سپی ریشی نە باریك نە درێژ و پان جمگەی ئەستور بازوی شێرانە سپی و مووی رەش بەسەرا بڵاوبوبوە وە هەروەها خەتێکی باریك لە مو و لە ژووری سینەیەوە تا سەر ناوکی موبارکی درێژ بۆتەوە، هەروەکو حەزرەتی رەسول بەم شێوە و رەنگە موصوف بوە.

هەروەها ملا محمودی باکی ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: جەنابی شێخ عبدالرحیمی مدّرسی بیاوێڵە ئەفەرموێ: لە خزمەت حەزرەتی پیرا سیرەتی حەزرەتی رسول الله ﷺ مان ئەخوێندەوە تا گەیشتینە ئەوە کە ژێر باخەڵی حەزرەت رەنگی لەگەڵ رەنگی باقی لەشی پیرۆزیا یەکسان بووە، لە رەنگا لەیەك چووە، نەك وەك هەندێ کە ژێر باخەڵیان یا زبری یا رەنگی بەباری رەشی یا جۆرە رەنگێکی تر جیاوازی بوو بێ، لەو کاتەدا حەزرەتی شێخ عمر قدّس سرّە قۆڵی پیرۆزی لادا و فەرمووی تەماشای ژێرباڵم بکەن کاتێ سەیرمان کرد پێستی ژێر باڵی هیچ لەگەڵ باقی لەشیا رەنگی جیاوازی نەبوو.

لووتی پیرۆزی کەمێ بەرزی تێدا بووە، هەم ماوەی تەمەن و ژیانی پیرۆزی وەك پێغەمبەر ﷺ ٦٣ ساڵ بوو[١]، وە ساڵی لە دنیا دەرچوون و وەفاتی ١٣١٨ کە بە پیتی ئەبجەدی ئەکاتە نائب پێغەمبەر[٢].

بـەیانی جـوانی خـوڵقی شـا عومـەر
هـەروا بـە ئاسـان نایەتـە دەفتـەر
رووخـۆش و بەشـوش رووبـەڕووی گشـت
بـۆ داد و هـاوار خێـرا و فـەریاد رەس
لـە رووی کـەرەمیا وەشـتی بـەهاری[٣]
ئەهاتـە خـوارێ بـە شـەرمەزاری

وەك لە کتێبی (نور الناظرين)دا نوسراوە ئەم زاتە ئەوەنـدە شێوەی سەخاوەت و کەرەمی پیشـان داوە دنیا پەرستان و کۆتـا بینـان بـە موسـریفیان ئەدایـە قەڵـەم بـەڵام هـەڵگری نیشانـەی پڕ لـە شـەرەفی السّخاء خلق الله الأعظم بـوو وە بـە جـۆرێ بـە مفادی الفقر فخري فەقری بۆ خـۆی هـەڵ بـژارد بـوو، جارجـار چـەن رۆژ لـە مـاڵی خۆیا نان دەس نەئەکەوت بۆ نموونە: جارێ کوڕێکی بێچوە شێری خـۆی محمـد أنـور منداڵ بوە ناوی نانی لە بیر چـوو بـوەوە[٤]، ژنێ بـە بـەردەمی ماڵەکـەیانا تێ پـەڕ ببـوو، منداڵێکی بە باوەشەوە بووە نانی بـە دەسـەوە بـوە ئەفـەرموێ لـەوە ئـەخۆم بـەدەس ئـەو منداڵەوەیە وە لە بیری نامێنێ بڵێ نان ئەخۆم[٥].

---

(١) هەروەها پێغەمبەری موبارەك ﷺ تەمەنی ٦٣ ساڵ بوە.

(٢) ئەم وشە (نائب پێغامبر) فارسی‌یە بە کوردی یانی جێ نشین پێغەمبەر ﷺ.

(٣) وەشتی بەهاری: یانی بارانی پڕ لێزمە و بە خوڕی بەهار.

(٤) لەبەر کەمی و نەبوون و بەرچاو نەکەوتنی.

(٥) لێرەدا بە شرینی ئەزانم کە چەند چیرۆکێکی دڵ فراوانی و سـەخاوەت کە لـە إحيـاء العلومی ئیمـامی غەزالی‌دا هەیە (خوا پایە بەرزتری بفەرموێ) لـە لاپـەڕەکانی ٣٠٧، ٣٠٩، ٣١٠ بـەرگی سێ کـە بـاسی بکەم:

له هەمووی گرنگتر و عەجایەبتر، لەو خانەقای بیارەی پیرۆزەدا نزیکەی ٢٠٠ دوو سەد کەس هەندیٚ جار زیاتریش لەساڵیٚکا لە سالیك و میوانان حازربوون وە هەروەها ١٢٠[1] سەدو بیست قوتابی ئاینی لە مەدرەسەی بیارەدا بووە، نە بۆ ماڵەوە و نە بۆ ئەوان ماوەی دوو سیٚ رۆژ هیچ خواردەمەنی دەس نەکەوتوە، وا بووە ٣ سیٚ رۆژ تێ پەریوە، وەخت وەخت ئەگەر بوویٚ مشتیٚ توو یا پیٚنج دانە خورما رۆژی جاریٚ یا دوو رۆژ جاریٚ دەس کەوتووە.

---

یەکەم: محمدی کوڕی منکدر لە (أمّ درّە) وە ئەگێڕیٚتەوە کە ئافرەتیٚ بووە خزمەتی حەزرەتی عائیشەی حەرەمی موبارەکی پیٚغەمبەری ﷺ کردوە ئەفەرمویٚ: لە کاتیٚکا حەزرەتی مەعاویە لەسەر حوکم بوو ١٨٠٠٠٠ سەد و هەشتا هەزار درهەمی لە دوو کیسەدا نارد بۆ خزمەت حەزرەتی عائیشە ﵂، ئەو حەزرەتە داوای سینیەکی کرد و پارەکەی لەسەر هەڵ رشت و دەستی کرد بە دابەش کردنی بەسەر موسڵماناندا کە ئیٚوارە هات فەرمووی ئیفطار حازر بکە غەیری نان و رۆن زەیت نەبیٚ هیچی تر نەبوو أمّ درّە رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ عەرزی کرد ئەو هەموو پارەت دابەش کرد نەت توانی یەك درهەم بهیٚڵیتەوە خۆشمان بمان دایە بە گۆشت، فەرمووی: فیکرم نەبوو فیکرت بخستمایەتەوە ئەم کری.

دووەم: ئیمام ئەفەرمویٚ أبو الحسنی مەدائینی ئەگێڕیتەوە حەزرەتی حسن وە حەزرەتی حسین و عبداللەی کوڕی جعفر چوون بۆ حەج لە ڕیٚگەدا شتومەکی سەفەرەکەیان فەوتا بە حاڵی تونیەتی و برسیەتی چون بەسەر ماڵیٚکی تەنیای چادر نشینا تەنیا ئافرەتەکە لە ماڵ بو داوای ئاویان کرد شەکە مەریٚکی بەستبووەوە، وتی شیرەکەی بدۆشن بیخۆنەوە شیرەکەیان خواردەوە بە کورتی حەیوانەکەشی بۆ سەر بڕین و خواردیان ووتیان ئیٚمە قورەیشین وە ماڵمان لە مەدینەیە، لە پاش چەن ماوەیە حەزرەتی حەسەن لەبەردەمی ماڵی خۆیاندا دەبیٚ ژنیٚ ئەبینیٚ مەشغوڵە بە پشکەڵەوە، بانگی دەکا دەڵیٚ تۆ ئەوە نیت لە فلان کاتا هاتینە ماڵتان عەرزی ئەکات بەڵیٚ ئەوم ژنەکە ئەم ناناسیٚ بەلام حەزرەتی حسن ئەو دەناسیٚتەوە ١٠٠٠ دینار و مەبلەغیٚ زۆر مەڕی بۆ ئەکریٚ ئەفەرموی بچۆ بۆ لای حسینی برام ئەینیٚریٚ ئەویش ئەوەندەی دەداتیٚ ئەویش ئەینیٚریٚ بۆ لای عبداللەی کوڕی جعفر ئەپرسیٚ حسن و حسین چەندیان داویتیٚ ئەویش ئەڵیٚ ٢٠٠٠ دینار ئەوەندە سەر مەڕە ئەویش بە ئەندازەی هەردووانیان دەداتیٚ ئەڵیٚ لە پیٚشەوە بۆ لای من بهاتیتایە ئەوانم ماندو دەکرد: عبداللەی کوڕی جعفر ئامۆزایان بوو، جەعفەری طیار برای حەزرەتی علی بو ﵁.

(١) ئەم رەقەم و رەنوسە بەرەو ژوور بۆتەوە لەودوا تا گەیشتۆتە ١٥٠ و بەرەو ژوو.

لەگەڵ ئەمەش هیچ کەس هاواری برسییەتی نەکردوە، وە هەریەك لە سالیك یا طەلەبە سەرگەرمی ئیشی خۆی بووە.

وە لە فصاحەت و زمان رەوانیدا وەها بووە، هەرچەند هەندیٚ لە زانست و زانیاری نحو و صرف خوێندبوو، کە ئەهاتە باسی عیلم ومەعریفەت و دانانی هەڵبەستی عەرەبی هەست و ژیری زۆر کەس لە شەرح و بەیاناتی سەرسام و متحیّر ئەمان، وەك بوێژیٚ لە ستایشی ئەم زاتەدا ئەڵیٚ:

ما كان منه لكسب العلمِ منْ تعب وكان ترجمة الآيات والسورِ[1].

وە لەگەڵ هەر کەسا فەرمایشتی بفەرموایە بە گوێرەی (گفتوگۆ بکە لەگەڵ خەڵکا بە گوێرەی ژیری ئەوان[2] نەك بە گوێرەی ژیری و زانستی و شارەزایی خۆتان) بوە دیسان بە گوێرەی (ریٚز لە خەڵکی بگرە بە قەدەر پلە و پایەیان کە پێویستە ریٚز بگیریٚ وەها ریٚزی لە خەڵکی گرتووە، دڵی هەموو جۆرە کەسێکی بە نەچیر گرتوە، بە تایبەتی لە ریٚز لیٚ گرتنی سیّد و فقیر و هەتیو و عولەمای گەورە بەو پەڕی إکرام و إحترامی گەیاندوە، کاتی وابوو خەڵکی زۆر ئەبوون بە میوانی لە پیاوانی دەوڵەمەند و ساماندار گەورە، وە بە پیوە وەستاون بە گوێرەی خۆیان ریٚزیان لیٚ گیراوە بەلاٚم زۆر گوێی پیٚ نەداون وەك ئەوەی کە لە پڕ سیّدێکی روت و قوت بهاتایە هەڵ ئەسا ئەچوو بە پیریەوە وە بە ریٚزێکی بیٚ سنوور لەگەڵیا ئەجوولایەوە و ووتو وێژی لەگەڵ ئەکرد، وە بەیانی إشتیاقی بۆ إظهار ئەفەرموو، زۆر کات لەگەڵ پیاوی فەقیر و بیٚ پوول و پارەی چڵکن و کوڵکن نانی ئەخوارد لە یەك قاپا، وە لەسەر زەوی دائەنیشت شتی لەگەڵ ئەخواردن.

---

(١) عەرەبییەکەی: كلّم الناس على قدر عقولهم لا على قدر عقلوكم.

(٢) عەرەبییەکەی: أكرم الناس على قدر منازلهم.

کات کات کە خوا دەرووی ئەکردەوە، دەسکەوت پەیدا ئەبوو لە کاتی قوربانیدا ٦٣ شەست و سێ سەر ماڵاتی ئەکرد بە قوربانی و دابەشی ئەکرد بەسەر هەژار و داماو هەتیو و بێ نەوایاندا.،

کە فەقێیەك إجازەی عیلمی وەربگرتایە ئەینارد پۆشاکی بۆ ئەکرد، شەکراوی بۆ ئەخواردەوە، قوتابخانەیەکی ئیسلامی دروست کردبوو علامەی زەمان جەنابی مەلا سید عبدالقادری گەورەی[1] کردبوو بە مدّرس لە بیارەی شەریف[2] کە لە هەموو زانیاری و زانستەکاندا بێ هاوتا بوە ١٢٠ – ١٥٠ سەد و بیست تا سەد و پەنجا قوتابی بوە، بە کورتی باسی گەورەیی و شیرینی رەووشت و خۆی بەرزی و کرداری پڕ کەڵك و سوودی ئەم زاتە پایە بەرزە بە کتێبێکی سەربەخۆ کۆتایی نایێ.

جارێ ئەوانەی کە سالیك ئەبن عەرزی ئەکەن قوربان مەشغوڵیمان بۆ ناکرێ بۆ زیکر و فیکر لەبەر قال و قیل ی فەقێکان، حەزرەتی شا عومەر ئەفەرموێ: دوو کوڕم هەیە بە کاری موسڵمانان بێن علا الدین و نجم الدین یەکێکیان ئەکەم بە قوربانی قال ئەوی تریان بە قوربانی قیل زۆر کات بوە کە خەبەری زانی بێت کۆمەڵێ فەقێ دێن بۆ بیارە وە یا بۆ ئەو جێگەیە کە جەنابی ئەوی لێیە سەری رووت کردووە

---

(١) جەنابی مەلا سید عبدالقادری مدرس: بە مدرسی گەورە مشهور بوە کە لە مەودوا باسی دێتە پێشەوە، وە حەزرەتی ضیا لەبەر گەورەیی و رێز و پلە و پایەی زانیاری کچی خۆی خەلات کردوە، وە سێ کوڕی لەو حەرەمەی خوا پێ خەلات کردوە.

(٢) شەریف: خاوەن شەرەف دێی بیارە بە شەریف ناوبراوە هەوەڵ لەبەر ئەوە محاسن و شەرەفداری پێغەمبەر ﷺ یانی (مووی) پیرۆزی ریشی موبارەکی رسول الله لەوێیە، دووەم لەبەر ئەوە جێگەی ئەو گەورە گەورانە بوە سێهەم وەك لە سەرەوە بەیان کراوە زۆر وەخت نزیکەی ١٥٠ و زیاتریش طەلەبەی علومێ دینی دەرسیان لەوێ بوە تەحصیلی علومی ئاینیان کردوە جارێ لە مەدینەی منوّرەوە کاغەزێ دێت بۆ حەزرەتی شێخ علا الدین خودا دەرەجاتی عالی بکات لە پشتی پاکەتی کاغەزەکەوە بەم (عنوانە) نوسرابو من مدینة المنورة إلى بیارة الشریفة خێرا حەزرەتی شێخ علا الدین سەجدەی شوکرانە ئەبات کە بیارە بەشەرەف لە بەرامبەر مەدینەی پێغەمبەرەوە ﷺ دیاری کراوە.

چوه به پیریانەوه لەگەڵ ئەوەش پێلاوی لە پێ نەکردوه یانی بە پێخاوسی إستقبالی لێ کردون لەبەر خاتری عیلم و شەریعەت خوا تۆڵەی بە خێری بداتەوە.

جەنابی ملا محمد سعیدی مازی بنی فەرموی لە کاتێکا لە خزمەت حەزرەتی شێخ عوسمان سراج الدین‌دا کە لە دێی بیارە نیشتەجێ بوو سلوکمان دەکرد لەگەڵ چەن رەفیقێکی تر لە مزگەوتی دێی ناوبراو، رۆژێ حەزرەتی شێخ عمر کە کوڕی خاوەن روشدی حەزرەتی شێخ عوسمان بوو، وە لە هەوەڵی گەنجی دابوو لە لای من دەرسی دەخوێند، نوستبو لە خەو خەبەری بوەوە إحتلام بو بو منیش لە خزمەتیدا چوم بۆ حەوزی کاموسا بۆ ئەوەی لەوێ غوسڵ بکات، کە گەیشتینە (باخی حمە کریمی کوڕی شێخ رشید) کە ئێستە بوە بە خەنەقا و مەدرەسە، راوەستا تا ماوەیە منیش وتم عەجەلە بکە کەی کاتی راوەستانە: فەرموی الآن خەبەریان دامێ کە ئەم جێگە دەبێ بە خانەقا و مەدرەسەی تۆ، وە هەمو ئەسباب و کەرەسەی لە خۆیدا هەیە، منیش لەو پەڕ هەمو سەرسوڕمانێکەوە عەرزم کرد حەزرەتی عمری فاروق ﷺ شەیتانی گرت لە ژێر کۆڵەکەی مزگەوتدا حەبسی کردوە تۆ تا ئێستا شەیتان لە ژێر رانتا بوە لەگەڵ ئەوەش کەراماتی ئاوا نیشان ئەدەی، دوایی حەزرەتی شێخی بهاء الدین و شێخ عبدالرحمن بەم مەوزوعەیان زانی بانگیان کردم بۆم گێڕانەوە بە جۆرێ پێکەنین زۆری بۆ هێنان حەزرەتی سراج الدینی باوکیان قدّس سرّه کە لە دیوێ تر بو گوێی لە پێکەنینەکەیان بو هۆی ئەو پێکەنینەی پرسی لەبەر ئەدەب ئەوان حواڵەی ئەم زەبونەیان کرد منیش چۆنیەتیەکەیم عەرزکرد زۆر مەسرور بوو وە فەرمووی راستی کردوە من (غیبطە) خۆزگە بە عومەر ئەبەم چونکە لە زەمانی خوێدا رەواجێ گەورە بە شەریعەت ئەدات: ئینجا تا سێ رۆژ دەی نارد بە دواما دەچوومە خزمەتی پێی دەگێڕامەوە، دوبارە عەینی شتی ئەفەرمو: (واقیعاً) هەروا بوو لە پاش چەن ماوە حەزرەتی شێخ عمر بە ئەمری حەزرەتی علی و ئیمامی غەزالی کۆچی کرد لە تەوێڵەوە بۆ بیارە لەوێ نیشتەجێ بو ئەو باخچەیەی کڕی وە چی ویست لە بەرد و دار و

ئەسبابی بینا لە ئەصلی ئەو جێگەدا موجود بو وە هیچ إحتیاجیان نەکەوتە هیچ لایەکی تر، وە لەو جێگەدا (دو بەرد) بینرایەوە یەکێکیان لێی نوسرابوو (جای پیران) وە خەتەکە هەر رەگێ سپی بو لە أصلی بەردەکەدا وە ئەو بەردە خرایە دیواری میحرابی خانقا دوەم بە خەتێ کە هەموو کەس ئەیخوێندەوە بەلام وەك (لە مۆر) هەڵکنرا بێ نوسرابو عمر ئەویش هەروەك ئەوی تر لە أصلی بەردەکە خۆی خیلقی بو بەلاّم ئەو لە لای بەردە نوێژەکانا دامەزرا، کاتێ حەزرەتی شێخ عمر وەفاتی کرد ئەو بەردە نەما.

# بەشی یەکەم

کەراماتی[1] حەزرەتی شێخ عمری ضیاء الدین خوا لێی خۆشنوود بێ کە لە لایەن زانایانی خاوەن پایە و پیاوانی راست و دروستی هاوچەرخییەوە بە چاوی سەر دیویانە و بە چاوی دڵ بڕیاری پایە بەرزی و گەورەیی‌یان داوە بۆیە خراوەتە سەر کاغەز هەتاوەکوو بەرزی پایە و بزورگی ئەم زاتە پیرۆزە دیار و ئاشکرا بێ بۆ هەمووان.

لە جەنابی زانای پایە بڵند و عالمی یەکتای زەمان و شارەزا بە هەموو جۆرەکانی زانست[2] ئاگادار لە هەموو مەسائیلی فقیهی[3] جەنابی بەڕێز مەولانا عبدالقادری

---

(١) کەرامات: بەشێکە لە خرق العادە یانی بەشێکە لەم شەش بەشەی لای خوارەوە:

١-إرهاص: بنچینە و بناغەیە بۆ هەر یەکێ لە پێغەمبەران پێش بوونیان بە پێغەمبەر وەکوو ئەو سێبەرەی لە سەفەردا ئەکەوتە سەر پێغەمبەر لە منالێدا.

٢- موعجیزە: بۆ پێغەمبەرانە لە دوای بوونیان، وە گەیشتنیان بەم پلەی خوایی‌یە، وەکوو معجیزەی میعراج و شەوڕەوی پێغەمبەر ﷺ.

٣- کەرامەت: لە ئیکرامەوە هاتوە کە مانای رێزگرتنە بۆ بەندەی خۆشەویست و رێز گیراوانێ کە ئەم کتێبە بە نرخە باسی ئەکات.

٤- معونەت: بە یارمەتی و کۆمەکی یەکێك لە ئەولیا و پیاوچاکانەوە لە پیاوی باش دەرئەکەوێ.

٥- إستدراج: لە فاسق و بێ دین رووئەدات تا خوا زۆرتر رق و کینەی لەو هەڵ بستێ وەك خۆی ئەفەرموێ (سنستدرجهم من حیث لا یعلمون).

٦- إهانە: لە کافر رووئەدات تا خوا شەرمەزارتر و شەرمەندەتری بکا وەکوو موسەیلەمەی کذاب کە دۆعای کرد بۆ چاوی یەکێك بەڵام چاوەکەی تری کوێر بوو، بەڵام جادوو چاو بەستە بەکەل و پەل ئەکرێ.

(٢) جۆرەکانی زانست: وەکو علوی عەرەبی، منطق، فەلسەفە، ریاضیات بە هەموو جۆرەکانیەوە فلکیات، میقات، اداب، أصول، بەلاغە، وضع، عروض.

(٣) مەسائیلی فیقهی: ئەو پرسیارانەی کە ئەکرێ لە بارەی شەریعەتەوە، ئەم زاتە سەرچاوەیەك بووە بە تەنیا کە هەموو ئەو پرسیارانەی وەڵام داوەتەوە، جێی هانا بووە بۆ روون کردنەوەی ئەو پرسیارنەی کە پێویست بە روون کردنەوە و دەرخستن ئەکات.

کانی کەوەیی‌یە، کە ئەم زاتە بە کورتی علامەیەکی بێ هاوتا بوە، وە هەتاوەکو لە دنیا دەرچووە بە شێوەی مدرّسی لە بیارەی هەورامان نیشتەجێ بووە جا ئێستا بە کۆمەکی خوا و هیممەتی دۆستانەوە بەشی یەکەم لەم زانا خاوەن پایەوە هەندێ لەو رووداوانەتان پێشکەش ئەکەین کە هەریەکەی کەرامەتێکی زۆر گرنگە، کە بە چاوی خۆی لەو پیرەی چاو پێکەوتوە و دیویەتی بۆتان ئەگێڕینەوە، لە دوای ئەو لە پیاوە زانا و گەورەکانی هاوعەسری خۆی.

**ك ١٣٤:** جەنابی ملا عبدالقادری مدرسی بیارەی شەریف ئەفەرموێ:

کاتێ کە حەزرەتی شێخ عمر تەشریفی فەرمووە بۆ بیارە و لەوێ جێگیر بوو، قوتابخانەیەکی زۆر گەورەی دروست کرد، وە بڕیاری فەرموو کە مامۆستایەکی زۆر شارەزا و دانا بۆ رابەری و رێنومایی کردن و فێرکردنی قوتابی و ووتنەوەی زانیارەکانی شەریعەت و زانست لەو مەدرەسەیە دابنێ، لەو کاتەدا پیر[1] وا دێ بە بیریا کە بنێری بە شوێن بەندەدا وە لە بیارە دامبنێت، لەم بارەیەوە ئەچێ بۆ خزمەتی باوکی شیرینی کە (حەزرەتی شێخی سراج الدین)ە لە وەلامی ئەم داخوازی و پرس و رایەدا ئەفەرموێ چوومەتە خەوی ملا عبدالقادر و هەندێ گفتوگۆم لەگەڵ کردوە حەزرەتی ضیائیش ملا محمدی کەستانی[2] نارد بۆ لام و فەرموو بووی پێی بڵێ بەو ناونیشانە کە لە فلان شەوا بە خزمەت سراج الدینی باوکم گەیشتبووی بیر بکاتەوە و بزانێ ئەو گفتوگۆیە چییە؟

جەنابی مدّرس ئەفەرموێ کە بیرم کردەوە خەوەکە ئەوە بوو کە داوای ئیجازەم لێ کرد کە بچم بۆ کەرکوك لەوێ خەریکی تەدریس بم وە لەکاتی ئەو خەوەدا من لە

---

(١) پیر: زانا، دانا، پڕ هۆش هەست و بیر، مرۆڤی بە تەمەن گەورە بۆیە پێی ئەوترێ پیر چونکە بە بۆنەی مانەوەی زۆری‌یەوە لە دنیا و تێکەڵی و تەجروبەوە زانین و هۆشی زۆر بوە، بەڵام پیر بە لای تصوّفەوە یانی شێخی تەریقەت و دەستگیر.

(٢) کەستان: دێیەکە نزیکەی سەعات و چارەکێ لە قەڵادزەوە دوورە لە پارێزگای سلێمانی.

دێی بەردە سپی بووم، حەزرەتی سراج الدینیش فەرمووی، لە کوێ خۆندووتە هەر لەوێ دەرس بلێرەوە، عەرزم کرد لە کەرکوك خۆندوومە، بە توندی‌یەکەوە فەرمووی ئەو خوێندنەم مەبەست نیە کە ئەو توندی‌یەم دی هەر لەو خەوەدا عەرزم کرد هەرچی ئەفەرموی سەرم لە رێیایەتی، هەر لەو کاتەدا سێ سێوی[1] پێ بەخشیم وە هەتا حەزرەتی ضیاء ئەم خەبەرەی بۆ نەناردبووم لە مانای ئەم خەوە ئاگادار نەبووم، کە داوای چوونمی فەرموو بۆ بیارە وە بۆم دەرکەوت کە خەوەکەم راست بووە، وە مەرامی پێ ئەوە بوو کە لە بیارە تدریس بکەم چونکە زۆربەی زانستی‌یە بەرزەکانم لە خزمەت زانای گەورە و خاوەن پایە جەنابی حاجی ملا أحمدی مفتیدا بوو لە نۆدشە، کە دێیەکە نزیکی بیارەی شەریف بوو.

من کە خولامی خۆرم هەر ئەوە گشت دەنگو باسم
نە شەوم نە شەو پەرستم کە باسی خەو بناسم

لەسەر سەر فەرمانەکەیم بەجێ هێناو چووم لە بیارە دەستم کرد بە تدریس وە ئەو سێ سێوەش بریتی بوو لە سێ کوڕ کە خوای گەورە لە بیارە بەخشی کە ناویان (حسن، حسین، محمد طه)یە.

**ك ١٣٥:** جەنابی مدرس ئەفەرموێ پێش چوونم بۆ بیارەی شەریف:

جارێ جەنابی ملا محمدی کەستانەیی باسی کەراماتی حەزرەتی ضیاي هێنایە پێشەوە وە جەنابی ملا محمدی کوێرەکی[2] لەوێ حازر بوو، خۆشەویستی حەزرەتی شێخی چوە دڵەوە هەر بەو خۆشەویستی تەشریفی برد بۆ خزمەتی، منیش نامەیەکی خۆمم پیا نارد کاتێ کە گەڕایەوە دەنگ و باسم لێ پرسی فەرمووی: یەکەم شەو کە

---

(١) سێو: جەنابی ملا یوسفی مەجمەر ئەفەرموێ: من ئەو سێ کوڕەی جەنابی ملا قادری مدّرسم بینیبوو بە خزمەتیان گەیشتبووم.

(٢) کوێرەك: دێیەکە سەر بە قەزای دەربەندیخان، نزیکە لەوەوە لە پارێزگای سلێمانی.

به خزمەتی پیر گەیشتم توجّهێکی[1] لیٚ کردم خۆم وا بە گەورە دی وام زانی جیهان لە من پڕ بوە دووەم شەویش توجهێکی لیٚ کردم وەکو نەبووم لیٚ هات پاڕامەوە لە خزمەتیا کە طەریقەتی[2] باوکم دابدەن هەر چەن لە دنیا دەرچووە فەرمووی ئێستا تەعلیمم[3] کرد وە طەریقەتم دادا، وە نیشانەمان ئەوە بیٚ باوکت برینیٚ بەسەر سەریەوەیە، وە دوای ئەو فەرمایشتە باوکم بە خەوی دی عەرزم کرد مژدە بیٚ شێخێکی گەورە پەیدا بوە بۆچی ناچی بۆ خزمەتی بەشی خۆت فەر و بەرەکەت وەربگری؟؟ باوکم فەرمووی هەر لەو شەوەدا بەشداریم کرد و طەریقەتم وەرگرت کە تۆ بۆت داوا کردم.

ئەمجا ملا محمدی کوێرەك فەرمووی لە پاشا کە چوومەوە بۆ ماڵی خۆمان لە دایکم پرسی ئایا باوکم هیچ نیشانەیەك بەسەریەوە هەبوە؟ فەرمووی بەڵیٚ باوکت سەری شکا بوو، وە هەمیشە جێگای شکاوی‌یەکەی بەسەریەوە لەبەر چاودا دیار بوو.

---

(1) توجّە: مانای ووشەکە روو تیٚ کردنە، بەڵام لە لای نەقشبەندی‌یەکان و علیمی تصوّف لە رووکردن بۆ حاڵی مرید بە پێی ئەو ئاگاداری‌یە خۆیان کە ئەیزانن بۆ چاك کردنەوەی نەخۆشی دیار و نادیاریان بۆ لابردنی بەلاّ و کۆسپ و ناڕەحەتی، یان بۆ بەرزی و سەرکەوتن لە زانستیدا وە یا بۆ سەرخستنی لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەك یان بۆ دلّ پاکردنەوەی لە ژەنگی گوناهو بیٚ ئاگایی لە خوای گەورە.

(2) طریقەت: رێگەی راست و دروست بۆ مەنزلّگای خوا ناسین لەگەلّ چەك بە دەستێکی رێگە شارەزادا.

(3) تەعلیمم دا: تەریقەتم فێر کرد: یانی تمسّکی وەرگرت، وە ئەم مەبەستە یانی چوونە ناو طەریقەت وە دەست گرتن بە داوێنی تەریقەت بە کۆمەکی ئەو شێخە بۆ رزگار بوون و پارێزگاری کردن لە هەمو کۆسپێکی دنیا و قیامەت وە بەو هۆیەوە گەیشتن بە بەختیاری و کامەرانی هەردوو دنیا بەڵیٚ شێخی راست و دروست هەروەکو ئەتوانیٚ تەریقەت بدات بە زیندوو هەرواش ئەتوانیٚ لە عالەمی ئەرواحا بە هەر گیانیٚ کە خوا مەیل بفەرمویٚ ئەمان تەریقەتی بدەنیٚ، وەك لە مەکتوبی ئیمامی ربانی مجدی ئەلفی ثانی بەرگی () صحیفە ....... ئەمە هەیە.

له لوتفی خوا هەر چیم داواکرد — بە ئاواتی خۆم کامەرانیم برد
بۆ دین و دنیات ئەوەیە تەگبیر — کە دەستت بگا بە داوێنی پیر

**ك ١٣٦:** وە هەروەها جەنابی مدّرس ئەفەرموێ:

شەوێ لە شەوان دەرسمان نەبوو، لەناو کۆڕی فەقێکانا دانیشتبووم باسی حەزرەتی پیر هاتە پێشەوە، کوتو پڕ یەکێ لە مستعدەکان[1] ووتی لەم کاتەدا کە باسی حەزرەتی شێخ ئەکرا، دیوارەکە شەق بوو، پیرم دی بە لەش تەشریفی هاتە ژوورەوە بەلاّم زوو تەشریفی برد دوای نزیك بوونەوەی لە کۆمەڵەکەمان، چونکە کوڕێکی تیا بوو لێرە کە هێشتا مووی لێ نەهاتبوو:

خەم ئەمکوژێ ئەگەر نەیەی — گەر بێیشی گیان لە دەس ئەیەی
ئەبێ بە دەستی تۆ بچم — تەشریف بهێنی یا نەیەی

**ك ١٣٧:** دیسان جەنابی مدّرس ئەفەرموێ:

لە پاش چەن رۆژێ لەسەر داواکەی حەزرەتی شێخ کە بچم بۆ بیارە و تەدریس بکەم، بۆ پرس و را (مشاوەرە) چوم بۆ خزمەت مامۆستای گەورە جەنابی ملا أحمدی نۆدشی ناوبراو لە سنە، دوای ئەوەی باسەکەم عەرز کرد یەکەم جار فەرمووی داوای مەشایخ مزگێنیە بڕۆ خۆیشت بی بینە، یانی من هیچ ئامۆژگاریم بە چوون و نەچوون لێ وەرنەگرت، چونکە هەندێ نەخوێندەوار وایان تێ گەیاندبوو ئەگەر بچم بۆ ئەوێ عیلم و تەدریسم لە کیس ئەچێ، تا ئەندازەیەك سستی و کەمتەرخەمی کرد لە ئیشەکەما، منیش ساردی و پەشیمانی لە دڵی دام، بۆ رۆژی دووەم کە بە خزمەتی گەیشتمەوە فەرمووی: بە هۆی ئەوەی کە سستیم کرد لە چونتا بۆ بیارە ئەمشەو حەزرەتی ضیا وا بە سام تەشریفی هێنا نەمتوانی سۆلەکانم بکەمە پێم

(١) مستعید: بە فەقێیەك ئەووترێ کە نزیکی تەواوکردنی خوێندن بێ.

بۆ پێشوازی وە توجهێکی لێ کردم زۆر کاری تێ کردم، ئەبێ بڕۆی هەرچی خوا بیەوێ ئەبێ بێ.

مەدرەسە و زانست و جێی خۆشی و سروود
بۆ کەڕ و بۆ دڵ نەزان و چاوی نابینا چە سوود!!!

**ك ١٣٨**: دووبارە جەنابی مدرس ئەفەرموون:

جەنابی رەزا قولی بەگ گێڕایەوە ووتی: جەنابی ملا عبداللە پالانی[١] لە کاتێکا چوو بۆ پرسە وای فەرموو:

کاتێ کە کوڕە گەورەی حەزرەتی شێخی سراج الدین عبدالحکیم[٢] وەفات ئەفەرموێ، مەلا عبداللەی پالانی تەشریف ئەفەرموێ بۆ سەرخۆشی و پرسە لێ کردن لە پاش فاتیحە خۆندن روو ئەکاتە شێخی سراج الدین و ئەفەرموێ: کاکە عوسمان من بۆ پرسە نەهاتووم بەڵکو بۆ مژدە پێدانتان هاتووم، هیچ پەژارە مەبە تۆ ئەولادی نێرینەت زۆر ئەبێ یەکێ لەوانە محمدی ناو ئەبێ لە دوای جەنابت جێگەدار ئەبێ، وە زۆر بەناوبانگ و دەرکەوتوو ئەبێ، وە یەکێ تریان عمری ناو ئەبێ برای ئەو ئەبێ جێی من و تۆ ئەو ئەیگرێتەوە وە ناوبانگ و شۆرەتی پایە بەرزی و بزورگی ئەو هەموو جیهان ئەگرێتەوە وە قاپی فتوح[٣] لە هەموو لایەك ئەکاتەوە و تەمەنیشی زۆر ئەبێ[٤].

---

(١) ملا عبداللە پالانی: زانایەکی زۆر بەرز و پیاوێکی زۆر پایە بلند و ناودار بووە، وە پالان دێیەکە لەناوچەی هەڵەبجە ماوەیەك دوورە لێیەوە.

(٢) عبدالحکیم: وەکو زانراوە حەزرەتی شێخی سراج الدین حەوت کوڕی بووە، ئەم زاتە پیرۆزە یەکێکە لەوان.

(٣) فتوح: کرانەوی چاوی دڵ.

(٤) جەنابی مدرس ئەفەرموێ ئەوانەی ئەم باسەیان گێڕاوەتەوە زۆرن، بەلام چونکە رەزا قولی بەگ هەردەم هەم سایە و هاودەمی جەنابی ملا عبداللە بوە بۆیە لەوەوە گێڕامانەوە.

بــادە گێڕانی نەشــەی جــەم عومرتـــان هــەر کامــەران
ســەد لــە چــەرخی ئێــوە شــا، پڕمـەی نـەبو پـەرداخمان

**ك ١٣٩:** دیسان جەنابی مەلای گەورە ئەفەرموێ:

کـاتێ بـە ڕەفاقـەت و نزیکـی پـیری پڕ هونـەر مشرّف بـووم، وە بـە خزمـەت گـەیشتنی کامـەران بـووم ڕۆژێ لەگـەڵ فـەقێکان چـووین بـۆ عەبابـەیلێ بـۆ زیـارەتی حەزرەتی (إبا عبیـدەی أنصـاری)[1] خـوا لێـی خۆشـنوود بێ، لـەوێ لـە سـەر ئـادابی طـەریقەتی نەقشی کەمێ بە چاولێکنان خەریك بووم، دیم حەزرەتی پیر حازر بـوو، وە حەزرەتی ئەبوو عوبەیدە دەستی گـرتم و خسـتی‌یە ناودەسـتی حـەزرەتی شێخەوە، وە وای دەرخست کە فەرموی فەرمان لەدەست ئەوایە.

یاران لە ڕووتا وێنەی دیوارن بەو وێنەش هێشتا کەی وەك تۆ دیارن

**ك ١٤٠:** دووبارە ئەفەرموێ: جارێکی تر لە خزمەتیا چاومنا بە یەکا و ماوەیەك خەریك بووم، حەزرەتی سـەردار و فـەخری عالـەم ﷺ تەشـریفی حـازر بـوو، وە بـە چاوی دڵ بە دیداری شیرینی ڕۆشنا و بەهرەوەر بووم، دەسـتی گرتم و خسـتی‌یە نـاو دەسی حـەزرەتی ضـیاء الـدین (خـوا لێـی خۆشـنود بێ) وە مـن دەسـتی هـەر دوکیـانم ماچکرد و نامنە سەر چاوم، لە پاشا بۆ دڵنیـایی خـۆم (لیطمئنّ قلـبي) عـەرزم کـرد و لێم پرسی ئەوە کێ بوو منی بە جەنابتان سپارد، فـەرمووی ئـەو حـەزرەتی رسـول الله ﷺ بوو لە پاشا تمّسکو عەهد و پەیمانی تەریقەتی پێ تازە فەرموومەوە.

---

(١) أبا عبیدەی أنصاری: سەرۆکی سوپای ئەصـحابە کـە تەشریفیان بـەخێر هێنـاوە لەگـەڵ کۆمـەڵی لـە یـارانی پێغەمبـەر ﷺ لـە فـەرمانڕەوایی خەلیفـەی دووەم حـەزرەتی عمـری کـوڕی خـەتابدا (خـوا لێـان خۆشنوود بێ) و ئەڵێن حەزرەتی شێخ حسن قەرەچێوار (قدّس سرّە) فەرمویەتی لـەو دێـی عەبابەیلێیـە کـە لەسەر هەڵەبجەوەیە بیست دەقیقە دوورە لێی مەرقەدی ١٥ پانزەی لەیارانی ئەو حەزرەتە تێدا مدفونە.

**ك ١٤١:** هەروەها جارێکی تر فەرمووی:

جارێکیان دیم کە حەزرەتی شاهی نەقشبەند (قدس سره) دەستی منی گرت و خستیە دەستی حەزرەتی شێخەوە خوا پایەداری بکات دووبارە ئەفەرموێ:

جارێکی تر حەزرەتی شێخ عبداللە دهلی(قدس سره) هەر بەوجۆرە دەستی گرتم و خستیە ناو دەستی حەزرەتی شێخەوە.

دیسان ئەفەرموێ سەماحەتی مەلای گەورە مەولانا عبدالقادری مدّرسی بیارە:

جارێك حەزرەتی عەلی[1] کرّم الله وجهه منی بە دەستی حەزرەتی شێخ سپارد و فەرموی هۆشت پێوە بێ لە پاشا عەرزم کرد کێ لەم دانیشتنەمانا تەشریفی حازر بوو؟ شێخ فەرمووی حەزرەتی عەلی (کرّم الله وجهه) تۆی بە من سپارد.

بۆ دین و دنیا ئەوەیە تەگبیر     کە دەستت بگا بەداوێنی پیر

جارێکی تر ئەو زاتە فەرمووی:

جارێکیان حەزرەتی حسین (رەزای خوای لێ بێ) منی سپارد بە حەزرەتی شێخ، پرسیارم کرد ئەوە کێ بوو ئەمجارە منی دایە دەست جەنابتان، فەرمووی سەرداری شەهیدان حەزرەتی حسین (خوا لێ خۆشنوود بێ) تۆی دایە دەست من، وە چەند جارێ تر ئەم فەرمانەیان داوە بە سەرما.

**ك ١٤٢:** جەنابی ملای گەورە سیّد عبدالقادر جارێکیان فەرموی: لە خزمەت حەزرەتی جێگەداری سەرداری عالەم (د. خ) جەنابی حەزرەتی ضیاء الدین چووین بۆ

---

(١) حەزرەتی عەلی تۆی سپارد بە من، هۆشت پێوە بێ: لە باسکردن و گێرانەوەی ئەم جۆرە کەراماتانەی حەزرەتی ضیاء الدین پایە بەرزی و گەورەیی و صداقەت و راستی رێگەکە و تەواوی و کەمالی ئەو زاتە دەر ئەخات.

زیارەتی خۆشەویستی خوا خاوەن پایە وەیسی قەرەنی[1] (خوا لیٚ خۆشنوود بیٚ)، حەزرەتی وەیس رۆژەرێیەك پێشوازی لە غەوثی زەمان کرد وە کاتیٚ بە بارەگای گەیشتین لە بەرەکاتی[2] کامیاب بووین حەزرەتی شێخ فەرموی ئەم سووتاوی عەشق[3] و ئەوینە ئەم پەروانەی رسول الله یە ﷺ منی راسپارد کە بە جەنابتی بلّێم ئاخ لە حیجابی قرب و عتابی حبّ[4]، ئەمجار پیر رووی تیٚ کردمەوە و فەرمووی تا دوو جار نەیفەرموو پێم نەووتی:

گەر چی من دوورم، بەلاّم رێی هیممەتت نێزیکە خۆ

من خولاّمم پادشا هەم!!! من ستایش خوانی تۆ

**ك ١٤٣:** دیسان جەنابی مدرّس ئەفەرمویٚ:

سالیٚ حاجی حسینی گولّ عەنبەری چوو بۆ سەفەری حیجاز، رۆژیٚ خزمەکانی لە خزمەت پیرا هەوالّیان پرسی و خەبەریان داوا کرد، فەرمووی حەزرەتی شێخ: لە

(١) وەیسی قەرەنی: یانی وەیسی مایدەشت (خوا لیٚ خۆشنوود بیٚ) یەکێکە لەو زاتە عظیم الشأنانەی کە تابعین ن وە مەبەست لە فەرمایشتەکەی مەلا عبدالقادری مدرّس کە ئەفەرمویٚ چووین بۆ نەزەرگای حەزرەتی وەیس بۆ زیارەت و بە خزمەت گەیشتنی زۆر لوطفی فەرموو.

حەزرەتی وەیس و خۆشەویستانی خوا نەزەرگا یان مەرقەدیان لە هەر شوێن بۆ دیاری کراوە، لەهەر یەکیٚ لەو شوێنانە بە زیارەت کردن و سەر لیٚ دانیان تأثیرات وە بەرەکات و واردات بەدی ئەهێنیٚ و رۆح و گیانی ئەو زاتانە لەو کاتەدا لەو شوێنە تەشریفیان حازر ئەبیٚ.

(٢) بەرەکات: فەڕ و دلّ گوشادی، بەلاّم بە صۆفی دەرون پاکان و خواناسانی بە راستی ئەبیزیٚ ئەچەژریٚ بۆن ئەدات ئەبیستریٚ.

(٣) ئەوین: عیشق، وە پشت بە خوا لەمەودوا باسی عەشقی تصوّف و زۆربونی عیشق و جۆرەکانی سودەکەی دیاری ئەکەین.

(٤) ئاخ لەحیجابی قرب و عتابی حب: جەنابی مدرس زاوای حەزرەتی شا عمر بوە بەم بۆنەوە نزیك بوە لێی، وە نزیکی و خزمایەتی خۆی پەردەیە وە هەم خۆشەویستی حەزرەتی شێخی زۆر بوە، وە گلەیی محبت پەردەیەکی ترە وە هەردوکیان هۆیە و سەبەبە بۆ درەنگ گەیشتن بە مەنزلّ.

نزیکی بیری زەمزەم[1] پێی گەیشتم زۆر مەلول بوو، بە هۆی ئەوەی هەندێ پارەی وون کردوە، کاتێ حاجی حسین لە حەج گەڕایەوە هات بۆ زیارەتی حەزرەتی شێخ و پێی موبارەکی ماچ کرد، حەزرەتی شێخ رووی تێ کرد و فەرمووی حاجی حسین ئەم زیارەتەت بۆ خۆت نەکرد بەڵکو رایان سپاردبوویت !!! حاجی فەرمووی بەڵێ خەلیل پاشا کە یەکێکە لەسەر خەتمە و جێگەداری طەریقەی بەرزی نەقشبەندی وە لە حەرەمی کەعبەدا (خوا شەرەفی زیاتربکات) کۆڕی خەتم و موریدی هەیە منی راسپارد کە پێی موبارەکت ماچ بکەم.

ئینجا جەنابی مدرس ئەفەرموێ لە پاشان پاشا هات بۆ ژوورەکەی بەندە و لێم پرسی لە فلان کاتا حەزرەتی شێخ هەواڵی فەرموو کە هەندێ پارەت وون کردوە، فەرموی بەڵێ پارەکانم کردبوو بە دوو بەش بەشێکیانم لێ دزرا، دوای ئەوە کەهاتەوە خزمەت پیر حەزرەتی شێخ پرسیاری لە حاجی حسین کرد فەرمووی: پیاوێکی بالاّ بەرزی پۆشاك سپی لە شاری رووناکی بەرامبەر حوجرەی سەعادەت بوو ئایا چاوت پێی کەوت؟ عەرزی کرد بەڵێ دەستیم زیارەت کرد فەرموی ئەوە خەڵکی وولاّتی مەغریب بوو، وە ئەو پیاوە ئەهلی دڵ بوو.

لە پاشا حەزرەتی پیر فەرمووی: باشە سیّدێ لە مقامی إبراهیم دابوو مەنزڵگای هەر ئەوێ بوو چاوت پێی کەوت؟ عەرزی کرد بەڵێ هەموو جارێ دەستیم زیارەت ئەکرد حەزرەتی شێخ خوا پایەداری کا فەرمووی ئەمیان لەوی تریان بزورگ و پایە بەرزترە.

لە پاشا پیر فەرمووی: لە کێوی عەرەفاتدا تەنیا هەر تۆم چاو پێکەوت بۆچی وا تەنیا بووی؟ وە زۆر پەلەت بوو بۆ خۆشتن هۆی چی بوو؟ ووتی هاوڕێکانم منیان بە

---

(1) زەمزەم ئاوێکی پیرۆز و پڕ تام و سەرچاوەیەکی شیرینە لە نزیکی کەعبە وەك پێغەمبەری موبارەك لە مدحی‌دا ئەفەرموێ: (ماء زمزم لما شرب له) بە هەر نیەتێ بخورێتەوە خوا قبولی ئەکات، وە بە عەرەبی قف یانی بوەستە.

لای کەل و پەلەکانەوە دانابوو، خۆیان چوو بوون بۆ غوسڵ کردن، پەلەکردنەکەم بەهۆی دواکەوتنەوە بوو، شێخ فەرمووی ٦- ٧ شەش حەوت کەسێ لە کێوی عەرەفاتدا بەسەر شێوە دوکانێکەوە دانیشتبوون ئەوانت دی؟ عەرزی کرد بەڵێ: بەڵام یەکێکیان دانابوو نەی ئەهێشت کەس بچێتە نزیکیان لەبەر ئەوە لە زیارەتیان بێ بەش بووم.

کەمتر نیم لە بەرخ یا لە کارژەلە    هەمیشە منیش شوانم لەگەلە[1]

**ك ١٤٤:** دیسان جەنابی مدّرس ئەفەرمووێ:

کاتێ حاجی محمودی مەردۆخی کە بە محموە رەق بەناوبانگە.

لە سەفەری حەج گەڕایەوە بۆ زیارەتی حەزرەتی غەوثی زەمان حەزرەتی ضیاء الدین تەشریفی هێنا دوای زیارەت عەرزی کرد لەم سەفەرەدا هیچ لوتفێکت لەگەڵما نەبوو، وە نظرێکی[2] حەزرەتی پیرم نەدی لە چەند جێگە داوای کۆمەکی و ئیستمدادم[3] کرد مەدەدێکم نەبینی لەو وشترە کەوتمە خوارەوە دەستم شکا بەزەیی‌یەکم لە تۆ نەبینی!!! حەزرەتی شێخ فەرموی هەر چیت بەسەرا هات حەقی خۆتبوو الناس مجزیّون بأعمالهم یانی خەڵکی بەگوێرەی کردار و ڕەووشتی خۆیان پاداش و سزا وەرئەگرن.

---

(١) فارسی‌یەکەی ئەفەرموێ: کی کم از برّه کم از بزغا لەئم    کە بنا شد حارس ازد بنا لەئم

(٢) نظر: نەزەر یانی نیگاە تەماشاکردن، زۆر جار دەستگیر و شێخی طەریقەت بیەوێ بەرەکەتی خەڵات بفەرموێ بە حضوری مورید یا لە دوور وولات، گەر حازر بوو تیلەی چاوێکی بۆ ئەخا یان بە نیگاهێکی وە تەماشایەکی ئەفەرموێ پێی ئەڵێن نظر یان هەندێ جار لەگەڵ یەکێکی تر ووتو وێژ ئەفەرموێ یا بەفەرمانێکی کەوە مشغوڵ و خەریکە بەڵام لە نهێنیدا خەریکی لوطفە لەگەڵ ئەمیان، جا زۆر لە موریدان بەو لوطف و خەڵاتە ئەزانن وە بە ڕۆح و دڵ تام و لەزەتەکەی ئەنۆشن وە کەمێ لەوانە لێیان ئاشکار نیە.

(٣) استمداد: بە هانا هاتن و داوای یاری‌یە دان و یارمەتی کردن.

هـۆی کەوتنـە خـوارەوەت لـە ووشـترەکە ئـەوە بـوو ڕۆژێ لـەوە پـێش نوێـژی عەسرت چوو، ووتی ئیتر نوێژم نەچواند، فەرموی ڕۆژێکی تـر پێویستی خـۆ شـتنت کەوتـە سـەر زۆر هـەوڵت دا خـەیاڵت بـوو تـیمم[1] بکـەیت بـەڵام نوێـژی بـەیانیشت چوو، ووتی ئیتـر کـاری نـالایق و نـاجۆرم نـەکردوە، فـەرمووی لـە شـوێنی طـوافدا بۆچی دڵی فلان ژنت ئازاردا؟ ووتی چونکە دەزنوێژەکەی شکاندم فـەرمووی ژنێکـی تر منالێکی پێ بوو ئەی ئـەووت بـۆچی زویـر و دڵگیر کـرد وە شوشـەی دڵیـت بـۆچی شکاند؟ ووتی بەردی سروشتم وای ئەویست و تەبیعەتم وابو، فەرمووی لـە بیابـان و چۆڵوانی فاطمـە (ڕەزای خوای لێ بێ)دا کـاروانی حاجییـەکان بـۆچی ئەوەنـدە پەلـەیان بـوو؟ عـەرزی کـرد مەبەسـت هـەر ڕێگـە بڕین و زوو گەیینـە مـەنزڵ بـوو لـە پاشـا حەزرەتی شێخ فەرمووی: من لە خزمەت سەروەری عالەم دابووم ﷺ کۆمەڵێ حـاجی بە بەردەمی ئێمەدا تێ ئەپەڕی، ئێمە ئەوانمان ئەدی، ئەوان ئێمـەیان نەئـەدی و چـاویان لێمـان نـەبوو، لـەو کاتـەدا مـن تـۆم دی بێ پەشـتەماڵ بـە ڕووتی خـۆت ئەشـت کـە حەزرەتی شێخ ئەمەی فەرموو محمود مەردۆخ یەك هاواری کرد لەسەرخۆی چوو.

کابـــەی بـــەرینی گیـــانی مـــن جـــەماڵی رووی نیگارمـــە
بـــەردە رەشی پـــیرۆزی مـــن خاڵـــە لـــە لێـــوی یارمـــە
بێجگـــە لـــە ناڵـــە نـــاڵی دڵ دەنگـــی زەنگێکـــی تـــر نیـــە
لـــەو قافلـــەی کەســـەر قـــەتار دولبـــەری چـــاو خومارمـــە

**ك ١٤٥:** هەروەها جەنابی مدّرس ئەفەرموێ:

یـەکێ لـە وولاتی مـەغریب[2] لـە شـوێنی خـۆی خـەوێك ئـەبینێ، وە ئەکەوێتـە دوای، بەو بۆنەوە تەشریفی هێنایە ئارامگای حەزرەتی ضیاء الـدین خوا پایەی بڵند تر

---

(١) تیمم: لەبەر بێ ئاوی دەزنوێژ بە گڵ گرتن.

(٢) مەغریب: یەکێکە لە وولاتانی سەروو بـاکووری کیشـوەری ئەفـەریقا (تونس، جزائـر، مـەراکیش، مەغریب).

کات، لێم پرسی ووتم عبدالرحمن ناو له وولاتی ئێوەیە له کاتی خۆیا حەزرەتی شێخی سراج الدین(قدس سره) باسی ئەوی بۆ کردوین که پیاوێ گەورە و مبارەکە، ووتی کاتێ من هاتم مابوو بەلاَم ئێستا نازانم، له پاشا هەردوکمان چووین بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ باسی ئەو پیاوە موبارەکەمان هێنایە ناوەوە، شێخ فەرمووی له رەمەزانی رابردوداکۆچی دوایی کردوە و به رەحمەتی شاد بووە[1] عەرزمان کرد قوربان ئەیناسی؟ فەرمووی سێ جار دیوەمە، جارێ له مەکەی پایە بەرز و دوو جاریش له مەنزڵگای خۆی، وە باسی چۆنیەتی ژوورەکەی بۆ کردین، وە فەرموی دوو کوڕی هەیە شێوە و رەنگیان بەم چەشنەیە، وە بۆ بڕوای برای مەغریبی فەرموی له فلاَنە جێگە دێیەك هەیە کەم ئاوە خەڵکەکەی ئاو له بیر هەڵ ئەگۆزن، کابرای مەغریبی هەموو فەرمایشتەکانی حەزرەتی شێخی تصدیق کرد و دانی به راستیا نا، وە بەم کەراماتانە شادمان و دڵسوزی حەزرەتی شێخ بوو:

چەن خۆشە خوا پێکەنین بێ دەم
بە بێ هۆی دوو چاو بینینی عالەم
دانیشە و بڕۆ خۆشەبە تەنیا
بەبێ رەنجی پێ گەڕانی دنیا[2]

---

(١) وا دیارە کاکەی مەغریب بە پێ کەوتۆتە رێ بۆیە ئەوەندە درەنگ تەشریفی گەیشتۆتە بیارەی شریف و مەنزڵگای حەزرەتی شێخ.

(٢) ئەمەش دەقی فارسی‌یەکەیەتی:

یا رب چه خوش است بی دهان خندیدن — بە واسطه چشم جهان را دیدن
بنشین و سفر کن که بغایت نیکوست — به زحمت پا گرد جهان گردیدن

**ك ١٤٦: دیسان جەنابی مەلا عبدالقادری مدرس ئەفەرموێ:-**

ئێوارەیەك حەزرەتی شێخ كۆمەڵێكی زۆری لە خزمەتا ئەبێ لە دەشتی شارەزوورا لە لێواری جۆگەیەكا نوێژی ئێوارە بە جەماعەت دەست پێ ئەكەن، كاتێ ركاتی یەكەمی نوێژەكەیان تەواو ئەكەن، لە ركاتی دووەما حەزرەتی شێخ پەڕواز ئەكات، وەكو بە باڵ بفڕێ ئەبینن تا ئەوبەر جۆگەكە ئەڕوا، بە پەرێشانی و سەرسامی نوێژەكە تەواو ئەكەن و چرا هەڵ ئەگرن وە دەست ئەكەن بە گەڕان بەدوای ئەو زاتە خاوەن كەرامەتەدا كە بیدۆزنەوە ئەبینن وا لە جێگەیەكی شێ دار و پڕ لە دڕك و دارا تەشریفیان كەوتوە و لەسەر خۆی چوە ئەیهێننەوە بۆ ئەو بەر كاتێ بە ئاگا دێ ئەفەرموێ ئایا من نوێژی مەغریبم تەواو كرد؟ عەرزی ئەكەن ركاتی یەكەمت تەواو فەرموو لە ركاتی دووەمدا گوم بوون ئەمجا نوێژەكەی ئێوارەی كردەوە، وە داوای باسی ئەم روودراوە گەورە گرنگەیان لێ كرد وە تكایان عەرز كرد كە پەردە لە رووی ئەم نهێنییە خواییە لابدا فەرمووی: لەو كاتەدا رۆحی حەزرەتی شێخی سراج الدینی باوكی خۆشەویستم (قدس سره) تەشریفی هێنا و فەرمانی پێ كردم فەرمووی یار ئەحمەد بەگی جاف ئێستە لە لای بانەیە[1]، سوپای دوژمن دەورەی داوە لە هەموو لایەكەوە رێگەیان لێ گرتوە، رێی درەچوونی نیە داوای یارمەتی وكۆمەكی[2] لە من ئەكات، ئەبێ فریای بكەوی و بە هانایەوە بچی زۆر بە گورجی منیش بە گورجی و بە پەلە پەیڕەوی فەرمانەكەیم كرد و بە پیریەوە چووم، لەشم لەگەل رۆحما پێكەوە پەڕوازیان كرد، سوپاس بۆ خوا لەسەر فەرمانی باوكی شیرینم بە بێ ئازار و

(١) بانە: شارێكە لە كوردستانی ئێران، دانیشتوانی هەمووی كوردن بە شێوەی سۆران ئەدوێن جۆری نەریت و ژیانیان لە زۆر بارەوە لە كوردی ناوچەی سلێمانی ئەچێ لە كوردستانی عێراق.

(٢) یارمەتی و كۆمەكی: ئیمداد.

زەحمەت و زیان لە چنگی دوژمن رزگارم کرد[1]، وە بە هیممەتی شێرانی بێشەی توحید سبەینێ بەیانی دێت، ئەم بەسەرهاتەتان بۆ ئەگێڕێتەوە، لە کاتی دیاری کراودا یار ئەحمەد بەگ گەیشت وە رووداوەکەی بەبێ کەم و زیاد باسکرد.

چە کەرامەتێکە یا رەب کردت لەگەڵ بەشەردا
کە بەرگی جێگەداریت بە لوطفت کرد بە بەردا
هەمیشە وا ئەبینرێ بە چاو کە ئەو لە ماڵە
کەچی بە شێوەیە تر هەروا لە رێی سەفەردا
ئاسوودەیی بەلاوە تاڵە هەتاکو دۆستی
رزگار نەکا ئەگەر دی، ئەو وا لە جێی خەتەردا
چەن جوان ئەڕۆی بە تەنیا تەن بێ سەرگەدانت
بێباك بەجێ ئەهێڵی یارانی میهرەبانت!!!

**ك ١٤٧:** دیسان جەنابی مدرس ئەفەرموێ: سیّد سەلمانی موصلی کە پیاوێ بوو لە لایەن میری‌یەوە دانرابوو بۆ تاقی کردنەوە و إمتحانی فەقێی ئایینی بە راستی و دروستی زۆر زۆر حەزرەتی شێخی خۆش ئەویست، رۆژێ لە خزمەتیا بوو گلەیی کرد ووتی چەند ساڵە بە تەمای نیو نیگاهێکی عومەر عومرمان هەموو بەسەر برد جارێك لوتفێکمان نەدی، شا عومەر لەوەڵامیا فەرمووی ئەی ئەوە چی بوو لە شاری موصلێ وەختی عەسر لەزیارەتی حەزرەتی یونس پێغەمبەر (علی سیدنا وعلیه الصلاة والسلام) بووی و لەو پەڕی شەوق و بێ قەراریدا بە گریە و زاری ئەم چەن دێڕەت ئەخوێندەوە:

---

(١) رزگارم کرد: دیارە بزورگی و پایە بەرزی ئەم زاتانە کە خۆشەویستی خوان لە کاتی تەنگانەی هەردولادا دەرئەکەوێ.

| | |
|---|---|
| دوو بــرۆت پزیشــك دڵ پەژارانــەن | هەردوكیان بە جووت لای بیمارانەن[1] |
| چاوانت كەوا خەوی خەڵكیان بەست | نوستوون و جـەردەی ڕێـی بێدارانـەن |
| چـەن هـەزار وەك مـن لێـت نـامرادە | شـاد بـە گـوڵی رووت درك و دارانـەن |
| مـەنعی گریـانم مەكـە لـە دەرگـات | چـون گـوڵ بـە هیـوای نمـەی بارانـەن |
| نـاوێرم گـەنجی رووت تەماشـاكەم | لــە لایــا زولفــت دوو رەشمارانــەن |

وەدیسان فلان شەویش كوڕەكەت نەخۆش بوو، خۆشت بێ ئاگا بوویت كە بە خزمەت حەزرەتی گـەیلانی (قـدس سـره) گـەیشتی، مـنی هـەژاریش[2] حـازر بـووم، بەڵام منت نەدی، دەس بە جێ سید سەلمان هەڵسا بە گەرمی و گریە و زاری و هاوار و دادەوە بەرماڵەكەی حەزرەتی شێخی ماچكرد وە ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

هەرچی بێ تەنیا بە هۆی چەوتی و لە بێ ئەندامی‌یە[3]

وە نەتەشریفت بە باڵای هیچ كەسێ كۆتا نیە[4]

---

(١) دەقی فارسی‌یەكە:

| | |
|---|---|
| أبــروان تــو طبیبــان دل أفگارانــد | هــردو پیوسـتـه بــر ســر بیمارانــد |
| نرگسان تو كه خواب همه عالم بستند | خفتگانـــد ولـــی رەزنی بیدارانـــد |
| گـنج روخسـار تـو دیـدن بنـوزره مـرا | كـه زوزلـف تـو بـر خفتـه سیه مارانـد |
| مـا هزاران زغمـت خسته و ناكـام ولـی | كامیاب أز گل روی تو حسن و خارانند |
| بر سركوی خود از گریـه مكـن منع مـرا | زانكــه گلــهای چمــن منتظـر بارانـد |

(٢) هەژار: فقیر. مەبەست لە عومەر شا عومەر، وە لە عومر مەبەست تەمەنە.

(٣) سر چی، مست أز قامت ناسازی به أندام ماست

ور نه تەشریفی بۆ بر بالای كس كوتاه نیست

(٤) مەبەست ئەوەیە یانی ئێوە لوطف و كۆمەكیتان یەكسانە بۆ هەموان، بەلام بەنـدە كە بێئاگـام خـەتای خۆمە، ئێوە پۆشاكی لـوطفتان وەكو بەرگـدوری شارەزا بـە بـەری بەنـدە بڕیـوە، بـەلام خـەتای لـەشی ناهەمواری خۆمە كە ئاوا كورت و كوێرە.

**ك ١٤٨:** جەنابی مدرس دووبارە ئەفەرموێ:

سۆفی فەتاح ناوێ کە بە فەتاحە گورگە[(١)] بەناوبانگ بوو کوڕێکی هەبوو عبدالعزیزی ناو بوو کەڕ و لاڵی زگماك بوو تەمەنی لە ٨-٩ هەشت نۆ ساڵی دابوو، کاتێ حەزرەتی پیر تەشریف ئەفەرموێ بۆ ناوچەی ئەوان، باوکی ئەو کوڕە ئەباتە خزمەتی، داوای چاکردنەوەی ئەو دەردە بێ دەرمانەی لێ ئەکات، حەزرەتی شێخ هەردوو پەنجەی شایەتمانی ئەخاتە هەردو کونە گوێی ئەو کوڕە و وە لە زەوی بەرزی ئەکاتەوە توند ئەیدا بە زەویدا، سۆفی فەتاح لە دڵی خۆیدا ئەڵێ چاك شا عومەرکوڕەکەی کوشتم، بەلاّم بۆ دڵنیایی لە چاك بوونەوەی بە دەرمانەکەی حەزرەتی شێخ بانگی ئەکات عبدالعزیز!!! دەسبەجێ ئەڵێ بەڵێ وە گوێ و زمانی هەردوکیان پێکەوە ئەکرێنەوە سوپاس بۆ خوا:

لاڵی زگماك ناوی دێی پڕ شۆڕی عیشقی بێتە گوێ
دێتە گوفتاری رەوان، نەك وەك زمان فێربووی لە نوێ
دەرگی بیستن بۆ کەڕی ئەصڵی ئەکاتۆ هەرووەکوو
کوێری نابینا بە چاوی نوور ئەداتۆ سەر لە نۆی[(٢)]

---

(١) مەبەست لە نازناوی فەتاحە گورگە: بەسەرهاتێکی زۆر خۆش و سەیری لەسەرە لە شوێنی خۆیا ئەنوسرێ.

(٢) کوێری نابینا بە چاوی نوور ئەدا تۆ سەر لە نوێ: رووداوێکی خۆشی لەسەرە: لە کاتێکا کە حەزرەتی شا عوسمان گیان لەدووروەی شەریف ئەبێ ملا خالد تووشی کوێری ئەبێ بەو حاڵەوە ئەیبەن بۆ لای پزیشك لە شاری سلێمانی چارەسەری نابینرێ لە پاشا ئەیبەن بۆ خزمەتی غەوثەکەی زەمان حەزرەتی شاعوسمان لەوێ بە هیممەت و توجهی پیرانەوە بە چاوی بینا و ساخەوە، بە دڵی خۆش و شادیەوە دێنەوە بۆ سلێمانی منیش ووتومە:

**ك ١٤٩:** هەروەها ئەفەرموێ:

عبداللطیف ناوێکی بەغایی یەکێ بو لە مریدانی ئەم حەزرەتی شا عومەرە، بە هەڵ خەڵەتانی نەفس و شەیتان لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانە خەیاڵی بێ شەرعی ئەکات، بۆ ئەم مەبەستە جێگەیەکی چۆڵ دیاری ئەکەن کە تیایا مەرامی خۆیانی تیا بەرنە سەر، لە کاتی نزیك بونەوەدا بۆ بەجێ هێنانی ئەو فەرمانە، دیواری ماڵە چۆڵەکە شەق ئەبێ وە حەزرەتی شا عومەر ئەچێتە ژوورەوە و عەسایەکی بە دەستەوە ئەبێ، لە چاوپێکەوتنی ئەم کارەساتە عبداللطیف سەرسام ئەبێ و بۆی دەرئەچێ، وە لە بەجێ هێنانی ئەو فرمانە ناپەسەند و ناشیرینەی خۆی پاشگەز ئەبێتەوە تۆبە ئەکات.

چۆن ئەبێ بڵێن بەجێ لەگەڵما گەر شوانی ئاگا بێ لەگەڵما

**ك ١٥٠:** جەنابی مدرس ئەفەرموێ:

عبدالله فەندی بەغایی کە یەکێ بوو لە دۆستانی راسی طەریقەت وە خۆشەویستی حەزرەتی خاوەن حەقیقەت بۆی گێراینەوە فەرمووی: جارێکیان لەگەڵ چەن هاوڕێیەکا چووین بۆ زیارەتی غەوثی گەیلانی (خوا لێ خۆشنوود بێ) پیاوێکی هیندی مان دی لە خزمەت شاها سالیك بوو، بەلام بە شێوەیا دڵ شکاو وپەژارە و مات و دڵبراو بوو، هۆی مەلولیمان لێی پرسی، رووی لێ وەرگێراین و گوێی[1] بە قسەکەمان نەدا، دوایی زۆرمان بۆ هێنا ناچار باسەکەی بۆ گێراینەوە و فەرمووی

---

مزگێنی بۆی کراسی کەرامەت با بە خێر بێ — کوێر چاوی چاك بێتۆ، مونکیر با چاوی کوێر بێ

حبوب و حبّی جانان قوەت و قووتی رۆحە — دەسکەوی ئاخۆ، یانە، بەم زوانە یا خۆ دێر بێ

پێویست نیە بە تەعلیم إنسانی ژیر و زانا — ئەبلەهە گرانە چاری، نەخۆندە سەهلە فێر بێ

دانەر

(١) تەریقەت: یانی ڕێگەی راست و دروست بۆ مەنزڵگای خواناسین لە چەك بە دەستێکی ڕێگا شارەزا. سالیك: ڕێگە گر، دانگری ڕێگە، سلوك کەوتنە سەر ڕێگای تەریقەت و پەیرەوی کردنی .

دووجار چله[1] و خەڵوەتم بە گوێرەی أصول ودەستوری خۆی کێشاوە بە تەمای ئەوەی کە بە خزمەت روخساری شیرین ودیداری موبارەکی حەزرەتی سەرداری عالەم ﷺ شاد و بەهرەوەر بم، بەڵام هێشتا هەر بە خزمەتی کامیاب نەبووم و دڵ و گیانم لە سووتاندایە بۆ دیداری پیرۆز و پڕ فەڕی، ئێمەش پێمان ووت ئێمە شێخێکمان مەڵبەند و لەنگەری هەورامانە وە پڕ فەڕی و بەرەکەتی پڕی هەموو جیهانە وە کەرامات و دەسەلاتی دوور لە سنور و بەیانە وە رەنگ و شێوەی بە جۆرەیە و عەیانە گەر لە سەر دەستی ئەوا طەریقەت وەربگری[2] بەم مەرام ونیازی خۆتە ئەگەیت وە روشتەی خۆشەویستی ئەو بخەیتە گەردنی خۆت، هیچ گومانی تیا نیە بە پێنج رۆژی کە بە زیارەتی حەزرەتی سەرداری عالەم ئەگەیت.

ووتی: ئای چەن دورە من بەو ئاواتە بگەم!!!

دوورە بۆ پیاوی وەکوو من خوار و پەست

قەت مەبەستی بەرزی ئاوای بێتە دەست

بە کورتی زۆر هاتماندا بۆ وەرگرتنی، لە سایەی خواوە بە وەرگرتنی طەریقەت شەرەفدار بوو ئیتر ئێمە بەجێمان هێشت، لە دوای پێنج رۆژی چاوپێکەوتنەوە و لێم پرسی چیت دی و بە خزمەتی کێ گەیشتی وا خۆشحاڵ و دڵخۆش و رووخۆشی ووتی بە ئاواتی خۆم گەیشتم

من بۆیە وەها دڵخۆش و شادم      بە ئاسان هاتە بەر باخی مرادم

---

(١) چلەکێشان: بریتی‌یە لە خۆشاردنەوەی سالیك لە هەموو کەس، لە جێیەکی تایبەتی و خەریك بوونی تەواوی ئەو چل رۆژە بە کۆششی خواناسین لەگەڵ کەم خواردن و کەم خەوتن وە ئەمەش لە فەرمایشتی خوا و پێغەمبەر ﷺ وەرگیراوە، جا بەرهەمی ئەو کۆششە لەدوای چلە دەرئەکەوێ، دڵ پاکو چاوکراوە ئەبێ.

(٢) تەریقەت وەریگرە: لەسەر فەرمایشتی بزرگانی تصوف ئەوەی ماڵی دنیای بەجێ هێشت ئیتر فەرمانی بەرزکردنەوەی پلە و ترقیات و ئیجازەدانی طەریقەتی ئەدرێتە دەست شێخێکی زیندوو کە لەحەیاتا بێ وە بەو ئەسپێردرێ ئەو فەرمانە.

له پاشا ئەم زاتە هیندییە فەرمووی:

حەزرەتی شێخ عمر (خوا لێ خۆشنوود بێ) کە ئەمە رەنگ و شێوەیەتی وە ئەمە بەرگ و پۆشاکیەتی وە هەموو ناونیشانەکانی بۆ هەڵداین، لە خەوێکی راست و دروستدا دەستی گرتم و خستیە ناو دەستی حەزرەتی رسول الله ﷺ ەوە سوپاس بۆ خوا، وە ئێستەش هەر پرسیار و ئیشێکم بێ چاو ئەنێمە سەر یەك حەزرەتی شێخ حازر ئەبێ و مەبەستەکەم وەلاّم ئەداتەوە، یەکێ لەوانەکە پرسو رام[1] پێکرد بە حەزرەتی شا عومەرم ئەمە بوو قوربان بە یەکجاری ئەمەوێ لە هیندستان کۆچ بکەم و لە بەغا نیشتەجێ ببم ئەویش فەرمووی باشە و خێری پێوەیە.

له پاشا رۆیشت و ماڵ و منداڵەکەی هێنا و جێ نیشینی بەغا بو.

چە سەر قافڵە چین نەقشی موحتەرەم

کاروان بە بێ هەست ئەبەن بۆ حەرەم

**ك ١٥١ :** وە هەروەها جەنابی مدرس ئەفەرموێ:

رۆژی سێ شەممەی ٢٢ی مانگی جیمادی یەکەمی ساڵی ١٤١٣ هیجری لە خزمەتی ئەو پیری دەستگیرەدا دانیشتبوین، هەموو چاوەڕوانی بەرکەت و لوتفی ئەو زاتە بووین رووی شیرینی کردە بەندە و فەرموی: مەلا تەئریخی[2] ئەمڕۆ بنوسە و لە بیرت نەچێ؟ نظام الدین[3]ی کوڕم لە بەخشی حاجی قەرە و خانەقین لە بارەی فەرمانێکەوە استمدادم لێ ئەکات، ئێمەش فەرمایشتەکەمان بۆ مێژوو نوسی.

---

(١) پرس و راو مەشورەت کردن بە دەستگیر بۆ کاروباری دین و دنیا چ بە ئاشکراو چ بە چاو لێکنان فرمانێکی شیرین و جوانی رێگەی راستی طەریقەت، وە پرس و را رەووشتێکی بەرزی پێغەمبەری موبارەکە ﷺ بۆ ئێمەی داناوە.

(٢) تأریخ: بەروار ، إستمداد: داوای کۆمەکی.

(٣) نظام الدین: حەزرەتی شێخی ضیاء الدین هەروەکو ئێمە بزانین تەنیا پێنج کوڕی هەبوو.

تا کاتێ لە مانگی ڕەمەزاندا جەنابی پیرزادە شێخ نظام الدین تەشریفی هاتەوە لێمان پرسی لە فلان ڕۆژ و کاتا چیت لە حەزرەتی شێخ داوا فەرمووبوو؟

فەرمووی پیاوێ زۆری ئازار دام هەرچەن ترسم نایە بەر هیچ کاری تێ نەکرد و بێ سوود بوو ناچار ڕووی پاڕانەوەم کردە باوکی شیرینم و لێی پاڕامەوە بە دڵ و یارمەتیم داواکرد خەو زۆری لێ سەندم خەوم پیا کەوت دیم حەزرەتی شێخی باوکم بە سواری تەشریفی هێنا و نێزەیەکی گرتبوو بە دەستەوە بە سەربانێکی بەرزەوە بوو، هەر ئەهات و بەرەو من نزیك ئەبووەوە و منی هەڵگرت و سواری کردم و ڕووی کردە کابرای ناوبراو قەمەیەکی وای تێگرت کە گیانی ریشەکێش بکات، کابراش دەستی خۆی کرد بە سوپەر قەڵغان و نێزەکە دای بە دەستیا.

وە لە هەمان کاتا کابراش هەر ئەم خەوە ئەبینێ کە لە خەو بە ئاگا دێ ئەبینی دەستی بریندارە سێ مانگ بەو برینەوە تلایەوە، منیش لە ئازار و زیانی ڕزگارم بوو.

**ك ١٥٢:** جەنابی مەلای گەورە ملا عبدالقادری مدرس دوبارە ئەفەرموێ:

لە خەوێکا بە خزمەت حەزرەتی سەرداری پێغەمبەران علی نبیّنا وعلیهم الصلاة والسلام شەرەفدار بووم کە بە لۆمە و زویریەوە ڕووی لە شەخسێ کرد و پێی فەرموو بۆچی وا ئەڵێی عمر جێگەداری منە، دوای ئەو لە خەوەکەم بە ئاگا هاتم و چووم و لەو پیاوەم پرسی[1] تۆ لەم بەینەدا هیچ بێ ئەدەبیەکت بەرامبەر بە حەزرەتی ضیا لێ دەرنەکەوتوە وە هیچ ناجۆریەکت بە زمانا نەهاتوە؟ ووتی نەخێر بێجگە لەوە نەبێ کە ووتوومە جەنابی حەزرەتی شێخ عومەر لە هەموو ئەولیای زەمان بالاترە دەستی، بەلام حەزرەتی شێخی سراج الدین (قدس سره) خۆی ئیرشاد ئەکات، جەنابی مدرس ئەفەرموێ ئەوەی کە دیبووم بۆم گێڕایەوە و پێم ووت دڵنیابە حەزرەتی شا عومەر دەستگیرێکی خاوەن دەسەلات و سەربەخۆیە، ئیتر پیاوەکە لە

(١) من لەو پیاوەم پرسی کە یەکێ بوو لە مریدانی حەزرەتی شێخی سراج الدین (خوا لێ خۆشنوود بێ).

ووتن و خەتەرەکە پەشیمان بوەوە و تۆبەی کرد، لەوەودوا لە خەتمەدا ناوی حەزرەتی شێخم بە نائب سيّد البشر یانی جێگەداری سەرداری عالەم ئەخوێندەوە ﷺ، دوای ماوەیەك ئەم خەوەم لە خزمەت شێخا گێڕایەوە جەنابیشیان هەر خۆیان خەوێکیان گێڕایەوە کە راستی خەوەکەی منی پێ ئاشکرا کرد سوپاسی خوای گەورەم کرد لەسەر ئەو لوتفە زۆرە.

**ك ١٥٣:** دیسان ئەفەرموێ: لە شاری هەڵەبجە[1] کۆمەڵێکی زۆر لە خزمەت شێخا بوون بە دەستی موبارەکی خۆی ٤ چوار پیاڵە ئاوی کردە قۆریەکەوە، دوا بە دوای ئەم فرمانەی کۆمەڵێ لە بەگزادەی جاف حازر بوون لەو قۆریە ١٨ هەژدە پیاڵەی چادا بە خەڵکەکە بێ ئەوە ئاوی تێ بکات هێشتا قۆریەکە هەر تیا مابوو، دەرکەوت ئەم کارە بە بەرەکەتی شا عمرە.

**ك ١٥٤:** جەنابی ملا عبدالقادر مدرس ئەفەرموێ:

ملا عبدالفتاحی پاڵەنانی بۆی گێڕاینەوە فەرمووی:

لە سەفەرێکا کۆمەڵێ لە خزمەتی حەزرەتی شێخا بووین، رۆژێ لە شاخێکی بەرداویدا ماینەوە حەزرەتی شا عومەر ئایەتی لو أنزلنا هذا القرآن علی جبلٍ خوێندەوە بە قەوارەی لەشی گیاندارێکی گەورە لەو شاخە سەختەوە بەرد جیا بوەوە و سەرەو خوار هارەی کرد، دوبارە لەوێ گوێزایەوە بۆ لایەکی تر و ئەو ئایتە پیرۆزەی سەر لە نوێ فەرمویەوە هەروەکوو جاری پێشوو بە قەلافەتی لاشەی گایەك بەرد تل بوەوە خوارەوە، سێ بارە تەشریفی فەرموو بۆ لایەکی تر هەر ئەو ئایەتەی فەرموەوە بەلام

---

(١) هەڵەبجە: شارێکی قەرەباڵغ و خۆشە لە فەرمانداری پارێزگای سلێمانی خوا بیپارێزی.

ئەمجارە لەرزەی خستە بناغەی کێوەکە، وەهەموو کێوەکەی هێنایە شەك و شوك[1]، هەروەکو جەنابی شێخ سەلیمی تەختی کە یەکێ بوە لە جێ نیشینانی خۆی، خاوەنی قصیدەی یا محمد المصطفی یە، لە مەدحی پیردا لە هەڵبەستێکیدا ئەفەرموێ کە ئەمە تەنیا دێرێکیەتی بە زمانی عەرەبی:

تقول يتلو على طه الكتاب أخو　　ه جبرئيل إذا ماكان رتّله

یانی

ئـەتوت کـە شـێخت ئـەدی کـاتی تـیلاوە و تـەرتیل
بـە سـەر فـەخری بەشـەردا قورئـان ئـەخوێنێ جبریـل

(١) توجە لەبەرد کردن: لەراستیدا کار لە دڵ کردنەکەیان وە پاکردنەوەی لە ژەنگ و چڵك و پیسی گوناح وساردی لە خواپەرستی و خۆشەویستی خوا و ئایینە بەرزەکەی ئیسلام وە کردنی بە کارگەی خواناسی و چاکەکردن و ئەوینی راستی و گرتنی رێگەی حقیقەت زۆر گرنگ تر و سەرسوڕهێنەر ترە لە کارکردن بەر و چونکە قەڵای کێوی گوناهو قورسی ژەنگی بێ بڕوا و عقیدەیی، وە هەڵکەندن و شکاندن و لابردنی گەلێ سەخت ترە لە کەژێکی گەورە، جا هەر بەو قورئانەی کە توجهی لە بەردی سەخت و لە کەژی قایم کردوە و لەت لەتی کردوە هەر بەو نوری قورئانە توجهی لە هەزاران دڵی بەرد رەق تر و تاریك تر لە شەو کردوە تا گۆڕیویەتی بە مەڵبەندێکی نەرم ونیان و کردیەتی بە چراخانی خواناسی و رووناکی ئەویش تیشکی بە هەموو لایەکا پەخشان بوە و موسڵمانان بۆ هەردو دنیایان سوودیان لێ وەرگرتوە:

تحجّر لە گلّ نرخی عەیــانــە　　تفّجر لە گلّ خیّر و إحسانە
ئەگەر بێکارە و پەست و تەنبەڵم　　وا بزانە منیش گلمۆتێ گلم

دانەر

**ك ١٥٥:** جەنابی سەحبانی دووەم[١] واتە خاوەن پایە شێخ سەلیمی تەختی[٢] کە یەکێکە لە زۆر زانا و پیاوە گەورەکانی هاودەمی خۆی، وە لە خەلیفە زۆر بەرز وبەرێزەکانی حەزرەتی شا عومەر بوە و نیشتەجێی شاری سنە بوو بۆ گێڕاینەوە فەرمووی: منالی نێرینەمان نەبوو خێزانم چەن ماوە داوای هێنانی دۆعای لێ ئەکردم لە خزمەت پیرا بەڵکو خوا کوڕێکی پێ ببەخشێ:

---

(١) سەحبانی دووەم: سەحبان یەکێکە لەهەرە بوێژە بەناوبانگەکانی عەرەب، وە ئێستە کراوە بە نموونە بۆ هەر کەس کە زۆر زانا و پایە بەرز بێ لە نوتق و فەصاحەتا.

(٢) جەنابی شێخ سەلیمی تەختی رەحمەتی خوای لێ بێ ئەم قصیدەی لە مدح و ستایشی پێغەمبەرا ﷺ فەرمووە:

یا محمد المصطفى جئت بالصدق والصّفا ... خير مقدم قدمت أنت للأسقام شفا

معشر الإسلام صلّوا، سلّموا على المصطفى ... بصلاتكم عليه، كان لكم كنفا

أبشروا طلاب جنّة، لكم فيها عرفا ... ربكم يعطيكم شتّى درجاتٍ تتحفّا

ربّنا اغفر كلّ ذنب بعبادك الضعفا ... واهدنا اللّهم نهجاً، عابدين وحنفا

فليصلّ وليسلم من نوى منه زلفا ... سلّموا عليه حتى، تجزووا الجزاء الأوفى

صلّ يا ربّ عليه كلّ آنٍ ألفاً ألفا ... وعلى الآل الكرام، وجنوده الشرفا

معشر الرّسل الكرام كلّهم منك استعطفا ... كنت دراً ذا شعاع والورى لك صدفا

وعلى عامة العالم فقت مجاً وشرفاً ... واصطفاك بين الخلق عالم السرّ والأخفى

صاحب البرّ والتقوى صادق الوعد والوفا ... منبع العلم والآدب معدن الصّدق والصفا

مخزن الأسرار جمّاً، مسعف اللّهفان عطفاً ... مظهر الأنوار دوماً وهو نورٌ ليس يطفى

أجمل المودود خلقاً، أكمل الموجود وصفاً ... أصدق العباد نطقاً، أبسط الجّواد كفّا

أزهر الأقمار وجهاً، أزخر الأبحار لطفاً ... أسرع الأغواث عوناً، من به استغاث يكفى

صلّ يا ربّ عليه، كلّ آن ولسوفا ... وعلى الآل الكرام، وعلى كلّ الخلفا

ربّنا اجعلنا بفضلك بجنابك عرَفا ... واجعلوا يا خير أمّة، صلواتكم سلفا

صلّ يا ربّ عليه بالكلام حرفاً حرفا ... وعلى صحب العظام والآل أولي الوفا

سالم أمدح خير الخلق بكلامك المقفى ... مدحه أشهى وأحلى من عسلٍ مصفى

لەبەر بێ جێگەیی وام نوسیوە ئەگینا هەر نیوە شیعرێکی ئێستا نوسراوە شیعرێکی تەواوە دانەر.

جارێ بەندە لە خزمەتیا باسی ئەو دۆعایەم کرد تەنیا هەر بۆ خۆشی حەزرەتی پیر فەرمووی کوڕ حازرە داوای سەر قەڵەمانە ئەکا کاتێ گەڕامەوە ئەم فەرمایشتەکەم بۆ ماڵەوە گێڕایەوە ماوەیە زۆر کۆششی کرد یەك سەرزینی وا کە شایەنی وولاخی تایبەتی حەزرەتی پیر بێ زۆر بە جوانی چنی وەختێ لەسەر ڕێگە بووم کە بچمەوە بۆ خزمەتی پیر خێزانم سێ چپەی بەسەر زینەکەدا کرد لەگەڵ خۆمان بە دیاری بردمان بۆ خزمەتی، کە گەیشتینە خزمەتی دوای حەوانەوە سەر زینەکەمان بە هدیە دانا و لێی وەرگرتین وە لە لایەکەوە دانرا لە پاش کەمێ گفتوگۆ لای کردەوە بە لای سەر زینەکەدا فەرمووی: ئەم سەر زینە لە لایەن خاوەنەکەیەوە سێ سپاردەی پێیە بڕێکی دنیاییە و هەندێکی بۆ دوارۆژە، بەلام یەکێکیان بۆ منالە، بەلێ منال پێش هاتنت دروست بوە کە لە دایك بوو ناوی بنێ محمد شریف کە گەڕامەو ماڵەوە مژدەم دا بە خێزانم باوەڕی بە دروست بوونی منالەکەی نەئەکرد لە سکیا، بەلام لە بەرەکەت و فەڕی حەزرەتی پیرەوە هەر بەو ماوەیە خوای بەخشندە کوڕێکی پێ بەخشین ناومان نا محمد شریف.

چاك نیە چی ڕاز هەیە لادەن لە ڕوویا پەردەکەی
وەرنە هیچ باسێ نیە گوم بێ لە لای مەستانی حەی

**ك ١٥٦:** جەنابی پایە بەرز و خاوەن دڵ مەولانا عبدالمجید کە یەکێ بووە لە خەلیفەکانی حەزرەتی شا عومەر وە بەر نوێژی خانەقای بیارەی کردوە ئەفەرموێ: جارێ بە خەیاڵما هات کە ئایا تعدّدی ئەرواح چۆن ئەبێ؟ یانی لە یەك سات و کاتا چەن هەزاران کەس رابیطەی ئەم شێخە ئەکەن چۆن ئاگادارە بەسەر حالی هەموویانا؟ وە یا چۆن ئەمانە هەموو سوود لەو شێخە وەرئەگرن، کاشکێ کەمێ لەم نهێنیانەم بۆ ئاشکرا ببوایە!!! لەو کاتەدا کە تەماشای ئەهلی خەتمەم ئەکرد ژمارەیان نزیکەی ٥٠ کەسێك ئەبوو بینیم بە چاوی سەرم کە حەزرەتی شێخ بە یەك شێوە و

پۆشاك لە بەردەمی هەر یەكێ لەوانەدا بە تایبەتی دانیشتوە بێ كەم و زیاد، وە ئەم شێوەی رۆحی یان لەگەڵ شێوەی گیان یانی جیسمی هیچ جیاوازییەكیان نەبو كە ئەمەم دی بە چاوی خۆم دڵنیاییم پەیدا كرد و گومانم نەما و سوپاسی خوام كرد[١].

**ك ١٥٧:** جەنابی شێخ مەلا خدری رەواندزی كە یەكێ بوو لە خەلیفەكانی حەزرەتی شا عومەر فەرمووی: لە بیارەی شەریف لە خزمەت شێخی روو رۆشنی دڵ روناكدا بووم عەرزیم كرد ئەگەر نوسراوێ بنێرن بۆ مەلا محمد أمین ئەفەندی كوڕی خوا لێ خۆشبوو جەنابی حاجی عمر أفندی خەیلانی دیارە ئەو دڵسۆزی بەم قاپییە بە لوتفتان كامیاب و بەختەوەر ئەفەرموون وە هۆی سەر بەرزی و دڵخۆشییە بۆ ئەویش و حەزرەتی شێخ رەوشتی گەورەیی خۆی بەجێ ئەهێنێ، وە بەم چاكەیە دەرگای كامەرانی و بەختیاری هەردو جیهانی بۆ ئەكەنەوە "فەرموی نامەیەكی بۆ ئەنێرم هەر لە دنیا لەدنیا رووت بێ وە شتێكی واش لە تەمەنی نەماوە" لە پاشا ئەم نوسراوەی نووسی بۆی ئێمەش بەبێ دەسكاری و وەرگێڕان ئەی نووسین: بسم الله الرحمن الرحيم يا أخي ملا محمد أمين أفندي سلام عليك وبعد: صِرْتُ بينَ الناسِ أفندياً وصِرْتَ به مسروراً, لكنْ لما نزلْتَ في القبرِ إذا جاءكَ المُلَقنُ يقولُ لكَ يا عبدالله ولا يقولُ لكَ يا أفندي يجعلُ لكَ الضحْكَ بكاءً.

ماناكەی: بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان بۆ برای خۆم مەلا حمە أمین ئەفەندی سلاوی خوات لێ بێ لەناو خەڵكا بووی بە ئەفەندی و زۆریشت پێ خۆشە بەو جۆرەت ناو ئەبەن، بەلام كاتێ سەرت شۆڕكردەوە بۆ لێواری قەبرەكەت تەلقین خوێن پێت نالێ ئەفەندی بەڵكو پێت ئەڵێ ئەی بەندەی خوا وە خۆشی و شادی و پێكەنینت لێ ئەكات بە شین و گریان، لە پاشا حەزرەتی شێخ فەرموی توجّهێكم كرد خوا هەرچی مەیل بفەرموێ هەر ئەوە ئەبێ، دواتر ئەم نامەیەم بۆ نارد، دوای

(١) ئەمڕۆ هەر كەس لە تەلەفزیۆن ببینێ سەری لەو جۆرە شتانە سوڕ نامێنێ و بە لایەوە عەجایب نیە.

ناردنی ئەم کاغەزە ماوەیەك لە بیارە مامەوە، کاتێ ویستم بگەڕێمەوە بۆ شوێنی خۆم حەزرەتی پیر فەرمووی کاتێ گەیشتیتە ماڵەوە بچۆ بۆ سەرخۆشی مەلا حمە أمین ئەفەندی، کە گەیشتمەوە ئەوێ هەواڵیان دامێ کە ناوبراو لەدنیا دەرچووە چووم بۆ پرسەی ووتیان لەگەڵ نامەکەی حەزرەتی شێخی پێ گەیشت خوێندی‌یەوە و مجزوب بوو[1] بەجۆری مەستی[2] رووی تێکرد وەك شێت ئەگەڕا، زۆری پێ نەچوو ماڵاوایی لە دنیای بێ وەفا کرد، وە گیانی پاکی بە گیانی گیانان سپارد.

شەهیدی خەنجەرت سەد جار سپی بێ ئەلبیسەی مەرگی
لە حەشرا هەڵ ئەسێ وەك لالەیە خوێناوی‌یە بەرگی[3]

---

(١) مجزوب: بێ ئاگا، بێ خود، بێ هۆش، جەزبە: بێ ئاگایی، بێخودی، بێ هۆشی لە راست یدا جەزبە یانی خۆ نەگرتنی سالیکە لەبەر نوری بەرەکەتێ کە بە هۆی نەزەرێ لە شێخەکەیەوە بۆی دێ بەبێ ئاگا و دەسەڵات هەراو جووڵانی لێوە پەیدا ئەبێ، وە خۆی جەزبە بەمانای راکێشانە، جا تا نوور و بەرەکەت و رۆشنایی زیاد بێ و تاریکی غفلەت و گوناح کەم بێتەوە بەرەو نزیکی لە خوا ئەڕوا، چونکە ئەو بەرەکەتە لە خواوە دێ و نزیکی ئەخاتەوە پێ ئەڵێن جەزبە یا راکێشان وە خاوەنەکەی ئەڵێن مجزوبیانی راکێشراو.

(٢) مەستی: بریتی‌یە لە بێ ئارامی‌یەك بە هۆی لەسەریەکهاتن بەرەکەت وتأثیراتی معنوی وە بە چاوی دڵ ئەبینێ بە شێوی جام سووراحی ئەگێردرێ، وە لە ئاکاما خۆشەویستی شێخ یا پێغەمبەر یان خوای پەروەردگاری زیاد ئەکات بە گوێرەی دەرس و دەورەکەی خۆی لە کام پلەدا بێ لەم سێ پلەیە بەو چەشنە وەری ئەگرێ.

تأثیرات: بریتی‌یە لە دەرك کردنی خۆشەویستی‌یەکی رۆحی یا ناخۆشی بە هۆی رەفاقەت و دانیشتن و تێکەڵی، لالە: گوڵێکی سوورە.

(٣) دەقی ئەم هەڵبەستە بە فارسی:

شهیدی خنجری نازی تو چون أندر کفن پیچد    به روزی حشر چون لا له خون الوده بر خیرد.

**ك ١٥٨: هەروەها شێخی مەلا خضری ئەفەرموێ:**

لەسەر فەرمانی حەزرەتی شێخ چەن کرێکاری بە کرێ گیرابوون، بەردیان لە کانە بەردەکە دەرئەهێنا، بۆ ئەم مەبەستە (٨) هەشت کرێکار ئیشی ئەکرد، چووم عەرزم کرد که بەرد لەو کانەدا نەماوە، ئیشارەی فەرموو بۆ جێگەیەکی تر، کە هەڵمان کەند ئەویش کان بوو، کاتێ کارێکارەکان داوای رۆژانەیان کرد عەرزی حەزرەتی شێخم کرد هیچی پێ نەبوو بەلام فەرمووی: فلان کەس هاتوە بۆ زیارەت هەندێ پارەی بە دیاری هێناوە کە رۆژانەی کرێکارەکان بە کەم و زیاد دەرئەهێنێ لە خوا بەو لاوە کەس بە هێنانی ئەو پارەیەی نەزانیوە، بڕۆ بە نهێنی لێی وەربگرە.

چووم بۆ لای پیاوەکە داوای دیاریەکەم لێ کرد کە بۆ خانەقای هێنابوو زۆر بە لایەوە سەیر بوو ووتی سبحان الله بێجگە لە خوا نەم هێشتوە کەس بەم ئیشە بزانێ تەنانەت ماڵ و منالیش بەم کارەیان نەزانیوە.

**ك ١٥٩: ئەمجارەش جەنابی ملا خضر ئەفەرموێ:**

رۆژێ لە خزمەت ئەو غەوثی زەمانەدا بووین گوێمان بۆ فەرمایشتی شیرین و گفتوگۆی پیرۆزی گرتبوو کوتو پڕ فەرمووی:

حاجی محمودی ئاکوانی ئێستە لەسەرە مەرگایە بەهۆی ئەوەی إخلاصی تۆی هەیە ملا خدر داوای کۆمەکی و ئیستمدادی لە تۆ هەیە، ملا خدر ئەو حاجی محمودە کێیە؟ لەبەر ئەوەی کاتێ من لە وولاتی خۆمانەوە هاتبووم لەوپەڕی لەش ساخی و تەندروستی دابو هیچ خەیاڵ و گومانێکم بۆی نەچوو!!! عەرزیم کرد قوربان وەصفی بفەرموو پیاوێکی چۆنە؟ فەرمووی پیاوێکی قەڵەو و ریشی پان و درێژ نیە قەڵەم کراوە بەلام سپی‌یە و رێك کراوە ماڵەکەی لە قەراخی دێ کەوەیە دارێکی توو لە بەردەمی ماڵەکەیانە چونکە داوای یارمەتی لە تۆ ئەکا هەروەك لە ئێمە داوا بکات وایە.

لەکاتی گیان کێشانا ئاگاداریمان کرد و بە ئیمانی سەلامەتەوە تەسلیمی بارەگای خوای بێ هەمتامان کرد، لە پاش ئەو فەرمایشتە فەرمووی: خۆزگە شێخ محمد طاهری کوڕی شێخ نەبی کە ئێستە لە ناوچەی خۆیان لە فلان جێگە نوستوە وە شتێ سوری بەستۆتە پشتی ئەهات بۆ ئێرە، وە ئەم زاتە هەرگیز نەهاتبوو بۆ خزمەتی پیر دوای ماوەیە ئەم شێخ محمد طاهرە بە زیارەتی حەزرەتی شێخ بە هەرەوەر بوو، وە زاوایەکی حاجی محمودی ئاکوانی لەگەڵا بوو، کاتێ هەواڵی خەزوریم لێ پرسی ووتی لە فلان کات وەفاتی فەرموو.

هەر بە مەستی سەر لە خاکی گۆڕەکەی دێنێتە دەر
هەر کەسێ چەشتی شەرابی عیشقی مەولانا عومەر

ك ١٦٠: جەنابی شێخ مەلا عبدالرحمن رەواندزی کە یەکێ بوو لە خەلیفە بەناوبانگەکانی حەزرەتی شێخ عومەر ئەفەرموێ:

ڕۆژێ حەزرەتی شێخ ناردی بە شوێن جەنابی شێخ عبدالقادری چۆڕی و بەندەدا کە بچینە خزمەتی بۆ چا خواردنەوە فەرموی: ئەمشەو وام زانی کەهەر لەم چایە بۆ خزمەتی دو برای نازدارم جەنابی حەزرەتی شێخ بهاء الدین و شێخ عبدالرحمن‌ی خوا لێ خۆشبووم لێ ناوە شێخ عبدالرحمن‌ی رەواندزی ئەفەرموێ لە کاتی گێڕانەوەی ئەم فەرمایشتەدا من لە حزوریا هەستامە سەر پێ و چاوم نا بە یەکا بینیم کە لطیفەی دڵی شا عومەربە شەوق و روناکی‌یەکی زۆرەوە بە فراوانی خەتی رۆژهەلات و رۆژئاوا وە باکوور و باششووری داگیرکرد وەکو دەریایەکی بێ پایانی لێ هات بێجگە

له أفقی حقیقی[1] کەسێ هەستی بە شتی تر نەئەکرد، وە هەر دووچاوی وەکوو بازێکی خوایی بە هەموو گۆشە و کەنار و رۆخی ئەو زەریا[2] نومایانەدا[3] ئەگێڕا.

لەو کاتەدا دەنگێ ئەهات ئەیفەرموو ملئ السموات وملئ الأرض وملئما بینهما وملئما شئت من شئ بعد[4].

دڵی زەریایە بە ئەسراری خوا          زەوی و ئاسمانان نمێکە لەوا

**ك ١٦١:** دیسان جەنابی شێخ ملا عبدالرحمن رەواندزی ئەفەرموێ:

جارێکیان حەکیمێ هاتە خزمەت حەزرەتی شا عومەر و دانیشت فەرموی حەزرەتی پیر تۆ چوویتە ئەستەمبوڵ یەك مزگەوتی گەورە لە فلان جێگەدایە وە شوورایەکی گەورە لەخوار ئەو مزگەوتەوەیە وەصفی چۆنە؟ ووتی یەکەم جار بە فەرمانی سوڵتان ئەو شوورایە وێران کرا و چینی و فەخفوریان لێ دروست ئەکرد وە ئێستە دیسان بە فەرمانی سوڵتان دروستکرایەوە، وە هەمان دەستور لەسەر شێوەی پێشووی، لە پاشا حەزرەتی شێخ فەرمووی، ئەو دەرمانانەت لەکوێ کڕیوە؟ ووتی هەمویم لە ئەستەمبوڵ کڕیوە، فەرمووی ئەی ئەوە چی بوو منت لە گەڵا بووم هەندێکیانت لە موصل لە فلانە دوکان کڕی؟ بەسەر سڕمانەوە ووتی راستە بە خوا وەهابوو، دیسان فەرمووی: بە تەمابووی زوو بێی بۆ ئێرە ئەوە بۆچی درەنگ هاتی؟ ووتی لەگەڵ برایەکی خۆم هەرام بوو بۆیە دواکەوتم. حەزرەتی شێخ فەرمووی: لەکاتی منالێتا لەخوێندگا دوو برات هەبوو بۆچی یەکێکیانت خۆش ئەویست دوایی

---

(١) أفقی حقیقی: ئاسۆی راستەقینە.

(٢) زەریا: محیط.

(٣)نومایان، فراوان،      باکوور: شمال.      باشوور: جنوب.

(٤) یانی بە فراوانی و گەورەیی هەموو ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی کە لە میانیان دایە هەرچی تریشت بوێ لەوە زیاتریش ئاگادارە و چاوی لێیەتی، دەستی بەسەریا ئەڕوات لە خوایی‌یەوە.

ئەو خۆشەویستی‌یەت نەما، ووتی لەناو خۆیانا ناکۆکیان بوو بەو بۆنەیەوە لە بەرچاوم کەوت لە پاشا فەرمووی ئەو ویردە کە فێرم کردی ئەمشەو بۆچی نیوەت خوێند و تەواوت نەکرد، لە دڵی خۆتا ووتت: شێخ لە کوێ ئەزانێ؟ من تەواوم کردوە یان نا.

ئیتر ئەو حەکیمە ئەستەمبولی‌یە دڵنیایی پەیا کرد زانی کە دەستگیر و مورشیدەکەی ئاگادارە بە هەموو کردار و خەتەرەیەکی کە بە دڵا هاتوچۆ بکات و تێ پەڕێ.

پێــــت ئــــەزانێ شــێخی خـــاوەن هێـــز و چــــەك
چـــیت بەســـــەردێ دانـــــە یـــــەك بــــە یــــەك

وە مەولەوی (خوا لێ خۆشنوود بێ) ئەفەرموێ:

چــــە ســـــەیرە لـــــە بـــۆ کـــاکی نەفســـانی
خـــۆی نـــەیبوو تـــۆشی وەکـــو خـــۆی زانی

**ك ١٦٢:** دوبـارە جـەنابی شـێخ مـەلا عبـدالرحمن رەوانـدزی ئەفـەرموی فـەقێ عبدالقادر ناوێکم لە لابو، لە خزمەت حەزرەتی شێخا چوو بۆ هەڵەبجە کە گەڕایەوە بۆی گێڕامەوە ووتی لەم سەفەرەدا رۆژێ لە ماڵی محمود پاشای جاف ژنێکی لێ بوو زۆر جوان بو، لە سەرەتاوە لە ترسی خوای گەورە وە واشم ئەزانی کە حەزرەتی شێخ ئاگادارە سەیرم نەکرد حەزرەتی شێخ لەو کاتەدا لەوێ نەبوو بەڵام لە پاشتر نەفس و شەیتان زۆریان بۆ هێنام بۆم روانی لە ئێوارەدا کە بە خزمەت حەزرەتی شێخ گەیشتم، فەرموی ئەحمەق بۆچی ئەمڕۆ لە ترسی خودا و ئەم بەندەی بێ دەسەڵاتە لە هەوەڵەوە نەتڕوانی بۆ ئەو ئافرەتە نا مەحرەمە، بەڵام لە پاشا گەڕایتەوە، ئەو گوناحەت کرد مەگەر ئایەتی [ونحن أقربُ إليه من حبل الوريد] و ئایەتی (إلا لديه رقيب عتيد)ت لە بیر چوتەوە.

وه هەروەها جارێکی تر بەو فەقێ عبدالقادرەی فەرموبو لە خانوی یەکەمتانا یەك داره رای بنمیچی خانوەکەتان شکابو و بۆچی نەتان زانیبو، فەقێ قادر ئەڵێ: کە چومەوە ماڵەوە سەیرم کرد راستەشکاوە.

سبحان الّذي لا يخفى عليه شيء في الأرض ولا في السماء, ويعلم دبيب النّمل على الصخرة الصحراء وهو السميع العليم.

**ك ١٦٣:** سەر لە نوێ جەنابی مودەریسی بیارە مەلا سید عبدالقادر فەرموی: لە سەردەمی ژیانی حەزرەتی شێخی سراج الدين (خوا لێ خۆشنوود بێ) حەزرەتی شێخ محمد بهاء الدين کەکوڕە گەورەی حەزرەتی سراج الدين وە برای حەزرەتی شێخ عمر بوە، تشریفی ئەبا بۆ سابلاغ (مەهاباد) شەوێ بە رێکەوت ئەچنە دێی (شەرەفکەند) وە حەزرەتی شێخ عمریش بۆ خزمەتی باوکی ئەمێنێتەوە، وە لەم سەفەرەدا نابێ ئینجا کوتو پڕ پێش ئەوەی حەزرەتی بهاء الدين بگاتە دێی ناوبراو مەلا أحمد ئیمامی شەرەفکەند گەنجێکی شێوە شیرین ئەبینێ دێت و پێ ئەڵێ: ئامادەبە میوانێکی زۆر عزیز و خۆشەویست لەگەڵ کۆمەڵێکی نەجیب و بەڕێز ئێستە دەگەن بەدڵ و گیان خزمەتیان بکەن، چونکە رەوشتی پەسەند و پایەی بوڵەند و بەرزی مقامیان و ئەندازەی نرخ و مەرتەبەیان خوا نەبێ کەس نازانێ هیممەتیان وایە کوێر چاك ئەکەنەوە، چاو ساغ کوێر ئەکات، ئیتر ئەم چەند فەرمودە تەواو ئەکات و لە چاو گوم ئەبێ بەلام ئاگری خۆشەویستی لەدڵی ملا ئەحمەددا هەڵدەکا بێ ئەوەی بزانێ ئەم لاوە کێ بو رجال الغيب[1] بو یا ئەبدال لە کوێ هات و پەیدا بو وە بۆ کوێ چو، لە پاشا حەزرەتی محمد بهاء الدين تەشریفی ئەگات، شەو خەتمی خواجەکانی نەقشبندی دەست پێ ئەکەن، وە ووشیاری خەڵك ئەکەن، کە کەس چاو نەکاتەوە،

(١) رجال الغيب وأبدال: دەستەیەکی تایبەتن لە أولياء الله.

کاتێ شۆڕشی جەزبە و ئاگری شەوق و محبەت پەرە ئەسێنێ دەنگ و ناڵەی ئەهلی محەبەت بەرز ئەبێتەوە، لەو کاتەدا پیاوێ: چاو ئەکاتەوە دەس بە جێ کوێر ئەبێ.

ئەم بەسەر هاتە ئەبێ بە شاهیدی راستی دەروێشی نەناسراو، وە ئەبێتە هۆی سەر سوڕمانی مەلا ئەحمەدی ناوبراو، بەلام مەلا أحمد لەگەڵ زانای بەناوبانگ مەلا علی تورجان دەس ئەکەن بە گەڕان بەناو خەڵکەکەدا بەڵکو ئەودەروێشە بدۆزنەوە ئەمما هەوڵەکەیان نەگەیشتە ئاکام[1] وە دەستیان نەکەوت، لە پاش چەن ماوە حەزرەتی بهاء الدین لەسەفەری پیرۆزی حەج دەگەڕێتەوە کەلە بەینی ۱۲۹۰-۱۲۹۱ی کۆچی دابوە، هەردوو مەلای شەرەفکەند و[2] مامۆستای تورجان[3] ئەچن بۆ بەخێرهاتنەوەی لە هەروامان حەزرەتی ضیاء الدین عمر ئەچێ بە پیریانەوە هەردو مامۆستاکە چاویان بەجەمالی پیر کەماڵی ئەکەوێ لەسەر وولاغەکە خۆیان فڕی ئەدەنە خوارەوە ئەڵێن ئەو گەوهەرە چەن ساڵە بۆی ئەگەڕێین ئەوا دیتمانەوە.

**ك ١٦٤:** جارێك پێش ئەوەی کە حەزرەتی شێخ محمد بهاء الدین تەشریفی لە سەفەری حەج بگەڕێتەوە بۆ هەورامان، حەزرەتی ضیاء الدین عمر بۆ پێشوازی کاکی تەشریف دەبا بۆ بەغدا لەو کاتەدا جەنابی علامەی زەمان فاضلی بەناوبانگ حاجی مەلا عبداللهی کۆیی کە بە جەلی زادە مەشهور بوە، وە پیاوێکی خاوەن شەخسیەت و بە دەسەلات وە زۆر زانا و دانا و زیرەك بە نوتق بوە، لەو کاتەدا لە شاری بەغدا لە خزمەت کوردی بەناوبانگ مفتی زەهاویدا خەریکی دواپلەی خوێندن بە پایان گەیشتن ئەبێ، ئەم زاتە خاون فەزیلەتە تا ئاخری ژیانی هەر بە

---

(١) ئەصلی کەرامەتەکە ئەوەیە کە لە چەن دەقیقەیەکدا حەزرەتی ضیاء الدین لە تەوێڵەوە گەیشتوەتە شەرەفکەند کە بەپێ ماوەی (٤) تا (٥) رۆژی بەهاری ئەبێ بۆ پیاوی قۆچاخ.

(٢) شەرەفکەند: دێیەکە لە موکریان نزیك بە مەهاباد.

(٣) تورجان: دێیەکی بەناوبانگە لە هەرێمی گەورك.

خزمەتی خەڵك و شەو عیبادەت وە بە تەواو مەعنا ناوی چاکەی خۆی بە راستی لە رووی رۆژنامەی رۆژگارا بە خەتی ئاشکرا دەرخست بوو زۆر بە بڕشت و لێهاتو بوە، تەنانەت شێخ رەزای تاڵەبانی لە باسی نەبەزی ئەودا ووتویەتی:

حاجی عبدالله لە ئادەم فیل ترە با وجودی روتبەی پێغەمبەری
ئەم بە سەد لە کۆیە دەرنەچو ئەو بە شەیتانێ لە جەنەت دەرپەڕی

ئەم زاتە زوتر لەگەڵ مەلا علی ناوێکدا دۆست وە رەفیقە قوتابی بوون، وە زۆر یەکتریان خۆش ویستوە، وە ك حاجی مەلا عبدالله شەخسێکی خوێندەوار و زانا بوە هەروا ئەویش پیاوێکی زیرەك و زانا و ژیر و هەڵکەوتو بوە، بەلام لە پاش ئەوە کە لە یەك جیا بوو بوونەوە مەلا عەلی بە تەئثیری فیوضات و بەرەکاتی أولیا بە عەشق و شەوق و جەزەبات و محبەتی ئەهلی خودا موبتلا ئەبێ وە ماوەیە بە سلوك و کەسبی مەعریفەت لە خزمەت حەزرەتی بهاء الدین‌دا خەریك ئەبێ، وە لەو کاتیشا بەردەوام لە خزمەتیا ملکەچ دەستە و نەزەری بە پێوە رادەوەستێ، کاتێ مەلا عبدالله مەلا علی ئەبینێ وە ئەیناسێتەوە، زۆر سەرسام ئەبێ کە پیاوێکی خوێندەوار و عالم و فازیل چۆن وە بۆ ئاوا گەردن کەچی شێخ محمد بهاء الدین دەوەستێ ئینجا لە پاش ئەوە لەگەڵ مولاقات ئەکەن، وە بە خۆشەیستی و محبەتەوە دادەنیشن مەلا عبدالله دەڵێ مەلاعلی من سەرم لە تۆ سوڕ دەمینێ خۆ تۆ پیاوێکی زۆر ژیر و عالم و تێگەیشتوی شێخ محمد بهاء الدین با پیاوێکی باشیش بێ بۆچی بەو حاڵە تۆ خۆت پیشان دەدەی بۆچی ئیحترامی عیلمی خۆت وە رێز لە خۆت ناگری بەڵێ ئەدەب باشە بەلام نەك بەو خەستیە، تۆیەکی هەڵکەوتوو پێکەوتو بۆ خۆت بە نزم ئەزانی، ئەم با دۆستی خودا بێ وە خۆشەویست بێ پێی ناوێ یەکجار تۆ وا لە خۆت بکەی، مەلا عەلی لە

وەلامیا ئەلّێ مەلا عبداللە ئێستە من هیچ نالّێم بەلام ئەو لەذەت و تامەی خوا بە منی چەشاندوە بە تویشی بچەژێ.

کاتێ لەو دانیشتنەدا هەلّ ئەسن وە لە یەك جیا ئەبنەوە، مەلا علی ئەچێتە خزمەت شێخی بهاء الدین عەرزی ئەکات، ئەلّێ قوربان ئەم مەلا عبداللە یە پیاوێکی خانەدان و خاوەن عیلم و فەزلە شەخسێکی لێ هاتوە پیاوێکی بەتەواو مەعنا مەردە، وە بە راستی شیرین رەوشت و لێهاتوە، حەیفە پیاوی وا لە دەس بچێ وە بەشێکی لەم بازاری مەعریفەت و روشد هیدایەتا نەبێ وە بوتلّێکی لەم شرابی میخانەی عیشقی ئیلاهیە بە گەروی گیانیدا نەچێژن لە وەلامیدا ئەفەرمون تەکلیفی لێ بکە با بێتە خەتمە.

ئەویش دەچێتەوە بۆ حوجرەکەی وە یا لە لایەکەوە دەیبینێ پێی دەلّێ کاکە خۆ تۆ هیچ زەرەر ناکەی ئیمشەو تەشریفت بهێنە لە خەتمەدا هاوبەشیمان بکە مەلا عبداللە ش ئەفەرموێ زۆر موبارەکە زیکری خودایە حازرم.

ئینجا جەنابی مەلا عبداللە خۆی لێرەدا دەگێڕێتەوە و دەلّێ شەو لە کاتێ خەتمەیان دەس پێ کرد و منیش چومە ریزی حەلقە بەگوێرەی عادەتی تەریقە چاویان لێك نا گوێم لێ بوو کە شێخ بهاء الدین بە مەلا علی فەرمو بچۆ توجهی لێ بکە هەستم کرد مەلا علی هاتە بەردەمم ماوەیە دانیشت و هەلّسا چووەوە خزمەتی عەرزی کرد قوربان (حیجابی عیلمی ئەستورە) ناتوانم توجهی لێ بکەم.

فەرمووی مەترسە موتەوەجیهی ببە دیسان هاتەوە پێ هەست دانیشت ماوەیەکی پێچو هەستایەوە چووەوە مەعزەرەتی کرد ناتوانم توجی لێ بکەم هەر بە دوای ئەوە دیم لە قولنچکێکی مزگەوتەکەوە لە شێوەی (تۆپ) قارن بەلام نوور بو هات دای بەسەر دلّما، ئەوەندە بەتین و تەوژم بوو هەستم کرد کەوتم ئیتر ئەشم زانی نە لە حەزرەتی بهاء الدین وە نە لە مەلا عەلی وە، نە بوو بەوە لەسەر خۆم چو بوم کاتێ هۆشم

هاتەوە، وەخت دێر خەتم بلاو بوبو بەلام هەستم بە حاڵی خۆم ئەکرد حاڵەتی خۆش وە لەشی سوك سۆڵ دڵیٚ پڕ لە سەفا بەتەواوی زەوق لەزەتیٚ تایبەتی روی تێکردبووم.

ئەشم زانی لە چ گوشەوە لە کام لای مزگەوتەکەوە هات هەستام بە شوێن هاتنی ئەو تۆپە نورینەدا چوم بۆ گۆشەی مزگەوتەکە دیم زاتیٚ سەری داخستوە لە موراقەبەدایە لە خزمەتیا دانیشتم سەری بەرزکردەوە حەزرەتی شاە عمر بوو فەرمووی مەلا عبداللە ئازارت پیٚ نەگەیشت؟ عەرزم کرد نەء توشی هیچ ئازار نەبووم، فەرمووی دەبڕۆ لە خزمەت کاکم تەریقەت وەربگرە منیش دەستم زیارەت کرد عەرزم کرد من لە خزمەت جەنابتی وەرئەگرم، فەرموی کاکم مورشیدە وەمنیش خادمی ئەوم عەرزی بکە با ئیجازەت بدات عەرزم کردەوە من هەر ئەبیٚ ئەو گەوهەرە لە لای خۆت وەربگرم، لە پاش زۆر لەسەر چونێکی زۆر، وە زۆر لێکردنێکی بە پاڕانەوە رازی بو کە لە خزمتی پڕ لە فەڕیا تەمەسوکم کرد.

ئینجا جەنابی حاجی مەلا عبداللە پاش ئەوە گەڕایەوە بۆ کۆیە وە شهادە و ئیجازەی عیلمی وەرگرت زۆر لە جاران بەناوبانگ تر وە پیاوێکی هەڵکەوتوی لیٚ دروست بو، وە شەخسیەتی لە هەموو لایە وە لە لای هەموو کەس دەرکەوت، وە بە چەن قات گەوهەری شەو چرای عیلمی بە شەوق تر بو، وە تیشکی خزمەتی بە موجتەمەع و کۆمەڵی موسلمانان روناك تر بوەوە، وە لە ماوەی ژیانی حەزرەتی شێخی ضیاء الدین مولانا عمردا چەند نوسراو بە نامە بە هەڵبەست و پەخشان بە کوردی و فارسی لە بەینیاندا هاتوچۆی کردوە ئەم چەن دێرە بەعزێکە وە نمونەیەکە لە هەڵبەستێکی دور و درێژی کە لە وەلامی هەڵبەستێکی حەزرەتی شا عومەردا ناردویەتەوە بۆ خزمەت شێخ بۆ هەورامان.

| | |
|---|---|
| لە رۆژێك و کە تۆم دیوە لە بغدا | دڵم داوە بە حەق واللە وباللە |
| سەلامی من چیە بۆ تۆی بنێرم | ئەتۆ شیر و شەکر من ئاوی سوێرم |
| عومەر عومرێکە گەر مەیلی لە لامە | ئەدی بۆ مەڵبەنی دەرد و بەلامە |

**ك ١٦٥:** جەنابی شێخ محمد عارفی کوڕی شێخ عبدالفتاحی برازای حەزرەتی مەولانا خالید (خوا لێیان خۆشنوود بێ) کە خەلیفە و جێگەداری حەزرەتی شێخ عومەر ضیاء الدین، ئەفەرموێ: محمد أفندی بەغایی بۆی گێرامەوە ووتی: ماوەیەك لە خزمەت شێخ ضیاء الدین خەریکی کەسب و سلوك بووم، دڵتەنگی‌یەکی زۆر رووی تێ کردم بە جۆرێ بە تین بوو پەرەی سەند بەبێ پرسی مورشیدەکەم کە حەزرەتی ضیا بوو رۆیشتم و رێگەی چۆڵ و تەنیایم گرت تا گەیشتمە باقوبە ماوەیەك لەوێ مامەوە هەواڵم زانی کە حەزرەتی پیر تەشریف ئەهێنێ بۆ ئەوێ رام کرد بۆ بەغا و نیشتەجێ بووم، بیستم کە تەشریف ئەهێنێ لەوێش رام کرد بۆ کەربەلا و نەجەف لەوێ لەگەڵ کۆمەڵێ هەرزە بووم بە هاوڕێ کە بێجگە لە خواردنەوە و قومار لەهەموو چاکەیەك بە دوور بوون، رۆژێ لە کاتی خواردنەوەدا بە منیان ووت، ئەگەر موریدی بۆچی هەر موریدێ ئەبینی ئەچی بە گژیا و بەرەنگاری ئەکەی؟ وە ئەگەر مورید نیت بۆچی لەگەڵ ئێمە تێکەڵی ناکەیت و رابوێری؟ ووتم ئەگەر لە موریدی دەرچوویم لە موسڵمانی دەرنەچووم وە حەلاڵ و حەرام هەر بۆ مورید نیە، چونکە لەسەری رۆیشتن جامێ شەرابم لێ وەرگرتن نیازی خواردنەوەیم کرد، دەسبەجێ پیری مەیخانەی خواناسی وە ساقی جامی خۆشەویستی بە لەش ئامادە بوو دەستی کرد بە لۆمە و تانە و هەڕەشە لێم و فەرمووی: ئەی سەگ ئەگەر شەرمت لە من نیە لە خوای سمیع و بصیریش ناکەیت ئیتر لەترسی توڕەیی و بەهێزی هەڕەشەکانی لەهۆش خۆم چووم، کاتێ هاتمەوە سەرخۆم لاشەی خەستەی منیان بردۆتەوە ماڵی مامم یانی شێخ محمد عارف وە هەموویان بە سەرمەوە ئەگرین، لە پاشا طەریقەتم تازە کردەوە و بە ڕاستی و دروستی روشتەی خۆشەویستی و محبەتم لەگەردنی خۆم بەند کرد، وە لە راکردن و تۆران کە شێوەی نەزان و دڵ تاریکانە تۆبەم کرد و پەشیمان بوومەوە

وایە خراپە لەگەڵ یاری مەرد تینوو ئاوی ژین پڕ بکا لە بەرد

**ك ١٦٦:** هەروەها جەنابی حاجی شێخ مەلا قادری دێوانە کە بە شێخ مەلا قادری چەمپاراو[١] بەناوبانگە وە یەکێ بوە لە خەلیفە و جێگەداری حەزرەتی شێخی ضیاء الدین ئەفەرموێ جارێکیان مەلا سەعیدی بێورەیی[٢]لە پشت سەری حەزرەتی شێخەوە وەستا بوو من لە دڵی خۆما ووتم: روو بە ڕوو لەبەردەم وەستان سوودی زیاترە هەروەك لە کاتی توجها وایە دوایی دیم رووناکی‌یەك بە ئەندازەی نیو مەتر لە لای چەپی حەزرەتی شێخەوە لە بەرامبەر دڵی موبارەکی ئەو پەیدابوو ئەو نورە منی لەکاتێ کە پێ ئاگابووم ووتم نورم دی دەست بە جێ نورەکە نەما دوای چەند دەقیقەیەك دووبارە پەیدابووەوە، چەند رۆژێکی پێ چوو رۆژێك حەزرەتی شێخ دەستی گرتم و فەرموی دەرکی نیسبەت چۆنە[٣]؟ عەرزم کرد قوربان نازانم فەرموی ئەوەی کە فلان رۆژ هاتی وە چاوت پێکەوت نیسبەت بوو ئەوە.

**ك ١٦٧:** دووبارە جەنابی ملا شێخ عبدالقادر چەمپاراو ئەفەرموێ: جارێك: لە خزمەت پیردا بووین بە شێوەی مژدە رووی تێکردین فەرمووی: حەزرەتی گەیلانی ئەفەرموێ: عمر منّی وکلّ من عنده فهو منّي یانی عمر لە منە، هەرکەس لای ئەوە ئەویش هەر لە منە.

وە جارێکی تر فەرمووی: حەزرەتی شاهی نەقشبەند گلەییم لێ ئەکات و ئەفەرموێ تۆ حەزرەتی غەوثت لە من خۆشتر ئەوێ.

---

(١) چەمپاراو: لەسەر سنوری عێراقە لە ئێرانا سەر بە فەرمنداری بانەیە نزیکی سیا گوێزە.

(٢) بێوریێ: دێیەکە لە فەرمانداری چوارتا لە پارێزگای سلێمانی.

(٣) دەرکی نیسبەت: إصطلاحێکی تصوّفە کە بە مانای هەست کردنە بە بەرەکەت و نور، یانی هەر کەس پەیوەندی تەواوی بە دەستگیرێکی راستەقینەوە بوو وە چەند هەنگاوێکی بڕی هەستی پێ ئەکا و ئەی بینێ.

نشته أم به میان دوو دلبر و دو دلم — که دل بمهر که بندم أزاین میان خجلم

له دوو دڵی لە جێ دام، لـە بـەینی دوو نیگـارم
کە دڵ بدەم بـە کامیـاب لـەم بەینە شـەرمەزارم

**ك ١٦٨:** هەروەها جەنابی مەلا عبدالقادری دێوانە ئەفەرموێ: جـارێ حـەزرەتی شێخ عومەر لە غەریبی دابوو بە هۆیەکەوە، لـە پاشـا نوێـژی إستخارەی فـەرموو کـە ئایا تەشریف بهێنێتەوە یان نا؟ کە نوێژەکەم بە جێ هێنا دیم لە لایەن حـەزرەتی (خـوای ذو الجلال) ەوە[1] نامەیـەکی تایبـەتی لـە بـارەی حـەزرەتی بهـاء الـدین و بەنـدە و شـێخ ئەحمەدی برام لـە ئاسمـان هاتـە خـوارەوە وە لـە بـارەی حـەزرەتی شـێخ بهـاء الـدینەوە نوسرابوو کە فضلی خوا دەرحەق ئەو فراوانە وە لە بارەی شێخ ئەحمەدی برامـەوە وا نوسـرابوو مەسـڵەحەت وایـە لـە بهـاء الـدینی بـرای جیـا نەبێتـەوە وە لـە بـارەی مـنی هەژارەوە وا نوسرابوو بەشێوەی فەرمانداری بچێ بۆ بیارە وە مۆرێکیان بـۆ هێنـام تیـا نوسرابوو [إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ ۞ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ ۞ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ] یا عمر الفاروق لە پاشا هەر لەو کاتەدا بە خزمەت ١٥٠ سەد و پەنجا لە مەشایخی هیندسـتان شەرەفدار بـووم کـە تـا ئـەو کاتـە بـە خزمـەتیان نەگەشـتبووم، وە ئـەوان لەجێگەیـەك دابوون کە ماڵی حەزرەتی عباس بوو خۆشنودی خوا بێ بۆ پیرۆزبایی چوونم بۆ بیارە خەتمیان فەرموو، لە کاتی قرآن خۆندنا یەکـەم ئایـەتی إنـا أعطینـاك الکـوثر یـان خۆنـد ئەمجا سوورەتی هل أتی علی الإنسان خوێند وە کۆتاییان بە دوو ئایەتەکەی إنّا أعطینـا هێنا.

جەنابی مـەلا قـادر ئەفـەرموێ عـەرزیم کـرد کەواتـە ئـەم هەڵبەسـتەی کـە جـەنابی زانای بەرز و گەورە شێخ عەلی قەرەداخی فەرموویەتی ئەوەی کـە لـەو نیـوەی دێـڕەدا ئەفەرموێ:

---

(١) خوای ذو الجلال إلهامی داناوە بۆ ئەولیا و خۆشەویستانی خۆی وەحی داناوە بۆ پێغەمبەران.

(إلهامی‌یه: شانئت[1] أبتره[2] هیچ نیه پشتیوانی) حەزرەتی پیر فەرمووی زۆربەی هەڵبەستی ئەو هۆنراوەیە إلهامی‌یە وەکوو ووتویەتی شاهی دین قطبي مبین غەوثی مەهین رەحمێکە إلهامی‌یە چونکو جارێ وام بۆ معلوم بو کە لەشم بە ناوی مبین کە یەکێکە لە ناوەکانی خوا گۆڕا، وە لە لایەن خواوە إلهام کرام ئەگەر مەیلت هەیە خۆت لە موسڵمانان ئاشکراو دیار بکە تا لە هەمووان دەرکەویت منی هەژاریش مەیلم نەکرد تا خوا بە لوطفی خۆی ئاشکراو و دەرکەوتوی بفەرموێ.

فەرمان ئەوەیە کە هەر خۆی بیکا ئەمر ئەوەیە کەخۆی بیفەرموێ

**ك ١٦٩:** وە هەروەها جەنابی ملا عبدالقادر چەمپاراو ئەفەرموێ:

جارێ حەزرەتی شێخ عمر فەرموی کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: هەر کەس تۆ ئازار بدا یا توشی گوناح ئەبێ یا تەمەنی درێژ نابێ.

وەك تۆوی قەتوونایە[3] دڵی مەردی خودا تا
نەشکاوە دەوا بێتو شکا ژارە لە زکتا

**ك ١٧٠:** سەر لە نوێ شێخ مەلا قادری چەمپاراو فەرمووی: یەکێ‌تر لە فەرمایشتی پیر ئەوەیە کە ئەفەرموێ: لە زەمانی حەزرەتی شێخی سراج الدین‌ی باوکیا حەزرەتی شێخ عمر بە خزمەت رسول الله ﷺ شەرەفدار ئەبێ فەرمووی: جێ و بانی خۆی بەم بێچارە بەخشی و فەرمووی ئەم رایەخە جێگەی خۆمە تۆ لەسەری دانیشە خۆی تەشریفی موبارەکی هەستا ئەم شەرمەزارەی لەسەر جێگاکەی خۆی دانا لەو

---

(١) شانئ: نا حەز و نەویست.

(٢) أبترە: بێفەڕ و وەجاخ کوێر.

(٣) قەتوونا: گیایەکە تۆوەکەی پێ ئەوەی بیشکێنی بۆ دەرمان بەکار دەهێنرێ بەڵام ئەگەر شکا خواردنی سەمە (زەهر). أعاذنا الله من معادات الأولیاء.

کاتەدا ڕوو بە قیبلە لەسەر ئەم جێگەیە سەرم نایە سوجدە وە ئەم ووت اللّهم حبّ النبيّ اغفر لي وە جارێ ئەمگوت یا ربّ حبّ النبيّ اغفر لي[1].

دیسان ئاشێکی پێ بەخشیم فەرمووی ئەم ئاشەماڵی خۆمە بۆ تۆ بێ.

**ك ١٧١:** کۆمەڵێ لەوانە کە هەریەکەیان بەتەنیا جێگەی بڕوایە گێڕایانەوە کە: جەنابی شێخ عەلی قەرەداخی (خوا لێ خۆشنوود بێ) لەکاتی فەقێیەتیدا کاتێ کە عیلمی کەلام ئەخوێنێ بە قسەی گومڕا و سەر لێتێکچوەکان ئەکەوێتە خەتەرەو خەیالاتەوە، تا وای لێ دێ هیچ بڕوای نامێنێ وە لە ئایینی پاکی ئیسلام بێ بەش ئەمێنێ، وە لەبەر چاوی خەڵکا بە بێ دەست نوێژ نوێژ ئەکا تا کاتێ ڕشتەی کامەرانی و بەختەوەری ڕای ئەکێشێ بۆ بنکەی ڕانومای ڕاستەقینە وە ئەکەوێتە باخچەی کامیابی بۆن خۆشان بە نوری ئیمان و خواناسی ئەگاتە مەنزڵگای غەوثی زەمان حەزرەتی شێخ عەومەری ضیاء الدین لە کاتی ئێوارەدا لە ڕووی تاقیکردنەوە و بێ باوەڕی‌یەوە ئەچێتە خەتمەوە، وەختێ حەزرەتی پیر لە بەردەمیا دائەنیشێ ئەبینێ ئاگری کوفر و بێ باوەڕی لەدڵیا بڵێسەیەتی وە بێ بەشە لە نوری ئیمان، خێرا حەزرەتی پیر هەڵ ئەستێ وە بە پەژاری و خەمناکی‌یەوە لە جێیەکەوە دائەنیشێ، ئیتر ئەو شەوە توجە لەکەس نافەرموێ لە دوای خەتم شێخ علی عەرزی ئەکات قوربان چیت دێ؟ ئەفەرموێ یا خوا ئەوەی لە دڵی تۆدایە لە دڵی هیچ موسڵمانێکا نەبێ عەرزی ئەکا ئایا چارەی هەیە یا نا، ئەفەرموێ ئەگەر بە گوێم بکەی بۆ لە ناوچوونی هەوڵ ئەدەم ئەمجار تمسّك ئەکات و طەریقەت وەرئەگرێ وە ئەیکا بە هاوڕێی کوڕانی عەزیز و خۆشەویستی خۆی وە بە ماوەیەکی کەم نوری ئیمان و باوەڕ لە دڵیا جێی تاریکی و

---

(١) جەنابی ملا یوسفی مەجمەر لە ژێر ئەو نووسینەی کە لە بەینی دوو کەواندا نووسیویەتی ئەمە دەست و خەتی موبارەکی حەزرەتی ضیایە بە دەست خەتی پیرۆزی خۆی ڕاستی کردۆتەوە لە کاتی تەماشا فەرموونیا کە لە کەرامەتی ژمارە (٣٧) دایە. (دانەر).

پەستی کفر و بێ دینی ئەگرێتەوە جاء الحقّ وزهقَ الباطل لە پاش ماوەیە حەقیقەتی رابیطەی لێ ئاشکرا ئەبێ[1] وە بەدەردی عیشق و ئەوینەوە گرفتاری ئەبێ، وە خەریکی دانانی هەڵبەست و هۆنراوە ئەبێ، لە کاتێکا کە لە عیلمی بەلاغە کتێبێکی مطوّل ئەخوێنێ ئەفەرموێ چەند باسێکم لەو کتێبە لە خزمەت رابیطە سوود وەرگرتوە.

**ك ١٧٢:** جەنابی شێخ مەعروفی نەرگسەجاری[2] کە یەکێکە لەزومرەی سادات و جێگەداری حەزرەتی شێخ و وەرگێراوی ئەم ئاستانەیە فەرموی:

شەوێ من لە خەتمەدا بووم لەوپەڕی خانەقاوە، وە حەزرەتی شێخ لە پەڕێکی ترەوە دانیشتبوو، بە چاوی سەر دیم یەکێ لە تاقەکانی خانەقا بوو بە حوجرە وە کۆمەڵێکی بە سام و هەیبەت لەو حوجرە دانیشتبوون، وە حەزرەتی شێخی ضیا چرایەکی داگیرساوی بە دەستەوە بوو، چووە ناویان و گفتوگۆیان دەست پێ کرد وام زانی کە پرس و ڕا لە فرمانێکا ئەکەن سام و ترسێکی زۆرم لێ نیشت و هەستام و چوومە لایەکی تری خانەقاوە، تەماشام کرد حەزرەتی شێخ هەروا لە جێی خۆیا دانیشتوە، لە دوای دوو ساڵ بەسەر ئەم بینینەدا تێ پەڕبوون حەزرەتی شێخ نامەیەکی بۆ ناردم فەرموو بوی بەو نیشانە کە فلان شەو فلان تاق بوو بە حوجرە، وە کۆمەڵێکی بە سام لەو حوجرەدا دانیشتبوون وە منت دی لەوێ لە ئیشێکا پرس و ڕایان ئەکرد فلان ئیش وا بکات.

---

(١) حەقیقەتی رابیطەی لێ ئاشکرا ئەبێ: یانی بە چاوی دڵ بینینی حەزرەتی شێخ کە ئەویش لە پاش بڕینی چەند هەنگاوێ ئەبێ.

(٢) نەرگسەجاڕ: دێیەکە لە دەربەندی خان لەوبەری سیروان سەر بە پارێزگای سلێمانی‌یە بەرامبەر چنارەیە.

ك ١٧٣: دیسان جەنابی شێخ مارفی نەرگسەجاڕ ئەفەرموێ: چووم بۆ زیارەتی حەزرەتی گەیلانی خۆشنودی خوا بێ لە کاتی زیارەتا بێخودیم بەسەراهات وە بە خزمەت حەزرەتی غەوثی گەیلانی گەیشتم هەندێ مژدەی دەرخست یەکێ لەوانە ئەوەبوو فەرمووی: مژدە بدە بە شێخ عومەر تا دێر زەمان لەسەر تەختی ئیرشاد پایەدار ئەبێ وە یەکێ تر لە مزگێنیەکانی ئەوەبوو فەرمووی ئەگەر ویستت إجازەی طەریقەتی بە نرخ و پایە بڵند وەربگری لە شێخی حەلقە، عومەر جێگەدار و نائیبی منە، کە گەرامەوە لە دوای دوو ساڵ حەزرەتی پیر جەنابی شێخ عومەر رای سپاردبوو فەرموبوی بەو ناونیشانە کە لە بەغا بە خزمەت حەزرەتی غەوسی زەمان گەیشتی و من لە پشت سەریەوە وەستا بووم منت نەدی ئەم مژدانەی پێ دایت فلانە فرمان و کار بەم جۆرە بکە.

ك ١٧٤: دیسان جەنابی شێخ مارفی نەرگسەجاڕ فەرموێ:

جارێك لەگەڵ ئەنجومەنی بەگزادەکانی جاف دانیشتبووین، حەزرەتی شێخ ئامۆژگاری بۆ ئەفەرموون، وە منی بێچارەش خەریکی فەرمانی طەریقەتی خۆم بووم، لەو کاتەدا بێ خودیەك هات بەسەرما دیم حەزرەتی شێخ وەکوو جبریلی ئەمین دەستی میهرەبانی لە کەمەر بەندی ئیخلاصم توند کرد، وە لە خزمەت خۆیا لە پەستایی و نەوی زەمین بە سواری بوراقی ویلایەت لە بیت المقدسی هیدایەتەوە بە ئەوپەری بەرزایی عەرشی گەیاندم والذي لا تأخذه سنة ولا نوم بە لا ژووررووی وسع کرسیه السموات والأرض چەند تەختی لاهوتی بەهێزی پێی ناسووتی وە چەندەها تارای رووناکی و تیشکداری وە باقی پەردە و تارای مەلەکووتی تری بە من طەی کرد تا بە پایەی نەبوونی وە تارای بێ تارایی گەیشتین، لەوێ منی بەجێ هێشت وە خۆی بۆ سەر تر تەشریفی برد تا بە لەشی موبارەکی لە بەرچاوا نەما.

بۆ بەجێم یەڵی!!! ئەی یاری گیانی خۆ من دڵسۆزم بۆ خۆت ئەزانی
فەرمووی لەمەو ژوور ئیتر تۆ مەیە چونکە تو ماوەت تا ئێرە هەیە
گەر یەك سەرە موو سەرکەوێ سەرت بە نوری خوا ئەسووتێ پەڕت

لە پاش ماوەیە تەشریفی گەڕایەوە بۆ لام کەمەری گرتمەوە و فەرمووی هەستە با بڕۆینەوە بۆ جێگەی خۆمان.

تا نە بووری تۆ لەسەر ڕێ ناخەیە مەیدانی عەشق
سەر لە پێشی پێ ئەبێ لەم ڕێگەدانێی ئەوەڵا

وە هاتینەوە شوێنی خۆمان، کە چاوم کردەوە دیم حەزرەتی شێخ لەگەڵ دانیشتوانی حازری حزوریا گفتوگۆ ئەفەرموی[1]:

لەم گێژا کە شتی گوم بوو بە هەزار تەنیا یەك پارچەی نەکەوتە کەنار

---

(١) هەر لەم بارەیەوە جەنابی زانای بەرز و پایە بڵند و بەناوبانگ مدرسی بیارە مەلای گەورە ملا عبدالقادر ئەفەرموێ: چەندەهاجار لە خزمەت حەزرەتی شێخابووین بینیوە بە ظاهیر بەشتێکی ترەوە خەریك بوە و لە باطینا منی هەژاریشی بردۆتە ژووررووی عەرشەوە لە کاتێکا کە من مشغوڵ بووم بە ئیشی خۆمەوە لە طەریقەتدا.
خاوەنی کتێبی شمس العقائد جەنابی بەڕێز شمس الأشراف ی قورەیشی، تەعریفی حەزرەتی ضیاء مەلای بیارە ئەکات ئەفەرموێ:

مەرحومی مەلا مەولانا قادر عالم بە علوم باطن و ظاهر
لە بیارەی شەریف بە جەمعێ بێ باك دەرسی ئەفەرموو تشریح الأفلاك
ووتی من هەر بەم کلاش و پاوە ئاسمانانم گشت داگەوەپاوە
بۆ ئەوجی ئەفلاك من هەڵبڕیاگم بە لوتفی پیرم هەموو گەڕیاگم
تشریح الأفلاك مەخوێنن چیە ئەوزاعی ئەفلاك هیچی وانیە
پیری ئەو عمر لێت مەجهول نەوێ پیر کە کامل بوو مورید وادەوێ

ك ١٧٥: جەنابی مدرسی بیارە ملا عبدالقادری علامە ئەفەرمویْ:

جارێك حەزرەتی شێخ فەرمووی: بە خزمەتی حەزرەتی رسـول الله ﷺ شـەرەفدار بوم تەماشام کرد تاجێکی بە دەستەوە بوو ئەمری پێ فەرمووم:ئەم تاجە بگرە وە هـەر چوار دەوری بنەخشێنە یا بچـنە بـە لـولاك لـولاك لما خلقـت الأفـلاك مـنی هـەژاریش لەسەر فەرمانی ئەوان وە (بەندە فەرمانی) قبـوڵم کـرد، وە لـەو کاتـەدا وام ئـەزانی کـە ئەو حەزرەتە ﷺ بـە أحمـد رسـول الله بەناوبانگـە، بـە هـۆی زۆر لـیْ سـەندنی شـۆڕی شەوق و مەستی ئەو لوطف و بەخشندەیی‌یەوە بە ئاگا هاتم، سەر لـە نـویْ چـوومەوە باری پێشوو بە خزمەتی شەرەفدار بوومەوە بەڵام ئەمجارە ئەو حەزرەتە بە محمد رسول الله ﷺ بەناوبانگ بوو، جاری سێیەم بە خزمەتی دایکم گەیشتم وە هـەر لـەو شـەوەدا بینیم کە نانەوای تایبەتی خانەدانی فەخری عالەمە ﷺ وە ئەم دایکەی منە کە سید بـوو لە ماڵی حەزرەتی أبو بکری صدیق (خوا لیْ خۆشـنوود بیْ) دروسـتی ئەفـەرمویْ، وە وام ئەزانی کە نیشتەجێی شاری مدینەی منورەیە وە[1] هەموومان ڕێزە خـۆری خـوانی فەخری عالەمین، وە دیم دایکم دەستی هەویراوی‌یە، لـەو کاتـەدا لـە دەرگـای مـاڵی پێغەمبەرەوە بە دەستی هەویراوی‌یەوە هاتە دەرەوە، ووتم دایکە برسیمە فـەرموی نـانم کردوە بردوومەتە حضـوری حەزرەتی ئەڕۆم دەستم ئەشۆم و نانت بۆ ئەهێنم لە پاشا بەو پەڕی خۆشەویستی و میهرەبانی‌یەوە فەرمووی: ئەی کوڕی خۆم شوکری خوا بـە جیْ ئەهێنم سوپاس بۆ خوا کە حەزرەتی رسول الله ﷺ لەگـەڵ تـۆدا لـوطفی هەیـە وە زۆر دەرحەق بە تۆ میهرەبانە.

چـەخەمی لـە ئـاور ئومـەت کـە تـۆ بیْ پشتیـوانی
باکیـان چی‌یـە لـە گێـژاو، کـە نـووح بیْ کەشـتیوانی[2]

---

(١) مەدینەی منورە: شاری رووناکی، شاری پێغەمبەر ﷺ.

(٢) چە غم دیوار أمت را کە باشد چون تو پشتیبان    چە باك أز موج طوفان را کە باشد نوح کشتیبان

**ك ١٧٦:** جەنابی حەزرەتی شێخ نجم الدین کوڕی موبارەك و شیرینی حەزرەتی شێخ عومەری ضیاء الدین ئەفەرمویٚ:

جاریٚ لە خزمەت باوکی پایەداری خۆما کە تەشریفی ئەفەرمو بۆ ناوچەی جوانڕۆ بە لای گۆڕستانێکا تیٚ پەڕین، حەزرەتی ماوەیەك راوەستا و روانی بۆ لای قەبرەکان کاتیٚ گەیشتینە مەنزڵ، حەبیب بەگی فەرمانڕەوای جوانڕۆ هات بۆ زیارەتی حەزرەتی شێخ، جەنابی باوکم رووی تیٚ کرد و فەرمووی: ئەی حەبیب بەگ یەکیٚ لە مردوەکانی ئەو گۆڕستانە بە بەرگ و پۆشاکی خوێناوی‌یەوە شکاتت لیٚ ئەکات، حەبیب بەگ دەستی کرد بە گریان و چۆنیەتی ئەو بەسەرهاتەی باس کرد ووتی ئەو یەکیٚ بوو لە دەس و پێوەنی خۆم بەهۆی ئێشێکەوە کوشتم دیسان فەرمووی: رۆحیانەتی ئافرەتێکی مەنیجە ناو حازرە نیشانەکەی ئەوەیە کە خاڵێك بە لای رومەتی‌یەوەیە لەخێڵی باوەجانی‌یە وە بەسەر منالەوە رۆشتوە، شکات لە ئامۆزاکانی ئەکات کە ماوەیەکی زۆرە مردوە، ئەوانی میراتگری ماڵەکەی بوون لەو ماوەیەوە تا ئێستا هیچ خێر و چاکەیان بۆ نەکردوە دەس بە جیٚ حەبیب بەگ دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە و گەڕان بە دوایانا، وە ئامۆزاکانی دۆزیەوە و بانگی کردن، وە پرسیاری لیٚ کردن کە چەند ساڵە ئەو مەنیجەیە لە دنیا دەرچوە، ووتیان ٢٢ بیست و دوو ساڵە وە حەزرەتی شێخ چۆنی فەرموە راستە و وەهایە.

**ك ١٧٧:** دیسان جەنابی حەزرەتی شێخ نجم الدین (قدس سره) ئەفەرمویٚ کاتیٚ ملا عبدالحکیمی لاجانی شەرفدار بوو بە زیارەتی حەزرەتی شێخی باوکم وە بوو بە موریدی ئەو زاتە توجهێکی فەرموو لێی وە پێی فەرموو: ئەثەریٚ لە دڵی تۆدا ئەبینم نیشانەی ئەوەیە کە بە خزمەت حەزرەتی رسول الله ﷺ گەیشتویت ملا عبدالحکیم دانی پیا نەنا ووتی: منی بیٚ قەدر و نموو کەی رایەی ئەوەم ئەکەویٚ کە بە خزمەت حەزرەتی رسول الله ﷺ بگەم، حەزرەتی شێخ فەرموی بیر بکەرەوە، لە دوای بیر لیٚ

کردنەوەیەکی زۆر عەرزی کرد، بەڵێ لە تەمەنی ١٥ پانزە ساڵیدا بووم جارێ: لە خەوا بە شەرەفی دیداری رسول الله ﷺ بەهرەوەر بووم ئەو کاتە حەزرەتی شێخ چۆنیەتی خەوەکەی باس فەرموو ئەویش تەصدیقی کرد.

بـــە خـــاکی پێی ئـــەو ناگـــا دەسی کـــەس

بـــە خـــەو بی بیـــنم بـــۆ مـــن بەســـە بـــەس

**ك ١٧٨:** دوبارە حەزرەتی شێخ نجم الدین خۆشنوودی خوا بێ ئەفەرموێ جارێك لە ناوچەی هۆرێن لە خزمەت حەزرەتی شێخا بووم، هەمیشە چاوەڕوانی توجهات و نیگای پیرانەی بووم، توجهێکی لەم گیان فیدایەی فەرموو:

لەو کاتەدا ئارەزووی دڵم ئەوە بوو، لە کاروباری دنیا خاڵی و دڵم هیچ بەدنیاوە نیە وە هیچ داوای پلە و پایەی ئەولیام نیە، تەنیا ئەمەم ئەوێ هیممەت بفەرموون نەخت و مایەی ئیمان بە سەلامەت دەربەرم وە ئیمان بە پاکی و بێ گەردی بە خوا بگەیەنم وە لە رۆژی دوایی لە رووی سەرمایەدارانی سەعادەت و بەختەوەریدا لە ژێر باری شەرمەزاری و خەجاڵەتیدا نەبم بە جێی تانە و لۆمە، خێرا لە وەڵامی ئەم خەتەرەیەی مندا ئەم دێرە هۆنراوەی فەرموو کە ئەمە کوردیەکەیەتی:

خولامی هیممەتی ئەو مەلە بن ئەم چەرخە رۆژ و شەو

لە هەرچی رەنگێ پەیوەندی بە خۆی بگرێ بەری بێ ئەو(١)

وە لە دوای ئەو فەرمایشە ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە [يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ] وە ئەم خولامی خۆیە کرد بە جێگەی سوپاس گوزاری و هیواداری.

---

(١) ئەمە دەقی شیعرە فارسیەکەی حەزرەتی ضیایە:

غلام همت انم که زیر چرخ کبود — زیر چ رنگ تعلق پزیرید ازاد است

**ك ١٧٩:** دیسـان حـەزرەتی شـێخ نجـم الـدین خۆشـنودی خـوا بێ ئەفـەرموێ: حەزرەتی شێخ تەشریفی فـەرموو بۆ شاری سنه من لـه خزمەتیا بـووم لـەو کاتـەدا جـەنابی مـلا عبدالمجیـدی خـەڵکی نـەیر کـوڕێکی نـەخۆشی هـەبوو هێنایـه خزمـەتی و داوای شفا و چاك بوونەوەی فەرموو، عەرزی کرد نەخۆشی‌یەکەی بەم هۆیەوە بووە جـاری پشیلەیـەك هەڵمـەتی بـۆ بـردوە و ترسـاوە، فـەرموی هـەڵی گـرن ببیەنـەوە بـۆ ماڵەوە، إن شـاء الله سـەگێکیش هەڵمـەتی بـۆ ئـەبات، کـاتێ کـه بردیانـەوە بـۆ ماڵـەوە پارچـەیەك گۆشـتی ئـەدەن بـه دەسـتەوە، کـوت و پڕ سـەگێ پـەلاماری گۆشـتەکەی دەستی ئەدات ئەقیژێنێ و بێهۆش ئەکەوێ، کاتێ هۆشی دێتەوە به بـەرا کوڕەکـه چـاك ئەبێتەوە، ئەم کەرامەتی حەزرەتی شێخه ئەبێته هۆی بڕوا پـەیا کـردنی ئـەو خەڵکـه لـەو ناوچەیه و پەیدابوونی خۆشەویستییان بەم زاته پیرۆزە.

**ك ١٨٠:** جـەنابی حـاجی أحمـدی عـەرەب[1] کـه خـەڵکی سـوریایه لـه ناوچـەی خۆیان به فرمانی هەندێ له مەشایخی ئەم طەریقـەتی پـیرۆز و پڕ فـەڕی نەقشبەندی‌یـه نگینی ئیرشادی درایه دەست، له پاش ئەوە کـه حـەزرەتی شـێخ عومـەر بـه کەمەنـدی مەعنەوی خستی‌یه ژێر سایەی خۆیەوە، وە ماوەیـەك سـلوکی کـرد، ئـەمجا لـه لایـەن پیری ناوبراو پایەی جێگەداری و خەلافەتی وەرگرت، وەرگرتنەکەی هۆی دڵخـۆشی و شادمانی بوو بۆی ئەم پیاوە موبارەکه بۆیێ گێڕاینەوە فەرمووی: کاتێ وەك دێوانه له وولاتی خۆم دەرچووم و زەحمەتی ڕێگەم خسته سەر شـانم هـەر مـەنزڵێ ئـەهاتین بـەم لاوە بـاسی کـەراماتی حـەزرەتی شـێخ عومـەرمان ئـەبیست، وە دەم بـەدەم کـەراماتی

---

(١) حاجی أحمدی عەرەب باوکی جەنابی شێخ عومەر و شێخ عبداللەی دێرەزورە کـه خـاڵی راستەقینەی کاکه شێخ أمین و کاکه شێخ ثابت و شێخ مظهری بەڕێزن که له پاشا باسی دێته پێشەوە که بـرای شـاهی عوسمان گیانن خوا ڕێزو قەدریان زیاتر کات.

حەزرەتی شێخ بۆ من ئاشکراتر ئەبوو، تا لە دواییدا لە دێی بیاوێڵە[1] چاوی پڕ ئێشم بە پرتەوی جەماڵی ئەو زاتە پایە بەرزە بە نیعمەتی تەندروستی دڵ و گیان بەهرەمەند بوو، ڕۆژێ گوێمان لە فەرمایشە جوان و پڕ فەڕەکانی گرتبوو، کە حەزرەتی شێخ عمر باسی کەرامات و دەسەڵاتی ئەولیا و خۆشەویستانی خوای ئەفەرموو منیش لەو کاتەدا عەرزم کرد: یا سیّدي قال الإمام الربانی لو توجّهتُ إلی الشجرةِ الیابسة لأخضرّتْ لە وەڵاما فەرموویان قال الإمام ذلك ولكن ما توجّه, ونحنُ توجّهنا فآخضرتْ.

یانی قوربان حەزرەتی ئیمام فەرموویەتی ئەگەر توجە بکەم و نیگاهێ بخەم بۆ درەختێکی ووشك سەوز ئەبێتەوە، حەزرەتی شێخ عمر فەرمووی، ئیمام فەرموویەتی بەڵام توجهی نەفەرمووە، بەڵام ئێمە توجهمان کرد و سەوز بوەوە[2]، عەرزم کرد ئەو درەختە کامەیە؟ کە بە توجّە سەوز بۆتەوە، فەرمووی: دەرختێکی نارەوەن بوو لە لای چەپی بەردە نوێژەکانی بیارەوە ووشك بوو بوو توجّهم لێ کرد دووبارە سەوز بوەوە، حەزرەتی شێخ ئەم فەرمایشتەی تەنیا لەگەڵ حاجی ناوبراو فەرموو بوو.

ژیــــانی دیســــان ئەچــــێتەوە بــــەر
تــــەڵقینی مــــردوو ئــــەو بکــــا ئەگــــەر

---

(١) بیاوێڵە: دێیەکە لە نزیك هەڵەبجە لە سەروی عەواوەیلێ لە پارێزگای سولەیمانی.

(٢) ئەم بەسەرهاتە بەم جۆرەیە: چەن ساڵێ لە مەو پێش دیمان ئەم دارە نارەوەنە لە دوا مانگی بەهارا ووشك بوو گەڵاکانی هەڵوەری، دوای ماوەیەك پەژاری و خەمباری بۆ سێبەر و کەڵك و سودی سەر لە نوێ گەڵای سەوزی دەرکردەوە دوای ماوەیەك حەزرەتی شێخ فەرمووی گەڵای ئەم دارە و نوستن لە سەر ئەم بەردە شفای لەرز و تایە چونکە کاتێ ئەم درەختە ووشك بوو بوو گەورەیەك توجهی لێ کرد و سەوز بوەوە، بەڵام نەزانرا ئەو گەورەیە کێ بوو، کە حاجی أحمد ئەم کەرامەتەی گێڕایەوە دەرکەوت کە ئەو زاتە حەزرەتی ضیا خۆی بوە.

ك ١٨١: جەنابی حاجی شێخ محمد أمینی بوخارایی[١] ئەفەرموێ:

لە شاری بوخارای پیرۆز برایەکم هەبوو لە کار بەدەس و نزیکانی فەرمانڕەوای ئەو وولاتە بوو، وە خاوەنی ڕێز و دەسەلات بوو، ئەم دادگەر و حاکمەی ئەو وولاتەی ئەبرد بەڕێوە لەگەڵ براکەی خۆی دوژمنایەتی پەیدا کرد و لە وولات براکەی خۆی دەرکرد.

پاش ماوەیە ئەم حاکمە و فەرمانڕەوایە کۆچی دوایی کرد و تەختی بەختی سەرەو ژێر بوو بە بڕیاری هەموویان برای ئەم حاکمەیان هێنایەوە لەو دەربەدەری یە لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دایان ناو کردیان بە دادگەر و حاکمی بوخارا لە جیاتی خوا لێ خۆشبوو ئینجا کە فەرمانی وولاتی کەوتە دەس داخی دەربەدەری پێشووی کە بە هۆی چەند کەسێکەوە کە لە لای براکەی دوو زمانیان کردبوو هانی دا بۆ تۆڵە سەندنەوە لێیان وەهەموویانی گرت و لە تەنافی تووڕەیی دان و بێ سەری کردن، وە ڕەوانەی شاری خامۆشانی کردن کە یەکێ لەوانەی براکەی من بوو، حاجی شێخ محمد أمین ئەفەرموێ من لەو کاتەدا لە دەرەوەی شار بووم بەو هۆیەوەی کە ئەم کۆسپە هاتبوو بە سەرمانا من بە هۆی براکەمەوە بە تاوانکار لە لای دادگەری تازە درابومە قەڵەم، دایکی بەڕێزم کوڕێکی خۆم و برازایەکم و کۆمەڵێ پارەی نەختینەی بۆ ناردم وە ڕای سپارد ئەگەر لەم وولاتە سەری خۆی دەرنەکات سوارەیەکی زۆر وان لە گەڕاندا ئەگەر بیگرن بێ سەری ئەکەن خێرا منیش برازاکەم و کوڕەکەم هەڵگرت و

---

(١) بوخارای شەریف: بۆیە پێ ئەووترێ بوخارای پیرۆز چونکە ئەم شارە مەڵبەندی بوزورگەورانی ئاینی بوو چە لە بارەی علومی ظاهر وە چ لە بارەی علومی باطن, یەکێ لە زانایانی ظاهر خاوەنی حدیسی بوخاری‌یە کە جەنابی عالمی بەڕێز و پایە بڵند محمدی کوڕی إسماعیلی کوڕی إبراهیمی بوخاری‌یە لە دوای قورئان یەکەم سەرچاوە و جێی بڕوایە بۆ وەرگرتنی أحکامی دینی، وە یەکێکی تر لەوان حەزرەتی شێخ محمدی بوخاری‌یە کە بە شاهی نەقشبەند بەناوبانگە وە سەربەخۆبوە لە طەریقەتی موبارەك و پیرۆزی نەقشبەندیدا.

رووم کرده وولاتی بەڵخ بۆ خزمەت جەنابی[1] بەڕێز شێخ محمدی بەڵخی[2]، بە هۆی پەیوەندییەکەوە کە هەر لە کۆنەوە لە بەینمانا بوو.

وە بۆ کەوتنە رێ لە بوخاراوە بۆ شاری بەڵخ ئەبێ رووباری جەیحون بپەڕدرێ لە بەینیانا، بەلاّم ئێمە رێگەی پاپوڕمان وون کرد و سەرمان لێ تێکچوو لە پەلەپەلی خۆمان و سەختی کاتەکە، وە کۆمەڵێ سوار کە نزیکەی ۳۰ سی کەسێ ئەبوون کەوتبوونە گەڕان بە دوامانا، ئا لەم کاتە سەختەدا لە ترسی خۆمان و ویردی یا مغیث یا مغیث مان ئەخوێند کت و پڕ تەماشامان کرد ریش سپی‌یەکی نورانیمان لە دوور بەدی کرد بە شێوەی رێ پیشاندەر وەستا بوو بە دەستی پیرۆزی خۆی ئیشارەی فەرموو کە لێرەوە وەرن ئێمەش بە دوای ئەوا رۆیشتین تا گەیاندینی‌یە کەشتی ئیتر لە ئێمە وون بو، ئێمە ئەومان بە حەزرەتی خدری زیندە ئەزانی، کە گەیشتینە ناو کەشتی‌یەکە گەمێوانەکەمان لە حاڵی خۆمان ئاگادار کرد، لەو کاتەدا سوارەکان گەیشتن، وە داوایان کرد لە گەمێ وانەکە کە ئێمە بهێننە دەرەوە، بەلاّم ئەوان بەزەییان پیامان هاتەوە و گوێیان نەدانێ وە بە مەرامی ئێمە کەشتی‌یان خستە رێ، وە ئەوان بە ناکامی گەڕانەوە کاتێ گەیشتینە بەڵخ وە بە شیرینی رەفاقەت و هاوڕێیەتی شێخ محمدی بەڵخی تەڵخی سەفەرمان لە بیرچووەوە باسی بەسەرهاتی رێگەمان لە خزمەتیا باسکرد و فەرمووی ئەو رێ نیشاندەری لێ قەوماوانە ئەو خەزنەداری فەڕ و بەرەکاتی خوایی‌یە وە ئەو فەریاد رەسی رێ لێ تێکچووی دەشت و دەری نامرادی‌یە (حەزرەتی شێخ عومەری کوڕی شێخ عوسمانی سراج الدین)ە لە

---

(۱) ئەم کەرامەتە یەکێکە لەو سێ کەراماتەی کە حەزرەتی شێخ عمری ضیاء الدین (خوا لێ خۆشنوود بێ) بە دەست خەتی خۆی لە ژێریا نووسیویەتی.

(۲) حەزرەتی ضیاء الدین (قدس سره) بە خطی مبارەك و پیرۆزی خۆی لە ژێر ئەم حیکایەتەدا ئەمەی نووسی بو: شێخ محمد بەڵخی کە چوو بۆ طرەفی حیجاز و گەڕایەوە لێرە لە بیارە ماوەیە پاش وەرگرتنی طەریقەت مایەوە، وە لە لایەن ئێمەوە مأذون کرا بە تعلیمی طەریقەتی طالبانی رێی خودا (شێخ محمد لەساڵی (۱۳۰۰) هیجریدا چوە حیجاز)

بیارەی هەورامان لە وولاتی کوردستانی عێراقە ئێمەش ئاگری شەوق و محبەت و خۆشەویستی لە تەنوری دەروونمانا بڵێسەی سەند وە لە ڕێگەی قەندەهار و خوراسانەوە هاتین تا بە ئاستانەی پیرۆزی دڵشاد و بەهرەوەر بووین، کە گەیشتینە خزمەتی لە دڵدا ووتمان ئەگەر حەزرەتی شێخ عومەر لەم کۆڕەدا بێ جیا ببێتەوە لەوان وە دڵخۆشی ئێمەی دەربەدەر بداتەوە، وە میهرەبانیمان لەگەڵا بنوێنێ، دیارە کە ڕێ پیشاندەری ڕووباری جەیحونیش هەر ئەو بوە.

دڵ ئەگەر بێنێتە جێگە شۆخی شیرازی دڵ بەند
بە خاڵی ڕووی ئەبەخشم بوخارا تا سەمەرقەند(۱)

کوت و پڕ ئەو زاتە پڕ لە بەرەکاتە تەشریفی لە جێگەی خۆی هەستاوە چەند هەنگاوێ بە پێشوازیمان تەشریفی هێنا وە دەستی لوطف و خۆشەویستی کردە ملمان، کاتێ دانیشتین لە خزمەتیا هەموو بەسەرهاتی بە بێ کەم و زیاد چۆن لێمان ڕوودرابوو هەر لە بوخاراوە تا ئەوێ بۆی باس فەرمووین و فەرمووی ئەگەر من فریاتان نەکەوتمایە سوارانی دوژمن بێ سەریان ئەکردن، حەزرەتی شێخ ئەم حیکاتەی خۆندوەتەوەوە لە ژێریا نوسیویەتی بە خطیّ خۆی(۲).

لەناو عاشقان ڕێگەیەکی جوێ — شارەزان بێجگە لە ڕێی چاو و گوێ
ئەبیەن ئەبیسن بە بێ گوێ و بێ چاو — ئاگاداری گشت عالەمن تەواو
جیهان ئەگەڕێن بێ زەحمەتی پێ — بێ باڵ دەرئەچن لە جێ تا ناجێ

(۱) خواجەی حافظی شیرازی خوای تعالای لێ بێ ڕازی ئەفەرموێ:
أگر ان ترك شیرازی بدست ارد دلی مارابخال هند ولیش بخشم سمرقند و بخارا.
(۲) ئەم شێخ محمدە سەفەری عەرەبستانی بۆ حیجاز لە ساڵی ۱۳۰۰ هیجریدا کردوە، وە لە طەرەف ئێمەوە بە خلیفە کراوە.

**ك ١٨٢:** جەنابی حاجی حمه صالح خەڵکی شاری سلێمانی وەرگیراوی بوزور گەوارانی تەریقەتی نەقشبەندی پایە بەرز ئەفەرموێ:

له سەفەری حیجازدا بووم کاتێ وەستان لە کێوی عەرەفات لە حاجییەکانی هاوڕێم به جێ مابووم وه لەوپەری تینوویەتیدا بووم کتو پڕ ٣ سێ کەس که بەرگ و کالاّیان لەخەڵکی مەهاباد ئەچوو پەیدا بوون ووتیان بۆچی بەجێ ماوی مەگەر لەبەر تینوویەتی هێز و توانای رۆیشتنت نەماوە؟ لەو قاپەی کە پێیان بوو بە ئاوی خۆیان تێراویان کردم وه هەتا چادری برادەرەکانم لەگەڵما هاتن لەبەر پەرێشانی خۆم بیرم لەوه نەکردەوه کە ئەگەر ئەمانە أولیا و پیاو چاك نین لە کاتی ئیحرامدا چۆن بە بەرگی عادەتی‌یەوه ئەبینرێن، حاجی چۆن لەو وەختا ئەو جۆرە پۆشاکە لەبەر ئەکات.

ئینجا کە لە سەفەری حەج گەڕامەوه، وه چوم بۆ زیارەتی حەزرەتی مورشید سەروەر مولانا ضیاء الدین عمر، فەرمووی ئەو سێ کەسە کێ بوون کە لە عەرەفەدا بوون بە هاوەڵت، وه بە هاوارت گەیشتن؟

کوت و پڕ کەوتە خەیاڵم کە ئەمانە رجال الغیب بوون، وەك لە زیارەتیان بێ بەش بوم بەلاّم بەدەست و پێ ماچ کردنی ئەم غەوثی زەمانە دەم و لێوی خۆم شەرەفدار کرد.

لەهەر لا کۆ بن چاکانی دنیا	خولاّمی تۆم ئەتۆ دولبەرمی تەنیا

**ك ١٨٣:** دوباره جەنابی حاجی حمه صالحی ناوبراو ووتی: حاجی عبدالغفوری سلێمانی گێڕایەوه فەرموی لە شاری مکەی رێز لێ گیراو خوا شەرەفی زیاتر بفەرموی لە خەودا دیم پیاوێکی حەبەشی پشتی کردبوه دیواری کەعبە منیش پێم ووت تۆ بۆچی ئەوەندە جەسور و بێ باکی؟ ئەویش زۆر بە تووڕەییەوه ووتی مەگەر نەت بیستوه قلب المؤمن عرش الرحمن وه لە پاشا لە شاری مەدینەی پیرۆز خوا

قەدری زیاتر بکا لە کاتی زیارەتی حوجرەی سعادەت[1] پیاوێکم دی بە یەکێ لە ئەولیام زانی ویستم دەستی ماچ بکەم، وە بە خزمەتی بگەم ئەو خێراڕووی وەرگێڕا، دوای کەوتم ئینجا لە روی سەرزەنشتەوە فەرموی تۆ ئیشت بە عومەرە کارت بە من چی‌یە؟ کاتێ لەو سەفەرە پیرۆزە گەڕامەوە وە بە زیارەتی ئاستانی راستان ماوە مەئوای ئاوا بە فەڕ و فەیزی خاوەن بەرەکتی قطبی سەروەر حضرەتی ضیا مەولانا عمر گەیشتم، فەرموی: لە مەکەی پیرۆز چ خەوێکت دی کە وەختە بوو ئەو پیاوە حەبەشی‌یە لە ناوت بیا وە فلان کەس لە مەدینەی پڕ نور لە حوجرە سەعادەتا هاوڕێیەکی تری هەبوو ئەووت نەدی، من لەگەڵ هەردویاندا تا ڕادەیەك برادەریم هەیە، و لە هەردو لە ریزی حەریفانن[2].

(حەریفان بادەیان نۆش کرد و رۆین    لە مەی مەیخانەیان بۆش کرد و رۆین)

حریفان بادها خور دند و رفتند    مهی خومخانها کردند و رفتند

**ك ١٨٤:** جەنابی صۆفی محمدی خەڵکی شاری سولەیمانی گێرایەوە: ووتی:

خۆم حازر بوم وەستا أحمدی زین دروو خە ڵکی شاری ناوبراو (٣٠) قڕانی[3] حەقی زین لە خزمەت حەزرەتی ضیاء الدین‌دا بوو، حەزرەتی پیرتەنیا (٢٠) قڕانی لە گیرفانی موبارەکی دەرهێنا دایە دەستی وە فەرمووی.

ئێستەهەر ئەمە حازرە، وەری گرە، وەستای ناوبراو چوە گۆشەیەکەوە بژاردی سێ بارە ژماردی بو بە (٢٣) وە هەر جارێ ئەی ژمارد قڕانێکی زیا ئەکرد تا گەیتشە (٣١) قڕان خۆی پێ نەگیرا لای خەڵك باسی کرد، وە چو عەرزی شێخی کرد حەزرەتی شێخ هەموو پارەکەی لە دەست وەرگرت و فەرموی نەمزانی نازانی هەڵی

(١) حوجرەی سەعادەت: یانی ژوری مەرقەدی موبارەکی رسول الله ﷺ.

(٢) حەریف: هاوشان (٥)

(٣) قڕان: قڕانی ئەو کاتە نزیکی دیناریکی ئێستە بوە، بەڵام ئێستە مسە زۆر کەمە تەنیا ١ فلس ئەکات.

بگری (٣٠) قرانی هەڵگرت و دایە دەستی فەرموی ئەمە حەقی خۆت، وە ئەم وەستا أحمدە بە بەرەکەتی حەزرەتی شێخ سامانی زیادی کرد، وە ئێستە[1] دانیشتوی شاری کەرکوکە وە یەکێکە لە ریزی زەنگینەکانی[2] ئەویێ.

ئەوەی بە نیگا خاك بە زەڕ ئەکەن ئاخۆ لە ئێمەش یەك نەزەر ئەکەن؟

(فارسی):

آنان که خاك را بنظر کیما کنند آیا بود نظری بجانب ما کنند؟

**ك ١٨٥:** جەنابی ملا محمدی خەڵکی شاری سولەیمانی گێڕایەوە:

هەر کاتێ بچومایە بۆ خزمەتی حەزرەتی ضیاء الدین(قدس سره) دایکم زۆر دڵ پەرێشانی ئەکردم، وە زۆر قسەی ناخۆشی پێ ئەوتمو بۆچی بەجێمان دێڵی و بۆ کوێ ئەچی بۆچی ئەچی؟ جارێك هاتمە خزمەت شێخ نزیکی (٥) مانگ ئیجازەی نەدام لەو ماوەدا کاتێ فەرموی چوم بۆ سلێمانی و چوم بۆ ماڵی ئێوە، وە نیشانەی ماڵەکەمانی باس فەرمو، وە فەرموی دایکت چێشتی خستبوە سەر ئاگر گلەیی ئەکرد، لەکاتی ئیجازەدان مان عەرزیم کرد زۆر لە زویری دایکم ئەترسم زۆرم سەرزەنشت ئەکات، فەرموی ئەمجارە من زامنت ئەبم هیچ ترست نەبێ لە ئەستۆی من کە گەڕایتەوە کۆمەڵێکی هەولێری پیاو و ژن بوون بە رەفیقم یەکێ لەوانە مەلا صاڵحی ناو بو کاتێ گەیشتینەوە بە پێچەوانەی جاران دایکم بە روخۆشی هات بە پیرمانەوە ژنەکانی لەگەڵ خۆی بردە ماڵەوە زۆر میهرەبانی لەگەڵ کردن، ئێمەش شەو چوینەوە کاتێ دانیشتین و ئیستراحەتێکمان کرد، دایکم بە بێ گرژی و روو لە یەکنان بەڵکو بە خۆشی و بەشوشیەوە لەگەل خۆم و میوانەکانا ئەجولایەوە جەنابی مەلا صاڵح ویستی هەندێ لە کەرامات و باسی گەورەیی پایەی حەزرەتی شێخ بکات، دایکم ووتی پێویست ناکا

---

(١) ئێستە: یانی لە ساڵی ١٣١٨ی کۆچیدا کە ئیمرۆ ئەکاتە ٨٣ ساڵ لەمەوبەر.

(٢) زەنگین: سامان دار، دەوڵەمەند، زەڕ : ئاڵتون، نەزەر: تەماشا.

هیچم بۆ باس بکەی شێخ کارێکی کردوە ناتوانم بە هیچ جۆر قسە بکەم چونکە کاتێ کە ئەم مەلا محمدەی کوڕمە لە ماڵ نەبوو، ڕۆژێ ژنەکەی لەگەڵ منا ناڕەحەتی کرد و دڵی ڕەنجاندم شەو لە دوای نوێژی خەوتنان مناڵەکان خەوتبون منیش چراکەم کوژاندەوە چیشتێکم خستە سەر ئاگر لە کوونجی مەلولیا دانیشتم، وە دەفتەری گلەیی و شکاتم کردەوە وتم یا شێخ من کوڕم بە هەتیوی گەورە کرد بە ئەزیەت و زەحمەت پێم گەیاند بۆ ئەوەی لە دوارۆژی پیریا بە کارم بێ تۆ بۆچی بردت؟ وەك بردت بۆ ئیجازەی نادەیت؟

تاقەتی بۆ لە بۆڵی ژنەکەیم نیە، تا کەی پەرێشانی و ناڕەحەتی بە من ڕەوا ئەبینی؟ لەو کاتەدا تەماشام کرد خانوەکە ڕوناك بوەوە، وام زانی یەکێ لە مناڵەکان هەستاوە چراکەی هەڵ کردوە، تەماشام کرد چرا کوژاوەیە، وە ماڵەکە چراخانە ترسناکی گرتمی لە پاشا ووردبوومەوەو کە ئەمە پیاوێکی مێزەر سپی شێوە پۆشاکی بەم جۆرە بەرامبەرم وەستاوە، فەرموی گلەیی[1] لە خوا ئەکەی؟ منیش لەو پەڕی ترس و لەرزەوە عەرزم کرد دیارە کە تۆ شێخ عمری مەلا محمد بۆ تۆ نامەوێ ئیتر دڵت لە من نەیەشێ کە ئەمەم ووت، لەبەر چاوم دیار نەما وە خێرا خانوەکە تاریك بوەوە، مەلا صالح فەرموی ئەو قیافە و ئەو شێوە و پۆشاکە، کە تۆ ئەڵێی ڕاست خۆیەتی.

ڕاستە ئەم باسە برا بۆچی وەها حەیرانی

وەك یەکە دور و نزیك بۆ سەفەری ڕۆحانی

---

(١) گلەیی لە خوا ئەکەی: یانی نە مەلا محمدی کوڕی تۆ بێجگە لە بەر ڕەزای خودا هاتوە بۆ لای من، وە نە منیش بێجگە لەبەر خودا مەلا محمدی کوڕی تۆم لە لای خۆم هێشتوەتەوە نە من مەبەستێکی دنیاییم بەو هەیە نە ئەویش بە مەبەستێکی دنیایی هاتوە، کەوابو گلەییەکەت ئەگەڕێتەوە بۆ گلەیی لە خوا.

ك ١٨٦: حەزرەتی قطبی دەوران مرشیدی گەورە و بەناوبانگ مولانا نجم الـدین فەرمووی جاریّ لە لایەن حبیب بـەگ فەرمانـداری (جـوانڕۆ) وە بـاوکم نامەیـەکی پێ گەیشت کـە نوسرابو، لـە لایـەنی حـەزرەتی شـێخەوە بـە تـەما کرابـوم کـە هـەر خـۆم فـەرمانڕەوای جـوانڕۆ ئـەبم بـەلاّم [1] نوسـراوی لـە لایـەن (أمـیر النظـام) حوکمـداری کوردستان هاتوە کە تیا دیاری کراوە، هەرکات (خەسرۆ خان) گەیشت حازر بن بۆ فەرمانی، قوربان ئێوە چی ئەفەرمون؟

حـەزرەتی شـێخ لـە وەلاّمیـا نـوسی: أمـیر النظـام بێ ئاگایـە، خەسـرەو خـان بـۆ جێگەیەکی تر دەنێریّ ئینجا پاش ماوەیە خەسرەو خان نێردرا بۆ بانـە وە حبیـب بـەگ بۆ فەرمانداری جوانڕۆ جێگیر کرا.

کیّ ئەم پەیامە بۆ شـا عـەرز کـا بـە هـەم نیشینـان
لـە شـوکری شـاهی بـا هـەر چاودێری کـا فقـیران

موتەرجم ئەڵێ:

وا ئەزانم لە مەرحومی مامۆستا مەلا عارفی بانەیی کە لـە پێنجوێن مـودەریس بـوو بیستم فەرمووی لە حەزرەتی شێخ علاء الدین (قـدس سره) بیستم فـەرمووی گوایـا کاغەزێکیان هێنایە خزمەت شێخی باوکم، وە ئەو کاغـەزە لـە لایـەن حبیـب بەگـەوە بو، و حەبیب بەگ ئیخلاص و ئیرادەتی شێخی بوو، مەوضوعی کاغەزەکە ئەمـە بـو خەسـرەو خـان بڕیـار دراوە لـە تارانـەوە بکرێـت بـە حوکمـداری جـوانڕۆ، وە فەرمانداریەتی من لەویّ نەمێنیّ پاش ماوەیە شێخ ئەمری کرد بنوسە ئەوەندە ڕۆژی تر

---

(١) قەت بە ملیۆن لەر، یا دەسەلاّت دار / یا سەرۆك دەوڵەت، مەڵیّ بەختیار
کـەسیّ کە نەختیّ، تەختی بەختی بیّ / لەنـاکـا وەختیّ نەمینیّ دیـــار
کـەی بـەختیـارە، کاکە بـەختیار / ئەوەیـە دەستی، گەلی بیّ بـەیـار
چ یـــار؟ ئـــەو یارە، یاریّ بیّ دیار / یارمەتی دەر بیّ، لـە هەردو دیـار

ئەمرت بۆ دێ تو بە حوکمدار ئەکرێیتەوە، منیش عەرزم کرد قوربان لە چ روویەکەوە ئەم بریارەت بەم وەعدەدا، فەرمووی ئێستە بۆ خصوصی ئیشی ئەم پیاوە مەشغوڵ بوم قطبی زەمان حەزرەتی شێخ إسماعیلی ولیانی تەشریفی هات فەرموی عومەر بۆچی بێتاقەتی مەطلەبەکەم عەرز کرد، فەرموی من ئێستە لەبەر تۆ ئەمرم بە دەبیری دەرباری (تاران) کرد حەبیب بەگ بنێرێتەوە جێگەی خۆی وە چەن مەئمورێکی رۆحانیم کردوە بە مەئمور بەسەر کاتبەکانەوە بچنە دڵیان نەیخەنە پشت گوێ، وە ئەبێ لەوەندە رۆژا بگاتەوە، و حەزرەتی شێخ إسماعیل ئەڵبەتە کە چوەتە دڵی دەبیری دەربارەوە بە بۆنەی حەزرەتی ضیاوە چوە وە ئەم کارەی کردوە.

گیانی سەگان و گورگە لە یەکتری جودایە
یەکیەتی گیان لە بەینی گروهی ئەولیایە
(فارسی)
جان گرگان و سگان از هم جدا است
متحد جانهای مردان خدا است
(دانەر أحمد)

**ك ١٨٧:** وە هەروەها حەزرەتی شێخ نجم الدین فەرموی:

جارێك جولەکەیەك هاتە خزمەت حەزرەتی شێخ عمر قدّس الله سرّه الأنوار عەرزی کرد قوربان خێزانم زمانی بەسراوە، وە قسەی بۆ ناکرێ داوالە خودا بکە بەڵکو خودا شیفای بۆ بنێرێ حەزرەتی شێخ پارچەیە (نەبات)ی لە گیرفانی موبارەکی هێنایە دەرێ وە بە پەنجە شتێکی بە ئیشارەت لێ نوسی بیبە ژنەکەت بیخوات، کە بردی و دەرخواردی دا گورج زمانی کرایەوە.

چۆن دوست لە لوتفی خۆت بێ بەش ئەکەی
کە وەها فریای دوژمنیش ئەگەی

**ك ١٨٨:** سەر لە نویٚ حەزرەتی شیٚخ نجم الدين فەرمو‌ی:

صۆفی محمدی رضا هەڵەبجەیی بۆی گیٚرامەوە ووتی: ساڵیٚك کوڕیٚکی هەشت نۆ ساڵەی هیٚنایە خزمەت شیٚخ کە نە زمانی وتن نە گوییٚ بیستن نە پیٚی ڕۆیشتنی هەبو، داوای کرد کە شیٚخ دوعای خیٚری بۆ بکات بۆ چاك بوونەوەی، ئینجا حەزرەتی غەوثی وەقت حەزرەتی ضیاء الدين لە بەردەمی خۆی دانا دوایی لیٚی پرسی شەکر ئەخۆی؟ عەرزی کرد بەڵیٚ، دواتر لە بەرەکەت و هیممەتی ئەو زاتەوە زمان و گویٚ و پیٚی کرایەوە.

شیعر

خەڵکیش ئەی کا، گیانی پاك، گەر، فەرری، کۆمەك بیٚ لە بۆی
ئەو شتانەی حەزرەتی عیسا کە ئەیکرد وەختی خۆی

فارسی‌یەکەی:

فیض روح القدس گر باز مدد فرمايد
ديگران، هم بكنند آنچه مسيحا ميكرد

گەر ببیسیٚ ناوی دیٚیەك بەختی وا بە عیشقەوە
لاڵ زمانی بەر دەبیٚت و دیٚتە دەنگو نوتقەوە

عەرەبی‌یەکەی:

فلو سِمعَ ألبكمُ اسمَ حيٍ بها الهوى
لعادَ فصيحاً بادياً بالحكايةِ

**ك ١٨٩:** وە هەروەها نائبی حەزرەتی ضیاء الدين حەزرەتی شیٚخ نجم الدين فەرمو‌ی: کوێخا مصطفى ناو خەڵکی (بیارە) (٢) قڕانی بە شیٚوەی زوڵم و زورداری لە (ئەحمەد) ناویٚکی موریدی حەزرەتی شیٚخ عمر سەند.

هەرچەند حەزرەتی شێخ عمر لێیٚ پاڕایەوە بە شێوەی تکا، وە خەڵکی نارده لای کە ئیشی وا نەکات، چونکە زۆرداریە و کارێکی ناڕەوایە، هیچ سودی نەبوو، وە ئەو تکا و رجا کەڵکێکی نەگرت.

هەتا دڵی رەنجا، و بە تەواوی زویر بوو، وە فەرمووی ئەگەر موحەبەتی خودای پەروەردگار بە دڵی عمرا عبوری کرد بیٚ ئەبیٚ ئەو (٢) قرانە بە کفنی خۆی بدا لەو کۆڕەدا یەکیٚ ئەیەویٚ تکا بکات بۆ ئەو کوێخایە حەزرەتی شێخ ئەفەرمویٚ تۆێش ئەتەویٚ؟ دەس بەجیٚ ئەو کەسە بێدەنگ ئەبیٚ، ئیتر هەر لەو شەوەدا کوێخای ناوبراو ماڵ ئاوای لە دنیای پڕ غرور کرد، وە روەو ماڵی دوایی کۆچی دوایی کرد لەکاتی شتنیدا بینرا کە لایەکی بە جاریٚ رەش بوبووەوە[1] (نعوذ بالله من معادات الأولياء).

(قوتونە) دڵی پیاوانی گەورە          تا ساخە دەرمان، بیشکێنی ژەهرە

فارسی‌یەکەی:

بمثلِ بذر قطوناست دل درويشان     تا درست است دوا، ورشكنی سم باشد

**ك ١٩٠: جەنابی ملا عبدالكريمی باشماخی بۆی گێراینەوە فەرمووی:**

لە کاتی گەنجی و لە سەرەتای جوانیمدا کە لەوپەڕی ئارەزووی هەواو نەفسدا بووم رێم کەوتە ناوچەی کوردستان لە سنە و شەویٚ میوانی سیّدێکی چاك و میهرەبان کە تەنیا کچێکی هەبوو، وە ژن و منالی نەبوو، لە کاتی خەوا من و سیّد و کچەکە لە ژێر لێفەیەك دابووین، کابرای سیّد لەناوەڕاستا بوو، نیوەشەو خەبەرم بوەوە تەماشام کرد شەیطانم پیٚ پێکەنیوە و ئاویش زۆر سارد بوو، خاڵە سیّدم ئاگادار

---

(١) پەنا ئەگرین بە خودا لە دوژمنایەتی مەردانی خودا، وە مەبەست لەو کەراماتە کە عەرزتان ئەکریٚ خۆشەویستانی خوا تادڵیان راگری هێشتا هەر کەمە، چونکە هەمووی ئەگەڕیٚ بە فەڕ و بەرەکەت و خۆشی، خوا نەخواستە دڵیان ئازار بدریٚ ئەوە ژەهری کوشندەیە پیاو بە هیلاکا ئەبات.

کرد و ئەویش کچەکەی خەبەر کردەوە بۆ ئەوەی ئاوم بۆ گەرم بکات، ئیتر خۆی تەشریفی فەرمووبۆ مزگەوت و کچەکەی خەوتەوە.

ئیتر لەو خانوەدا بێجگە لەمن و ئەو کچە کەسی تر نەما وە خەتەرەی خراپ زۆر بە دڵما تێ پەڕی بەڵام بەینی من و کچەکە بە قەدەر جێگەیەکی خاڵی بوو تەماشام کرد لێفەکەیان لەسەر هەڵگرتم بەو هۆیەوە ترسێکی زۆرم لێ نیشت و لەو خەیاڵە دوور کەوتمەوە، دووبارە سەرما زۆری بۆ هێنام ناچار لێفەکەم دایەوە بە خۆما کچەکەش بە دەم خەوەوە هەر ئەجوولا تا هاتە تەنیشتمەوە.

ئاگری شەوقی خراپە گڕی سەند هەرچەند ویستم لەغاوی نەفسی سەرکێشم بگرم هیچ سوودی نەبوو، نیازی کردەوەی ناشیرینم کرد لە پڕ یەکێ دەستی راستی گرتم، بە هەموو هێزی خۆی گوشی و وە لە ژێر لێفەکە دەری هێنام و دامی بە دیواری خانوەکەدا لە ئازاری ئەو نارەحەتی‌یە تا ماوەیەك مەدهۆش بووم، دوایی کە تەماشام کرد حەزرەتی شێخی موحتەرەم بە جەماڵی پڕ کەماڵی وەکو رۆژی رووناك رووناکی خستبوە خانوەکە و بەرامبەرم وەستابو منیش لە ژێر باڵی شەرمەزاری و تەریقیدا پەرێشان حاڵ بووم، هەر لەوێ تەشریفی موبارەکی وەستا تا مەسینەم هەڵگرت بچمە دالانی خانوەکە بۆ دەست بە ئاو گەیاندن.

کاتێ گەڕامەوە هەرچەند هەوڵم دا دەرگاکەم نەدۆزیەوە، نزیکەی دوو سەعات من لەو دالانەدا هاتوچۆم کرد، سەرگەردان ئەگەڕام دیوار نەبێ هیچی ترم نەدی نە بۆ دەرەوە نە بۆ ژوورەوە دەرگاکەم نەدۆزیەوە وە لەبەر سەرماش هەراسان بوو بووم، سیّد نوێژی خۆی کرد و گەڕایەوە منی لە دالانەکەدا دی پێی ووتم چی ئەکەی؟ ووتم ئاوی گەرم حازر نەبوو هێشتا نوێژی بەیانیم نەکردوە، فرمانی دا ئاویان بۆ گەرم کردم خۆم شت و نوێژەکەم کرد، بەڵام ئێش و ئازاری بازووم تا ماوەیەك هەر مابوو.

ئـەو کەسـەی شـێخی نـەبێ شـەیطـان هەمیشـە دژیـەتی
وەك گەلی بێ شوانە گورگیش بەرخی ئایین کوژیـەتی[1]

**ك ١٩١:** جەنابی ملا یوسفی مەجمەر کە دانەری ئەم کتێبەیە ئەفەرموێ: جاری کۆمەڵێ لە خزمەت شێخ عمردا دانیشتبووین، وە خەریکی خۆراك خواردن بووین لەناو کۆمەڵی زاناکاندا جەنابی مەلا صاڵحی گەڕوسی سستی ئەکرد لە نان خواردن دا، حەزرەتی شێخ(قدس سره) فەرموی بۆچی باش نان ناخۆی؟ عەرزی کرد قوربان سەرێشەیەکی زۆر ناڕەحەتمە لە خواردن دوای خستووم، حەزرەتی شێخ عومەر بە پەنجەی موبارەی ئیشارەی فەرموو بۆ ناوچاوانی خۆی و فەرمووی ئەم شوێنەت دێشێ، ملا صالح فەرمووی بەڵێ، کوت و پڕ مەلا صالح هەستا دەستی موبارەکی حەزرەتی پیری ماچ کرد شێخ فەرمووی چی‌یە؟ بۆ وا ئەکەیت؟ مەلا صاڵح فەرمووی: کە کاتێ ئێوە بە پەنجە شوێنی ئازارەکەی منتان لەسەری خۆتانا دیاری کرد وام زانی ژەهری کاسەی سەری منیان رشت و شفایان تێ رژاند، حەزرەتی شێخ فەرمووی ئێستە من سەرم هاتە ئێش.

**ك ١٩٢:** دووبارە جەنابی مامۆستای بەناوبانگ ملا یوسفی مەجمەر ئەفەرموێ جەنابی مەلا صالحی جەباری بۆی گێڕاینەوە فەرمووی جاری لە خەودا بە خزمەت سەرداری هەموو جیهان حەزرەتی رسول الله ﷺ شەڕەفدار بووم لە خۆشی و شادیا وام لێ هات وەکوو جەزبە لێ هاتووگەرم بووم وە لەو کاتی خۆشی و بەختەوەریەدا

---

(١) لەم بارەیەوە حەزرەتی ئیمامی غەزالی (رەحمەتی خوای لێ بێ) لە کتێبی إحیاء علوم الدین‌دا لە بەرگی سێیەم لە لاپەڕەی ٦٥ چاپی یەکەم ١٢٨٩ کۆچی ئەفەرموێ فمن لم یکن لە شیخ یهدیە قادە الشیطان إلى طرقة لا محالة یانی کەسێ پیرێکی نەبێ بۆ سەرپەرشتی شەیطان رێی لێ گوم ئەکات و ئەی فەوتێنێ بێ گومان.

ووتم أشهدُ أن لا إله إلاّ الله وأشهد أنّ محمداً رسول الله وه بێژه و لەفظی إنّك رسول الله م له یاد چوو، وه پاش ئەو خەوه ماوەیەك بە سەریا تێ پەڕی ئەمجار بە خزمەت حەزرەتی پیرم گەیشتم دەستی گرتم فەرمووی خەوێکت دیوه بۆم بگێڕەوه من لە بیرم چوبوەوه کە خەوێکی وەهام دیوه، عەرزم کرد خەوێ بە کەڵکی گێڕانەوه بێ بۆ جەنابت نەم دیوه، دوایی بیرم کەوتەوه بەڵام خۆم لێ هەڵە کرد و نەم گێڕایەوه، لە پاشا حەزرەتی شێخ چۆنم دیبوو خەوەکەی خۆمی وەها بۆ گێڕامەوه بێ کەم زیاد وه فەرمووی بۆچی لە حضوری ئەو سەروەردا (وأنّك)ەت نەووت مەگەر فەرموودەی من رآني في المنام فقد رآني حقاً[1] نت نەبینیوه و نەت خوێندۆتەوه.

**ك ١٩٣:** دیسان جەنابی ملا یوسفی مەجمەر ئەفەرموێ: جارێکی تر لە قەڵای مەریوان پیاوێ هەندێ خەیاری ناسکی تازه پێگەیشتوی هێنا وه هەندێ تۆراخی دۆ لەخزمەت شێخا بوو، هەر وەختێ خەیارێکی پاك ئەکرد لە تۆراخەکەیەوه ئەدا و نۆشی ئەفەرموو بێ نان، لەو کاتەدا لایەکی کرد بە لامەوه فەرمووی ئەمە چوار ڕۆژه بێجگە لەمە کە تۆ ئەی بینی هیچی ترم نەخواردوه چونکە تاوەکو شاری بانەچووم و گەڕاومەتەوه حەڵاڵی رووتم دەست نەکەوتوه، وه ئەوەی گومانیشی لێ کرابێ نەم خواردوه، چونکە من حمی حول الحمی یوشك أنْ یقع فیه[2].

وه هەروەها الحلال بیّن والحرام بیّن وبینهما شبهات[3].

**ك ١٩٤:** جەنابی ملا مصطفی رەباتی کە یەکێکه لە خۆشەویستانی حەزرەتی شێخ وه لە ڕیزی ئەهلی محبەت و وەفایە ئەفەرموێ:

---

(١) یانی کەسێ من ببینێ بە خەو هەر بە راستی منی بینیوه، یانی خەوەکەی راستی‌یە و کەسیی تری نەدیوه، یانی کەس ناچێتە شێوەی منەوه.

(٢) یانی ئەوەی بە دەوری مێرگ و پاوەنی قەدەغەدا بگەڕێ و بسوڕێتەوه نزیکە بکەوێتە ناوی.

(٣) حەڵاڵ دیارە و ئاشکرایە، حەرامیش هەروەها وه لە میانەی ئەو دوانە هەر چی هەبێ جێی شکە.

له هەوەڵی لاویدا کە خەریکی وەرگرتنی زانستی ئایینی بووم کەوتمە داوی ئەوینی ئافرەتێکی جوانەوە، وە بە دەرد و بەڵای سەودای ئەو خۆشەویستی‌یەوە دووچاربووم بە چەشنێ هەمیشە پەرێشان حاڵ و شێوا و بووم و دەستم لە خوێندن هەڵگرت وە بەو دەردە بێ دەرمانەوە ئەتلامەوە، تەمەنی بە نرخی خۆم بەبێ هودە بەسەر ئەبرد هەتا لە دواییدا هەستام بەرەو هەورامان رۆیشتم بۆ خزمەت پیری گەورە و پایە بڵند حەزرەتی شێخ عمری ضیاء الدین خۆشنودی خوا بێ وە لەسەر رەووشتی جوان و شیرینی خۆیان زۆر دڵ نەوازی کردم و لە بەرامبەری خۆیەوە دانام رێز و قەدرێکی زۆری لێ گرتم، منیش لە دڵی خۆما ووتم ئەگەر ئەم زاتە یەکێ بێ لە بزووۆرگانی خوا و ئاگاداری نهێنی ناودڵ بێ من وا بە دڵ ئێستا داوای دەرمانی دەردی خۆمی لێ داوا ئەکەم لە پاشا بە دڵ هەر لە حەزرەتی أبو بکری صدیق ﷺکردم بە تکا کار تا حەزرەتی شێخی سراج الدین (رضوان الله تعالی علیهم أجمعین) وە ئەوەی کە ناوم ئەزانی لە ئەولیا بۆ دەرمانی دەردی دڵم لێیان پاڕامەوە حەزرەتی شێخ (قدس سره) رووی کردە یەکێکی تر و فەرمووی: فلانی هەندێ کەس ئەولیای پێشوو ئەکەن بە تکاکار نازانن ئەوانیش کاروباریان حەواڵەی شێخی زەمان کردوە، چونکە ئەو مجتهدی زەمانی خۆیەتی کە ئەمەی فەرموو زانیم کە ئاگادارە بەسەر دڵی بەندەدا، وە دوایی رووی کردە هەر ئەو پیاوە فەرمووی هەندێ کەس خۆی بەجۆرە کاروبارێکەوە خەریك ئەکات وەکوو خۆشەویستی ظاهیری بێ وە حاڵ و کاروبار لە خۆی تێك ئەدات ئەوەندە هەستی نیە کە بیر و هۆشی خۆی خەریکی زانستی و کاروباری دین بکات وە سەیری مەصنوعاتی زۆر سەیری خوای پەروەردگار بکات، وەلە پاشان وا لە خۆیان ئەکەن ئەو بیر و هەستە لەدڵیانا جێگیر ئەبێ وە لە خوێندن دەستیان پێ ئەکێشێتەوە کە ئیتر دەرمانی خۆیان نازانن چی‌یە، کاتێ ئەمانەم بیست شەرمەزار و پەشیمان بووم وە بە ماوەیەکی کەم دڵ لەو خۆشەویستی‌یە خاڵی بوو وە بە محبەت و خۆشەویستی خوایی رۆشن و رووناك بووەوە:

| | |
|---|---|
| عەشق ئەو مەلەیە کە باڵ لیٚ بدات | سیمرخی فەلەك لە گەڕان ئەخات |
| عەشق هات و دەمی شمشیٚری ماڵی | زوو ماڵی کردم لە ئەغیار خاڵی |

**ك ١٩٥:** وە هەروەها جەنابی ملا مصطفی رەباتی دووبارە ئەفەرمووی: جاریٚکی تر لە سەفەری ناوچەی زەهاودا لەخزمەت ئەو دەستگیری دنیا و دینەدا بووین، شەویٚ وا ریٚکەوت لە تەنیشت مەنزڵی حەزرەتی شیٚخ جیٚگەم دەست کەوت وە لە میانەی من و حەزرەتی شیٚخا تەنیا یەك پەردە هەبوو، من لە دڵی خۆما ووتم شیٚخ بە شەوا ناخەویٚ ئەمشەو هەڵیٚکی باشە لە پەنای حەزرەتی پیرا با نەخەوم وە دەسم کرد بە فرمانیٚ کە پیٚم ووترا بوو، کاتیٚ شەو دەرنگ بوو تەماشام کرد پیاویٚکی بە سام ریش سور و عەبا سوور هات وەکوو پیاویٚکی ووشیار دەستی کرد بە ئامۆژگاریم وە ووتی: ئەم شیٚخە کە تۆ دوای کەوتووی مرشدی کامل نیە، فلان و فلان کە لە وولاتی خۆتان دایە ئەوان کاملن بەلام من ئەو دوو کەسەم ئەناسی خەبەریان لە ئیرشاد نەبوو، بیٚ ئاگا بوون لە شیٚخیەتی، بەلام بڕواشم بە حەزرەتی شیٚخ نەما، لەو کاتەدا خەیالم کرد بڕۆمەوە بۆ ناوچەی خۆمان وە یەك دوو هەنگاویٚ رۆیشتم و گەڕامەوە، ووتم: خۆ ئەگەر بڕواشم پیٚی نەما بیٚ خۆ نمەکیم کردوە، وە ماوەیەك لە خزمەتیا بووم با ماڵ ئاوایی و خوا حافیزی لیٚ بکەم، مەرجی وەفا و پیاوەتی نیە من بیٚ ئیجازە وەرگرتن بڕۆم، وام زانی بیٚ دەست نویٚژم چووم دەست نویٚژ بگرم تەماشام کرد شەیاطینی زۆر هیٚرشیان هیٚنا بۆم کە بمخەنە حەوزەکەوە، سەرگەردان مام وە بە خۆم ووت جاران داوای کۆمەکی و ئیستمدادم ئەکرد لە حەزرەتی شیٚخ، بەلام ئیٚستا کە بڕوام نەماوە پەنا بە کیٚ بەرم، کە شەیاتینەکان زۆریان سەند ناچار بووم داوای ئیستمدادم لە حەزرەتی شیٚخ کرد، دەسبەجیٚ هاوار و ناڵە لە شەیاتینیەکان پەیدا بوو وە بەم لاو لادا دەرباز بوون وە حەزرەتی شیٚخ عومەر لە پشتی پەردەکەوە بە دەنگی بەرز فەرمووی أعوذ بالله من الشیطان الرجیم وە بەندە بە

دەنگی حەزرەتی شێخەوە هۆشم هاتەوە کاتێ ڕۆژ بوەوە شێخ فەرمووی: وەختە بوو ریش سوری عەبا سوور بیروباوەڕت تێك بدات تا أعوذ وی منت بیست.

**ك ١٩٦:** وە هەر لەو سەفەرەدا عەرزی حەزرەتی شێخیان کرد: حسن ناوێ لە تیرەی قادری پیر وەیس جوێنی بە باوکی سیّد محمد سعید داوە فەرمووی ئەگەر بە تێکڕایی ووتبێتی کافر ئەبێ چونکە حەزرەتی سەرداری عالەمیش ئەگرێتەوە ئەگەر مەبەستیشی ئەوە نەبووبێ تەنیا گوناهبار ئەبێ ئەمجار فەرمووی: ئەگەر سید حمە سعید نەتوانێ تۆڵەی خۆی بسێنێ من تۆڵەی ئەستێنم هەر چەند کوڕەزای مەولەوی بەناوی تکا و پاڕانەوە فەرمووی: خەتا لە سید حمە سعیدەوە بووە تووڕەیی حەزرەتی شێخ دانەمردەوە، لە پاش ٣ سێ ڕۆژ فرمان لە میری ئێرانەوە هات حەسەن ناوی ناوبراو تالآن کرا وە هۆی خۆ بە زل گرتنی لەناوچوو وەکرا بە نموونە بۆ هەموو کەس.

**ك ١٩٧:** هەر لەو سەفەرەدا حەزرەتی شێخ تەشریفی فەرموو بۆ دێیەکی تر حوجرە و ژوورێکیان بۆ حەزرەتی شێخ ئامادەکرد فەرمووی: ئەم ژوورە حەرامە کە چووینە بنجو بناوانی ئەو ماڵە، ماڵی هەتیو بوو، حەزرەتی شێخ یەك مجیدی نارد بۆ دایکی هەتیوەکان فەرمووی لە بری کرێی ئەمشەو وە من و چەند کەسێکی تر لەو ژوورەدا خەوتین نزیکی بەیانی بە ئاگا هاتم حەزرەتی شێخ داوای جگەرەی لێ کردم، وە منیش جگەرەم نا بە ئاگرەوە تا نەختێکی تری داگیرسا و پێشکەشم کرد بە دەستی‌یەوە گرت و دایەوە دەستم چونکە ئاگری نەگرتبوو، دیسان نامەوە بەئاگرەکەوە و پێشکەشم کردەوە، دیسان دایەوە بە دەستمەوە هەروەکو ئاگری نەدیبێ وابوو، سەراسیمە بووم و سەرم سوڕما، دیسان جگەرەکەم نایەوە بە ئاگرەکەوە و چەند هەناسەیەکم لێدا و دامەوە خزمەتی کە نای بە لێوی پیرۆزی‌یەوە دیم کە هیچ نیشانەی سووتانی پێوە نیە، بە ڕاستی شەرمەزار بووم وە لەوپەڕی خەجاڵەتیدا سەر لە نوێ جگەرەکەم نایەوە بە ئاگرەکەوە ئەوەندەم هەناسە لێدا

سووتوەکەی کەوتە سەر زەوی پێشکەشم کرد و بۆم رووانی ووتم بزانم چۆنە؟؟؟ تەماشام کرد کە نای بە لێویەوە نە ئاگری ما نە دوو کەڵ دایەوە بە دەستمەوە پەرێشان بووم و سەرگەردان.

شێخ فەرمووی شێخ حەسەن خەبەر بکەرەوە با جگەرەکەم بۆ دابگیرسێنێ شێخ حەسەنم لە خەو خەبەر کردەوە، دەسبەجێ هەر ئەو جگەرەیەی نا بە ئاگرەکەوە و دای گیرساند و پێشکەشی جەنابی حەزرەتی شێخی پیرۆز و پڕ فەڕی کرد، جوان بە رێك و پێکی ئەسووتا، لە پاشا فرمانی کرد بە من فەرموی بچۆ خۆت پاك بکەرەوە خۆت بشۆ کە لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە سەیری خۆمم کرد إحتلام بوو بووم و بە خۆمم نەزانیبوو، لەو کاتەدا ئاو زۆر سارد بوو، وە ئاوی چەم بەستبووی وە بوو بوو بە سەهۆڵ، لە دەوری ژوورەکە وەستام شایەد یەکێ لە خەڵکی دێیەکە بەو ناوەدا بڕوات ئاوێکی گەرمم پیشان بدات، حەزرەتی شێخ فەرمووی لە ژوورەکەدا و بانگی کرد: بڕۆ عبدالوهاب خەبەر بکەرەوە ئاوی گەرمت نیشان بدات کوێخا عبدالوهاب هات لەگەڵما ئاوی گەرمی نیشان دام لەجێیەکی دوور کانی‌یەك هەبوو، پێم ووت ئێرەت چۆن زانی؟ ووتی ئێوارە ئەسپەکانم هێنا بۆ ئەم دەرە ئەم کانیەم لێرە چاوپێکەوت وە بە کەسم نەووتوە، لە پاشا کە چوومەوە بۆ خزمەت شێخ فەرمووی: نازانی خۆراکی دەستی لەش پیس چاك نیە.

**ك ١٩٨:** دووبارە جەنابی ملا مصطفى رەباتی ئەفەرموێ:

لە دوای نوێژی بەیانی لە دێی کوبان دەرچووم بەرەو صلاحیە بە ئەندازەی سەعاتێ رۆیشتم تووشی سیِّد مصطفى ناوێ بوم کە یەکێ بوو لە قوتابیانی ئایینی و خزمایەتی هەبوو لە خزمەت حەزرەتی شێخا، لێم پرسی لە کوێ وە هاتووی ووتی لە دێی سەرقەڵاوە دێم ووتم چ کاتێ دەرچووی، ووتی لە دوای نوێژی بەیانی بەڵام من بڕوام پێ نەکرد چونکە من ماوەی کات ژمێرێکم بڕی بوو ئەو چوار کاتژمێر زیاتری بڕی بوو، کاتێ گەیشتمە دێی سەرقەڵا لە ملا محمودی مامۆستایم پرسیار کرد ووتی

بەڵێ نوێژی بەیانی لێرە کرد ئەمجار دەرچوو من لەم بەسەرهاتە سەرسام بووم، کاتێ کە گەڕامەوە دیسان لە ڕێگەدا تووشی بوومەوە دووبارە لێم پرسیەوە ووتم چۆن وا ڕێگەت بەو جۆرە بڕیوە، لە پاش ئەوەی من زۆری لەسەر ڕۆیشتم ووتی من لەم ڕێگەدا زۆر ترسام تەماشام کرد جێگەداری سەرداری عالەم حەزرەتی شێخ عمری ضیاء الدين م بە لەش بینی حازر بوو فەرمووی ئەی کوڕی خۆم مەترسە من وام لەگەڵتا تا ماوەیەك لەگەڵما بوو دوایی دیار نەما دووبارە ترسم لێ پەیا بوو دیسان حەزرەتی شێخ تەشریفی موبارەکی هاتەوە و دڵ نەوایی کردم و دڵ خۆشی دامەوە وە هەر جارجار پەیدا ئەبوو، لەو کاتەدا کە بە جەنابت گەیشتم تەشریفی لەگەڵما بوو، کە تۆ گەیشتی ئەو تەشریفی برد، جا ئیتر نازانم بەم حاڵە چۆن ڕێگەم بڕیوە.

**ك ١٩٩:** وەستا بابای دەرگا شێخانی گێڕایەوە ووتی:

لەگەڵ عبدالرحمنی براما ناکۆکی‌یەك هەبوو لە بەینمانا، وە زۆر ئازاری دام ویستم لە لای میری شکاتی لێ بکەم، بەڵام پەشیمان بوومەوە و چووم دادم بردە بەر حەزرەتی شێخ و لە بەرامبەریەوە وەستام کاتێ سەری موبارەکی بەرزکردەوە چاوی پێم کەوت فەرمووی: ئەو کەسە عاجزی کردووی ئەبێ وای عاجز بکەم خۆشی لە ژیانی خۆی نەبینێ دەسبەجێ پەشیمان بومەوە چووم دەستم ماچکرد الأمان م کرد بەڵکو زیان و زەرەی پێ نەگات فەرموی تیر لەکەمان دەرچوو کە گەڕامەوە براکەم لە داری توو کەوتبوە خوارەوە دەست و ڕانێکی لە جێی ترازا بوو، شەش حەوت مانگ بەو دەردەیەوە تلایەوە لە ئەنجاما ڕانی چاك بوو بەڵام بازووی هەتا مرد هەر بێ هێز و ناتەواو بوو.

| | |
| --- | --- |
| ئاواتـــــت چی هەیـــــە وەرە | بـــۆ شـــێری مـــەردانی بـــەرە |
| پڵنگ و گـورگ و بـەور و وورچ | لـــە ژێـــر چـــەپۆکی وەك مـــەڕە |

**ك ٢٠٠:** جەنابی صۆفی عبدالفتاح کە بە فەتاحە گورگە بەناوبانگە بۆی گێڕاینەوە کە هۆی ئەوەی ناوبانگی بە فەتاحە گورگە بڵاوبۆتەوە ئەوەیە: لە دوای لە دنیا دەرچوونی حەزرەتی شێخی بهاء الدین(قدس سره) لە دڵی خۆما پەیمانم دا و بڕیارم ساخ کردەوە کە لە دوای ئەو حەزرەتە رووی دڵ نەکەمە کەس وە زنجیری فەرمانبەری هیچ مورشیدێ نەکەمە ملم.

پاش ماوەیەك رۆژێ لە کەژ بووم تەماشای لەشی خۆمم کرد بینیم کە بەشێوەی گورگ گۆڕاوم هەر لەسەرم هەتا پێم بە دەمی کراوە و کلکی چەماوە لە کەژ و کێو ئەگەڕام و شتم ئەخوارد، وە لە ژێر باری پەژاری و پەستی و مەلوولی دابوو.

وە بەو شەرمەزاری‌یەوە لە دەرگای خوای پەروەردگار ئەمناڵاند و ئەپاڕامەوە، وە ئەموت خوایە چ گوناهو تاوانێ لە من رووی داوە کە ئاوا منت بردۆتە شێوە و کاڵاوی گورگەوە، لەم خەیاڵ و خەتەرەیەدا بووم لەناکاو حەزرەتی شێخ عمری ضیاء الدین لە شێوەی شێرێکی بە سامدا حازر بوو فەرمووی ئەگەر روشتەی فەرمانی من نەخەیتە گەردنی خۆتەوە وە مۆری خۆشەویستی من نەنێیتە نامەی دڵتەوە بە زۆری بازوو دوژمن شکێن وەك مەڕێکی بێچارە تێکت ئەشکێنم.

منیش هەر چەن کەوتمە ترس و لەرزێکی بێ ئەندازەوە بەڵام خۆم بۆ شل نەکرد و بێ فەرمانیم کرد و ملم پێ نەدا، لە پاشا دەستێکی گەیاند بە ملم لەسەر کێوەکەوە سەرەو خوار فڕێی دام منیش بێهۆش کەوتم کە هۆشم هاتەوە بە خۆما کەمەری بەندەگیم بەست و فەرمان بەرداری ئەو زاتەم بە پێویست زانی وە خۆم خستە ژێر سایەی پارێزگارییانەوە.

لە پاشا ئەویش پەیمانی دامێ کە هەر کاتێ داوای کۆمەکی و یارمەتیم لە حضوریا کرد بە فریام بگات لە پاش چەن ماوەیەك پیاوێ زۆری لێ کردم و زۆری جنێو پێ

دام منیش مجزوب[1] بووم و هاوارم کرد یا عمری عوسمان بگه به هاوارم گویم له دەنگێکەوه بوو فەرمووی وەره بەو دەنگەوه منیش رۆیشتم تا گەیشتمه قەراخی زێی سیروان دیسان هاوار و ئیستمدادم کرد و داوای کۆمەکیم کرد لەوبەری چەمەکەوه دیسان بانگیان کرد وەره دووباره بێخودی و بێ هۆشییەکەم زۆری سەند، لەوبەر چەمەکەوه خۆم لەناو گۆڕستانێکا بینی له یەکێ له مردووەکانی ئەو گۆڕستانەم پرسی ووتم: تۆڵەم لەو دوژمنه چۆن ئەبێ؟ ووتی ۷۰ ساڵه مردووم له دنیا بێ ئاگام بچۆ خزمەت شێخی خۆت، ڕێگەی بیابانم گرت بەو ئەحواڵەوه تا له بیارەی شەریف به خزمەت حەزرەتی پیر گەیشتم فەرمووی چیت له زۆردارەکەت ئەوێ؟ عەرزم کرد له دنیادا به رۆح زیندوو به بەدەن مردوو بێ، فەرمووی با وابێ.

ئێستا چەند ساڵه ئەو شەخسه ناوی محمد قرگەیه تووشی عەنین بوه و پیاوەتی نەماوه لەوه پێش ژن و منالی بوو.

ئەوەی منظوری لوتفی کیبریایه    به دڵ تەسلیمی دەستی ئەولیایه

**ك ۲۰۱:** ئەو قوطبی یەقینه ئەو غەوسی سالکینه، ئەو فەخری زەمان و زەمینه ئەو (نائب سید المرسلین)ه ئەو (حەزرەتی ضیاء الدین)ه فەرمووی: جارێ له کاتی

---

(۱) له بارەی مجزوبەوه جەنابی خاڵه شێخ أحمدی شاکەلی گەرمیانی گێڕایەوه فەرمووی: جەنابی بەرز و بەڕێز حاجی جاسمی خەڵکی ناوچەی جەلەولا توشی شۆڕ و عیشق و جەزبەیەکی بەردەوام بوو هەردەم مەست و دڵ گەرم بو صحو بێداری نەمابوو داوایان کرد که نامەیەك بۆ مقامی عالی و بەرزی حەزرەتی شا عوسمان بنوسرێ که ئەو سەماحەته لطف بفەرموێ ئەو جەزبه بەردەوامەی نەمێنێ و بەرەو کەمی بڕوات بۆ ئەم فەرمانه داوایان له بەنده کرد منیش چەند دێڕێکم بۆ زاتی عالی و پڕ قەدریان نووسی له وەڵاما ئەو زاته پڕ فیوضات و لوطفه نووسیبوویان:

حاجی جاسم به جەزبەوه لەدنیا دەرئەچێ به مجذوبی زیندو ئەکرێتەوه، وه به مجزوبی به خزمەت زاتی حەق ئەگات له قیامەتا بەڵێ وەفات فەرمونەکەی هەروا بوو که فەرمایشتیان فەرموو.

چاو لێکنانـدا[1] وام بـینی کـە مـن دوو رووبـارم هەیـە[2] یـەکێکی بەسـەر کێـوێکی بەرزەوەیە، ئەوی تریان لە چۆڵێکی فراواندا جاری ئەبن، کە خـەریکی هـەڵ کەنـدن و پاکردنـەوەیانم، کـە گـەیشتمـە سەرچـاوەکەی دیم ئـاوی هـەردوو رووبارەکـە لەیـەك سەرچاوەوەیە، وە لە کاتی جاری بوون و وەستانا لـە ئـاوا کـەم و زیـادی نیـە وە لـەو سەرچـاوەیە سـەروەری عالـەم پێغەمبـەری موبـارەك ﷺ تەشـریفی حـازر بـوو نـانی دروسـت ئـەکرد، یـانی نـانێکی زۆری لـە خزمـەتا بـوو، مـنی بێ نـەوا بەئـەمری ئـەو حەزرەتە نانم دابەش ئەکرد بەسـەر خـەڵکا هـەموو جـاریێ عـەرزم ئـەکرد قوربانـت بم هیممەت بفەرموو هەر کەس لەم نانە ئەخوا بەمحبەت و خۆشەویستی ئەو حەزرەتـەوە بیخوات.

**ك ۲۰۲:** دوبارە حەزرەتی شا عومەر ئەفەرمویێ:

جارێکیکە وام دی لـە جێیـەك وەکـوو مزگـەوت وابـوو[3] بـۆ نوێـژی جومعـەیان ئامـادە کردبـوو، مـنی دڵ بـڕاویش چـووم بـۆ خزمـەتی حـەزرەت ﷺ کـە تەشـریفی موبـارەکی لـەویێ بـوو لـە دەرگـای مزگەوتەکـەوە کـە مـنی هـەژاری بـینی لـە رووی لوطفەوە بۆ سەرفرازی غولامی خۆی رووبەڕووم چەن هەنگاویێ پێشوازی فـەرموو، داوێـن و پێـی موبـارەکیم ماچکرد ولله الحمـد زۆر لـوطفـی فـەرموو لـە پاشـا لەسـەر

(۱) واقیعە: بریتییە لە کاتی چاولێکنان، ئەو لەو چاولێکنانەدا شت ئەبینێ وە مەبەست لەوە خەو نیە.

(۲) دوو رووبارەکە کە طەریقەتی موبارەکی نەقشبەندی و قادری‌یە.

(۳) ئـەم واقیـعـەی مزگـەوتـە لـە مـەریوان رووی داوە، لـە کاتێکـا پـیری ئێمـە حـەزرەتی شێخ عومـەر لـە مەریوان بوو، وام دی کە حەزرەتی رسول الله ﷺ بە خێرهـاتن و خـۆش هـاتنی لـە پـیری ئێمـە ئـەکرد وە زۆر نەوازش و لوتفی لەگەڵ فەرموو، کاتێ کە حەزرەتی پیر ئەم کەرامەتەی فەرموو عەرزم کرد قوربـان ئەم رووداوە (واقیعە) لە مزگەوتەکەی مەریوان بوو، فەرموی:

صدقتَ وبررتَ وبالحقِ نطقتَ. دانەر ملا یوسفی مەجمەر.

دڵ بڕاو: دڵ عاشق.

عەبایەك كە بەسەر شانی إخلاصمەوە بوو نوێژی لەسەر خوێند، لە كاتی تەشریف فەرموونیا دووبارە لوطفی فەرموو یەك دانە شاڵ كە بە أسماء الله نەخشێنرا بوو پێی بەخشیم و نامە سەر شانی إخلاصم وە لە زەمینی پەستی هەڵی ساندمەوە سوپاس بۆ خوای پەروەردگار.

**ك ٢٠٣:** دیسان جەنابی حەزرەتی ضیا فەرمووی:

جارێكی تر بەخزمەت رسولی أكرم ﷺ گەیشتمەوە، وام زانی لەجێیەك دانیشتبووم كەتەشریفی موبارەكی بۆ سەرفرازیم حازر بوو وە زەرفێكی چینی بە دەستی موبارەكی‌یەوە بوو فەرمووی: ئەم زەرفە بگرە كردەوەی تیا بنووسە كە بۆ تكاكردن بۆ خزمەتی حضوری ربّ العزة ئەڕۆم منیش پەیڕەویم كرد و فەرمانەكەیم بە جێ هێنا.

**ك ٢٠٤:** وە هەروەها جارێكی تر وام دی لە شاری رووناكی[1] لە نزیكی بەقیع‌دا رووبەڕووی مەكەی پیرۆز (خوا شەرەف و پایەیان بەرزتر كا) حەزرەتی محمد المصطفی ﷺلە جێیەكی تۆزێ بڵند لە نوێژا وەستا بوو وە حەزرەتی حسین سەرداری شەهیدان لەگەڵ یەكێكی ترا لەوێ حازربوون وە بەندە لە كاتی دەست و پێ زیارەت كردنیا كەوتەوە یادم كە لە كتێبا چاوم پێكەوتبوو كە لەكاتی نوێژكردن و هاتنی وەحی‌دا دەنگێ وەكوو پوورەی هەنگ لە سینەی موبارەكیانەوە بیستراوە، ووتم ئایا ئێستەش هەروایێ كە نزیك بوومەوە و هۆشم پێدا بیستم هەر بەو چەشنە وەها بوو ستایش بۆ خوا دڵنیاییم تازە بوەوە، وە خۆشی‌یەكی زۆر زۆر روویدا بۆم.

---

(١) شاری رووناكی: المدینة المنورة، سەرداری شەهیدان سیّد الشهداء.

ك ٢٠٥: فەرموی لە ساڵی ١٣٠٠ هەزار و سێ سەدی هیجریدا لە شاری خانەقین بووم کە شەوی یەك شەممەی یەکەمی مانگی محرم بوو، سەروەری هەردوو دنیا پێغەمبەر ﷺ (باپیری حسن و حسین)ی ئەنوەر تەشریفی حازر بوو، وە کۆمەڵێ لە ئەولیای کرام (قدس الله أسرارهم) تەشریفیان لە خزمەتیا حازر بوو، خانەقای خانقین یان بە تەشریف هێنانی پیرۆزیان پڕ فەڕ و پیرۆز و رازەکرد، وە ئەم شەرمەندەیەش لەو حضور و بەشداری‌یە بەهرەمەند بووم لە رووی لوطف و میهرەبانی‌یەوە رووی تێ کردم و چەند فەرمایشتێکی رووبەڕوو فەرموو کە ئێستە لە یادما نەماوە، بەڵام بە واتاکەی بەهرەوەر و شادمان بووم، وە لەو کاتەشدا باش لە فەرمایشتەکەی تێ نەگەیشتم چاوەرانم کرد لە یەکێ لەو بوزورگانەی کە لە زەمانی خۆیا قیّومی[1] چەرخی خۆی بوو وە فەریاد رەسی ئەمن و ئەمان بوو، لە پاشا خەلاّتی فەردی‌یەتی پۆشی بوو، بۆ روون کردنەوەی مژدەکەی فەرموی ئەی کوڕم پێغەمبەر ﷺ بە لەفظی شیرین و پیرۆزی خۆی ئەفەرموێ (مژدە بێ بۆ تۆ کە خوا لە فقری من بەشداری کردوویت)[2]. الحمد لله الّذي نوّرنا بلطائف مننه وأسبغ علينا سوابغ نعمه وأرانا من زلال كرمه بفضله وجوده إنّه وليّ التوفيق.

ك ٢٠٦: وە هەروەها فەرمووی: ئەمشەو وام چاوپێکەوت کە بۆ نوێژی عەسر رووەو قیبلە دەشتنوێژ ئەگرم، لە دوای گرتنی دەستنوێژەکە لە لێواری ئەو حەوزەوەستا بووم دوعای دەستنوێژم ئەخوێند لەناکاو سید حسین ناوێ کە نووری سەعادەت و رووناکی سیادەت لەناو چاوی یەقینیا ئەدرەوشایەوە، وە ئەستێرەی پایە بەرزی لەناو چاوانیا ئەگەشایەوە، بەڵام پیاوێکی وەهابوو هەروەکو ووتراوە:

---

(١) بزورگێ قیّومی زەمان بوو: ئەو زاتە مفضاله حەزرەتی شێخ عوسمانی سراج الدینی باوکی بووە.

(٢) مەبەست لە فەرمایشتی پێغەمبەر مژدە بێ کە خوا لە فقری من بەشداری کردوویت یانی روتبەی فەقیری.

سادات و سەعادەت بە یەکۆ وەك تەن و گیانن

ساداته بە راستی کە سەعاداتی جیهانن

سەیریٚ لە ووشەی خۆشی سەعادەتکە کە عەین

کانیٚی شەرەفە کانی ئەوەش دیارە ئەوانن

هەرکەس کە دژی کا لەگەڵ ئەو تاقمە سەدجار

خۆی بیژی کە دینم هەیە من، وایە مەزانن[1]

رووبەڕووم وەستاو فەرمووی ئێستە لە شاری مەدینەی منورەوە هاتووم لە لایەن سەروەری عالەمەوە ﷺ ئەم مۆرەم بۆ تۆ هێناوە کە لێم وەرگرت و سەیرم کرد ئەم ووشە پیرۆزەی لیٚ نەخش کرابوو لا إله إلاّ الله محمد رسول الله یا عمر الفاروق وەرم گرت و قبوولم کرد و بەرەو شاری مدینەی منوەرە رۆیشتم کە گەیشتمە حوجرەی سەعادەت لێم ئاشکرابوو کە فەرمایشتەکەی سید حسین تەواو بوو، یەك بەند قورئان لە ژووی حوجرەی موبارەکا بە هۆی یەکێکەوە دەستگیرم بوو گەڕامەوە اللّهم صلّ على سيدنا محمد صلاةً تزكّي النّفوس وتقرّبُ المأنوس وسلم سلاماً يجمع بين الأصل والفرع وزد وبارك بمنّك وفضلك آمين.

**ك ٢٠٧:** وە هەروەها جارێکی تر فەرمووی: جارێکی تر پیری طەریقەت دەستگیری ڕێگەی حەقیقەت ڕەهبەری ئادابی شەریعەت غەوسی زەمان و زەمین شاهی نقشبند شێخ محمدی بخاری (قدس سره) هەر لەو ساڵەدا کە لە خانەقای

---

(١) لە فارسی‌یەکەدا ئەفەرموێ:

سادات و سعادات بهم چون تن و جانند

القصه کە سادات سعادات جهانند

در لفظ سعادات بینديش کە عینش

یکچشمه و سادات بپیرا من آنند

خانقین لەگەڵ کۆمەڵێ ئەولیا بە خزمەتیان گەیشتم یەکێکیان جەنابی شێخ باوکی بەڕێزم بوو، بۆ جێگەدارییەکەی حەزرەتی فەخری عالەم تەشریفی هێنا بوو ﷺ حەزرەتی شاهی نەقشبەند تەشریفی هێنا و چەند فەرمایشتێکی لەگەڵ بەندەدا فەرموو، لە پاشا فەرمووی: هەر زەمینێ کە ئەی کێڵی گیا و گژەکەی لە رەگ و ریشە دەربێنە تا زەراعەتەکەی بە ئومێدی سەعادەت بێ، لە پاشا حەزرەتی شێخی باوکم فەرمووی ئەی کوڕم ئەزانی خولاسەی فەرمایشتی حەزرەتی شاهی نەقشبەند چییە لەم فەرموودانەدا عەرزم کرد نازانم فەرمووی مەبەستی ئەوەیە: هەر کەست وەرگرت بۆ طەریقەت وەختێ لێی ئەمین بە کە هەموو کردار و ڕەووشتە بەدەکانی وە خووە ناشیرینەکانی بە تەواوی لە رەگ و ریشە دەرهێنا بێ، وە گەرنا ئەمانەتی تۆی بۆ هەڵ ناگیرێ اللّهم أصلح أمّة محمد ﷺ وارحم أمة محمد ﷺ وفرّجْ عن أمّة محمد ﷺ[1].

ك ٢٠٨: حەزرەتی شاه عمر خوا سایەی بەرینتر کات دووبارە فەرمووی: جارێ لە کاتی موراقەبەدا چاوم پێکەوت لە مکەی معظمە، وام زانی کە جەنابی حەزرەتی باری ﷻ بە پێی فەرموودەی ئایەتی [وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ]: بەبێ چەند و چوون و بە بێ جیهەت و ئەندازە حازرە، وە ئەنجومەنی پێغەمبەران ﷺ و کۆمەڵی ئەولیاکان (قدس الله أرواحهم) تا شێخی بهاء الدینی برام هەموو حازر بوون، ئەمر لە لایەن خواوە جلّ شأنه هات بە بڕیاری هەموو ئەنجومەن و کۆمەڵانی حازر بوو کە دوو پایەی کەعبە زەدە بووە لە بنچینەدا خرایە ئەستۆم و سەرشانم کە سەر لە نوێ تازەی بکەمەوە، بەسەر سەر و بە دڵ و بەگیان وەرم گرت، وە هەر لەو کاتەدا بۆ تەوافی کەعبەی عاشقان و مەستان و شەیدایان ڕۆیشتم لە جێگەی طەوافا بە خزمەت نەعلی موبارەکی سەروەری عالەم ﷺ شەرەفدار بووم وە بە

---

(١) یانی خوا ئوممەتی پێغەمبەرمان محمد المصطفی بەرەو چاك و باشە بیگێڕێت، وە بەزەیی و بەخشندەییت بۆ ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ بخەیتەکار، وە خەم و پەژارە و پەستی و نارەحەتی دین و دنیا لەسەر ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ هەڵگرە صلی الله تعالی علیه وسلّم أبد الآبدین وسرمداً في سرمد.

نەخشی صحّ هذا نعْلُ محمدٍ چنرابوو، وە بە پێی پەتی و چاوی پڕ لە گریان زیارەتم کرد وە ئایەتی (فاخلعْ تعليْكِ إنّك بالوادِ المقدس طوى)ام هاتەوە یاد.

خاڵت حەجەرە، زەمزەمە خۆ چاڵی چەناگەت
حاجی نیە تا ماچی نەکا، بەردە سیاکەت

دیسان ڕوودراوی یەکەمم چاوپێکەوتەوە، کە بریتی بوو لە حضوری زاتی حق و هەموو پێغەمبەران و پیاوچاکان، وە هەمان فەرمانم خرایەوە ئەستۆ، وە منی هەژاریش بە کەماڵی ئەدەبەوە قبوولم کرد اللّهم صلّ على سيّدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلّم وآرض عن الخلفاء الراشدين المهديّين وعن الصحابة والتّابعين وجميع المشايخ الكرام لا سيّما سيّدنا سراج الدين وبهاء الدين وضياء الدين ونجم الدين وعلاء الدين والشيخ محمد عثمان سراج الدين الثاني ونفعنا ببركاتهم آمين[1].

**ك ٢٠٩:** شەوێ لە خەوا چاوم پێکەوت، ئاشێکم هەیە لە شوێنێکی بەرزا، بێ خانوو، بێ نێ، بێ ئاو، وە بێ پێویستی‌یەك، بەڵام دوو دانە بەرداشی زۆر گەورە و ئەستور لە سووڕانەوەدان، وە لە هەموو لایەکەوە ئاردی لێ ئەڕژێ هەر کەسێ کە دێت وەك کێویکی بەفرین بەشی خۆی لێ جیا ئەکاتەوە، وە ئەوەی شیاوی باسێ نە گەنم نە دانەوێڵەی ئەکرایە سەر نە قەدەغەی تیا بوو بۆم دەرکەوت کە ئەمە بەخششینێکی خوایی‌یە، کە تەنیا لوطفی خۆیەتی و بەس سوپاسێکی بێ پایان بۆ خوا لەسەر ئەو هەموو لوطفەی.

گەر ئاشکراکا ئاوازی کەرەم     شەیطانیش ئەڵێ بەشی خۆم ئەبەم

---

(١) لە صەڵەواتەکەوە لە دیاری پێغەمبەری نازدار تا پاڕانەوە بۆ دەستگیری دڵسۆزمان لە فەرمایشتی دانەرە رحمة الله عليهم.

**ك ٢١٠:** جارێ له قەزای صلاحیه (کفری) به گەیشتنی من بۆ ئەوێ له ڕۆژی دووەمدا یەکێ له مەنسوبانی طەریقەی قادری موبارەك حاجی سعید[1] ناو هات و فەرموی: ئەمشەو له خەوا چاوم پێکەوت که ئالایەکی سەوز و نورین هاتە ناو شارەوە وە هەموو شار دەر و ناومالْ، بازاڕ و کۆلان هەموو دەور و پشت بە یەك جار بێ جیاوازی ڕووناك بوەوە، که کاتێ گەیشتە ئەم جێگە که ئێستە شوێنی ئەم دانیشتنەی ئێمەیە جێگیر بوو لە پاش چەند ڕۆژێ هاتەوە، وە بە وەرگرتنی طەریقەت سەرکەوتوو بوو.

ئەوەی منظوری لطفی کبریایە        بە دڵ تەسلیمی دەستی ئەولیایە

**ك ٢١١:** وە هەروەها صۆفی فەتاحی ناوبراو فەرمووی:

یەکێ لە ئەهلی عیلم زۆر منکری حەزرەتی شێخی ضیاء الدین (قدس سرە) بوو، وە منی زۆر ئەزیەت ئەکرد ناچار شکاتم بردە خزمەت، فەرموی تا ٢٩ بیست نۆ ڕۆژی تر وەعدەی ماوە منیش ئەو حیسابەم هەڵگرت، ڕۆژی ٢٨بیست و هەشتەم نەخۆش کەوت ڕۆژی ٢٩بیست و نۆیەم لە دنیا دەرچوو.

چە عەجەب لە بۆ ئەهلی نەفسانی    خۆی نەی بوو تۆشی وەکوو خۆی زانی

---

(١) ئەم حاجی سعیدی ناوبراو خۆی گێڕایەوە فەرمووی: لە دوای خۆرئاوای ڕۆژی جومعە خەتەرەم کرد لە دڵی خۆمدا ووتم ئەبێ ساداتی مەشایخی طەریقەی بەرز و بڵندی قادری لە من دڵ ڕەنج نەبووبن، کە من تەرکی تەبەعیەتی ئەوانم کردوە و داخلی طەریقەی نقشبندی بووم

اگر بندەکان عاصی و سرکشند        خداوند گاران قلم درکشند

بەو خەتەرەوە لە پاش تەواوبوونی خەتمی قادری خەوتم، لە خەوما دیم حەزرەتی فەخری عالەم ﷺ تکا کاری گوناهکارانی بێچارە، لە جێیەکدا تەشریفی حازرە وە مەجلیسی مەشایخانی الطریقتین العلیّتین نقشبندی و قادری لە ڕاست و چەپی رسول الثقلین ﷺ حضوریان هەیە، وە حاجی ئەڵێ دیم کە حەزرەتی پیر دەستی گرتم و بە خزمەت سید الکونین ﷺ گەیاندم، خطابی بەو فەرموو هیچ تفاوت و جیاوازی لە بەینا نیە هەموو دێنەوە بۆ لای من، وە وای دیبوو کە منی فقیری هەژار خادمی مخصوص و عبدی مملوکی (خولامی کڕدراوی) ئەو حەزرەتە ﷺ بووم.

بدین مژدە گرجان فشانم رواست        کە إین مژدە اسایش جان ماست

**ك ٢١٢: صۆفی عبداللهی باخەوان گێڕایەوە ووتی:**

من و سید مصفطی باخەوانی باخی لاڕەوە بووین کە وەقفی خانەقای موبارەکە، حەزرەتی شێخ تەشریفی چوو بۆ مەریوان، وە سید مصطفی لە خزمەتیا چوو، لەو کاتەدا میوەهات پێگەیشتبوو، بە تەنیا من پارێزگاری باخەکەم پێ نەئەکرا چونکە ئەم لاو لای باخەکە ڕێ ڕەوی عام بوو، وە خەڵکی ئەم ناوچە شەرمیان لە من نەئەکرد، لە دڵی خۆما داوای کۆمەکی و یارمەتیم لە حەزرەتی پیر کرد کە کاری بفەرموێ ئەمساڵ خەجاڵەت و شەرمەزاریم بەسەرانەیەت، کە بۆ قەراخی ئەولای باخەکە ڕۆیشتم تەماشام کرد مارێکی ڕەش و گەورە لەوێ حازرە، لە دڵی خۆما ووتم ئەگەر ئەم مارە بۆ پارێزگاری ئەم باخە هاتبێ لەگەڵ ئەوا قسە ئەکەم ئەویش ئیشارە ئەکات ئەمجا لێی نزیك بوومەوە ووتم ئەی برای ڕەش خۆش هاتی سەری بەرزکردەوە و نایەوە سەر زەمین دیسان ووتم تۆ لەم لایەوە باش وشیار بە، منیش بەناو باخا ئەگەڕێم ئیشم هەیە، دیسان سەری ئیطاعەی بەرزکردەوە و لەسەر زەوی داینا لەپاشا هەرکەس بە خیانەت و ناپاکی داخڵی ناو ئەو باخە ببوایە ئەو مارە پەلاماری ئەدا و هێرشی بۆ ئەبرد و ڕاوی ئەنا، زۆریان هاواریان بۆ من ئەهێنا و ئەیانووت وەرە با ئەم مارە سامناکە بکوژین، بەکورتی تا حەزرەتی شێخ تەشریفی موبارەکی هاتەوە ئەو مارە لەگەڵ منا هاوڕێیەکی پارێزەری من بوو، بە جۆرێ لەگەڵ ئەو مارەدا ڕاهاتم نە من لەو سڵم ئەکردەوە نە ئەویش دوورە پەرێزی لە من ئەکرد، کاتی وا هەبوو پێم ئەهێنا بەسەر پشتیا هیچ جووڵەی نەئەکرد، کاتێ سید مصطفی هاتەوە ئەو مارەی دی ترسا ووتی: تا ئەو مارە لەو باخەدا بێ من قەرار ناگرم هەرچەن ووتم مەترسە ئەوە شێخ بۆی ناردووین ئەویش باخەوانە، هیچ دڵنیایی پەیدا نەکرد ناچار چووم بۆ خزمەت شێخ فەرمووی سید مصطفی لە مار ئەترسی با نەبێ کە هاتمەوە مارەکە نەمابوو، لە پاشا عەوام و هەرزەی ئەو ناوچە بە ئاشکرا دەسیان کرد بە بێ شەرمی لە ڕنین و دزینی بەر و ئەمەری ئەو باخە ناچار چوومەوە

خزمەتی و عەرزیم کردەوە، شێخ فەرمووی، بۆ طلبی مار هاتووی؟ یەك ماری تر لەگەڵ خۆی بهێنێ کە گەڕامەوە دیم ماری رەش لە جێی خۆی بوو وە مارێ تری لەگەڵ دایە تا میوەهات ئاخر و ئۆخر و کۆتاییان دێت، ئەو دوو مارە پاسی ئەو باخەیان کرد وە لەگەڵ ئێمە هامدەمی و یاریەدەر بوون.

رۆژێ شێخ سەلیمی تەختی هاتە باخەکەوە، ووتم خۆت دەس مەبە بۆ میوەکان ئەو مارە پەلامارت ئەدات، فەرمووی ئەو رێگری من ناکات و بە تەنیا چووە باخەکەوە کاتێ دەس ئەبا بۆ ترێ پەلاماری ئەدات تەماشام کرد بە راکردن گەڕایەوە وە پێی بەر بەرد کەوتبوو بریندار بوو بوو، وە زۆر لەوانە دانیشتووی ئەم جێگەن ئاگاداری ئەم باسەن.

**ك ٢١٣:** حاجی حسینی گوڵ عەنبەری فەرمووی:

کاتێ لە سەفەری حەج گەڕامەوە حەزرەتی شێخ فەرمووی خۆت بەم هەموو بچووکی‌یە دەنگی بەو جۆرە گەورەت لە کوێ بوو؟ لە رێگەی حیجازا ئەوە چ هاوارێ بوو ئەت کرد؟ عەرزم کرد ئەوە یەك شەخسی شیعە جوێنی دا بە حەزرەتی عمر ﷺ منیش لە ووشتر پیادە بووم کە بچم بیکوژم، رەفیقەکانم نەیان هێشت خەیاڵم کرد شەو خۆمی پێ بگەیەنم وە ئەو باش بە سزای خۆی بگەیەنم دیسان تۆڵەیم حەواڵە بە هیممەتی بوزورگان کرد ووتم یا شێخ هاوار خۆت ئەم وەزعە بە حەزرەتی عمر خۆشنودی خوا بێ بگەیەنە هەردووکتان هیممەت بفەرموون تۆڵەم لەم شیعە بەد ناوە بۆ بسێنن، لە پاشا تەماشام کرد ووشترێ لەدوورەوە رای ئەکرد وەك شێت بەم لاو لادا ئەهات و ئەچو لە پڕ خۆی بە تەنیشتی ئەوشیعە نالەبارەدا دا، شیعەی بەد بەخت چارە رەش بە قەدەر یەك مەتر لەسەر ووشترەکە بەرزبوەوە و بە زەویدا کەوت لاشەی پیس و گلاوی شەقی برد وە دڵی شکاوی من شیفای بۆ هات.

**ك ٢١٤:** جارێ یەکێ لە ئەهلی ماڵی حەزرەتی شێخ ناڵە ناڵی یەکێ ئەبیسێ وە تەماشا ئەکات حەزرەتی شێخ هەندێ دەرمان هەڵ ئەگرێ بەدوای ئەو ناڵینەدا دەڕوا، دوایی پرسیار لە حەزرەتی شێخ ئەکات، حەزرەتی شێخ ئەفەرمووی: ئەوە کاموسی‌یە جنی‌یە لە خزمەت شێخی سراج الدین قدّس سرە موسڵمان بووە، هەروەها جارێ تر حەزرەتی شێخ تەشریفی ئەبا بۆ حەوزی کامووسی وە یەکێ لە حەرەمانی خۆی لە خزمەتیا ئەبێ گوێی لێ ئەبێ یەکێ لە خزمەت شێخا قسە ئەکات و وە هیچ کەسیش لەوێ نیە، لە پاشان عەرزی ئەکات لەگەڵ کەسێکا گفتوگۆت بوو کەسیش دیار نیە، ئەفەرموی کاموسی بوو لەبارەی شتێکەوە پرس و رای پێ کردم، وە هەروەها جارێکی تر لە بابەت کوشتنی مصطفی ناوی بیارەیەوە کە منی خستبوە رەنج و نارەحەتی داوای رەزامەندی لێ کردم[1]، ووتم نە رێگەت ئەدەم نە رێت لێ ئەگرم لە پاشا هەر لەو شەوەدا مرد.

**ك ٢١٥:** جەنابی خوا لێ خۆشبوو محمود پاشا جاف[2] لە بارەی ئەولادی نێرینەوە موڕاجەعەی بە حەزرەتی پیر کرد، وە عەرزی کرد دۆعای بۆ بکات فەرمووی دۆعای من چاو بە یەکا نانە بۆ بەیانی ئەو رۆژە فەرمووی: ئەمشەو لە خزمەت حەزرەتی غەوس‌دا لە بابەت ئەولادەوە قسەم کرد، فەرمووی محمود پاشا لەمەو پێش پەیمانی چەند شتێی پێ دابووم، ئەو عەهدانە بە جێ بهێنی منیش دۆعای ئەولادی بۆ ئەکەم، محمود پاشا ووتی ئەزانم تۆ ئەزانی ئەو شتانە چی‌یە؟ بەڵام دەنگ مەکە إن شاء الله ئەو پەیمان و عەهدە بەجێ ئەهێنم، کە سەیرم کرد لە پشتیا کوڕێکی

---

(١) لە نوسخەیەکی ترا ئەفەرموێ: یەکێ لە ئەهلی بیت عەرزی ئەکات کە لە خزمەتیا بوو بۆچی حوکمڕانی ئەوانیش ئەکەن؟

(٢) ئەم کەراماتە یەکێکە لەو سێ کەرامەتەی کە حەزرەتی ضیا بە خطي خۆی دەسکاری کردوە وەك لەو و دیو روون ئەبێتەوە.

جوان و شیرین دیاره، ووتی ئەم تۆوە ئەفەرمووی لە کام مەزرەعەدا[1] بچێنرێ؟ ووتی (فلان) بۆ بەیانی لەگەڵ ئەو حەلاڵەی هاتنەوە منالەکە نەقڵ بوو بوو پێم ووت خێزانت حاملە وە هەرکات منالەکەی بوو ناوی بنێ محمد علی دانیشتوانی خزمەتی حەزرەتی پیر سەریان سڕما لەو گوفتارە کاتێ یاداشتی خۆی تەواو خوا کوڕێکی پێ بەخشین و بردمانە خزمەتی و ناوی نا محمد علی لە پاشا کوڕێکی تری بو خێزانم ناوی نا حسین دوایی بە (مەفادی) إذا ثنّي فثلّثْ[2] محمود مشورەتی کرد دەرمان بخوا کەسێیەم بێتە جێگە ووتم مەحاڵ و ممتنیعەو کلّ شيء عنده بمقدار, حەزرەتی ضیا بە خطی مبارەکی خۆی نووسیویەتی ئەفەرمووێ: (کوڕێ تری بوو ناوم نا ئەحمەد مشورەتی کرد کە دەرمان بە عەمەل بێنێ تا بە حوکمی خيرُ الرّفقاء أربعة ببێ بە چوار جوابم دایەوە محالە و ممتنع وكل شيء عنده بمقدار)[3].

**ك ٢١٦:** جەنابی خوا لێ خۆشبوو ملا عبدالقادری مدرس فەرمووی:

ڕۆژێ لە خانەقادا لە حضوری حەزرەتی پیرا دانیشتبووین مەجلیسێکی خۆش و بە بەرەکەت بوو ووشەی خۆش و فەرمایشتی شرین و خۆش دڵی حازرانی دڵخۆش و شادمان فەرمووبوو کوت و پڕ لە کاتی ئەم فەرمایشانەدا فەرمووی حەج و پاپۆڕ بەحر و حاجی سعید ئەفەندی ئا لەم ووشانەی بەتێکەڵاوی و بە پەلە فەرموو هەستا تەشریفی بە بێ کەوش لە پێ کردن بە پەلە تا حەوشی خانەقاکە گەیشت و گەڕایەوە چووەوە سەر فەرموودەکانی پێشوی، ئەو حاجی سعید ئەفەندیە زاتێکی دیار بوو مخلص و موریدی حەزرەتی پیر بوو، ماڵی لە بەغا بوو، ئەو ساڵە لە حەج بوو، کاتێ

---

(١) یانی ئەم منالە لەکام ژنیان ئەبێ، مەزرعە یانی ژن.

(٢) هەر شت بوو بە دوو ئەشبێ بە سێ.

(٣) ئەوەی لە بەینی دوو کەواندا خەت و نووسراوی پیرۆزی حەزرەتی ضیایە قدس الله سرّه العزیز کە راستی کردۆتەوە، کە بۆ چوارەم منالە نەك سێیەم، ئەمە سێیەم جێگەیە کە حەزرەتی ضیا بە خطیپیرۆزی خۆی لەسەری بنووسرێ.

کە حاجی سعید ئەفەندی گێڕایەوە کە لە بەحری جدّە کە بەرەو عەقەبە ئەگەڕێتەوە تووشی گێژ و فەرتەنەی دەریایی بووین پاپۆڕەکەمان کەوتە خەتەرەوە، داوای کۆمەك و یارمەتیم لە حەزرەتی پیری دڵ مونیر حەزرەتی عمر کرد بە ئاشکرا تەشریفی حازر بوو بإذن الله لەو بەلاّ و تەنگ و چەڵەمە رزگاری کردین فالحمد لله ربّ العالمین وە ئەو حاجی سعیدە ئەفندییە یەکێ بوو لە أشخاصی محترم و خاوەن شەخصیەت و زانایە پڕ لە محبەت بوو.

**ك ٢١٧:** لە جەنابی عالمی فاضل وە زاتی پڕ شەخصیەت و وەقر و ئەدەب ئەمەری درەختی خۆشخوڵقی و صلاحەت و خاوەن پایە کاکە شێخ مولانا خالدی برای حەزرەتی پیری دەستگیر شا عوسمان گیانم بیست فەرمووی: کاکەم یانی حەزرەتی شێخی سراج الدین داوای ئافرەتێکی بۆ خۆی کردبوو، بەگزادەکانی هەورامان کە بە تەما بوون داوای بکەن زویر بوون و ووتبویان تفەنگ ئەنێن بە شێخ عوسمانەوە، وە لەو کاتەدا من لە دووڕووە بووم هەڕەشە و تهدیدیان بۆ منیش ناردبوو، شەو لە خەومدا بە خزمەت حەزرەتی شێخ ضیاء الدین(قدس سره) گەیشتم فەرمووی: خەبەریان بۆ بنێرە خەریکی چین ئەوان تەنیا ٢ مانگیان ماوە حوکم لە هەورامان بکەن، بۆ دوو مانگ بۆچی خۆیان بەد ناو ئەکەن لەپاش ئەو دوو مانگە أمیر عبدالله[1] خان هاتە هەورامان چی هەورامی ومەریوانی بوو لە بەگزادە هەمووی گیران و بران چەندە ساڵ لە حەپسا بون دوای فەوتانی رەزا شای لەناوچوو چی ما هاتنەوە چی نەما نەما و بەرەو ئەولا کەوتەڕێ.

---

(١) أمیر عبدالله خانی تماسبی لەگەڵ رەضا بەهلەوی ئیران باوکی شای لابراو و دو بەدو أحمد شای قاجاریان دەرکردبو بەلاّم زۆرتر لەگەڵ ئێران تابیعی أمیر عبدالله خان بون رضا شا کە ئەوەی زانی ترسی لێهات ئەو بە پاشایی دابنێن، بە فێڵ ناردی بۆ جێگەیە بە ناو دامرکاندی شەڕی قەدەم خێر ئەمری دابوو لە رێ بۆی دابنیشن بیکوژن لە رێ کوشتیان.

**ك ٢١٨:** حەزرەتی قطبی زەمان ضیاء الدین کوڕی عوسمان فەرموی:

جاریٚ ئەمریٚکم لە لایەن حەزرەتی خاوەن پایە و شەرەف غوس الثقلین (قدس سره) هاتە سەرم کە بڕۆم بۆ بەغا ئجازەم لە باوکی گەورەم شیٚخی سراج الدین خۆشنودی خوا بیٚ وەرگرت بەرەو زیارەتی بەغا کەوتمە ریٚ، کاتیٚ بەو مەزارە مبارەکە گەیشتم، بە پەنهانی لە نیوە شەودا چووم بۆ زیارەت، ئەمجا پیٚش ئەوەی بگەمە ئەویٚ حەزرەتی غەوس (قدسّ سرّه) ئاگاداری یەکیٚ لە دەرویٚشانی خۆی فەرموو کە کاروباری تۆ حەوالە بە کوڕی مەعنەویم شیٚخ عمرە وە دە رۆژی تر دەگاتە ئیٚرە، و لە شەوی گەیشتنم بەو شویٚنە بەرز و گەورە و بە نرخە ئەو دەرویٚشە منی ناسی وە بە شەرەفی تمسك و إرادەت لەو کاتە پیرۆزەدا نایل بوو ئەمجا لە شەوی سیٚیەم لە کاتی موراقەبە لە پڕ خەبەریان دامیٚ (تهیأ لقد جائكَ السلطان)[1] هەندیٚ خووڕەووشتی لە سعید ئەفەندی بەغایی ئەچوو وە ئەم زاتە داوای تمسّکی کرد، ووتم تکا و لالە لە خزمەت حەزرەتی غەوسا بکە یارا من لەم مەقامەدا تەوانای طەریقەت دانم نیە بەلاّم ناوی کەس مەبە، بزانین یار مەیلی بە کیٚیە و کیٚ پیٚویستە، لە پاشا کە بە خزمەتی گەیشتبوو فەرموو بوی (هذا الأمر بعُمَر) وە تۆ موڕادیشی لەم فەرموودەیەوە زۆر مەسرور و شادمان بوو دیم گەڕایەوە ئەی ووت بشّرني بأني مراد[2] لە پاش کامەرانی بە شەرەفی قبولّ و حەوالەی ئەو حەزرەتە لەو واقیعەدا، خەیالّم هەروەك غەوسی ثانی و حەزرەتی ئیمامی رەبانی (قدّس سرّه) مەنسوبانی خۆیان نیشان داوە و ژمارەیان بۆ دیار و ئاشکرا کردوە منیش ئەگەر منسوبانم بۆ معلوم بیٚ لە خزمەت حضوری سلطاناندا ئایا زۆرە یان نە ئایا لە بارەگای حەزرەتی ئەقدەسدا قبوولّن یا نە، خۆش ئەبوو زۆر باش ئەبوو دەسبەجیٚ هەتا چاو کارکات ویسعەتیٚ پەیدا بوو جیٚگەیەکی زۆر بەربلاّو کوت و پڕ هاتە بەرچاو ئەمجا خەلّکیٚکی یەکجار

---

(١) ئامادە بە وا پاشا تەشریفی هیٚنا بۆ لات.

(٢) حەزرەتی غەوس مزگیٚنی پیٚ دام فەرمووی: مژدە بیٚ تۆ مرادی یانی وویستراو.

زۆر پەیدا بوو وەکو قتویەکی کبریت[1] پڕی بکەیت جێگەی یەکێ تری نەمێنێ وابوو، بەڵام هەموو بێ عەمامە[2] بوو ئایا مقبوڵن یا مەردوود، دەسبەجێ لە سینەی موبارەکیەوە قەدرێ عەمامە خارج بوو، ئەنجا درێژ بوو تا وای لێهات یەك موریدە نەما بێ عەمامە بێ، ئیشارەی فەرموو سەیری کە هەموو قبووڵ کراون ئەنجا زۆریشیان بەکۆمەڵەکەیانا دیارە الحمد لله علی ذلك (ربّنا آتنا في الدنیا حسنةً وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار) ئینجا لەکاتی چێشتەنگاو شێخ سعید ئەفەندی هات وە لە ئێوارەدا تمسّکی کرد و تسلیم بوو، وە بە ماوەیە کەم موجاز بوو یانی ئیجازەی طەریقەدانی درایە لە پاش ئەویش ڕۆژێ شێخ محمود[3] ئەفەندی بەغایی هات داوای تمسّکی کرد حەواڵەی إستخارەم کرد، ووتم بچۆ إستخارە بکە[4] ووتی لە کاری خێرا پێویست بە إستخارە نیە، ئێستخارەشم کردوە تۆیان بە من نیشان داوە، چونکە لە خەودا دیم شێخ لە قاپیەکەوە هاتە دەرێ دەستێکی نا بە سەرچاوما ئیشارەی بە تزکیەی نەفسی کرد[5]، وە دەستێکی بەسەر دڵم دا ئیشارەی بە تصفیەی[6] قلب کرد لەو کاتا بۆم کەشف بوو لە نێو چاوم نووسرابوو ربّ یسّر ولا تعسّر ووتم منیش پێویستە ئیستخارە بکەم چونکە لە ئادابی ئەم طەریقە پیرۆزەیە شێخ محمودی ناوبراو لە قسەکەم مەلول بوو هەستا و ڕووی وەرگێڕاو ڕۆیی، منیش بە دوای ئەودا مەشغوڵ بە موڕاقەبە بووم دیم حەزرەتی شێخی باوکم سراج الدین (قدس سره) حازر بوو هەندێ لە ئاداب و نصیحەتی دڵسۆزانەی تەقریر فەرموو، وە لەو کاتەدا

---

(١) قتوی کبریت: شقارتەی پڕ لە دەنك.

(٢) عەمامە: مێزەر،

(٣) شێخ محمود: برازی نەقیبی بەغا بوو.

(٤) نوێژی إستخارە یانی: یانی نوێژکردن بە نیەتی دڵ دامەزراندن لەسەر ئەو کارەی مەصلەحەتە.

(٥) تزکیەی نەفس: نفسی إنسان واەی لێ بێ متیعی ئەمری خوا بێ و نەهی بکات لە خراپە بە بێ تکلیف و زۆری.

(٦) تصفیەی قلب: یانی پاکردنەوەی دڵ لە ژەنگی گوناح.

هەستم کرد یەکێ تەشریفی هاتە ژوورەوە دانیشت وە من لە مەشغوڵییەکەم دەستم هەڵ نەگرت خەبەرێکم نەپرسی تا خۆی هاتە فەرمایشت ووتن و فەرمووی محبوبی صمدانی حەزرەتی غەوسی گەیلانی (قدس سره) ئێستە لە تۆ مەلولە و گلەییت لێ ئەکات و ئەفەرموێ بۆچی من زۆردارم کە شێخ عمر نایەڵێ کە ئەولادی من بگات بە حق ئەوجا ووتم:

ئـــەی نەفســـی ناســـك بـــای صـــەبا
لای یـــــارم هــــاتی مەرحـــــەبا[۱]

مـنی هـەژاریش وەك زەرەکـەم کـەی بـۆ ئـەوە ئەشـێم لـەم جێگـە موبارەکـەدا ئیرشادی خەڵك بکەم بەڵکو ئەگەر قبووڵ بکرێم من بۆ خۆڵ و خاك رشتنی ئەم بارەگایە هاتووم.

لــە هــەر کــاتێ کــە رۆژ دیــارە هــەتاوە
ســوها بێ نــووره پــەردەی پیــا دراوە[۲]

فەرمووی خاك و خۆڵ و پاکردنەوە ئەوە نیە گسك هەڵ بگری و مەنزڵ و دەرووبانی پێ بماڵی، بەڵکوو ئەوەیە کە ئەولادەکانی ئەو لە پەیوەندی دنیایی دەنی و درك و داڵی تعلّقات بە محبەت و خۆشەویستی بێجگە لە خوای تەعالی رزگار

---

(۱) دەقی فارسی‌یەکەی:

أی نفس خرّم مرحبا از بريار امدهءي مرحبا

(۲) سوها: ئەستێرەیەکی زۆر لاواز و بێ هێزە، یانی کە رۆژ هەڵهات لە ژێر شەوق و تیشکی رۆژدا شاراوەیە، مەبەسی حەزرەتی شا عومەری پیری دەستگیر نەفس شکاندنی خۆی بوە، یانی لە مقامی حەزرەتی غەوس‌دا قدّس سرّە کە وە ك رۆژ وایە من وەك سوها وام.

بکەیت، بە ئەوامر و نەواهی رەغبەت و حەزی تەواو پەیدا بکەن وە واز لە خەڵك بێنن وە بە حق علاقەمەند بن کە ئەم فرمایشتی پڕ لۆمە و عیتابەم بیست.

ووتم بەخێر بێیت ئەی یاری سەرمەست

زوو لە داوێنت من بەر نادەم دەست[1]

تا ئێستە لە کوێ بووی، فەرمووی بۆ زیارەتی حەزرەتی شێخ حسن بصری[2] (خوا لێ خۆشنوود بێ) ئەچووم، حەزرەتی حسین سیّد الشهداء ﷺ لە ناوەڕاستی ڕێگە منی گێڕاوە بۆ ئەوەی ئەم ریسالەیە بە جەنابت بگەیەنم و پێت تبلیغ بکەم و وما علی الرسول إلاّ البلاغ هەر لەم کاتەدا دیم شێخ محمود گەڕایەوە، وەگوێی لەم ووتو وێژە بوو، یانی بە هەمان رووداو ئاگاداری پەیدا کرد، وە بە پێ فرمانی گەورە گەورانی دین لە نزیك رۆژئاوا بوونا تلقیلنی طەریقتم کرد وە بە ئادابی مقرّرە تعلیم کرا، ئەمجار بە پێنج جار کە توجّهم لێ کرد وای لێ هات بۆ خۆی ئەی ووت هەر کاتێ مەیل بکەم بە خزمەت (جدّ – باپیر)ی خۆم حەزرەتی غەوسی ثقلین ئەگەم (قدس سره) وە بە مەرامی دڵی خۆم قسە لە خزمەتیا ئەکەم الحمد لله علی ذلك وە ئەو شەخسە کە لە هەندێ خو و شێوەیا وەك شێخ سعیدی ئەفەندی وە لە هەندێکا وە وەك شێخ محمود ئەفەندی وابوو ئیشارە بە هەردوویان بوو کە لە طرەف حەزرەتی غەوسەوە حەواڵە بە من کرابوون.

حەزرەتی ضیاء الدین مجازی حەزرەتی سراج الدینە وە طەریقەی لە خزمەتیا کەسب کردوە.

---

(١) خوش امدی ای نیگار سر مست     زوو دامن ازدست

(٢) شێخ حسن بصری (قدس سره) زاتێکی گەورە و پیرۆز و دەستەڵات دارە، یەکێکە لەو بزورگەوارانەی کە چاویان بە دیدار و دڵ یان بە مجلسی أصحاب و یارانی پێغەمبەری نازدار ﷺ شادمان کامیاب بووە، یانی ئەم زاتە عظیمە یەکێکە لە تابعین رحمة ا لله علیهم أجمعین.

**چەن فەرمایشێکی حەزرەتی ضیاء الدین کە ئەفەرموێ:**

کاتێ کە حەزرەتی پیر (خوا لێ خۆشنوود بێ) ئیجازەی ئیرشادی دامێ یەکەم کەسێ کە خەلاتی کردم حەزرەتی غەوثی الثقلین بوو جبەی کەرامەتی خستە سەرشانم لە دوای ئەو خەواجە محمد أویسی بخاری مشهور بە شاهی نەقشبەند بوو خەلاتی کردم.

چە شەوی پیرۆز چە ساعەتی خۆش

لەو شەوی قەدرا خەلاتیان کردم

عەجایب نیە کە کامەران بووم

بە موستەحەقی زەکاتیان کردم[1]

**ك ۲۱۹:** کۆمەڵێ زۆر ئەزانن جوولەکە یە لە دێی گول عونبەر ئیخلاص و ئیرادەتی زوبانی لە خزمەت حەزرەتی پیری دەروون مونیردا ئەبێ، وە بە ئاشکرا لە روو مەنسوب ئەبێ وە بە جوولەکەی شێخ عمر مەشهور ئەبێ، رۆژێ حەزرەتی پیر (قدس سره) کتێبی حدیثی شریف ئەخوێنێتەوە، بە پێ فەرموودەی پێغەمبەری عظیم الشأن ﷺ نزا و دۆعای کافری زۆر لێ کراو دەرهەق موسڵمانی زۆردار لە بارەگای ربّ العزة قبوڵ و وەرگێراو ئەبێ.

بە رێکەوت قەدەر ئەی ئەهێنێتە پێشەوە رۆژی دووەم پاش خۆندنەوەی ئەم حدیثە کە بەو مفهومە فەرموبوی مدلولی حدیثی شریف رووئەدا وە سرّی ئەو ئیعجازە ظاهر و دەرکەوتو ئەبێ لە دێی ناوبراو شەخسێ ئەزیەت و ئازاری جوولەکەکە ئەکا وە زۆر دەردی سەری ئەدا ئەویش لە ئەسەری ئیخلاصی خۆیەوە

(۱) دەقی فارسی‌یەکەی ئەفەرموێ:

| | |
|---|---|
| چ مبـــــارك سحری بوود چ فرخنده بشی | ان شب قدر که این تازه براتم دارند |
| من اگر کام روا بودم و خۆشد ل چ عجب | مستحق بودم واینها به زکاتم دارنـد |

هاوار ئەکات شێخ عمری شێخ عوسمان هاوار دەسبەجێ شەخسی ئازار دەر و زۆردار سـکی دێتـە ئـێش وە بـە دەرد و ئـازار گرفتـار ئـەبێ ئەوانـەی حـازر ئـەبن لەوێـدا جوولەکەکە ئەگرن ئەڵێن ئەگەر بە پەلە نەڕۆی دۆعا لـە خزمـەتی شـێخ (قـدس سـره) نەیەنی بۆ ئەم شەخسە ئێمە تۆ ئەکوژین، جوولەکەکەیش لە ترسی گیانی خۆی زۆر بە پەلە دێت بۆ خزمەت شێخ (قدس سره) مەسـەلەکە بـاس ئـەکات ئـەویش دۆعـای بـۆ ئەنوسی و ئەیداتێ تا جوولەکە ئەگاتەوە کابرا وەفات ئەکات.

**ك ٢٢٠:** جەنابی ملا محمدی هەرەوی فەرمووی:

فقێ عبدالله ناو ماوەیە بە لەرز و تا گرفتار بـوو، بێ هێز و لاواز بـوو زۆر، وە تەواو بێ تین و پەریشان بوو، هات هەواڵی پرێشان حاڵی خۆی عەرزی حەزرەتی پیر کرد، حەزرەتی ضیاء فەرموی ئەی (تا) ئیتر مەیگرە ئیتـر ئـەو نـەخۆشی‌یـە نەگەڕایـەوە سەری، وە لەم جۆرە زۆرمان دیوە کە رووی داوە.

**ك ٢٢١:** چەندەها کەس کە جێی بڕوا و صحیح الروایە بـوون بـەیانیان کـردوە: جارێ لە بارەگاهی حەزرەتی پیردا چەن زەرفی گەورە و مەنجەڵیان لەسەر ئـاگر دانـاوە پڕ لە چێشت بۆ ئەهلی خانەقا و مەدرەسە و باقی دەست و پێ و بێ نـەوایان و ئەچـنە خزمـەت حـەزرەتی شـێخ (قـدس سـره) عـەرزی ئەکـەن کـە ئەسـڵەن رۆن بـۆ چێشـتی خانەقا و هیچ لایەك نیە، فرمان ئەفەرموێ لە باتی رۆن ئاو بە سەر چێشتەکانا بکەن، گوێ رایەڵی فەرمایشتەکەی ئەکەن وە نزیکی سـەعاتی سـەری مەنجەڵـەکان دائەپۆشـن دوای کەچێشت تێ ئەکرێ ئەبینن لـە جـاران زۆر چـەورتر بـەتام تـرە، ولله الحمـد فی السموات والأرض وما بينهما وصلى الله على أفضل الخلايق وأسبق كلّ سابق محمد ﷺ وآله الطاهرين وصحبه الطيّبين والتابعين والصالحين أجمعين آمين.

ك ٢٢٢: جەنابی شێخ یوسف سەقزی فەرمووی:

جارێ حەزرەتی شێخ (قدس سره) لەسەر فەرشێ تەشریفی دانیشتبوو، چەن کەسێ لە خزمەتیا دانیشتبوون، من و چەند کەسێکی تر بە پێوە لە حزوریا وەستا بووین، لەو کاتا بارانێ وەها باری کە لە هەموو لایەکەوە لافاو هەستا، وە یەك دڵۆپ بەسەر ئەو مەجلیسەدا نەباری، تەماشای ئاسمانم[1] کرد ئەمدی لە لای ژوورەوەی ئێمەیشەوە باران دێت، بەلاّم بە قەدەر درێژی رمێ (دوو سێ میتر زیاتر) بارانەکە بەم لاولادا بلاّو ئەبێتەوە وە لە دەرەوەی مەجلیسەکە ئەکەوێتە سەر زەوی.

ك ٢٢٣: گێڕایانەوە کە عبدالفتاح بەگی جوانڕۆیی بە نیەتی خراپەکاری ژنێ ئەباتە جێیەکی پەنامەکی فەوراً حەزرەتی ضیا حازر ئەبێ ئەفەرموێ: ئەگەر لەم خەیاڵە پەشیمان نەبی ئەت فەوتێنم وە بە هیلاکت ئەبەم، دەسبەجێ حەیران و پەرێشان ئەبێ وە لەو کردارە پەشیمان ئەبێ جزاه الله أحسن الجزاء آمین.

ك ٢٢٤: صۆفی عبدالرحمن ناو کە ژیانی خۆی بردە سەر بە شێوەی بێ ژن و ماڵی بە خزمەتی خانەقای موبارەکی بیارەوە لە سەرەتای ژیانیەوە خەریك بوە، وە هیچ خەمێکی دنیای نەبوە لە بون و نەبوون، وەنەی کردبوو بە بار بەسەر دڵیەوە هەرگیز، ئەم پیاوە خاسە گێڕایەوە ووتی: نەوت لە چرای خانەقادا نەما بوو زۆر کەم

(١) جەنابی خاڵۆ شێخ ئەحمەدی شاکەلی گەرمیانی گێڕایەوە فەرمووی: لە خزمەتی حەزرەتی پیردا شاهی عوسمان (قدس سره) لە ناوچەی گەرمیان ئەیانەوێ وێنە بگرن لە دەرەوەی دێ کە لە سەرقەلاّی شێروانە لەو کاتەدا پەڵە هەورێ رەشی هێنا کە نیشانەی بارانی پێوە بوو، کە ببارێ بە سەرمانا، عەرزی ئەو عەزیزەمان کرد قوربان ئەوا هەوری هێنا و باران نزیکی دابارین یەتی ماوەی رسم گرتن نابێ، ئەو زاتە پڕ صیفاتە بە زەردە خەنەیەکەوە سەری موبارەکی هەڵ بڕی بۆ ئاسمان و بە دەستی پیرۆزی ئیشارەی بۆ لای هەورەکە کرد و فەرمووی من جاران باشتر بووم ئیشارەتم بکردایە بۆ هەور ئاوا دەسبەجێ هەورەکە نەئەما شاکەلی ئەفەرموێ بە قودەرەتی خوا و هیممەتی مورشید دەسبەجێ هەورەکە بلاّوبووەوە نەما.

نەبێ ئەو شەوە بەو نەختە نەوتە چرا گڕا بۆ سبەی ئێوارە تەماشای چراکەم کرد ووشك و برنگ هیچی تێدا نەمابوو، دام بە بەری دەستی خۆما چراکە تۆز و خۆڵی دەرچوو لێی، هەڵم گیرساند لە جارن شەوقی زیاتر بوو بە کورتی تا ٧ حەوت رۆژ هەموو شەو تا بەیانی بەو جۆرە دامگیرساند ئەو چرا بێ نەوت ئەسووتا عاقیبەت تاقەتی راگرتنی ئەو نهێنیەم بۆ نەکرا، ووتم ئەی ئەهلی خانەقا ئەمە ٧ حەوت شەوە ئەم چرا بێ نەوت ئەسووتێنم لەگەڵ وام ووت دەسبەجێ کوژاوە هەرچەند خەریك بووم ئیتر نەگڕا عەرزی حەزرەتی فاروقی دووەمیان کرد فەرمووی ئەگەر ئاشکرای نەکردایە تا ماوەیە زۆر هەر ئەگیرسا.

**ك ٢٢٥:** مەلا صاڵحی ئانچلی کە حیکایەت و ئەحواڵی ئەو شەخسە بە داستان گێردراوەتەوە، بە چەشنێ بێ ئەدەب بووە تاوەکوو نیسبەت بە حەزرەتی شاهی نقشبند و حەزرەتی گەیلانی(قدس سرە) قسەی بێ ئەدەبانە و بێ شەرم و تەقیەیی کردووە، بە بۆنەی وەرگرتنی عیلمەوە دێت بۆ بیارەی شریف دیسان لەوێش ئەو حاڵی ئینکارییەی دەبێ و بێ بڕوایی بەکار ئەهێنێ، وە چەندەها پرسیاری گران و گرنگ لەهەر بارێکەوە لە خزمەت قطبی زەماندا ئەکات.

حەزرەتی پیر بە هێزی نێزەی هیممەت و قوەی شمشێری شێرانەی خۆی لە بێشەی باطنی خۆیدا سکی سؤال و پرسیاری چی هەیە وەك مەڕێ بێچارە بۆ ئاواڵە ئەکات بەڵام خۆی تەسلیم بە زنجیری ئیطاعە و ملکەچی ناکات، تا رۆژێ حەزرەتی پیر بە چەن کەسێکی نزیکی خۆی بە پنهانی ئەفەرموێ تا سێ رۆژی تر شتێکی بۆ ئاشکرا ئەکەم وەحاڵێکی لێ دیاری ئەبێ کە خۆی تصدیقی دڵی بێ.

رۆژی سێیەم شەخسی ناوبراو ئەڵێ دیم نورێ وەك بەرق ئاشکرا و ظاهر بوو هات دای لە ملا عبدالرحمن کەوت ئەمجا دای لە ملامحمود ئەویش کەوت هات دای لە من ناڕەحەتی کردم، لە ترسی جەزبە هەڵسام چووم لە حوجرەی مدرّس خۆم شاردەوە، زۆر ئەعزا و ئەندامەکانم تووشی ناڕەحەتی بوو لەوێش بێ تاقەتی کردم،

فەقێكان بە حاڵیان زانیم بەزەییان پێما هات و كۆبوونەوە، حەزرەتی پیریان بە حاڵم ئاگادار كرد تەشریفی هێنا مـن لـەو وەختـا رابیطـەی شێخی ناتـەواوم ئـەكرد چونكە بیستبووم رابیطـەی شێخی ناقیص بەرەكەت كەم ئەكات، هیچ چـارەم نـەما دەخالـەتم خواست ئەمجا لوطفی لەگەڵ كردم دەستی بەسەر هەر ئەندامێكا ئەهێنا دەسبەجێ بەر ئەبوو تا خەلاسم بوو چوومە ژێر سایەی پیرۆزیەوە مشرّەف بە تمسّك بووم.

**ك ٢٢٦:** كوێخـا عبـدالوهاب كـە سەرپەرشـتیاری كاروبـاری خانـەقا بـوو وە لەلایەن حەزرەتی ضیاء الـدین(قـدس سـره) فەرمانـداری دامەزرانـدنی میوان و ئەوانە بوو كە ئەهاتن و ئەڕۆیین گێڕایەوە ووتی:

ساڵێ میقداری ٨ هەشت مست گـەنم لـە عـەمار[1]دا مـابوو لەبـەر كـەمی نـەمان ئەكرد بە ئارد، وەلە لایـەكی تریشـەوە هیچمان شـك نەئـەبرد، بـە قـەدەر ئەوەنـدەش قـەرزار بـووین، چـووم بـۆ هەمارەكـە تـا ئـەو ٨ هەشـت مسـت گەنمـە بدەمـەوە بـە قەرزەكەدا، كە دەرگام كردەوە بە قەدەر ٨ تەغار[2] گەنمی تێدا بـوو لەگـەڵ ئـەوە كـە ئەو عەمارە داخرا بوو كلیلی بە خۆم بوو، چووم عەرزی شێخم كـرد (قـدس سـره) فەرمووی: ئەگەر قسەت نەكردایە تا مانگێ دەوامی ئەبوو ئەنجا هەركەس لە نـانی ئـەو ئاردەی ئەخوارد رەوان ئەبوو یانی شۆر ئەبوو عەرزی پیرمان كرد فەرمووی: حەلاڵی تەواو[3] لەم زەمانەدا كەمە و دەست نەكەوتوو نـادرە لەگـەڵ شـوبهە لـێ كـراودا یـەك ناكـەوێ كـە چـووە دەروونی إنسانـەوە نـاو سـكی لـە چـڵكی خـۆراكی غـەیرە مەرضی[4]پاك ئەكاتەوە.

---

(١) عەمار: هەممار.

(٢) تەغار: ٣٠ ربە یان (٣٠) تەنەكە بەگوێرەی رەسمی ولات لە مەریوان ٣٠مەن.

(٣) حەلاڵ تەواو: حلاڵی مەحض حەلاڵی پاك.

(٤) خۆراكی غیرە مرضی: خۆراكی ناپەسەند یانی شەریعەت لێی رازی نەبێ.

**ك ٢٢٧:** فەقێ کەرەمی شارەزووری ووتی: جارێ ٢٢٠ دوو سەد و بیست تەغار گەنمم لە خەرمانی حەزرەتی پیر (قدس سره) کردمانە عەمار و من هەمماردار بووم، حەزرەتی شێخ فەرمووی قبوولّم نیە بێجگە لە خۆت هیچ کەسی تر بێتە ناو عەمارەوە، هیوادارم تا کاتی بەهار تەواو نەبێ ئەمجار لەسەر فەرمانی حەزرەتی پیر هەر خۆم ئەچوومە ژووری زەخیرە وەهەر خۆم گەنمم لێ دەرئەهێنا تا کاتی بەهار، ٦٠٠ تەغار گەنم بە پێی دەفتەر لە منەوە تەسلیم بە حەزرەتی پیر کرا (قدس سره) هەندێکی بە حەزرەتی پیر خۆی هەندێکی تری بە گوێرەی پێویست بە خەڵکی تەسلیم کرا، هێشتا گەنم هەر مابوو.

**ك ٢٢٧:** جەنابی حاجی مصطفی ئەفەندی ملازم کە یەکێ لە خولەفای حەزرەتی پیر بوو (قدس سره) ئەمیرێکی دەروێش نیشان بوو ووتی: جارێ قومانداری[1] زۆر جوێن و قسەی ناجۆری دەربارە کرد، ئەفسەرەکانی سەربازگاکە ووتیان ئێمە مەزبەتە[2] ئەکەینەوە بۆت مۆر ئەکەین بە عەریزەکەوە قایمی بکە لە تەلگراف خانەوە بە شکات بۆ دیوانی هومایونی[3] حەواڵە بکە من ووتم لە تەلگراف خانەی خاتری خەمگینی خۆمەوە تەلگراف بۆ حەزرەتی شاهی ضیاء الدین (قدس سره) ئەکەم و بۆ ئەوم کردوە لە پاش سێ رۆژ بەڵکوو سێ رۆژ تەواو نەبوو فرمان لە ئەستەمبوڵەوە هات کە خۆی و ماڵ و منالی بە حەپسی و لە ژێر چاودێریدا رەوانە بکەنەوە، وە ئیتر بە سزا و ئاکامی خۆی گەیشت.

---

(١) قوماندار: قائد، پێشەوا.

(٢) مەزبەتە: مضبطة.

(٣) هومایوونی: ئاستانەی سەڵتەنەتی، بابی عالی، وەك ئەڵێن دیوانی مەلکی یا قەسری جمهوری.

ك ٢٢٩: جەنابى مصطفى ئەفەندى مولازم ناوبراو گێڕایەوە ووتى: سيد خالد ئەفەندى يوزباشى كە ئەويش يەكىٚ بو لە خولەفاى حەزرەتى پير (قدس سره) وە داخڵى بازاڕى دەروێشان بوو گێڕايەوە: كە جارىٚ حەزرەتى پير تەشريفى هێنا بۆ قەزاى صلاحيه[١] وە منش لەوێوە لە سەر سەفەرى كەركوك بووم، وە ريٚگە لەبەر چەتە و جەردەى گومڕا جێى ترس بوو، لە خزمەت پيردا پرس و ڕاو تەمەناى هيممەتم كرد فەرمووى: فلاّن ئايەت بكە بە ويردى زمانت إن شاء الله بە بەرەكەت إسمى سلام بەسەلامەت واردى دار السلام ئەبى، كاتىٚ گەيشتيتە دێى طاوغ[٢] يەكىٚ لە چاخانە ئەبينى زۆر ئەدەبى لىٚ بكە، زۆر زۆر لە خزمەتيا ئەدەبت بىٚ، لە پاشا خوا حافيزيم لە خزمەت سەراسەر نورى ئەو زاتە پيرۆزەدا كرد و هاتم، كاتىٚ گەيشتمە دێى ناوبراو، چوومە چاخانەكە ديم شەخسىٚ لەوانەى لەويا بوون گاڵتە و گەمەيان پىٚ ئەكرد، بوو بوو بەهۆى پىٚ رابواردنى عام و خاص لە دڵى خۆما ووتم ئەم پياوە بۆ خۆى ريسواى گشت كەس كردوە، دەسبەجىٚ هاتە بەردەمم دەستى گرتم و بردميە لايەكى پەناوە پێى ووتم سپاردەكەى شێخت بۆ فەرامۆش كرد بۆ لە خەتەرە و خەيالاّت واز ناهێنى پارێز بكە لە گومانى خراپ.

لە بوو هيچ كەس بە سووك مەڕوانە بىٚ جىٚ
چون لەناو لۆتيش وەلى ئەگونجى[٣]

لە پاشا دەستم ماچكرد وە داواى لىٚ بوردنم لىٚ كرد و بە خوام سپارد و رۆيشتم.

---

(١) صلاحيه: يانى كفرى.

(٢) طاوغ: قەرەتەپە.

(٣) فارسىيەكەى ئەفەرموىٚ:

بچشم عجب و تكبر بخلق نگاه مكن
كه دوستان خدا ممكند در أوباش

**ك ٢٣٠:** هەروەها مصطفی ئەفەندی ناوبراو گێڕایەوە ووتی:

عبدالقادر ئاغای یوزباش بۆی گێڕامەوە، جارێ لە صلاحیە شەریەتێکم بردە خزمەت حەزرەتی پیر کە بردمە خزمەتی فەرمووی بۆچی ژنەکەت نوێژ ناکات!!! عەرزی ئەو زاتەم کرد بەڵێ نوێژ ناکات، لەو کاتا سێوێکی بە دەستەوە بوو فەرمووی ئەم سێوەی بۆ بەرەوە بیخوات وە لە مەولا تەرکی نوێژ نەکات[1] ئەگەر تەرکی کرد بە قەدەر ئەم سێوە لە تەنیشتی پەیدا ئەبێ، لەسەر ئەمر و فەرمانی حەزرەتی شێخ سێوەکەم دایە خواردی تا ماوەیە تەرکی نوێژی نەکرد هیچ ناڕەحەتی و دەردێکی نەبوو، لە پاشا تەمەڵی دایە بەری و وازی لە نوێژ هێنا هەرچەن هەڕەشەکەی حەزرەتی شێخم ئەهێنایەوە سوودی نەبوو ئاخری تووشی دەرد و نەخۆشی بوو، وە تەنیشتی بەقەدەر سێوێکی لێ بەرز بوەوە وە هەر پزیشك دەرمان و تیماریان بەکارهێنا و زەحمەتیان لەگەڵا کێشا قازانج و سوودێکی نەبوو ئەمجا بە ماوەیە کەم خوا حافیزی لە ماڵی دنیا کرد.

**ك ٢٣١:** جەنابی ملا شێخ عبدالقادری چەمپاراو کە مشهور بوو بە ملا قادری دێوانە وە یەکێ بوو لەهەڵ بژێرراوان و وەرگیراو و مقبوڵانی ئەو زاتە وە مەئزون و ئیجازە پێ دراوی حەزرەتی ضیاء الدین بوو، وە لە حضوری پیرا هەمیشە غەزەل خوان و مەست و سەرمەستی بێ غەمی سوود و زیانە گێڕایەوە فەرمووی:

لە کاتی لاویدا کەوتە داوی حەزرەتی پیرەوە، پاش ئەوە تەمەسوکم بە داوێنی پیرۆز و پڕ فەڕی کرد، بە بێ ڕەزا و ڕەغبەتی حەزرەتی پیر بە نیەتی وەرگرتنی علومی دینی رووم کردە کۆیسنجەق پاش ماوەیە لەوێ عەهد و پەیمانم دا بە ئاوا کەوتمە داوی حەز و ئارەزووەکانی دنیایی، هەر کاتێ بە بارێ خەریکی نەفس پەروەری ڕەحەتی گیان

---

(١) تەرکی نەکات: یانی وازی لێ نەهێنێ.

وەلیش چونکە لەناو لۆتی ئەگونجێ.

و لەزایزی نەفس بووم، جاروبار بە تەماشای نەزەری حەرام لە مەیدانی عیشقی کەسێکا بە سەرم ئەبرد، کاتێ شێخم بیر ئەکەوتەوە ئەمووت ئەو لە کوێ ئەزانێ من چۆن رائەبوێرم و دنیا چۆن ئەبەمە سەر، خەریکی ئەم خەیالانە بووم رۆژێ لە ژوورەکەمدا دانیشتبووم خەیالی هیچ و بیری نالەبارم هێنابوە پێش، کتوپڕ شولێکیان دا بە لووتی نەفسما وە هەروها تووشی دەردێ بووم نەم ئەتوانی لەناو خەلکا دابنیشم[1]، ناچار رێگەی بیارەم گرتە بەر عیبرەت گیر بووم و پەندم وەرگرت وە هەموو خەیالێکم لە دەست دا دەستم کەوت ئەوەی کە دەستم کەوت.

**ك ٢٣٢:** ملا سید محمد ئەمینی عەنەبی فەرمووی: کاتێ لەسەر ئەمری حەزرەتی پیر چووم بۆ دێی هەیبە کە سەر بە پارێزگای کەرکوك بوو، وە ماوەیە لەوێ مامەوە، خەلکی ئەو جێگە زۆر دوژمنایەتییان لەگەلما بەکار ئەهێنا وە زۆریان ناحەزم بوون، بە چەشنێ شەو بە مەبەستی کوشتنم کۆ ئەبونەوە ئەهاتنە دەرگای مالمان بەلام لە یومن و بەرەکەتی پیرانەوە هەلیان دەست نەکەوت منیش ئەو حالەتە

(١) وەرگێر: ئەلێ مەرحومی باوکی لە فارسیەکەدا نوسیویەتی لە ژێر ئەم کەرامەتەدا کە شێخ مەلا قادری مەشهور بە مەلا قادری دێوانە کە لە دێی چەمپاراو بە ئیجازەی حەزرەتی ضیاء الدین ئیرشادی کردوە خۆی ئیجازەی دا کە ئەم کەرامەتە بنوسینەوە، ئەگەر ئیجازەی نەدایە نەمان دەنوسیەوە چونکە زۆر واقیع بوە لەم چەشنەی لێ واقیع بوە، هەروەك لە زەمانی ئیرشادی خۆیدا قائیمقامی چوارتا رەزا بەگ ناو قاری لێ گرتبو وە ناردبوی گوایا مەرحومی شێخ مەلا قادر بێنن بۆ چوارتا و إیهانەی بکات بەلام (مالێ مدیری) کە موخلیص بوبو نوسیبوی بۆ شێخ کە ئەم رەزا بەگە لێت بەقارە، و زالم بە گوێی کەس ناکات ئەویش نوسیبوی:

تن را بە قضادا د جان را بە رضا هرکس بە کسی ناز دو مابس بە خدا

رەزا بەگ بە دەردی لێ بەربوون دوچار ئەبێ تا ناچار تەشەبوسێ زۆر ئەکا رزگار ئەبێ وە ئەبێ بە یەکێ لە موخلیصان.

لەشم داوە بەدەم دەجلەی قەزاوە دلم داوە بە چنگ بازی رەزاوە
بەلێ هەرکەس بەسەر دارێ ئەنازێ ئەنازم من بە ألطافی خوداوە

نارەحەتی‌یە بەو بەد گوزەرانی‌یەوەم نووسی‌یە خزمەت حەزرەتی پیر لە وەلاّمدا فەرموبوی بۆ هیچ جێیەك خۆی نەقلّ نەکات ئەگەر خاکی دەرگای خۆی خواردوە لەویّ بمێنیّ کاتیّ ئەم وەلاّمەم وەرگرت تەنیا ٨ هەشت مەن خەلە نەبیّ هیچم شك نە ئەبرد کە ئەویش تەنیا بەشی ١٠ دە رۆژی نەئەکرد و چونکە ٧ حەوت سەر خێزانم هەبوو بێجگە لە میوان.

ماوەی ٢ دوو مانگ و یانزە رۆژ ئەو هەشت مەنە بەشی خێزان و میوان و بەشی هەژاران و هەتیوانی کرد، کاتیّ تەواوبوو، هەر ئەو پیاوانەی کە تەماداری کوشتنی منیان ئەکرد خۆشەویستی و رێزیان پەیدا کرد و جۆرەها نیعمەتیان ئەهێنا بۆ ماڵەوە بۆم لە سایەی سەری دۆستانەوە.

**ك ٢٣٣:** جەنابی سید محمد سعید کوڕەزای خوا لیّ خۆشبوو ملا عبدالرحیمی مەولەوی فەرموی: جاریّ ئەچووین بۆ زیارەتی حەزرەتی پیر حفظە الملك القدیر وأولادە وأحفادە لە وەرزی بەهارا بوو خەیار کەم چنگ ئەکەوت وای لیّ نەهاتبوو هێشتا کە لە هەموو لایەك دەست بکەوێت، بەلاّم لە دێی عەنەب زۆر هەوڵ و کۆششێکی زۆر بە نرخێکی زۆر گران دوو خەیارم چنگ کەوت کڕیم و بە هاوڕێ کەم ووت: ئەم خەیارانە ئەبەم ئەگەر شێخ خۆی فەرمووی بۆم بێنە بە کەشف کردی بە کەرامەت ئەوا چاکە ئەگینا ئەگەر خۆم خواردوومە ئاشکرای ناکەم و نای خەمە بەرچاو، کاتیّ گەیشتینە ئەویّ تانزیکی نیوەڕۆ هیچ هەواڵی نەبوو، کە کاتیّ گەیشتە نزیك بونەوە لە نوێژ چوومە گۆشەیەکەوە خەیارەکان بخۆم لە ناکاو بانگی لە من کرد فلان تا کەی خەیارەکان نایەنی؟؟؟ ئەو کاتە ئیتر خەیارەکەم پێشکەش کرد.

**ك ٢٣٤:** جەنابی شێخ یوسفی دەرگا شێخانی گێڕایەوە کە:

شێخ محمد عارفی سەرگەت بۆی گێڕاینەوە ووتی: حەزرەتی شێخ تەشریفی فەرموو بۆ هەڵەبجە وە من لە خزمەتیا بووم لە کۆڕ و مەجلیسی قایقمقامدا لەگەڵ قازی گفتوگۆیان ئەکرد، لەو کاتەدا خزمەتچی قازی هات قلیانی بۆ هێنا، قازیش قلیانەکەی پێشکەشی حەزرەتی پیر کرد، شێخ گێڕایەوە دواوە تا سێ جار بەم شێوەیە هەر ئەو پێشکەشی ئەکرد و پیر وەری نەئەگرت و ئەی گێڕایەوە دواوە، لە پاش ئەوە وەری گرت و فەرمووی ئەم قلیانە بۆنی کوفری لێ دێت قازی عەرزی کردئەم خزمەتچی منە گاورە بەلاّم تا ئێستە هیچ کەس نەی زانیوە.

وە هەر گێڕایەوە: باسی قورعە خستن و پشك هاتە ناو سەربازەوە لە دێها تدا، یانی بە قورعە ئەبران بۆ سەربازی، حەزرەتی پیر بۆ هەندێ دێ مەیلی بوو تکای ئەکرد، بەلاّم لە بابەت سەرگەتەوە بێدەنگ بوو، بینباشی(1) کە مەئمور تەجنیدی ئەو وەختە بوو عەرزی کرد من چاوەڕوانم لە بابەت ئەم دێیەوە چی ئەفەرموون؟ فەرمووی بە بۆنەی خزمایەتیەك کە ئێوە لەگەڵ خەڵکی ئەم دێیە هەتانە تکا و رجایەکەی حەواڵە بە خۆت بێ عەرزی کرد چە خوێشی و خزمایەتیەکم هەیە لەگەڵ سەرگەت دا، فەرمووی سیدن تۆش هەر لە رەگی ئەو درەختە پیرۆز و موبارەکەی.

عەرزی کرد راست ئەفەرموی وەهایە من سیدم بەلاّم تا ئێستە لەم وولاتە هیچ کەس نەیزانیوە.

**ك ٢٣٥:** کۆمەڵێ لە ئەهلی سیقەو باوەڕ پێکراو گێڕایانەوە: کاتێ حەزرەتی پیر تەشریفی بەرەو بەغا ئەکەوێتەرێ وە لەو سەفەرەدا ئەگاتە نیزیکی شاری باقووبە شێخ محمد قەرەداخی عەرزی ئەکات لەم شارە بچینە کوێ؟ حەزرەتی پیر ئەفەرموێ

---

(1) بینباشی: ووشەیەکی تورکی‌یە بە کوردی یانی سەرەکی هەزار نەفەر، باش سەرە بین ١٠٠٠ هەروەك ویز ١٠٠ أۆن ١٠ یە دیزباشی سەرەکی ١٠٠ أۆن باشی سەرەکی ١٠ دە.

تۆ لەگەڵ حەزرەتی شێخ عبدالرحمن هاتوی شارەزای بچین بۆ کوێ؟ عەرزی ئەکات ماڵی ئەفەندی فلان، وە ماڵەکەیان نزیکی مزگەوتە، ئەفەرموێ: میوانی تەلگراف خانە ئەبین (چونکە هەموو لا مەنزلی عیشقە چە مزگەوتە چە کەنیشت)[1] شێخ محمد لە بێ موناسەبەتی جێگەکە سەرسڕماو و بێدەنگ ئەبێ حەزرەتی پیر ئەفەرموێ: من مەئمورم و المأمور معذور لە پاشا بە بێ هیچ پێویستی‌یەکی دیار و ئاشکار دوو ڕۆژ لە تەلگراف خانە ئەمێنێتەوە ڕۆژی سێیەم موریدێ کە ناوی صۆفی عظم ئەبێ لە خزمەت حەزرەتی پیرا مجذوب ئەبێ ئەڵێ لەم تەلگراف خانە ئەوە کراوە ئەوە رووی داوە وەها فلان ئیش واقیع بوە هەرچی بوو بێ ئەیلێ، وە هەرچی کرابێ دەری ئەخا حەبیب ئەفەندی کە مەئموری تەلگراف خانە بوو ڕەنگی تێك ئەچێ و حاڵی پەرێشان ئەبێ دەست ئەکات بە گریان و زاری داوێنی حەزرەتی قوطبی زەمان شا عمری عثمان (قدس سره) ئەگرێ و دەخیلی ئەبێ و تۆبە ئەکات وە داخلی سلکی مریدان ئەبێ وە خۆشی دان بەوەدا ئەنێ کە ماوەی ٢٥ بیست و پێنج ساڵە کە تەمەنی خۆم بە خواردنەوە و هەموو کردارێکی نالەباردا بە خەسار و فیڕۆداوە کە لە پاشا ئیتر ئەو دایرەی پۆستە و تەلگرافە بوو بە جێگەی خەتم و تەهلیلە و زیکر و طاعەت و خواناسی.

لە پاش ماوەیەك تر حەزرەتی پیر زادەی خاوەن تمکین قطبی عارفین شێخ علاء الدین (قدس سره) تەشریفی بە فەرمانی پیری ناوچەوان پڕ لە نوور حەزرەتی ضیاء الدین ئەبا بۆ بەغا، هەمان ئەفەنی کە تەشریفیان ئەگاتە باقوبە[2] لە رووی دانپیانان و ئیعترافەوە عەرزی ئەکات و ئەڵێ:

لەو ماوەیەدا ئافرەتێکی خەڵکی کرماشان بۆ بروسکەیەك هات لە راستی جوانی‌یەکی دڵ رفێنی هەبوو، نەفسی ئەممارە بالسوء هەڵی فریواندم و تەفرەی

(١) ئەمە فارسی‌یەکەیەتی: همه جاخانەی عشقت چ مسجد چ کنشت.

(٢) باقوبە: بعقوبە.

ئیشەکەم دا تا خۆرئاوا بۆ ئەوەی بۆ کاری ناجۆر لەگەڵیا کۆ ببمەوە، ئەو ژنە شیعە قبووڵی کرد، ئێوارە هاتەوە منیش بۆ ئەو کارە ناڕەوایە و نالەبارە ئامادەبووم، لەناکاو دیم حەزرەتی ضیاء الدین قدّس الله سرّه العزیز بە جەسەد لە تەلگراف خانە وەستا وە فەرمووی ئەی کذاب ئەتەوێ عەهدی ئێمە بشکێنی [إنّ العهد کان مسئولاً] ئەگەر بە دڵ تۆبە نەکەی بە راستی دەسبەجێ بە هیلاکت ئەبەم، کە ئەمەم دی هاوارم کرد ئەم ئافرەتە خراپەم لێ دووربخەنەوە، وە خۆشم لە ترس و لەرزا بێ هۆش کەوتم، کە هۆشم هاتەوە رووی تۆبەی بە ئیخلاصم کردە خوا، وە لە کارگوزاری وازم هێنا و بە یەکجاری دەستم لێ هەڵگرت.

**ك ٢٣٦:** جەنابی زانای دانا و پڕ حیکمەت و لەبیب[١] زۆر بەڕێز حاجی مەلا محمدی شەڵماشی خەتیب، خەتیبی خانەقای حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی (خۆشنودی خوا بێ) لە سلێمانی ئەم رووداراونەی بۆ گێڕامەوە فەرمووی[٢]:

ماموستا مەلا عەلی مدرسی دێی بی شابسپی بۆ کۆمەڵێ لە فەقێکانی خۆی گێڕایەوە کە یەکێ لەوانە من بوم ووتی: لە خزمەت ماموستا مەلا محمد سعیدی گۆڕانگاندا فەقێ بووین ئەمان خوێند، بەیانییەك زۆر زوو ئەوانەی کە مستعید بوون خەبەری کردنەوە فەرمووی نوێژ بکەین و بڕۆین ئێمەش هەستاین نوێژمان کرد و لە خزمەتیا کەوتینە رێگە ماوەیەك رۆیشتین ئەنجا فەرمووی: حەزرەتی ضیاء الدین تەشریفی هات فەرمووی: مەلا عبداللەی دەم شکاو لە دێی پاراستان لە سەرە

---

(١) جارێ حەزرەتی شێخ عوسمان گیان لە دووڕووەی شەریفەوە نامەیەکی پیرۆز ئەنێرێ بۆ شاری سلێمانی لە نامەکەدا سلاوێ ئەنێرێ بۆ ئەم زانا خۆشخوڵق و شیرین صیفاتە ئەفەرموێ: (سلام لە عالمی لبیب ملا محمدی خطیب ئەکەم).

(٢) ئەم رووداوەی لە بەرواری ٢٧/ ربیع الأول/ ١٤٠١ هیجری بەرامبەر بە ١/ ٢/ ١٩٨١ گێڕاوەتەوە بۆم.

مەرگایە، وا من ئەچم تۆش بەیانی حازری سەر جەنازەکەی بە، فەمووی والله کە چووین وەفاتی فەرموو بوو[1].

دیسان جەنابی فاضلی لەبیب حاجی ملا محمدی خطیب گێڕایەوە فەرمووی: باوکم ناوی ملا محمد أمینی هەمەوەندی بوو (قدس سره) ئەیووت: ڕووداوی ٨٠ هەشتا ساڵ لەوە پێشم لە یادە و هەروەها ئەی ووت حەزرەتی شێخی ضیاء الدین عوسمان (قدس سره) جارێ پێنج گوڵی دامێ فەرمووی ها ئەمانە ئەبن بە خۆشەویستی تۆ هیچ تێی نەگەیشتم ئەو کاتە، ئێستەکە خاوەنی ٥ پێنج کوڕم ئەزانم کە ئیشارە بە بوونی ئەم کوڕانەیە.

**ك ٢٣٧:** جەنابی شێخ عمر خەڵکی دیرەزورە کوڕی حاجی ئەحمەدی عەرەبە[2] گێڕایەوە فەرمووی: بۆ خۆم لە خزمەت حەزرەتی شێخ علاء الدین (قدس سره)دا بووم وە خۆم لێم بیست فەرمووی شێخی باوکم یانی حەزرەتی ضیاء الدین(قدس سره) پێی فەرمووم ئەمشەو پێش ئەوەی نوێژی بەیانی بکەیت دوو ئیش هەیە ئەبێ هەردوکیان ئەنجام بدەیت یەکەمیان ئەوەیە سوڵتان عبدالحمید خان موستحەقی ئەوەیە کە ویلایەتی صوغرای بدرێتێ ئەبێ بچی توجهی لێ بکەی وە بە حەقی خۆی بگەیەنی وە دووەم شەخسێ لە شاری موصڵ خەڵکێکی زۆری تێك داوە ئەبێ بچی لەناوی ببەی بیکوژی، پاش کوشتنی بۆ خەڵکی ئاشکار ئەبێ کە ئەمە چیە.

فەرموی چووم توجهەکەم لە قەڕاڵ کرد هاتمەوە لە مووسڵ ئەو شەخسەم لە قاتی سێیەمی ئەو مەنزڵە بوو ویستی بێتە خوارەوە پێم دایە بەر پێی سەرەو خوار بووەوە

---

(١) میانەی گوڕانگان وە پارستان: پێنج سەعاتە ڕێیە سەر بە ناوچەی سەردەشتە ملا محمدیخطیب ئەفەرموێ لێرەوە بۆ بازیان ئەبێ.

(٢) خاڵی راستەقینەی کاکە شێخ ئەمین و کاکە شێخ ثابتە وە شێخ مظهرە, وە زڕ خاڵی حەزرەتی شاهی عوسمان سراج الدین.

و له زەوی دراو مرد پاش ئەوە کە پێیان زانی ویستیان بیشۆن تەماشایان کرد خەتەنە نەکراوە بۆیان دەرکەوت کە ئەمە گاور بوە ئەوان نەیانزانیوە[1].

**ك ٢٣٨:** لە حەزرەتی پیری دڵ مونیر یانی حەزرەتی سراج الدینم بیست[2] فەرمووی: حەزرەتی ضیاء الدین تەشریف ئەبا بۆ دەوروپشتی سەقز و چەند جێیەك لە ناوچەی کوردستانی ئێران، لا ئەداتە دێی مەولاناوا لەوێ میوان ئەبێ، مەرحومی شێخ حسنی مەولاناوا قورئانێ پیرۆزی بە دەستی موبارەکی خۆی لە عەهدی ژیانی خۆی نوسیوەتەوە وە لە کۆتاییدا نووسیویەتی (هچ کەس نابێ دەسکاری ئەم قورئانە بکا، وە ئەگەر ناتەواوی‌یەکی بێ کەس حەقی نیە ئەو ناتەواوی‌یە تەواو بکا) کاتێ حەزرەتی ضیاء الدین ئەو قورئانە ئەکاتەوە تەماشا ئەفەرموێ پیتێکی (و) ناتەواوە، ئەویش بۆ ئەوەی کە بە بێ ئیجازەیە واوەکە نانوسێ لەو جێیە کە تەواو نیە، بەلام پارچە کاغەزێکی سپی لە باخەڵی پیرۆزی دەرئەهێنێ واوێکی لەسەر ئەنوسێ و ئەی خاتە ئەو لاپەڕەیەی کە واوەکەی تیادا ناتەواوە، ئەمجا تەشریف ئەفەرموێ بۆ سەفەرەکەی هەرچەندی پێ ئەچێ کاتێ کە ئەگەڕێتەوە دیسان لائەداتە مەولاناو سەیری قورئانەکە ئەکاتەوە تەماشا ئەکا کاغزەکە سپی‌یە هیچی لێ نەنوسراوە واوەکە چۆتە ئەو جێگە کە ناتەواو نوقصانە[3].

---

(١) ئەم رووداوە کەرامەتە چ بۆ حەزرەتی ضیاء الدین چ بۆ شاهی علاء الدین (قدّس سرّهما).

(٢) قەڕاڵ: یانی سوڵتان.

(٣) ئەم کەرامەتە سێیەمی ئەو کەرامەتانەیە کە فازڵی لبیب مەلا محمدی خطیب گێڕاویەتەوە، وەرگێڕ: ئەڵێ ئەم کەرامەتە خۆم لە حەزرەتی شێخ محمد عوسمان بیستومە نوسە ربە سەهوا چوە بە دەسکاریەکی بێ ئیجازە دەخالەتی کردوە کە شەرعاً زیادە نووسین نادروستە لەم کەرامەتەدا کە تیا بەیان کراوە کەس حەقی تصرّفی نیە، تصرّف واقیع بوە.

ك ٢٣٩: چەند رۆژێ لە پاش وەفاتی حەزرەتی ضیاء الدین قدس الله سره العزیز کۆمەڵێ لە زانایان لەسەر مەزار و مەرقەدی پیرۆز و پڕ فەڕی قورئان ئەخوێنن، جەنابی شێخ حسینی سەرگەت کە خوشکەزای پیر بوو (خۆشنودی خوا بێ) وە یەکێ بوو لە پیاوچاکانی چاخی خۆی، لە کاتی خوێندنی قورئاندا صەیحە و هاوارێکی لێ رووئەدا و لێیان پرسی ئەم هاوارەت بۆچی کرد؟ فەرمووی نەمزانی پەڕەیەکم وەرگێڕا دوان بە دەسمەوە هات دەسبەجێ لە مەرقەدی پیرۆزیەوە هاواری لێ کردم فەرمووی شێخ حسین بگەڕێرەوە دواوە کە ئەمەم بیست هاوارم لێ هەستا دوایی سەیرم کرد دوو پەڕەم وەرگێڕاوە.

ك ٢٤٠: جەنابی عالمی فاضل وە خۆشەویستی مورشیدی کامل، یەکەم زانای بێ هاوتای زەمان مامۆستا مەلا محمد ئەمینی کانی سانان[1] بۆی گێڕامەوە فەرمووی: خوا لێ خۆشبوو حاجی شێخ حەسەنی چۆڕ لە بیارەی شەریف لە زیارەتی حەزرەتی ضیاء الدین‌دا ئەبێ، وە خوا لێ خۆشبوو حاجی سید حسینی کوڕیشی لە خزمەتیا ئەبێ، کاتێ ماڵ ئاوایی ئەکەن، حاجی سید حسین ئەفەرموێ دیم کە حەزرەتی ضیاء الدین (قدس الله سره العزیز) ئەوەندە گەورە بو گۆشتی ئەچوە بەینی داری سەقفی خانوەکەوە، وەرزی زستان بوو، هاتین تا گەیشتینە دزڵی کە پێمان دا لەسەر پلەکانی ماڵی عەزیز خانی باوکی محمود خان گرمەیەك لە ئاسمانەوە هات، وە یەك ئەنگوست و نیو بەفر لەسەر یەك بە یەکجار کەوتە سەر زەوی، وە ئەمە شتێکی زۆر سەر سوڕهێنەر بوو.

---

(١) ئەم زانا بەرز و بەڕێز و پڕ دانشە جەنابی حاجی مەلا محمد ئەمینی کانی سانانی ئەم کەرامەتەی لە شەوی سێ شەممەی ٤/ جمادی یەکەمی / ١٤٠١ هیجری لە ماڵی خۆمان بۆی گێڕامەوە کە ڕێکەوتی ١٠/ ٣/ ١٩٨١ زایینی ئەکات رحمة الله علیه ورفع درجات حضرة الشاه محمد عثمان سراج الدین وجعلنا الله تحت لواء سرّه المتین إلی یوم الدین بجاه سید المرسلین آمین. (دانەر).

باوکم خوا لیٚ خۆشبوو حاجی سید حسن فەرمووی: حسین ئەمە لەو کاتەوە ئیٚمە لە بیارەوە دیٚین ئەباریٚ بەلاٚم بە تەمەنای شیٚخ عمر تا ئیٚستە نەکەوتۆتە سەر زەوی ئیٚستە کە ئیٚمە گەیشتین بە جاریٚ هەمووی هاتە خوارەوە.

**ك ٢٤١:** دیسان زانای پڕ حیکمەت و دانا جەنابی حاجی مەلا حەمەمینی کانی سانان ئەفەرمویٚ کاتیٚ خوا لیٚ خۆشبوو جاجی سید حسنی چۆڕ لە نزیکی کۆچی دوایی خۆیدا ئەبیٚ ئەمر ئەفەرمویٚ بە: ئاغا حسینی کوڕی خۆی وە کەسانیٚ کە لە خزمەتیا ئەبن لە کەس و کار بڕۆن شیٚخ حبیب بیٚنن پیٚ بخاتە سەر سینەم با بە ئیمان و بە ئاسانی گیانم دەربچیٚ (جەنابی شیٚخ حبیبی خۆشەویستی کوڕی حەزرەتی حاجی شیٚخ ئەحمەدی کوڕی حەزرەتی شیٚخ عوسمان سراج الدین (خوا خۆشنوودیان بفەرمویٚ گشتیان) لەو کاتەدا فەقیٚ ئەبیٚ لە چۆڕ[1] ئەخویٚنیٚ،

(١) چۆڕ : دیٚیەکە لە مەریوان، دانیشتوەکانی زۆربەی سیدن لە نەوەی ملا أبو بکری چۆڕی مصنف ن وە جەنابی ملا أبو بکری مصنف لەویٚ نیٚژراوە، وە یەکیٚ بوە لە هەرە زانا گەورەکانی عالەمی ئیسلامی، وەیەکیٚ بووە لە ئەولیای کبار قدّس الله سره العزیز، بەیەك چوارینە میٚژووی لە دنیا دەرچوونی خۆی بەیان فەرمووە کە ئەفەرمویٚ:

جنـان بـر روی جـانم برگشـادند
بجـانم وصـل جانـان مـژده دادنـد
ملـك تشریـف حـاضرشـد در آن دم
رقـم زد بـرو فـاتم خـیر مقـدم
٩٩٤
بـۆ گیـانم قـاپی بەهەشـت کـراوە
مـژدە بـە گیـانم درا لـە خـواوە
مەلـەك تـەئریفی لیٚـدا بـە رەقـەم
بـۆ سـالی کـۆچم بـە خـیر مقـدم

لەبەر ڕێز و قەدر لەناو فەقێکاندا نابێ هەر لە ماڵی حاجی سید حسن[1]دا ئەبێ.

ئەمجا حاجی ئاغا حسین و باقی خزمان عەرزی ئەکەن قوربان تۆ بۆ وا ئەفەرموی؟ شێخ حەبیب چی‌یە؟ تۆ عالم و زانای ئوممەتی پێغەمبەری ﷺ سیدی خزمەتت بە شەریعەت کردوە، ئەویش ئەفەرموێ: ئێوە نازانن خۆ من مەبەستم شێخ حبیب خۆی نیە، بەلاّم لەگەلّ پێی شێخ حبیب پێی شێخ عمر حازر ئەبێ، وە لەگەلّ پێی شێخ عمر پێی رسول الله حازرە.

صلى الله عليه وعلى آله وصحبه وسلّم اللّهم بجاه هذا النبي الكريم والرسول السّند العظيم توفّني مسلماً وألحقني بالصالحين, يا مجيب دعوات المضطرين ويا أرحم الراحمين.

چ عەجەب لە بۆ ئەهلی نەفسانی
خۆی نەی بوو تویشی وەکو خۆی زانی

کاکە گیان سەرتسوڕنەمێنێ قوتویەکت لەبەر دەستایە بەبێ ئەوە هیچ وایەرێکی پێوە بەسرا بێ تەلەفزیۆنی پێی ئالوگۆڕ ئەکەی، قەمەرێ بە ئاسمانەوەیە ئەگەر خەلەلێکی پێ گەیشت لێرەوە خەبیرەکان هەم پێ ئەزانن وە هەم لێرەوە ئیصلاحی ئەکەن لەگەلّ ئەوەش ئەبینی هیچ واسیطەیەك لەبەرچاودا نیە ئەنجا خوا ئەفەرموێ: (الا له الخلق والأمر) وە معلوم هێز و سرعەتی عالەمی (ئەمر)ی زیاترە، روح کە لە عالەمی ئەمرە کە کاتێ (تجرّد)ی حاصل کرد (یانی تقید و پەیوەندی بەمادەوە نەما

---

خیر مقدم بە پیتی ئەبجەد ئەکاتە ٩٩٤ کە ساڵی هیجری ٩٩٤ بوو کە کۆچیان فەرموە ئەم زانا بەرزە عالی جەنابە دانراوی زۆرە:

١- وضوح لە فیقها تەئلیف و دانراوی ئەوەڵین (١٠) دە بەرگی گەورە و ئەستورە.

(١) حاجی سید حسن لە ئەولادی یەکێ بوە لە هەڵکەوتوانی زەمان زۆر زانا لە علومدا وە بێ هاوشان و بێ وێنە بوە (رحمة الله عليه).

إمتزاجێ كه لەو پێش لە بەینی روحانی و جسمانی دابو نەما وە لەیەك جیاوازیـان پەیـدا کرد بە هۆی سلوکەوە ئەم جۆرە شتانە زۆر ئاسـانە جـەنابی مـلا محمـدی خطیـب لـە خانـەقای مـەولانا خالیـدی نەقشـبەندی بـۆی گێرامـەوە ووتی: مـلا حمـە أمـینی هەمەوەندی باوکم گێرایەوە فەرمووی[1].

ئێمە هەموومان ۱۱۰ سەد و دە فـەقێ بـووین لـە بیـارەی پـیرۆز لـە خزمـەت مـلا عبدالقادری گەورەدا کە مدرس بوو ئەمان خوێند، میقدارێ میوە دانرابوو بە مووچە هەموو رۆژێ ئەدرا بـە فـەقێکان، بـەلام بـەشی نەئەکردین، هـەموو شـەوێ بـە نۆبـە ئەچووین بۆ میوە دزین لە باخی حەزرەتی شێخی ضیاء الدین(قـدس سـره) شـەوێکیان لە نۆبەی منا لەگەڵ ملا سید أحمدی باوکی ملا سید سـلامی بانـەیی چـووین بـۆ سـێو دزین، من لەسەر سێوەکە بووم رام ئەوەشاند، باخەوانەکە داینەبەر ساچمەزەن منیش خۆم فڕێ دایە خوارەوە ئەژنۆم تۆزێ بریندار بوو، بەیانی باخەوانەکـە لای حـەزرەتی شێخ شکاتی لێ کردین شێخ بانگی کردین فەرمووی: ئەوەی تا ئێستا خواردووتانە لە بەشی خۆم گەردنتان ئازاد بێ بە باخەوانەکەش ئەڵێم هەندێکی ترتـان بـۆ زیـاد بکـات دزی لێ مەکەن منیش عەرزم کرد قوربان نابێ کـاری وا چـۆن ئێمـە دزی ئەکـەین بـە تایبەت لە باخی شێخ چەن جار ئەو فەرمایشتەی دووبـارە ئەفـەرمووەوە مـنیش هـەر بـە هـەمان وەلام دووبـارەم ئـەکردەوە ، لـە پاشـا فـەرمووی وەرە پێشـەوە ئەگـەر دزیـت نەکردوە ئەژنۆت بە چی بریندار بووە؟ وە ئەوەش کـەس نـەی زانی بـوو هـەتا هـاوڕێ کانیشم بێ ئاگا بوون لێی.

جەنابی زانا و خاوەن هەسـت و بـیر لـە سینە و گـەش و کـراوە لـە دڵا مامۆسـتا مەلا عەبدوڵلا کاتب و نووسـەری حـەزرەتی شـێخ (قـدس سـره) بـۆی گێرامـەوە: لـە زەمانی زووا کـە خـەڵکی لـە سـەفەری دوور و درێـژی حـەج ئەگەڕایـەوە خـەڵکی بـە پیریـەوە ئەچـوون و بـە تـەپڵ و دەف و سـەڵەوات و ڕێزێکـی زۆرەوە پێشـوازییان لـێ

---

(۱) ئەم سێیەمینی ئەو کەراماتانەیە کە جەنابی حاجی ملا محمد بۆی گێراوەتەوە.

ئەکرد هەروەك ماڵ ئاوایی و خوا حافیزی لێ کردن، جا بەم بۆنەوە کاتێ یەکێك لە زانایانی سنە کە پیاوێکی زۆر ناسراو و بەناوبانگ ئەبێ و لە دەرکەوتوانی چاخی خۆی ئەبێ کە ئەگوتجێ معتمد الإسلامی سنە بوو بێ کە جەنابی ملا عبداللطیف بوە لە حەج ئەگەڕێتەوە گلەیی ئەکات لە حەزرەتی شا عومەر کە گوایا لەم سەفەرە بەخێر تەشریفیان گەڕاوەتەوە ئەو زاتە تەشریفی نەهاتوە بۆ بەخێرهاتنەوەی وا رێ ئەکەوێ ئەو فەرمایشتە ئەگاتەوە بە حەزرەتی ضیا ئەویش ئەفەرموێ (من ئەچووم بۆ زیارەتی زوو لە کاتی خۆیا بەڵام لە ماوەیەکی لەمەو پێش مردویەك لەناو قاپی مزگەوتەکەیدا نێژراوە ئایەتێك لەسەر قەبرەکەی نوسراوە کە داوای پاڕانەوە و لێ خۆشبوون ئەکات بۆ مردوەکە منیش بە لامەوە بێ ئەدەبیە پیایا تێ پەڕم یا پێی پیا دابنێم) کاتێ تاقی ئەکەنەوە چۆنی فەرموو وەها بوو بەو بۆنەوەیە عەقیدە و باوەڕ پەیدا ئەکات.

لە خوا لێ خۆشبوو جەنابی میرزا ئەحمەدم بیست گێڕایەوە فەرمووی: لە دێی صەفی ئاوا بووم کوڕی عەزیز خانی بۆی گێڕامەوە: ووتی ئا لەم جێگای حازریە حەزرەتی شێخ عمر تەشریفی دانیشتوو ئەبێ باوکم لە خزمەتیا ئەبێ عەرزی ئەکات قوربان ٣ سێ داواکاریم هەیە لە خزمەتتانا ئەبێ بە لوتفی خۆت هەرسێکم لێ وەربگری، ئەفەرموێ چین؟ ئەڵێ:

یەکەم دۆعام بۆ بفەرموی بە کوشتن نەچم بە مردن خۆم بمرم.

دووەم بە گوناحی زینا گرفتار نەبم.

سێیەم: کاغەزێکم بدەیتێ بۆ مەلائیکەتەکانی قەبر کە تووشی ئەزیەتم نەکەن ئەفەرموێ خاڵۆ مومکینە دۆعا بکەم بە کوشتن نەچی خوا دۆعای عمر قبوڵ بکات بە مردن بچی و نەکوژرێیت.

دیسان ئەگونجێ دۆعا بکەم تووشی ئەو گوناحە نەبی خوای تەعالا قبوڵی بکات بەو گوناحە دووچار نەبی.

بەڵام فریشتەکان مەئموری خوان وە کاروباری خۆیان بە پێی دەستور ئەنجام ئەدەن عەرزی ئەکات من خۆم ئەزانم تۆ لای خوا ماقوڵی لای کاربەدەستی خوا رێزت هەیە ئەوەم بۆ نەکەیت ئەوانی تریشم ناوێ.

ئەفەرموێ باشە بەڵام منیش داوایەکم لە تۆ هەیە ئەوە بە باشی ئەنجام بدە عەرزی ئەکات چی‌یە ئەو داواکاری‌یە بیفەرموو؟

ئەفەرموێ: ئێوە کۆچەرین گەرمیان و کوێستان ئەکەن هەردوو رۆژ و سێ رۆژێ یا هەر هەفتەیە لە جێگایەکن شەرتم بۆ بکە گەیشتنە هەر جێگەیە کە تیا بمێننەوە بۆ رۆژێکیش بێ حەوز و ئاوی ژنان و پیاوان لەیەك جیا بکەنەوە و دوور لە یەك بن وە بە هیچ جۆرێ یەك نەبینن.

عەرزی ئەکات بە چاوان، حەزرەتی پیر ئەڵبەت دۆعاکان ئەفەرموێ وە دوو کلیمە نامەش ئەنووسێ بەم مانایە[1].

برادەران مەلائیکەی قەبر خاڵۆ عەزیزم هات پرسیاری بە نەرمی و لەسەرخۆ لێ بکەن بە توندوتیژی پرسیاری لێ مەکەن والسلام عمرم پاش ماوەیە وا رێ ئەکەوێ لە بەینی عەزیز خان و ژنێکی قەڵخانی پەیوەندی حەز لێ کردوویی ئەکەوێتە بەینیان بۆ لەیەك نزیك بوونەوە جێگەیەکی چۆڵ و پەنا لە دەور و پشتی خۆیاندا دیاری ئەکەن، لە کات و شوێنی دیاری کراودا بەر لەوە بە یەك بگەن عزیز خان ئەبینێ ئەوا سوارێ لە رێوە هات کە باش وورد ئەبێتەوە تەماشا ئەکات ئەم زاتە حەزرەتی شێخ

(١) ئەم نوسراوەی حەزرەتی ضیا لە نوسراوەکەی مالکی کوڕی دینار ئەچێ کە دای بە کوڕە گەنجەکە لە بەسرە لە باتی ئەو کۆشکەکە دروستی ئەکرد، پاش ماوەیە نوسراوەکەی لە میحرابەکەدا بینی کە تاقیبیکرد کوڕەکە وەفاتی کردبوو لە پشتی کاغزەکەش لێی نوسرابوو بە خەتی قدرەتی چی تیا نوسراوە وەرگیرا بە زیادی ئەوەندەوە.

عمره (قدس سره) پەلە پەل بە إشتیاقەوە خۆی ئەگەیەنێتە ریحابی پیرۆزی وە بە سەد دڵ گەرمی و شەوق و سۆزەوە ئاوزەنگی ئەو زاتە زیارەت ئەکا و لە خزمەتیا بەرەو ماڵ دێتەوە جێگەی بۆ چاك ئەكەن و کوڕ و کەس و کار و دەر و دراوسێ و خەڵکی ئەو دەوارنشینانە دێنە زیارەتی تا کاتی ئێوارە.

دەستور ئەدات لەو جێگە کە ئەوی تیایە بەرماڵ بۆ نوێژی شێوان دابخەن وە بە کوڕەکەی ئەڵێ لە خزمەت شێخا بە نەوەکو سەگی بەردەم ئەم خانوە بوەڕێ حەزرەتی شێخ ئەفەرموێ من سەگ پێم ناوەڕێ کاتێك لە حەزرەتی شێخ بێ ئاگا ئەبن و دێنەوە تەماشا ئەکەن حەزرەتی شێخ دیار نیە هەرچەن ئەگەڕێن نە خۆی وە نە ئەسپەکەی کە بەسرابوەوە نەماوە، ئینجا بۆ عزیز خان دەرئەکەوێ کە سڕی ئەم هاتنە بۆ ئێرە پارێزگاریکردنی بوە لە گوناهـ[1].

وە هەروەها چەن جار لە چەند کەسی بڕوا پێ کراوم بیستوە کە جارێ حەزرەتی شا عومەر (قدس سره) لەگەڵ کۆمەڵێ لە زانایان و گەورە پیاوان تەشریفی ئەبا بۆ

---

(١) تەشریف هێنانی حەزرەتی پیر بە یەکێ لەم دوو ریگە بەدەر نیە:

یەکەم یان هەر بە لەش و رۆحەوە تەشریفی هێناوە، وە یا رۆحی تشکلی بە حالی لەشیەوە کردوە یانی سەفەرێکی رۆحانی بوە.

رووادن بە هەردوولا ئەگونجێ وە هەردوو جۆرەکەی رووی داوە تشکلی بە صورەتی جیسمی زۆر واقیع بوە، وەك ئیمامی ربانی (خۆشنودی خوا بێ) لەکاتی پرسیار لە حەزرەتی خضر سەلامی خوای لێ بێ ئەگێڕێتەوە لە بەرگی (١) لە لاپەڕە (٣٠٤) بە ناوی مەکتوب بو مەلا بدیع کە پرسیار وەلام ئاواکرا، دۆستان داوایان لێ کردم لە أحوالیخضر علی نبیّنا وعلیه الصلوة والسلام وە یان رۆیشتنی جەنابی خۆی لە کاتێکا چوو بە ئیمدادی یار أحمد بەگ ەوە وەك لە کەراماتی ژمارە (١٣) ئەم کتێبەدا نوسراوە.

دووەم یش دروستە بوونی وەك ئیمام لە مکتوبی (١٣٥) لە لاپەڕە (١٢٧)دا دیاری کراوە ئێمەش لە پێشەکی ئەم کتێبەدا ل دەقی مەکتوبی حەزرەتی ئیمام مان نووسیوە

وە هەروەها وەك ئەوە کە خۆی بۆ یارمەتی یار أحمد بەگ چوو فەرمووی نەمزانی جیسمانیم بە رۆحانیم تابیع بوو لەم کتێبەدا دیارە لە طەیەراندا جسم لەگەڵ رۆح بڕوات بە رۆیشتن ئاسان ترە. والسلام.

سەردانی نەخۆشی لە عەزیز خان باوەجانی ناوبراو بە بۆنەی ئەوە تەشریفیان لە نزیکی دێی ئەوان ئەبێ وە لە ژن خوازیشەوە نزیکیان ئەبێ.

رۆژێ پێش ئەوە تەشریف ببا بۆ ئەوێ فەرمایشت ئەفەرموێ لە بارەی عالەمی میثال[1] و گفتوگۆ لەو بارەیەوە ئەکرێ، وە حەزرەتی شێخ بە دور و درێژ باسی ئەو عالەمە ئەفەرموێ ئەو رۆژە کە ئەگەنە ئەوێ ئەبینن عەزیز خان بێ ئاگا کەوتوە هۆشی بە خۆی نیە، حەزرەتی شا عومەر ئەفەرموێ دوێنی باسمان لە عالەمی میثال ئەکرد ئێستە من دەست ئەدەمە صورەتی میثالی ئەم شەخسە ئێوە بڕوانن و سەرنج بدەن ئەگەر ووردە ووردە لەسەرخۆ لە جێگەی خۆی بەرز بوەوە تا رێك راوەستا بە پێوە دیسان وردە وردە لەسەرخۆ بە پشتا نەوی بوەوە تا بە ئاسانی لە جێگەکەی خۆیدا درێژ بوەوە ئەوە نامرێ.

وە ئەگەر پاش ئەوە هەستا سەر پێ لە پڕ وەك داری شکاوە بە جولانێکی بێ دەسەلاتانە کەوت بە زەویدا ئەوە ناژی.

کاتێ حەزرەتی پیر کەوتە حالەتی مشغولْ بوون بە ئەنجامی ئەو کارە لە پاش ماوەیەك بە چاو ئەیان بینی وردە وردە کەوتە جوولە جوولْ تا پاش ماوەیەك هەڵساو بە پێوە وەستا ئەمجار هەروەك جاری پێشوو بە نەرمی و هێواشی هاتەوە خوارەوە تا لەسەر جێگەکەی راکشایەوە، بەڵام ئەو بەسەر هاتو ئالوگۆڕە بەبێ دەسەلاتی خۆی بوو رووی ئەدا.

لەو کاتەدا خێزانەکەی کە زۆر مخلیص بوو حەزرەتی پیری زۆر ئەویست عەرزی کرد بوو قوربان توخوا دۆعا بفەرموو عەزیز خان بەم نەخۆشیە نەمرێ دوایی لە پاشا بەشتێکی تر بمرێ قەی ناکات.

---

(١) عالەمی مثال: وەك لە مکتوباتدا باسی ئەکات عالەمێکە تەواوی عالەمی خەلق و أجسام و عالەمی أمر و ئەرواحی تیایە وە هەر کەس لە دایك بوونیەوە تا مردنی هەرچی بکا و بەسەری بێ، وە هەر جووڵانەویەکی بێ لە عالەمی میثالدا ئەوە شێوەی دیارە و ئاشکرایە.

شا عمر فەرمووبوی بۆچی عەرزی کردبوو با نەڵێن شێخ عمریش چوە سەردانی هەر مرد فەرموبوی مژدە بێ بەم نەخۆشیە ناڕوات وەسێ کوڕی تری لە تۆ ئەبێ[1].

جەنابی مامۆستا مەلا نصر اللهی کێلوو[2] خوای لێ رازی بێ بۆی گێڕامەوە فەرمووی: جارێ شێخ حمە شریف ناو کە یەکێ بوە لە خۆشەویستانی حەزرەتی شێخ گێراویەتەوە کە حەزرەتی ضیاء الدین رۆژێ موعیظەی ئەکرد وە تفسیری سورەتی الکهفی بەدەستەوە بوو، لە تفسیری ئایەتی [ولا تقولّن لشيءٍ إنّي فاعلٌ ذلك غداً إلاّ أن يشاء الله]دا حیکایەتی حەزرەتی سولەیمان پێغەمبەری ئەگێڕایەوە على نبيّنا وعليهم الصلاة والسلام کە فەرموو بوی ١٠٠ ژنم بوو ووتم ئەمشەو بەسەر هەمویان ئەگەڕێم وە لە میانەی هەریەکەیاندا دوو رکات نوێژ ئەکەم ١٠٠ سەد منالّم بێ لە پشتمەوە سوار بن چونکە إن شاء الله م نەکرد بێجگە لە بلقیس کە لەتە بەشەرێکم لێ بوو ئیتر لە هیچیان هیچ نەبوو.

کاتێ ئەم فەرمایشتەی ئەفەرموو من بە بەردەمیا تێ پەڕیم وە ئەم حیکایەتە لە دڵم نەچەسپی لە پاش ئەوە چەن رۆژێ ئەم بینی کە بە خزمەت حەزرەتی پیر ئەگەیشتم لوتفی جارانی دەرنەئەبڕی وە منیش هەرچی بیرم ئەکردەوە هۆی کەم لوطفی یەکەیم نەئەزانی چیە وە ئەم باسەم هەر بە خەیالا نەئەهات تا ئێوارەیەك مەلا عبدالمجیدی مەشهور بە إمام الأولیاء پێش نوێژی مەغریبی ئەکرد نوێژی دابەستبوو، منیش چووم نیەت بهێنم ئەو گەیشتبوە (ما)ی مالك یومِ الدین لە پڕ لە دوامەوە دەستیان لێوە دام لام کردەوە حەزرەتی ضیاء الدین (قدس سرە) ئیشارەی لێ کردم چوم بە دوایا تا بە

---

(١) میرزا ئەحمەدی بیارە رەحمەتی خوای لێ بێ بۆی گێڕامەوە ووتی ئاخر کوڕی کە سێیەمین بوو ناوی صۆفی بەگ بوو، وە من چاوم پێ کەوتبوو.

(٢) مامۆستا مەلا نصر الله پیاوێکی زانا و بەڕێز بوو جەسوور و قسە لە روو بوو بە خۆشەوستانی خوا خاوەن باوەڕ و عەقیدە بوو رەحمەتی خوای لێ بێ: خوا خاوەنی دەسەلاّت و توانایە بەسەر هەموو کارێکا کە بڕوام بوو بە ئایەتی وقال الّذي عنده علمٌ من الكتاب أنا آتيك به قبل أن يرتدّ إليك طرفك ئیتر لەم نەوعە شتانە سەرسام نابم هەرگیز.

ناو باخەکاندا سەرەو خوار بووینەوە تەماشام کرد کۆشکێکی عالی چوە بە ئاسمانا حەوشێ گەورە و واسیع دەروازەیەکی بەرز و بەرینی هەبوو، شێخ تەشریفی چوە حەوشە و من بە دوایا وە لە قادرمەکانەوە سەرکەوت بە بەردەم چەن ژوورێکا تێ پەڕ بووین تا گەیشتینە هۆدەیەکی گەورە پەردەی پێوە بوو حەزرەتی پیر پەردەکەی لادا و داخلّ بوو منیش هەروام بە دوایەوە کە سەیرم کرد یەك مەجلیسی گەورە و پڕ لە گەورە پیاوانە زاتێکی عالی قەدری خاوەن شکڵ و شێوە بە سام و هەیبەت لەسەر کورسی‌یەك دانیشتوە موعیظە ئەفەرمویٚ فەرمووی:

من ١٠٠ ژنم بوە ووتم ئەمشەو ئەچمە لای هەموویان ١٠٠ سەد کوڕم بێ کە گەورە بوون بە سواری ١٠٠ سەد سوار لە پشتمەوە بڕۆن چونکە إن شاء الله م نەکرد تەنیا لە بلقیس نەبێ لەتێ کوڕم بوو ئیتر هیچم نەبوو، هەروەك هەوەڵ جار حەزرەتی پیر چوو دەسی ماچ کرد منیش دەسم ماچ کرد هاتە دەرەوە منیش لە خزمەتیا هاتمەوە.

گەیشتینە لای خانەقا فەرموی نوێژەکەت بکە کە چووم ووتم نیەتمە ٣ سێ رکات نوێژی مەغریب ئەکەم الله أکبر ووتی مالك یوم الدین یانی ماوەی چوون و هاتنەوەمان (ما) تا (لِكِ) بوو والله أعلم بحقائق الأمور في الأزمنة والدهور وما ذلك على الله بعزيز.

لە زانای عالی قەدر و خاوەن پایە جەنابی حاجی مەلا عبدالله چوڕستانیم[1] بیست بۆی گێرامەوە فەرمووی:

---

(١) مامۆستای چوڕستانی فەرمووی من ئەم رووداوەم لە شەخصی مباشر بیستوە یانی أو کەسە خۆی کاغەزەکەی بردوە، ئەگینا ئەم حیکایەتەم لە پێش ئەوە مامۆستا چوڕستانی بیگێڕێتەوە چەن جارێ تر بیستومە لە خەڵکی تریش.

جاریٚ حەزرەتی شێخ (قدس سره) کاغەزیٚ موجیبەت نامە ئەنوسیٚ بۆ مەرحومی خاوەن فضیلەت علامەی زەمان جنابی حاجی مەلا عبداللەی[1] کۆیی وە تسلیم بە نامە هەڵگری ئەکات، کاتیٚ هەڵگری نامە ئەگاتە کۆیە نزیکی مەغریب - شێوان ئەبیٚ ئینجا بۆ چوونە ماڵی حاجی مەلا عبدالله ئەکەوێتە ریٚ وەختیٚ کە مەرحومی حاجی مامۆستا ئەگاتە ماڵی خۆیان و دادەنیشیٚ لە دەرگا دەدات و لە پاش ئیجازە دەچێتە ژوورەوە سەلام دەکات و کاغەزەکە دەردێنیٚ، وە لەو کاتادەیداتە دەستی (سینی)یە دادەنێن لەبەر دەستی مامۆستاکە دەوریەکی لەسەر دەبیٚ و نانی بەسەردا دراوە وە کە کاغەزەکە وەرئەگریٚ و پاکەتەکە ئەکاتەوە تەماشا ئەکا لە هەوەڵی نامەکەوە نوسراوە فەرموو (دۆڵمە) بخۆ وەختیٚ نان لەسەر دەوریەکە لا ئەبات چێشتی دوڵمە ئەبینیٚ لەسەر سینی دانراوە، ئینجا حاجی مامۆستا زۆر بەو رووداوە کەیف خۆش دەبیٚ.

---

(١) باوکی ملا محمدی کۆیە یە، عالمێکی زۆر بەناوبانگ و بە برشت لێهاتو بوە لە چاخی خۆیدا رحمە الله.



**کۆمەڵێ لەو هەڵبەست و نامانەی کە حەزرەتی شا عمر فەرمایشتی فەرمووە و نوسیویەتی یا خەڵکی تر دایان ناوە و بۆیان نووسیوە (قدّس اللّه سرّه العزیز).**

کۆمەڵێ لەو هەڵبەست و نامانەی کە حەزرەتی شا عمر فەرمایشتی فەرمووە و نوسیویەتی یا خەڵکی تر دایان ناوە و بۆیان نووسیوە (قدّس الله سرّه العزیز).

حضرة الشيخ عمر ضياء الدين قدس الله سره العزيزوتحريراته المباركة وعنوان كلّ رسالة.

١- الرسالة الأولى: إلى شقيقه وسليله حضرة الشيخ أحمد (قدس سره).

٢- الرسالة الثانية: إلى نجله وولده الأمين مولانا حضرة الشيخ نجم الدين (قدس سره).

٣- الرسالة الثالثة: إلى حضرة المدرّس الكبير والعلامة الشهير مولانا عبدالقادر المدرس.

٤- الرسالة الرابعة: إلى العلامة المفضال الملا فتح الريژابى.

٥- الرسالة الخامسة: إلى الحاج الشيخ سعيد أفندي خليفته ببغداد.

٦- الرسالة السادسة: إلى العلامة الناصح الشيخ سليم الأديب البارع.

٧- الرسالة السابعة: إلى السيد هداية الله عليه رحمة الله.

٨- الرسالة الثامنة: في بيان وشرح اللطايف لحلّ مشاكل المؤمنين

٩- الرسالة التاسعة: رسالة جوابية إلى العالم المفضال الحاج ملا سلام الباني.

١٠- الرسالة العاشرة: تفضل بها إلى أحد الكيماويّين.

١١- الرسالة الحادية عشرة: إلى حضرة السلطان عبدالحميد حول رعاية خانقاه حضرة مولانا خالد النقشبندي في السليمانية.

١٢- الرسالة الثانية عشرة: رسالة جوابية إلى بعض العلماء الأعلام لتحقيق آداب الأصفياء الكرام رضوان الله عليهم أجمعين.

١٣- الرسالة الأخيرة: إلى الشيخ محمود الشاكلي لمناسبة والد الشيخ سعيد الشاكلي رحمة الله عليهم.

# ✿ بەشی عەرەبی ✿ نامە و نووسراوەکان

حەزرەی شا عومەر چەندەها نامە و نوسراوی هەیە بە زمانی کوردی عەرەبی فارسی بۆ پیرۆزی و موبارەکی چەند نامەیەك لەهەر بەشەیان ئەنووسین.

**الرسالة الأولى:** رسالة كتبها إلى حضرة أخيه الأمجد الحاج الشيخ أحمد (قدس سره) وطاب ثراه.

من دنت مصيبة الفراق واقتربَتْ وجيوش الأحزان من طريق هجركم قرُبتْ وشمسُ السرور كُورتْ ونجوم الحبور طُمستْ وفوق فرق الوداد بسهام الوداع تفرّقتْ وجماعة الاتحاد من قسورة البُعد فرّتْ وأقسام الأقسام إلى أهل الغرام توجّهت وأكواب قمر المواجهة والموانسة أُفلتْ وقوّة الوصول إلى المأمول قلّت وأنواعُ الآلام علينا مرّتْ لا جاء لشفاء ضنأي كتاب ولا رأينا من سكان جبال الكمال خطاب أذلكَ عندكم حسنٌ أم نجاة الهالِك في بئر المحن والطّور وكتابٍ مسطور, إنّ اليوم سماء التّمني بهواكم تمور موراً وجبال الخيال بوفاكم يسيرُ سيْراً, فويل للقلب الحزين أن تتركوه كما تركتموه ويا حسرتا على هذا المسكين لولا أن وجده أخوه الذّين في جنّات نعيم الألفة فاكهون وبما آتاهم الله من النعمة الباقيةِ فرحون والذّين حاروآ في قفار الرّجاء والتّمني داروا على أنفسهم يبكون فما الّذي يضرّكم إن كان بكتابٍ يفرحون أو بالاستخبار منكم يتفرّحون هل قطعتم حبل الوداد أم جعلتم السّقاية في رحْلِ أهل الاتحاد فاختر من النّسيان والتّذكار ماعندكم يحلو إنّ الغرام مرارته لدى أهله تحلو وجمال جمالِ الأحبّة في عين صدقهم يجلو لا تحسبوني في الهوى متصنفاً إن أحسنتم الظنّ أحسنتم فإنْ أسأتم أحسِبُ الأساءة منكم حسانتُ يُذهبن السيّئات ولست أهلاً للحسنات بل أنتم الأهل وأنا بالخطايا للسّيئات ما بقى من النّعمة غيرُ نَعَمْ وما بقى ما بقي عندي الأكرم صاحب الهممْ العهدُ باقٍ لولا أهلكني الغمّ والوفاءُ ساقٍ إن أهملني الهمّ وإن جاء موتي فالسلام عليكم إن استخبرتم من الأمور

فبعد وصول الجواب نتوجّة إلى الصّلاحية بالصلاح نرجوا الدعاء في المساء والصباح وحبونكم التي هي مُنى قلبي وحبّكم الّذي هو غاية مطلبي إنّ البعد جعل وجودي كالصّريم وما وجدتّ الوجد منذ فارقتك كالسّقيم كاد أنْ أكونَ كأعجاز نخلٍ خاوية فانظر هل ترى لي من باقية ها أوم آقروآ كتابية إنّي لم أدر ما حسابية أسئل الله بقائكم ولقائكم ويكون نعمة باقية والسلام عليكم آناء الليل وأطراف النهار.

**الرسالة الثانية**: إلى نجله الأرشد وخَلَفِهِ الصّدقَ الأرشد الأمجد مولانا حضرة الشيخ محمد الملّقب بنجم الدين مدّ ظلّه.

يا من أنت مني بمنزلة هارون من موسى لو كنت آنساً أحد غير ذكر الله لأتخذتك أنيساأسئل الله لي ولكَ الفتوح إعلمْ أنّ لكلّ لطيفة من اللطايف المودعة في الوجود فوق العرش أصلاً مسعوداً ومقاماً محموداً وليس يحصل الفناء لها من غير وصولها إليه بواسطة طلب السّالك وعمله تحت يد أهلِ مثلاً أصل القلب التجلّي الأفعالي وأصل الروح الصّفات الثبوتيةَ وأصل السّرّ شئونات الذاتِ وأصل الخفيّ الصّفات السّلبية وأصل الأخفى الشأن الجامع وبملاحظة الأصول يُراقب في المراقبات المعلومة ولنفس الفاني كذلك أصل من تلك الأصول يعني أصلُ النّفس أصل القلب وأصل الهوى أصل الروح وأصل الماء أصلُ السّرّ وأصل النار أصلُ الخفيّ وأصل التّراب أصل الأخفى ولكلّ واحد من هؤلاء نورٌ باللّون ممتازٌ, ونور القلب أصفر, ونور الروح أحمر, نور السرّ أبيض ونور الخفيّ أسود ونور الأخفى أخضر, ونور النفس ليس له لون من تلك الألوان.

والغالب من كثرت لطافته لايدرك له لون من الألوان المفصّلة, وذلك بعد التّزكية يدرك لا قبلها ولا يلقاها إلاّ ذو حظٍ عظيم وآعلمْ أنّ المراقبة إذا كانت بملاحظة تلك الأصول توجب الوصول إلى درجة القبول وتنتج التّرقي والتخلّق بالشريعة حقيقةً كماهو المأمول وتفصيلها إنّك تصوّر شخص النّبي صلى الله عليه

وآله وسلّملاً وتقابل قلبك قلبه الشريف وتعرض في مقام التّضرع لربك ﷻ رجاءك فيض التجلّي الأفعالي الّذي هو قلبُ حبيبك هذا إن كنت من أهل المكاشفة وإلاّ تقولُ من قلب حبيبك صلى الله عليه وآله وسلّم وصِلْ إلى قلب سيدنا آدم ولما حصل الفناء للقلب تسلب نسبة الأفعال منك ومن الخلق في نظرك وعلمك وتقول صادقاً كلّ من عند الله بل ليس يدري عندَ من كان عنده نسبة هذا الحال خلاف للقال لا يُشاهد شيئاً إلاّ من الله على قدر استعداده وهو الفاعل الحقيقي والفعال لدى أهل التحيقق وهذه الولاية الصّغرى التي تسمّى ولاية آدم عليه السلام ومن وصل إلى هذه الولاية فهو آدميّ مشرباً وكذا الرّوح تقابل روحك روحه الشريف وتعرض لتجلّي الصّفات الثبوتية الّذي ورد من روح سيد البشر إلى روح نوح وإبراهيم عليهما السلام إلى روحك والواصل في هذه الدّايرة يقالُ له إبراهيمي المشرب فإنّه إلى الخلّة أنسب وعلامة الصّدق أنه ليس ينسب الصّفات بأسرها إلى منْ أثرَ له وبعين الصّدق يرى ويعتقد ويقول مايرضى الرّب وأيسر أن لا يتشخص شيئاً من الأشياء لا حساً ولا نفساً ولا أنساً وهكذا في السّرّ والمقابلة, ولكن يعرض فيض شئون الذات الّذي هو كاشف الأسرار صلى الله عليه وآله وسلّم ورد إلى سرّ موسى عليه السلام والواصل إلى هذا المقام موسَويٌّ المشرب والصّادق في هذا الحال يرى ذاته مستهلكة في ذاته تعالى وكذا الخفيّ وتقابله بلطيفة النّبي صلى الله عليه وآله وسلّم وتعرض بالتضرّع إلى ربّك وترجو فيض الصفات السلبيّة الّذي ورد من خفي النبي إلى خفي عيسى عليه السلام والواصل فيا عيسويّ المشرب وتجريد الربّ وتفريده في هذه المراقبة على السالك وارد ولا يرى ولا يعلم إلاّ من الواحد, وليس في علمه إلاّ الواحد, وفي الأخفى تقابلها إلى لطيفة الأخفى في صدر سيد الورى الّذي صلى عليه ربّنا متضرّعاً إلى ربّ الشّعرى للشأن الجامع الّذي تجلّى في أخفى حبيبه الآدمي والسمود فيها محمديّ المشرب والتّخلق بأخلاقه فيها أقربُ ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء والسّير فيها لا يعيّن إلاّ بلا تعيّن ولكلّ من تلك المراقبات محو وصحو إذا غلب

المحو يشكُرْ وإذا عادَ الصّحوُ يشعر وكلّما يغلب المحو فالصّحو أرغب, يعني مادام يكون المحو أصفى من الكدورات البشرية وإذا غلب الصّحو يكون أصفى إلى ألأحكام الشرعية والاعتبار بالاستقامة مع الشريعة أولاً وآخراً وباطناً وظاهراً لأنّها هي النهج القويم والصراط المسقتيم بالقرآن العظيم فطوبى لمن ترك الغير وتوجّه بالكلية إلى الخير و رزقنا الله وإياكم وما ذلك على الله بعزيز وليس الكلام واسعاً لبيان المرام والله أعلم بالصّواب.

**الرسالة الثالثة:** تحرير جوابي إلى فريد العصر ووحيد الدهر مولانا عبدالقادر المدّرس مدّ ظلّة ودام إفضاله.

الحمد لله الّذي علّم بالقلم, العليم الأكرم الّذي علّم الإنسان ما لم يعلم والصلاة والسّلام على نبيّه وحبيبه سيدنا محمد الّذي في فضله وشرفه جفّ القلم الّذي هو أكمل الخلق وأعلمْ الورى وأكرم الّذي لم يبت في بيته دينار ولا درهمْ وكان رضي الله عنه من كلّ شيء أحبّ وأعظم وهداية الناس إلى معرفته علماً وعملاً ممّا في الدنيا أهمّ, وصلى الله عليه وعلى آله وصحبه أجمعين إلى يومِ الدين وسلم.

وبعد لقد تشرّفنا بكتابكم الأنور وتنوّر به بصر عمر كأنّما اكتحل بكُحل مازاغَ البصر رأينا حروفه لمدامة الوداد ظروفاً وكلماته مبشّرة بأنّ وثام خيل جيش الفضلاء كان إلينا عطوفاً وصار بتلك البشارة قلب خادمكم مشغوفاً حمدت ربّي على استقامتكم واستمدت منه لدوام إفادتكم وأرجو الله مزيد سعاداتكم يا من أنت إلينا أن العلم مراد لدى العلم والخبير وله خلق الصّغير والكبير وله أحر أمر بالطاعة في القليل والكثير وفي كريمة وقل ربّ زدني علماً لتعظيمها بشارة عظيمة وما أوتيتم من العلم إلاّ قليلاً تشير إلى كريمه على كلّ نعمة كريمة دون الجهل منه يتبرأ منه من هم فيه نعم إنّ الأنبياء لم يرثوآ درهماً ولا ديناراً وإنّما أورثوآ العلم فمن ظفر به وتعلّمه

لما هو له فقد فازوا ومن تعلمه وجهل قدْره فأدخل نفسه مع المجرمين في بئر وأمتازوا اليوم أيّها المجرمون حشرَنا الله مع العلماء الرّاسخين آمين.

**الرسالة الرابعة:** إلى العلامة المفضال الملا فتح الريْژابي.

وقد تفضل بهذا الخطاب والمكتوب إلى جناب ملا فتح الريْژابي.

لقد همّ قلبي بوداد أهل السعادة ولامه بعض الحسّاد وأنتقم منه ربّ العباد فأهلكهم بالطاغية وأرسل عليهم ريحاً صرْصراً عاتية نعم من مال باله إلى الحبيب وناله من الأعداء سهام المحن ولم يكن قوّة للانتقام في البدن نصره الله وأعزّه ونجاه ويجعل الخير متقلّبه ومثواه, فآنظر يا صاحبي هل ترى لهم من باقية أماترى كأنّهم أعجاز نخل خاوية رحم الله أصحاب الألفة الذين خربوا ديار الكلفة وأسلفوا ما وجدوا في الأيام الخالية وسالكوا سبيل النّجاة ووصلوا إلى الجنة العالية وجوههم يومئذٍ ناضرة إلى ربها ناظرة طوبى لهم وحسن مآب واستفازوا وأخذوآ بينهم الكتاب.

يا حبيبي لاتغترّ بالدنيا فإنّها دنية فانية والقلوب المائلة إليها قاسية ولنعمَ الله ناسية إن كنت تريد عيشاً دائماً تكن في الليالي بالعبادة قائماً وبالنّهار ما أمكنك صائماً ولا تمل إلى ما يفرّحك اليوم فانّه يبكيك في يومك وتسمع من الملائكة إن عليك اللّوم يوم ترى أقواماً في السرور وأفواجاً مسترحين بالحور فوجاً يدورون في القصور وأقواماً يسعى بين أيديهم وبأيمانهم النّور لا أقسم بيوم القيامة ولا أقسم بالنّفس اللّوامة لا تنفعك يومئذٍ النّدامة وأرض بالله رباً وبالإسلام ديناً وبالقرآن إماماً وبمحمدٍ صلى الله عليه وآله وسلم نبيّاً ورسولاً وكنْ مع الصّادقين كي تكون مقبولاً والآخرة خيرٌ وأبقى.

**الرسالة الخامسةُ:** حرّره بيديه الكريمتين إلى خليفته ببغداد حضرة جناب الفاضل الكامل الشيخ محمد سعيد أفندي البغدادي.

بسم الله سبحانه وتعالى

ألا فاسقني خمراً وقل لي هي الخمر ... ولا تسقني سرّاً إذا أمكن الجهرُ

وبح باسم من أهوى ودعني عن الكنى ... فلا خير في اللّذات من دونها سترٌ

الحمد لله الذي أعاد حبيبي السعيد باللّطف الحميد إلى مقام التذكير والتحميد وجعل بقدومه أيامنا يوم العيد إنّه حميدٌ مجيد والصلاة والسلام على سيّدنا محمد النبيّ الأصيل وعلى آله وأصحابه الذين زهدوا وجاهدوا و اجتهدوا ودفعوا بسيف الغيرةِ كلّ كفّار عنيد وبعد:

يا ويلتى من بسط يد الفراق من بيارة إلى العراق ويا لهفى من هجوم خيله ونجوم ليله واشتداد حبوب الامه وامتداد سنابل ايامه وكثرة أسقامه ووفرة أقسامه الآن.

إنّ الفراق هو المليك الجائر وعظم ملكه وسلطانه ما هو إلاّ حاكم لا يعدل في رعيّته ولايُسئل عن هيبته ولا يمكن الفرار من حكومته فهل للهارب من سبيل وللهايم من دليل الويل ثمّ الويل حيث لا مقرّ من أرضه ولا مفرّ من بغضه ولا طريق إلى الخلاص ولات حين مناص يا حبيبي وفرحة قلبي إذا عطفتم عنان السؤال لمعرفة الأحوال فآعلم أنّ القلب بحبّك متقلّب والفؤاد بودادك متتعب والعين في جبّ الحبّ تنتظرك مع حبّك إلى متى تبقينا في بئر الحسرة والى أين ترغب عنّا بالهجرة وتترك أصحاب كهف الفكرة علام تنسانا وإنّا إليك منتظر وحقّ الحبّ والوداد إنّه ما بقى قوّة للبصر لقد صار مقامي منه الفراق وغلبة الاشتياق كالسجن حقيق على أن أقول وابيضّتْ عينايَ من الحُزنِ أين شفقة الوداد أماتخاف من نور تأوّه خدّام أهل الرّشاد أدام الله أيامك وأعانك بذكره في قعودك وقيامك وزين بك المقام في البدء والختام

بحسن العبادة وتربية العباد وأيّدك بهم العباد المتكئين على أريكة الإرشاد وإذا صحّ لكم التوجّه إلينا فنعمّا هي وبشّرو إلاّ فأشرنا ناقلاً ماجرى في السّقر راوياً كيفية الرّجعى من باب السعادة إلى الوصول والقبول مفصّلاً أو مختصراً ونرجوا لك الحسنى وزيادة بجاه من كان التقوى زاده وسلام على عباده الذين اصطفى والتزموا متابعة المصطفى صلى الله عليه وعلى آله وصحبه أهل المغفرة والتقوى وسلّم وأسلمُ على من بالصدق عندكم وأهل العلم والمريدين جميعاً.

**الرسالة السادسة:** تحرير مبارك إلى العلامة الناصح الشيخ السليم الأديب البارع.

يا سليم القلب في واد الوداد ... كم أناديك خفيّاً بالفؤاد

لا تدعْ ودَ الودود التّائهِ ... علّه بنجيك في يوم التناد

ودّ أهل الودّ في دار الفنا ... ذخر أهل الصّدق في يوم المعاد

ما قلاك القلبُ آناً يا أخي ... منذ آخاك لدى أهل الرشاد

إنّ ذا الفضل من الله العليّ ... قد علا قدري بفقري في العباد

ما انصرف عن عدله قطّ عمر ... إنّه بالفوز سادَ القوم ساد

بعد از سلام چشمان عزيز با صدق و تميز را ببوسم ومى نوسم شكر خدا لازمت كه بندهى خود را راه فقر نشان داد و صحبت و خدمت و غلامى فقرا را خلعت أميدوارى و تاج فرق فخر فرمود (الحمد لله ثمّ ثمّ إلى أبد الآبدين) و اميدوارم دوستان ما را عموماً وخصوصاً آن عزيز را تميز مقام صبر و شكر كرامت فرمايد و آلودهى به رنگ دنيا ننمايد و به استقامت طاعت بر سجادهى توحيد آسوده گرداند (إنّه بعباده رؤوف) إن شاء الله خاك قدم فقر را به تاج مرصع امرا مقابله نباشد

ایشان عیال مذکورند و اینان به مال بازولال مسرور شتّان ما بینهما دعا کن که همیشه پیشانی ارادتم به خاکپای فقرا خدا بانشان باد سعادت جاودان را بهانه است.

**الرسالة السابعة:** مكتوب جوابي إلى السيّد هداية الله عليه رحمة الله.

بسم الله حامداً مصليّاً ومسلّماً أما بعد فقد تشرّفت بالكتاب المستطاب وأفادت رؤيته فوايد الخطاب فلّما تأملت في المعاني التي المحت نواصيها من زوايا المباني إذاً كلّها كالدّر المنضود ومثله في الأمثال مفقود والجواب لدى الخطاب موجود كما هو رأي أصحاب صفة الصّدق ولكنّ التحرير موجب تسويد الصحايف من البدايع اللّطايف فالإيجاز أحرى وأنفع إمتثال الأمر أولى ولدى الهوى عند ذي النهى أعلى وأقطع إن لم يكن متلّذذاً بذكر مولاه فهو كاذب في فكر هواه والذين جاهدوا فينا لنهدينّهم سبُلنا فإن شئت أن تحيي سعيداً فمت به شهيداً وإلاّ فالغرام له أهل ومن لم يمتْ في حبّه لم يعش به ودون اجتناب النّحل ما جنت النحل ومعلوم أهل المعرفة أنّ الرقيب بصير وأنّ العليم خبير كيف يتصوّر الجواب من المصوّر بين يدي الله المصوّر خيال الأعذار كمال الأعذار ترك التهوّي في الهوى أحسن وترك الإرادة في الإرادة أمتن قمْ كمنْ قام بالاستقامة وكمَنْ توجّه إلى القيامة دعْ الأمارة اللّوامة إلى متى تدور لأين وحتى تمسّك بأذيال الهوى واخلع الهوى الحيا وخلّ سبل الناسكين وإنْ جلّوا واعلم يقيناً بأن لي محبّة صادقة معك ولكن ظهور نور السرور يبدو رويداً رويداً إن شاء الله.

**الرسالة الثامنة:** في بيان وشرح اللّطايف من أجل حلّ عقد ومشاكل المؤمنين حرّرها ببركته ولطفه.

بسم الله والحمد لله وسلامٌ على عباده الذين اصطفى محض تسليهٔ خاطر دوستان که دماغ ارادتشان از گلستان صداقت بوستان است بعد از استدعای توفیق

ولپس از تمنّای وصول بدرجه تحقیق به فریق تصدیق بیان مي دارد که بعضی از احباب عبارات بزرگان باصفا و اشارات سر بلندان مجالس وفا را که از مباحث فنای لطایف وعناصر عالمین امر وخلق محرّر فرموده اند دیده اند واز مبتدیان بریك معنی از آنها فهمیدة گویا دماغ فهمشان بویه از گلستان نەیاشامیده و پای عزمشان انجاها نرسیده واین فقره مایه تصوّرات نوعیه بعضی که خرمان کردیده یمین ویسار خودشان نشناخته اند وباحالات فقد ونقد در تفریقِ فریقِ اهلِ تحقیق باخته اند وقول خود احابر اعتبار وخیال بیمثال بر آمال جاهلانه وخویش را محك عیار ساخته اند ندانسته که حقّه عبارات را وسعت درر حق تعالی نیست وآن دقایق مبارك ارباب حالند وخارج عمارات عبارت وبعید از قیل وقالند ومتصوّر عقل عادی بر پر خلل نمیشوند باری فقیر که پای تحقیقی رش بستەی زنجیر تحصیر است مرکز نادانی ومظهر عجز و سرگردانی باکمال جهل ونقصانی رزمی را از کنوز ان بزرگان به سلك تحریر درمی ارد که فایده اش عاید فهیمان وقاعده اش قاید مستقیمان کوی تعلّم وتعلیم آید (إن شاء الله تعالی):

که ندارم از شکر جزنام بهر　　　　این لبي خوشتر که اندر کام زهر

آری لطایف عالم امر ولطایف عالم خلق هریك را کانه صفت ذاتیه است لطایف امریه در صحبت وجوار لطایف خلقیّة اند اصل خویش رافراموش ومنسی نموده اند و به آنهای دیگر که در تنزلات منازل عدیده دارند گردیده وتابع شده اند کأنه مملوك ومحکوم ومظلوم مانده طالب که مقتدارا نه کردنِ اختیار خودرا بسته فتراك ارادهٔ او نمود و به دایرهٔ قبول محسوب شد و به سلوك مامور گردید وصادقانه کوشیده واز یُمن توجّه معنویەی مقتدای خود غبار غفلت وجهالت مرتفع شد وفي الجمله لطایف عالم امر مصفّی شدند در رشتەی تعلّق عالم بشري از علایق صوریه میکردد وعلم را جهة تجرّد به اعتبار صفت ذاتیه خود پیدا می شود سالك در آن وقت معلوم خارجه ندارد لکن بر حسب ضرورت علم بوجود خود را دارد مادام

دانیشت بۆ التّحیات و سەلامی دایەوە، مامۆستا شێخ عبدالکریم رووی تێکردم ووتی: کاکە رکاتێکت خوارد هەستە نوێژەکەت بکەرەوە نوێژەکەم کردەوە.

کاتێ گەیشتمە حضوری شێخی باوکم قدّس الله سرّه العزیز فەرمووی رۆڵە ئەم شەو مامۆستاکان باسی میعراجیان کرد حاڵی بوویت عەرزم کرد بەڵێ تێگەیشتم.

چەن خۆشە کە وا بەبێ زەحمەت بێ

بتبەن بەرێدا بتگەیەنە جێ

ئەوی لە دلا بوە بە گرێ

بۆت بکەنەوە موشکیل حەل بکرێ

پێغەمبەری موبارەك ﷺ ئەفەرموی: (من صلّی البردین دخل الجنه وهما الصبح والعصر) رواه البخاری ومسلم.

**ك ٢٤٤:** هەروەها جەنابی شێخ مەولانا فەرمووی:

خاڵۆیەکم بوو لە دێی تەرخاناوا[1] ناوی حاجی شێخ عەلی بوو بێشەیەکی هەبوو لە چنارەبێ لەو دێیەدا.

شێخ قدّس سرّه ئاشی لەدوورووە بیناکردبوو بۆ خانەقای دوورووە پێویستی بە (نێ)[2] هەبوو، وە دارییەکی ئەستوور و درێژ لە بێشەکەی حاجی عەلی‌دا هەبوو، ئەنجا حاجی شێخ عەلی مەشرەبێ دێوانە بووە، ماوەی دوو ساڵ لە مەدینەی منوّرەدا مابوەوە لەوێ شێخێکی دیوە کە ناوی شاه مظهر بوە وە سلوکی لە خزمەتیا کردبوو.

حەزرەتی شێخ قدّس سرّه تەکلیفی لێ کرد فەرمووی: حاجی شێخ عەلی بییەکی باش وا لە بێشەکەتا بە کاری (نێ)ی ئاشەکەمان دێت، تۆیش ئیحسانت ئەگات،

---

(١) تەرخاناوا: دێیەکە بە بەرزییەوەیە بەرامبەر بە دوورووەی پیرۆز.

(٢) نێ: ئاوی ئاشی بە خور تێدا دێتە خوارەوە بەهێز ئەداتە پەرەی ئاشەکەدا بەردەکە ئەسوڕێنێتەوە.

ووتی بەو شا مظهرە نایدەم، شێخیش خودای تعالی دەرەجاتی عالی کات فەرمووی تۆیش نەی دەیت کاکە علی خودا عەطای ئەکات رۆژێ یا یەك دوو رۆژ درێژەی کێشا و بەسەریا رۆیشت هەورێکی کەم پەیدا بوو هەروا بەناو دێی سەولاوادا خولی خوارد و باران دایکرد بە چەشنێ باری لافاو هەستا چەند سەر حەیوانی و ئاژەڵی برد ئەنجا دای لە بێشەکە دارببیەکەی هەڵ گرت هێنایە بەردەم ئاشەکە، دوایی هاتە خوارەوە سەیری کرد داربییەکە لەبەردەم ئاشەکەدا کەوتوە، وتی بە خوا برا شێخێکی گەڕ بازن، شێخ فەرموی حەزم ئەکرد خێری تۆیشی تیا بێ الحکمُ لله ئێستەش إحسانی تۆی تیا بێ"[1].

جارێ تر فەرموی: یەکێ لە پیاوی بەگزادەکانی هەورامان ئازاری یەکێکی تری کردبوو، کە ئازار دراوەکە هەم مرید بوو هەم ئەهلی محبّەت و خزمەت گوزار بوو پیاوێکی هەژار و دیانەتدار بوو ئەوەیش کە ئازاری کردبوو نۆکەر و زۆردار و بێ بەزەیی بوو، لەو کاتەدا کە ئەو هەژارە هات بۆ شکاتی ئەحواڵی خۆی حەزرەتی شێخ قدّس سرّە تەشریفی موبارەکی لەماڵەوە نەبوو، منیش تەمەنم لە دەوری ١٢ ساڵانەدا ئەبووم گریان و زاری دەست پێ کردوو وتی ئێوە بە دەستوری خۆتان چاو ئەنووقێنن و قسە لەگەڵ رابیطە ئەکەن، ئەبێ چاو لێك بنێیت و شکاتم عەرزی شێخ بکەیت منیش چوم دەستنوێژم شت و نوێژم کرد و بە شێوەی رابیطە دانیشتم داخوازی پیاوەکە کە شکاتی هێنا بوە لام ووتم حەزرەتی شێخ لە رابیطەدا پێی ووتم کە بەیانی خۆیشم دێمەوە جوابی ئەو داوایەی فەرموو بە قبوڵ کردنی داخوازیەکە و شکاتەکەی

---

(١) ئاگات لە حاڵی ئەو و ئەمیش بێ    هۆشیشت بە لای وبي يبطشْ بێ

قال ﷺ : إنّ الله تعالى في الحديث القدسي قال: من عادى لي ولياً فقد آذنته بالحرب وما تقرّب إليّ عبدي بشيء أحبّ إليّ مما افترضته عليه, وما يزال عبدي يتقرب إليّ بالنوافل حتى أحبه فإذا أحببته كنت سمعه الّذي يسمع به وبصره الّذي يُبصر به, ويده التي يبطش بها ورجله التي يمشي عليها ولئن سئلني لأعطيّنه ولئن استعاذني لأعيذنّه رواه البخاري.

پرسرا، هەر ئەو شەوە پیاوە زۆردارەکە لە خەوا وای دی بوو شێخ جامێ ماستی بە دەسەوەیە و پێی ئەڵێ ئەنگوستێ بدە لەم ماستە بیخۆ ئەویش پەنجە ئەبات لە ماستەکەی ئەدات کە ئەیبات بۆ دەمی قەترەیە لە ماستەکە ئەکەوێتە سەرمەچەکی بەو ئێشەوە بە ئاگادێ لە خەوەکەی ئەنجا بۆ بەیانی شێخ تەشریفی هێناوە و کابرایش بەو ئێشەوە گەیشت زۆر زۆر پاڕانەوە و لالانەوەی کرد فەرمووی تیر ترازاوە هەستە بڕۆ بگەڕێ بەو دێهاتانەدا کە زوڵمت لێ کردوون گەردنی خۆتیان پێ ئازاد بکە و شەوی جومعە وەرەوە ماڵی خۆتان، ئەویش سواری وولاخێ بوو و دێ بە دێ گەڕا گەردن ئازادی کرد و شەوی جومعە هاتەوە ماڵی خۆیان هەر ئەو شەوە دنیای بێ وەفای بەجێ هێشت قال رسول الله ﷺ (التائبُ من الذّنبِ كَمَنْ لا ذَنبَ له, اللّهم اغفر له ولنا يا أرحمَ الرّاحمين).

هەتـــا ئــــەتوانی ئاگـــات لـــــە دڵ بێ

وەختـــت بـــە لاوە مـــورغی سەرچـــڵ بێ

بـــۆ دڵ نـــەوایی بـــا وەختـــت نـــــەچێ

کــە چـــوو جـــارێ تـــر نایەتـــەوە جێ

**ك ٢٤٥:** جارێ تر فەرموی: لە دێی (...........) مەلای دێیەکە ناوی مەلا عبدالله بوو، خزمەتکارێ کە سەرە و کاری ئەو دێیەی ئەکرد ملا عبداللەی حەپس کردبوو، وە دەرگای لەسەر داخستبوو لێی نەکردبووەوە، لە پەنجەرەی ژوورەکەوە کوێخای دێی ئەکەوێتە بەرچاوی هاواری لێ ئەکات کاغەزێ لە بەیانی ئەحواڵی خۆی ئەنووسێ تەسیلمی ئەکات کە بۆی بنیرێ بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ بۆ دووڕووە کاتێ نامەکە ئەگاتە دەس حەزرەتی شێخ و دەیخوێنێتەوە، ئەفەرموێ من بڵێم چی "سکی بێتە ئێش" بۆ بەیانی ئەو رۆژە ئەو کابرایە لەگەڵ مامۆستای دێ کە هاتن بە داد و فوغانەوە هەم بە ئێشی زگ گرفتار بو بو هەم بە حاڵەتێ کە رووی ناو مەجلیسی نەبێ

بەڵکوو رووی ئەوەی نەبوو لەگەڵ کەسێکا پێکەوە بوەستێ، کە هات لە رێوە خۆی خستە ناو تەویلەی ووڵاخ عەرزی شێخیان کرد فەرموی تفەنگەکە بنێرێتەوە بۆ ئاغای کاکۆڵ و زوڵفی بتاشێ و تەوبە بکات ئەنجا لەو پلەکانەوە سەرکەوێ رزگاری ئەبێ ناچار بە پێی دەستور معامەلەی کرد و لە پلەکان سەرکەوت گەیشتە ئاخر پلە و رزگاری بوو. پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ئەفەرموێ: (الظلمُ ظلماتٌ یومَ القیامةِ) یانی زوڵم تاریکی‌یە بۆ رۆژی ئاخیرەت.

قەت زوڵم مەکە جێی نەدامەتە        زوڵم تاریکی بـــۆ قیامەتە

**ك ٢٤٦:** خوا لێ خۆشبوی بەرێز جەنابی ملا محمد ئەمینی باراماوایی[١] خوا بە کەرەمی خۆی بمانبەخشێ پایەی بەرزکات لێم بیست فەرموی: جارێ لە خزمەت پیری دڵ منیر حەزرەتی شێخی علاء الدین‌دا قدّس سرّه لە باخێکا بە پێوە وەستا بووم، وە حەزرەتی پیریش دەستی دابوە بەر ئەژنۆ پاژنەی پێی لەسەر زەوی دانابوو ژێر پێی بەدیارەوە بوو سەریشی لەسەر ئەژنۆ بە شێوەی موراقەبە و مەشغوڵی دیار بوو، وە بەندە ئەحمەدی کوڕم تازە نزیکە پێگرتنی بوو و منالّ بوو بە خەیالّ لە دێی نژمارەوە[٢] هێنام تا گەیاندمە بەر دەستی وە هەروەها بە خەیالّ دەمی ئەو کوڕەم نا بە ژێر پێی پیرۆزیەوە و بە شێوەی زیارەت کردنی، کتوپڕ پێی هەڵکێشاوە وەك یەکێ بە ئاشکرا ماچی بکات، دوایی فەرمووی ملا محمد ئەمین کوڕەکەت ناوی چییە؟ عەرزم کرد قوربان من وام زانی تۆ خۆم و خێزان و ماڵ و منالّت خستۆتە ناو کیسەیەك و لەوبەر پردی صراطەوە دات ناوە تازە ئەفەرمووی کوڕەکەت ناوی چییە؟ ئەنجا فەرمووی ئەحمەد؟ عەرزم کرد بەڵێ.

---

(١) بارام ئاوا: سەعاتە رێیەك ئەم لای دوڕووە کەوتوە لای طەرەفی دەربەن کەڵەوێ.

(٢) نژمار: دێیەکە لە مەریوان لە میانەی ولەژێر و دەرگا شێخاندایە.

قال رسول الله ﷺ إنّ مِنَ العلم كهيئة المكنون[1] لا يعلمه إلاّ العلماء بالله تعالى فإذا نطقوه به لا ينكره إلاّ أهلُ الغرّة بالله ﷻ. رواه أبو منصور والدّيلمي في المسند وعبدالرحمن السّلمي في الأربعين التي له في التصوّف.

چــه عەجــەب لـــــه بـۆ خــەڵكی نەفســانی
خــۆی نــەی بــوو تــۆیشی وەكــو خــۆی زانی

**ك ٢٤٧:** مەرحومی مامۆستا شێخ عبدالقادری حەوتاشی فەرمووی: جارێ قەلبم خستە قەلبی حەزرەتی شێخ، خانەقا پڕ بوو لە تجلاّی خودا وە رۆحی رسول الله م ﷺ لە سینەی حەزرەتی شێخدا چاوپێكەوت.

جارێ تر پێی فەرمووم: هەر شێخێ دەستبڕ نەبێ بە لای کەمەوە ئەبێ لە کاتی سەرەمەرگ و جوابی مەلەکەین لە قەبرا هۆشی بە مریدییەوە بێ وە جارێ تر فەرمووی کە فەقیانەکەی بەدەستەوە گرتبوو ئەمە ئەگەر پەڵەیەکی پێوە بێ ئەبێ بیخەیتە ئاو، طەریقەت وەرگرتن وەك ئاو وایە بەڵام ئەبێ خۆت هەڵی بفلیقێنی جا لێی ئەبێتەوە.

عیلم بۆ زانین زانین بۆ کردن          کردن بەسوودە بۆ پاشی مردن

لە (مامۆستا مەلا عارفی بانەیی)م بیست رحمة الله علیه فەرموی: کاتێ مجذوب بوم وە ماوەی جەزبەکەم ٣ سێ رۆژە دەوامی بوو، لەو ماوەیەدا ئەمبینی کە حەزرەتی رسول الله ﷺ هەردوو پێی موبارەکی بەسەر سەری حەزرەتی شێخەوەیە بەڵام نەمئەزانی ئایا پێی پیرۆزی متّصلە بە مێزەرەکەی سەریەوە یا نە، وە حەزرەتی رسول علیه الصلاة والسلام جبەیەکی زەردی زەعفەرانی لەبەردا بوو، وە ئەشمبینی بە چاو کە جەمیعی ئەرواحی ئەولیا ئەهاتن یەکە یەکە دەورەیان لەو صورەتی حەزرەتی رسول الله ﷺ ئەدا

(١) كهيئة المكنون: كهيئة الدّرّ المستور بكثرة تقواهم أجرى الله على لسانهم وفقّهم في دينهم.

وەئەیشم ناسین کە ئەوە حەزرەتی شاهی نەقشبەندە (قدّس الله سرّه العزیز) تەشریفی هێنا وە حەزرەتی غەوسە (قدّس الله سرّه العزیز) وە هەروەها باقی تری ئەولیا تەنیا حەزرەتی ئیمامی شافیعی)م نەدی تأویلم بەوە کرد کە لەشەرعا ئێستا کامیل نیم، من أراد الله به خیراً یفقّه فی الدین[1].

دڵێ خاڵی بێ لە عەشق مردوە　　دڵی عاشقان دایم زیندوە

**ك ٢٤٨:** وە هەم جارێکی تر مامۆستا ملا عارف فەرمووی:

جارێ لە وەختی فەقێیەتیدا زۆر لە مردن ئەترسام چووم عەرزیم کرد، بانگی کردمە بەردەمی خۆی گرتمیە ژێر باڵی خۆی وە بە خۆیەوە گوشیم و فەرمووی مردن چی‌یە تۆ لێی ئەترسی؟؟؟ کاتێ لە ژێرباڵیا جیا بوومەوە ئیتر ئەو ترسەم نەما.

کەسێ پەروەردەی دەستی بەقا بێ　　کەی ئەبێ ترسی لە بای فەنا بێ
أذکروا هازم اللّذات فەرموو مصطفی[2]　　تا لە دڵ لابا کە دەربێنێ صفا

**ك ٢٤٩:** جارێ شەخصێ دێتە خزمەتی داوای ئەوە دەکات کە خوا کوڕیان بداتێ، وەعد ئەدات کە خێزانی حامیل بوو ئێسترێ بهێنێتە خزمەت شێخ بۆ خانەقا کە سکی خێزانی دیاری ئەدات لە بەخشینی ئێسترەکە پاشگەز ئەبێتەوە، عەرزی حەزرەتی شێخ ئەکەن فلان پەشیمان بۆتەوە لە خەلاتەکەی بۆ خانەقا.

---

(١) کەسێ خوای تعالی ئیرادەی خێری پێی بێ تێگەیشتووی ئەکا لە دیندا، یانی دینی پێئەفامێنێ.
(٢) یادی لەزەت شێوێن بکەن یانی مردن، بۆئەوەی دڵ لە محەببەتی دنیا کە لێڵییە دوورکەوێتەوە، وە محەببەتی خوا کە سەراسەر نوورو صەفایە بێتە پێشەوە.

حەزرەتی شێخیش ئەفەرموێ ئێمەش لە ئەولادی خۆمان پەشیمان ئەبینەوە مامۆستا فەرمووی ماوەی ٤ چوار ساڵ هەروەکو سك پڕ وابو بێ ئەوەی هیچی دیار بێت.

**ك ٢٥٠:** جەنابی مامۆستا مەلا شێخ زاهیدی[١] کوڕی شێخ مەلا محمدی سونەتە[٢] گێڕایەوە فەرمووی لە دێی دەرەتفێ کە لە ناوچەی تیلەکۆیە لەماڵێکا هەندێ منالّ بوون هەتیو بوون ئەو ماڵە بەردە باران ئەکرا[٣]، ئەنجا ئەبران بۆ هەر ماڵێکی تر ئەو ماڵەش هەروا بەردی بۆ ئەهات، ئەم حالە بەردەوام بوو بەلاّم بەردەکەش لە کەسی نەئەدا بۆ چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتە کۆششێکی زۆ کرا هەولّێکی زۆر بەکارهێنرا وە پەنا بە چەند ئەهلی دۆعا و نزا برا، لەدوور و نزیك بە هیچ جۆر چارەسەر نەکرا، هاتن بۆ لام بۆ شاری سەقز لەم بابەتەوە داوای چارەسەر و تەگبیریان کرد منیش پێم ووتن:

بۆ بزن ناشێت گێرەی خەرمانان
گای جووتی ئەوێ و پیاوی پالّەوان

ئەبێ ئەم شکاتە ببرێتە خزمەت قطبی زەمان چرای خانەدانی ئالی عثمان غوس السالکین حەزرەتی علاء الدین قدّس سرّە ئەوانیش پیاوێکیان بە کرێ گرت و نامەم بە دوور و درێژی لەسەر ئەم رووداوە نوسی و بردی، بە هۆی سەرما و سۆلّە و بەفری زۆرەوە کە باری بوو ئەو پیاوە نزیکەی ٤٠ چل رۆژێکی پێچوو، تا هاتەوە ئەوەی زەخیرەی ماڵەکەی بوو وەك برنج و نیسك و نۆك و وێنەی ئەمانە هەموو

---

(١) سونەتە: دێیەکی گەورەی سەر بە پارێزگای سەقزە.

(٢)شێخ ملا زاهید: خەلیفەی حەزرەتی شێخ علاء الدین بوو (قدّس الله سرّە العزیز).

(٣) لە وێنەی ئەو بەردە بارانە لەم سالاّنەدا لە دێی دڕی و قامیش لە ناوچەی ماوەت لە نزیکی سلێمانی لە مالّی حاجی عزیز رووی دا.

تێکەڵ کرابوو بە یەکا، کاتێ هاتەوە ئەمری حەزرەتی شێخ قدّس سرّە وابوو کاغەزێ کە ناردبووی سەری هەڵ نەپچڕم تا نەچمە ئەو خانوە کە منداڵەکانی تێدا هەن لە دێی ناوبراو، لەسەر فەرمانی پیر و چووم بۆ ئەوێ وە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك کۆبونەوە، بۆ ئەوە بزانن سەرەنجام چۆن ئەبێ، چونکو ئەم مەسەلەیە ماوەیە بو رووی دابوو لە زۆر جێگە و شوێنەوە زانرابوو هەتا ئەچوون بەردیان دیاری ئەکرد یا نیشانەی بەردیان بەیان ئەکرد ئەیان ووت ئەو بەردە فڕێ بدەن، راست ئەو بەردە دائەکەوتە زەوی، بە کورتی کە نووسراوە پیرۆزەکەم لەگەڵ خۆم بردە ژووری ماڵەکە لە ۱۰۰ کەس زیاتر هێرشیان بردە ژوورەوە و حەوشی ئەو خانوە کاتێ زەرفەکەم کردەوە و دەستم بە خوێندنەوە کرد هێرشی بەرد هاوێشتن بە چەشنێ زۆر بوو خەڵکەکە هەموو رایان کرد، منیش چەند جار کاغەزەکەم لێ تێك ئەچوو دیسان ئەگەڕامەوە سەرەتاکەی، وە دەستم پێ ئەکردەوە تا بە هەر حاڵ بوو نامەکەم تەواو کرد وە ناوەڕۆکی نامەکە ئاوا بوو[1]:

---

(۱) عەزیزا بەوانە بڵێ ئەمانە هەتیون، وە هەتیو جێگەی ئەوەن بەزەیی یان پێدا بێتەوە و رەحمیان پێ بکرێ، وە لە مساعدە و کۆمەکی پێ یان کۆتایی نەکرێ، وە هۆی دڵخۆشی و ئیسراحەت و حەوانەوەیان بۆ تەرتیب بدرێ، بڵێ یەکەم بیکەن بە خاطری (سراج الدین کە ناوی عوسمان)ە وە بیکەن بە خاتری بهاء الدین کە ناوی محمدە وە بیکەن بە خاطری (ضیاء الدین کە ناوی عمر)ە. وە بیکەن بە خاطری نجم الدین کە ناوی (محمد)ە، وە بە خاطری من دەست لە ئازاری ئەم هەتیوانە هەڵ بگرن، وە منیش دۆعای خێر ئەکەم، ئەگینا بە وەسیلەی فضیلەی محمد ﷺ خوا دۆستی خۆی ئەوێ داوای نازل بوونی مەئموری ئەزیەت و سوتانیان ئەکەم لەگەڵ ئەمەم تەواو کرد بەردێکی زۆر گەورەیان فڕێ دا و ئیتر تەواو بوو وللە الحمد.

حەزرەتی شێخ علاء الدین و حەزرەتی شێخ محمد نجم الدین بران، کوڕی حەزرەتی شێخ عمر ضیاء الدینن, وە ئەم زاتە پڕ فەڕ و رو بەرەکەتەش لەگەڵ حەزرەتی شێخ محمد بهاء الدین بران کوڕی (حەزرەتی شێخ عوسمانی سراج الدین)ن قدّس الله تعالی أسرارهم الزکیە.

قال رسول الله ﷺ: أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ[1] كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ، وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ[2] وَالْوُسْطَى، وَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا[3] قَلِيلًا. رواه البخاري وأبو داود والترمذي.

هەرکەسێ کەوا هەتیو بەخێوکا    ڕێزی لێ بگرێ هەتا پێ ئەگا
وەك ئەو دوو پەنجە لەگەڵ حەزرەتا    هەردوو پێکەوە وان لە جەننەتا

**ك ٢٥١:** جەنابی خاوەن فەزڵ و صەلاحەت واصیل بە مەرتەبەی ویلایەت صاحیبی خوڵق و خووی شیرین و کردەوەی پڕ لە خێر حاجی مەلا عارفی وولەژێر[4] فەرمووی: ماڵی حاجی حەسەنی پێنجوێنی لە دێی نێ بوو بیستبووم کە خێزانەکەی ٧ یا ٨ کچی هەیە، وە ئیتر منالی نێرینەی نیە، وە هەر خۆی لە خەیاڵما بووە کە بچم بۆ بیارە وە بە تایبەتی لە خزمەت حەزرەتی شێخ دۆعایەکی ئەولادی نێرینە بۆ ئەو ژنە بهێنم شایەد خوا لە بەرەکاتی (أولیاء الله)وە کوڕێکی پێ عطا بفەرموێ، بەلام ئافرەتەکەش خەبەری زانی بوو سەفەری بیارەم مەبەستە، خۆی هات کە رام بسپێرێ بۆ دۆعایەك بۆ هەمان مەبەست، منیش کاتێ بە شەرەفی زیارەتی حەزرەتی پیر شەرەفدار بووم شکاتی حاڵی ئەو ئافرەتەم گەیاند، حەزرەتی پیر حیکایەتێکی نەقڵ فەرموو کەئەویش ئەمەیە: فەرمووی عبدالله بەگی سەرتیپ[5]، خاوەنی دێی قەلاجێ[6]، داوای دۆعای منالی نێرینەی کرد دۆعای بۆ نووسی خوا

---

(١) كافل اليتيم: هەتیو نیگاداری بکا.

(٢) السّبابة: پەنجەی شەهادەت.

(٣) الوسطى: پەنجەی ناوەڕاست. فرّج بينهما: جیای کردنەوە.

(٤) وولەژێر: دێیەکە لە مەریوان دێیەکی خۆشە لە مەریوان وە لە دێی نێوە سەعاتێ دوورە، نێ ڕاست بەرامبەر قەلای مەریوانە، بە کاژێر و چارەکێ لە قەلاوە دوورە، بە پیادە ڕەوی.

(٥) سەرتیپ: نازناوە و لەقەب نەك ناو.

(٦) قەلاجێ: سەعاتێ ڕێگە ئەبێ بۆ دووڕووە لە میانەی مەریوان و دووڕووەدایە.

کوڕێکی دایە[1] ، لە دوای ئەو بە ماوەیە تر دیسان داوای دوعای کردەوە کە خوای پەروەردگار کوڕێکی تری بداتێ، منیش دۆعام دایە، کاتێ وەختی منالّ بوون تەواو بو بەسەفەر هات بۆ دووڕووە لێم پرسی کوڕەکەتان نەبوو، ووتی: قوربان کچەکەمان بوو، منیش ووتم: ئەگەر بووبێ کوڕە، من دۆعای کوڕم نوسیوە، ووتی: نەخەیر واللە قوربان کچە منیش لەوە کە حەتمی ئەوە کوڕە دەس بەردار نەبووم، ڕۆیشتەوە بۆ دێی خۆی دایکەکەی و منالّەکەی هێنا، خێزانەکەی لەگەلّ منالّەکەدا ناردبوە دیوی حەرەم کە حەرەمی حەزرەتی پیر عەرزی حەزرەتی شێخی کردبوو: قوربان ئەو کچە، چۆن تۆ ئەفەرموی کوڕە؟ فەرموبوی نەخێر کوڕە، فەرموی: کاتێ لە حوجرە دانیشتم لەگەلّ عبداللە بەگ داوای منالّەکەی کرد لە بەردەممدا دای نا، ویستی کراسەکەی لابدا و پیشانم بدا کە کچە دەستم برد نەمهێشت تا ماوەیە منالّەکە هەر وا مایەوە، وەختێ لە هەندێ نامە و نوسین دەستی پەرژا کراسەکەم هەلّ دایەوە ووتم ئەی ئەوە چییە کوڕە[2] .

ئەمجا حاجی مەلا عارف فەرمووی حەزرەتی پیر دۆعای بۆ ژنەکەی حاجی حسن دامێ فەرمووی ئەم جارە هیچ بۆ جاری تر کوڕ ئەبێ إن شاء اللە, ئەو جارە زکی پڕ بوو کچی بوو بەدوای ئەوا ئیتر خوای تعالی بە بەخشین و خەلات کردنی کوڕ

(١) ئەم ریوایەتەم لە چەندەها کەسی تر بیستوە کە گێراویەتەوە.

(٢) دوای ئەم ڕووداوە کە حاجی ملا عارف گێرایەوە: چەندەها جاری تر لە گەلێ کەسی ترم بیستوە، وە ئەو کچە بە کوڕبوەم چەند جار دیوە، ناوی رووف بەگ بوو دەنگی لە دەنگی ژن ئەچوو، ژنی هێنابوو منالّیشی لێ بوو، وە خۆیشی سەرگوزشتەی خۆی لە دایك و باوکی بیستبوو بۆ خەلّکی گێرابوەوە، وەئەم کەرامەتە گەورەیە لەناوچەی مەریواندا لە شورەت و تەواوتر دەچوو، لەو ماوەی دواییدا پاش ئەوە موو لە ریشیا سپی بو بوو چاوینەی لە چاو دابوو، وە ئەمری خوای پەروەردگاری بەجێ هێنا.

شادمانی کرد[1] ولله الحمد، قال رسول الله ﷺ : ما منْ مسلمٍ له بنتان فيُحْسِنُ إليهما ما محبتاه أو صحبتاه إلاّ أدخلتاه الجنة. رواه ابن ماجه بإسناد صحيح وإبن حبان والحاكم.

| | |
|---|---|
| حەدیثی قودسی پێشووت لە بیرە | ئەمیش بي يبطش هەم بی یبصیرە |
| هەرکەسێ دوو کچ پێ بگەیەنێ | بە باشی بەهەشت بۆ خۆی ئەسێنێ |

**ك٢٥٢:** له خاڵه سید محمودی تاوەگۆزیم بیست گێرایەوە وە فەرمووی: مامە مصطفی لە دێی بەشارەت وەفاتی کردبوو لە تاوەکۆزییەوە لەگەڵ ماموژنە عایشەم هاتین بۆ پرسەی، وە لەو کاتا من منداڵ بووم ماموژنم سواری وولاخ بوو لە بەشارەتەوە روەو بیارەی شەریف پاش بەجێهێنانی شێوازی پرسە و دوای چایی خواردنەوە رۆیشتن گەیشتینە خێڵی حەمە کە ئەو ناوچەیە ئەو کاتە چۆڵ بوو، زەلامێکمان لە دوور دی، بە ماموژنم ووت ئەو پیاوە تەماعی ماینەکە گرتوویەتی ئەگەر ووتی ئاگرتان پێ نیە یا قسە و باسی کرد من رائەکەم تۆیش ئاوزەنگێ بدە لە وولاغەکە و بەغاربێ بە دواما کاتێ پێی گەیشتین خەنجەرێکی پێ بوو لەگەڵ کوتەکێ خۆی هەڵ کردبوو بۆ ئەوەی ماینەکە ببا، ماندوو نەبوونی لێ کردین جوولا رووبەڕوومان هات من رام کرد و ووتم بە ماموژنم: بخوڕە[2] لە ماینەکە کە ئێمە دەرباز بووین ئەویش بە ماوەی بەردهاوێژێ بە گوڕ بە شوێنما هات ئیتر پەکی کەوت و ئێمە رزگاربووین دوایی تا ئێمە گەیشتینە دەرقوڵە ئەو هەر لەوێ مابوو، نوێژی نیوەڕۆ گەیشتینە بیارەی شەریف بە خزمەت حەزرەتی شێخ گەیشتین قدّس

---

(١) خێزانەکەی حاجی حسن خورشیدی ناوبوو دوای دۆعاکە ٣ سێ کوڕی بوو: ١- حمە سعید ٢- سلیم ٣- حمە رشید هەرسێکیان خاوەن خێزان و منالی خۆیانن لە کوڕ و لە کچ دانیشتووی پێنجوێنن. (نوسەر)

(٢) بخوڕە: یانی دەنگی بدە بۆ ئەوە بەغار بێت.

سرّه شێخ فەرمووی: لە ڕێ نەگەیشتن بە هیچ کەس گەلانێ گێلانێ[1] مامۆژنم عەرزی کرد نەخێر نەگەیشتینە کەس، ئەمجار فەرموی مەتێ[2] ئایش لە ڕێدا نەگەیشتن بە گەلانێ گێلانێ دووبارە عەرزی کرد نەگەیشتن بە کەس، سەری سێیەم جار شێخ سێ بارەی کردەوە فەرموی عەینی فەرمودەکەی پێشوو ئەمجا مامۆژنم عەرزی کرد قوربان ئێستە هاتەوە بیرم: لە پشتی خێڵی حەمەوە لە لای خاگێلان گەیشتینە زەلامێ محمود پێی ووتم ئەوە تەماعی کردۆتە ماینەکە ئەگەر ووتی مانو نەبن یا ئاگرتان پێ نیە من رائەکەم تۆش بێ بە دواما کە گەشتین پێی ئەو مانوو نەبوونی لێ کردین محمودیش ووتی ئامۆژنم بێ وەرێوە ئیتر ڕامان کرد ماوەی بڕك هاوێژی[3] بە دوامان ڕای کرد ئەنجا وەستا لەسەر ڕێ حەزرەتی پیر فەرمووی ئەو سەگە خەیاڵی خراپ بوو ڕای کرد بە دواتانا منیش دووبەرد هاڕم بەست بە زەنگوڵیەوە ئیتر تەکو جمی نەما.

تا نەگا پایەی پێی و بی یمشی　　　وبي يسمع چۆن وایـه ئیشی

**ك ٢٥٣**: حاجی وەستا محمدی خەیات سیرێیی گێڕایەوە فەرمووی:
شەوێکی دەرنگ وەخت لە بیارەی شەریف لە خزمەت حەزرەتی پیردا بووم لە بەینی فەرمایشتەکانیدا فەرمووی کێ لێرەیە؟ کتوپڕ عەرزم کرد قوربان بەندە وەستا محمد فەرمووی وەستا هەرکەسێ منی ئەوێ عوسمانی بوێ؟ وە هەر کەس عوسمانی بوێ منی ئەوێ بەندەش عەرزم کرد بەڵێ قوربان وە جەنابی خاڵە سید محی الدين کە باوە محی الدين ناو ئەبرێ ئیجازەی خەلافەتی حەزرەتی پیری هەبوە و مێزەری موبارەکی خۆی بەستۆتە سەری گێڕایەوە فەرمووی: شەوێکی درەنگ وەخت دوو بە دوو

---

(١) گەلانێ گێلانێ: زاراوەیێکە بۆ خەڵکی نەناسراو بەکار ئەهێنرێ یانی کەسانی نەزانراو.

(٢) مەتێ: پوور، ئایش: ئایشە، خێڵی حەمە: دێیەکە لە شارەزوور لەولا سید صادق ەوە (قدّس سرّه).

(٣) برك: بەرد، بەردهاڕ، بەردە ئاش.

پێکەوە لە خزمەتیا چاوەڕوانی فەرمانم ئەکرد کتوپڕ سەری موبارەکی بەرزکردەوە فەرمووی کێ لێرەیە عەرزم کرد محی الدین فەرمووی باوە محی الدین چەندەها جار نزامان کرد و پاڕاینەوە لە خوا، خواش بەکەرەمی خۆی نزاکەی لێ قبوڵ کردین کە بەلاَ هات بۆ عێراق و ئێران خوا بەو نزایە بە هیممەتی دۆستان بەلاکەی گێڕایەوە، بەڵام بەلایەك بەڕێوەیە لە دەوری عوسماندا دێت بۆ سەر هەردوو لا "خۆزگەم بەو کەسەی ئەمێنێ بۆ دوای ئەو بەڵایە" دەور دەوری عوسمان ئەبێ، دەورێکی زۆر پڕ لە نصرەتی دین و سەربەرزی شەریعەت ئەبێ"[1].

جەنابی کاکە شێخ مەولانا خالید فەرمووی: ساڵێ شێخی باوکم قدّس سرّه لە کاتێکا دەخل و دان گران بوو فەرمووی بچۆ بۆ سەقز گەنم بکڕە، وە پووریشت لە (سەردەرە) بهێنەرەوە، منیش ڕۆیشتم لەو سەرەوە هاتمەوە لەگەڵ ماڵ و کۆچی پورم وە شێخ ڕۆوفی پورم لەگەڵما بوو، وە چەن قەتارچی و خەڵکی تریش کە بە بارە گەنم و ئەسبابی ماڵی پورم نزیکەی (٥٠) ولاخێ ئەبوون ڕەمەزان بوو گەیشتینە (کەلی کاومەلە) بەدیوی ئێراندا کاروانەکە لە پێشەوە ئەڕۆیی منیش سوار بووم نوێژی عەسرم نەکردبوو تفەنگێکم پێ بوو، نوێژم دابەست، هێشتا نوێژەکەم تەواو نەکردبوو دەنگی دوو سێ تەقە تفەنگ هات کە سەلامم دایەوە کەسێکم دی ووتم ئەوە چییە ووتی ئەوە تەقەیان لە کاروانەکە کرد ئەگەر ئەو تفەنگەم بدەیە دەست لێیان ئەسێنمەوە، منیش ووتم فەرموو ها، ئەویش دوو سێ تەقەی کرد و تفەنگەکەی برد، بە کورتی بەدوایانا سەرکەوتم، تەماشام کرد کەلوپەلیان هەموو بردوە شێخ ڕۆوف و کۆمەڵەکە دانیشتبوون بانگی شێوان بوو نان و خوێ و شت و مەکمان لەگەڵ کاروان ڕۆیشت، لەوێ دا شوانێ بوو ماڵاتی ئەلەوەڕاند، حەیوانێکمان لێ کڕی بێ خوێ و بێ نان برژاندمان و خواردمان، ئەمجا لەم دیو کێوەکەوە بە رووی عێراقەوە

---

(١) ئەگونجێ تەنیا مژدە بێ بۆ خۆشی و شادی ئەو کاتە خۆشە کە بە رێگاوەیە إنشاء الله وە لە چەرخ و زەمانی شا عوسمان گیان دا یەتە دی.

خێڵی جاف بوون ئەوان بوون ئەم کەتنەیان کرد، شێخ رؤوف چوە ناویان و پێ ووتن ئەم هەموو کەل و پەل و ئەسبابە عائیدی حەزرەتی شێخی علاء الدینە بە ئێوە ناخورێ هەروا هاتەوە پرسیم چی بوو؟ ووتی نەیان دامەوە، خەریك بوو خۆیشم بکوژن، شەو تا درەنگێ خەوم لێ نەکەوت، کاتێ خەوم لێ کەوت دیم لە خەوما وام زانی لە جێگەیە دوورەوە وەستاوم و سەر لوتکەی شاخەکەم لێوە دیارە بەردێ زۆر گەورە نزیکی بەقەدەر ژوورێ هۆدەی خانویەکی بچووك ئەبوو، وە ئەم بەردە راستی بوو ئەو جێگە کە جافەکان دەواریان لێ هەڵ دابوو تەماشام کرد شێخی باوکم چاکی کەواکەی کردوە بەلادا وە قۆڵی لێ هەڵ ماڵیوە تەشریفی نزیك بوەوە فەرمووی: رۆڵە ئەمە چییە؟ عەرزم کرد قوربان وەزع ئەوەیە کە ئاوا رووتیان کردووینەوە وە هیچیان نەهێشتووین فەرمووی ئاپروانە بزانە چییان لێ ئەکەم!!!

چاوم لێبوو تەشریفی برد تا گەیشتە لای بەردەکە هەرچەند لە منەوە دوور بوو هەم چاوم لێبو هەم بیستم کە پێی توند کرد لە بەردەکە وە یەك جوولەی پێدا سەرەو خوار بوەوە و فەرمووی ئەئاواتان لێ ئەکەم خەبەرم بوەوە.

ووتم شێخ رؤوف شێخ رؤوف هەستە هەستە، هەستا و ووتی چی‌یە؟ بۆم گێڕایەوە ووتی ئای وام زانی ئەڵێی کەلوپەلەکانیان هێنایەوە بە خەیاڵەوە خەوتوویت ئەمەت دیوە بەڵام من دڵنیا بووم بەو خەوە کاتێ کەوتینە بەیانی خۆر دای لەسەر کێوەکان پەیدا بوون بە ئەسبابەکانەوە ئەیانووت خواماڵی شێخ علاء الدین کاول .....
ئەمشەو کارێکی پێ کردووین، مەگەر هەر خۆی کردبێتی، ووتمان چی بووە؟ ووتی بەردێ لەسەر شاخەوە هاتۆتە خوارەوە بەسەرماندا هەر بە قەدپاڵی چیاکەوە وورد بووە هەر ماڵێ لەو کەلوپەلانەی تێ چووە زیانێکی لێ داوە، یا بە ماڵات و ئاژەڵ کوشتن یا بە قاچ و دەس شکاندن زەرەری زۆرمان لێ کەوتوە، بۆ خاطری خوا وازبێرن ئەمە ئەسبابەکانتان!!!

فەرموی سەر حیسابی کەلوپەلەکان بووین قیمەتی ٦ شەش قران دیار نەبوو، قال رسول الله ﷺ (إنّ لله خلقاً خلقهم لحوائج الناس يفزع الناس إليهم في حوائجهم أولئك الآمنون من عذاب الله) صدق رسول الله (رواه الطّبراني وغيره).

وقال رسول الله ﷺ فيما يرويه عن ربّه ﷻ (إنّي لأثأر لأوليائي كما يثأر اللّيث الحِرب).

لـــــه خـــەلقی خـــودا جـــەمـــاعەتێ هـــەن
گیـــــروگرفتی خـــەڵك چـــاره ئـــــەكەن
ئـــەمـــینن ئـــــەوان لــــه عـــــەزابی حـــەق
چـــونکه لەبـــەر خـــوا ئـــیش ئەکـــەن بـــۆ خـــەڵق

**ك٢٥٤**: دووباره فەرموی:

ئاغای فتح الملك لەگەڵ ئیسماعیل خانی ئەردەلانی لە کاتی شەڕی روسا بە شێوەی کۆچکردن لە سنەوە هاتن بۆ دووڕوە چونکە زیانێکی زۆریان لە روس دابوو، دوای عافوات و لێبوردنیش ئەوان دڵنیا نەبوون دانیشن، فتح الملك بە هۆی ئەوەوە کە خوا لێخۆشبووی باوکی لە خزمەت حەزرەتی شێخی ضیاء الدین قدّس سرّه ئیخلاصی بوو، خۆشی ئەهلی محبەت و خاوەن بڕوا بوو بە ئەولیا، بەڵام ئیسماعیل خان چونکە زووتر فەرمانبەری عوسمانی‌یەکان بوو، وە لەگەڵ ئەهلی ئیخلاص هەڵسان و دانیشتنی نەبوو، بڕوا و عەقیدەی بە خەواریق و کەرامەت کەم بوو، لە پاش ماوەیە زۆر کە مایەوە هەروا لەم و لەو شتی ئەبیست ووردە باوەڕێکی پەیدا کردبوو بە کەرامەت، رۆژێ خوا وای رێکخست لەسەربانی خانەقا کۆڕێکی زۆر پێکهاتبوو لە زانایان و ئاغا و چەن کەسانی تر وەرزی گوڵ و گوڵزار بوو فەرش راخرابوو چایی لێنرا بوو حەزرەتی شێخ (قدّس سرّه) لەگەڵ (فتح الملك)دا باسی زەمانی حەزرەتی شێخی ضیاء الدینی ئەفەرموو باسی باوکی فتح الملك کەچییان

به بەینا چوە وە کەرامات لە میانەیانا ئەگێردرایەوە لە طەرەف حەزرەتی شێخەوە و لە لایەن فتح الملك ەوە، إسماعیل خان[1] گوێی لەو قسانە بوو.

کتوپڕ بالندەیە بەرز بە هەوادا هات إسماعیل خان ئەیزانی ئەو بالندەیە بەسەر دار و جێگەی نزمییەوە نانیشێتەوە زۆرتر بەسەر شاخ و لوتکەی بەرزی کێو بەسەر بەردی هەڵەوە ئەنیشێتەوە، عەرزی شێخی کرد قوربان ئەولیا ئەتوانن ئەو پەلەوەرە بێننە خوارەوە و بەسەر ئەو دارەوە کە بەوبەر چەمەکەوەیە بینیشێننەوە؟ فەرموی ئەگەر خوا مەیلی لێ بێ ئاسانە!! ووتی دەی قوربان با وابێ، ئەنجا ئەو پەلەوەرە سووڕی خوارد و گەڕا و دەورەی دا هاتە خوارەوە بەسەر دارەکەوە نیشتەوە،

(١) إسماعیل خانی ناوبراو وەکو باسکرا لە کاتێکا کە مەئموری عوسمانی روتبەی زابتییەکەی سوڵتانیان پێ ووتوە (لەقەبی سوڵتان بوو) وە خۆشی لە تیرەی ئەردەلانییەکان بوو، راسپێران و چەند دێیەك لە مەریواندا بە موڵکایەتی سەر بەوان بوە، ئەنجا شێخ قدّس سرّه بەر لەوا نوسیبوی بۆ کەیخەسرەو خانی وولەژێر کە خۆم ئاگادارم ئەم موڵکانە حەلالی ئەمانە بەلام ئێوە وەك داگیرتان کرد وە لە ئێستە و لا بۆیان رەد بکەنەوە، ئەگەر رەدی ناکەنەوە ئاوا موهاجیرن موڵکانە بدەنێ، شەخسی ناوبراو لە فەرمایشتی حەزرەتی شێخی نەکرد بوو دیسان بۆی نووسیبوو بە هەمان شێوە، ئەگەر نایاندەنەوە هیچ نەبێ ئەمانە موستەحەقی خزمەتن، بەروبومی ئەمساڵیان بدەنێ، نامەکە ئەدات بە إسماعیل خان بیبات عەرزی ئەکات ئەم کابرا زۆردارە ئەترسم بمکوژێ، ئەفەرموێ بۆ خۆی ئەڵێ وە لە نامەکەدا ئەنوسێ ئەمجارە ئەگەر جوابی بکەی وەك جاری پێشوو بە خۆڕایی بگەڕێتەوە أزل تا ابد فرصتی درویشان است تیرێ ئەنێم بە جگەرتەوە تا قیامەت ئێشی هەر بێ، کاتێ نوسراوەکە ئەداتە دەستی ئەی خوێنێتەوە نامەکە فڕێ ئەدات و ئەڵێ من نە نەقەشیم وە نە سهرەوەردی، ئەم ئەگەڕێتەوە، ئەویش هەر ئەو رۆژە کوڕێکی ئەبێ ناوی محمد أمین بەگ لە مەریواندا بەناوبانگ ئەبێ لە جوانی و خەت خۆشی و سوار چاکی و پێ کەوتوویی لە عەسرا فیشەکێ لە دەس خزمەتچییەکیان دەرئەچێ ئەدا بەسەر سنگی ئەمدا وە ئەیکوژێ، کەیخەسرەو خان خزمەت چییەکە داوا ئەکات ئەڵێ خەتای تۆ نیە ئەزانم ئەمە لە کوێوە بوو بەلام لێرە مەبە لە بەرچاوم مەمێنە.

عەرزی کرد ئەمر بفەرموو با عبدالحمید خان تفەنگێکی پێوە بنێ بەڵام نەی پێکێ، تفەنگێکی پێوە نا بەرەو قەڵاچێ بەو چەمەدا دای لە شەقەی باڵ ئەنجا عەرزی کرد ئەولیا ئەتوانێ ئەو تەیرە بگێڕێتەوە بنیشێتەوە بەسەر دارەکەوە، فەرمووی خوا مەیلی لێ بێ ئاسانە عەرزی کرد قوربان با وابێ، شێخ کەمێ چاوی لە یەك ناو پەلەوەری ناوبراو دیسان گەڕایەوە سووڕی خوارد وە بەسەر هەمان دارەوە نیشتەوە، دیسان بە شێخی عەرز کرد بفەرموو با میرزا عبدالحمید خان تفەنگێکی پێوە بنێ و نەی پێکێ تفەنگێکی پێوە نا ئەنجا بەرەو چەمی ڕەزاو پەڕوازی کرد، دیسان بە جەنابی پیری عالی قەدری عەرز کرد ئەولیا لە تەوانایا هەیە ئەو پەلەوەرە بهێنێتەوە وە بە جێگەی یەکەم جارییەوە بینیشێنێتەوە، فەرموی هەموو شت لە لای خوا ئاسانە، دیسان ووتی دە قوربان با وابێ، جاری سێیەمیش هەر ئەو باڵندەیە بە ئاسماندا بە دەورە و گەڕان هاتەوە چووەوە سەر هەمان دار نیشتەوە ئەنجا فەرمووی قوربان با میرزا عبدالحمید خان تفەنگێکی پێوە بنێ و بەڵام لێی بدا ئەمری کرد بە میرزا هەستا چوە سەر پلەکانەکان فیشەکێکی پێوەنا خستییە خوارەوە چوو هێنای، ئەو پەلەوەرە ئەو باڵندەیە بوو کە بەسەر دارەوە نەئەنیشتەوە، وە جێگەی بەس چیای بەرز و لوتکە بەردی سەر کێوان بوو، کاتەکە بەهار بوو هەورێکی ڕەش هاتە دووڕووە عەرزی کرد قوربان ئەولیا ئەتوانێ ئەم هەورە دوو لەت بکات؟ لەتێکی وا بڕوات و لەتێکی وا؟ فەرمووی لای خوا ئەگەر مەیلی بێ ئاسانە، ووتی قوربان باوا بێ!!! دەسبەجێ هەورەکە دوو کەرت بوو لایەکی بەم لاو لایەکی بەو لادا ڕۆیشت ووتی قوربان ئەشتوانی وەکوو یەکەم جار بیلکێنیتەوە پێکەوە، فەرمووی بەلای خواوە ئاسانە عەرزی کرد با وابێ دووبارە لکایەوە بە یەکەوە.

ئەنجا هەڵسا چوە بەردەمی حەزرەتی شێخ دەستی ماچ کرد و ووتی: أشهد أن لا إله إلاّ الله وأشهدُ أنّ محمداً رسول الله قوربان ئا ئێستە ئیتر نیوە ئوممەتە محمدێکم.

میرزا ئەحمدی مەرحوم گێڕایەوە: ووتی ئەو إسماعیل خانە زۆر قسە خۆش بو جارجار شێخ بێتاقەت ئەبو ئەیفەرمو سوڵتان بانگ بکەن دو قسەی خۆش بکات، ئەهات بە قسەی خۆش شێخی ئەهێنا پێکەنین، رۆژێ عەرزی شێخی کرد وتی قوربان سێ بە سێ تەلاقم کەوتبێ پێغەمبەرایەتی نەبێ هەرچی بفەرمووی بڕوام پێت هەیە وەلێ حەز ئەکەم بزانم وای لە چ روتبەیەکا؟ فەرمووی ئەوەندە کە شارەزام بزانم یەکێ تر لە ئوممەتی محمد هەیە نەفعی لەمن زیاترە خەڵکم ئەنارد بۆ لای.

**ك ٢٥٥**: لە جەنابی خوا لێخۆشبوو ملا محمد أمینی نێم بیست فەرمووی: کاتێ بە شێوەی کاتبی لە خزمەتیا بووم، رۆژێ لە دەور و پشتی شاوەیس و باوەیس وەیا هۆرێن و شێخان ئێستە باشم لە یاد نیە، شێخ فەرمووی ملا محمد ئاو بکە بە دەستما بۆ دەسنوێژ لەو کاتەیا ئاوم ئەکرد بە دەسیا لەم لای دەوار و رەشماڵێکا کە هەڵدرا بوو شەخسێ هاتە خزمەتی و عەرزی کرد بۆ مەسەلەی ژن هێنان یا کچ بە شوودان وەلامی دایەوە و رۆیشت، ئەنجا لەبەر خۆیەوە فەرموی سبحان الله هەرکەس پرسیارم لێ بکا لە بارەی ژن هێنانەوە تا ئەمرن ئەزانم ئەو ژن و مێردە چییان بەسەر دێ بەلاّم بۆ خۆم هیچ نازانم لە پاشا فەرمووی عەزەم عەزەم وەرە وەرە، بۆ بەیانی صۆفی عەزەم[1] پەیدا بوو بە جەزبەوە، لە پاش ماوەیە لێم پرسی ووتم صۆفی عەزەم

(١) صۆفی عەزەم: زاتێکی پڕ فەڕ و پیرۆز و لە نەمامە دەست نێژەکانی خانەدانی بیارەی شریفە لە پێشا موریدی حەزرەتی محمد بهاء الدین بوە (قدّس الله سرّه العزیز) پاش وەفاتی ئەم زاتە پڕ فەڕ و بەرەکاتە بوە بە موریدی حەزرەتی شێخی ضیاء الدین مولانا عمر قدّس الله سرّه لە پاش وەفاتی ئەم زاتە پڕ کەمالاتە بوە بە موریدی حەزرەتی شێخی نجم الدین قدّس الله سرّه لە دوای ئەم زاتە عالی جەنابە بوە بە مریدی حەزرەتی شێخی علاء الدین قدّس الله أسرارهم ئەم صۆفییە پاك نیهادەی صفا شیعارەی وەفا دیارە زۆربەی کات مجزوب بوە خەڵکی گەرمیان و لە دانیشتوانی دێی تاقمی وەڵەد بەگی بوە قسەی کەشفی و باسی راستی و ووتنی بەسەرهاتی زۆر

چۆن هاتی بۆ ئێره ووتی برا که دوێنێ بۆ بیاره ئەچووم لە بەینی بیاره و هەڵەبجەدا بووم گوێم لێ بوو شێخ بانگی کردم فەرمووی عەزەم عەزەم وەره بۆ ئێره منیش ئیتر گەڕامەوه هاتم ئێسته گەیشتمه ئێره.

ك ٢٥٦: جەنابی کاکه شێخ مەولانا فەرمووی: شەخسێ لە بەگزادەی دەوری هەڵەبجه گێڕایەوه: کاتێ حەزرەتی شێخ قدّس سرّه لە دووڕووه بوو لە دوای داوای داوایەك که بۆ خۆی جێبەجێ بفەرموێ کە لە خزمەتیا کردبوم بۆی نوسیبوم: بە توصیه لەوه که خۆم له تعرّض به ناموس بپارێزم وا رێکەوت لە دێیەکەی خۆماندا ژنیان هێنا بۆ پیاوێ، وه من بووکەکەم زۆر لا جوان بوو له پاش ماوەیه لە ژێرەوه قەناعەتم پێکرد که بچم بۆ لای، کاتێ که چووم وام زانی حەزرەتی شێخ علاء الدین لەوێ حازره گەڕامەوه، جارێ تر هەر عەینی شەو چوومەوه دیسان هەر جەنابی ئەو زاته مقدّسەم دی گەڕامەوه، سێ بارەم کردەوه ئەنجا به شیدەت بۆ گەڕانەوەم حازر بوو، ناچار تەرکم کرد نامەیەکی لە دووڕووەوه بۆ نوسیبووم بەم جۆره جارێ دووجار سێ جار.

ك ٢٥٧: وه هەروەها جارێ جەنابی کاکه شێخ مەولانا فەرموی: پیاوێ لەوانەی دەس ڕۆیشتوو لە یاسادا شارەزان به میوانی هاتبوه دووڕوه، لە پاش چەن وەختێ ئافرەتێ لەناو دێ دەبینێ شەو ئەچێ فەوری خۆی پێبگەیەنێ لەسەریەك دووجار ئەچێ حەزرەتی پیر علاء الدین ئەیگەڕێنێتە دواوه، سەری سێیەم جار که ئەچێ مارێ ئەبینن شێخ ئەفەرموێ بەو ماره بڕۆ قەپ بکه بەو دارەدا، ئەچێ قەپ بە دارەکەدا ئەکات، ئەمجا ئەفەرموێ به شەخسەکه بڵێم بێ قەپت پیا کات؟ دەسبەجێ مار ئەبینێ و فیرار

---

سەیر و گرنگی بەناوبانگ بوه لە ڕاستی خۆی کەلیمەی بۆ نەخراوەته ناو پەردەی ریعایەتی ئەدەب و هەموو معنایەکی به لفظيخۆی ئەداکردووه.

ئەكات، بۆ بەيانی بە خزمەت حەزرەتی شێخ ئەگات، شێخ ئەفەرموێ لە مار نەترسای؟؟؟

**ك ٢٥٨:** لە زۆر كەس كە یەكێكیان حەزرەتی شێخ خۆی بوو گێڕایەوە وە دووەم شێخ مەولانا فەرمووی وە زۆری تر ئەمە ئەزانن كە:

شەخسێ ئەچێتە خزمەت حەزرەتی شێخ قدّس سرّە ئەڵێ ناسازم و سەییدم شێخ ئەفەرموێ رۆڵە تۆ سەیید نیت ئەڵێ قوربان سیّدم، ئەفەرموێ تۆ سیّد نیت تۆ گولیت و سید گول نابێ، عەرزی ئەكات، قوربان راست ئەفەرموی عیلاجم بفەرموو، ئەفەرموێ ئارام بگرە بزانم تا خوا ئیرادەی بە چییە فەرموی مشغول بووم، بە مەبەستی چارەسەری ئەو پیاوە وام ئیلهام كرا كە ئەبێ ماری هێلكەی چۆلەكە بخوات وە هێلكەكە بڕشێنێتەوە، ئەوە بەكاربهێنێ بە رێگەی خواردن چاك ئەبێ، لە پاش ئەوە زۆری پێنەچوو لە ماڵی خۆمان لەبەر هەیوان چەند ساجێ لەسەر ئاگر بوون بۆ نانكردن، وە سوور بوو بوونەوە كتوپڕ قیژە قیژ و هاوار پەیدا بوو ووتم چییە؟ ووتیان ئەوە مارە سەری شۆڕ كردۆتەوە، ئەنجا رشایەوە، رشانەوەكەی هێلكەی چۆلەكە بوو، ووتم لێی گەڕێن ئیشم پێی هەیە، وە هەمان هێلكە رژابوە سەرساجێ لە ساجەكان و پاش نەختێ پرژان كردمە سەرشتێ بە یەكێكا ناردم بۆ ئەو پیاوە ناساخە خواردی و دوو سێ تویكڵی لە پێستی فڕێ دا رزگار بوو والحمد لله.

قال رسول الله ﷺ (فرّ من الجذام فرارَكَ من الأسَدْ).

فەرموویە شاهی خاوەن فەڕ و خێر          فیراركە لە گول وەك فیرار لە شێر

**ك ٢٥٩:** لە چەند كەسی جێی بڕوا و راستگۆم بیست: كە یەكێ لەوانە شێخ عز الدین سەعاتچییە لە پێنجوێن ووتی لەگەڵ فقێ محمودی بیستان چووم بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ علاء الدین، فەقێ محمود لەش و لاری خورانی هەبوو وە لەوە پێش تریش بووی وە عەرزی حەزرەتی شێخی كردبوو، حەزرەتی شێخ دەرمان و پارێزی

بۆ دانابوو بۆ ئەوەی بەکاریان بێنێ لە سەفەری دواییدا عـەرزی کـرد قوربـان ئەمـەوێ شێخ بە هیممت چاکم بکات نەك بە دەرمان و پارێز ئـەویش فـەرمووی ئـەڵێن: ئـاخر هیممەت هەموو کات دەست نادات، ئەویش وەخت وەختە لە پاشا فەرمووی سـاڵێ بۆ یەکێ کە دووچاری دەردی جذام –گولی بوو دڵم گەرم بو و حاڵی کرام کە مـار ئەبێ هێلکە چۆلەکە بخوات و بڕشێتەوە و ببرژێ ئەو شەخسە بیخوات چاك ئەبێ.

ئەمجار هەمان بەسەرهاتی پێشەوەی بـە ئاکـام گـەیان یـانی هـەر ئـەم نەخۆشـە ئـەو ناساخە بوو کە خۆی گۆریبوو بە سەیید.

**ك ٢٦٠:** لە جەنابی بەڕێز مامۆستا مەلا محمد أمینی مەشـهور بـە (صـۆفی)م بیسـت لـە پێنجوێن فەرمووی: فەقێ بـووم لـە بیـارەی شـەریف ئـەم خوێنـد، شـێخ محمـد سعید ناوێکی خەڵکی وولاتی گێلان و رەشت کوڕە شێخ بوو، پاش وەفاتی باوکی هـاتبوو ماوەیـە لـە خزمـەت حـەزرەتی عـلاء الـدین (قـدّس الله سـرّه العزیـز) سـلوك بکـات و بچێتەوە کەڵکی بۆ موریدەکانی باوکی بێ، وە ئـەم شـێخە نـاوبراوە لـە حوجرەیـەکی تایبەتی خۆی دابوو رێزی لێ ئەگیرا هەندێ شەو حەزرەتی پیر قدّس سرّه لە درەنگێکا تەشریفی ئەهێنا بۆ حوجرەکەی، شەوێ لە حوجرەی مدرس خـەریکی دەورکردنـەوە بووم دیم چرایە هـات زانیم وا شـێخ تەشـریفی هـات، یـەکێ فـانوسی لـە پێشـەوە بـۆ هەڵگرتبو کە گەیشتە حەوشی خانەقا بە وێڵ و ئەدەب هەڵسام چاوەڕوانی لوطفی ئـەو بووم رووبەڕووی وەستام تا تەشریفی هاتە سەر، ئەمجا رووم کردە قاپیەکـە کـە ئـەو زاتە پڕ نووره بە بەردەمی ئەو قاپییـەدا تێئەپـەڕی کـاتێ گـەیشت لای کـردەوە بێ ئـەوە تەشریفی بوەستێ ئیلقای فەیزێکی فـەرموو دەسـبەجێ بێ ناڕەحـەتی وەك فەنـەر کەوتمـە سەر ئەرز ئیتر تا ماوەیە بێ هەسـت کـەوتم بـەلاّم ئەمانـە رووی لێـدام هـەرچی لـەزەتێ چاو لە شتی ئەنواعی جوانی بیبا وە هەرچی شێوەی جوانی هەیـە چـووە چـاوم هـەرچی ئاوازی خۆش هەیە بە تێکڕایی هـەموو چـووە گـوێم هـەرچی بـۆنی عطر و گـولاّو و

میسك و جۆر به جۆری بۆنی خۆش هەیە چوە هێزی بۆن كردنەوە یانی لەدەماخما بۆنی ئەدایەوە، وە هەرچی هێزی چەشتن هەیە یانی ذاییقە لە گەرووماں هەست بە چەشنەها ئەنواعی خۆراك و خواردەمەنی هەیە ئەكات، وە بە هەموو چەشنەكانی خۆشی و لە زایقەم دا روویدا وە هەروەها لامیسەشم بە تەواوی مەلموساتی نەرم و نیان لەزەت لیٚ براو بەهرەمەند بووم، بە كورتی هەر پێنج هەستیارەكەم بە گشت نۆشین و چەشتن و بینین و بیستن و بۆنی خۆش كردنیٚ داگیر كرا تا ماوەیە زۆر لەم حاڵەتەدا مامەوە ئەم هەموو خەلاتە لە لا كردنەوەیەك بوو بە دەم رۆیشتنەوە[1]، قال تعالی:

[إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ (٥٤) فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ (٥٥)](سورة القمر).

ئەی باخەوانی باخی تەمەننا     كلیل بەدەستی گەنجینەی مەعنا
قاپی بكەوە گەنج بێنە مەیان     بێنەدی هیوای بە قیمەتی گیان
دەروون پڕ لە نوور دڵشادمان بكە     لەم شەوی خەما ئازادمان بكە

**ك ٢٦١:** جەنابی حاجی مامۆستا مەلا محمد ئەمینی كانیسانانی فەرمووی: كاكەم بۆی گێرامەوە، ووتی حەزرەتی شێخ علاء الدین قدّس سرّه تەشریفی موبارەكی بە لای چۆر[2] و نەنەدا ئەڕوا ئەگاتە ........ فەرمووی لەویٚ ئافرەتێكی بەڕێزی پڕ لە

(١) فمن كان بهذه المنزلة العليا لا تخرج من يده شيء إلاّ ماشاء الله.

(٢) كاكەی مامۆستا محمد أمین ملا محي الدینە مەلای دێی شێخە كوێرە كە ناوی دێیە لە مەریوان نزیكی دێی چۆڕو نەنە، بەندە بە خزمەت مامۆستای ناوبراو گەیشتوم خوا لێی خۆشبیٚ پیاوێكی زۆر چاك و خواناس سروشتێكی پڕ لە سەخاوەت و لەش سووك بوو بە دەستی خۆی كاسبی ئەكرد جاریٚ بە بۆنەیەكەوە چیرۆكێكی گێرایەوە ووتی: لە بەردەمی ماڵی خۆمانا بێستانێكم بوو خەیار و ترۆزی و تەماتە و باینجان و ئەم جۆرە سەوزانەم تیایدا بەرهەم ئەهێنا لە نزیكمانەوە

ویقار خۆداپۆشیو جلەوی وولاخەکەی گرتم زانیم ئەم زاتە پیرۆزە لە ریزی چاکانە، دابەزیم پێی فەرمووم: من نەنکی مەلا أبو بکرم وە ئەم دێیە کە ناوی نەنەیە بە ناوی منەوەیە ئێمە لەم جێیەدا بە خاك سپێردراوین و ئێوەش پیاوێکی خاوەن ئەهلییەتی بڕوا پێکراوی خەڵکین، موسڵمانان بە گوێت ئەکەن بە دانیشتوانی ئەم دێیە بڵێ ئاژەڵ و مالاّت بەسەر سەیوانەکانماندا نەهێنن ئەگینا تووشی ئازاریان ئەکەین.

**ك ٢٦٢:** .......... فەرمووی کۆمەڵێ لە ئەشرافەکانی سەقز هاتبون بۆ بیارەی شەریف کوێرێکیان لەگەڵ بو ناوی مەلا حەسەن حافز بوو لە پاش ئەوە دەستی

---

ئافرەتێ بوو زۆر بێ چاوەڕو و بێ شەرم و حەیا بوو جوێن فرۆش بوو رێزی لە کەس نەئەگرت، مریشکێکی بوو تازە جووجەڵەی هەڵ هێنابوو چەند جارێ ئەهاتنە ناو ئەو بێستانە شەتڵ و بێستانەکانیان تێك ئەدا، منیش دەرم ئەکرد، جارێ وا رێکەوت لە دوورەوە بەردێکم هاوێشت بۆ ئەوەی مریشکەکە دەرچێ بە تقدیر بەردەکە دای لەسەر و ملی مریشکەکە و کەوت کە چووم نزیکی هەرچەند جوولاّندم و رام وەشاند و دەستم گرت بەچاویەوە هیچسوودی نەبوو ئیتر دڵنیا بووم کە تازە مردوە، هەردوو قاچیم گرت هەتا هێزم بوو تورم دا، ئەمجار چووم دەست نوێژم گرت لە مزگەوت و دوو رکات نوێژم کرد، بەلاّم هەر خوا ئەزانێ چەندە خەمو خەفەت دای گرتم یەکەم لە ترسی خوا و بەزەیی هاتنەوە بە جووجەڵەکان دووەم ترسی ئەو ژنە کە زۆر شەڕ فرۆش بوو، ئەمجا زۆر زۆر دوای نوێژەکە بە زاری یەوە پاڕامەوە، لە بارەگای خوا هەتا ماندوبووم دوایی بەسەد داخ و دەرد و پەژارە و خەمەوە چوومەوە بۆ بێستانەکە بۆ سەیری جووجەڵەکان، کە چووم دایکەکەیان قرتە قرت هاتبوە ناویان و چینەی بۆ ئەکردن دووبارە هەر خوا ئەزانێ چەند دڵخۆش و شادمان و کامیاب بووم و خۆشیم پێ گەیشت.

چۆڕ و نەنە دوو دێیە ماوەی میانەی هەردوو لایان زۆر کەمە، لە پەڕاوێزی کتێبە ئیسلامییەکان دا لە فیقە و نافیقها کە نوسراوە (چۆڕی) مەبەس حاجی سید حسینی چۆڕییە یانی ئەم مەسئەلەیە یەکێکە لە پرسیارەکانی ئەو یان حەلێکە لە شیکارەکانی لە نحوا فیضی عیلمی لە لایەن ئەوەوە، وەك نۆدشی مەبەس لە مەرحومی حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشەیە.

(حەزرەتی شێخی علاء الدین)یان زیارەت کرد شێخ فەرموی: بزانە ئەو مەلا ئەزانێ نەختێ قورئان بخوێنێ منیش ووتم شێخ ئەفەرموێ عەشەرەیە لە قورئانمان بۆ بخوێنە ئەویش لە کۆتایی سورەتی البقره دەستی پێ کرد آمن الرّسول بما أنزل إليه من ربّه چەن خەتێ رۆیشت لەبەر ئەوەی گریان زۆری لێ سەند بۆی نەخوێنرا، بە پەلە کوتی هاتە بەردەمی حەزرەتی شێخ و بەردەمی ماچ کرد بە زارییەوە، ووتی قوربان تو خوا قبولْ کراومەتەوە؟ بە موسڵمانی وەرگیراومەتەوە؟ فەرمووی باسی ئەم چییە چۆنە؟ خەریك بوون سەقزییەکان بیگێڕنەوە، من وتم لێی گەڕێن با خۆی بەیانی بکات، وتی لەو گەڕەکەی منی تیا بووم ماڵە گاورێکی تیا بوو چەن جارێ ئەیان بردمە ماڵەوە کچێکیان بوو ووردە وردە پەردەی خۆشەویستی لەگەڵدا بەستم دوایی پێیان ووتم ئەگەر ببیت بە گاور ئێمە ئەو کچەت ئەدەینێ وە هەموو خزمەتتان لەسەر خۆم منیش لە رووی هەوای نەفسەوە ئاواتیانم بەجێ هێنا ماوەی پێنج مانگ و ١٧ حەڤدە رۆژ لەسەر بڕوای کفر بووم هێشتا کچەکەیان نەدابوە دەستم وە لەو کاتەدا من حالْم وابوو زۆر العیاذ بالله بوغزی ئیسلام چوبوە دڵمەوە، هەتا گوێم لە بانگ ئەبوو بۆ ئەوەی گوێم لێ نەبێ پەنجەم ئەکرد بە گوێما ئەو شەوە بڕیار وابوو کچەکەم بدەنە دەست ووتیان خۆت حازر بکە ئەم شەو کچەکەت بۆ دێنین بۆ ژوورەکەت کاروباری پێویستی زاوا و بوکیان بۆ ئامادەکردین، لەسەر چارپایەك راکشابووم خەوم لێ کەوت لە خەوما وام زانی رۆژی دواییە وە منیش سەرگەردان ئەڕۆم بێ ئەوەی بزانم روو بۆ کوێ بکەم پرسیارم کرد لە خەڵك ئەڵێن حەشرە ووتیان ئەی حەشرە ووتی رێگەی گاورانیش هەیە ووتیان هەموو میللەتێ ئەبێ بچێتە بەردەمی دادگا و پرسیاری لێ بکرێ هەروا ماوەیە رۆیشتم لەناکاو یەك ئەژدەهای گەورەم لێ پەیدا بوو، بە پێچێ دەورەی دام وە بە قەد کۆڵەکەیەك ئاگر لەدەمی دەرچوو، هاوارم کرد بە هەموو هێز هاوار رزگارم بکەن کتوپڕ یەکێ ووتی بڵێ أشهدُ أن لا إله إلاّ الله وأشهدُ أنّ محمداً رسول الله تا رزگارت بکەم ووتم ئەی هاوار تۆ کێی

رزگارم بکە ووتی ئەڵێم بلـیٚ أشهدُ أن لا إلـه إلاّ الله وأشـهدُ أنّ محمـداً رسـول الله تـا رزگارت بکەم ووتم کێی تۆ هاوار رزگارم بکە ووتی أحمق من عـلاء الـدینی عوسمـانم بلـیٚ دوای ئـەوەی دەسـتی دایـە بـاڵم و رای وەشـاندم. ووتم أشـهدُ أن لا إلـه إلاّ الله وأشـهدُ أنّ محمـداً رسـول الله و خەبـەرم بـوەوە و بـە ئاگـا هـاتم لەسـەر چـارپاکە کەوتبوومـە خـوارەوە ئیتـر رام کـرد نەوەسـتام تـا گەیشتمـە مزگـەوت هـاوارم کـرد موسڵمان بیکەن بە خاتری خوا فێری شێوازی ئیسلامیم بکەنەوە با موسڵمان ببمـەوە پرسیان چییە بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕانەوە، ئـەوانیش فێریـان کردمـەوە، ئـەوا هاتومـە زیارەتـت قوربـان توخـوا قبـوڵ بوومەتـەوە؟ فـەرمووی چـونکە گەیشتویتـەوە دەس خاوەنی خۆت وەرگیراویتەوە.

بەلاّم نوێژی ئەم پێنج مانگ و حەڤدە رۆژە لەگەڵ رۆژوی مـانگی رەمەزانەکـەتا بگێـڕەرەوە وەرگیراویتـەوە، لـە پـاش ئـەوە حـەزرەتی شـێخ فـەرموی لەبـەر خـاتری قورئانەکەی ئەمەی بۆ کراوە.

**ك ٢٦٣:** جـەنابی شـێخ مـەولانا خالیـد فـەرموی شـێخی بـاوکم لـە شـاوەیس و باوەیس ئەبیٚ رۆژیٚ عەباس بەگی کوڕی یار ئەحمەد بەگ بـە تفەنگێکـەوە ئەچـێت بـە شێوەیەکی دوور لە وێڵ و ئەدەب لە نزیـك حـەزرەتی شـێخ دا دائـەنیشیٚ تفەنگەکـەی لەسەر کۆشی دائەنیٚ و رووی لوولەکەی ئەکاتە حـەزرەتی شـێخ و ئـەڵیٚ: یـا شـێخ بـۆ واز لە کێڵگە و زەوییەکانی ئەحماوا ناهێنن؟ حەزرەتی شێخ لـە وەلامیـا ئەفـەرمویٚ کـە زەوی زەوی ئەحـمـەد ئـاوا بیٚ تـۆ حـەقت چیـیـە بەسـەرەوە؟ ئـەڵیٚ نـازانی لولـەی ئـەم تفەنگە خوێنی لیٚ ئەتکیٚ؟ حەزرەتی شێخیش ئەفەرمویٚ ئەی تۆش نازانی دڵی ئـەهلی خوا خوێنی لـیٚ ئـەتکیٚ؟ لـە پـاش ئـەم گفتوگۆیـە کـابرا هـەڵ ئـەسیٚ ئەڕواتـەوە کـاتیٚ ئەگاتە ماڵەوە ئەڵیٚ: تەشتێکم بۆ بێنن؟ تەشـتەکەی ئەگەیـەننیٚ ئـەڵیٚ ئـای شـێخ عـلاء الدین کوشتمی!!! وە ئیتر ئەڕشـێتەوە تەشـتەکە پڕ ئـەکات لـە خوێن و ئـەمریٚ ففـي الحديث الرّباني (من عادى لي وليّاً فقد آذنته بالحرب).

ئـــەی نەفسی لە خۆبایی بە بـای بیٚ خـەمی مـەغرور
نەت بیستوە بای قەهری خوا صەرصەری مەشهور
هـــەردەم بـــە ئەدەب دەمبدە ئاگات لە دەمـت بیٚ
با نەبیە مەلی مل بە پەت و بەرگی بە خویٚن سوور

**ك ٢٦٤:** جەنابی شیٚخ عمر[1] خەڵکی دیٚر زوور[2]. کوڕی حاجی أحمد عـەرەب کە ئەمە ماوەیەکە ماڵی لە بەغایە بـۆی گیٚڕامـەوە فـەرمووی: والله خـۆم لـە حـەزرەتی شیٚخ علاء الدین م بیست فەرمووی: شەویٚ شیٚخی باوکم قدّس الله سرّه فەرمووی: علاء الدین بەر لەوە نویٚژی بـەیانی بکـەیت دوو شـت هەیە ئـەبیٚ جیٚبـەجیٚیان بکـەیت یەکەم: سلطان عبدالحمید خان[3] موستەحەقی ویلایەتی صغری ـیە ئـەبیٚ بچـی تـوجّهی لـیٚ بکـەیت بـە پایـەی ئـەو ویلایەتـەی بگەیـەنی، دووەم پیـاویٚ لـە شـاری موصـلٚ خـەڵکیٚکی زۆری بـە نالـەباری وەرگیٚـڕاوە بـڕۆ لـەویٚ ئـەویش بفەوتیٚنـە دوای نـەمانی خەڵك بۆیان دەرئەکەویٚ چی‌یە؟

فەرموی: بە پیٚی فـەرموودەی بـاوکم هـەر دوو ئیشەکـەم تـەواو کـرد، جـا کـاتیٚ گەیشتمە موصلٚ ئەو کابرایە لە قاتی سیٚیەمی ئەو تـەلار و کۆشـکە کـە لیٚـی دائـەنیشت هەستا بیٚتە خوارەوە پیٚم نایە بەر پیٚی سەرە و خوار بوو وە لەزەوی درا و مـرد بـەیانی لە کاتی شـتنیدا بۆیـان دەرکـەوت کـە خەتەنـە نـەکراوە، بۆیـان روون بـوەوە کـە ئەمـە گاورە.

---

(١) شیٚخ عمر زڕ خـاڵی حەزرەتی شـاهی عوسمـان گیانـە، وە خـاڵی حـەقیقی کاکـە شـیٚخ أمین و کاکە شیٚخ ئابتە.

(٢) دیٚرزور: قەزایەکە لە سوریا.

(٣) سلطان عبدالحمید خان: پادشای رۆم بوە، وە یەکیٚ بوە لە سوڵتانەکانی عوسمانی...

والأوليا ذوو كراماتٍ رتب          وما آنتهوآ لولد من غير أب

**ك ٢٦٥:** جەنابی مەلا جەلال کوڕی مەرحومی شیخ الإسلامی بانە گێڕایەوە ووتی باوکم بۆی گێراینەوە وتی کاتێ لە بیارە بوم وە ماوەیە بو تووشی خەتەرە و وەسوەسە بو بوم، وە هەرچەندم دەکرد رزگارم نەدەبوو، عەرزی شێخم کردبو، زیکری لا حول ولا قوة إلاّ بالله م ئەخوێند: ئەنجا هەموو رۆژێ لە ژوورەکەی خۆم ئەچومە دەرێ، وە ئەچوم بۆ مەنزلی حەزرەتی شێخ پرسیاری ئەفەرموو وەضعت چۆنە؟ عەرزم ئەکرد قوربان هەروەکو خۆم وام، هەتا رۆژێ وتیان ئەوە ئەفراسیاو بەگە هات، منیش لە ژوورەکەی خۆم بوم لە پەنجەرەوە سەرم دەرهێنا کە بزانم ئەفراسیاوبەگ پیاوێ چۆنە، دیم شتێ وەك پەپولە لە دەمم دەرچوو رۆیشت نیشت بە ئەفراسیاو بەگەوە، وە ئیتر من لەو نارەحەتیە رزگار بوم.

لە پاش ماوەیە بە عادەتی جاران چوم بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ وەك لەوە پێش پرسیاری نەکرد وەضعت چۆنە؟ بەلاّم فەرموی ئێمە تاقەتی ئەو جۆرە شتانەمان نیە ئەوان خۆیان ئەوانەیان هەر هەیە، بۆ ئەوان باشە.

ظولمەت وا بە لای ظالمانەوە          نوریش وا بە لای عالمانەوە
ئەو عالمانەی عارف بە (حق)ن          خادمی شەرع و دڵسۆزی خەڵقن

عن أبي موسى الأشعري ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ ألا أدلّك على كنز من كنوز الجنة فقلت بلى يا رسول الله قال: لا حول ولا قوة إلاّ بالله) متفق عليه.

**ك ٢٦٦:** مرحومی علامەی زەمان مفضال ماهر أستاذ الكل مامۆستا مەلا باقر رحمه الله الملك القادر، فەرموی: جارێ لەو جارانە کە ئەچوم بۆ زیارەتی بیارەی شریفه تصادفی بە شەوی نیوەی شعبان کرد کە بە کوردی ئەڵێن شەوی بەرات، وە

له شەوەکەیدا ٣ جار سورەتی یس و دوعای تایبەتی خۆی تێدا دەخوێندرێ: ئەنجا بۆ بەیانی ئەو شەوە عرضی حەزرەتی شێخ علاء الدین م کرد ووتم قوربان ئەمشەو چیت بۆ کردین؟ فەرموی ئیمشەو لە وەختی خوێندنی دوعاکاندا لە دەمی تەلەفوز بە کەلیمەی (نا) کەشکۆڵێ حازر بو هەرچی هەیە لە ئەرواحی مەرید و مەنسوب ئەتباعی خۆم و موریدی ئەولادم کە لەمەولا پەیدا ئەبن کردمنە ناو کەشکوڵەکەوە وە ٧ جار طەوافی بیت المعمورم[1] پێوە کرد.

روی عن عائیشة رضي الله تعالى عنها عن رسول الله ﷺ إنّه قال أتاني جبريل عليه السلام فقال هذه ليلة النصف من شعبان ولله فيها عتقاء من النار بعدد شعور غنم كلب لا ينظر الله فيها إلى مشرك, ولا إلى مشاحن, ولا إلى قاطع رحم, ولا إلى مسبلٍ ولا إلى عاقٍ لوالديه, ولا إلى مُدّمن خمرٍ, رواه البيهقي.

ئەتەوێ هەرگیز: نەکەویتە دوا      چاك بگرە چاکی ئەولیای خودا

**ك ٢٦٧:** جەنابی حاجی مەلا عارفی ولەژێر، یادی هەموو کات بەخێر، لە موناسبەیەکدا گێرایەوە، فەرموی لە بیارەی شەریفە بووم، رۆژێ لەگەڵ کۆمەڵێکا لە ماڵی حەزرەتی شێخ عوسمان دانیشتبوین کوڕێکی حمە أمین بەگ بە پەلە کە چاوی پێویست بە موعالەجە بو داوای لە حەزرەتی شێخ عوسمان کرد کە لە خزمەت شێخی باوکی طەڵەبی دەرمانی چاوی بۆ بکات، شێخیش فەرموی ئەی خۆت عەرزت نەکردووە؟ وتی بەڵێ عەرزم کردوە، فەرموی چی فەرموو؟ ووتی چەن دەرمانێکی پێ فەرمووم کە لەگەڵ هێلکە تێکەڵی بکەم و بە پێی دەستورێ کە حاڵی کردوم بەکاری بهێنم، شێخیش فەرموی: دەی کەوای فەرموە باشە منیش عەرزی بکەم هەروا ئەفەرموی: کابرا بەوە قەناعەتی نەکرد هەر ئەیویست کە شێخ عەرزی بکات. شێخ

---

(١) بيت المعمور: لە ئاسمانی حەوتەمدا لە محاذی مقابلی كعبة الله دايە.

فەرموی باشە عەرزی ئەکەم، پاش ماوەیە دانیشتن هەمووماں لە خزمەت حەزرەتی شێخ عوسماندا چوین بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ علاء الد ین قدّس الله سرّہ ئەنجا لە پاش زیارەت و هەریەك لە جێی خۆماندا قەرارمان گرت حەزرەتی شێخ عوسمان داوای دەرمانی بۆ شەخسی ناوبراو کرد شێخ فەرموی خۆ دەرمانم پێوتوە و دەستورم نیشان داوە عەرزی کرد قوربان ئەزانم وە منیش پێم وتوە، بەڵام هەر حەزی ئەکرد کە عەرزت بکەم، ئیتر حەزرەتی علاء الدین قدس الله روحە تێگەیشت کە ئەم شەخصە وا ئەزانێ بێجگە لەوە پێی وتراوە شێخ خۆی دەرمانی باشتری هەیە و نایداتێ، فەرموی گوێ بگرن با حیکایەتێکتان بۆ بگێرمەوە.

فەرموی رۆژێ خەبەریان دامێ کەوا حاجی حمە أمین بەگی[1] بەیەڵەیان بە سواری هێستریێ هێنا لەبەر ئێشی چاوی وەقرەی نیە منیش مراجعەی دڵیم کرد عقیدەی دڵی هەر ئەوەندە بو کە ئەمە جێگەیەکە موعالەجەی نەخۆش و چاو بەشەداری تێدا ئەکرێت.

منیش ئەوەندە کە لە تەوانام دابوو تەداوی چاویم بۆ کرد و رۆیشتەوە ساڵی دوەم لە عەینی کاتدا بەسەر سواری هێسترێکەوە هاتەوە بە هەمان ئێش و ژانەوە دیسان موراجەعەم بە دڵی کردەوە هەر لەسەر ئەو بیروباوەڕی پێشویە بوو ئەنجا کوڕێکمان بوو جمالی ناوبوو تازە پێی گرت بوو خۆشمان دەویست تەمانام کرد لە خودا کە چاوی ئەو کوڕە بکەوێتە بری چاوی حاجی حمە أمین بەگ، حاجی حمە أمین بەگ رزگار بو، وە ئەو کوڕە چاوی تووش بوو وە بەو دەردەوە مرد.

لە پاشا فەرموی رۆڵە ئێمە بە ماڵ و بە ئەولادیش لە خزمەت بە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ درێغیمان نیە، ئێستە تۆ وا ئەزانی دەرمان مان هەیە و لێت درێغ ئەکەین برۆ ئەو دەرمانانە کە پێم و تویت بە کاریان بهێنە إنشاء الله چاك ئەبێت.

قال رسول الله ﷺ : (من قضى حاجةً لأخيه فكأنّما خدَمَ الله عمْرُه).

---

(١) حمە أمین بگی بەیەڵە باوکی شەخصی ناوبراوە کە داوای دەرمانی چاوی کردوە.

أخرجه البخاري والطبراني والخرائطي.

عـلاء الـدين لـــه ألطـافى خـوداوه ... عـهباى عـيزهت بـه بالآيـا بـڕاوه
لـه پايـهى بـهرزى هيممهتـدا مقيمـه ... كـريم إبـــنُ الكـريم ابـــنُ الكريمـه
قدّس الله سرّه العزيز

**ك ٢٦٨:** حاجى عبدالله بهگ كوڕى نصر الله بهگى سيا گوێز[1] گێڕايهوه ووتى: لـه سـاڵى ١٩٤٩دا بـاوكم و دوو كـوڕ و كوڕهزايـهك و ئامۆزايـهكى لـه يـهك شـهودا كوژران، وه من ئيتر لهو جێگه نهمام وه كۆچم كرد هاتمه دێى مـهلاداوده كـه عائيـدى ناحيهى سهرچناره ئهنجا له ساڵى ١٩٥٠ دا چوم بۆ بياره بـۆ زيـارهتى حـهزرهتى شـێخ علاء الدين قدّس سره چونكه باوكم موريد و موخلصێكى راستهقينهى ئهو بـوو. لـه پـاش ئـهنجامى زيـارهت و إظهـارى لطفـى خـۆى و بـهيانى داخ و تهئهسـوفى بـۆ ئـهو كارهساته عهرزم كرد. قوربان باوكم ئهگهر دهستى به كهسێ بگرتايه خاوهنى تفهنگ و دهمانچه بوايه يارمـهتيان ئـهدا، وه ئـاوا بـه خـۆڕايى نهئـهڕۆى، ئـا بـهم مـهعنا هەنـدێ شهكواى حاڵى خۆم له خزمـهتيا دهربڕى. شـێخ بـهم قسـهيه دهركـهوت پێـى نـاخۆش بوو، وه له شێوهيدا دهركهوت كه عاجز بوو.

دواى فهرموى باوكت چ شهوێ كوژرا؟ عـهرزم كـرد نـازانم فـهرموى شـهوى ٤ شهممه، له چلهى هاوين، وه ئهوهندهى مانگ بو لهگهڵ دايكتـا ئـهو شـهوه رابگـرن، ئهگهر ئهم ساڵ لهو شهوهدا كه باوكت كوژرا خوا كردى و ئێمه شـێخ بـوين حـهقتان ئهسـهنرێ ئهگـهر خـوا نـهيكرد و ئێمـهش شـێخ نـهبوين ئهچـين شـوانى ئهكـهين كـاتێ گهڕامهوه، ئهم قسانهم بۆ دايكم گێڕايهوه، ئهو وهخته من چوم پايز بـوو. لـه وهرزى هاوين له شهوى ديارى كراو من بـه دايكمـم ووت ئـهم شـهوه ئهوهنـدهى مانگـه ئـهو شهوهيه كه شێخ فهرمووى، من بـه عـادهتى خـۆم شـهو لـه بـانێژه ئهخـهوتم دايكـم لـه

---

[1] سياگوێز: دێيهكه لهسهر سنورى بانه عائيدى عێراقه تابعى قهزاى پێنجوێنه.

ژوورەوە کاتێ نوستم سەیرم کرد و لە خەوما ٣ سوار لە لای بیارەوە هاتن بەڵام خۆیان سپی وولاغەکانیان سپی ئەسپەکانیانم ئەدی باڵیان هەبوو، جارجار بە ئەندازەی منارەیە بەرز ئەبونەوە جارجاریش بە زەویدا ئەهاتن کە گەیشتنە نزیکمان تێگەیشتم ئەمە هەمان وەعدە وە بۆ هەمان مەبەستە. بە من و دایکمیان فەرموو ئێوەش وەرن لەگەڵمان لە ئەزمڕ[1] وە سەیر بکەن. چوین ئێمە گەیشتینە سەر شاخی ئەزمڕ ئەوان گەیشتنە سەر کێوی کەتو[2] چاومان لێ بو بە قەمچییەك کە بە دەسیانەوە بو، وە حەلقەکانی وەك زنجیر لە ئاسن بو هەریەك قەمچیەکیان ماڵی بەسەر کەژی کەتودا تۆز و خۆڵێکی زۆر بەرز بوەوە وە چاومان لێ بوو بەردەکان لەت ئەبون وە لەگەڵ ئەو حاڵەتا (٣) کەس تیاچون، وە بە ئەرزا چونە خوارەوە، من لە شەقەی قامچیەکان راپەڕیم وام زانی تفەنگیان پێوە نام هەستام و رام کرد بۆ ژوورەوە لە ناوەڕاستی ڕێ گەیشتم بە دایکم، بە راکردن ئەویش ئەهاتە دەرەوە ووتم دایە چییە؟ ووتی خەوم دیوە، کە گێڕایەوە بە بێ کەم و زیاد منیش ووتم واللهی دایە منیش هەر وەهام دیوە، بۆ سبەینێی ئەو شەوە خەبەر هات کە لە کێوی کەتو بە هۆی مەفرەزەی شوڕتەوە خولەپیزە[3]، و هاوڕێکانی کوژراون.

نوسەرئەڵێ: من پێش نوێژی مزگەوتی قازی بوم لە پێنجوێن: مەرحومی نصر الله بەگم چەن جار دیبوو، وە خەبەری خۆی و چەن کەسێکم بیست ئیتر لە فیکرم چوو بوو کە چەن کەس بوون، وە بە معلومی لە لایەن کێوە کوژراون.

عن ابن مسعود ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ (أول ما يقضي بين الناس يوم القيامة في الدّماء).

---

(١) ئەزمڕ : شاخێکی مەشهورە لە پشتی سولەیمانی کەوتوەتە بەینی ....... چوارتا.

(٢) کەتو: کێوێکە لە شاربازێڕ نزیکی دێی شێراوێژە، پیری شەوکیل لە نزیکی دایە، ئەڵێن ئەو کەژەکانی بەردە ئاشە.

(٣) خولە پیزە: رێگرێکی بەناوبانگ بو زۆر کەس لە دەستی یاس و بێزار بوون.

وعن البراء بن عازب ﷺ أنّ رسول الله ﷺ قال: (لزوال الدنيا أهون على الله من قتل مؤمن بغير حق) رواه ابن ماجه بإسناد حسن ورواه البيهقي والأصبهاني.

دەخیلـــــە تـــۆوی بێ رەحـــمی مەچێنـــــە
گولاڵـەی ژیــن لــە دەس هــیچ کـەس مەسـێنە
بـــــە ناحـــەق دەســـت و پێ مەشـــکێنە چـــونکە
دەسی قـــەهری خـــودا ئـــەستـــۆ شکێنـــــە

**ك ٢٦٩:** جارێ لەگەڵ مەرحومی حاجی سعید ناو خەڵکی پێنجوێن وە حاجی أحمدی حەمەی مینەی سمایل ئەویش هەر لە دانیشتوانی پێنجوێن، وە مەرحومی مەلا شێخ علی برای مەلا نذیر لە بیارەی شریفە لە خزمەت شێخ دا بوین قدّس الله تعالی سرّە موناسەبەیە لە گفتوگۆ[1] هاتە ئارا حەزرەتی شێخ فەرموی لە بەغدا ئەگەڕاینەوە چەن کەسێ رەفیقم بو، گەیشتینە جێگەیە تاقمێ شیعەی ئێرانی کە لە کەربەلا و نەجەفەوە ئەهاتنەوە لە دوورەوە دەرکەوتن، من بە رەفیقەکانی خۆم ووت ئێوە بڕۆن من چاوەڕوان ئەبم تا ئەمانە ئەگەن تینومە نەختێ ئاو ئەخۆم دوایی بەغار دێم پێتان ئەگەم، کاتێ گەیشتن وە زیارەت قبولم لێ کردن داوای ئاوم کرد، ئاویان بۆ هێنام بەڵام لەبەر ئەوەی دەمی جەوەنەکە دابوی بە قەبرغەی[2] وولاغەکەدا مو و توکی زۆری پێوە بو تبیعەتم نەچوە سەر ئاوەکە، وە لەبەر دڵی ئەوان نزیکم بە دەمم کردەوە، وەك ئەوەی بیخۆمەوە رەددم کردەوە، وە نیعمەت بە زیادیم لێ کردن، یەکێکیان تێدا بوو ئاخون ئاغا گەورەی مەزهەبییان بو.

---

(١) گفتوگۆ: وتوویژ.

(٢) جەوەنە: لە چەرم دروستی ئەکەن ئاوی تێ دەکرێ. قەبرغە: تەنیشت.

پرسیاری لیٚ کردم: وتی تۆ چیت؟ مەبەسی ئەوەبو شیعەی یا سوننیت؟ منیش لە وەلاما وتم لەناو کۆمەڵێکام ئەگەربڵێم من ئەوەم، بە بەرد سەنگەسارم[1]، ئەکەن، منیش مەبەستم لەو کۆمەڵە ئەوان بو یانی ئەگەر بڵێم سونی م بەردە بارانم ئەکەن، بەلام ئەو وا حاڵی بو من وام لەناو جەماعتێکی سونی دا ئەگەر بڵێم شیعەم سەنگ باران ئەکرێم، ئاخون ووتی الحمد لله کە تۆ لە خۆمانی دەخیل صەد دەخیل ئاگات لە خۆت بیٚ، بە قسەیان فریب نەخۆی ئاینی خۆت بپارێزە: ئەنجا هات بە هەجوو زەمی سونی مەزهەبدا وە دەستی کرد بە قسە پیٚ ووتن بە گەورە گەورانی مەزهەبی أهلی سوننەت و جەماعەت تا گەیشتە ئەم حەددە ووتی ئەگەر یەکیٚ شەخسێکی سوننەت و جەماعەت بکوژیٚ خێری وەك ئەوە وایە حەفتا مورتەددی کوشتبیٚ ئەنجا تێفکرام ئەگەر بە قسە و موجادەلە لەگەڵیا بچمە مەیدان درێژەی ئەویٚ، وە لە رێگەدا زۆری پیٚ ناچیٚ ئەوان جیا دەبنەوە، بەرەو ئێران ئەڕۆن، ناچار لە بابێکی ترەوە کەوتمە قسە لەگەڵیاووتم تۆ بۆچی چوبوی بۆ کەربەلا؟ وتی لەبەر خوا بۆ زیارەت چوم، وتم لەبەر خوا نەچویت، تۆ ٣ دوژمنت هەیە بۆ ئەوە چویت کە دوعات بۆبکەن لە شەڕی ئەو دوژمنانە ئەمین بی ووتی والله راس ئەکەی، ئەنجا ژنیٚ لە کەژاوەکەدا بو ژنی ئەو بو ووتم ئەی ئەو ژنە بۆچی چوە؟ ووتی ئەو لەبەر خوا چووە، ووتم: ئەویش لەبەر خوا نەچووە، ووتی: ئەی بۆچی چووە؟ وتم بۆ کوڕ چوە، وتی ئەو بۆ خوا چوە وتم منداڵی هەیە؟ وتی نەء، وتم دەی بۆ ئەوە چوە کوڕی بیٚ، ئەنجا وتم موژدەبیٚ هەتا ئەچیتەوە یەکیٚ لەو ٣ دوژمنەت، وە ئەوەی بە تایبەتی زۆرتر لێی ئەترسای مردوە، ووتی ئەمە بە چی بزانم کە وایە، ووتم بەو نیشانەی کە کۆڵنجت کردبوو، دەرمانی رەوانیت خوارد تووشی ذات الجنب بویت وەخت بو بمریت چویتە فلان مەرقەد زۆر زۆر هاوار و زاریت کرد تا دوعای بۆ کردیت رزگار بویت: وتی سبحان الله ئەڵێی

---

(١) سەنگەسار: بەردەباران، رەجم. مورتەد: لە دین و وەرگەڕاو.

هەمیشە تۆ لەگەڵ من دابویت، ئەمە تۆ یەکێکی لە ١٢ ئیمام خوا زیندوی کردویتەوە یا یەکێکی لە أولیاء الله؟

وتم نە یەکێکم لە ١٢ ئیمام، و نە یەکێکم لە أولیاء الله ی مقدەس بەڵکو من خۆم بە یەکێ لە خادمانی دەرگای دوازدە ئیمام ئەزانم، وە من یەکێکم لە کەمترین کەسێ لە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ ومن سونیم وە ئەم مەنزیلەتەم کە دەست کەوتوە بە هۆی پەیرەوکردنی ئەو گەورە گەورانەیە لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت کە ئێوە لە بەیانیەوە قسەیان پێ ئەڵێن، وە من ئێستە بێ حەواسم ماندووم سەفەرین ئەگینا چەندە موو وا بەسەرتەوە ئەوەندەم لە بەسەر هاتی خۆت بۆ باس ئەکردی.

لە پاش ئەم قسانە حیسّم کرد موجبەتی سونییەت چوە دڵی وە قەراری دا نیسبەت بەوان بێئەدەبی نەکات وە لە خەجاڵەتی خۆی سەری ولاغەکەی وەرگێرا خۆی کرد بە ناوقافڵەکەدا قال رسول الله ﷺ : (منْ أحدثَ في أمرنا هذا ما ليس منهُ فهو ردٌّ) متفق عليه.

| | |
|---|---|
| دوژمنی گرۆی یارانی نبی | دەخیل سەد دەخیل نزیکیان نەبی |
| سەفیە و نەزان چەوت و چەوێڵن | لە سارای خەطای پڕ خەتەر وێڵن |

ك ٢٧٠: جارێك لەو جارانە کە بە زیارەتی حەزرەتی قطبی زەمان حضرەتی شاه علاء الدين قدّس سرّه فائز ئەبوم پرسیارێکم عەرض کرد، وە پرسیارەکەیشم ئەمە بوو:

وتم قوربان: شێخ عبدالوهابی شەعرانی لە کتێبێکا کە خۆی تەئلیفی کردوە، وە ناوی کتێبەکەی، بە العهود المشایخ[1]، ناوناوە، ئەفەرموێ: شێخ عباسی حدیثی بو بە میوانم، ئاگام لێ بو لە ماوەیەکی کەما چەن جارێ خەتمی قورئانی کرد، منیش بە خزمەت مورشیدی ئەو گەیشتم ئەمەم بۆ گێرایەوە ئەویش فەرموی جا ئەوە چیە، من لە رۆژێکا، ئەوەندە خەتمی قورئان ئەکەم، وتم هەر بە حەرف؟ ووتی بەلێ بە حەرف وتم ئەوە چۆن؟ فەرموی کاتێ رۆح تجردی کرد لە بەدەن ئەمانە سەهلن، ئوممەتی پێغەمبەرانی پێشو وابوە ٢٠٠- تا ٣٠٠ و زیاتربە ساڵ عمری بوە بە عیبادەت و طاعەت تەواویان کردوە، خوای گەورە بەم ئوممەتە ئەفەرموێ: (كنتم خيرَ أمةٍ أخرجتْ للناسِ) ئەگەر خواصی ئەم ئوممەتە ئەم جۆرە شتانەیان نەبێ لەگەڵ ئەم عومرە کەمە ئیتر بە چی لەوان چاکترن؟ لە پاش ئەوە کە ئەمانەم عەرز کرد چەن رووداوێکی پڕ لە بەرەکەت و رووناکی گێرایەوە:

**یەکەم:** شێخی باوکم تعلیمی موراقەبەی قورئانی کردم وە فەرموی لەمەولا موراقەبەی قورئان بکە ماوەیە بە پێی ئەو تعلیماتە مەشغوڵ بوم، تا جارێ لە کاتی مەشغوڵیدا سەیرم کرد قورئان بو بە صورەتێك دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ ما، ئەنجا هەر سورەتێ لە سورەتەکانی قورئان بون بە صورەتێ[2] وە دەستی بە قسەکردن لەگەڵما کرد، ئەنجا هەر ئایەتێ لە ئایەتەکانی قورئان بە قسەکردن لەگەڵم مەشغوڵ بوون، لە پاش ئەوە هەر کەلیمەیە لە کەلیماتی قورئانی وەك ئەوان قسەی لەگەڵ کردم تا بە تەواوی وای لێهات جەمیعی حروفی قورئان قسەیان لەگەڵ ئەکردم، وە هەریەك بە حەقیقەتی معنای خۆی قسەی ئەکرد، ئەوەی باسی بەهەشت بو باسی بەهەشتی ئەکرد ئەوەی حەرفی جەهەننەم بو باسی ئەحوالی جەهەننەمی ئەکرد ئەوەی

---

(١) ئەم کتێبە هامشی کتێبێکی خۆیەتی کە ناوی (الأنوار القدسية في العهود المحمدية)یە.

(٢) صورت: یانی شێوە و هەیئەت. هەرجارێ پلەیە ئەهاتە خوار لە هەوەڵەوە هەموو قورئان دووەم جار سورەتەکان سێهەم جار ئایەت چوارەم کەلیمات پێنجەم حروف.

لە بەیانی صیفات و زاتی خودای تعالی وە بو لەو حقیقەت و مەعنایەوە قسەی ئەکرد، هەروا بەم جۆرە ئەمدی، وە لە یەك ئانی تەنیادا هەمووم ئەدی وە قسەی هەموویانم ئەبیست، وە قسەی ئەم قسەی یەکێکی تری لێ تێك نەئەدام: خودای تعالی ویسعەتێکی وای دابومێ هەموی حالی ئەبووم ئەنجا فەرموی: چونکە هەمو لەحزەیە دیتنی ئەوانە یانی تەواوی حروفی قورئان تکرار ئەبوەوە، وەك ئەوە وایە: (هەر لەحزەیە تەواوی قورئانت خەتم کردبێ: موکینە هی ئەویش وا بو بێ)[1].

**دووەم**: ئەمە بو فەرموی: جارێ لە خزمەت شێخدا من و نجم الدینی برام لە سلێمانی چوین بۆ خزمەت کاك أحمد قدّس سرّه لە پاش ماوەیە لە إیظهاری موحبەت و دەربڕینی إشتیاق و چەن قسە و باسێکی خۆش کاکە أحمد فەرموی بە باوکم تۆ دوعا نوسین تعلیمی وفق و ئیجازەی ئەمانەت لەم کوڕانە بە کامیان داوە؟ من ئەمەوێ تعلیمی ویفقی گوللە بەندی[2] بکەم وە ئیجازەی بدەم بۆ خەڵکی بنوسێ.

---

(١) هی ئەویش وابوو بێ: یانی أبو العباس و مورشیدەکەی کە ئەویش شێخ علی مرصغی بو. حەزرەتی شێخ علاء الدین ئەمانەی بە میثال ئەهێنا بۆ ئەمە کە هەروەك (طەی) یانی پێچانەوەی کات و مکان هەیە توسیعەی زەمانیش هەیە.

(٢) گوڵەبەند: بە هەرکەس بێ ریعایەتی شەرتەکانی بکات: گوڵە نای بڕێ. وە گولەبەند بە تەواتر ثابت بووە بە هەر شتێکەوە بو گوڵە تأثیری تێ ناکات، زۆر کەس بۆ تاقیکردنەوە لە ملی مریشك و حەیوانیان کردووە و تفەنگیان تێ تەقاندووە، پەڕو و موی لێ کردۆتەوە بەڵام هیچ لە گۆشتەکەی نەبڕیوە. ئەمجا (ویفق)یش چەند شەرتێکی هەیە. وەخۆیشی ئەم ئەصلانەی هەیە:
مفتاح مغلاق (تەرح = ئەصل) وفق مساحە ضابط غایە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٥ | ٤ | ٩ | ٢ |
| ١٥ | ٣ | ٥ | ٧ |
| ١٥ | ٨ | ١ | ٦ |

ئەنجا ئەمە لە هەر لایەوەکەوە کۆی بکەیتەوە

میفتاح(١) میغلاق (٩) تەرح (١٢)

| ١٥ | ١٥ | ١٥ | ١٥ | ١٥ |
|---|---|---|---|---|

وفق (١٥)    مساحه (٤٥)    ضابط (٦٠)
غايه (١٢٠)    بيت الزائد (٧)

بۆ نمونه عليم بكەين به وفق:

| ٧٠ | ع |
|---|---|
| ٣٠ | ل |
| ١٠ | ي |
| ٤٠ | م |
| ١٥٠ | |

١٥٠÷٣ = ٥٠ – ٤ = ٤٦

| ٤٧ | ٥٤ | ٤٩ | ١٥٠ |
|---|---|---|---|
| ٥٢ | ٥٠ | ٤٨ | ١٥٠ |
| ٥١ | ٤٦ | ٥٣ | ١٥٠ |
| ١٥٠ | ١٥٠ | ١٥٠ | ١٥٠ |

١٥٠

لێرەدا ئەبینی لە هەموو لاوە ١٥٠یە وە ناوی عیلم ئەگرێتەوە

ئەمە هەر بۆ مثلثە، مورەبەعیش معاملەی خۆی هەیە

ویفقی مربع تەرحەکەی (٣٠)ە لە مەجموعی ژمارە ئیسم یان ئایەتی مناسب بە مطلوب دەکرێ.

| ١ | ١٤ | ١١ | ٨ |
|---|---|---|---|
| ١٢ | ٧ | ٢ | ١٣ |
| ٦ | ٩ | ١٦ | ٣ |
| ١٥ | ٤ | ٥ | ١٠ |

| ع | ل | ی | م |
|---|---|---|---|
| ل | ی | م | ع |
| ی | م | ع | ل |
| م | ع | ل | ی |

وفقی مربع بە حروف
ئیسمی علیم

لە مربعا (١٣) بیت الزائدە.

ئەنجار فەرقی نیە ١٢ تەرح بکەی لە مەجموعی ژمارەی ئیسمەکە. یا ٤ تەرح بکەی لە ١/٣ی ئەو ژمارەیە وەك ئیسمی علیم کە مجموعی ژمارەکەی ١٥٠ بو وە تەنیا (٤)مان لە (٥٠) دەرکرد کە یەکسانە بە ١/٣ی ژمارەی ئەو ئیسمە.




١٥x ٣=٤٥ مساحه بە إضافەی ١٥ کە لە زاویەدا مەوجودە ئەکاتە ٦٠(ضابطە) بە

شێخی باوکم فەرموی ئیجازەی نوسینی ئەمانەم بـە عـلاء الـدین داوە: حـەزرەتی کاکە أحمد بانگی کردمە نزیکی خۆیەوە: ویفقەکەی فێرکردم. وە فـەرموی ئـەم ژمـارە بە حیسابی أبجد ئەوەندە ئەکات یـانی تـەواوی حەرفـەکانی قورئـان لـە هـەر حـەرفێ بـە

---

| ٨ | | ٦ |
|---|---|---|

مفتاح

إضافەی زاویـەی دووەم لەگـەڵ نەفسـی مسـاحە

| د | م | ح | ا |
|---|---|---|---|
| ١٦ | ٢٣ | ١٤ | |
| ١٥ | ١٧ | ٢١ | |
| ٢٢ | ١٣ | ١٨ | |
| ٥٣ | ٥٣ | ٥٣ | |

احمد ٥٣ - ١٢ =٤١

٤١÷ ٣ = ١٣ زائد ٢/٣

| | م | ی | ل | ع |
|---|---|---|---|---|
| ١٥٠ | ٣٧ | ٤٠ | ٤٣ | ٣٠ |
| ١٥٠ | ٤٢ | ٣١ | ٣٦ | ٤١ |
| ١٥٠ | ٣٢ | ٤٥ | ٣٨ | ٣٥ |
| ١٥٠ | ٣٩ | ٣٤ | ٢٣ | ٤٤ |
| ١٥٠ | ١٥٠ | ١٥٠ | ١٥٠ | ١٥٠ |

زائـد هـەرچی لـە مورەبەعـدا مایـەوە لـە خانـەی (١٣) دەخرێتـەوە سەری، خانەی ١٣ لە پێشتر باسکرا لە کوێدایە.
ئەنجا گوڵەبەند بە وفقی مربع دروست ئـەبێ بـەڵام شـروطی زۆری هەیە. ئەمە هەر بۆ تەرتیبی پڕکردنەوەی خانەکانە. وە بۆ نمونەیەو بەس

---

ئەمجا ٢/٣ کە لە ئەنجامی ٥٣ تەقسیم بەسەر ٣دا مابوەوە لە پاش تەرحی ١٢ لە مـەجموعی ژمـارەی أحمد: یانی ٤١ مابوەوە وە لە ٥٣ تەقسیمان کرد بەسەر ٣دا ١٣ حاصل تقسیم وە (٢)ی مابوەوە: ئەو دووە ئەخرێتە سەر (١٩) کە لە وفقی مثلثی (أحمد)دا دەردەکەوێ وە ئـەویش لـە خانـەی (٧) کە بیت الزائدە. وەك:

| د | و | د | و |
|---|---|---|---|
| و | د | و | د |
| د | و | د | و |
| و | د | و | د |

| د | م | ح | أ |
|---|---|---|---|
| ١٦ | ٢٤ | ١٤ | |
| ١٥ | ١٧ | ٢+١٩ ٢١ | |
| ٢٣ | ١٣ | ١٨ | |

ژمارەیە دیاری کراوە هەموی بنوسی وە کۆی بکەیتەوە حاصلی ئەمەندە ئەکات، ئەنجا پاش ئەوە کە لەویٚ هەستاین وە لە خزمەت باوکی بەڕێزما گەڕاینەوە کاتبیٚ شێخ عمر ناوم هەبوو لە پاش نوێژی بەیانیەك لەگەڵ ئەوا بۆ تاقی کردنەوە تا بزانین ئەو ژمارەیە صحیحە یا نە، دەستمان کرد بە حسابی حروفی قورئان بە حسابی ئەبجەد لە هەوەڵەوە تا ئاخر بۆ پاش نوێژی نیوەڕۆ تەواومان کرد بە بیٚ کەم و زۆر تەواو بوو.

ئەمجا ئەمە کەرامەتێکی زۆر گەورەیە، وە نمونەی تەوسیعەی زەمانە ئەگینا ئەمە ئیشی چەن مانگێکە.

وە گوللە بەند بە تەواوتر ثابت بوە بەهەر شتێکەوە بو گوللە تەئثیری تیٚ ناکات زۆر کەس بۆ تاقی کردنەوە لە ملی مریشك و حەیوانیان کردوە تفەنگیان تیٚ تەقاندوە پەڕ و موی لیٚ کردوەتەوە بەلاّم هیچ لە گۆشتەکەی نەبڕیوە، ئەنجا ویفقیش چەن شەرتێکی هەیە، وە خۆیشی ئەم ئەصلانەی هەیە: مفتاح میغلاق تەرح = ئەصل وفق مساحە رسم.

**سێهەم**: فەرموی جاریٚ یەکیٚ لە رجال الغیب هات ووتی ئەم بەیانیە لە خوراسانەوە هاتوم بۆ نوێژی نیوەڕۆ ئەچم لە مکە نوێژ ئەکەم، ...... وە نوێژی عصر لە مەدینە ئەکەم وە یا بە پێچەوانەوەی ئەم دو کاتە لەو دو جێگە (ئێستە من لە بیرم چوەتەوە کە شێخ کامیانی فەرموو).

**چوارەم**: لەوانە لە خزمەت خۆیدا بوم، وە فەرموی ئەمەیە: یەکیٚ پەیدا ببو بە ناوی خەلیفەگەرییەوە چەن کەسێکی لە خۆی کۆکردبوەوە، وە ئیشوکاری مفسیدانەی بەجیٚ ئەهێنا، فەرموی کە تەمولم لە حالی کرد بۆم مەعلوم بو کە مسیحیە وە ئەیەویٚ زەربە لە دیانەتی ئیسلام بدات: زۆر بە لامەوە ناخۆش بوو.

چوم بۆ رەزاو کە بە عباس قولی سولّتان بلّێم ئەم شەخسە لەناو ببا، بەیانی نوێژم کرد جا لەبەر ئەوە کە خێرە ئینسان لە جێی خۆی ثابت بێ تا خۆر ئەکەویٚ، لەو منزلاّ پاش نوێژەکەم لەسەر بەر ماڵەکە مەشغولّی ویرد بوم بەر لەوە خۆر بکەویٚ یەکێ هاتە ژوورەوە مصافەحەی کرد و دانیشت: لەو کاتە چای پێگەیشتبو وتم بە چایچیەکە چایی بێنە بۆ ئەم پیاوە لە دوورەوە هاتوە لە پاش نەختێ هەستا هاتە لامەوە چپانی بە گویٚ ما ووتی مەصلحەت نیە ئەو کابرا بە هۆی عباس قولی سولّتانەوە بفەوتیٚ ئەم بەیانیە من نوێژم لە بیت المقدّس کردوە أولیا اجتماعیان کرد نەمانی ئەو پیاوەیان حەواڵە بە من کرد ئیتر هەستا و رۆیشت، کە چوە دەرەوە بە کۆمەڵی حازرانم ووت نەتانزانی ئەمە چی بوو؟ وتیان نە واللە قوربان، وتم ئەمە رجال الغیب بوو ووتیان ئەی قوربان بۆ زوو نەت فەرموو با زیارەتمان بکردایە؟ ئەنجا رایان کرد بە دوایا زۆر گەڕابون نەیان دی، وە ئیتر ئەو شەخصە گوم بوو وە نەزانرا چی بەسەرهات: بلّیٚ ئیتر الحمد للە[1]، بە هۆی ئەو پرسیارەوە بە بیستنی ئەم چەن فەرمودە پڕ لە .. بەهرەمەند وە شاد و کامەران بوم.

عن أنس ﷺ قال: "رسول الله ﷺ من صلى الصبح في جماعة ثمّ قعد يذكر الله حتى تطلع الشمس ثمّ صلّى ركعتين كانت له كأجر حجةٍ وعمرة قال: رسول الله ﷺ تامةٍ تامةٍ تامةٍ" رواه الترمذي.

(١) بۆ مامۆستا مەلا عارفی پێنجوێن رحمة الله عليه ئەمەم گێڕایەوە فەرموی بەلّیٚ منیش لە خزمەت خۆی بیستومە، وە فەرموی کاتێ ئەو زاتە هاتەژوورەوە وا بە زمانمدا هات وتم حلّت البركة.

چ كەرامەتێکە یــارەب کـردت لــەگەڵ بــەشەردا

کە بەرگی جێگە داریت بە لـوطفت کـرد بـە بـەردا

چی‌لـیٚ دەبینیٚ بیٚ چـاو چی لـیٚ دەبیسـیٚ بیٚ‌گـویٚ

خـاکی نــەفامی بیٚ دڵ بـــا هــەر بکـا بـــەسەردا

بی یــسمــعُ و یَبصرُ بی یــبــطشُ خـــوا خۆی[1]

لـە وەصفی ئەولیــای‌خۆی بـە پێغەمبـەر خەبـەردا

ك ٢٧١: مرحومی مامۆستا مـەلا نصر الله ئیمـام و مـدرسی دێـی کیلـو[2] بـۆی گێرامـەوە فـەرموی لـە بیـارە لـە خزمـەت شـێخدا حـاضر بـووم جەماعـەتیٚ خـەڵکی ئەنطـاکیە هاتبون بۆ زیارەتی حەزرەتی شێخ چوار بەرگی فقهی ئیمامی مالکیـان هێنـابو بە دیاری کە پێیان ئەڵێن (موطّا) حەزرەتی شێخ بە مەلا محمدی کـوڕی مامۆسـتا مـەلا بهای فەرمو نـەختێکی لـیٚ بخوێنـەوە، ئـەویش لـە بـەرگی (١)ی لـە بـاسی دەس نوێـژ جوملەیەکی خوێندەوە: وە ئاخری بە حدیسێکی پیرۆز هێنا کـە فـەرموی رواه مسـلم: ئەنجا حەزرەتی شێخ فەرموی درۆ ناکەم (وە ئەمەی بە سوك فـەرمو) ٣ جـار تـەواوی قورئان بە جمیعی معانی و حقایق و رموزیٚ کە لـە (لـوح المحفـوظ)وە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ هـاتوە لـە خزمـەت پێغەمبـەرا خوێندومـە (مسـلم)یش هـەروا، جـا ئیتـر نـەمان زانی

---

(١) لە حدیثی قدسیدا دەفەرمویٚ: من عادی‌لی ولیاً فقد آذنتهُ بالحرب, وما تقرّب اليّ عبدي بشيء أحبّ إليّ ممّا افترضت عليه, وما يزال عبدي يتقرّب اليّ بالنوافل حتى أحبه, فإذا أحببته كنت سمعه الّذي يسمع به وبصره الّذي يبصر به ويده التي يبطش بها ورجله التي يمشي بها ولئن سئلني لأعطينّه ولئن إستعاذني لأعيذنّه. رواه البخاري وابن حبان في صحيحه وأبو داود وأبو نعيم في الحلية والبيهقي.

(٢) کیلو: دێیەکە ماوەی سەعاتیٚ لە پێنجوێن دورە، شێخ رشید مالیکی ئەو دیٚ بو.

(مسلم)یش وەك ئەو خوێندویەتی کە جامعی حدیثە یا کتێبی (مسلم)یشم لە خزمەتیا خوێندوە.

بە کیلوی نزیك جێگەی ئەجدادم          رووی دراویٚ تر هاتەوە یادم

ئەوەش ئەمەیە:

شێخ رشید کوڕی شێخ عزیزی کیلو: ماوەیەکی زۆر نەخۆش بو لە لای دوکتۆر هیچ چارەسەری نەکرا، وە لە کاتی سەلامتی‌دا زۆر مونکیر و بێ بڕوا بو بە مشایخی بیارە، بە ئاشکرا بێ ئەدەبی دەکرد، کە دەردەکەی بێ عیلاج ما ناچار لەگەڵ مامۆستا مەلا نصراللە کە مدرسی دێی خۆی بو چون بۆ خزمەت شێخ وە زۆر لە حاڵی خۆی دڵخۆش، وە لە کرداری پێشوی پەشیمان و خەجاڵەت بو، ئەنجا ئەو شێخ رشیدە وتی دو سێ رۆژ شێخ ئەیفەرمو جار بە جار بەلایەك وەك دالاش بەسەر ئەم چەمەدا ئەسورێتەوە خوا لە ئێمەی لادا لە پاش ئەو دو سێ رۆژە لە بەینی بیارە و هانەگەرمەلەدا بەگزادەیە هەورامی لە چەما لە بن دارێکدا (درەختێکا) خەوتبو کوشتیان، ئەنجا من بڕوام پەیدا کرد کە ئەم خاوەنی حەقیقەتە وە خاوەنی ئیدراك و بصیرەتە. عن عثمان بن عفان ﷺ عنه عن النبيّ ﷺ خيركم من تعلّم القرآن وعلّمه, رواه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي وابن ماجه وغيرهم.

عن ابن مسعود ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ : من قرأ حرفاً من كتاب الله فلهُ به حسنةٌ والحسنةٌ بعشر أمثالها لا أقولُ الم لكن الف حرف, ولام حرفٌ, وميم حرف, رواه الترمذي.

خۆزگە بەو کەسە کە دەس بەتاڵە
دنیا پەرستی بە لاوە تاڵە
تەنیا هەر یادی خوای لە دلا بێ
ویردی زوبانی کلام اللە بێ

ك ٢٧٢: جەنابی فاضلی موحتەرەم صادق و ناصح متقی وارع حاجی مەلا صالح مەشهورە بە مەلا صالحی پەرخی گێرایەوە فەرموی: فەقێ بوم توشی نەخۆشییەکی زۆر بەردەوام و نارەحەت هاتم، چەن جار موراجعەم بە دوکتور ئەکرد فەحصیان ئەکردم ئەیان ووت تۆ هیچت نیە کەم خوێنی و ضەعیفی، دەرمانی مقوییان بۆ ئەنوسیم هیچ سودێکی نەبوو، وە هەر بە تەیەموم نوێژم ئەکرد نەم ئەوێرا بە هیچ جۆر ئاو لە هیچ جێگەیەکم بکەوێت دەستم تا جمگەم یان جمگەی مەچەکم. سەر و ریشم هات بو لەبەرئەوە کە نەم ئەوێرا ئاو لە سەر و رووم بدەم، بەڵام دەم و چاوم لە چڵکن نەدەچو، بە کورتی لە پاش چەن جار موراجەعە بە دوکتۆر وە کەڵك نەبینین جارێ لە روی گلەییەوە، وتم ئینسان ئەگەر پەنا بەکافرێ ببات بۆ هەر مەطلەبێ، چی لە دەسەڵاتیا بێ دریغی ناکات، لە ئومەتی پێغەمبەرا ﷺ ئەم هەمو ئەولیا گەورە گەورانە هەیە تەشەبوسیان پێ ئەکەین بە قەدەر گاورێ لێمان ناپرسن.

ئەو شەوە بە خزمەت حەزرەتی شێخ علاء الدین قدّس سرّە گەیشتم دوعایەکی دایە دەستم فەرموی ئەم دوعا بە نیەتی لاچونی ئێشی سەرت وە تصفیەی قلبی هەڵگرە کە خەبەرم بووەوە ئێشی سەرم نەما، وە ئیتر بە تەواوی لاچو بەڵام نەخۆشیەکەی تر هەرچەن مابو لەویشدا فەرقم کرد ئەنجا پاش ماوەیە ویستم مراجعە بە مستشفا بکەمەوە دوایی کاغزێکم بە برایەکدا نوسی بۆ خزمەت حەزرەتی شێخی علاء الدین قدّس سرّە بەم جۆرە قوربان نەخۆشم مایەسیرێمە لە چارەسەر کردنی سەرگەردانم: منیش مەشورەت بە جنابت ئەکەم، خوێندنم پەکی کەوتوە، بچم بۆ لای طبیب، یا صبر بکەم یا بێم بۆ خزمەتت لە وەڵاما بەو برایەی فەرموبو مەیبەن بۆ لای دکتۆر چونکە نەخۆشیەکەی نازانن ئەڵێن هیچت نیە، نەخۆشیەکەی لە جگەریایە ٣ سێ رۆژ بەر لە خواردن بەیانیان پەنجە تەڕ بکات وە بیدا لە خۆڵەمێشی داربەڕوو هەر جارەی ٣ کەڕەت ئەو پەنجەی شەهادەیە بدا بە زمانیدا وە قوتی بدات، وە بە کەرە و خوێ بیهەنون ئەگەر چاك بو بێت بۆ ئێرە، منیش ئەو دەستورەم ئەنجام

دا بەوە زۆر فەرقم کرد، لە پاش ماوەیە چوم بۆ بیارە، بە خزمەتی گەیشتم وە ماوەیە مامەوە رۆژێ عەرزم کرد قوربان مایەسیریم هەیە، دەرمانم چییە؟ فەرموی دەرمانت پێ ئەڵێم ئیتر هیچی نەدەفەرمو، وە ئەمبینی خەڵك ئەهاتنە خزمەتی مایەسیرییان هەبو دەرمانی بۆ دیاری ئەکردن، چەن رۆژێ تر عەرزم کردەوە بە هەمان قسە، فەرموی دەرمانت بۆ دیاری ئەکەم، ئیتر هیچ دەرمانێکی نەفەرمو ئەنجا لە پاش ماوەیەکی تر شێخ محمدی کوڕی شێخ مارفی نرگسەجاڕی هات وتم شێخ محمد من مایەسیریم هەیە وە چەندجار عەرزی شێخم کردوە هەر ئەفەرموێ دەرمانت ئەدەمێ و هیچ نافەرموێ وتی الآن بەیەکەوە ئەچین و عەرزی ئەکەین وە دەرمانی پێ دیاری ئەکەین کاغزێکی نوسی و چوین و تقدیمی کرد لە جوابا فەرموی دەرمانی بۆ ئەنوێنم ئیتر هیچی دیاری نەکرد، لە پاشان لە دڵی خۆمدا قەرارم دا ئیتر لەم بارەوە هیچی عەرز نەکەم، لە پاش بەینێ ئیجازەم وەرگرت بۆ گەڕانەوە فەرموی پاش ماوەیە تر وەرەوە، منیش بەو جۆرە چومەوە وە هاتمەوە لە پاش ماوەیە مانەوە رۆژێ سەیرم کرد لە پێمەوە هەتا ئەژنۆم ئاوساوە، بە جۆرێ وابو دەرلنگی دەرپێ کەم هەڵ دڕی، چومە خزمەتی پێم نیشاندا فەرموی ئەمە نەخۆشییەکە دیاری دا ئەنجا دەرمانی بۆ دیاری کردم بەکارم هێنا بە تەواوی چاك بوم.

ئەنجا مەلا صالح فەرموی: بەر لەوەی بە خزمەت شێخ بگەم لە کاتی نەخۆشییە نارەحەتەکەمدا بە خزمەت حەزرەتی رسول الله ﷺ گەیشتم سکالام لە خزمەتیا کرد، فەرموی ئەتدەمە دەس یەکێ رۆژی ٣ جار مولاحەزەت بکات جا لە پاش ئەوە بە خزمەت حەزرەتی شێخ کامەران بووم، وە چەندەها سود و کەڵکی گەورەم لێ إستفادە کرد.

**ك ٢٧٣:** جارێکی تر بە هۆی نارەحەتیەکی ترەوە کە هەم بو وە ئەو نارەحەتیە نەخۆشی جیسمی نەبو بەڵکو حاڵەتێکی قەلبی بو ئەوەندە عاجزی و دڵتەنگی روی تێئەکردم دوعام ئەکرد بمرم، وە بە دڵ حەزم بە مردن ئەکرد، وە لەو کاتا هەر لە

بیارە بوم وە دوعای مردنیشم کە ئەکرد غەیری خوا کەس نەی ئەزانی لەو حاڵەتەدا چوم بەپێوە لە خزمەتیا راوەستام خەڵك زۆر لە خزمەتیا بو، سەری بەرزکردەوە بۆی روانیم (زەردەیە) گرتی و فەرموی بە خوا عەجایبە إنسان حەز بە مردن بکات، من هەر لەسەر حاڵی خۆم بوم دیسان دەستی کردەوە بە جێبەجێکردنی ئیشی خەڵك نیو سەعاتێکی پێچو سەری بەرز کردەوە تەماشایەکی کردم تەبەسومێکی کرد و فەرموی بە خوا عەجایب ئینسان مردنی پێخۆش بێ، دیسان مەشغوڵ بە ئەنجامی کاروباری خەڵك بوەوە تا ماوەی نیو سەعاتێکی تر و سەری هەڵبڕی و سەیرێکی کردم ئەمجا فەرموی نە أنبیا نە أولیا هیچیان مردنیان پێ خۆش نەبوە، عجایبە إنسان ئەوەندە پێی خۆش بێ بمرێ، بەدوا ئەوا چەند جار پەنجەی جولاند، وە ئیتر من وەکو بارێکی قورس و کۆڵێکی گران لەسەر شانم بو بێ و لابچێ، ئاوا باری شانم سوك بوو پاش ئەوە حیکایەتێکی حەزرەتی شێخ نجم الدین کبری گێڕایەوە[1].

---

(١) حیکایەتەکە ئەوەیە: خوشکە زا، یا برازایەکی ئەو زاتە لە خزمەتیا دەبێ چاوی لێ ئەبێ پیاوێ دێتە خزمەتی ماوەیە بە یەکەوە قسە ئەکەن، و ئیتر ئەو ئەڕوا شێخ ئەفەرموێ نازانی ئەم پیاوە کێ بو؟ عەرزی ئەکا نازانم ئەفەرموێ ئەمە مەئموری فلان جزیرەیە ئەمما لە مەنصەبەکەی عەزل کراوە، چونکە ئەزری ئەو جێگە پێویستی بە باران ئەبێ باران بەسەر بەحرەکەدائەبارێ ئەویش بە دڵ ئەڵێ زەویەکە محتاجە و باران بەسەر بەحردا ئەبارێ لەو اعترازەوە عەزل کراوە بەڵام لەبەر ئەوە فیضو بەرەکاتی زورە هێشتا دوایی نەهاتوە بە خۆی نەزانیوە ئەمیش عەزری ئەکات ئیجازەم نادەی بچم پێی بڵێم؟ ئەفەرموێ بەڵێ بە هیممەتی ئەو زاتە ئەگاتە جزیرەکە وە ئەیگێڕێتەوە بۆ پیاوەکە: ئەویش ئەڵێ چیت پێ ئەڵێم گوێم لێ بگرە ئەڵێ بەڵێ، ئەڵێ ئەم مێزەرە بخە ملم بە ناو ئەم هەمو دار و بەرد و درك و دالا رام بکێشە بڵێ ئەمە جەزای کەسێکە اعترازی لە مەولای خۆی ئەگرێ، منیش بەو شێوەم عەمەل کرد تا بانگ کرام بەسیەتی مەلائیکە تکایان بۆ کرد چوە سەر وەظیفەی خۆی، بە گێڕانەوەی ئەم حیکایەتە لەو تمنای مردن و لاچونی نارەحەتیە پەشیمان بوومەوە.

که ئەو حیکایەتە ئیشارە بە کاروباری ئەحواڵی منەوە بوو بە هۆی پەشیمان بونەوەم لە لاچونی نارەحەتیەکەم

قال ﷺ (إنّ عِظَمَ الجزاء مع عِظَمِ البلاءِ, وإنّ الله تعالى إذا أحبّ قوماً ابتلاهم فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضا وَمَن سَخِطَ فَلَهُ السُّخْط).

رواه الترمذي من حديث انس ﷺ.

بەڵێ ئەمانە ئەسەد و بازن
عالی مەرتەبەو بوڵند پەروازن
بە حوسنی خولق بە بەرزی هیممەت
لە بەنی نەوعی خۆیان ممتازن

**ك ٢٧٤:** جەنابی فاضل عالم کامل حاجی مامۆستا مەلا سید علی کوڕی حاجی شێخی ئەڵمانە[1]، گێڕایەوە: فەرموی من نەخۆشییەکی زۆر نارەحەتم تووش بوو باوکم بە پەلەپەل پیاوێکی بە کاغەزێ لە بەیانی چۆنیەتی نەخۆشییەکەمی نارد بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ علاء الدین، حەزرەتی شێخ جوابی نوسیبووەوە هەتا ئەم جوابە ئەگات سید علی چاك ئەبێت بەڵام خۆت ئەم دەرمانانە بۆ خۆت بەکاربهێنە، ئەنجا مامۆستا سید علی فەرموی تا ئەو پیاوە هاتەوە من چاك بوم باوکم تووشی نەخۆشی بوو بە بەکارهێنانی دەرمانەکان ئەویش چاك بوەوە، والحمد لله.

**ك ٢٧٥:** جەنابی مەلا صدیقی کوڕی مامۆستا مەلا عبدالعظیمی مجتهد گێڕایەوە: ووتی من لە دوڕوە ئەم خوێند حەزرەتی شێخ عوسمان لە خزمەت مامۆستا مەلا سید محمد مدرسی دوڕەوە ئەیخوێند شێخ ماوەیە زۆر بوو بە مامۆستای خۆی فەرمو بو دەعوەتێکم بۆ بکە، جەنابی مامۆستایش وا مەشهور بو کەمێ لە سەخاوەت کەمیی

---

(١) ئەڵمانە: دێ یەکە لە بەینی مەریوان هەورامان.

هەیە، ئەویش وەعدی پێ دابو کە دەعوەتی بکات، وە پێی وتبو ئاخر تۆ گێچەڵت بە دواوەیە خەڵك لەگەڵ خۆت ئەهێنی، ئەویش بڕیاری دابویە کە هیچ کەس لەگەڵ خۆی نەبات، ئەنجا ڕۆژێ لە پاش نوێژی نیوەڕۆ کە مامۆستا لە ویرد و ئەوراد بوەوە هەستا بڕواتەوە، حەزرەتی شێخ عوسمانیش لە صەفی جەماعەتا بو لە نوێژ سەلامی دابوەوە، دەستی دا لەسەر شانی بە ئیشارەت کە یەعنی هەستە بڕۆین بۆ سەر دەعوەتەکە، لە پاش ئەوە کە ئەوان ڕۆیشتن حەزرەتی شێخ علاء الدین پرسیاری فەرموو بو عوسمان لە کوێیە عەرزیان کردبو لەگەڵ مامۆستادا ڕۆیشتن، ئەنجا شێخ فەرموی بەوە کە لە خانەقادا حازر بون با بچین بۆ ماڵی مامۆستا. جەماعەت کە لە حدودی ٧٠ تا ٨٠ کەسێ ئەبوین لە خزمەت شێخ دا چوین بۆ ماڵی مامۆستا دامان لە قاپی، لەگەڵ تەقەی دەرگا دێ. مامۆستا ئەفەرموێ شێخ عوسمان نەمووت تۆ گێچەڵاویت ئەوە بۆ لای تۆ هاتون، ئەویش ئەفەرموێ واللە من بە کەسم نەووتوە، بەڵکو میوانی خۆت بێ بزانن کێیە؟ ئەویش پرسیار ئەکات کێیە؟ حەزرەتی شێخ علاء الدین ئەفەرموێ خۆمانین قاپیمان بۆ بکەوە، کاتێ ئەزانێ شێخە ئەڵێ قوربان دەرگای چی بکەمەوە بە خوا مشتێ برنجە لێمان ناوە ئەوەندە نیە شێخ ئەفەرموێ هیممەتت بێ دەرگامان بۆ بکەوە، پاش إصرار دەرگا ئەکاتەوە ئەبینێ ئەم هەموە لە خزمەت دان ئەڵێ قوربان جا من چی بکەم؟ ئەبێ بڕۆم ئەفەرموێ تۆ سەییدی، ئەبێ بە غیرەت بی، تۆ با بچین دانیشین ئەنجا ئەڵێ قوربان ئەمر بفەرمو با ئەوەی بۆ خانەقا لێنراوە بێت بۆ ئەم خەڵکە، ئەفەرموێ ئێمە ئەم نیوەڕۆ میوانی تۆین، بە کورتی خەڵکەکە لە ژوورەکەدا هەندێ لە خزمەت شێخ و بەعزێکی لە هەیوان و حەوشە دائەنیشن، شێخ ئەفەرموێ ئەوەی کە کردووتانە بە چێشت بە خێزانت بڵێ چارەکەیە شتێ بدا بە سەریا هەروا بە کەوگیر تێی بکا بۆمان و بۆ ئەم خەڵکە، ئەویش بە خێزانی ئەڵێ مجتهدی یانی مەلا صدیق بە حضوری شێخ ئەمەی ئەگێڕاوە، وتی واللە ئەو نەختە چێشتە کە لە مەنجڵێکی بچوکدا بۆ دو سێ کەس دروست کرابو، ئەو هەمو خەڵکە

تێری لیٚ خوارد، له پاش ماوەی چێشتەکه مابو حافزیٚ دراوسێیان بو بۆ ئەوانیشیان نارد فالحمد لله المنعم الکریم، و عن ابن عباس ﷺ عن النبي ﷺ قال: البرکة تنزلّ وسط الطعام فکلوا من حافتیه ولا تأکلوا من وسطه.

هەرکەس ئەولیای بەڕاسی ناسی ئەکەوێتە سەر شەقامی راسی
ئەوەش که ئەهلی خودا نەناسه لەهەردو دنیا هەر کەڕ و کاسه

**ك ٢٧٦:** جەنابی فاضل مەلا صالح پەرخی: فەرموی حاجی محمد أمین خەڵکی دێی دەرەمیانه، ووتی من حاڵەتیٚ رووی لیٚ ئەدام له پاش عەصر ئیتر نەئەوەستام ئەکەوتمە ریٚگه بۆ بیاره له هەوەڵی بەرەبەیاندا گەیشتمه بیاره زۆر جار ڕیٚ ئەکەوت که به ناو گژو گیادا تێپەڕیم به شەو توشی مار ئەهاتم به پێما پێچی دەدا، وه من هەرکات ئەو حاڵه سەری لیٚ بدامایه ئیتر وەستانم نەبوو، وه هەر لەپاش نوێژی عصر ئەوه رووی دەدا، جارێکیان خێزانم زۆر به شیدەت به ژانه سك گورفتار بو، به تەواوی بێتاقەت بو منیش له پاش نوێژی عەصر گەرمی حاڵەت سەری لێدام و بەرەو بیارەی شەریفه کەوتمە ڕیٚ، بۆ نوێژی بەیانی گەیشتمه جێگه تصادف تووشی ........ بوم که یەکیٚ بو له خزمەتچییه تایبەتیەکانی حەزرەتی علاء الدین چۆنی چاکیمان کرد وه وتم کەی ئەبیٚ من به خزمەت شێخ بگەم وه حاڵی ناڕەحەتی خێزانەکەم بۆ بەیان کرد، ئەویش وتی شێخ ٣ سیٚ جۆر نەخۆشی قەرار داوه لەسەر خۆی بەهەر کەسەوه بیٚ شکاتی بهێننه لای هەڵی ئەگریٚ بۆ خۆی، یەکەم سەریەشه دوەم ژانه سك سێهەم: ........ معلوم بزانه تۆ حیکایەتی ئەم ژنەی خۆتی بۆ بکەی ئەم توشی ئێشه سك ئەبیٚ ئەو لەویٚ رزگار ئەبیٚ که ئەم قسەی کرد بەلامەوه زۆر به دڵمەوه نەچەسپا، کاتیٚ به خزمەتی گەیشتم زیارەتم کرد و به دوای ئەوا حاڵی خێزانم عەرز کرد فەرموی إنا لله وإنا إلیه راجعون.

ئیتر راكشا و كەوت وە بەو ناسازیە دوچار بوو خێرا هاتن لێفەیان پێدادا وەختێ گەڕامەوە لەو كاتەدا خێزانم چاك بو بو، روی عن ابن عمر ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ لله خلقاً خلقهم لحوائج الناس يفزع الناس إليهم في حوائجهم أولئك الآمنون من عذاب الله. رواه الطبراني.

| | |
|---|---|
| چاكانی خودا نە بە رۆژ نە شەو | ئیسراحەت ئەكەن لەبەر ئەم و ئەو |
| ئیشیان طاعەت و دوعایە بەشەو | رۆژیش ئیشی خەڵك ئەكەن لەبەر ئەو |
| بەڕاسی ئەمان لە عالەم جودان | هەمیشە جێگەی چاودێری خودان |

ك **٢٧٧:** حەضرەتی مفضال علامەی خاوەن كەماڵ مەرحومی مامۆستا مەلا باقر رحمه الله الملك القادر: فەرموی جارێ حەزرەتی قطب العارفين ومرشد السالكين حەضرەتی شاهی علاء الدين قدس سره فەنای وجودی نیشان دام نەك بە طەریقی دەرس بەڵكو بە طەریقی بەحث, كاتێ ئەو حوجرە كە تێیدا تشریفی دانیشتبو خەڵك مراجەعەیان پێدەكرد، چۆڵ بو خۆی تەشریفی هەستا قاپی حوجرەكەی داخست ئەنجا چۆكی نا بە چۆكمەوە دەستی نایە سەر هەردوو رانم، وە دەستی كرد بە بەیانی چۆنیەتی فەنای وجود. وە مثالی بە وجودی خۆی دەهێنایەوە، ئەنجا ئەم بینی وردە وردە وجودی لەبەر چاوم روەو مەحو ئەڕۆی تا وای لێهات شەبەحێكی ما، ئەنجا هەر طولی دا بەو تقریرە ئەیكرد تا وای لێهات شەبەحەكەیش نەما، بەلام دەنگەكە هەروەك خۆی ئەهات، بەلام خۆی لەبەر چاوا نەبوو تەنها خۆمم ئەدی و بەس بەلام تدریجی بە فەنای وجودی هەمو نمونە بو بۆ تقریرەكەی، ماوەیەك نە جسم و نە شەبەحم نە ئەدی، تا هەر لەسەر تقریرێ كە ئەیكرد بۆ ئیعادەی وجود سەر لە نوێ ئینشای وجودی پەیدا بو، وەك هەوەڵ جار وردە وردە بەرەو پێشەوە هاتەوە سەرپیشاندانی شەبەح تا بە ماوەیەك وەك خۆی لێهاتەوە ئەنجا تەشریفی هەستا

قاپیەکەی کردەوە فالحمد لله أولاً وآخرا وصلى الله على سید الوری محمد وآله وصحبه ومن تبع دینه ونصر.

عن إبي هريرة ﷺقال: قال رسول الله ﷺ إنّ الله تعالى قال من عادى لي ولياً فقد آذنته بالحرب, وما تقرّب الي عبدي بشيء أحبّ إليّ بالنوافل حتى أحبّه فإذا أحببته كنت سمعه الّذي يسمع به وبصره الّذي يبصر به ويده التي يبطش بها ورجله التي يمشي بها ولئن سألني لأعطيّنه ولإن استعاذني لأعيذنه) رواه البخاري, زاد بعد وقوله لأعيذنّه وما ترددت عن شيء أنا فاعله ترددي عن نفس المؤمن يكره الموت وأنا أكره مساءته, وانفرد البخاري عن باقي الكتب الستة ورواه ابن حبان في صحيحه وأبو داود خارج السنن فيما رواه عنه إبن الأعرابي وراوه أبو نعيم في الحلية والبيهقي في الزهد وابن عدي في الكامل وآخرون وقد روى الحديث من طريق عائشة وميمونة وعلي وأنس وحذيفة ومعاذ بن جبل وابن عباس وغيرهم.

أولـيـاء الله بـه عـيزز و نـازن
بـه بـازوو شێر و بـه دیـده بـازن
بـۆ ئـەوجی فـەزای مەرتەبـەی قوربـەت
هـەڵـۆ هـەڵمـەت و بوڵـند پـەروازن
دەروێشـی صەهبـای صەفـای وەحـدەتن
لـە خـەیری غەیـری ئـەو بێ نـیـازن
کلیـلی قـاپی خەزنـەی فـتـوحـن
گـەنجینـەی گـەنجی ئـەنـواعی رازن
مـل کـەچی قـەزان بـە ئـەمری رەزان
هـەر ئـەو ئەناسن هـەر بـەو ئـەنازن
بـۆ دۆس و ئەحـباب لـە هـەردو دنیـا

کـــهف الأمـــــان و نـــعـــــم الـمــــــلازن
هــــەر کـاتێ بـکەی طـەڵــــەبــــی ئیمـداد
بــــە کۆمـەکی حـەق حـازر و ســــــازن
بـــۆ تێکشــکانی فــــــیرعەونی نـــــەفست
موســــای زەمــــــانن خــــاوەن وەکــازن
بێ بــاکن أممـــــا بێ فـیـــــز و دەعیــــــەن
میــــوان پــــــەزیر و غەریــب نــــــــەوازن
بــە رەحم و وەفـــان دەرون پـــــڕ صەفـــان
لــە حــەق مـەغفیرەت بـۆ خـەڵق ئـەخوازن
دۆســت بــە هیمـەتیان بـــــەرزە قیـــمەتیان
دوژمنیــــــش ســەگ و گــورگ و بــەرازن
ئـەمانمـؤمــــن و خـەڵکیش هـــەر مـؤمن
ئــــەمــــــان حەقیقــەت ئـــــەوان مـەجازن
بـــــە کـــــورتی گــرۆی أولــیــــــاء الله
لــــــە بــــــەنی نـەوعی خۆیــان مومتــــــازن

**ك ٢٧٨:** إبراهیم شلاّل[1] گێڕایەوە لە زمانی إسماعیـل راوی ووتی: پاش نوێـژی عەسری رەمەزانێ لە ساڵی چلەکان خوا لێخۆشبوو مفتی عێراق شێخ قاسم قەیسی لە مەوعیظەیەکدا کە لە باسی غرورەوە ئەدوا فەرمووی:

لە پاش ئەوە کە خوێندنم تەواوکرد، وە بە بەهرەی عیلمـی ظاهیری گـەیشتم وە لەناو خـەڵکا شـۆرەتێکم پەیداکرد هەسـتی غـرورم لـە خۆمـا کـرد بڕیـارم دا کـە ئـەو

(١) إبراهیم شەلاّل لە دێیەکە لە أبو غریب رئیسی عشیرەتە وە خوّی أقطاعي یە پیاوێکی بـە وێـڵ و خاوەن مەعریفەتە. إسماعیل راوی لە فلوجەیە.

کردەوە پڕ زەرەرە لە خۆما ڕیشەکەن بکەم وە لە بنچینە دەری بهێنم ئەنجا هەستام چووم بۆ بیارە بۆ خزمەت حەزرەتی قطبی زەمان شێخ علاء الدین کە گەیشتمە ئەوێ سێ ڕۆژ لە خانەقا مامەوە هیچ کەس لێی نەپرسیم بۆ شەوی چوارەم قەرارم دا کە لە بەیانی بگەڕێمەوە بۆ بەغا چونکە خۆمم بە بێ بەخت ئەزانی.

بەیانی ڕۆژی چوارەم حەزرەتی علاء الدین تەشریفی هاتە خەتمەوە لە دوای خەتمە تەواوبوون خەڵکەکە بڵاوەیان کرد منیش هەستام بچمە قوژبنێکەوە، حەزرەتی پیر ئیشارەی فەرموو دانیشە دانیشتم بە یەکێ لە خادیمانی فەرموو سێ بەرماڵ بێنە، ئەنجا بە منی فەرموو: شێخ قاسم[1]، ئەم دەور و پشتی بیارەت نەدیوە حەز ئەکەم بۆ تەماشا و سەیران ئەم شاخ و کێوانە ببینی منیش زۆر مسرور بووم و عەرزم کرد حازرم، لە خزمەتیا ڕۆیشتم زۆر دوورکەوتینەوە گەیشتینە سەر کانی و ئاوێ ئەمری فەرموو بە دەستنوێژ، دەست نوێژمان گرت و چەن ڕکاتێ نوێژمان کرد حەزرەتی شێخ چووە سەر حاڵی موراقەبە لە پاش ماوەیە سەری بەرزکردەوە ڕوەو تەرەفی خانەقا سەیری کرد ئێمەش ئاوڕمان دایەوە دیمان دوو نەفەر لەسەر شێوەی عەرەب و ئەهلی عیلم بەرەو لای ئێمە هاتن وامزانی ئەمانیش میوانن لە بیارە خەبەریان زانیوە شێخ لێرەیە بۆیە هاتوون، ئیتر شێخ تەشریفی موبارەکی هەستا چوو بە پێشوازییانەوە، دەستی کرد بە ماچکردنیان لە خوارەوە تا سەر هەموو گیانی ماچ کردن، بەڵام یەکێکیان شوعلە و تیشکی ئەنواری لە ڕۆژ زیاتر بوو، ئینجا هەستم کرد کە حەزرەتی شێخ لە بارەی منەوە لە خزمەتیانا قسە ئەکا وە باسی منیان لە حضوریان کرد، ئەو زاتە خاوەن ئەنوارە تەماشای فەرمووم وە تبسّمێکی (زەردەخەنە) فەرموو تیشکێ لە دەمی موبارەکییەوە هات لێی دام حاڵم تێکچوو وە ئەوزاعی غەریب ڕووی لێ دام وە دڵنیایی و خۆشییەکی زۆر کەوتە سینەمەوە لە پاشا

---

(١) شێخ قاسم قەیسی: مەشهورە بە علامەی عێراق، مفتی بوە لە بەغاوە خطیبی تەکیەی حەزرەتی گەیلانی بووە.

گەڕانەوە[1]، وە شێخ کاتێ لە چاو وون بوون تەشریفی هاتەوە و بە ئێمەی فەرموو با بگەڕێینەوە، هاتینەوە بە شوێنی خۆماندا لە ڕێدا دەستم کرد بە گیرفانما تەزبیحەکەم پێ نەما بوو عەرزم کرد ئیجازە بفەرموو تەزبێحەکەم بهێنمەوە شێخ رووی کرد بە لامەوە فەرمووی: ئەزانی کەمێ لەمەو پێش ئێمە لە کوێ بووین؟ عەرزم کرد نە والله، حەزرەتی شێخ فەرمووی ئێمە لەسەر کێوی ئوحود بووین لە شاری مەدینەی منوّەرە ئەوە حەزرەتی رسول الله ﷺ بوو حەزرەتی أبو بکری صدیقی ﷺ لە خزمەتا بوو کە ئەوەی فەرموو حاڵم تێکچووەوە بە جۆرێ وا هەرچی پۆشاکم هەیە لەت و پەتم کرد و گشتیم لەبەر خۆما دڕی هەتا بەیانی بەو حاڵە مامەوە، بۆ بەیانی ئیفاقەم کرد چاك بوومەوە، حەزرەتی شێخ دەسێ لیباسی بۆ ناردم وە فەرمووی: ئەوەی ئەو بۆی هاتبو دەسی کەوت ئیتر بچێتەوە بۆ بەغا، حەزرەتی شاهی سراج الدین (قدس سره) فەرمووی: چەند جار خۆم ئەم کەرامەتەم لە قاسم قەیسی بیستوە کە بە دەمی خۆی بۆی گێڕاومەتەوە[2].

وە لە مامۆستا مەلا عبداللهی چروستانیم بیست فەرمووی قاسم قەیسیم دیوە پیاوێکی ریش سپی موبارەك بو، ئەهلی بەغدا تەرجیحی ئەویان ئەدا بەسەر مرحومی (ئەمجد زەهاوی)دا.

---

(١) لە کتێبی ئیمامی شەعرانی طبقات کبری وە لە کتێبی أبهی القلائدی شێخ معروفی نۆدێیە یانی لە شەرحەکەیدا کە ئەویش هی خۆیەتی ئەفەرموێ لە ساڵی ٥٥٥ کۆچیدا حەزرەتی سید أحمدی رفاعی (قدس سره) چوە بۆ حەج روباعییەکی خوێندوەتەوە حەزرەت دەستی راکێشا حەزرەتی سید أحمد زیارەتی کرد.

(٢) ئەم کەرامەتە لە ماڵی حەزرەتی پیری دەستگیر شای سراج الدین لە بەغا نوسرایەوە بە خامەی جەنابی شێخ حسینی لبنانی سەر خەتمی بەغا لە یەکی جمادی یەکەمی ١٤٠٢ کۆچی.

قــەت بــە ملوێنــەر یـــا دەســـەڵات دار
یـــان ســـەرەك دەوڵـــەت مـــەڵیٚ بـــەختیار
کـــەسیٚ کـــە نـــەختیٚ تـــەختی بـــەختی بیٚ
وەخـــتیٚ لـــە نـــاکاو نـــەمیٚنیٚ دیـــار
کـــەی بـــەختیـــارە کاکـــە بەختیـــار
ئـــەوەیـــە دەســـتی گـــەیی بیٚ بـەیـــار
چ یـــار ئـــەو یـــارە یـــاریٚ بیٚ دیـــار
یارمـــەتی دەربیٚ لـــە هـــەر دوو دیـــار

**ك ٢٧٩:** حەزرەتی شێخی سراج الدین (قدس سره) گێرایەوە فەرمووی: یەکێك هاتە خزمەت شێخ عەرزی کرد ئەچم بۆ تاران هەندیٚ حەیوانم هەیە ئەیبەم بۆ فرۆشتن حەزرەتی شێخ ئیجازەی فەرموو، کاتیٚ کە لەویٚ ئەیفرۆشیٚ کڕیاری ئەو ئاژەڵە فرۆشیارەکە ئەباتەوە بۆ ماڵی خۆیان بە میوانی، شەو لە پاش نانخواردن و حەوانەوە لە ژوورێکی تایبەتیدا جێگەی نوستنی بۆ چاك ئەکەن، کە ئەچێتە ژوورەوە و خەوی لیٚ ئەکەویٚ، لە خەویا حەزرەتی شاهی علاء الدین دێتە سەری ئەفەرمویٚ چی ئەکەی لێرە؟ هەڵسە بڕۆ کە خەبەری ئەبێتەوە گویٚ نادات بەم خەوە دیسان ئەخەوێتەوە، دوبارە هەمان خەو ئەبینێتەوە ئەفەرمویٚ: چی ئەکەی لێرە؟ هەڵسە بڕۆ، بۆ سێهەم جار شێخ بە توندی ئەفەرمویٚ: ئەبیٚ هەڵسی بڕۆی، ئەویش یەکسەر هەڵئەسێت قاپی حەوشە ئەکاتەوە و ئەچێتە دەرەوە و لەو نزیکانەوە چایخانەیەك ئەدۆزێتەوە و ئەچێتە ئەویٚ، بۆ بەیانی کە خەبەری ئەبێتەوە گویٚ ئەگریٚ گریان و رۆ رۆیە لە هەمان ماڵ دوایی دەرئەکەوێت کوڕێکی ئەم پیاوە لە دەرەوە بوە شەو بە شارەزایی خۆی ئەچێتە ژورەوە و ئەچێتە جێگای میوانەکە و ئەخەوێت کابرای خانەخوێش کە حەیوانەکانی کڕیبو ئەچێتە ژورەکە و وا ئەزانیٚ هەر کابرای میوانە و نوستوە چەند خەنجەرێکی لیٚ ئەدات و ئەیکوژێت، کە سەری بەرز ئەکاتەوە سەیر

ئەكات كوڕەكەی خۆیەتی، ئەمیش لە بەرەكەتی ئەولیادا پارێزراو بوو وە بە سەلامەتی گەڕایەوە دواوە و ئەمەی گێڕایەوە[1].

**ك ٢٨٠:** حاجی مەلا عبداللهی (هەجمنەیی)[2] مەلای دێی (دەری) بو كاغەزێكی بەچەن نوسخە بەم لاو لادا بلاوكردبوەوە، نوسراوەكەی ئەمە بوو لەم دێیە: پیاوێك لە پاش چەن رۆژێ نەخۆشی بە رەحمەتی خوا چو دیسان بە چەن دەقیقەیە پاش مردنەكەی زیندبوەوە، وە هاتەوە حاڵی هۆش و قسەكردن، لێمان پرسی خۆ تۆ مردی، ووتی بەڵێ مردم، وتمان چیت دی؟ وتی بە حضوری خوا گەیشتم، فەرموی موسا و عیسی مردن محمد مرد عبدالقادری گەیلانی مرد هەموو ئەبێ بمرن، وە بەمانە إظهاری لطف و دڵ نەوایی بو، عەرزم كرد یا ربّی شێخ علاء الدین پیاوێ چۆنە؟ فەرموی یەكێكە لە موقەررەبان عەرزم كرد ئەی ...؟ كە ئەویش لەو جێگا ئیرشادی ئەكرد فەرموی نامەی ئەعمالی خۆی لە رۆژی قیامەتا ئەدرێ بە دەستیەوە، ئەنجا وتمان خوا ئەم رێزەی بەچی لێگرتیت؟ ووتی گەورە و بچوك میوانم هاتبێ رێزم لێ گرتون، وە خزمەتم كردون، وە لەسەر خەرمان هیچ كەسم بێ بەش نەكردوە لەوانە كە بۆ خێر هاتبن، ئەمانەی وت وە پاش ئەوە گیانی بە خوا تسلیم كردەوە (ئەنجا من كە نوسەری ئەم روداوەم بە دەمیش لە جەنابی مەلا عبداللهی ناوبراوم بیست بە

---

(١) ئەمە نوسرایەوە بە خەتی فاروقی خوشكەزام (فاروق رسول یحیی) خوا محفوظی بكات امین شەوی شەمە، ١١/ ج ١/ ١٤٠٢. (أحمد القاضی).
جارێ عەرزم كرد قوربان هۆشت پێمەوە بێ فەرموی رۆڵە ئیخلاصی خۆت نایەڵێ هۆشم پێتەوە نەبێ. قدس الله تعالی روحه.

(٢) هجبنه: دێیەكە لە لای هەزارخانی وە ئەم دو دێ واقیعەن بە بەرزاییەوە لە بەینی سەولاوا و ئەلأنە لە میانەی هەورامان و مەریواندان. دەری: دێ یەكی ئاو درەخت دارە نزیك بە چەمی گارانە.

درێژی بۆی گێڕامەوە، وە وتی لە سەردەمی نەخۆشیەکەیا تەمەسوکی بە حەزرەتی شێخ علاء الدین کردبو.

لە مامۆستا مەلا عارفی بانەیی کە مودەرسی پێشوی پێنجوین بو بیستم فەرموی: صۆفی عەزەم[1]، ئەیوت لە خزمەت شێخ بهاء الدین دا سەرکەوتوم لە خزمەت شێخ عمر سەرکەوتوم لە خزمەت شێخ نجم الدین دا سەرکەوتوم لەگەڵ ئەم پیاگا[2] سەرکەوتوم، ئەو سەلام ودروودە لە ئاسمان بۆ ئەمم دیوە گرتویانە نەم دیوە بۆ ئەوان بکرێ، وە هەر ئەم قسەم بە عەینی مەعنا و لەفظ لە پاش زیاتر لە (٢٠) ساڵ لە حاجی عوسمانی خەڵکی تەپی سەفا بیست، بەلاّم بۆ شێخ بهاء الدین گومانم هەیە لە وتنەکەدا نەك یەقین.

(١) صۆفی عەزەم یەکێ بو لە هەڵکەوتوان خاوەنی حاڵ و مقامی تەواو بو وە پیاوێکی بەناوبانگ و مەشهور بو حیکایاتی زۆرە هەرچی وتبێ هاتوەتە دی، لە حەزرەتی شێخ عوسمان سراج الدینم بیست فەرموی صۆفی عەزەم: تکلیفی لێ کردم توجّهی لێ بکەم، پێم ووت تۆ صۆفی زەمانی شێخ ضیاء الدین و مامۆ نجم الدینم و صوفی شێخی من لە تۆ چۆن توجّە بکەم، وتی ئەبێ هەر توجّهم لێ بکەیت منیش ناچار خۆم حازر کرد بۆ توجّە شێخی باوکم حازربو فەرموی رۆڵە صۆفی عەزەم غەیری توجە بە حقیقەتی الله نور السموات والأرض شتێ تری مناسب نیە، بە کورتی صۆفی عەزەم یەکێ بوە لە ئەهلی مراتب وە خاوەنی پلە و پایەیە بەرزبوە، رحمة الله علیه رحمةً واسعة.

(٢) پیاگ: پیاو، گەرمیانی بە پیاو ئەڵێن پیاگ.

ك ٢٨١: لـه جـەنابى حـاجى مـەلا علـى لاجـانى كـاتبى حـەزرەتى پـیرم بیسـت فـەرمووى: دە سـاڵێ ئـەبێ لـە دوورِوە بـووم وە مـاوەى پێـنج مـانگێ ئـەبوو لـەوێ مابوومەوە كورێكم هەیە ناوى عادل ئەو كاتە تەمەنى ٣، ٤ ساڵ بـوو شـەوێ[1] وام زانى نەخۆشە، وە نەخۆشییەكەى گەیشتە ئەندازەیە ئـەمرى خـواى بـەجێ هێنـا ئـەمجا ئاگام لێى بوو مناڵەكانى تر وەكو مصطفى‌ى كورِم و باقییەكانى تـر بـە شێوەى گلـەیى وە خـەڵكى تـر بـە شـێوەى لۆمـە و تانـە ئـەیان ووت شـێخ ئەوەنـدەى گـل دایـەوە كورِەكـەى مـرد خـۆى حـازر نیـە ئەمـە كـەى وا ئـەبێ!!! بـەڵام دایكیـان دڵ خـۆشى ئەدانەوە ئەى ووت ئەولیاى خوایە چییە با لە ماڵەوە نەبێ بـا خوامـان لـێ عـاجز نـەبێ شێخیش دڵى لێمان نەرِەنجێ هەر چەند لەمەوپێش لـە مـاڵ نـەبووە بـارى ژیانمـان لـە هەموو كاتێ چاكتر بـووە ئێستەش ئەڵبـەت وا بـۆ ئێمـە چـاكە لـە پـاش ئـەوە خەبـەرم بووەوە زۆر نارِەحەت بووم، ئەنجا چوومە خزمـەت حـەزرەتى شـێخ كـە چـاوى پـێم كەوت فەرمووى: كاكە عـەلى وا بـزانم نارِەحـەتى وەرە بـا بـزانم بـۆچى نارِەحـەتى، لـە پاش ئـەوەى جەماعـەت چـوونە دەرەوە هـەر بەنـدە تـەنیا لـە خزمـەت پـیردا مامـەوە، فـەرمووى دا بێ بـزانم چـییە مـنیش خەوەكـەم چـلۆن دى بـوو هـەر وا عـەرزم كـرد حەزرەتى شێخ فەرموى خەوەكەت راستە مـنیش زیـاتر نارِەحـەت بـووم ئـەنجا دەسـتى كردە ملم فەرمووى نارِەحەت مەبە تا پێت بڵێم ئەمشەو چومە ماڵتان بۆ سەردان وەك خەوەكـەت دى هـەرواماں دیـت، دۆعامـان بـۆ كـرد خـواى تعـالى شـیفاى بـۆ نـارد فەرمویشى ئەمە تەئریخى بۆ راگرە كە ئاوایە.

پاش سێ رۆژ یا دوو رۆژ خەبـەرم بـۆ هـات هـەر هـەمان باسـم بـەو چەشـنە بـۆ نووسرابوو.

---

(١) شەوێ: یانى لە خەوما وام بینى.

ك ٢٨٢: هەروەها جەنابی حاجی مەلا عەلی لاجانی گێڕایەوە:

کاتێ حەزرەتی شێخ تەشریفی هێنا بۆ وولاتی لاجان تەشریفی هات بۆ خانێ وە لەوێ لە ماڵی محمود ئاغای کاکەسەن رۆژێ لەوێ دەعوەت کرابوو بەلام گەیشتە ئەو ماڵە توشی سەریەشە بوو، کاتی نەهار حەزرەتی پیر هیچی نەخوارد، وە محمود ئاغا زانی حەزرەتی شێخ هیچی نەخواردوە، داوای لە بەندە کرد کە عەرزی حەزرەتی شێخ بکەم شتێك بخوات منیش عەرزی شێخم کرد لە وەلاما فەرمووی بە شەرتێ نان ئەخۆم تەوبە بکات وە تەمەسوك بە طەریقەت بکات جا من دیسانەوە بە محمود ئاغام راگەیاند ووتی هەرچی شێخ بفەرموێ حازرم وە لە فەرموودەی دەرناچم ئەنجا کە بە خزمەت شێخم عەرزکرد فەرمووی دەبڕۆ تەمەسوکی پێ بکە، لە پاش ئەوە بردمە سەر بانەکەی خۆیان تەوبەی کرد و تەمەسوکی کرد و بردمەوە خزمەتی عەرزم کرد قوربان ئەو محمود ئاغا تەوبە و تەمەسوکی کرد فەرموی بی هێنە کە بردمە خزمەتی شێخ تەشریفی کە راکشابوو راست بوەوە و هەستا دانیشت پەلی محمود ئاغای گرت، لەو کاتەدا شێخ لەبەر هەیوانی قاتی سەرەوەی خانوەکەیان دانیشتبوو پەنجەرەیەك هەبوو بۆ هۆدەکەی محمود ئاغا پێوە درابوو، فەرمووی ئەم پەنجەرەیە بکەرەوە، پەنجەرەکەی کردەوە فەرمووی سەر ببەرە ئەو دیو لە پڕ سەری هێناوە بۆ دوا شێخ دەسی نایەوە بە سەریا سەری پێ بردەوە ژوورەوە نەی ئەتوانی فەرمووی بۆ سەرت هێنایەوە پاش نەختێ زمانی تێك ئالا بە یەکدا، دیسان فەرمووی ئاخر پێم بلێ بۆچی؟ ووتی قوربان بۆنی عەجایبی لێ دێت فەرمووی وەك چی؟ ووتی قوربان وەها بۆنێکم نەدیوە؟ وەك بۆنی سەگە تۆپیو بەڵکو خراپتر ناتوانم سەری پیاکەم، فەرمووی بۆچی ئەمە دیوی خۆت نیە چەند ساڵە خۆت لەم ژوورەدا نەبوویت ووتی بەلێ واللە بەلام ئەم بۆنەم نەکردووە ئەمجا شێخ فەرمووی ئاخر ئەمە ئیشوکاروباری باشت لێ نەکردوە لەو کاتەدا هەندێ دۆلاب دوور لە ئێمەوە لەو ناوچەدا هەبوو کە شووشە شەراب و عەرەق تێدابوو، شێخ فەرمووی ئا ئەوانە هەموو هاوڕێی تۆ بوون چەند

ساڵە ڕۆژی خۆی شایەتیت لەسەر ئەدەن، ئەنجا فەرمووی خۆ ئیتر بە تەواوی تۆبەت کرد ووتی ئەریٚ واللە وەك حاڵ تیٚکچوون و شیٚوە جەزبەیەك پاڕایەوە.

قوربان شەرت بیٚ ئیتر نزیکی هیچ خراپەیە ناکەوم، فەرمووی معلوم خۆ ئیتر تۆبە؟ عەرزی کرد ئەریٚ واللە، فەرمووی دەی سەربەرەوە دیوی ژوورەکە سەری بردەوە ژوورەوە ئینجا سەری نەئەهیٚنا دواوە فەرمووی ئیٚستە چۆنە؟ عەرزی کرد قوربان ئیٚستە ئەوەندە بۆنی خۆش و سەیری لیٚ دیٚ بۆنی وا خۆشم هەرگیز نەکردووە، معلوم وەك بۆنی بەهەشتە ئەمجا فەرمووی باشە لە ماوەی تەمەنیٚکی زۆرا تۆ لەناو ئەو بۆنە پیسەدا کە ئەسەری خراپە و نافەرمانی خواوە ژیاوی تیٚیدا تەمەنی خۆت لەکیس دا ئیٚستە لەم ماوە کەمە کە گەڕایتەوە و رووت کردە خوا، خوا ئەم دەرك و ئیدراکەی پیشان دایت هەتا باشتر رووت لە خوا بیٚ و خواپەرستی بکەیت ئەم وەزعەت بۆ زیاتر ئەبیٚ ئەنجا بە منی فەرموو تۆ چاودیٚری ژیانی بکە مەیەڵە جاریٚکی تر تووشی نافەرمانی بیٚ، وە بە خۆیشی فەرموو ئەم مەئموری چاودیٚری تۆیە نایەڵیٚ بچیتەوە سەر خراپە ئەمجا شیٚخ بە منی فەرموو من ناتوانم شەو لیٚرە بمیٚنمەوە شەو هاتەوە بۆ ماڵی ئیٚمە ئیتر ئەو ماوەیە لە خانەدا بوو تەشریفی هەر لە ماڵی ئیٚمە بوو.

**ك ٢٨٣:** جاریٚ تر گیٚڕایەوە: کاتیٚ کە لە دیٚی قەلاتی موتاوا بە صیفەتی پیٚش نویٚژی خویٚن لەویٚ دانیشتبووم، بەهۆی ئەوە کە من زۆر هاتوچۆی حەزرەتی شیٚخم ئەکرد پیٚیان راگەیاندم کە من واز لە دانیشتنی ئەو دیٚیە بیٚنم بەشیٚوەی ئیمامەت، منیش عەرزی حەزرەتی شیٚخم کرد فەرمووی ناوی چەند دیٚیە بنووسە، پاشتر فەرمووی بچۆ شاری خانە لەویٚ کۆمەڵی ئەهلی خەتم زیاتر دەبیٚ، عەرزم کرد لەویٚ خانووبەرە بکڕم یا ئەرز، فەرمووی خانووبەرە بکڕە بەلاٚم بەم شەرتانە:

١- وەك ژووری تیا کرابێتەوە جێگەی ئەوە بێ چەند ژوورێکی تری تیا بکرێتەوە.

٢- هەندە ویسعەتی بێ ئەگەر ئێمە ڕێگەمان بکەوێتە ئەوێ بەو جەمعیەتەوە بۆ ئێمە دەس بدا تێیدا دابنیشین.

٣- هەرزان بێ .

ملا مصطفی ناوێ کە ئەیزانی هەوڵی خانوو لە خانە ئەدەم ووتی خانوویەك ئەزانم بیبینە ئەوجا ئەگەر ویستت خاوەنەکەی ئاگادار ئەکەین وە موعامەلەی ئەکەین، کاتێ ڕۆیشتم سەریم کرد عاشقی بووم لە راستیدا خانویەك بوو ٢٠٠٠ دوو هەزار مەتر زەوییەکەیەتی ئەمجا کاتێ مەلامصطفی ئاگاداری خاوەنەکەی کرد کە لە دێی پەسوێ[1] بوو وە بە درێژی بۆی باس کرد کابراش ووتبوی چونکە بۆ مەلا دەبێ و پەیوەندی بە حەزرەتی شێخەوە هەبێ (طاپۆ)کەی بۆ دەنێرم ئەگەر کڕی پێی ئەفرۆشم ئەگەر نەیشی ویست هەتا خانووبەرە پەیدا دەکات با لەوێ بێ، ئەنجا لە ناوبراومان کڕی بە ١٨٠٠ تمەنی ئێرانی وە کاتێ خۆی کڕیبوی بە مەبلەغێ کە ژوورتر لە ٥٠٠٠ تمەن بوو، کاتی خۆی ئاغای ئەو جێگە بۆ خۆی دروست کردبوو دیسان هەر لە دڵگیری و خۆشی ئەو خانوە ئەوەیە بە جێگەیە بەرزەوەیە، وە یەك چەم ئاوی پاك کە هەموو منالێکی سێ چوار ساڵە ناوێری پێیدا تێپەڕێ وە ئەشوبهێ بە ئاوی سەرچنار لە زۆریدا وە چەند دێ بۆ کشتوکاڵ ئاوی لێ جیا ئەکەنەوە بەناو حەوشەکەدا تێ ئەپەڕێ، لە پاش ئەوە حەوت تا هەشت ساڵی پێ چوو شێخ

---

(١) پەسوێ: دێیەکە لە لاجان کە قەرەنی ئاغای مامشی سەرەك خێڵی ئەو وولاتە نیشەجێی ئەوێ بوو.

تەشریفی هات بۆ ناوچەی لاجان و پیران[1]، وە تەشریفی هێنایە خانە[2]، وە لە خانوەکەدا لەگەڵ کۆمەڵدا مەنزڵی گرت، ئەنجا لە کاتێکا جەماعەتێ لە خزمەتیا داوای کردم فەرمووی ئادەی کاکە علی کاتێ پرست پێ کردم لە بیرتە چیم پێ ووتی؟ کە خانوو لە خانە چۆن بکڕە ووتم قوربان بەڵێ و چۆنیەتی فەرمان فەرمووی شێخم بۆ کۆمەڵ بەیان کرد.

**ك ٢٨٤:** کاك عومەرێك[3]، لە شاری سلێمانی گێڕایەوە ووتی: وەستایەکم بوو ناوی وەستا عباس بوو ئاسنگەر بوو پاش جەژنی رەمەزان تووشی کوڕەکەی بووم ووتم محمد گیان باوکت چۆنە؟؟؟ ووتی کاك عومەر باوکم رەمەزان ئەمری خودایکرد منیش زۆر دڵگیربوم و پیاوێکی موسڵمان بوو نەسیحەت و ئامۆژگاری خێر وچاکەی ئەکردم، زیاتر ئەوەم پێ ناخۆشبوو کە رۆژی لە دونیا دەرچونیم نەزانی لەگەڵیا بچم بۆ سەر قەبرستان.

هەر ئەو شەوە لە خەوا چاوم پێکەوت لێم پرسی وەزعت چۆنە؟ ووتی الحمد لله شێخ عوسمان شێخ علاء الدین قدّس سره رزگاری کردم وە هەر لەو خەوەدا هاتم بۆ ئێرە بە خزمەت شێخ گەیشتم هەرکە بە خزمەتی گەیشتم فەرمووی کاکە عمر لەبەر خاتری تۆ وەستا عباسمان نەجات دا.

الرؤیا الصالحةجزء من ستة وعشرین جزأً من النبّوة.

مژدەت تاریکی دڵ ئەڕەوێنێ    إنّا للهی لە خەم ئەخوێنێ

---

(١) پیران: بە چەن دێیەك ئەڵێن لەوبەر ئاوی دربکە، خانە و زەرگەتەن و شین ئاوی و چەندەها دێی تر عائدی پیرانە قسمێکی ئاغەواتن، وە بەشێکی ساداتن، بەلام بەر لاجانەوەیە، ئەنجا لە لایەکەوە کەوتوەتە سنوری عێراق وە لە لایەکییەوە مەنگوڕ.

(٢) خانە: جەرگەی جێگەدارییە، لەوێوە تا چەمی هۆمەران، دوو کاژێر ئەبێ بە پیادە رەوی، کە دێیەکە لە لاجان تا ئێران.

(٣) بۆیە نوسیومە کاك عومەرێك ووتی ناوم ئاشکرا مەکە بە نیشانە نەبێ.

**ك ٢٨٥:** له جه‌نابی فاضل مامۆستا مه‌لا محمدی ئه‌مینی مدرّسی زووی کانی سانانم بیست به حضوری شێخ محمودی[1]، کانی سانانی کوڕی شێخ محمد ئه‌مین که فه‌رمووی: هۆی ته‌مه‌سوك و یه‌که‌م جار تووشبوونی جه‌زبه‌ی شێخ محمود ئه‌وه بوو داوای توصیف و نیشانه‌کانی ده‌ستگیر و مورشیدی راستی لێ کردم کاتێ که ئه‌و به هۆی ئه‌وه باوکی خه‌لیفه‌ی شێخێکی تر بوو، وه ئه‌م زووتر په‌یوه‌ندی و عه‌لاقه‌ی له‌گه‌ڵ فه‌قێکاندا بوو به زۆری شه‌و و رۆژ له‌ناویاندا بوو قسه‌یان بۆ ئه‌کرد منیش به‌یانی حه‌قیقه‌تی مه‌شیخه‌تم بۆ کرد من پێم ووت تۆ نابێ ته‌نیا به‌وه بڵێی نوێژ بکه‌ن و رۆژوو بگرن و حه‌رام مه‌خۆن ئیتر پێت وابێ ئه‌مه وه‌زیفه‌ی شێخیه‌تیه، ئه‌وه وه‌زیفه‌ی عوله‌ما و زانایانی شه‌رعه.

ئه‌وه زانایانی شه‌ریعه‌ت له خه‌ڵکی حاڵی ئه‌که‌ن. بڕۆ بۆ دووڕووه ئه‌گه‌ر شێخ فه‌رموی بڕۆ نوێژ و رۆژوو هه‌موو واجبه‌کان به‌جێ بهێنه ته‌مه‌سووك مه‌که‌ره‌وه حه‌ق ئه‌وان ئه‌وه‌یه به تصرّوفی باطینی دڵت بێننه سه‌ر کردنی ئه‌و واجباتانه محبه‌ت و خۆشه‌ویستی خوا له دڵتا جێ بکاته‌وه دنیات له دڵا ناخۆش و بێ محبه‌ت بکات گه‌رمییت له‌باره‌ی ئاخیره‌ته‌وه تیا دروست بکات نه‌مامی خۆشه‌ویستی کرداری شیرین و ئه‌عمالی صالحه‌ت له دڵا بڕوێنێ تۆوی محبه‌ت و مه‌عریفه‌تی خوایی له ده‌روونتا بچێنێ، رووی دڵت بکاته قیبله‌ی حقیقی، ره‌فاقه‌تی صاڵحانت له لا شیرین و محبوب بکات، هه‌ڵسان و دانیشتنت بخاته میزان و ته‌رازووی شه‌ریعه‌ته‌وه، وه‌زیفه‌ی مورشید و ده‌ستگیری به‌ڕاسی ئه‌مه‌یه وه له کاتی مه‌رگا فه‌وری بگاته سه‌رت محافظه و پارێزگاریت بکات، له شه‌ڕی شه‌یتان تا به ئیمان و باوه‌ڕی بێ شك و ته‌ردیده‌وه

---

(١) شێخ محمود: پیاوێکی خۆشه‌ویست و کراوه و قسه خۆش و پیاوێکی پڕ له گه‌رمی محبه‌ته، وه له دوای تمسّك ئه‌نواعی شتی غرایب و عجایبی ئه‌بینی. وه شێخ محمد ئه‌مینی باوکی به‌ناوبانگ بوه زۆر به که‌ڵك بوه بۆ موسڵمانان وه زۆر پیاوێکی خاوه‌ن که‌ره‌م و سه‌خاوه‌ت بوه رحمهم الله جمیعاً.

بمرێ ئەوجا ووتی لەو کاتەدا کە ووتت لەسەرەمەرگا بگاتە سەرت لە دڵی خۆما ووتم جا چۆن لەوێوە ئەزانێ وا من ئەمرم وە چۆن لە لام حازر ئەبێ!!!

ئیتر فەوری حەزرەتی شێخ عوسمان م دی بە عەبایەکەوە حازر بوو لەبەردەمما دانیشت وە ووتی ئاوا حازر ئەبم ئیتر من ئاوا تێکچووم و مجذوب بووم ئیتر بەدوای ئەوا وازی لە پەیوەندی و خزمەتی دەراوێش هێنا و تمسکی بە طەریقەی بەرز و بڵندی نقشبندی کرد. "السّعيد منْ سعِدَ في بطن أمّهِ".

دەس بدە بە دەس شارەزای رێگە
بەسەلامەتی ئەگەیتە جێگە
نەقشبەندییە قافڵە سالارن
زۆر پایە بەرز و دەسەڵات دارن
چون زیکری قەلبی لە لایان دەئبە
کاروان نمێنی ئەبەنە کەعبە
هەڵقەی زنجیرەی ئەمانە وایە
شێران گشت ملیان لەم حەلقەدایە
زنجیرێ کە شێر لە هەڵقەیا بێ
رێوی بە حیلە چۆن بەلایا بێ!!!

**ك ٢٨٦:** فەرمودەی کاکە شێخ مەولانا خالیدە: فەرموی کاتێ شێخی باوکم چوبوە بیارەی شەریف من و کاکەم لە دووڕووە بووین پیاوێ هات و ناوەکەشی دیاری کرد، ووتی فلان کەس ماوەیە زۆر بوو ژنی هێنابوو منالی نەبوو چوبوە خزمەتی حەزرەتی شێخی ضیاء الدين (قدّس الله سرّه العزيز) داوای دۆعای منالی کرد خوای بێ هەمتا کوری پێ بەخشی، فلان کەسی تر لە زەمانی باوکتان چەند ساڵ بوو ژنی هێنابوو ئەویش منالی هەر نەبوو بوو چوە خزمەت باوکتان دۆعای بۆ

نووسی خوا ئەولادی پێ خەلات کرد منیش ئەمە چەن ساڵە ژنم هێناوە (وە لەو کاتەدا ژنەکەی حازر بوو) منالمان نیە دۆعام بۆ بنووسن شایەد خوا لەمنالّ بێ بەهرەمان نەفەرموێ، کاکەیشم شێوە سێ گۆشەیەکی[1] کە بە قەبزە نوشتە[2]، ناو ئەبرێ بۆ نووسی، وە لە پشتەکەی نووسی یا عوسمان فەرمووی ئەمە بگرە لەموشەمما لە ئاوی هەڵ بکێشن لە ئاوەکەی بخۆنەوە ئەنجا بیگرنە بەرگ دوایی بە کشتەك کە لە بەکرەی رەش و سپی پێك هاتبێ بۆی بابدەن، هاوسەرەکەت راست و چەپ بیکاتە ملی لە ژێر جلەکانی یەوە لەسەر گۆشتەوە بەجۆرێکی وا دۆعاکە بکەوێتە لای کەلەکەی، ئەمجا لە پاش ماوەیە ئەگەر دۆعاکە ون بوو نەبۆی بگەڕێن نەبێنەوە کە بویشن بیان هێننەوە، پاش خوا حافیزی کە ئەچنەوە ماوەیەکی پێ ئەچێ دۆعاکە نامێنێ ئیتر ئەوانیش نایەنەوە لە ساڵی ئایندەدا هاتنەوە دوو کوڕیان پێ بوو لە لاتەنیشتی هەردوو منالّەکە تا ملیان وێنەی ئەو کشتەکە دیار بوو، وە هەروەها وێنەی نوشتەکە لە لا کەلەکەی هەردوکیان بە ئاشکرا دیاربوو، وە هەموو خوێندەوارێ یا عوسمانی لەناو نەخشەی دۆعاکەدا لە لاتەنیشتی هەردووکیاندا بۆ ئەخوێندرایەوە، آمنا بالله وقدرته ونؤمن بكرامة أولياء الله وأثبتنَ للأولياء الكرامة[3], ومنْ نفاها فآنبذن كلامه.

ك ٢٨٧: جارێ کوڕێ هات وەلامی نوسراوی خۆی هێنا کە بۆ خزمەت شێخی نووسیبوو وە پرسی کرد بوو بۆ رەزامەندی بۆ هێنانی کچێکی ناوبراو لە گەڕەکی خۆیان، وە حەزرەتی شێخ موافقەی فەرموو بو بەم جۆرە نووسیبوی فلان ناو

---

(١) سێ گۆشە: مثلث.

(٢) شێوە قەبزە نوشتە ئاوایە:

(٣) ئەولیای خودا کەرامەت دارن — کات هەیە بە شت کە ئاگادارن
ئەوە کە بلّێ کەرامەت نیە — وێلّی کە قسەی، شتی وا چیە

موبارەکە بیهێنە وە لە ژێر ناوی ئافرەتەکەدا نووسیبووی قهوة[١] حبّة حلو[٢] کوڕەکە ووتی ئەمە مانای چیە؟ لەو کاتەدا نەمزانی کاتێ ڕۆیشت ووتم بگەڕێرەوە هاتەوە لێم پرسی:

ئەم کیژە ڕەش تاڵەیە؟ ووتی بەڵێ.

ووتم کورتە بالایە: ووتی بەڵێ

ووتم خوێن شیرینە ووتی بەڵێ، ووتم فەرموودەکەی حەزرەتی پیر ماناکەی ئەمەیە کوڕەکە پێکەنی و پێی خۆشبوو ڕۆیشت منیش ئەڵێم.

شاهم لوتفی کرد لە ڕووی مژدەوە وەصفی یاری کرد لە ژێر پەردەوە[٣]

**ك ٢٨٨:** لە جەنابی حاجی ملا صاڵحی پەڕخیم[٤] بیست فەرمووی: لە خەوا بە شەرەفی حضوری دیداری حەزرەتی ڕەسوولی ئەکرەم شادبووم فایز بە فەیزی لطف و مەرحەمەتی بووم، عەرزیم کرد ئێمە ئومێدمان هەر بە تۆیە، هاوار و دادم هەر عائید بە تۆیە فەرمووی نەء ئێوە ئەبێ تسلسلتان بێ ئەمجا عەرزم کرد دەی بە کاکە عوسمان بفەرموو با هۆشی پێمەوە بێ وا ئەزانم ئەوەی لێ قبووڵ فەرمووم.

---

(١) قەهوە: ئیشارەیە بە ئەسمەری، حبّە ئیشارەیە بە کورتی بالا.

(٢) حلو: بە ڕەزا سووکی خوێن شیرین، هێما: ڕەمز و ئیشارەتە.

(٣) شاهم لوطفی کرد لە ڕوو بەشارەت وەصفی یاری کرد بە چەن ئیشارەت

(٤) ملا صاڵح: الحمد لله پیاوێکی زۆر صاڵحە خاوەن وەرع و تەقوایە هەندێ شتی بۆ دەست دراوە وەلی ڕوو دراوە، ئەولیا کۆمەکی زۆریان پێ کردوە بۆ کەم کەس ئەوە کراوە، ئەگەر خوا مەیلی فەرموو باسیان ئەکەین هەرچەند ووتراوە:

که من نەخلی مرادم بێ سەمەر بێ بە من چی جوملە عالەم باخی بەر بێ

بەڵام دۆست دەست ڕوویبو بێ بە کەڵکە دیسان ذکر العیش نصف العیش.

**ك ٢٨٩:** کاکە شێخ محمودی ناوبراو ماوەیە پاش ئەوەی وازی لە خەلیفەیەتی هێنا و محبەت و خۆشەویستی زیادبوو، ووتی زاتێکی خوێندەوار مەلای دێیەك بوو لە نزیکی ئێمەوە کە پێی ئەڵێن سەردۆش[1]، بێ فرمانی مامۆستا مەلا محمد ئەمینی زۆر ئەکرد رۆژێ مامۆستا لە ماڵ نەبوو چووبوو بۆ سەفەر مامۆستای سەردۆش[2] هاتبوو بۆ کانیسانان گەڕابوو بەناو کۆمەڵێکا ووتبوی مامۆستا هەرچیتان پێ ئەڵێ لە بارەی فلان بابەتەوە هەموی وانیە ئێوەش باشن و دڵتان نارەحەت نەبێ بە کورتی بارە و ئارەزووی ئەوان چی ووتبوو ووتبووی، کە بۆیان گێڕامەوە زۆر داخم خوارد ئەنجا ناوبراو لە هەمان کاتا چەن دانەیە کاوڕ و مەڕی لەو دێیە بردبووەوە، والله أعلم بەکڕینیان، شەو لە خەوما شەخسێ بانگی لێ کردم بۆ حەوشە چوومە دەرەوە، وتی سەیری ئەم دوو گورگە وەرە بڕۆ لێرەوە لەگەڵیان تا ئەگەیتە دەرەتفێ لەوێوە رێگەی سەردۆشیان نیشان بدە با بچن مەڕەکانی (فلان) بخۆن، منیش ووتم با بڕۆین گورگەکان هاتن لەگەڵما تا گەیشتمە دەرەتفێ[3]، ئەمجار ووتم ئێوە لەم شێوەوە

---

(١) سەردۆش: دێیەکە لەناو دێی دەرەتفێ وەسەر ئەکەوێ بە چەم و دۆڵێکا ئەمجا پاش ماوەیە لائەدا بە دەستە راستا بۆ لای لێو و مڕانە بۆ سنوری پێنجوێن بەلام یەکسەر سەرئەکەوێ تا ئەگاتە سەر (شان) لەوێدا دەشتێکی فراوان و گەورەیە وە تەنیا دێیە و بەرزە لە پشتی ئەو دێیە کێوێکە پێی ئەڵێن (میراجی) زۆرە لە بەهارا قارچك و رێواس و پیچکی.

(٢) مامۆستای سەردۆش: لە کاتی خۆیا فەقێی مامۆستا مەلا محمد ئەمین بوە چەند ساڵ دەرسی لەلای خوێندوە بەلام یاخوا بێ وەفایی و سپڵەیی لە کەسا روونەدا.

(٣) دەرەتفێ: دێیەکی گەورەیە بۆ کانیسانان کە ئەویش دێیەکە لە مەریوان پشتیان بە شاخەوەیە قەلای مەریوان بەو بەریانەوەیە، میانەی ئەو دوو دێیە و قەلا سەعاتێ ئەبێ، زێی زریبار کەوتۆتە میانەی قەلا و دێهاتی بەگزادە ئەمجار دوو چیرۆکی بە سوود هەیە کە لە میانەی باسی سەردۆش و دەرەتفێ هاتەوە یادم بۆ پتەوی هێزی بڕوا و دڵ خۆشی لەم پەراوێزەدا ئەی نووسم: یەکەم: خوا لێخۆشبوو ملا رسول کە مەلای دێی گۆڵە بوو لە قەزای پێنجوێن پیاوێکی رەزا سوك، سەخی سروشت شیرین رەوشت بە دین و هەمیشە رووخۆش و بەشوش بوو، دوو کوڕیشی بە ئاو

خنکان زۆر بە ئارام خۆڕاگر و صابر بوو، ڕەحمەتی خوای لێ بێ بۆی گێڕامەوە فەرموی ماوەیە لە دێی سەردۆش فەقێ بووم مامۆستاکەم ناوی مامۆستا مەلا سلێمان بوو خەڵکی دێی دەرەزیارەت بوو کە نزیکی سەرشیوی سەقز بوو لە پرسیارێکا ناکۆکی کەوتە میانەی مامۆستای دێی دەرەتفیێ کە مەلا حسنی ناوبو کە خەڵکی دێی زیارەت بوو لەسەر شیوی سەقز، وە لە میانەی ئەم مەلا سولەیمانەدا وەچەند نامەیەکیان لە میانەی یەکترا هاتۆچۆ پێ کرد، دوایی مامۆستا مەلا سلێمان بە منی ووت هەستە بچین زیارەتی مەلا حەسەن بکەین لە دەرەزیارەت وە لەم پرسیارەدا ڕووبەڕوو دانیشین و لێی بکوڵینەوە، لە خزمەتیا چووین وە کتێبێکی لەگەڵ خۆی هەڵگرت کە بەرگی سێیەمی کتێبی ئیعانە بوو لە پاش گەیشتن و حەوانەوە باس هاتەوە ناو، مامۆستام مەلا سلێمان بەڵگەی بە إعانە ئەهێنایەوە، بۆ سەلماندنی داواکەی خۆی بەڵگەی بە فەرموودەی خاوەنی ئیعانە هێنایەڕوو، مامۆستا ملا حسنی دەرەزیارەت لەوەلاما ووتی من شێخی ئیعانە بە قوتابی خۆم ئەزانم کە ئەمەی ووت مامۆستا مەلا سلێمان هەستا ووتی تۆ کە جەسارەتت وابێ قسەی وا بێ ئەدەبی وا دەربارەی زاتی ئاوا دەربڕی ئیتر بۆ ئەوە ناشێ من قسەت هیچ لەگەڵ بکەم بەرەو دێی سەردۆش گەڕاینەوە، ئەمجا هەتا چووینەوە ناو دێ مامۆستام مەلا سلێمان هەر گریا.

وە من خوم پێوە گرتبوو کە دەرسم ئەخوێند ئەهاتمە قەراخی دێیەکە داری گەورە گەورەی تێدابوو سێبەری خۆشی هەبوو، ئەوەی ئەم خوێند لەبەریشم ئەکرد یان کۆششم لە وانەکانمدا ئەکرد، کاتێ ماندوو ئەبووم ئەخەوتم لە دوای یەك دوو ڕۆژ دوای ئەم ڕووداوە لە خەوا چاوم پێکەوت ٣ سێ سوار هاتن ئەوەی ناوەڕاست زاتێکی بە شکڵ و سامدار بە قیافەیەکی بەڕێزانە مێزەرێکی سپی بەسەرەوە بوو ریشی سپی عەبایەکی بە شانەوە بوو، بەڵام بە خۆوە بوو زۆریش سیمایەکی نورانی و جوانی بوو نیشانەی ئەوە بوو کە یەکێکە لە گەورە پیاوان.

پرسیارم لە یەکێکیان کرد ئەمە کێیە؟ ووتی ئەمە خاوەنی کتێبی ئیعانەیە دانەری ئەو کتێبەیە خێرا هەستام و بە ئەدەب زیارەتم کرد.

ووتم قوربان مامۆستا مەلا سلیمان زۆر دڵسۆزی تۆیە تەشریفت لادە بۆ ناو دێ فەرمووی لە منەوە سەلام بە مەلا سلیمان بگەیەنە منیش ئەوم خۆش ئەوێت، بە پەلەم لانادەم ئەچم ئەو مەلا حەسەنە بێ سەلیقەیە دەربەدەر ئەکەم.

سەرکەون تا ئەگەنە سەرەوە بچنە ناو مەڕ و مالآتی (سەردۆش) لەویَ مەڕەکانی مامۆستا بخۆن ئیتر دەم لەمالّی هیچ کەسیَ نەدەن شیَوەی گویَرایەلّیان پیشان دا و رۆیشتن، کە بە ئاگاهاتم سەرم سڕما لەم خەوە، لە پاش نان و چای خواردن مەیلی چوونی (قەلا)م کرد ووردە وودرە کەوتمە سەر ریَ تا گەیشتم بە کۆمەلّیَ لە خەلّکی سەردۆش کە بارەداریان ئەبرد بۆ سەر قەلا بۆ فرۆشتن دەستوری هەموو رۆژیَکیان

---

جەنابی ملا رسول خۆشنودی خوا لِیَ سویَندی خوارد فەرمووی کەیخسرەو بەگ مالّیَکی لەدیَی دەرەتفیَ بووە دەسەلآتدار و بەهیَز بوو لەوەپیَش وەك خولآمی ملا حسن وابوو، لە دوای سیَ چوار رۆژ دوای ئەو خەوە لەگەلّ مەلا حەسەن بەینیان تیَکچوو ووتی حەتمی نابیَ لیَرەبی هەستا چووە دیَی دەرەزیارەت لەویَشەوە چووە دیَیەکی تر، ئەنجا لە دیَی دووەمەوە باری کرد چوو بۆ ناوچەی تیلەکۆ ئیتر دوای ئەوە لیَی بیَ ئاگامام نازانم چی بەسەر هات.
دووەم: ئەمەیە لە خوار دیَی دەرەتفیَ سەیوانیَ هەیە، لەو قەبرسانەدا کەلەکو شەخسیَ هەیە پیَی ئەلّیَن کابل، کابولی مەریوان شۆڕەتیَکی گەورەی هەیە، وەئەو زاتە ریَز و نرخیَکی تەواوی هەیە لەو ناوچەیەدا، لەناو جەرگەی دیَکەوە تا کابل ۷ تا ۸ حەوت تا هەشت ووردیلە ئەبیَ و ناگاتە دە دەقیقە حاجی عبدالله فرج لە پیَنجویَن کە پیاویَکی ئەمین و بەدین و قسە رەوا و وەرع پیشە بۆی گیَرامەوە ووتی:
مالّمان لە دەرەتفیَ بو و پیاویَکی تیا بوو صۆفی حسین ناو مەنسوبی حەزرەتی پیری قەرەچیَوار شیَخ حسن بوو قدس الله سره ئەو پیاوە زۆر گریانی هەبوو وە مرۆڤی صالّح و پیاوچاك بوو، وە من هیچ بە نەخۆشی ئەوم نەزانی بوو، سویَندی خوارد عیلمم نەبوە کە ئەم پیاوە نەخۆشی بووە یا نەی بوە بیَ ئاگا بووم لە وەزع و حالّی دیم لە خەوا چرایەکی رووناك وەك لۆکس لەناو قەبرسانی کابلەوە هات و گەیشتە ناو دیَیەکە، ئەمجا چووە مالّی صۆفی حسین، چووە ژوورەکەیان دوای ماوەیەکی کەم گەڕایەوە وە چرایەکی بە شیَوەی چرا قتوولەی لەگەلّدا بوو گەڕایەوە بۆ ناو قەبرسانەکە وە چرا قتوولەکە بەدوایەوە بوو، لە ناکاو خەبەرم بووەوە، دەستم کرد بەوە کە خەوەکە بگیَرمەوە بۆ کەسانی مالّی خۆمان کوتوپڕ گریان و زاری لە مالّی صۆفی حسین بەرزبووەوە، کە قسەکەم تەواو نەکردبوو ئیَشتا خەبەریاندا صۆفی حسین کۆچی دوایی کرد و بە رەحمەتی خودا شادبوو إنّا لله وإنّا إليه راجعون.

بوو، گوێم گرت یەك یەك و دوو دوو پێکەوە هەریەك لە باریکەوە قسە ئەکەن، دوو کەسیان باسی بەخت و چارەنوسیان ئەکرد، وە ئەیان ووت بە هەوڵ و کەسابەت نیە بە بەخت و ناوچاوانە، یەکێکیان ووتی باوکم سەیری کە ئەگەر بە بەخت نیە دوێنێ مامۆستا چوو لە کانیساانان چوار پێنج سەر مەڕی کڕی هێنایەوە ئەمشەو گورگ چوبوە ناو رانەکە تەنیا مەڕەکانی ئەوی زگ دڕی بوو، ئیتر زیانیان لە ماڵی هیچ کەسی تر نەدابوو گوایا ئەمە بەخت و شانس نیە چییە؟ کە ئەمەم بیست خەوەکەم بە خەوەێکی ئەصڵ و راست تصدیق کرد وە زانیم ئەمە تەمیە و تۆڵەیەکی خواییە.

بـرا دەرچـۆ لـە چـۆڵی دەشـت و سـارا
مەتـــاع و ئـاوەدانی وا لـــە شــارا
دڵــی بێ هــۆش و ئــاگا چۆڵەوانـــە
ئەگــەر گــۆ کـات ئـەوێ شـاری دڵانـە

**ك ٢٩٠:** خوا لێخۆشبوو میزرا ئەحمەد گێڕایەوە فەرمووی: جارێ لێم پرسی ووتم میرزا ئەحمەد جاران تۆم ئەدی ئا بەم ئەندازە گەرم و گوڕە لە خۆشەویستی شێخدا نەئەبینیت بەڵام ئێستە زۆر بە گەرم دێیتە بەرچاو ئەمە هۆی چییە؟

لە وەڵاما ووتی من جارانیش هەر شێخم بە شێخ زانیوە ئەمما بەم خەستیە نا، ئەمجا بە درێژی باسی کرد، ووتی من تا شێخی علاء الدین قدس سره کۆچی خێری نەفەرمووبو بۆ خزمەت رەفیقی أعلی لە ٣٠ سی ساڵ زیاتر بە شێوەی خزمەتکاری ئەو زاتە لە بیارەدا بووم، محبەت و خۆشەویستی بە چەشنێ کاری لە من کردبوو بەلامەوە موشکیل بوو بتوانم خۆم تەسلیم بەمورشید و شێخێکی تر بکەم لەبەر ئەوە جارێك عەرزم کرد قوربان دەستگیر و مورشید ئەتوانێ هەندێ لە موریدی خۆی بۆ خۆی بێ وە دوای کۆچ و وەفاتیش بۆ خۆی پەروەردەیان بکات نەیانداتە دەست کەسی تر؟ فەرمووی شێخی باوکم لە دوای خۆی (قدس سره) سێ کەسی بۆ خۆی

هەڵگرتوە؟ تەسلیم بە کەسی نەکردوون یەکیٚ لەوانە حاجی عبداللە وەڵزی بووە، ئەزانم ئەڵێی چی؟ تۆ بڵیٚ منیش لە پاش خۆم تۆم بۆ پەروەردە نەکریٚ بەڵام بە مەرجیٚ نەك عوسمان بە مورشید نەزانی ئەمجا من هەر لەسەر ئەو رەسم و رەویە بووم تا لەم دواییەدا چووم بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ بۆ دووڕووە کاتیٚ گەیشتمە سەر کەلی کەماجاڕ [1] هەر لەوێوە تا چاخانەکەی قەلاجیٚ بەم دووچاوی سەرە ئەمبینی ئەم شێخە لە عالەمی میثال توجّهی کرد وە بە هەر کەس ئەگەیشت توجّهی لیٚ ئەکرد، کاتی خۆی بەندە لە حەزرەتی علاء الدینم بیست فەرمووی هەرکەس ئازاری دابم وە خەیانەتی لیٚ کردبم گەردنی ئازاد بیٚ بێجگە لە دوو کەس نەبیٚ، یەکێکم لەو دوو کەسە ئەناسی چاوم لیٚ بوو بەلای ئەو شەخسەدا تیٚ پەڕی موبالاتی پیٚ نەکرد و توجّهی لیٚ نەکرد، کەسیٚ کە ئەزانیٚ ئاگای لێیەتی وە کەسیٚ نەزانیٚ با بزانیٚ.

**ك ۲۹۱:** لە لایەن بەختەوەری دڵی بە ئاگا کاکی بە هیممەت ملا عبداللە کە ناوبانگی ملا عبداللەی لاجانییە فەرمووی:

ماوەیەك بە ئاواتەوە بووم کە حقیقەتی رابیطە بزانم تا کاتیٚ دانیشتبوم لە پڕ وام هاتە بەر چاو کە جێگەیەکە وەکو جێی طەبابەت هاتە نەزەرم لەم لاوە مەوقعیٚ بوو جێگەی پزیشك بوو، وە دیتم پزیشکەکە حەزرەتی شێخ بو وە ئەولاش مەوقیعیٚ بوو مقامی رەئیسی صحە بوو، وە رەئیسی صحەش حەزرەتی رسول الله ﷺ بوو وە ئەم دی بیٚ ووچان حەزرەتی پیر مراجعە بە حەزرەتی رسول الله ﷺ ئەکات وە ئەگەڕێتەوە بۆ جێگەی خۆی، وە من ئەم حاڵە ئەبینم ماوەیەکی زۆر لە ناکاو دیم حەزرەتی شێخ بەرامبەرم وەستاوە قسەم لەگەڵ ئەکا وە من وەك شێخ ئەبینم شێخە ئەشبینم شێخ

---

(۱) ماوەی میانەی کێوی کەماجاڕ تا چایخانەی قەلاجی، ٥ پێنج سەعات ئەبیٚ، بەڵام ماوەی سیٚ سەعاتیٚ وەهایە ئەگەر رێبوار یەك ئانی چاو بنیٚ بە یەك دا دەسبەجیٚ سەرەوژێر ئەکەویٚ وە بەڵکو جێگەی وای هەیە کە کەوتنی خەتەری ژیانی لەبەر تەنگەلانی و ناڕێکی رێگە و بانی ....

ئاوێنەیە، وە لەو ئاوێنەدا بە هەموو شێوە و شکڵ و صورەت حەزرەتی رسولی ئەکرم ﷺ ئەبینم کە تێیدا ئاشکرا و دیارە، وە حەزرەتی شێخ دەستی درێژ کرد بۆ ئەو عەکس و شێوە وە فەرمووی ئەمە حەقیقەتی رابیطەیە.

بە ئاوی فەیضی مەسینەی سینە
دڵ بشۆرەوە لە چڵکی کینە
بیماڵە پاك پاك تا وەك ئاوێنە
لەوا دەرکەوێ وێنەی بێ وێنە
ئەو کاتە ئیتر لە خەم ئازادی
بە پایەی بەرزی سەعادەت شادی(۱)

**ك ٢٩٢:** جەنابی بەڕێز و شیرین لە دڵا جەنابی صۆفی عبداللە گێڕایەوە فەرمووی: لەم نزیکانەدا شەوێك لە دیداری موبارەك و سایەی شیرین و جەماڵی حەزرەتی رسول اللە ﷺ شادبووم و عەرزی ئەو عەزیزەم کرد لوتفێکم لەگەڵا بکە، بە زمانە شیرینە نوورینەکەی فەرموودەی فەرموو تۆ عائدی عوسمانی.

**ك ٢٩٣:** دووبارە کاکە عەولا فەرمووی: لە خزمەت حەزرەتی پیر شاهی سراج الدیندا بووین لە بەغا، فەرمایشتی فەرموو کە بچین بۆ زیارەتی حەزرەتی غەوسی گەیلانی (قدس سرە) کە گەیشتینە مەنزڵ زیارەتمان بەجێ هێنا، لەو کاتەدا بەدڵ عەرزی ئەو حەزرەتەم کرد کە بۆ فلان فرمانی شێخ عوسمان کۆمەك بفەرموو هیممەتتان بخەنە کار، فەرمووی ئێمە کاری خۆمان داوەتە دەست عوسمان کاتێ هاتینە دەرەوە و تەشریفی ئەفەرموو بۆ دیدەنی یەکێ لە دۆستان لەو شوێنە پیرۆزەدا،

(۱) قال عليه الصلاة والسلام (المرأُ مع منْ أحب) اللّهم أحبابي أحبّتك فاجعلني معهم في الدارين وخصّصني بما خصّصتهمْ به وأبغض إليّ أعدائك أبد الآبدين يا ولي العالمين.

به هێواشی سەری هێنایە نزیکەوە فەرمووی: تۆ پاڕایتەوە و دۆعات کرد بۆ کوڕی ئێمە ئێمەش دۆعامان کرد بۆ کوڕەکەی تۆ.

**ك ٢٩٤:** ئەم ویست بچم بۆ دووڕووە برایەکم بوو حاجی ئەمین ناو کچێکی هەبوو خاتون ناو پێی ووتم مەلای برام تۆ ئەچی بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ دۆعایەك بێنە بۆ خاتون تەبیعەت ئاڵۆزە منیش کە ڕۆیشتم بە خزمەت حەزرەتی پیر گەیشتم لە کاتی خواحافیزیدا عەرزم کرد بۆ دۆعای برازاکەم، شێخ زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: بیدەن بە شو و تەبیعەتی خاس ئەبێ وە ئەو خاتون ناوە خاڵێ وا بە ناوچاوییەوە من کە برازام بوو نەم ئەزانی، ووتم قوربان تۆ ئەزانی کە هاتمەوە تەماشای خاتونم کرد خاڵێکی لەناوچاوانیا کوتابوو.

چەند ساڵێکی پێ چوو خاتون دۆعاکەی گوم کرد ووتیان ئەچیتەوە بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ دۆعایەکی تر بێنە بۆ خاتون، کاتێ گەیشتمە خزمەتی ئەو سەماحەتە عەرزم کرد قوربان برازایەکم هەیە (خاتون) ناو دۆعایەکت بۆ ناردوە گومی کردوە یەکێ تری بۆ بنێرە تەبەسومی کرد فەرمووی سبحان الله خاتون ناو حەز لە کوتانی خاڵ ئەکەن، خاڵێکی لەناو چاوانیا کوتاوە، ووتم ڕاست ئەفەرموی ئەوساڵەیش وات فەرموو[1].

پەیداکە بۆ دڵ دیدە دووربینێ
نەبینراو هەروەك بیزراو ببینێ
ئەیدەن بە ئیخلاص لە کۆگای چاکە
لە ڕۆژ بە ئیشێ بە شەو بە شینێ

---

(١) کاتی خۆی لە بیارە ئەم خوێند، هەر کاتێ شێخی مرحوم حەزرەتی شا علاء الدین (قدس سره) یان شاهی سراج الدین تەشریفیان بهاتایە ئەمزانی یەکێکیان تەشریف ئەهێنن بەڵام نەم ئەزانی کامیانە چونکە لە هاتنیان ظهورێ ئەبوو (المؤمن بنور الله ینظر).

**ك ٢٩٥:** لـه بـرای عـەزیز و خۆشـەویستم مـەلا ئەحمـەد ئیمـامی دێـی (کـوڕی گەپڵە)[1]، م بیست وتی ماوەیە بوو بە ئەنـدازە جێگـە نینـوکێ لەسـەر شـانم ئێشـی تیـا بووە ئەو ئێشە ماوەیە بوو پەیدا ببو، وە لە سەرەتای پەیدابونیەوە دو سێ جـار چـومە دوڕووە روم نەبو عەرزی شێخ بکەم سەری سێهەم جار کە چوین و گەیشتینە ئەوێ شەو بوو داخڵی ژووری خانەقا بـوین چـرا کوژابـوەوە خـەتم ئـەکرا هـەروا چـوم لـە لایەکەوە دانیشتم، زوری پێ نەچوو شێخ تەشریفی هات بۆ خانەقا بـەدەم ڕۆیشتنـەوە پەنجەی لەسەر شانم وە لەسەر ئەو جێگە کە ئێشەکەی تیا بوو دانا فـەرموی ئـەو ئێشـە ڕۆیشت وە ئیتر جارێکی تر نەم دیەوە لله الحمد والمنة.

**ك ٢٩٦:** وە هەروەها جارێ تر لەگەڵ حسین مام رەسوڵ و ژنەکەی لە خزمەتیا بوین لە کاتی گەڕانەوە شێخ فەرمووی بە حسین ئەگـەر ئیشێکتـان هەیـە بیڵێن؟ ووتی قوربان بۆ زیارەت هاتوین فەرموی ئەگەر ئیشێکتان هەیە بڵێن بزانم چیە؟

ووتی قوربان بۆ زیارەت هاتوین و شێخ ئەگەر مەرحەمەت بکـات دوعایـەکیشمان بداتێ بۆ ئەولاد: شێخ رووی کردە ژنەکـەی حسـین وە فـەرمووی ڕۆڵـە تـۆ حامیلـەی ژنەکە عەرزی کرد قوربان حامیلە نیم، فەرموی حـەملت هەیـە ژنەکـە ئینکـاری کـرد وە وتی نیمـە بـەلام شـێخ هـەر فەرمویـەوە کـە تـۆ حامیلـەی بـە کـوڕتی ئیجازەمـان وەرگرت، وە گەڕاینەوە لە ڕێگەدا بۆ نصیحەت بـە ژنەکـەم ووت بـۆچی ئەوەنـدە لـە خزمەت شـێخ دا ئینکاریـت کـرد؟ ووتی ئـەی بڵـێم چی ئەفـەرموێ تـۆ حامیلـەی، وە منیش شك نابەم حەملم بێ بۆیە، وتم ئاخر کە شێخ ئەوەندە کە فـەرمووی حـەملت هەیـە ئـەبوا ئیتـر بێـدەنگ ببـوای، کـە کـاتێ گەیشتینـەوە پـاش چـەن ڕۆژێکـی کـەم دەرکەوت کە سکی پڕە، وە ئـەوە بـوو بـەهۆی زۆر عەقیـدەی ئـەوان و کەسـانێ کـە ئاگایان لەم روداوە بوو.

---

(١) کوڕی گەپڵە: دێیەکە لە قەسبچەی پێنجوێنەوە سـەعات و نیـوێ دوورە وە نزیکـەی حـدودی ئێران بەلام ئێستە ئەو دێ و دێهاتی دەور و پشتی چۆلەوە کەسی تیا نیە ١٤٠٢

**ك ٢٩٧:** جـەنابی پێشـەوای زانایـان مامۆسـتا مـەلا بـاقر لـە قـەڵای مـەریوان فەرمووی: شتێکی سەیرم بەدی ئەکرد هەر کاتێ خوا بیکردایە بە نصیب کە بچوومایە بۆ مەریوان نەخۆش ئەکەوتم بە بۆنەی تاریکی و دڵتەنگییەکەوە چەند رۆژێ چونکە هەستی بەربەرەکانی و بەرەنگاری نارەحەتیەکم بە خۆم ئەکرد، ئەمجارە کە هاتم لە کاتێکا کە بەرەنگاری ئەو تاریکییەم ئەکرد کتووپڕ حەزرەتی پیر حازر بوو فەرموی مامۆستا بۆیە تۆ نەخۆش ئەکەوی چونکە بە خۆت بەرەنگاری ئەو نارەحەتییە ئەکەیت، تۆ بەرەنگاری ئەو نارەحەتییە بە رابیطە بکە لەمەولا، مامۆستا فەرمووی دەستم کرد بە پارێزگاری و خۆپاراستنی خۆم بە رابیطەی پیر نارەحەتییەکەم نەما زەحمەتی رابوردوم لاچوو، ئیتر ئەو نەخۆشییەم لاچوو سوپاس بۆ خوا.

**ك ٢٩٨:** دووبارە لەو سەرچاوە پڕ بە فەڕ و پیرۆزەم بیست لە زانستی دینی و دنیاییەدا جەنابی مامۆستا باقر کە فەرمووی (خوا لێخۆشنوود بێ):

لە گێڕانەوەی کەرامەتێکی دوور و درێژدا کە حەزرەتی شا عوسمان (قدس سره) توجّهی فەرموو بۆ فنجانێ کە چای تیابوو، بەرزبوەوە بە قەدەر بستێ دوایی نزم بوەوە و چووەوە جێ خۆی سوپاس بۆ خوا.

**ك ٢٩٩:** دوبارە ئەو زاتە عالی جەنابە و لە زانا پایە بڵندەم بیست کە فەرمووی: چووم بۆ دیدەنی حاجی ملا عارفی وولەژێر، لە کاتێکا ئاوی دەزنوێژیان ئەکرد بە دەستما، بینیم کە حەزرەتی شای علاء الدین و حەزرەتی کوڕە گەورەکەی کە شێخ محمد عوسمان تەشریفیان هێنا، حەزرەتی شای علاء الدین فەرمانی فەرموو بە کوڕی شیرینی شێخ عوسمان کە توجّهم لێ بکات، توجّهی فەرموو جەزبە زۆری لێ سەندم هەڵسام دەستم کرد بە هەڵپەڕین ماوەیەکی زۆر دەوامی بوو.

لە دوای ماوەیەك كاتێ چووم بۆ بیارەی شەریف پرسیارم لە حەزرەتی شێخ علاء الدین كرد قدس سره ئایا ئەو كاتە توجهەكەم لێ كرا جەنابت بووی لە شێوەی شاعوسمان توجّهت لێ كردم یان هەر ئەو سەماحەتە خۆی بوو؟ فەرمووی نەخەیر خۆی بوو توجهەكەی لێ كردی سوپاس بۆ خوا و سەلات و سەلام لەسەر رسول الله ﷺ بێ.

**ك ٣٠٠:** مژدە: جارێكی تر لەو زاتە پیرۆزەم بیست كە فەرمووی: جارێك خەوتبووم یا خەریكی مشغوڵی بووم بینیم كە دوو زات تەشریفیان هێنا و فەرموویان پێم پێغەمبەری موبارەك ﷺ تۆی ئەوێ و بانگت ئەكات، هەستام و لە خزمەتیانا رۆیشتم تا گەیشتمە شاری رووناكی خوا شەرەفی زیاتر بكات بە شەرەفی دیداری پیرۆزی پڕ فەڕی رسول الله ﷺ شادبووم وە حەزرەتی شاعوسمانی سراج الدین لە حزوریا وەستا بوو، پێغەمبەری موبارەك ﷺ فەرمووی بە بەندە ئەم پیاوە ئەبێ بە مورشید وە مورشیدێ گەورە ئەبێ.

**ك ٣٠١:** جارێكی تر فەرمووی:

پێغەمبەری موبارەك ﷺ فەرمووی پێم ئەم پیاوە ئەبێ بە دەستگیر و مورشیدێكی گەورە تۆ تەرویجی بدە لەناو موسڵمانانندا لە حضوری پێغەمبەری موبارەكدا لەسەر دەستی عوسمانیدا تەمەسوكم وەرگت و بەیعەتم پێ كرد، ئەو سەماحەتەش پەیمانی فەرموو كە پەیڕەوی شەریعەتی پیرۆز بفەرموێ ئەم پەیمانە لە میانەی هەردوولاماندا روویدا.

كاتێ بە هۆش هاتم وە سێ چوار رۆژ بەسەر ئەم رووداوەدا بەسەرچوو، لە حەزرەتی سراج الدین (قدس الله سره العزیز)ەوە نامەیەكی پیرۆزم لە بیارەی شەریفەوە بە خزمەتی شادبووم لە ئاخری فەرمودەكانیا نووسیبوی: بەو ناونیشانەی

فلان شەو دوو بە دوو بە شەرەفی دیداری رسول الله ﷺ شاد بووین و زیارەتمان کرد بەو ناوونیشانەیە تەشریف بهێنە تمسك بکە با تەرویجی موسڵمانان بێ"[1].

سوپاسێکی بێ پایان و بێ کۆتای بۆ خوا، صلات و سەلام لەسەر خۆشەویست و نازداری خوا حەزرەتی رسول الله بێ ﷺ وە دوورد و سلاوی بێ پایان لەسەر یارانی پاکی بێ، وە بۆ گیانی پاکی ئەوانەی کە بڕوامان پێ کردی و پشتیان گرتی و کۆمەکت بوون.

**ك ۳۰۲:** لە جەنابی زانای بەڕێز و بە توانا مامۆستا مەلا علی قەلاگا[2]، بیستم کە فەرمووی: لە کاتی فەقێیەتیما بڕوام بە حەزرەتی شێخ عوسمان هەبو لەگەڵ مەلا محمدی نێ و مەلا إبراهیمی بانەیی لە دووڕووەی پیرۆز ئەمان خوێند، مەلا عەلی فەرموی: برایەکم هەبوو لەوە پێش تێکچووبوو بەڵام بردمانەوە بۆ بیارەی شەریف بۆ ئەوەی بە فەڕ و پیرۆزی توجّهی شا علاء الدین خاس ببێ، بەڵێ بە پیرۆزی و پڕ فەڕی ئەو شا علاء الدینە چاك بووەوە بەڵام کەمێ ماتی و پەژاری مابوو هەندێ جار تووشی ئەبوو، لە یەکێ لە دێهاتی هەورامان دائەنیشت، منیش چووم لە ژێر سێبەری خانەقادا پاڵم دایەوە و خەوم لێ کەوت، بینیم کە حەزرەتی شێخ محمد عوسمان ئەمدوێنێ و قسەم لەگەڵ ئەکات و ئەفەرموێ من تۆم خۆش ئەوێ و شیرینی لە لام منیش عەرزم کرد ئازیز: ئەگەر منت خۆشەوێ کۆمەکییەکم پێ بکە کە براکەم بە لوطف و کۆمەکیت چاك بکەیتەوە، ئەگەر ئەوەت لەگەڵ کردم بڕوام هەیە کە بەزەییت پێما دێتەوە و مەرحەمەتت زۆرە بەرامبەرم، فەرمووی هەروا؟ عەرزم کرد بەڵێ دەست بەجێ براکەم بینی لە خزمەتیا حازر بوو، توجّهێکی لێ فەرموو لە هەردو شانیەوە کێمو و جەراعەت بە زۆری هاتە دەرەوە و چاك بووەوە، لە پاشا

(۱) ئەم بەسەرهاتە پێش کۆچی حەزرەتی قطبی زەمان شێخی علاء الدین بوو بە حەوت ساڵ لە پاش ئەم خەوە ۷ ساڵی پێ چوو جا حەزرەتی علاء الدین لە دنیا دەرچو قدس سرە.

(۲) کە بە مەلاعلی ئەفشاری بەناوبانگە.

حەزرەتی پیر لێم نزیك بووەوە بەرەو رووم تەشریفی هێنا و فەرمووی ئەوا براکەت چاك بووەوە و شیفای بۆ هات با توجّهێکیش لە خۆت بکەم توجهەکەی لیٚ کردم وام هەست پیٚ کرد کە شیشیٚ لە ئاسنی سوورەوەکراوی هێنا کردی بە سنگما و سەرێکی لە پشتمەوە هێنایە دەرەوە لە ترس و ئازارا بە ئاگا هاتم تەماشام کرد حەزرەتی شا عوسمان سراج الدین تەشریفی هێناوە و لە لامەوە پاڵ کەوتوە و سنگی موبارەکی نووساندوە بە سنگمەوە هەستام و فیرارم کرد لە خانەقا چوومە دەرەوە هاوڕێکانم بانگیان کردم بە دەنگێکی بەرز عەلی عەلی بۆ بەو شەلییە رائەکەی؟ کە لە تاو ئازار نووشتابوومەوە بەندەش وەڵامیانم دایەوە کە هیچم نیە تەنیا ئەوە نەبیٚ لە خەو هەستاوم بەو چەشنە ئاوا بیٚ تاقەتی کردووم، کاتیٚ ئەو بەسەرهاتەم بۆ گێڕانەوە ویستم خۆشم دڵنیا ببم لەو بەسەرهاتە کاتیٚ براکەم بینی ئەوەندە چاك بوو هەر ئەتوت قەت نەخۆشی دەماخ و دەماری نەگرتوە و توشی ئازاری مێشکی نەبوە سوپاس بۆ خوا.

**ك ٣٠٣:** لە جەنابی بەڕێز و بە نرخ خوالێخۆشبوو شێخ عبدالقادری داغسانی تورکمان صەحرام بیست خوا لێی خۆش بیٚ فەرمووی: حەمە جانی کوڕم و زاتێکی ترم نارد بۆ خزمەتی حزوری شا محمد عوسمان بۆ ئەوەی بە هیممەتیان سەرکەوتوو بن و خاوەنی ئیمان و باوەڕێکی راست و دروست بن، کاتیٚ کە لە تاران پەساپۆرتیان وەرگرت وە چوون بۆ بیارەی شەریف و بە دیداری شەرەفداربوون ماوەی دوو مانگ لەویٚ مانەوە لە پاشا گەڕانەوە و بۆیان گێڕامەوە کە: لەبەر ئەوەی هەردوکیان هەرزەکاریوون باوەڕیان بەرامبەر غەوسی وەقت دامەزراو نەبوو[1]، کاتیٚ داوای ماڵ ئاواییمان کرد بڕیاری فەرموو دوای وەڵام دانەوەی نوسراوەکان، کاتیٚ دەستی

---

(١) چونکە ناشکوری نەبیٚ لەم چەرخ و سەردەمەی ئێمەدا زۆربەی گەنجەکانمان لە تێکەڵی و نزیکییەوە لە دۆستانی خواوە دوورن، جا چە جایٚ بۆ بەساڵاچووەکان.

پیرۆزیمان زیارەت کرد، وە لە بیارەی شەریف دەرچووین پیاوێکی بەدوایا ناردین و لە دوور بانگەوازی کردین کە لە جێی خۆتان بن تا حەزرەتی پیر دێتە لاتان، ئێمەش لەسەر فەرمایشتی پیر لە شوێنی خۆمان چاوەڕوانیمان کرد تا تەشریفیان هێنا وە ئامۆژگاری ووشیارییەکی زۆر جوانی کردین و تەشریفی فەرموو خوا حافیزیمان لێ کرد ئەمجار دەستمان کرد بە رۆیشتین، ئەم بینی بە ئاشکرا حەزرەتی شێخ عوسمان لەگەڵمانایە بۆ هەر لایەك ئەچووین هەر لە خزمەتیا بووین، بە چەشنێ تا گەیشتینە قەڵا شێخان[1]، هەر لە خزمەتیا بووین شەرمم ئەکرد دەزنوێژ بگرم و ئەو سەماحەتە حازر بێ کاتێ گەیشتینە ئەوێ ئیتر دیار نەما و لێمان ئاوا بوو[2].

سوپاسێکی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگاری لا مکان و درووود و سڵاو بۆ حەزرەتی محمد المصطفیی نازدار ﷺ و خزم و یارانی خوا پیری نازدارمان پایەدار بفەرموێ.

**ك ٣٠٤:** لە برای بەڕێز و مجذوبی راستەقینە و زانای بێ نەزیر جەنابی ملا نظیرم بیست کە گێڕایەوە فەرمووی: من حەزرەتی شێخ عوسمان سراج الدینم لە سێ شوێنا بینیوە و بە خزمەتی مشرّف و پایەداربوم لە پاشا هەر سێکیانی باسکرد فەرمووی جارێکیان بە خزمەتی گەیشتم لە شوێنێکا تەشریفی حازر بوو کە چووم بۆ شوێنێکی تر هەروەها بە خزمەتی مشرّف بووم لەو شوێنەش تەشریفی دانیشتبوو، کە رۆیشتم بۆ شوێنێکی تر سێیەم جار بینیم تەشریفی لەوێش حازرە ...

---

(١) قەلاشێخان: دێی جەنابی پایەبەرز مەولانا خالیدی برای حەزرەتی پیرە وە لە بیارەی شەریفەوە ٣٠ سی قوناخێ دوورە.

(٢) کاتێ باوکم محمد جان جەنابی شێخ مەلا قادری تورکمان سەحرا لە دنیا فەوتی کرد ئەم بەسەرهاتەم لە جەنابی کوڕی شیرینی محمد جان لە خۆی بیست کە بە چاوی سەر حەزرەتی پیری بینیوە تەنیا هەر خۆی و بەس.

**ك ٣٠٥:** جارێکی تر دووباره جه‌نابی مامۆستا مه‌لا نظیر بۆی گێرامه‌وه فه‌رمووی: کاتێ پێش نوێژیم بۆ دێی تووتمان[1] ئه‌کرد له‌و ناوچه‌یه ناکۆکییه‌ك له‌و سه‌رسنوره له میانه‌ی هه‌ردوو لای عێراق و ئێراندا به‌دی هات مه‌ڕ و ئاژه‌ڵی دێیه‌که گیراو هه‌روه‌ها ئامر مه‌خفه‌رێکی ئێرانیش به دیل گیرا وه ناکۆکییه‌که په‌ره‌ی سه‌ند به‌ چه‌شنێ ڕێی هاتوچۆ به‌ستراو، منیش خێزانم ماوه‌یه‌ك له‌وه‌پێش ناردبووه‌وه بۆ سه‌ردان بۆ ماڵی باوکی له دێی (کاڵی سه‌رو) له دوای ته‌واوبوونی سه‌ردانه‌که چووم به شوێنیانا که بیان هێنمه‌وه بۆ لای خۆمان بۆ تووتمان ئه‌بوایه له‌هه‌ردوو سه‌ر به‌لایانا تێ بپه‌ڕیمایه، ترسێکی زۆرم بۆ هات چونکه سه‌ربازه‌کانی ئێران به ئاواته‌وه بوون که عێراقییه‌ك له‌سه‌ر سنور بگرن به تایبه‌ت من خه‌ڵکی ئه‌و دێیه‌ش بووم که بۆته هۆی ناکۆکییه‌که، کاتێك له ڕۆیشتنما نزیك به دێی سیاناو بوومه‌وه به خزمه‌ت یانزه سوار گه‌یشتم که له پێشیانه‌وه حه‌زره‌تی شێخ عوسمان بوو منیش چووم جڵه‌وی ئه‌سپه‌که‌یم ماچ کرد عه‌رزم کرد قوربان بۆ کوێ ته‌شریف ئه‌فه‌رمون، فه‌رمووی: هاتووین بۆ پارێزگاری تۆ له پاشا ئاوه‌زه‌نگی له ئه‌سپ دا و به په‌له ته‌شریفیان فه‌رموو ئیتر من ترس و له‌رزه‌که‌م له دڵا ده‌رچوو سوپاسی بێ پایان بۆ خوای په‌روه‌رگار هه‌زار سڵاو بۆ ڕۆحی پاکی پێغه‌مبه‌ری موباره‌ك ﷺ و خزم و یارانی خوا حه‌زره‌تی پیرمان پایه‌دار و به‌رقه‌رار بفه‌رموێ.

**ك ٣٠٦:** دووباره جارێکی تر لێم بیست که فه‌رمووی: کاتێ که حه‌زره‌تی شا علاء الدین ڕۆحی شرینی به جه‌ننه‌ت شادبوو جه‌نابی خوا لێ خۆشبوو شێخ عبدالله نێزلی[2] بۆ پرسه ته‌شریفی هێنابوو بۆ بیاره‌ی شه‌ریف له یه‌که‌م جاره‌وه حه‌زی به

---

(١) تووتمان: دێیه‌که سه‌ر به قه‌زای پێنجوێن له سنوری ئێران به دیوی پیران دا.

(٢) ئه‌م زاته پیرۆزه (شێخ عبدالله نێزلی) زاتێکی پیرۆز بوو، وه یه‌کێ بوو له خه‌لیفه و خۆشه‌ویستانی حه‌زره‌تی شێخ نجم الدین (قدس سره) له پاشا له زه‌مانی حه‌زره‌تی شا علاء الدیندا

تازەکردنەوەی طەریقەت نەئەکرد لە خزمەت حەزرەتی شێخ عوسماندا ماوەیەك تەشریفی مایەوە لە پاشان تەشریفی ڕۆیشت و دوبارە گەڕایەوە و فەرمووی: (کاکە عوسمان نایەڵێ بڕۆم)[1]، ماوەیەکی تریش ماوە لە بیارە و دووبارە لە دێی گولپ[2]، تەشریفی گەڕایەوە ئەمجار ماوەیەکی تریش مایەوە و ئەمجارە ئیجازەی لە حەزرەتی شێخ عوسمان وەرگرت و تەشریفی برد بەڵام ئەمجارە لە نزیکی هەڵەبجە گەڕایەوە و فەرمووی نایەڵێ بڕۆم ئەمجارە پەیمان و تەریقەتی لەسەر دەستی حەزرەتی شێخ عوسمان تازەکردەوە بەو خەلاتە و پایە بەرزە شاد و بەختەوەر و کامیاب بوو سوپاس بۆ خوا[3].

---

(قدس سره) کرا بە خەلیفەی حەزرەتی شا علاء الدین وە لە طەریقەت دا خاوەنی پلە و پایەیەکی دیاربوو، وە یەکێ لە خزمانی خانەدانی بیارەی شەریف و ئامۆزایان بوو.

(١) یانی لە مەعنادا بە تصرف ماوەم نادا کە بڕۆم.

(٢) گولپ: دێیەکە لە هەورامانی عێراق لە بیارەی شەریفەوە نزیکە.

(٣) لەو بەسەرهاتە گرنگانەی کە ئەم مریدە خاوەن پایەیە شێخ عبداللە نێزلی بۆی گێڕاینەوە فەرمووی:

شا عوسمان عەبایەکی خۆی خەلات کردوم من عەباکەی خۆمم بەسە خۆ من ئەمرم ئێمەش عەرزمان کرد تۆ چۆن ئەزانی، فەرمووی ئا لەم خانەقایەدا بە لیقای حەزرەتی رسول اللەی أکرم ﷺ شادبووم فەرمووی:

تۆ لە دوای فەوتی شێخ علاء الدین قدس سره بە شەش مانگ لە دنیا دەرئەچی وە هەروەها فەرمووی: ﷺ تۆ لە دوای چل کەس فەوت ئەکەیت.

شێخ عبداللە فەرمووی: من ئەو چل کەسە ئەناسم تەنیا نەفەر ونیوێکیان ماوە نیوەکەی شێخ غەفوری خەرپانییەکە ماوەیەکی دوورو درێژە نەخۆشە.

وە دووبارە فەرمووی: پێغەمبەری موبارەك ﷺ پێی فەرموم کە وای ئەگەیاند: ئەم دینەم ٢٨ بیست و هەشت ساڵ بە هۆی عوسمان ەوە بەردەوام ئەبێ.

**ك ٣٠٧:** دووباره له برای خۆشەویستم جەنابی مەلا نظیرم بیست کە فەرمووی: باوکم رەحمەتی خوای لێ بێ ئەی فەرموو: چەند جار خۆم لە پێغەمبەری موبارەکم ﷺ بیستوە کە فەرموویەتی: عوسمان موڕادی[1] خوایە یانی (عوسمان مراد الله) هەزاران شوکر و سوپاس بۆ خوا لەسەر ئەو نیعمەتە بێ پایانەی کە خەلاتی کردوە پێمان لەم ئاخر زەمانەدا.

**مژده ٣٠٨:** دووباره جەنابی مامۆستا مەلا نظیر فەرمووی: باوکم ئەی فەرموو: لە پێغەمبەری ﷺ موبارەکم بیست ئەی فەرموو: خۆشی بۆ ئەو کەسەی کە ئەبێ بە مریدی[2] عوسمان، مزگێنی و مژده بێ لێمان ئەی کۆمەڵی موسڵمانان با چەسپانی بکەین بۆ وەرگرتنی طەریقەت لە خزمەتیا، خۆمان بخەینە ژێر سایەی پیرۆز و پڕ فەڕیا، با بەهرەمەندی بەرەکات و ئەلطافی پڕ مەرحەمەت و میهرەبانییەکەی ببین وە لە سایەی پڕ فضل و دەسەلاتی گەورەیا خۆشنودی بارەگای یەزدانی ببین وە بە هەزاران سوود و بەختەوەری دین و دنیا کامیاب و بەختەوەر ببین بەهیممەتەکەی خۆی.

---

بەڵێ هەروەکو خۆی فەرمووبوی وە لەو بەدی هاتەیا دی بووی لەو کاتەدا کۆچی دوایی فەرموو خوا بە رەحمەتی بێ پایانی خۆی شادی بکات وە حەزرەتی شاعوسمان گیان لە سایەی کەرەم و رەحم و میهرەبانی خۆیا پایەدار بفەرموێ ئامین.

(١) موڕاد: یانی محبوبی خوا لەلای خوداوە موقەدەرەکە بە پایە بگات لە فەیضی الله یجتبي إليه من يشاء بەشدارن، مجزوبان و مرادان بێ خواستی خۆیان کەشان کەشان ئەیان بەن.

(٢) موريد: یانی سالك موحبی حەق ئەمانیش لەسەر سفرەی ویهدی إليه من ينيب بە نیعمەتی دەستگیری کامەرانی نسأل الله تعالى العفو والعون والوصول بنوال رحمته وكمال رضاه آمين.

مەريد: العياذُ بالله العظيم یانی: طەرد، دەرکراو.

**ك ٣٠٩:** دووباره جەنابی مامۆستا مەلا نظیری خۆشەویست فەرموی: لە زانای گەورە و وەلی تەواو مامۆستای بەڕێز مولانا أستاذ محمد أمینی باراماوێم بیست خوا خۆشنودی بفەرموێ کە ئەی فەرموو: لە رووداوێکا وەکو لە ماڵی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ بم وابوو گوێم لێ بوو دەنگێك لە دەرەوە ئەهات سێ جار فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەی پێغەمبەری خوا، حەزرەتی فاطمە زەهراء رضي الله عنها گەورەی هەموو ئافرەت و دایکی حەزرەتی حسن و حسین (رحمة الله علیهما آمین) فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا یەکێك لە دەرەوە بانگت ئەکات، پێغەمبەری موبارەك ﷺ فەرموی: ئەو کەسە مەحرەم نیە بە ماڵی من، منیش لە دڵی خۆما ووتم مەحرەم نیم چۆن هاتووم و لێرە وەستاوم ویستم بڕۆمە دەرەوە پێغەمبەری موبارەك ﷺ فەرموی: مریدی عوسمان نامەحرەم نیە بە ماڵی من یان فەرموی ئالی عوسمان نامەحرەم نین لە ماڵی منا، بە ئاگا هاتم شوکرانە و سوپاسی خوام کرد لەسەر ئەم مژدە خۆشە.

**ك ٣١٠:** لە دوای خەتمێکی شەوانە لە جەنابی زانای خاوەن پایە و وەلی گەیشتوو بە پایە مامۆستا مەلا شێخ عبدالقادری حەوتاشیم بیست کە فەرموی کە لە کاتێکا لە زیارەتی پیری دەستگیر حەزرەتی شێخ عوسمان بووین لە بیارەی شەریف فەرمووی: دڵی بەنی ئادەم دوو گوێچکەی هەیە لە لای راستی فریشتەیەك هەیە ئیلهام[1] ئەکات، وە لە گوێچکەی چەپی شەیتانێك هەیە ئیلقاء[2] ئەکات، ئەمشەو حەزرەتی شێخ عوسمان توجّهی فەرموو لێم و شەیتانەکەی هەڵ کەند و فڕێی دا بە

---

(١) ئیلهام: إیعلام، لە لاین خواوە یا لە لایەن فریشتەی خواوە.

(٢) ئیلقاء: قسە هاوێشتنە دڵ.

ئالی عوسمان: یانی: تەبەعە، پەیرەو، وەرگیراوان.

ئێجگاری هەزار شوکر و سوپاس و حەمد بۆ خوا و درودی بێ پایان بۆ زاتی رسول اللەی نازدار ﷺ و ئال و یارانی.

ك ٣١١: لە مەرحومی حاجی وەستا عەلی سنەئی کە ناوئەبرا بە حاجی عەلی کەنعانی، بیستم ووتی شێخ تەشریفی یەکەم جاری بو بە پەساپۆرت لە عێراقەوە هات بۆ ئێران وە لەوێ وە چو بۆ تورکمان سەحرا وە لەو ماوەیەدا لە عێراق ثەورە کرا وە مەلیك و وەصی نەمان بەو بۆنەیەوە شێخ سەفەرەکەی کورت کردەوە کە گەیشتەوە سنە ئێمە لە خزمەتیا تا شاری کرماشان رەوانەمان کرد، شەو لە مزگەوتی زەردۆیەکان ماینەوە بەلاّم شێخ تەشریفی رۆیشت[1] تاقمێ دەروێش هاتن زیکریان کرد من و رەفیقێکم کە شەو لەو مزگەوتەدا مابوینەوە راکشابوین وە رەشتییەکەی خۆم دابو بە خۆما، کاتێ دەروێشەکان لە زیکرکردن بونەوە وە مزگەوتیان چۆڵ کرد من لە دڵی خۆمدا وتم حەیفە ئینسان وەقت بە خەسار بدات چاك ئەوەیە دەس نوێژێ بگرم وە بە یادی خوا مشغولێ ببم، هەستام و دەزنوێژم گرت و دوو رکات نوێژم کرد چاوم بە یەکدانا خەریکی رابیتە بوم، لە پڕ وەك تۆپی یاری کە قوەتی هات دای بە سینەما، ئەوەندە عەتر و عبیر و بۆنێ خۆشی بو لە ترسی ئەوەی نەوەك لە هۆشی

---

(١) کاتێ کە ماڵمان لە سنە بوو، وە لە ماڵی مامم حاجی مصطفی ی پێنجوێنیدا بوم هەموو رۆژ یا جارێ یا دوجار ئەچومە سەر دوکانی وەستاعلی خەیات کەنعانی دوکانەکەی وەك خانەقا وابوو پڕ لە خۆشی بۆ موریدانی سەقز و مەریوان و لاجان کە ئەهاتن بۆ دووڕووە لەم سەر و لەو سەر ئەهاتنە دوکانەکەی وەستا علی ئوتومبێلی بۆ ئەگرتن و خوا حافیزی لێ ئەکردن زۆر بە خزمەت بو لێم پرسی بۆ ئەوەندە هەناسە بە لوت وەرئەگری و ئەڵێی لاحول ولا قوة إلاّ بالله ئەویش حیکایەتی کرمانشانی گێرایەوە، وە وتی ئێستەش هەر ئەو بۆن رائحەیە هەیە، وە چەن ساڵە هەر نابرێ، وا ئەزانم ئەو حیکایەتی کرمانشانەی لە پاش بەسەرهاتی دووەم کە نوسیومانە وە پاش ساردبونەوە گەرم بۆتەوە لێ رودراوە.

خۆم بچم لوتم بەرەشتی یەکەم هەڵبەست: جارجار کەمێ لوتم ئەکردەوە فەوراً هەڵم ئەبەستەوە تا بەیانی وا بوم، وە ئێستەش هەروام، وە هەروەها مەرحومی حاجی علی کەنعانی ووتی لە پاش ماوەیە سەرگەرمیم لە رابطە و موحەبەتا بە هۆی رەفاقەتی هەندێ لە مونکیران ساردبومەوە، وە هیچ شەوق و زەوقم نەمان، کأنە لەو وەزعا نەبووم، ئەم حاڵەم هەروا بەردەوام بو تا شەوێ وام زانی لە خەوما: لەشم پیسە، وە پێویستم بە خۆشتن هەیە، والحال لەشم پیس نەبو، بەلاّم بە خەو وام ئەزانی، وە لەو خەوەدا رۆیشتم بۆ مزگەوتی خورشید لیقا خانم کە ئەو مزگەوتە ٣ سێ شەممە و جمعە خەتمان لێ ئەکرد، بۆ ئەوەی لە غوسڵ خانەکە خۆم بشۆم کاتێ لە قاپی حەوشەکە خەریك بوم بچمە ژوورەوە، سەیرم کرد لە هەیوانی مزگەوتەکە حەزرەتی رسول الله ﷺ تەشریفی وەستاوە، وە شێخ لە خزمەتیا حازرە لەگەڵ ئەوانم دی ویستم بە جۆرێ بچمە ژوورەوە نەم بینن تا لە خۆشتن ئەبمەوە، بە دزییەوە چومە ئەو دیو قاپییەکەوە رووەو حەوزی خۆشتن رۆیشتم لەناکاو شێخ لای کردەوە منی دیت، وە بە ئیشارەی دەست داوای کرد بچمە خزمەتیان، ناچار هەر بەو حاڵەوە چوم.

کە گەیشتمە خزمەتیان عەرزی حەزرەتی پێغەمبەری کرد ﷺ ئەمەیە وەك لەوەپێش لە خزمەتیا باسی کردبم حەزرەت ﷺ روی لێ کردم وە فوی کرد بە دەم و چاوما بەو لوتفە کردی خەبەرم بوەوە، کە بێدار بوومەوە، بە گەرمی و شەوق و زەوقێکەوە هەستام کە لەوەپێش نەم دی بو، وە ئەوە ئیتر الحمد لله تا ئێستە هەر بەردەوامە، وصلی الله علی خیر خلقه محمد واله وسلم.

**ك ٣١٢:** جارێکی تر لە کاك علی مەرحومم بیست فەرموی بە ئوتومبیل چوین بۆ دێیە لە دێهاتی سنە وە بۆ ئیشی شێخ ئەچوین رێگە خۆش نەبو ترسمان بو ماشێنەکە وەرگەڕێ، لەگەڵ ئەوەدا بە چاو بینیم کە شێخ لەسەر (بۆدی) ئوتومبێلەکە

دانیشتوه، من ئیتر بێ ترس مام، وه چەن شتی تری بۆ گێڕاومەتەوه بەڵام بە هۆی کەم حەواسی و تولی ماوه زۆرم لە فیکرچوەتەوه، رحمة الله علیه رحمة واسعة آمین.

بە دڵ یادت بە خێر ئەی کاتی خۆشی
کە شەهدی خۆشەویستیم تیا ئەنۆشی
بەڵام ئێستا کە کاسەی کاتی ئەمڕۆ
لە شوربی خۆشەویستی ما بە بۆشی

**ك ۳۱۳:** لە سیدی خاوەن ڕێز و پڕ عەقل و کەماڵ کاك سید عطا[۱] دانیشتوی دێی دەرەمەرم[۲]، بیست، وتی باوکم بە پەیڕەوی باوکی خۆی طەریقەتی قادری لە خزمەت شێخ سعیدی باوکی شێخ محمودی صغیر وەرگرتبو چونکە باپیرم طەریقەی لە کاکە أحمد وەرگرتوه، ئەهاتن بۆ لامان بە ناوی زیارەتەوه، خۆیشم حەزم ئەکرد کە لە طەریقەتدا شارەزاییم بێ هەستام چوم بۆ خزمەت مەرحومی شێخ محمود لە دێی داری کەلی کە بە خزمەتی گەیشتم و ناسیمی زۆری پێ خۆش بوو لە پاشا عەرزم کرد هاتومە خزمەتت کە ئیجازه و تعلیمی تەریقەت و تلقینی زیکرم بفەرمون فەرموی ڕۆژی ئەوەندە جار زیکری (لا إله إلا الله) بکە و هاتوچۆی ئێرەیشت بێ، وتم قوربان بیستومە کە تەریقەت دەور و دەرسی هەیە وە بە پلە بە پلە سەرکەوتنی تێدایە، فەرموی من بە زوبان ئەتوانم مەوعیزەیەك بکەم، وە تعلیمی زیکر و تەلقینی ئادابی طەریقەت بۆ مورید بڵێم ئیتر من ناتوانم کەس بە خوا بگەیەنم ئەوه کە ئەمڕۆ

(۱) جەنابی سید عطا لە شێخەکانی دێی (ئەسکۆڵ)ه و لە نەوەی شێخ محمد تەراتەوەنی‌یە بەڵام باپیریان تەریقەتی لەسەر دەستی کاکە ئەحمەدی شێخ وەرگرتوه (ڕەحمەتی خوای لێ بێ).

(۲) دەرەمەڕ هەیە، وه دەرەمەر یش هەیە، دەرەمەڕ لە عێراقایە لە لای سەرگەت دەرەمەر لە ئیرانایە لە لای ئەسکۆڵ و پیران شا.

بتوانن که خەڵك بە خوا بگەیەنن ئەو مشایخانی هەورامانەن، ئەنجا منیش سەیرم کرد کەسێ لەم کاتا لە مشایخانی هەورامان خاوەنی ئیرشاد بێ حەزرەتی شاه عوسمانە بە دوای ئەو سەفەرەدا نەوەستام چوومە خزمەت حەزرەتی شێخ عوسمان تەمەسوکم بە تەریقەت کرد.

**ك ٣١٤:** وە هەروەها کاکە عطا گێرایەوە ووتی تازە لە خزمەت شێخدا تمسّکم کردبوو وە چەن رۆژ لەوێ بوم پەلەم ئەکرد بۆ وەرگرتنی روخصەت بۆ گەڕانەوە.

فەرموی ئەگەر بە من بێ تا (٦) رۆژی تر ئیجازەت نادەم، کاتێ گەڕامەوە (٦) رۆژ بە هۆی باو و بۆرانەوە لە دێی (کانی ئاسکان)[1] مامەوە.

**ك ٣١٥:** جارێکی تر حەزرەتی پیر فەرموی مانگایەکمان هەیە تازە زاوە بەیانی زوو بێ و لەوبەر نان بخۆ و بیان بە بۆ (ریشێن).

کاتێ بەیانی بەر لە نانخواردن هەستام و لەسەر فەرمانی حەزرەتی پیر چووم بۆ خزمەتی بەڵام رۆژێکی تووش و تۆف بڕوام وابوو کە کەس ناتوانێ سەرببێنێتە دەر و بۆ ئەم لاو لا بچێ، سەر لە بەیانی زوو فەرموی زوو ناشتا حازر بکەن بۆ سید عطا با بڕوا بۆ ریشێن، رووم نەبوو هیچی عەرز بکەم خێرا مانگا و کولکە ساواکەم وەرگرت و بەرەو ئەوێ کەوتمەڕێ.

لە رێگا ئەم بینی لەم لاو لاوە بە راست و چەپا ئەباری، ئەو شوێنەی ئێمەی پیا ئەڕۆشتین باران نەئەباری، بەم چەشنە تا گەیشتمە ئەوێ لە نزیکی دێ کەوە تووشی برادەرێکی خۆم بووم، ووتی لە کوێوە دێی ووتم لە بیارەوە، ووتی ئەی بۆچی تەڕ نەبووی دەستی دا لە جل و بەرگەکەمەوە زۆری بە لاوە سەیر بوو کە ئەو ماوە دوورو درێژە هاتووم و نیشانەی باران بارانیم پێوە نەبوە.

---

(١) کانی ئاسکان: لە بناری شارەزوور نزیك بە دێی نەوێ و بەردەبەلە عائد بە ناحیەی خورماڵە.

**ك ٣١٦:** دووباره جەنابی سید پڕ وەفا کاکە سید عطا بۆی گێڕامەوە فەرمووی کوڕێکی بچووکم هەبوو ناوی (عادل) بوو زۆرم خۆش ئەویست نەخۆش کەوت ترسام ئەمیش وەکو کوڕەکانی ترم خوا بیان باتەوە، زۆر پاڕامەوە، زۆر لالامەوە بۆ ئەوەی خوا شیفای بفەرمویٚ، وە داوای بەرەکەت و هیمەتم داواکرد لە حەزرەتی شای سراج الدین کە بۆم بپاڕێتەوە لە خزمەت خوادا مەڕێك یا بزنێکم بۆ کرد بە مەولودی پێغەمبەر ﷺ لە پاشا بەکزی و ماتییەوە دانیشتم و دەستێکم خستە سەر ناوچەوانی و چاوم لێك نا، بینیم کە حەزرەتی شای سراج الدین دەستی گرتم و خستمییە ژوورێکەوە لە کۆشکێکی گەورە وەك دایرەیەکی میری وابوو، یەکێك لەسەر کورسییەك دانیشتبوو مێزێك و دەفتەرێ لەبەردەستیا بوو، حەزرەتی شێخ رووی تیٚ کرد و پیٚ فەرمووی: ئەمە یەکێکە لە مریدەکانم کوڕێکی هەیە مەیکەن بە سەرباز، پیاوەکەش پیٚی ووت: بە دەس من نیە ئەم فەرمانە لەسەر و منەوە دەرچووە پەنجەی نووسی هەر وەکوو پێنوس وابوو نیوەی سوور و نیوەی رەش بوو نووسی ئەبیٚ بکریٚ بەسەرباز لای ئەو رۆیشتین و چووینە ژوورێکی تر ئەمیش هەمان وەلامی دایەوە هەروەکو یەکەم، لە لای ئەویش رۆیشتینە ژوورێکی تر، رووی کردە ئەوەی لەسەر ژوورێك لەسەر کورسی دانیشتبوو کە ئەم گەورەتر بوو لە دوو زاتەکەی پێشوو، ئەمیش هەر عەینی وەلامەکەی ئەوانی دایەوە، بەلام حەزرەتی پیر زۆر زیاتر تکای لەم کرد و لێیان ئەپاڕێتەوە، لەگەڵ ئەوەشا ئەم زاتەش فەرمووی فەرمانی ئەمە لە لایەن پاشای گەورەوە دەرچووە دەسەلاتی ئێمەی تیا نیە هەر ئەبیٚ بگیریٚ بە سەرباز وا من ئەنووسم ئەوە سەربازە، ئەویش بە پەنجەی نووسی هەروەکو دوانەکەی پێشوو ئەبیٚ بکریٚ بە سەرباز لە لای هاتینە دەرەوە، ئەمجار ئەو سەماحەتە فەرمووی: من بڵێم چی چی بکەم برام ئیتر بە ئاگا هاتم، هەر لەو کاتەدا ئەم زانی کە بە رەحمەتی خوا ئەچیٚ رۆژیٚ یان دوو رۆژ لەوەدوا لە دنیا دەرچوو، بەلام گرانی و سەختی و ناڕەحەتی‌یەکەی لەسەر دڵ لابردم.

[فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ][1].

مصــــطفى ديـــــتن كليــــــم يش بيســــتن

قـــەت ناگـــات پلـــەی بيســـتن بـــە ديـــتن

ك ٣١٧: لە زانای دانا و هۆشمەندی ژیر جەنابی خوا لیٚ خۆشبوو (مامۆستا مەلا عارفی بانەیی)م[2] بیست کە فەرمووی: سالێکیان لە خزمەت حەزرەتی شێخ عوسمانی سراج الدین دابووم لە دووڕووەی شەریف، لە کاتێکا باوکی شیرینی لە بیارەی پیرۆز بوو لە خەتمەدا شێخ عوسمان سراج الدین توجهێکی لیٚ کردم کە مانگی رەمەزان بوو، منیش مجزوب بووم حالٚ هات بەسەرما، لە جەزبەکەدا شتی زۆر سەیرم ئەدی، وە بەرەکەت و واریدات و رەحمەتی خوایی بە زۆری هێرشی بۆهێنام خەریك بوو سنگم دوو لەت بیٚ، بینیم کە حەزرەتی شێخ علاء الدین تەشریفی هێنا و دووڕووەی شەوقدار کرد، وە حەزرەتی رسول الله ﷺ لەسەر سەری تەشریفی وەستابوو بەلاٚم نازانم ئەگەر پێی موبارەکی مێزەرەکەی گرتبوو یان نا.

وە پێغەمبەری موبارەك ﷺ جبەیەکی زەردی پۆشی بوو هەموو ئەولیا و پیاوچاکان ئاشکار بوون لە چوار قوڕنەی جیهانەوە ئامادە بوو بوون، وە من لە جەزبەکەدا ئەمزانی هەرچی بهاتایە و بە دەنگی بەرز هاوارم ئەکرد وا فلاٚن هات، دەنگم بە چەشنیٚ بەرز ئەکردەوە و گومانم وابوو کە یەکێکم لەوانەی بە پایە گەیشتوون وە شێخیەتی بۆ من بەدەست هاتوە، بە نهێنی پەیمانم ئەدا بە خوا کە غەش

(١)سورەتی النحل، ئایەتی ٦١. مەبەست لەم فەرمووده شیرینەی خواگیان کە ئەفەرمویٚ ئەجەلی موبڕەمە لە کاتی خۆیا چەند کەرامەت بۆ ئازیزان ئەخەینە پێش چاو کە بوونەتە هۆی رزگارکردنی زۆر کەس لە مردن و لە کۆسپی زۆر سەخت و پێشهاتی زۆر سەیر، کە ئەجەلی (معلّق).

(٢) مدرسی پێشووی مزگەوتی وەسمان پاشای پێنجوێن بوو، پیاوێکی مەشهور و بەناوبانگ بو زۆر عالم و بە غیرەت و لێهاتوو بو شەرع رەو وە پر لە ئیمان و ئاین بو رحمەتی خودای لیٚ بیٚ.

و ناجۆری لەگەڵ کەس نەکەم و لەگەڵ هەموو کەس پاك و چاك بم و خائن نەبم کە بۆ سوود وەرگرتن هاتبێ، ئەمجار کەم کەم ئەو حاڵەتەم نەما و لە سێ رۆژ زیاتر دەوامی نەکرد، وە ئەم حاڵەتەم بە بەرەکەتی توجهاتی حەزرەتی شێخ محمد عوسمانی پایەدارەوە بوو، خوا پایەداری بفەرموێ.

**ك ٣١٨:** دووبارە لەم زانا خۆش خولق و شیرینەم بیست فەرمووی: لە کاتێکا کە حەزرەتی شێخ عوسمان تەشریفیان لە بەغا بوو نیازی ئۆغر فەرمونی هەبوو بۆ تورکمان سەحرا منیش لە خزمەتیا بووم، بە تەلەفۆن لەگەڵ بلاطي مەلیك گفتوگۆیان کرد بۆ سەردانی مەلیك ئەوانیش چاوپێکەوتنەکەیان دواخست بە بۆنەی هاتنی میوانی زۆرەوە، وە چاوپێکەوتن و بە خزمەت گەیشتنی ئەم دەستگیرە پایەدارەیان دواخست، منیش عەرزیم کرد ئازیز حاڵیان لە خزمەتتانا چۆنە؟ حەزرەتی پیر فەرمووی: بەرزبوونەتەوە و مێشکیان پڕ بووە و لووتیان بەرز بۆتەوە خوا ئاوایان لێ بکات، هەردوو دەستی پیرۆز و پڕ فەڕی سەرەو خوار فەرمووەوە، ئەمانە لەناو ئەچن هەرچەند بۆ ئێمەش ئەبێ بەزیان، دوو مانگ بەسەریا تێ نەپەڕی شۆڕشەکەی عێراق رووی دا و لە ژێر پەردە و نهێنییەوە سەری دەرهێنا پەنا ئەگرین بە خوا لە دوژمنایەتی دۆستانی خوا و بێ فەرمانییان، پەنا ئەگرین بە خوا لە بێ ئەمریان و بێ گوێیی فەرمایشتیان لە خوای بێ نیاز نزا ئەکەین کە سەرکەوتوومان بکات بە بەزەیی و کەرەمی لوطفی دۆستانی تا رۆژی دوایی.

**ك ٣١٩:** لە جەنابی ملا رسولی لاجانیم[١]، بیست کە فەرمووی: شەوێ لە خەوا بە دیداری شیرین و سیمای پڕ نووری پێغەمبەری موبارەك ﷺ شەرەفدار بووم هەزار درووود و سلاو لەسەر ئال و یارانی بێ عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خوا تیمارم

(١) ئەم زاتە شەریفە (منعاوی) نازناوی بوو.

بکە پێغەمبەری موبارەك ﷺ درودی خوای لەسەر بێ فەرمووی: سپاردومی بە عوسمان چارت بکات بڕۆ بڵێ پێغەمبەر ئەڵێ چارت بکات، سوپاسێکی بێ پایان بێ حەد و حیساب بۆ خوای تاك و تەنیا بێ، هەزاران درود و سلاو بۆ رۆحی رەوانی پاکی پێغەمبەر ﷺ و ئال و یارانی.

**ك ٣٢٠:** دووبارە لە مەلا رسولی لاجانیم بیست کە فەرمووی: نووسراوێ لە جەنابی شێخ عبداللە دێرزۆرەوە هاتبو بۆ حەزرەتی پیر باسی نەخۆشی نور الدینی کوڕی نووسی بوو کە ١٠ رۆژ بەر لە جەژنی قوربان تووشی بوو، نەخۆشییەکەی لە شەوی عارفەدا زۆر بەهێز بوو، ترساین لێی کە ئەوەندە نەخۆشە بە تایبەت دایکی ئەوەندەی بۆ گریا بوو هەردوو چاوی تەمی هێنابوو، منیش خزمەتکاری خانەقام بینی هەردوو قاچی تووشی ئازار بوو بوو ماوەیەك لەوەپێش، منیش بە پەژاری و خەم باری دانیشتبوم لە دڵی خۆما ئەموت: خەڵکی لەم رۆژەدا لەم شەوەدا لەوپەڕی شادی و خۆشی دایە ئێمەش توشی پەژاری و خەم بووین، لەسەر رایەخی پەستی و خەمباری خەوم لێ کەوت بینیم لەو خەوەما لە خزمەت شێخ عوسمان گیان دا بووم تفەنگێکی بە دەستەوە بوو ئەی فەرموو: من تفەنگێك ئەنێم بە نەخۆشیی منالەکەتەوە و ئەیکوژم با کوڕەکەت لەو نەخۆشییە رزگاری بێ بەڵێ تفەنگێکی پێوەنا بەڵێ بێ دەنگ بوو، وام ئەزانی نەخۆشییەکەی کوشت، کاتێ رۆژ بوەوە لە بەیانیدا کوڕەکەم هات ووتی مژدەم بدەرێ چاك بومەوە سوپاس بۆ خوا چاك بوەوە شیفای بۆ هات، کوڕەکەم ووتی: شێخ محمد عوسمان ئیمشەو تەشریفی هێنا وە دەستی پیرۆزی هێنا بەسەرما، ئەمبینی ئاوا چاك بوومەتەوە، وە هەروەها چاوی دایکی چاك بوەوە و بینیا بوەوە وە خادیم و خزمەتکارەکەی خانەقا چاك بوەوە.

وە هەروەها شێخ عبداللە نووسی بووی[1]: ئەمانە هەمووی بە بەرەکەتی شێخ عوسمان گیانەوە بوو لە ماوەی یەك ڕۆژ سوپاس بۆ خوا.

**ك ٣٢١:** لە جەنابی زانای پڕ هەست و بیر مامۆستای پڕ هۆش و ژیرم بیست کە فەرمووی[2]: نامەیەك لە جەنابی شێخ عبداللە عزّی دێرزوریم چاوپێکەوت کە نووسیبووی مریدان و مەنسوبان لە سوریا و لە لوبنان و ئەمەریکا و ئەفەریقای خۆرهەڵات دەستتان زیارەت ئەکەن وە هەموو ئاواتیان نزای خێرتانە بۆیان[3]، وە داوای هیممەت و بەرەکەتتان ئەکەن.

منیش ووتم حەزرەتی پیری دەستگیر لەو وولاتانە و ناوچانە مرید و مەنسوبی هەیە؟ مەلا عبداللە فەرمووی: بەڵێ من وەڵامی ئەو نامانەم داوەتەوە کە لە مریدەکانییەوە لە ١١ یانزە وولاتەوە بەدەستی گەیشتوە بێجگە لە ئەمەریکا و لەندەن چونکە لەم دوو وڵاتە مریدەکانی حەزرەتی پیر نامەکە ئەنووسن بۆ شێخ عبداللەی ئەحراری عزّی دێرزووری ئەمیش نامەکە پێشکەش بە حەزرەتی شێخ محمد عوسمان سراج الدین وە جەنابییان وەڵامەکەی ئەنێرێتەوە بۆی ئەویش وەڵامەکەیان پێ ئەگەیەنێ وە لەو وولاتانەی کە ڕاستەوخۆ نوسراو بۆ حەزرەتی شا عوسمان ئەنێرن

---

(١) ئەم شێخ عبداللەی دێرزووری‌یە برای حەرەمی حەزرەتی شێخ علاء الدین (قدس الله سره)وە خاڵی جەنابی شێخ ئەمین و کاکە شێخ ثابت و شیخ مظهرە هەر سێ کوڕی شیرینی شای علاء الدین، کە جێگەدار و جێ نشینی بوو لە دێرزور، لە نامەیەکیدا کە نووسی بووی فەرموویبووی: پەخشی طەریقەتی نقشبندیم کردوە لە ئەفریقیای خۆرهەڵات و ئەمەریکا و گەلێ ناوچە و میرنشینی تر، وە لە موسڵمانەکانی بریتانیا نزیکی ٦٠٠٠ شەش هەزار کەس تەریقەتی وەرگرتوە.

(٢) ئەم زانایە ناوی ملا عبداللەی لاجانییە کە تا کاتی ئەم نووسینە نووسەر و کاتبی حەزرەتی پیرە وە ڕۆشەن بیرێکی زۆر ژیرە، وە لەمەو پێش لە چەند لا ناوی شیرینی براوە.

(٣) ئەم نوسراوە بۆ حەزرەتی سراج الدین قدس الله سره نوسرابوو.

حیجاز عێراق سوریا مصر لبنان ئەندنوسیا ئەفغان ترکیا ئێران پاکستان هندستان وە مریدەکانی ئەمەریکا داوای ڕێبازی رابیطەیان لە شێخ عبداللە کردوە لەگەڵ وێنەی حەزرەتی شا عوسماندا، منیش ئادابی رابیطەم بۆ نووسیون لەگەڵ چەند وێنەیەك بۆم رەوانە کردوون، سوپاس بۆ خوا ژمارەی مریدانی حەزرەتی شێخ گەیشتۆتە زیاد لە ملیۆن کەس، بە گوێرەی فەرمایشتی مامۆستا مەلا عبداللەی لاجانی لە بیارەی پیرۆزدا، خوا گیان تۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە دڵی موسڵماناندا جێگیر بکەیت وە راستی و حقیقەت لە دڵی موسڵمان جێگیر بکەیت آمین.

**ك ٣٢٢:** لە جەنابی مامۆستا مەلا رسولی لاجانیم بیست فەرموی: مەلا سید عبداللەی لاجانی کە یەکێك بوو لە خواناسان و پیاوچاکان لە کاتی فەقێیەتیدا بۆی گێرامەوە فەرمووی: دوای تمسّك وەرگرتنم و تەسلیم بوونم بە حەزرەتی شێخ نامەیەکم لە سەماحەتیان وەرگرت بۆ میرزا رۆستەم[(١)] لەوێ دەستم کرد بە خوێندن، لە دوای ماوەیەك بە هۆی ناکۆکییەکەوە لەمیانەی من و یەکێك لە فەقێکانی ئەوێ خەبەریان لێ دام کە ئەم فەقێیە ئێرانی‌یە[(٢)]، منیش هەستام چووم بۆ دێی سەرسیان و لەوێ جێگیر بووم، شەیطانی لعین علیه اللعنة خەیالاتی دا بە دڵما بە وازهێنان لە رابیطەو[(٣)] بەڵێ وازم هێنا ماوەیەك لەم ڕێبازە ممتازە، رۆژێ یەکێ لە فەقێکان هات بە مەحرەمانە پێی ووتم کیژێ هەیە زۆری خۆش ئەوێ!! منیش هیچ وەڵامێکم نەدایەوە تەنیا ئەوەندە نەبێ منی غەریب و فەقێ لەم دێیەدا چ پەیوەندییەکم بە کچی خەڵکییەوە هەیە، فەقێکە زۆری لەسەر رۆیشت و ووتی خۆشەویستییەکەی گەیشتۆتە

---

(١) میرزا رۆستەم: دێیەکە لە میانەی سلێمانی و قەڵادزێدا، لەسەر رێی دوکان.

(٢) پۆلیسێ هات بە نهێنی ئاگاداری ئەو ئیخباریەی کردم لەبەر رەزای خوا و خۆشەویستی فەقێی ئاینی نەیخستە رەسمیاتەوە، یان بەر لەوەی بخرێتە رەسمیاتەوە منی تێ گەیاند لەو بەسەرهاتە.

(٣) رابیطە: ڕێباز و ئادابێکی ئەم طریقە شیرین و پیرۆزە.

ئەوپەڕی و هەست و هۆشی پێوە نەهێشتووە ئەیەوێ چاوی پێت بکەوێ منیش بانگم کرد شەوێکیان چەند گفتوگۆیە لە بەینا روویدا و ئەمجار بەجێم هێشت و هاتمەوە حوجرەکەم جگەرەیەکم داگیرساند و کەوتمە خەیاڵاتەوە، نەخەیر چووم دەستنوێژێکم تازە کردەوە و هاتمەوە حوجرەکەم کتووپڕ حەزرەتی شێخ عوسمان لە پەنجەرەوە تەشریفی هێناو دەستی خستە دڵمەوە و گەلێك ئازاری دڵی دام منیش بە هەموو توانام هاوارم ئەکرد بە چەشنێ فەقێکانی رەفیقم هەموو رایان کردە دەرەوە بەم چەشنە بەو ئازارەوە لێی ئەپاڕامەوە و داوای یارمەتیم لێ ئەکرد ئەویش هیچ گوێی پێ نەئەدام و کتوپڕ تووڕی دام لە هەوادا، ئەم بینی کە خۆم لەسەرو خانقای بیارە لە هەوادا ماومەتەوە، حەزرەتی پیریش لەناو حەوشی خانەقادا وەستاوە، وەختەبوو لەتاو ئازاری نارەحەتی بمرم تا خۆی رزگاری کردم، کاتێ فەقێکان هاتنەوە ژورەوە لە کاری من سەریان سووڕما و خۆم بۆم باس نەکردن کە هۆی ئەم هاوارە چی بوو، ئیتر تۆبەم کرد کە واز لە رابیطە نەهێنم و بە کارێکەوە خەریك نەبم کە رەزامەندیی خوای تیا نەبێ شوکر و سوپاس بۆ خوا کە رزگاری کردم.

**ك ٣٢٣:** جارێکی تر بۆی گێڕامەوە فەرموی: لە حەزرەتی شێخ عوسمان سراج الدینم بیست کە باسی سەفەرێکی خۆی بۆ ئەگێڕاینەوە لە گەرمیان کە تووشی کۆمەڵێ ئاسك هاتین و خەریك بوون خۆیان لێ ئەشاردینەوە چونکە چەکدارمان لەتەکا بوو، منیش بە ئاسکەکانم ووت بۆچی خۆتان ئەشارنەوە ئێمە بە تەمای کوشتنتان نین بەڵام ئەمانەوێ سەیری جوانییەکەتان بکەین ئیتر ئەو ئاسکانە هاتنە ناومانەوە نزیکی سەعاتێ تێکەڵمان بوون و لەناو مانا مانەوە ئەمجار ئەوان رۆشتن ئێمەش رۆیشتین.

بالله یــا ظبیّات القاع قلن لنا
لیلاي منکنّ أم لیلی من البشر

تۆ خودا ئەی ئاهوانی دەشت و سارا پێم بڵێن
لەیلی من ئاخۆ لە ئێوەس[1] یا بەرەی ئینسانیە

**ك ٣٢٤:** دووبارە جەنابی ملا رەسوڵی لاجانی منعاوی بۆی گێڕامەوە فەرمووی ئەم کەرامەتەی شا عوسمانم لە جەنابی حەزرەتی شێخ مولانا بیستوە کە بۆی گێڕاینەوە فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەت حەزرەتی سراج الدین داوای دۆعایەکی کرد کە خوا کوڕێکی پێ خەلات بکات، حەزرەتی شا عوسمان دۆعاکەی بۆ نووسی و فەرمووی: ئەم دۆعایە لە بەرگ بگرە دوای لە موشەمما گرتنی ئەمجا بە دوو کشتەکی رەش و سپی لێ هۆنەرەوە دۆعاکەی پێ بکاتە ملی خێزانەکەت بە مەرجێ لایەکی بخاتە ناو قۆڵییەوە با دۆعاکە بکەوێتە تەنیشتێکییەوە، دوای ئەوەی منالەکان لەدایك بوون بیان هێننەوە، نەی فەرموو منالەکە، ئەم پیاوە رۆیشت و سالی داهاتوو خۆی و خێزانەکەی هاتنەوە و دوو منالیان پێ بوو بەلام وێنەی دۆعاکە و کشتەکە بادراوەکە لە لا تەنیشتی هەردوو منالەکە کێشرابوو، وە لەسەر رووی دۆعاکە وێنەی یا عوسمان کێشرابوو.

**ك ٣٢٥:** لە برای تەریقەت جەنابی شێخ محمدی خاونی دێی سەعدابادم بیست بۆی گێڕامەوە ووتی: لە بیارەی پیرۆز شەوێ لە خەتمەیەکا دانیشتبووم و چاوم لێك نابوو چرا کوژابوەوە، بینیم هەروەکو بە ئاشکرا ئەبینرێ لە رۆژدا بە چاوی دڵ حەزرەتی پیر تەشریفی لە دەرگای خانەقاوە هاتە ژوورەوە بە بەردەمی ریزەکانا تێ پەڕبوو تا گەیشتە بەردەمم تەشریفی دانیشت ئەژنۆی نوساند بە ئەژنۆمەوە، گەرمییەکی زۆرم بۆ هات ویستم راکەم خۆم بخەمە حەوزی خانەقاوە بە جل و

(١) ئێوەس: (ئێوەیە) مەریوان و چەن جێیەکی تر لەباتی لە ئێوە لە ئێوەس ئەڵێن. ئەڵێن فلان شت هی ئێوەس.

بەرگەوە، بەلام هەرچەندم کرد نەمتوانی هەروەکو بە بزمار بە زەویدا داکوترابم وەهابوو، ئەمجا ویستم بە هەموو توانام هاوار بکەم نەشم توانی ئەویش بکەم دوای ماوەیەك تەشریفی پڕ فەڕ و پیرۆزی هەڵسا سوپاس بۆ خوا بۆ ئەو لوطفە شیرینەی بۆ ئەو کۆمەکییە چاکەی کە فەرمووی لەگەڵما.

**ك ٣٢٦:** جەنابی مەلا محمد ئەمینی مدرسی کانیسانان بۆی گێڕامەوە ووتی: حەزرەتی شێخ محمد عوسمان لە بیارەی شەریفەوە بەرەو شاری سلێمانی تەشریفی کەوتەڕێ لە ڕێگا فەرمووی پێم: مامۆستا لە کوێ دابەزین؟ منیش عەرزم کرد خۆتان ئەزانن قوربان، چونکە جارانی بەرین کە تەشریفی سەریان لە سلێمانی بدایە یان لە ماڵی خوا لێ خۆشبوو حاجی سعیدی سلێمانی میوان ئەبوو یان لە خانەقای مەولانا خالید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی لە میوانخانە دائەبەزین، منیش خەیالات شالاوی بۆ هێنام چۆن ئەبێ حەزرەتی شێخ لە ئوتێل دابەزێ؟ ئەو شەوە دابەزین لەوێ لە کاتێکا بەشێکی شەو تێپەڕی بوو حەزرەتی شێخ خۆی کرد بە یەکێ لە ژوورەکاندا و منیش چوومە سەریان و خەوتم، کاتێ هەستام بۆ نوێژی بەیانی بینیم وا کۆمەڵێکی زۆر بە دەوری حەزرەتی شێخەوەن هەموو مەست و مەخموری مەیخانەی محبت بوون جەزبە و هاوار و صیحەیان ئەو ناوەی پڕ کردوە لە خۆشی و شادی، ووتم ئەمانە کێن ووتیان ئەمانە خەڵکی بانە و سەقزن هاتوون بۆ سەفەری حەج ئەڕۆن کۆمەڵێکن لە مریدانی حەزرەتی پیر، ئەمجار هات بە بیرما کە حەزرەتی شێخ لەبەر خاتری ئەمانەیە کە لە میوانخانە تەشریفی دابەزیوە، هەزار شوکر و سوپاس و ثەنا بۆ خوای پەروەردگار و درووود و سلاو بۆ ڕۆحی پاکی حەزرەتی محمد المصطفی ﷺ و ئال و یارانی خوا لێمان وەرگری.

**ك ٣٢٧:** خـوا لێخۆشـبوو مـلا محمـد ئـەمینی وەسـتا مصـطفی بـۆی گێڕامـەوە فەرموی: فەقێ بووم لە بیارەی شەریف و دامەزراو نەبووم لەسەر بڕوای تەواو بە حەزرەتی شا عوسمان چونکە عەقیدەکەم تەنیا بە زۆری بە حەزرەتی شێخ عـلاء الـدین (قـدس سـره) بـوو رۆژێکیـان تەشـریفی هێنـا شـا عوسمـان و دەزنوێـژێکی گـرت لـە حەوزەکـە و لەسـەر بـەردە نوێـژەکان ئـەهاتو ئەچـوو، مـنیش دەورم ئـەکردەوە دانێشەیەکی زۆرم هەبوو لە بیر خۆمم ئەبردەوە لەبەر خاتری پاداش و ئەجرەکەی لای خوا، کاتێ حەزرەتی پیر چاوی پێم کەوت سەری بەرز فەرمووەوە و پێی ووتم ئەی مامۆستای بەڕێز دانت دێشێ منیش عەرزم کـرد بـەڵێ فـەرمووی پەنجـەت بخـەرە سەر ئەو دانەی ئازار ئەکات منیش پەنجەم خستەسەری ماوەیەك موراقیب[1] بـوو لـە پاشا فەرمووی ئێش و ئازارەکەی نەما عـەرزیم کـرد بـەڵێ نـەما حمـد بۆ خـوا، ئیتر بڕواکەم دامەزراوتر بوو بەو زاتە و بۆم دەرکەوت کە زاتێکە لە پایەداران و عاریفـانی ڕێی خواناسی و بە دوو کەرامەتیشم زانی لە هەمان کاتا یەکەم بە پێزانینی ئازارەکەم دووەم کەرامەتیش بەلابردنی ئێشەکە.

**ك ٣٢٨:** جەنابی نور اللهی طاڵشی[2] بۆی گێڕامەوە فـەرمووی: لـەدوای وەفـات و کۆچی حەزرەتی شێخ علاء الدین قدس سره هـاتم بـۆ بیـارەی شـریف و چـووم بـۆ زیارەتی مەرقـەد و مـەزاری حـەزرەتی شـێخ نجـم الـدین (قـدس سـره)[3]، و شـەباکی پیرۆزیم راوەشاند و ووتم نجم الدین من چی بکـەم؟ مەبەستەکەشـم ئەوە بـوو کـە ئایـا

---

(١) موراقیب بوو: خەریك بوو بە منەوە و چاوی بۆ لێك نام.

(٢) جنابی سید نور اللهی طالشی یەکێك بوە لە مریدانی حەزرەتی شێخ نجم الدین قدس سره.

(٣) هـەروەکو ئاشکرایە ئـەم بزورگەوارانـە مـەزاری پیرۆزیـان لـە بیـارەی شـەریفە جـەنابی مجدّی تەریقـەت لـە زەمـانی خۆیـا حـەزرەتی شـێخ عمـری ضـیاء الـدین و حـەزرەتی شـێخ نجـم الـدین و حەزرەتی شێخ علاء الدین (قدس الله أسرارهم).

مەصلحەتە من تمسّك بە حەزرەتی شێخ محمد عوسمان بکەم یان نا؟ خەوتم لەو خەوەما پیشانیان دام لەسەر سینییەك نوسرابوو بەڕێز بەم چەشنە سراج الدین بهاء الدین ضیاء الدین نجم الدین علاء الدین عوسمان کە خەبەرم بوەوە دڵنیاییم پەیداکرد بە یەقینەوە بە حەزرەتی شێخ عوسمان سراج الدین ثانی و لەسەر دەستیا تمسکم وەرگرت و سوپاس و حمد بۆ خوای بێ هەمتا.

**ك ٣٢٩:** ئەم کەرامەتەش لە کەرامەتەکەی لەوە پێش ئەچێ ئەویش ئەمەیە کە حاجی مەلا محمدی تورکمان سەحرایی قارئ بۆی گێڕامەوە کە پیاوێکی پیر و بەساڵا چووە و هەموو قورئانی بە حەوت قیرائەتەکە لەبەر بوو، ئەم پیاوە لەسەر پەیڕەوی ئیمام أعظم (خوا لێی خۆشبێ) بوو ووتی لە خەو بینیم دەرختێکی گەورە و چوار کورسی لێ جیابوەوە، وە لە درەختەکە ئەم چوار کورسییە جیانەبوو بوە وە یەکێکیان بە ناوی سراج الدین دووەم بە ناوی ضیاء الدین سێیەمیان بەناوی علاء الدین چوارەمیان بە ناوی سراج الدین سوپاسێکی بێ پایان بۆ خوای تاك و تەنیا هەزاران سلاو و درود بۆ گیان و رۆحی پاکی پێغەمبەر ﷺ و یارانی سەراسەر.

**ك ٣٣٠:** لە جەنابی مامۆستای بەڕێز ملا سید علی[١] (نێ)م[٢] بیست گێڕایەوە ووتی کەوتمە رێ بۆ زیارەتی حەزرەتی شێخ محمد عوسمان سراج الدین (قدس سرە) بینیم کە جەنابی مامۆستا حاجی ملا مجیدی گەرمیانی لە خزمەتیا بوو خوا لێی خۆشبێ

---

(١) مامۆستا سید علی کوڕی نێ کوڕی بابە شێخ ئەڵمانەیە، کە دێیەکە سەر بە هەورامانی ئێران. ئەم مامۆستا سید علی نێیە یەکێکە لە زانا بەڕێزەکان، زۆر لە طریقەتدا پێشکەوتووش نیە وە پەلی محبەتی زۆر بالا نیە وەکو هەندێ لە مریدان بەلام سوێندی خوارد کە بە حقیقی حەزرەتی شێخی بینیوە کە لە شێوە و شکلی شێردا بووە سوپاس بۆ خوا.

(٢) نێ: ناوی دێیەکە لە مەریوان لە کوردستانی ئێران.

و بیبەخشیٚ بە رەحمەتی خۆی مجزوب بوو، بەلاّم جەزبەکەی تا ئەهات گەرمتر ئەبوو لەکاتی جەزبەکەیا ئەیوت وام لە فلاّن دیٚ کرد، وە بە فلاّن دیٚ ئاوام کرد بەم چەشنە دەسەلاّت و توانای ئەو زاتەی ئاشکرا ئەکرد لەو ناوچانەدا وە ئەی ووت لە کاتی جەزبەکەیا ئەمبینی کە حەزرەتی شیٚخ بەڕاستی بوە بە شیٚر بەسەر سوڕمانیٚکەوە ئەموت شیٚخ تەشریفی بوە بە شیٚر، فەرمووی حەزرەتی شیٚخ هەر بە شیٚری مایەوە تا کەوتە گفتوگۆ و فەرمووی سبحان الله من حەز ئەکەم عیٚراق خۆشبیٚ ئەمجار چوەوە سەر شیٚوەکەی خۆی.

**ك ٣٣١:** لە جەنابی بەڕیٚز خوا لیٚخۆشبوو مامۆستا مەلا محمدی[١] هیٚجانانی[٢] مەشهور بە مەلا محمدی مەلا داودم بیست فەرمووی: لە زەمانی فەقیٚیەتیدا تووشی خەتەرە و خەیالاّت بووم بە چەشنیٚ هیچ لە مامۆستاکەم حالّی نەئەبووم و خەیالّم ئەڕۆشت وە چەند سالیٚ بەردەوام بوو تا وای لیٚ کردم خەریك بوو واز لە خویٚندن بهیٚنم، مامۆستای خوا لیٚخۆشبوو ملا عزیزی پریس پیٚی ووتم چاریٚکی خۆت بکە و بەزەییت بە خۆتا بیٚتەوە، عەرزیم کرد چۆن چاری خۆم بکەم؟ فەرمووی: دوو کەس هەردووکیان ئەتوانن چارەسەری تۆ بکەن بچۆرە لای یەکیٚکیان با دەوای دەردت بکا یەکەمیان حەزرەتی شیٚخ علاء الدین دووەمیان حەزرەتی شیٚخ حسام الدین[٣] (خوا خۆشنوودیان بکات امین) منیش چووم بۆ خزمەتی حەزرەتی شیٚخ علاء الدین (قدس

---

(١) مامۆستای هیجانانی رحمه الله: فەرموی لە هەوەڵەوە چومە خزمەت شیٚخ حسام الدین قدس سره ماوەیە مامەوە حالّم لە دەس ئەودا چارەسەر نەبوو هاتمەوە چوومە خزمەت حەزرەتی علاء الدین بە سواری لە هەڵەبجە بە خزمەتی گەیشتم فەرموی ئیٚمە لە سەفەرین تا دیٚمەوە زیکری لا حول ولا قوة إلاّ بالله بکە.

(٢)دیٚیەکە نزیکی سەقزە.

(٣) چونکە مەلا عزیزی پریس خۆی مریدی شیٚخی حسام الدین بوو (قدس الله سرّە العزیز).

سره) له بیارەی شەریف و ماوەیەك لە خزمەتیا مامەوە رزگـارم نـەبوو داوای بەیعـەتی لیٚ کردم منیش کامیاب بووم بە تمسك و وەرم گرت و بەردەوام بووم لەسـەر رابیطە رۆژێك پرسیاری لیٚ کردم فەرمووی: حالّت چۆنە؟ عەرزی ئەو عەزیزەم کرد نـازانم ئاکامی چۆنە، فەرمووی لەبەر ئـەو دوو میوانـەم سـەرم نەپـەرژاوە، گـەر مـاوەم بـوو ئەمشەو دێم بۆ خەتمە و توجهت لـیٚ ئەکـەم وەئەگـەر نەمپـەرژا ئـەوا یـەکیٚ ئـەنێرم لـە جیاتی خۆم توجهت لیٚ بکا منیش زۆر دلّخۆش بووم بەو فەرمایشتەی، بەلاّم

مـــا کـــلّ مـــا یتمنّـــی المـــرء نائلـــه
تجـــري الریـــاح بمـــا لا تشـــتهی الســـفن[1]
ئـــاواتی بـــــە شـــەر گشـــت نایـــــەتەدی
(بـــا) دیٚ بـــە زیـــددی ئـــارەزووی کەشـــتی

له دەمەو عەسرا نزیکەی ٣٠ سواریٚ ئەبوو گەیشتنەجیٚ زۆر خەمینی کردم بـەلاّم ئاواتێکی ترم هەر مابوو فەرمووی یەکێك ئەنێرم توجهت لیٚ بکا کـاتیٚ خەتمـە دەسـتی پیٚ کرد هەستم کرد یەکیٚ هات و لە خەتمەکەیا تەشریفی دانیشـت لەبـەردەمما لـە پـاش تـۆزیٚ بینـیم دلّـم وەکـوو ژوورێکـی بچـوکی سـپی لـیٚ هـات، وە گلـۆپێکی تیـا داگیرسێنرا سپی بوو ئیتر لەم بەلاّ و پارەحەتییە رزگارم بو فالحمد لله فـاطر السموات والأرض وصلّی الله علی سیدنا محمد وعلی آله وصحبه وسلم آمین[2].

---

(١) بە هەموو ئاوات پیاو ئەلّبەت ناگات بەمەیلی پاپۆڕ هێزی با ناڕوات

(٢) مەرحومی مامۆستا مەلا محمـدی هیجانـانی: فـەرموی کـاتیٚ هەسـتم کـرد کـە یـەکیٚ لەبەردەمما دانیشت، دلّم وەك ژورێکی بچوکی سپی کـراوە کـە گلـۆپێکی تیـا داگیرسـابیٚ وای لێهـات. ئـەنجا هەستم کـرد وەك مقـاش شتێك برایە دلّـم شتێکی پیٚ دەرهێنن. هـەوەلّ جـار بـەدەم مقاشـەکەوە نەهات قرتەی دەمی مقاشەکەم بیست کە دای بەیەکا وە شتەکەی لە دەم دەرچوو، جـاری دووەم مقاشەکەی بردەوە ڕایکێشا ئیتر ڕزگارم بوو. کە چاوم کردەوە حەزرەتی شێخ عثمان بوو.

وه فەرمووی: کاتێ ئەو زاتە پیرۆزە لەبەردەمما دانیشت هەر چرایەك بوو خرایە ناو دڵمەوە، وە یەکێك مقاشێکی خستە ناو دڵمەوە و شتێکی لێ دەرهێنا دووبارە گرتی و رایکێشا ئەمجارە بە توندی گرتی و رای کێشا و دەری هێنا کە چاوم کردەوە سەیر ئەکەم حەزرەتی شێخ محمد عوسمانە لەبەردەمما دانیشتوە، ئیتر سوپاس بۆ خوا ئەم خەیالاتەم نەما و رزگارم بوو بە هیممەتیان لەو بەلایە.

**ك ٣٣٢:** لە کۆمەڵێك بڕوا پێکراوم بیست لەوانە یەکێکیان مامۆستا مەلا سید باقییە کە فەرمووی: حەزرەتی پیری دەستگیر بۆی گێڕاینەوە فەرمووی: بە ناوچەی گەرمیاندا ئەڕۆیشتین رانە مەڕێ دای بەلاماندا، حەزرەتی پیر بە شوانەکەی فەرموو کە خاوەنی مێگەلەکە بوو: ئەم کاوڕە مێیە ئەڵێ خاوەنەکەم نەزری تۆی کردوم بە بەرخۆلەیی، ئێستا کە گەورە بووم دوو بەچکەم بووە پەشیمان بۆتەوە نەفسی رێگەی نادات بەو نەزرە لەگەڵ تۆدا بەجێی بهێنێ، خاوەنەکەشی ووتی بەخوا راست ئەکەی وایە، سوپاس و شوکر و سەنا هەر بۆ خوایە درودێکی بێ پایان و ژمارە بۆ سەر پێغەمبەری نازداری و یەکە یەکەی یارانی.

**ك ٣٣٣:** لە بەڕێز و دڵپاك زانای خۆشەویست و بێ نەزیر مامۆستا مەلا نظیری دۆستی بۆ خوام بیست کە فەرمووی: حەزرەتی پیری دەستگیر شای سراج الدین فەرموی: چوم بۆ زیارەتی حەزرەتی وەیسی قەرەنی لە مایدەشت بینیم نورێك لەسەر شێوەی گومەز لەسەر مەرقەد و مەزاری پیرۆزیەتی وە ئەو گۆمبەتەش هەڵواسراوە بە عەرشی مەجیدەوە ﷺ.

**ك ٣٣٤:** دووبارە خۆیشم لە حەزرەتی شا عوسمان سراج الدینم بیست فەرمووی: چووین بۆ زیارەتی وەیسی قەرەنی (خۆشنودی خوا بێ) لەوێ ئاومان لێ بڕا، ئاویشمان لێ دووربوو، وەختێ بەیانی لە خەو هەستام و کەمێ رۆیشتم کانییەکی روونم چاوپێکەوت و کۆمەڵێ درەختی بە دەرەوە بو بۆ نوێژکردن ئامادەکرابوو

دەزنوێژێکم شت و نوێژم کرد، وا بزانم فەرمووی: لە ئاوەکەشم خواردەوە، ئەمجار گەڕامەوە بۆ ناو هاوڕێکانم و پێم ووتن ئێوە ئەڵێن ئاو لێرە دەست ناکەوێ بەڵام من لەوێدا ئاوم دۆزییەوە ئەوان لە قسەکەم سەریان سڕما کاتێ هاتن و سەیرییان کرد ئاوی دەزنوێژەکەیان بینی کە دیار بوو بە دەم چاویەوە، ووتیان ئاو لەم ناوچەیە دەست ناکەوێ وە هەر کەس بێت بۆ زیارەت ئاوی پێویست لەگەڵ خۆیاندا ئەهێنن و ئێمەش ئاومان لەگەڵ خۆمان هێناوە منیش پێم ووتن ئەو ناو و نیشانەکانی و ئاوەکە نزیکە و کۆمەڵێ درەختی بە دەورەوەیە چوون و هاتنەوە ووتیان ئاومان نەدیوە بەڵام کاتێ خۆم چووم لەگەڵیانا ئاساری ئەو شوێنە نەمابوو نە کانی و نە ئاو و نە درەخت خوا هەمووی لێ وون کردبوون و چاومان پێی نەکەوتەوە منیش ووتم دیارە ئەمە کەرامەتێکی حەزرەتی پیرە چونکە مەزاری پیرۆزی کەوتۆتە سەر شاخێ لە دێهاتی دەوروپشتی ئاوی بۆ ئەبەن وە چەند کووپەیەك دانراوە پڕ ئەکرێن لە ئاو بۆ میوان و زیارەت گەران.

**ك ٣٣٥:** جارێك حەزرەتی شێخ عوسمان، (قدس سره) بۆی گێراینەوە فەرمووی جارێك لە بەغاوە بەرەو فلوجە و رومادی ئەڕۆیشتم، وابزانم لە ناوچەیەك لە نزیکی ئەبو غرێب نیسبەتی حەزرەتی وەیسی قەرەنیم لە ڕێگا ئەبینی، سەرم سوڕما و لە ئۆتومبێلەکە دابەزیم لە چەند کەسێ کە لەو ناوە نزیك بوون پرسیارم کرد (یانی لە ئەڕواحی ئەو بوزورگانەی لەو ناوە مدفون بوون) ئایا لەم نزیکانە نەزەرگایەك هەیە یان مەزاری پیاوێکی خواناس فەرموویان لێرە، ئیشارەتیان بۆ نەزەرگای وەیسی قەرەنی کرد خوا لێی خۆشنود بێ.

**ك ٣٣٦:** لە زاتی تێگەیشتوو خاوەن ڕێزو پێگەیشتوو مامۆستا ملا عبدالله لاجانی کاتبی حەزرەتی پیرم بیست فەرمووی لە چەند کەسێکی خاوەن بڕوا و جێگەی سیقەم بیستوە کە بۆیان گێراومەتەوە کە حەزرەتی شا محمد عثمان بۆی گێراینەوە

فەرموی: جارێك منالٚ بووم بە فەرمانی شێخی باوكم چووم بۆ دێیەك لەگەلٚ چەند خادمێكی خانەقادا وائەزانم دێی كەماڵە بوو، تۆزێ پاڵكەوتم بۆ حەوانەوەو خەوتن لە مەنزڵەكەمدا.

بینیم وائەزانم لە مەجلسێك دام كۆمەڵی بوزرگان لە ئەولیای خوا لە حەزرەتی سراج الدّینەوە تا شێخی باوكم (قدس الله أسرارهم) هەموویان حازرن، حەزرەتی شیخی سراج الدّین لە باوكمی پرسی: ئایا عثمانت تعلیم و تلقین كردوە؟ فەرمووی: نەخێر، فەرمووی: من تعلیم و تلقینم كردوەو بانگی كردم حەزرەتی شێخی سراج الدّین و چوومە خزمەتی و لە بەردەمیا بە پێوە ڕاوەستام تعلیم و تەلقینی تەریقەی كردم. كاتێ بە ئاگا هاتم حاڵم گەیبوو بە مەرتەبەی سلطان الأذكار چاوم نا بەیەكا هەموو كەونم لە بەرچاوا دیاربوو، ئەمجا چاوم كردەو چاوم نایەوە بەیەكا هەموو جیهان سەراپا لە بەرچاوما ئاشكرابوو ئەو ڕەفیقانەم كە لەگەڵما بوون بۆ دێ ئەمبینین كە لەگەلٚ ئافرەتی نامەحرەمدا قسەیان ئەكرد لە ناو دێیەكەدا، وەختێ گەڕانەوە پێم ووتن: بۆچی لەگەلٚ ئافرەتی نامەحرەمدا قسە ئەكەن؟ ووتیان چۆن بوویت بە شێخ؟ منیش پێم ووتن: ڕاست ئەكەم لە قسەكانما بەو ناونیشانەی دایكم دۆڵمەمان بۆ ئەنێرێ وە سبەینێ ئێوارە بە سواری ئێسترە سپییەكەدا ئەگاتە ئێرە.

بۆ سبەینێ لەكاتی عەسرا پیاوێ بە سواری ئێسترە سپی هات و چێشتی ناوبراوی بۆ هێناین، سوپاس بۆ خوا لە سەر ئەو لوتفەی فەرمووی.

**ك ٣٣٧:** لە كاكە ئەحمەدی سەقزی ئاشپەزی خانەقام بیست كە فەرمووی:

لە سەقزەوە لەگەلٚ كۆمەڵێكا كە بۆ زیارەتی حەزرەتی پیر هاتبوون گەڕاینەوە بۆ دووڕووە كاتێ گەیشتمە نزیكی (دەرێ)[1]، تووشی سێ كەس بووین خۆیان بە دەروێش و سەر بە تەریقەتی قادری ئەزانی هەزاران ڕەحمەت و سلاو لە مەشایخان و

---

(١) دەرێ: دێیەكە نزیكی حەوت كاژێر لە پایتەختی بوزرگان كە دووڕووەیە دوورە.

مریدانی بێت ئامین، یەکێکیان پێی ووتم دوای ناسینەوەم: ئەحمەد تۆ صوفی و لە ماڵی شێخای؟ منیش ووتم بەڵێ، یەکیان ووتی ئێوە ئەڵێن هەر کەسێ نانێکی حەزرەتی شێخ بخوا چاوی دڵی ڕوناك ئەبێتەوەو دەرك پەیدا ئەکات؟ ووتم نەء، ووتی نەخەیر ئێوە ئەڵێن، ئەبێ پێم بڵێی کە من لە کوێ بووم؟ ئەگەر ڕاستت پێ ووتم وا بڕواتان پێ ئەکەم ئەگینا بەم شیرە سەرت ئەبڕم، وەشیرەکەی بەدەستەوە بوو، پێم ووت بەخوا نەمان ووتوەو هیچیش نازانم وازم لێ بێنە با بڕۆم، ووتی هەر ئەبێ پێم بڵێی لە دەست من رزگار نابی، پێم ووت تۆ چەند ساڵە چەندەها جار سەرت لە شێخەکەت داوەو بیست ساڵێکە تەریقەتت وەرگرتوە ئایا تۆ هیچت وەرگرتوە تا من وەری بگرم و بیزانم؟ ووتی من گوێ بۆ ئەو قسانە ناگرم هەر ئەبێ پێم بڵێی من لە کوێ بووم؟ منیش لی دڵی خۆما ووتم ئەگەر ئەڵێم لە دووڕووە بووی ئەڵێ دیارە لە خۆشەویستی و محبّەتی خۆتەوە وات ووت، ئەگەر ئەڵێم لە سەر ئاباد ئەگونجێ وا نەبێ، لە یادیشم چوو داوای کۆمەکی و ئیستیمداد بکەم لە حەزرەتی شێخ لەو ماوەیەدا، هاوڕێکانم بە جێیان هێشتم و دوورکەوتنەوە تۆزێ بیرم کردەوە لە پڕ یادی حەزرەتی شێخ هات بە خەیاڵما و عەرزیم کرد بە دڵ: قوربان گیان لەم بەڵایە نەجاتم بدە چۆن تووشی ئەم پیاوە بووم کە حەزرەتی شێخ تەشریفی حازربوو فەرمووی: غەیبەتی مەکە و پێی بڵێ: تۆ لە تاران بووی وە لەوێ چەند ڕانە مەڕت فرۆشت و دووهەزار تمەنت[1]، قازانج کردووە، وە دوو مانگ لەوێ ماویتەوە، وەئەم نیوڕۆیە لە دێی گۆشخانی چێشتی دۆخەوات خواردوە، ئەمانەم هەمووی پێ ووت، ئەمجار پێم ووت: ئایا ئەوانەی پێم ووتی ڕاست بوو؟ ووتی بەڵێ: ئەمجار سێ تەڵاقەی خوارد کە ئیتر نەچێتەوە بۆ لای شێخەکەی خۆی، وە خواحافیزیم لێ کردو خواحافیزی لێ کردم. تۆزێ ڕۆیشتم و بانگی کردم گەڕامەوە بەڵام ترسام لەوەی کە پرسیارێکی ترم لێ بکات و منیش

(١) تمەن : دراوێکی ئێرانە جاران بە (٥٠) فلس (درهەمێکی) عێراق ئەچوو.

نەزانم وەڵامی بدەمەوە، کە سەیر ئەکەم چەند تمەنێکی دامێ ووتی وەری بگرەو لە ڕێگا خەرجی بکە منیش بێ دڵیم نەکرد و کەوتمە ڕێ، سوپاس بۆ خوا.

**ك ٣٣٨:** جارێکی تر بۆی گێرامەوە ووتی:

جارێکیان لە خزمەت حەزرەتی پیردا بووم ئەوزاتە موبارەکە پێکەنی و سەری هەڵ بڕی فەرمووی: ئەزانی بە چی پێ ئەکەنم؟ عەرزیم کرد نەخەیر، فەرمووی ئێستا ڕۆحی خوالێخۆشبوو مەلا محمّدی هەیجانی هات و پێکەنی و ڕۆی، بۆیە منیش پێکەنیم. هەزاران شوکرو سەنا بۆ زاتی پاکی خوای بێ هەمتا درودێکی بێ پایانیش لە سەر پێغەمبەری نازدار حەزرەتی محمّد المصطفی ﷺ و یەکە یەکەی ئال و یارانی بێ.

**ك ٣٣٩:** لە جەنابی مەلا شێخ زاهیدی سەقزم بیست لە کاتێکا کە هاتبو بۆ دووڕووە خۆی و خێزان و ماڵ و منالی و کچێکی حامیلەی، زۆر خەم و پەژارە دای گرتبوو لەوەی کچە سك پڕەکەی کەوتبوە سەر خوێن وە شەریکی ژیانەکەشی خاوەن بڕواو عقیدە نەبوو بە حەزرەتی شێخ، چونکە پرسوڕا کرابوو بە پزیشك و چارەسەری بۆ نەدوزرابووەوە، لە بەر ئەوە هێنابووی بۆلای شێخ بۆ موعالەجە ووتی: لە خزمەت حەزرەتی شێخدا زۆر پاڕامەوەو داوای یارمەتی و کۆمەکی بۆ ئەو کچەم لێ کرد کە ئەمشەو ئەو خەمەمان لەسەر هەڵ بگرێ بە کۆمەکییەکی زۆر کە بۆمان بخاتە کار، بۆ بەیانی ئەو شەوەدا فەرمووی: تۆ خۆت لە قەدیمەوە من ئەناسی کە عادەتم نیە کە نهێنی ئاشکرا بکەم بەڵام بە حەقی ئەم قورئانە ئەمشەو ئامینەی کچتم لە خزمەت رسول الله ﷺ معرفی کرد با بزانین خوا چی ئەکات. ئەمجا هەڵسائین لە خزمەتیاو ڕۆیشتین، لە دوای مانگێ چاك بوو وە منالەکەش زەرەری پێ نەگەیشتبوو زیندو بوو لە سکیا بە بەرەکەت و هیممەتی حەزرەتی شێخ حمد وسەنا بۆ خوا هەزار جار وە هەزاران درود و سلاو بۆ سەر ڕۆحی پاکی پێغەمبەر ﷺ و یارانی.

**ك ٣٤٠:** جەنابی برای خووڕەووشت شیرین و زانای زۆر بەڕێز و خۆشەویست مامۆستا شێخ عثمانی زونجی بۆی گێڕامەوە فەرمووی:

شەوێ لە دووڕووە زۆر عجیب مجذوب[1] بووم منیش پێم ووت ئەوە چۆن بوو؟ ئەویش فەرمووی: ئەم جەزبە سەیرەم هێشتا نەگێڕاوەتەوە بۆ هیچ کەس بێجگە لە جەنابی مامۆستا ملا محمّدی وولەژێری نەبێ کە ئەویش کاتی خۆی مامۆستام بووە. فەرمووی: ئەمەیە (حەزرەتی شێخ تەشریفی هێنایە خەتمەکەوە وە لەو ڕیزەدا کە منی تیا بووم دانیشت، کاتێ تەشریفی هاتە بەرامبەرم منیش بە هیممەتیان مجزوب بووم تا بە تەواوی لێم نزیك بووەوە و تەشریفیان دانیشت منیش بە چاوی دڵ ئەمبینی کە ئەو سەماحەتە خاوەنی دەسەلات و پایەیەکی زۆر گەورەیە وەخت بو لە ترس و سامی ئەو زاتە بمرم وە واشم تێ گەیەنرا کە کراوە بە متصرّفی کەون و ئیجازەی تەواوی لە حەزرەتی مەولای ربّ العزّە پێ دراوە لەم کەونەدا وە ئەشمزانی کە چۆن تصرّف ئەکات، ئەمجار کە ئەمەم بینی دەستم کرد بە پاڕانەوەو دۆعا کردن بۆ ئەوەی خوا ئیصلاحی حاڵی خۆمان و ولاتمان بکات، وەلەم پاڕانەوەو دۆعایەدا دەسەلات لە دەست خۆما نەبوو. وە هەستم ئەکرد کە هەر دۆعایەکم ئەکرد لێم وەر ئەگیراو حەزرەتی شێخ تەسلیمی ئەو شوێنەی ئەکرد کە خوا مەیلی ئەفەرموو بۆ وەرگرتن و قبووڵ بوون.

**ك ٣٤١:** جارێکی تر بۆی گێڕامەوە فەرمووی: لەکاتی فەقێیەتیما کە خەریکی خوێندن بووم لەگەڵ جەنابی مامۆستا ملا سید احمدی دەرەمەڕی لە وولاتی شنۆ لە دێیەکا، مامۆستاکەمان بڕوای بە حەزرەتی شێخ محمد عثمان (قدس الله سرّە العزیز) نەبوو، ڕۆژێ لەبەینی خۆمانا ووتمان ئیمڕۆ کە چووین بۆ دەرس صوڕەتی میثالی حەزرەتی پیر لە بەردەمی مامۆستادا حازر ئەکەین بزانین چی ئەبێت؟ کاتێ کە چووین

---

(١) لە کاتی ئەو جەزیەیەیدا بەندەش لە دووڕووە حازر بووم. (دانەر) رحمەالله علیه.

بۆ دەرس و دانیشتین وە ئەوەی مەبەست بوو بەجێمان هێنا، ماموستا هاواری کرد و بە دەنگی بەرز ووتی الله ئەمجار بەسەرسوڕمانێکەوە فەرمووی ئەریٚ ئەوە مەلا عثمان و مەلا سید احمد ئەوە چی ئەکەن ئێوە[1]!!!

**ك ٣٤٢:** لە برای شیرین کاکە بهاء الدینی کوڕی میرزا عبدالوهابی شەفیعی بیستم کە ئەفسەرێکی لاوی تازە پێگەیشتوو بوو، لەگەڵ ئەو هەموو محبّەت و عەقیدە شیرینی و دامەزراوییەشیا خاوەنی جەزبەیەکی گەرم بوو، شەوێك لە حاڵی مجذوبیدا چاوم پێی کەوت بە چەشنیٚ سامێکی پێوە بوو گێڕایەوە فەرمووی: لە کاتی جەزبەکەمدا بە خزمەت حەزرەتی رسول الله (صلی الله علیه و سلم) مشرّف بووم لە هەوادا وەستا بوو وە حەزرەتی شا محمد عثمان(قدس سره) تەشریفیان لە خواری پێغەمبەرەوە وەستا بوو لە هەوادا، نورو بەرەکاتێکی زۆرم ئەدی لە حەزرەتی رسوڵی ئەکرەمەوە لە شێوەی چەتردا بەرەو حەزرەتی پیرمان ئەچوو، وە حەزرەتی شای سراج الدین بە سەر موسڵماناندا دابەشی ئەکرد، وە لەو جەزبەمدا ئەم بینی کە حەزرەتی پیر داوای زیاتری ئەکرد لەو بەرەکات و نورە هەروەکو رۆڵەیەکی شیرین داوای لە باوکی بکات و نازی هەڵگیریٚ. شوکر و سوپاس و سەنا بۆ خوای پەروەردگار هەزاران درود و سڵاو بۆ رۆحی پاکی پێغەمبەر ﷺ و یارانی.

**ك ٣٤٣:** لە بەڕێز جەنابی محمد خانی تیکانتەپەم بیست گێڕایەوە فەرمووی:

لە خەوا بینیم کە خەڵکی لە قەبرەکانیان هاتبوونە دەرەوە، وە خۆڵ و تۆز لە سەریان ئەکەوتە خوارەوە، وە بینیم حەزرەتی شیخ محمد عثمان لە ئاسمانەوە بەرەو

---

(١) لە جەنابی ماموستا سید احمدیش بە عەینی شێوە بیستومە، وە لەم کاتەدا ئەم دڵپاکە شیرینە تمسکیان هێشتا بە حەزرەتی پیر نەکردوە، لەوە دوا پایەدار و مشرف بوونە بە نیعمەتی تمسّك فالحمدلله والصلاة والسلام علی رسول الله و آله و أصحابه الأتقیاء الحنفاء و نفعنا الله بحضرة الشیخ محمد عثمان سراج الدین.

زەوی بە دەورییانا ئەگەڕا، وەتا خەبەرم بوەوە ئەو حاڵەتەم هەر ئەبینی، سوپاس بۆ خوا، درود و سلاو لە سەر پێغەمبەری موبارەك ﷺ و یارانی بێ.

**ك ٣٤٤:** لە صۆفی کریمی کەمتارانیم[1] بیست کە بۆی گێڕامەوە فەرمووی:

برایەکم بە ڕەحمەتی خوا چوو، ئەولیاکان هاتنە دیاری لە کاتی گیان کێشاندا وە حەزرەتی شا محمد عثمانی سراج الدین تەشریفی پڕ خێرو پیرۆزی هێنا، بە دەستی موبارەکی گەوهەری ئەکرد بە دەمی براکەمەوە.

**ك ٣٤٥:** جارێکی تر هەر لەم صۆفی کەریمەم بیست گێڕایەوە فەرمووی:

جارێکیان حەزرەتی شیخ محمد عثمان تەشریفیان لەگەڵ کۆمەڵێك لە دێی چوارکلاوە هاتنە خزمەتی بۆ زیارەت و بەخێرهاتن و عەرزی ئەو عەزیزەیان کرد، کە فلانە کەس لە دێیەکەمان نەخۆشە تکای بۆ بکە خوا شیفای بۆ بنێری، منیش لە شوێنی کەوشکەنەکە دانەنیشتبوم بە پێوە بووم دەسبەجێ ئەو سەماحەتە وازی لە نووسین هێنا و موراقیب بوو، منیش چاوم نا بەیەکا، دیم حەزرەتی پیر بە ڕۆح تەشریفی موبارەکی بردە چوارکلاوو منیش لە خزمەتیا ڕۆیشتم، ئەوزاتە عظیم و بوزورگە چوە ماڵی نەخۆشەکەو تۆزێ بە سەر نەخۆشەکەدا تەشریفیان لار بووەوەو بینیم کە دووکەڵێ لە نەخۆشەکەو نەخۆشییەکەی بەرزبوەوە سەرم هەڵبڕی و هاوارم کرد نەخۆشەکە شیفای بۆ هات، کۆمەڵەکە ووتیان چۆنت زانی؟ ووتم زانیم. هەر لەو ڕۆژەدا کە پیر تەشریفی برد و سەری لێدا چاك بوەوە. حمد و شوکرانە بۆ خوای پەروردگار وە درووود و سلاو بۆ گیانی پێغەمبەر ﷺ و یارانی خوا پیرمان پایەدار بفەرموێ.

---

(١) ئەم صۆفی کەریمە بە وەسیلەی دۆستان چەندەها ڕووداوی گەورەو سەیری لێ ئەگێڕنەوە.

**ك ٣٤٦:** وه برای عەزیز جەنابی ملا علی سراژگایی بۆی گێڕامەوە فەرمووی:

من جارێکیان بە خزمەت حەزرەتی شێخ محمد عثمان سراج الدین گەیشتم بە ئاشکرا لە کاتێکا کە ویستم لە ماڵەوە بێمە دەرەوە بەرەو خزمەتی بۆ زیارەت بچم بۆ دووڕووە هاتمە دەرەوە لە ماڵ و ئاوڕێکم دایەوەو داوای کۆمەکی و یارمەتیم لە حەزرەتی شێخ کردو ووتم: ئەی حەزرەتی شێخ محمد عثمان لێت دەپارێمەوە کە ئاگات لە ماڵەکەمان بێ با پارێزراوبێ، بە ئاشکرا بە خزمەتی گەیشتم پاڵی دابووەوە بە کەلوپەلی ماڵەکەمانەوەو ئەمبینی، شوکر بۆ خوا.

**ك ٣٤٧:** دوبارە فەرمووی :

جارێك هەستام چووم بۆ دێی قۆزڵوو ئەو دێیەش موریدی حەزرەتی پیری تیا نەبوو، یەکێکم بینی لە دێکە نوێژی ئەکرد، کتوپڕ دڵم خەبەری دا کە ئەوە موریدی شێخە، کاتێ سلاوی نوێژەکەی دایەوە خۆم پێ نەگیرا هەستام و باوەشمان کرد بە یەکاو دەست و مۆچمان کردو هەردوکمان مجذوب بووین، کاتێ حاڵەتی جەزبەکەمان هاتە کزی و نەما سەیر ئەکەم لە شوێنی خۆمان نەماوین هیچمان کە ئاوڕێکم دایەوە بە لایەوە سەیر ئەکەم حەزرەتی شێخ محمد عثمان سراج الدین لە بەینی هەردوکمانا تەشریفیان دانیشتوەو عەبایەکی ڕەشی لەبەردایە، دووبارە هەردووکمان مجذوب بووینەوە ماوەیەکی زۆر دەوامی کرد. شوکرانە بۆ خوای پەروەردگار.

**ك ٣٤٨:** سێ بارە فەرمووی:

لە کاتێکا ئیمام بووم لە دێی تموتە وا ڕێکەوت لە مانگی ڕەمەزان شەوێ لە نیوەشەودا پێویستم بە غوسڵ بوو، چووم بۆ حەوز بۆ خۆشۆردن کە تۆزێ دووریش بوو مزگەوتەکەش لە چۆڵەوانیدا بو وە بە ناو دارستانێکا بۆی ئەڕۆیشتی و حەوزەکەش دەرگای نەبوو، کاتێ چوومە ناو حەوزەکەوە ترسێ هات بە سەرما لە دڕندەو وەحشی کێوی کە ئێستا لەم کاتەدا ئەگەر گورگێ یان دڕەندەیەك بێت بۆم

کیْ فریام ئەکەویْ و ڕزگارم ئەکا؟ ڕوانیم بۆ لای دەرگاکە بینیم وا حەزرەتی شیْخ محمد عثمان لە بەر دەرگاکەدا وەستاوەو ڕووی کردوْتە دەرەوە بۆ ئەوەی نەمبینیْ زۆر تەریق بوومەوە، چونکە لەوکاتەدا حەزرەتی شیْخم لە یادا نەبوو، سەرم داخست لە شەرم و پەشۆکاویدا، دوایی کە ڕوانیم ئەو زاتە تەشریفی موبارەکی بردبوو، ئیتر ترسم نەما زۆر شوکر بۆ خوا لە سەر ئەو نیعمەتە بیْ پایانە.

**ك ٣٤٩:** جەنابی مامۆستا ملا عەلی گلّیی بۆی گیْڕامەوە فەرمووی:

خیْزان و منالّەکەم هەموویان پیْکەوە ناساخ بووین، منالیْ لە دیْکەدا بە ڕەحمەتی خوا چوو لەگەلّیانا چووم بۆ سەرقەبران و تەسلیممان کرد، لە کاتی گەڕانەوەدا من لە بەر ناساخی لەگەلّیانا نەمتوانی بچمەوە بۆ مالّی ئەوان، داوای جیابوونەوەم لیْ کردن، ڕۆیشتمەوە بۆ مالّی خۆمان تا و لەرزیْ دای گرتم و بە چەشنیْ نەخۆشی زۆری بۆ هیْنام بیْ هۆش بووم کاتیْ بە ئاگا هاتم سەیر ئەکەم خیْزان و منالاّن زۆر ناساخن و کەوتوون، ڕوو لە شیفاو چاك بوونەوە نین بینیم شیطان علیه اللّعنه وا لە تەنیشتمەوە پەرداخیْ ئاوی بە دەستەوەیە، زانیم ئەوە خۆیەتی پیْم ووت: بۆچی ئەم ئاوەت هیْناوە خۆ من سیْ ڕۆژە لیْوم تەڕ نەکردوە، گویْم لیْ بوو دەنگیْك و بارەیەکی لیْوە هات پەرداخەکەی فڕیْ دا و ملی شکاند لەعنەتی خوای لیْ بیْ، ئەمجا ویستم بە لای ڕاستا بکەوم نەمتوانی وەهەروەها بە لای چەپ و بە سەر گازی پشتا نەمتوانی لەسەر قاچ وەستام و هاوارم کرد ئەی طایفەی شیْخ محمد عثمان فریام کەون خۆوامن خەریکە ئەمرم وە مەبەستم لە حەزرەتی شای سراج الدین بوو، وە وام ئەزانی کە ئەمرم کە شەیتانی مەلعون خۆی پیشان داوم، بینیم کە حەزرەتی شیْخ محمد عثمان سراج الدینی ثانی تەشریفی هیْناوە عەبایەکی زەردی پۆشیبوو کۆمەلّیْکی زۆری لە خزمەتا بوو، کۆمەلّیْکیان چوونە سەربان و بەرامبەر دەرگاکە وەستان، وە هەندیْکیان هاتنە ژوورەوەو بە پیْوە وەستان، حەزرەتی شا عثمان تەشریفی هیْنایە ژوورەوەو زاتیْکی لە خزمەتدا بوو نەم ناسی، پیری دەستگیر بەسەرمەوە وەستا فووی

کرد بەسەر من و هەموو ئەندامانی خیزانەکەدا وە ئەوزاتەی لە خزمەتیا بوو پێی گرتم و لەناو جێگاکەدا پاڵی خستم، منیش لە دڵی خۆما ووتم ئەوا پاڵی خستم بۆ مردن، بێ ئاگاییم هات بە سەرا کاتێ هۆشم هاتەوە بینیم خۆم و هەموو ماڵ و منالْ شیفایان بۆ هاتوەو چاك بووینەوە. حمد و سوپاس بۆ خوا و هەزاران درود و سلاو بۆ سەر ڕۆحی پاکی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی.

**ك ٣٥٠:** دووبارە ملا عەلی ناوبراو بۆی گێڕامەوە فەرمووی:

ڕۆژێ لە خزمەتی باوکمانا لەناو گۆلی توتندا لە کێڵگەیەکدا ئیشمان ئەکرد، وە ئێمە چەند برایەك بووین یەکێ بە لامانا تێ پەڕی و ووتی: منالەکانت گەورە بوون ئیتر خۆت ئیش مەکە با ئەوان خەریك بن باوکم ترسا ووتی (فالله خیر حافظاً و هو أرحم الرّاحمین) زانی کە کوڕەکانی چاوی پیس لێی داون زۆری پێ نەچوو تووشی ناساخی بوو یەك ساڵ و چەند مانگێ بێزار بووین لە درێژی نەخۆشییەکەی و ئەمان ووت: خۆزگە باوکمان ئەمرد و لە دەستی ڕزگارمان ئەبوو کەپرێکمان[1] بۆ دروست کرد تیایا پاڵ ئەکەوت، ڕۆژێ هاتبوە دەرەوە تا گەیشتە نیهایەتی بانیژەکەو خەریك بوو بکەوێتە خوارەوە کە لەبەر دەمیا چنارێ هەبوو، چووین و هێنامانەوە جێگەکەی خۆی و پێمان ووت: چۆن توانیت هەڵسیت وەبڕۆیت؟ ووتی بەتەنیا بووم شەیاتین دەوریان لێ دام یەکیان ئەیوت تۆ نەخۆشی بەلام من نەخۆش نیم، یەکێکی تریان ئەیوت تو چەند کوڕێکت هەیە بەلام من هیچ کوڕم نیە بەم چەشنە دەستیان کرد بەم قسە پڕوپووچانە، کتوپڕ فڕۆکەیەك هات لەسەر ئەو درەختی چنارە نیشتەوە بینیم کە حەزرەتی شێخ محمد عثمان سراج الدین و حەزرەتی مولانا خالیدی برای لە فڕۆکەکە دابەزین وە چەند قومبەلەیەکیان بە دەستەوە بوو گرتیانە شەیاتینییەکان و شکاندیانن وە کوشتارێکی بێ شماریان لێ کردن ئەمجار لە پاشا ئیشارەتیان فەرموو

---

(١) سابات : کەپر

بۆلای منەوەو فەرموویان وەرە بۆ ئێرە منیش چووم بۆ لایان و لە خزمەتیانا مامەوە دوای ئەوە ئیتر چاك بووەوەو خوا شیفای بۆ نارد. هەزار شوکر و سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهان.

**ك ٣٥١:** لە زۆر کەس لەوانەی کە تووشی گەلیٚ نەخۆشی بوون و لەوانەی کە تووشی ناساخی ترسناك بوون بیستومە کە ووتویانە حەزرەتی شا محمد عثمان تەشریفی هێنا ئەوا ئەیبینم وا دیارە ڕێگەی بکەن وە تەشریف هێنانەکەی بۆ حازرەکان ئاشکرا کردوەو یەکیٚ لەوانە شێخ محمدی تاجرە لە دێی کەماڵە گێڕایەوە ووتی:

کیژەکەم نەخۆش بوو لەو ڕۆژەیا کە بۆ شەوەکەی وەفاتی کرد ئەیووت ئەوا حەزرەتی شا محمد عثمان تەشریفی هێناماڵەکەی بۆ پاك بکەنەوە گسکی بدەن بەم چەشنە ئەیوتەوە تا ماڵەکەمان پاکردەوە ئەمجار بەخێرهاتنی لیٚ ئەکرد و پێشوازی ئەکرد تا بە ڕەحمەتی خوا چوو.

**ك ٣٥٢:** لە جەنابی بەڕێز و خۆشەویستم برای گەورەو دڵپاك مامۆستا مەلا عبداللەی لاجانی (کاتب)م بیست کە فەرمووی:

من و مەلا سید احمد هەموو شەویٚ سێیەکی شەوی بمایە دۆعامان ئەکرد بۆ حەزرەتی شا محمد عثمان بۆ ئەوەی خوا بە پایەی ڕیاسەی مطلقەی بگەیەنیٚ، شەویٚ گوێمان لیٚ بوو حەوت نازناویان بۆ حەزرەتی شا محمد عثمان ئەخوێندەوەو لە میانەی ئاسمان و زەویدا کە دوا نازناویان شیخ الجنّ والانس الشیخ محمد عثمان سراج الدین بوو.

**ك ٣٥٣:** ئەمجار مەلا عبداللەی لاجانی فەرمووی:

دوو کەسی تر شتێکیان دیوە لەم باسەی سەرەوە ئەچیٚ کە هەر یەکەیان لە ناوچەیەك بوون کە دوورە لە یەکترەوە، وە بە هۆی زاتێکەوە ئەم ڕووداوەم ناردە

خزمەتی و عەرزیان کرا، فەرموویان مەرحەمەت و لوتفی خوایە خەلاّتی فەرمووە کە خوا دۆعاکەی لیّ قبولّ کردوون کە بۆیان کردوون و بە ئاواتی خۆیان گەیشتون یانی ئاگادار بوە لە دۆعاکانیان کە بۆیان کردوە، بەلاّم ئیجازەی نەفەرموو کە لە خەتمەدا بخوێنرێتەوە بەلاّم کاتیّ سێیەمیان ئاگاداری کرد ئیجازەی فەرموو کە لە خەتمەی شەریفدا بە نازناویان بخوێنرێتەوە، منیش ئەوەم بۆ برای دۆست خوام گێرایەوە کە جەنابی ملا نظیرە فەرمووی:

محمـد دیـــتن و مـوسی بـــە بـیستن
بـە بیسـتن کـەی بـەدی دیّ حـالّی دیـتن[1]
مصـطفی دیـــتن (کـلیـــم)یش بیســتن
قـەت نـاگات پـــلەی بیسـتن بـە دیـتن

یانی محمّد بینی و موسی بیستی جا بیستن کوا وەکو بینینە! وە مەبەستی ملا نەذیر لەوەدا ئەمەیە کە فەرمووی: من بە چاوی خۆم لە مریدانی حەزرەتی شێخی ضیاء الدین لە جنّیم بینیوە کە پەیمان و عهدیان لە خزمەت حەزرەتی پیری ئێمە شا محمد عثمان سراج الدیندا تازە کردۆتەوەو تمسّکیان کردوە، هەزاران حمد و شوکر و سوپاس بۆ خوا، بەلاّم ملا عبدالله کە فەرموویەتی من بیستومە خۆمن بە چاوی خۆم دیومە، بەم چەشنە گومانی تیا نیەو بە دلّنیای تەواوە کە شا محمد عثمان شێخی (جنّ و إنس)ە.

موسی النبيُّ إستَمَعَ رآهُ فخرُ البَشَرِ وَلَيْسَ مَنْ يستَمعُ كمن رأى بِالْبَصَرِ

---

(١) لە شیعرە فارسییەکەدا ئەفەرمویّ:

محمد دیدن و موسی شنیدن    شنیدن کی بود مانند دیدن

**ك ٣٥٤:** دوباره لێم بیست بۆی گێڕامەوە فەرمووی:

لە شەوی جەژنی ڕەمەزانا، ئەو ڕەمەزانەی کە پێنج ڕۆژ و شەوی بە سەرا تێپەڕی حەزرەتی شێخ عثمان عیراقی بەجێ هێشت، لەو شەوەدا لە خەتمەی پیرۆزدا کاتێ لە سەرەتای سیلسیلەدا گەیشتمە سەرناوی حەزرەتی مولانا خالید چوار ڕۆحانی حازربوون و مێزێکیان داناو پەشمەکێکیان بە سەرا داخست و دەفتەرێکیان لەسەر دانا، منیش پێم ووتن ئەوە چیە؟ فەرموویان: ئەمە پلەومقامی قدمی هذه علی رقبة کل ولی لله هێناومانە بۆ شێخ عثمان، نزیکی چوار مەترێ بەرز بوونەوە، پرسیم ئەوە بۆ کوێ؟ ووتیان هەموو ئەولیاکان ئیمزایان کردوەو بڕیاریان لەسەر ئەو پلەوپایەیە فەرموە تەنیا حەزرەتی شێخ عبدالقادری گەیلانی ماوە ئەچین بۆلای با ئیمزای بکات چونکە سەرداره و سەرۆك، سەرۆکیش ئەبێ لە دوای هەمویان ئیمزای بکا، بەڵام دوای ئەوەی سەرکەوتن چوار کەسەکە بوون بە حەوت ئیتر تەشریفیان فەرموو، حمدو سەنا بۆ خوا و هەزاران درود و سلاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار(صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی.

**ك ٣٥٥:** جارێکی تر لێم بیست کە فەرمووی:

شەوێکیان بە خزمەتی هەموو ئەولیاکان گەیشتم لە هەوایا دانیشتبوون، وەکوو پەلەوەر و باڵندەش وابوون وە بەرگی ڕەشیان لەبەرابوو، بەڵام حەزرەتی شێخ محمد عثمان سراج الدین دوور بوو وە لەسەر شێوەو سوڕەتی خۆی بوو بە هەمان پۆشاکی خۆیەوە، وە میانەی ئاسمان و ئەرز پڕبوو لە دەنگی زوڵاڵ و خۆشی کە وەکو فڕۆکە دەنگی ئەدایەوە، وەبینیم یەکێ لە میانەی حەزرەتی پیر و ئەولیاکاندا وەکو سەفیر هەر لە هاتوچۆدا بوو، وام ئەزانی کە جەنابی بەڕێز خەلیفە احمد بوو کە ئەویش هەروەکو باڵدار وابوو بەرگەکەی ڕەش بوو وە لەوکاتەدا وام ئەزانی کە وەکوو دەستیان بەسرابێ وابو ولا حول و لا قوة الا بالله العلی العظیم وصلی الله علی سیدنا محمد و آله و صحبه أجمعین.

**ك ٣٥٦:** جارێکی تر لێم بیست که گێڕایەوه فەرمووی:

نامەیەك له جەنابی (عبدالله بەگی سەرتیپ)ی[1] بەیاندەرەوە[2] هات بۆ حەزرەتی پیر نوسرابوو: ئەوه بە هیممەت و غیرەت دانانرێ بۆ ئەولیا که کۆمەڵێ وەربگرن که خواناسی و خوڕەوشتی جوان و شیرینیان هەبێ، بەڵام کۆمەکی و هیممەتی تەواو لەوەدایه که نمونەی وەکو من وەربگرن که پەنایان بۆ ئەهێنێ وا من دەستم گرتوه به داوێنی هیممەت و غیرەتتان بۆ ئەوەی وەرم بگری به یەکێ له مەنسووبەکانت و ئیمانەکەم بپارێزی و لەسەره مەرگ و گیان کێشانا له دەس شەیتان ڕزگارم بکەی وه دەستم بگری له مواقیفه ترسناکەکان.

وه ئەم پیاوه نوێژکەر نەبوو ڕۆژوی نەئەگرت و کرداری ناجۆر بوو، وه به موڵکایەتی بیاندەرەی ئەخوارد، وه زۆربەی تەمەنی بەسەر بردبوو، وه ئەم نامەیەی له کاتی ئەو نەخۆشییەیدا نووسی که تیایا بەرەحمەتی خوا چوو، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا به بەخشندەیی و سەخاوەت بەناوبانگ بوو، له ساڵێکی گرانی و سەختیدا بەشێکی زۆری سامان و سەروەتی بەخت کردبوو.

ملا عبدالله ئەفەرموێ: حەزرەتی پیری دەستگیر بەم چەشنه وەڵامی فەرمووبوو: بۆ نوسراوەکەی پشت به خوا تۆ لای ئێمه وەرگیراوی وه مژده بێ لێت ئیمانەکەت سەلامەت ئەبێ وه به پلەی ویلایەت ئەگەیت من کەفیلتم له ڕۆژی قیامەتا وه نیشانەی ڕاستی قسەکەم لەمانەدا هەمووی تۆ له ڕۆژێکی موبارەکا له دنیا دەرئەچی، جەمعێ زۆر له عولەمایان حازری سەرەمەرگ و گیان کێشانت ئەبن بێ ئەوەی به حاڵەتی نەخۆشی یا مردنت بزانن یا خۆت ناردبێتت به دوایانا، وه هەرکەسێ تووشی (فلان) نەخۆشی بوو هاته سەر مەزارەکەت خوا شیفای بۆ ئەنێرێ و له نەخۆشییەکەی چاکی ئەکاتەوه.

---

(١) سەرتیپ : ئامرفوج.

(٢)بەیان دەره: دێیەکه نزیکی حەوتاش له سەرشیوی سەقز.

ملا عبدالله ئەفەرموێ: ئەم عبدالله بەگە لە ڕۆژی جومعەی ٢٧ بیست و حەوتی ڕەمەزان کۆچی کرد، وە دوانزە کەس لە زانا و عولەمایان حازری سەرە مەرگی بوون بێ ئەوەی بە حاڵی بزانن تا گیانی سپارد و تەسلیم بە خاك کرا. ڕەحمەتی خوای لێ بێ و لە تاقی کردنەوە دەرچوە هەرکەس سەر لە قەبرەکەی بدات و ئەو نەخوشییەی ببێ چاك بۆتەوەو خوا شیفای بۆ ناردوە، فالحمدلله حمداً يوافي نعمه ويكافيء مزيده و صلى الله على سيدنا محمد الذي لا نبيّ بعده و على آله و صحبه وسلّم أجمعين و جزاه الله شيخنا حضرة الشّيخ محمد عثمان سراج الدين آمين.

**ك ٣٥٧:** جارێکی تر مامۆستا ملا عبدالله بۆی گێڕامەوە فەرمووی:

ئەگەر بمزانیایە کە ئەم حەزرەتی شێخی سراج الدين تەنیا تا عەرش ئەتوانێ بەرز ببێتەوە ئەڕۆیشتم بە جێم ئەهێشت ئەگەر بێ ئیجازەش بوایە. (بەڵام ئەم فەرمودەیە بەنیسبەت ڕۆحەوە گرنگ نیە چونکە تا عرش داخلی عالەمی ئیمکانە).

**ك ٣٥٨:** وە جارێکی تر فەرمووی:

هەرکەس بە تەواوی حەقیقەتی ئەم حەزرەتی شێخە ببینێ و ئەگەر خوا بەری نەگرێ بە کەرەم و ڕەحمی خۆی سەجدەی بۆ ئەبات کە ئەو پەڕی أنوار و فیوضات و بەرەکات و تیشك و شەوقی هەمو کەونی داگیر کردوە چونکە لە مەقامی جلالەوە بۆ جمال خوا ڕازاندویەتەوەو دایگرساندوەو پرشنگداری فەرموە. من ئەم قسەیەی ملا عبدالله بۆ مەرحومی ملاعارفی پێنجوێن گێڕایەوە فەرموی: ڕاس ئەکات لە حدیث دایە (لو كشف عن حقيقة الوليّ لـعُبد) یانی ئەگەر حقیقەتی وەلی خودا، بکەوێتە ڕوو، وە ببینرێ ئەپەرسترێ، وە ئەوەش لە بەر ئەوەیە، اولياء الله مظهری حەزرەتی حەقن مظهری صورەتی ظاهر نیشان ئەدا بەڵێ ظاهر بێ نیشانە بەڵام نیشانەی بێ نیشانی ئەنوێنێ. سوپاس بۆ خوای پەروەردگار درووود وسلاو بە هەزاران هەزار بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری ﷺ نازدار وئال ویارانی.

جارێکی تر لێم بیست فەرموی: لە وەڵامی بەڵگەی شێخییەتی حەزرەتی پیردا کە بە فەرمایشتی باوو باپیرانی حەزرەتی پیردا کە هەموویان مرشد ودەستگیر بوون وشێخی طەریقەت بوون واللە ئەگەر سراج الدین و بهاء الدین و ضیاء الدین و علاء الدین ئێستا تەشریفیان لە حاڵی حەیاتا بوونایە هەموویان پێکەوە بیان فەرمووایە کە عثمان شێخ نیە و دارای تصرف نیە من بە قسەم نەئەکردن وگوێم بۆ نەئەگرتن چونکە عیلمی من بە ویلایەتی و مەشیخەتی ئەوان بە ئەم زاتەوە بووە وە ئەشزانم ئەگەر ئەم زاتە تەنیا لەسەر دەستی شێخی باوکیا سلوکی کردبێ وە مەرحومی باوکیشی تەنیا لە سەردەستی باپیریا سلوکی کردبێ کە ضیاء الدینە ئەمجار زیاتر بۆم ڕوون ئەبێتەوە، ئەگەر ئەم زاتانە مرشد و دەستگیری حەقیقی نەبوونایە باخچەی شیرینیان ئەم گوڵە بۆن خۆشە نەی ئەڕازاندەوە.

لە ڕەوشت و عادەتی ئەم زاتە سالیکە جەنابی ملا عبداللە لاجانییە (کاتب)، (فەنایی): شەکر و چاو پێویستی خۆی بە پارەی خۆی لە ماڵی خۆی ئەکڕی، نان و پێخۆری خانەقای وەرنەئەگرت هیچیش لە کەس وەر ناگرێ بەبۆنەی وەڵامی نامە و نوسینەوە، وە قەت دۆعای بە هیچ کەس نەداوە بێ ئەمری پیر با بە هەزاران تکلیف و دیناریش بێت، خزمەکانی دەوڵەمەندو ساماندارن بە پارەی خۆیان خزمەتی ئەکەن بە تایبەتی باوکی و دوو براکەی، فەقێیەکی هەبوو بە ناوی سید باقر ئەو ئەدەبەی ئەم زاتەی باس ئەکرد بەرامبەر بە سادات و پیاوان کە چەند بەڕێز و بە حەیا بووە.

وە ئەی فەرموو من ڕەفیقی سید باقر بووم ئەو لە خوارووی منەوە ئەخەوت هێشتا قاچم درێژ نەکردوە لە بەر حەیا و ویقار لەو. سید باقر ئەیفەرموو: هیچ کەسم نەدیوە بە قەدەر مامۆستام بە ئەدەب بێ، بێ ئەوەی کەسیش پێی بزانێ.

من کە فەقێ و قوتابی ئەوم ئەوەندە ئەدەبی لێ ئەکردم بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە.

**ك ٣٥٩:** وه هەروا لـه جەنابی کـاك سـید عطا بـاوکی کـاك عـادلی بـاس کـراوه گێڕایەوه فەرموی: شـەویٚ لـه خـەوما وام زانی (مـەڕیٚ) زۆر جـوان وه زوٚر لـەطیـف وەك ئەمه بەو هەموو جوانییەوه به صابون و ئاوی گەرم چەن دەس شت و شۆت پێ کردبێ وه پاك و شۆردرا بێت، وەهەر تاڵێ له مووەکـانی زەنگوٚڵەیـەکی بچـوکی پێـوه بێ وابو. بەلاّم ئەم مەڕه جوانه پاك پوخته که هـەر سـەره مویـەکی زەنگوٚڵەیـەکی پێـوه بەسرابو گایەك خۆی داوه بەسەریا به ئەرزیەوه چەسپ کردوه وه دەرەتانی لـیٚ بڕیـوه به هیچ جۆر مەجالی دەربـازبونی نیـه ئـەمجا کـەرێکیش سـوار گاکـه بـوو. وه ئـەم دی عالـەمێکی زۆر دەورەی ئـەم کارەسـاتەیان داوه، وه هـیچ کـام دەرفـەتیان نیـه بـۆ چارەسەری ئەم مەڕه فەقیره. وه واشم ئەزانی لەلایەن گەوره گەورانەوه خەبـەر دراوه بەملاولا بۆ عیلاجی ئەم حاڵه ناڕەوایه ناکا دیم حەزرەتی شێخ علاء الدين قـدس سـره لـه نـاو ئـەو جەماعـەتا رووەو ئـەو کارەسـاته چـوه پێشـەوه بـەلاّم هـیچ خـۆی کۆنەکردبوەوه ناکا یەکیٚ صاحب جاه و جەماڵ بانگی کرد حـەقی تـۆ نیه ئیتر دیم لـه جێگەی خۆی وەستا، له پاش ماوەیه تر دیم حەزرەتی عبدالقادر گـەیلانی قـدس سـره تەشریفی به توندی بـەرەو عـەینی کارەسـات بـۆ عـیلاج تەشـریفی هێنا بـەلاّم نزیکتر کەوتەوه. له ذاتی عالی قەدرەوه بانگ کرا حەقی تۆ نیه. ئەو ذاتیشه لـه جێگـەی خـۆی وەستا. ئەنجا وترا ئەی حەقی کێیـه؟ لـەو ذاتـەوه زانـرا کـه حـەقی شـێخ عثمـانی کـوڕی شێخ علاء الدينه، ئەنجا دیم حەزرەتی شێخ عثمان خۆی کۆکردبوەوه وه قۆڵی داپێچا بو (عەصایه)کی به دەسەوه بو بەتیژی رۆیشت دارێکی گەیانده گاو کەرەکه ئـەو دوه کەوتن وه توانەوه مەڕەکه بـه سـەلامەتی هەستا وه خـۆی راوەشـاند. وه لـەم ڕودراوه خەڵکەکه غەڵبەو بەیەکاهاتنیان تێکەوت ئەنجا دەرکەوت ئەم گەوره گـەورانه کـێن دیم شـێخی بهـاء الـدين وه شـێخی ضـياء الـدين وه سـائری مشـايخانن وه ئـەو ذاتـه کـه ئەیفەرمو تۆ حەقت نیه حەزرەتی رسولی اکرەم(صلی الله علیه وسلم) بـوو. ئـەنجا کـه بەخەبەر هاتم ئەم واقیعەم نوسی وه به کەسێکا که به کرێم گرتبو نـاردم بـۆ دووڕووه

بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ. ئەویش هەر بە دەمی فەرموبوی انشاء الله خوا بە هۆی اولیاوە اسلام رزگار ئەکات. عن ابی هریره (رضي الله عنه) قال رسول الله صلی الله علیه و سلم: ان الله یبعث لهذه الامة علی رأس کل مئة سنة مَن یجدّد لها دینها (أخرجه ابو داود والحاکم والبیهقی ـ جامع الصغیر).

خـدا بـا دەسـتی کۆمـەکیت ناگـا     بـە فـریـای حـاڵی مـەڕی دیـن بگـا

زو بـــە ئاسـانی رزگـاری بـکا     لەژێر سەنگایی (سەنگ)[1]ی کەر وگا

**ك ٣٦٠:** هەر لەم شێوە مزگێنیە فاضلي محبوب سالك و مجذوب زانای بەوەفا و پرفام مەلا احمدی ئیمام، کە لە خانەقای سەقزدا بە ئەمری شێخ دانیشتووە وە پێش نوێژی ئەکات، گێڕایەوە فەرموی: لە مانگی پیرۆزی رەمەزاندا بەیانیەك بانگم دەدا، بەر لە بانگەکە حاڵم گەرم و گوڕی تیابو کاتێ لەو بانگە گەیشتمە و اشهد ان محمدا رسول الله ﷺ گەرمی حاڵم بە جۆری شیدەتی سەند دیم ذاتی حەزرەتە سەراسەری عالەمی پڕ کرد، وە لەو حاڵەتا خرایە دڵمەوە کە هەرکەس قطبي ارشاد بێ وەنیابەتی تامّەی بێ ئەویش بە ذات عالەم پڕ دەکات وە هەر وەها خرایە دڵمەوە کە حەزرەتی شێخ عثمان قطبي وەختە وە هەروا خرایە دڵمەوە کە شێخ مجددی ئەم سەدەیە، ئەنجا بە هەر حاڵ بو بانگەکەم بۆ تەواو کرا کە چومەوە ناو ژوری مزگەوت ئەو حاڵی منە تاثیری دای لە جماعەتی نوێژکەران ئەوانیش مجذوب بون وە دەوامی ئەو جەذبە و هەرایە هەر بو تا کاتی خۆر کەوتن. کاتێ نیەتمان بۆ نوێژ هێنا هەتاو کەوتبو.

تـانـەی دیـدەی دڵ زۆر و تـوێ تـوێیـە

هـەر تـوێیـە لەگـەڵ بـاقی جـوێ جـوێیـە

هـەر یـەك دەوایـە تـایبـەتی هـەیـە

ئـاخۆ دەس کـەوێ؟ ئـەربێ لـە کوێیـە

---

(١) سەنگ: مۆتەکە، مێردەزمە.

**ك ٣٦١:** له مەرحومی میرزا ئەحمەدم بیست کە حاڵەتێکی بۆ رودرابو ئەویش ئیشارەت بەوە ئەکات کە حەزرەتی پیر هەڵگری ئالآی نوێکردنەوەی ئاین ئەبێ وە ئەو گێرانەوە بە هۆی پرسیارێکی منەوە بو کە لەوم کرد وە ئەو باسەمان لە پێشەوە نوسی کە میرزا احمد لە سەر کەلی کەماجار دیبوی لە کاتی ڕۆشتنیان لە بیارەوە بۆ دووڕووە بۆ دیدەنی شێخ.

**ك ٣٦٢:** ڕۆژێ لە مەرقەدی حەزرەتی گەیلانی، لێم پرسی[1] وتم میرزا احمد وائەزانم نەقدی محبەتی حەزرەتی پیری و مریدی لە کیسەی دەرونتا کەمتر بێ، لە وەڵاما چەن شتێکی ووت ئەنجامی ئەمە بو: فەرموی: بە محبەتێکی دامەزراوی ریشە قایم بوی سی چل ساڵەی هەروا چۆن بەم ئاسانییە لا ئەچێ؟

سەعدی بە چەن زەمانێ میهرێکی چۆتە نێو دڵ
دەرناکرێ لە دڵدا مەگەر بە چەن زەمانی
فارسی‌یەکەی:
سعدی بروزگاران مهری نشستە دردل
بیرون نمی توان کرد الا بروزگاران

---

(١) وە ئەم لێ پرسینە ئەو ساڵە بو کە شێخ تشریفی لە بغدا بو وە زەمانی مەلیك فەیصەل بو. تەشریفی لەگەڵ حاجی ملا عبدالقادری ترکمان صحرا و حاجی یارجان عارفی ایران وە ترکمان سارا بون. (یاد باد ان روزگاران یاد باد) جا چەن ڕۆژێ لە خزمەت شێخا بوین لەگەڵ مەرحومی حاجی سعید هاتمەوە ئەنجا حەفتەیێ یا زیاتر تشریفی حەرەکەتی فەرمو بەڵام ٢٥ ڕۆژێ لە ئێران بو پورەی عێراق ١٤ تموز ١٩٥٨ ڕویدا لە (٢٧ یا ٢٨ی ذی الحجە الحرام)ی ساڵی ١٣٥٧ە بەیانی دوشەممەدا بوو.

له پاش ئەمە ساڵەهای پێچو ڕۆژێ لە دوکانی کاك عبداللەی کۆکادا دانیشتبو چومە لای سەیرم کرد محەببەتێکی زۆر زۆر گەرم و گوڕ و ممتازی تیا موجودە. خۆی و ئەولادی خۆی قەزاوەگێڕی حەزرەتی شێخ ئەکا نمونەی راستی و دروستی ووتاری لە سیمایا دیارە. ووتم میرزا احمد الحمد لله محبەتێکی جوانت هەیە، ئەمە هەروا بە خۆڕایی نیە ئامادەی پێم بڵێ چۆن بو وە لە چییەوە لە پاش چەن قسەیە لە وتە باشەکانی خۆی. فەرموی من هەر لە ئەصلا باوەڕم بە مەرتەبەو پایەی ارشاد و مەشیخەتی شێخ بو بەڵام لە کاتی نزیك بونەوەی کۆچی حەزرەتی علاء الدین رفع الله مقامه وأعلا عەرزم کرد: قوربان ئایا بووە کە مورشید لە مریدەکانی خۆی بەعزێکیان هەر خۆی لە پاش وەفاتیش سەرپەرشتیان بکات و تسلیم بە مرشیدێکی تریان نەکات؟ فەرموی: بەڵێ شێخی باوکم حاجی ملا عبداللەی پەسوێ و یەکێ دوی تری فەرمو تسلیم بە کەس نەکردن وە هەر خۆی تولیەی ئەفەرمون. تۆ بڵێی منیش نەتوانم سەرپەرشتی تۆ نەکەم بەڵام بەو شەرتە نەك عثمان بە مورشید نەزانی جا من هەمیشە ئەوم هەر بە مورشید زانیوە بەڵام نەك بەم خەسییە[1].

فەرموی : لەم بەینەی پێشوە چوم بۆ خزمەتی بۆ دووڕووە کە وەختێ گەیشتمە سەر کەلی کەماجاڕ[2] حاڵەتێ روی لێدام، بەم دوچاوی سەرە ئەم دیت ئەم شێخە (یانی حەزرەتی شیخ عثمان) لە عالەمی میثالدا توجهی لە خەڵك ئەکرد. بە هەرکەس بگەیشتایە توەجوهێکی لێ دەکرد وە من لە سەری کەماجاڕ ئەمەم دی ئەم دیتنەم بەردەوام بو هەتا گەیشتمە چایخانەکەی دێی قەلاجێ[3]. لەگەڵ لە چایخانەی قەلاجێ دانیشتم ئیتر ئەو حاڵەتەم پەردەی بە سەرا هات. ئەنجا کاتی خۆی حەزرەتی قطب و

---

(١) خەسی : تۆخی ـ مەبەس نەك یەکجار وا خاوەن دەسەڵات و خاوەن پایە.

(٢) کەماجار : کێوێکی بەرزە لە پشت دێی سەرگەتی لای خورماڵە وە بۆی سەر ئەکەوی ئەم دیوی عێراق ئەو دیوی ئیرانە.

(٣) قەلاجێ: دێیەکە لەوێوە بۆ دووڕووە ساعەتێ رەنگە بێ بە پێ.

غەوثي زەمان و زەمین مولانا شیخ علاء الدین لە نزیکی کۆچیدا فەرموی هەرکەس لە ئوممەتی محمد المصطفی ئەذیەتی کردبم خەیانەتی لیٚ کردبم ماڵی خواردبم فی سبیل اللە ئازاد بیٚ تەنیا دوو کەس نەبیٚ، وە من لەو دوو کەسە یەکێکیانم ئەناسی. لەو حاڵەتا کە ئەم دی بە هەر کەس ئەگەیشت توجیهێکی لیٚ ئەکرد بەلای ئەو کەسەدا تیٚ پەڕی هیچ موبالاتی پیٚ نەکرد وە لە توجهی خۆی بیٚ بەشی فەرمو. (ئەنجا کەسیٚ نەچوبیٚ نازانیٚ) لە کەلی کەماجاڕ تا چایخانەی قەڵاجیٚ نزیکەی (٥) کاتژمێر ئەبیٚ. نیوەڕوٚ ڕێیەك دورە وە ئەو مسافە لە بەر ئەوە بەرد لە سەر بەرد و هەڵەت بە هەڵەت ڕێگەکەی ئەبیٚ بە پیادە بپردریٚ وە کەسیش ناتوانیٚ لە زۆر جێگەیدا نیو دەقیقە چاو لەیەك بنیٚ وە هەروەها فەرموی کە گەیشتمە خزمەتی شێخ لە باخەکە بە ئوتومبیل هێنامیەوە لەگەڵ خۆی بۆ ماڵەوە لە ئوتومبیلەکەدا فەرموی میرزا احمد حەز ئەکەی قورئانت بۆ بخوێنم یا ئەو شێعرانە کە لە خزمەتی شێخدا ئەم خوێندەوە؟ عەرزم کرد قوربان شیعرەکان. بەعزێکی خوێندەوە زۆر خۆش و عەجایب بو.

**نوسەر ئەڵیٚ:**

توجە لە عالەمی مثال وە لە عالەمی خەڵك بۆ تەهیەکردن و پاك کردنەوەی دڵ و دەرونە لە موانعی دخولی ایمان و قبوڵی هیدایەت. یانی ئامادە ئەبن کە لە کاتی خۆی (الامور مرهونە باوقاتها) دڵی ئەم خەڵکە قابلی وەرگرتنی نوری ئیمان و خودا پەرستی بیٚ وە ئەمیشە هەر نیشانەیەکە لە نیشانەکانی تجدیدی دین و نویٚ کردنەوەی ئاین اللهم حقق ذلك بفضلك و منك امین.

داخەکەم زۆر شتم لە میرزا احمد بیستوە بەڵام لە هۆشم نەماون زۆری، وە هەندێکیشی ناتەواو دێتەوە بیرم ناتوانم بیان نوسم.

**ك ٣٦٣:** لە مەرحومی حاجی مامۆستا مەلا حسینی دەشتی (رحمە الله علیە) بیستم فەرموی:

فەقێ بوم لە بیارە ئەم خوێند هەر ئەو وەختە خۆیشی و باوکیشیم ناسیوە. جارێکی تر فەرموی کاتێ فەقێیەتیم لە بیارە هەمو بەیانیەك ئەچومە مەرقەد زیارەتم دەکرد. وە هەمو کات کە دەچوم دەرکی بۆنی خۆش خۆشم ئەکرد. بەیانیەك چوم هەرچەند اهتمامم کرد بۆنەکە نەبو، هاتمە دەرەوە تەفتیشی شەرواڵەکەی خۆم کرد احتلامم بوبو بە کوردی شەیتانم پێ پێکەنی بو. چوم خۆم شت لە پاش غوسڵ کردن چومە سەر جانماز نوێژەکەم کردەوە ئەنجا چومەوە بۆ (مەرقەد) بۆنە خۆشەکە وەك جاران دەماخمی پڕ لە عەتر کردەوە:

ئەی کانی کەرەم تۆ بی خودا بەندە بە یاد کە
بۆ دەفعی خەمم میهری کەریمانە زیاد کە
بەو نیسبەتە وا مەست بوە بەو گیانی عەزیزان
ئیحسانە دڵی گیانی منیش دەم دەمە شادکە

**ك ٣٦٤:** جارێ تر میوانی ملا شێخ عثمانی زونجی بوین لە حوجرەی مزگەوت من و حاجی مامۆستا ملا حسین پێکەوە دانیشتبوین کاتێ هەستاین و هاتینە دەرەوە فەرموی وەختێ پێکەوە دانیشتین شێخ لە بەینی هەردومانـدا دانیشت. وە هەروا لە قەڵادزە خەتمان ئەکرد مامۆستاش لەوێ بو، لە پاش خەتم فەرموی کە سیلسیلە خوێنرایەوە شێخ لە بەینی خوێندنەوەی خۆی و باوکیدا هاتە نێو خەتمەکەوە دانیشت. رحمة الله علیة رحمة واسعة امین.

**ك ٣٦٥:** لە برای زۆر بەڕێز و مسلمان بەختەوەر و کامەران حاجی جلالی کوڕی حاجی ئەحمەد رشیدم بیست وتی :

شەو لە خەوما کاك عومەری خەزورم دیت لە سەر ئەساسی دەم سوحبەتێ کە لە دنیادا لە بەینمانا بوو وتی حاجی جلال چاوت رون شێخ تەشریفی هاتەوە (بۆجرت و فرتی بیارەت) منیش وتم توخودا پرسیارت لێ ئەکەم ئیوە ئەڵبەتە وان لە عالەمێکا شت ئەزانن بە خوات قەسەم ئەدەم شێخ عثمان شێخێ چۆنە؟ ئەویش ووتی حاجی جلال خۆزگە بەوکەسە لە عومری خۆیدا هەر جارێکیش چاوی پێی بکەوێ.

**ك ٣٦٦:** وە جارێ تر گێڕایەوە وتی :

شێخ مصطفای شێخ مارف هات ووتی حاجی جەلال عەرزی شێخ بکە کە لوطفێ بکا بە حالم وەضعم باش نیە وتم مامۆستا شێخ خۆی لوطفی لەگەڵ ئەهلی عیلم هەیە خۆت تەشریفت بچێ عەرزی بکە، ووتی ئاخر بۆ من ناکرێ لوطفی لەگەڵ تو هەیە عەرزی بکە. وە حاجی فەرموی ئێستە چاوەڕێم لە کاتێکا ڕێ بکەوێ بۆی و داخوازی هیمەت بکەم.

**ك ٣٦٧:** جارێکی تر حاجی جەلال گێڕایەوە وتی :

لە کاتێکا شێخ تەشریفی لە سلێمانی بو فەرموی با بچین بۆ مالی شێخ مەلیك فەرموی وەرە لەگەڵم بچین بۆ مالی شێخ مەلیك، عەرزم کرد بەڵی فەرموی دەبڕۆ ئوتومبێلەکەوە، عەرزم کرد ئوتومبێلم پێ نییە، فەرموی لەگەڵ خۆمدا وەرە چومە ئوتوموبیلەکەی حەزرەتی شێخ روەو مالی شێخ مەلیکی کوڕی خۆی (کەماڵیان لە دەورو بەری فولکەی سەرچنارە) کە بە بەردەمی مزگەوتی حاجی حەسەنی لۆکەدا تێپەڕین فەرموی: ئەمە مزگەوتی کێیە؟ عەرزم کرد هی حاجی حەسەنی لۆکەیە وە وتم قوربان حاجی حەسەن مامە بەلام نەك مامی نەسەبی بەڵکو لەگەڵ باوکما محبەت و پەیوەندیەکی زۆریان پێکەوە بوە وە ئێمەی زۆر خۆش ویستوە داوا ئەکەم دۆعای

خێری بۆ بفەرموی. فەرموی خوا عەفوی بکا. هەر ئەو شەوە لە خەوا وام زانی شێخ تەشریفی لە ماڵی ئێمەیە وە ئێمەش مەشغوڵین بە تەرتیب و هەڵسوڕانی نان و طعام دروست کردن دیم لە ناکاو باوکم و حاجی حسن خوا عفویان بکا هەردو دەستیان بە یەکەوە گرتبو هاتنە ماڵەوە منیش چوم بە دەمیانەوە وە ویستم بیان بەم لە جێگەیە مەخصوص دایان بنێم وتیان ئێمە لە طەرەف حەزرەتی شێخەوە دەعوەت کراوین منیش قاپی ژورەکەی حەزرەتی شێخم بۆ کردنەوە چونە ژورەوە و قاپیەکەم لە سەر پێوەدان. پاش چەن وەختێ هاتنە دەرەوە کە بڕۆن وتم بابە ئەوە نان دروس کراوە الان دادەنرێ نان بخۆن جا بڕۆن وتیان ئێمە نانمان پێویست نیە ئەڕۆین. ئەنجا ووتم توخودا بابە گیان ئەزانم معامەلەی بەینی باوك و ئەولاد بۆ ڕۆژی قیامەت زۆر زەحمەتە منیش هەر بێ ئەدەبی و نارەزاییەکی دڵی تۆم کردبێ ئازادم کە، ووتی ڕاس ئەکەی ڕۆڵە کاروباری بەینی باوك و ئەولاد گرانە بەڵام یاخودا ڕۆڵە وەك بوی بە باعیثي زیارەتی ئێمە بۆ حەزرەتی شێخ خودا لە دونیا و قیامەتا سەربەرزت بکا. پاش ئەوە ئەوان ڕۆیشتن و منیش بە خەبەر هاتم. تێگەیشتم کە لە هۆی ئەو طەلەبی دوعای خێرەوە بو کە ڕۆژی ئەو شەوە کردم. اللهم اغفرلنا ولوالدينا وارحمنا وارحمهم وارض عنا وأرض عنهم وأدخلنا وإياهم فی مستقر رحمتك يا أرحم الراحمين وأجمعنا معهم جميعاً فی الآخرة بجاه سيدنا محمد صلی الله عليه وعلی اله وصحبه وسلم. آمين. وأدم لنا من اقمت بنيابته وانفعنا فی الدارين بامداداته وبركته آمين. انك سميع قريب مجيب.

**ك ٣٦٨:** حەزرەتی پیر (قدس سره) فەرموی[١]: چوم بۆ ڕەزاو عباس قولی سوڵتان ووتی بۆ شێخ فڕوجێکی حەڵاڵ بە پارە بکڕن بۆی سەر بڕن. ئێوارە کە

(١) شەوی پێنج شەممەی ١٧ جمادی الأول ١٤٠٢ ك تا سەعات ٢ی زەوالی لە خزمەت شێخدا بووین لە بەغدا وە ئەم فەرمایشتەی بە مناسبەیەکەوە فەرمو. وە فەرموی عباس قولی سوڵتان

وختێ نان دانرا (ماموٚستا مەلا شمس الدین)یش تەشریفی موجود بو من ووتم ئەم فڕوجە جوکەی یەت ئەڵێ ماڵی هەتیوم. ماموٚستا فەرموی جوکەی لێ ئەبڕم ئەی خوٚم، عباس قولی سوڵتان وتی شێخ بوٚ وا ئەفەرموی والله پارەم ناردوە بە پارەی حەلاڵ کڕاوە. ئەو نەفەرە کە چوبو کڕی بوی وتی والله‌ی ڕاستی باشە، ئێمە چوین و کڕیمان بەلاّم بەربوو بوٚمان نەگیرایەوە ئەم فڕوجە هینی مالی فلانە گرتمان سەرمان بڕی وە خاوەنەکەی هەتیون.

**ك ٣٦٩:** وە فەرمویشی : میوانی حسین خان یا حەسەن خانی ڕەزاو بوین چێشتیان دانا وتم ئەم گوٚشتە لە گوٚشتی کەڵ ئەچێ، وتیان بەڵێ گوٚشتی کەڵە، وتم ئەم کەڵە ئەڵی بە تێغ نەگەییوم وە وتم ئەمە ..... فلان کوشتویەتی وتیان بەڵێ بانگم کرد و سوێنم دا وتم ئەمە بە تێغ گەیشتوە، سوێنی خوارد وتی قوربان نە والله فریای تێغ نەکەوت.

**ك ٣٧٠:** جارێ کوٚمەڵێ لە مریدان لە دووڕووە هاتن بوٚ زیارەتی حەزرەتی شێخ عثمان سراج الدین خەڵکی سنە بوون لە کارگوزاری پەرەوەردە و مەعاریف بوون و کوٚمەڵێکیشیان لە ئەشراف و پیاو ماقولاّن بوون بەڕێز بوون، ئێمەش شەوێك لە ناویانا ماینەوە جەنابی ماموٚستا ملا عبدالله هات بوٚ لایان کە تا ئێستا نەم بینیوە و نەم بیستوە سەر لە کەس بدات یا ژورەکەی خوٚی بەجێ بهێڵێت، چونکە زوٚر خزمەتیان کردبوو کاتێ حەزرەتی پیر لە سەفەری پیروٚزیا لەو وولاّتە بوو، وە لەوێشەوە تەشریفی فەرموو بوٚ مشهد و خوراسان دەستیان کرد بە گێرانەوەی کەرامات و خەواریقی حەزرەتی شای سراج الدین و باوکی عەزیزی، ئێمەش داوامان لە میرزا

---

پیاوێ بو خاون نوێژ و ڕوٚژو قورئان خوێن بو موڵکی غەصبی هەبو. واریداتی ئەدا بە نوٚکەرەکان خوٚی لێی نە ئەخوارد، هەرچەن ظولمە بەلاّم ئەوەندە ریعایەتی ئەکرد کە لێی نە ئەخوارد.

عبدالوهابی شفیعی کرد کە ئەو کەرامەتەی ماوەیەك لەمەو بەر بۆت گێراینەوە بۆمان بگێڕەوە جەنابی ملا عبدالله فەرموی من کەرامەتێکت بۆ ئەگێڕمەوە باوکی هەموو کەرامەتەکانە ئەگەر تۆ ئەی نووسیتەوە، عەرزمان کرد فەرموو بابە بیستنی هەمووومان شەرەفدار ببین ووتی نەخەیر لەم مەجلیسەدا نایگێڕمەوە، زۆریان لیٚ کرد ئەویش نەی گێڕایەوە، کاتیٚ بەیانی چووین بۆ دەزنویژ گرتن ئەوەندەی نەما بوو بۆ بانگی نیوەڕۆ بە دوایا ڕۆیشتم دوای دەزنوێژ لێی نزیك بوومەوە داوای گێڕانەوەی ئەو کەرامەتەم لیٚ کرد ووتی بەلیٚ باشە چووینە شوێنێکی وا بە کەلکی دانیشتن بیٚ لەویٚ فەرمووی:

بە حەزرەتی شا محمد عوسمان سراج الدین راگەیەنرا (قدس سرە) کە لە رەمەزانی سالی ١٣٨٠ هیجریدا تۆ لەم رەمەزانەدا ئەگەیتە پلە و پایەی تزکیە، پزیشك بۆتیمار و معالجە بانگ مەکە، یانی تزکیەی ترابی فەرمووی: کاتیٚ رەمەزان چەند رۆژێکی مابوو حەزرەتی پیر توشی نەخۆشیەکی زۆ سەخت بوو رۆژ بە دوای رۆژ هەر ناڕەحەت تر ئەبوو تا وای لیٚ هات لە ژیان دەستی شت و هەموو ئەندامی پڕ نوری توایەوە و بو بە ئاو وە لە ڕۆژێکا (٥٠) پەنجا جار پێویستی بە قەزای حاجەت ئەبوو هەر جاریٚ قاپێکی گەورەی پڕ لە ئاو ئەکرد، بەردەوام بوو ئەم حالەتە تا نزیکی جەژن.

ڕۆژیٚ فەرمووی ئەزانی پلەی تزکیەی ترابی چییە؟ لە وەلاما عەرزم کرد نەخەیر فەرمووی دوا پلەی هەموو پایەیەکە بۆ عاریفان وە دوا جێگەیەکە ئەولیا ومقربین پێی ئەخەنە سەر، زۆر کەم لە ئەولیا گەییونە ئەو پایەیە، وە ئەوەی ئەگەر گەییبێتە ئەو پایەیە ئەوا تووشی مُقْعَدْی[1] بووە (هەر کە نەتوانیٚ بیٚ یارمەتی خەلکی بە پێوە بوەستیٚ یا بە ڕێوە بڕوا) وە نەبیسراوە هیچ زاتیٚ گەییبێتە ئەم پایە عالی و مقعد نەبوویٚ بێجگە لە حەزرەتی گەیلانی وە حەزرەتی سید احمدی سرهندی کە ئیمامی ربانییە (قدس

---

(١) مُقْعَدْ: کە ووتراوە وەك شەلەل وایە توانای هەلسان و هاتوچۆی لیٚ ئەبردرێت بیٚ کۆمەکی و دەستگرتن.

سرها العزیز) ئەم دوو زاتە بزورگەوارانە بەو پایە عالیە گەیشتون و لەسەر صحەتی خۆیان هەرماوون پێش ئەوەی خوا شیفا بنێرێ بە چەند رۆژێ هەندێ شتم چاو پێکەوت کە زۆر نارەحەتی ئەکردم وە ماوەی سێ شەو لەسەریەك ئەمبینی هەموو ئەولیاکان بەڵکوو ئەولیای سەر ئەرز و بن ئەرز هەموویان بە سواری ئەسپ ئەهاتن وە لغاوەکە و جڵەوەکانیان ئەکرد بە ملی ئەسپەکەیانا بە دەست خۆیانەوە نەبوو هێدی هێدی بە ڕێگا کەدا ئەهاتن بەرەو جادەی ئوتومبێلەکە زۆر پەژار و خەمبار بوون تا ئەگەیشتنە نزیکی پردەکە و ڕوویان ئەکردە ناو دێ، وە ئەچوونە ئەو ژوورەی کە حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین لەوێدابوو بەلاّم من هەموو شەوەکان ئەمبینی کە ئەم ڕووداوە سەعات پێنج بەدی ئەهات بەلاّم شەوی سێیەم بە خزمەتیان گەیشتم (قدس الله اسرارهم) تەشریفیان هێنا هەروەك جاری پێشوو بە سەر جادەی ئوتومبێلەکەدا بەلاّم ئەمشەو کۆمەڵێ لە پێغەمبەرانیش تەشریفیان لەگەڵیانا بوون (علی نبینا و علیهم الصلاه و السلام) کاتێ لە پردەکە پەڕینەوە پێغەمبەری موبارەك حەزرەتی رسولی أکرم (صلی الله علیه وسلم) لەم کۆمەڵە حەوت کەس یا شەش کەسی هەڵبژارد وا ئەزانم شەش کەس بوو.

بەپەلە پێغەمبەرﷺ بردنی لە خزمەتیا بۆ ئاستانەی حەزرەتی پیر بەماتیەکەوە، پێغەمبەری موبارەك ﷺ ماوەیەك تەشریفیان لەماڵی حەزرەتی پیر مایەوە، ئەمجار تەشریفی موبارەکی هەزاران درود و سلاّوی لێ بێ هێنایە دەرەوە کە رووی موبارەکی وەك مانگی چواردە ئەدرەوشایەوە لە شادی فەرەح و سروردا وە من نەچوومە خزمەتی یا لەبەر ئەدەب یا شەرمم کرد شەخسێکی تر چووە خزمەتی و گەڕایەوە فەرمووی پێغەمبەری موبارەك مزگێنی فەرموو کە خوا شیفای بەخشی پێی وە گەیشت بەو مەقامە ئیشارەی فەرموو بە تزکیەی ترابی.

فبان بالشواهد القاطعة قد حل بالتزکیة السابعة
لکنه کالغوث ثم الاحمد منها نجا و لم یکن بمقعد

ئەمجا لە سایەی خواوە لە پاش دوو یا سێ ڕۆژ حەزرەتی پیر تەشریفی موبارەکی لە ماڵ هاتە دەرەوە، وە هیچ نیشانەی ناساخی و نەخۆشی پێوە دیار نەبو، هەزاران حمد و سوپاس بۆ زاتی پاکی پەروەردگار کە پیرمان کرد ڕزگار وە موقعەد نەبوو وەکو هەر دو قطبەکەی پێشوو سەلامەت دەرچوو، ستایش و سەنا بۆ خوا ستایشێ کە هەرگیزاو هەرگیز کۆتایی نایێ و هەزاران دروود و سلاو بۆ زاتی پاکی پێغەمبەری نازدار (صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی، ئاشکرا بوو کە ئەم زاتە نوورینە هەموو مەرتەبەو پایەکانی تەواو کردو و ئیحاطەی فەرموو بە سەر هەموو دائیرەکاندا هەروەکوو گەورە و بەڕێز زانای هەموو زانایان زاتی پڕ فضل و شایانی گشت تقدیر و ڕێزێ جەنابی عالیمی پڕ عیلمی زاخر استاذ الأساتذة مامۆستا ملا باقر اعلی الله مقامه و نور الله ضریحه الملك القادر ئەفەرموێ:

لما ثوی بخیمة التمکین      احاط بالدوائر العشرین[1]

ئەم شیعرە شیعری خۆمە لە ئاخری سیلسیلەی مشایخانی طریقەی نقشبندی نظمم کردوە وە فەرمایشتی مامۆستا رحمەالله نیە.

**ك ٣٧١:** ئەم زاتە پڕ بەرەکاتە ئەفەرموێ: چووم بۆ زیارەتی حەزرەتی پیر لەوکاتی نەخۆشییەی کە باسکرا، حەزرەتی پیر فەرمووی وام ئەمبینی خەیمەیەك لە نزیکمەوە هەڵ دراوە وام ئەزانی ئەگەر بچمە ناو ئەو خەیمەوە[2] دەوائیری عشرینم تەی کردوە، بەلام لە میانەی من و ئەو ڕەشماڵەدا شێرێکی ڕەش هەیە کە حەوت کەس تا شەش کەسی ئەوێ بۆ بەربەرەکانی منیش ماوەیەك بیرم لێ کردەوە لە پاشا ووتم هەر ئەبێ بچمە ناو ئەو خەیمەیەوە چاکم کرد بەلادا وخۆم ئامادە کرد و بەرەو ڕووی ڕۆیشتم، بەرەنگاری کردم خۆم حازر کرد و بە پەلە پەلاماری دام و بعون

---

(١) الدوائر العشرین (بیست دائیرەکە)

(٢) خەیمە: ڕەشماڵ، چادر

الله کوتام به زەویدا و پارچه پارچەم کردو هەر پارچەیم هەڵ دا بۆ لایەك، ئەمجار چووومه ناو خەیمەکەوە بینیم کە بیست دائیرەکەم تەی کردوە هەزاران شوکر و سوپاس بۆ زاتی پەروەردگار.

وە ئەم زاتە پڕ بەرەکەتە جەنابی زانای پڕ وەفا و ئەدەب سەرانسەر یەکە زانای ئەم چەرخە لە هەردو زانیارییەکەدا مامۆستا مەلا باقر دانەری کتێبی دەوائیری عشرین[1] ئەفەرموێ: خوا سینەی فراوان کردم کە هەریەك لەم دائیرانە تا قیامەت هەر لە فراوان بوون دان بێجگە لە دائیرەی عالەمی مشاهدە کە ئەم اتساع ناکا.

---

(١) بە کورتی باسی دوائری عشرین :

دائیرەی یەکەم : پێی ئەووترێ دائیرەی عالەمی مشاهدە، مەبەستم لە عەرشە و ئاسمانەکانە و عنصر و عنصریات لە اجسام و جسمانیات، وە نیوە تیرەکەی ئەو هێڵە ڕاستەم مەبەستە کە لە چەقی ئەرزەوە دەرچووە بۆ محدەبی عەرش کە ماوەی پەنجا هەزار ساڵە.

دائیرەی دووەم : پێی ئەوووترێ دائیرەی ویلایەتی صغری وە دائیرەی ظلالی ئەسما و صفاتیشی پێ ئەوترێ، وە ماوەی ئەم دائیرەیە بۆ سەروی عەرش درێژ ئەبێتەوە لە عالەمی ئەمر و مجردات.

دائیرەی سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم : دائیرەی ویلایەتی کبرای دائیرەی حەوتەم، دائیرەکانی ویلایەتی علیا کە پێی ئەوترێ ویلایەتی خاصەی محمدی و ویلایەتی مەلەئی ئەعلا و کەس بەم دائیرە نەگەیشتوە بە پەیرەوی ئەو نەبێ(صلی الله علیه وسلم)

دائیرەی هەشتەم : دائیرەی کەمالاتی پێغەمبەریەتی یە.

دائیرەی نۆیەم : دائیرەی کەمالاتی ڕیسالەتە.

دائیرەی دەیەم : دائیرەی کەمالاتی اولوالعزمی یە.

دائیرەی یانزەهەم : دائیرەی حەقیقەتی کەعبەیە.

دائیرەی دوانزەهەم : دائیرەی حەقیقەتی قورئانە.

دائیرەی سیانزەهەم : دائیرەی حەقیقەتی نوێژە.

دائیرەی چواردەهەم: دائیرەی حەقیقەتی عبودیەتی صرفە.

دائیرەی پانزەهەم : دائیرەی ئیبراهیمی یە وە پێی ئەووترێ دائیرەی خوللەت.

دائیرەی شانزەهەم : دائیرەی حەقیقەتی مووسەوی و پێی ئەوترێ دائیرەی محبەتی زاتی یە.

**ك ٣٧٢:** له زانای بەرز و داد پەروەر خواناس و دین پەروەر هەڵگری نهێنی و فیدای ڕێگای ڕاست و پاك له هەموو گەردێك، ڕازاوه به ڕەووشتو خووی شیرین ملا عبدالله کاتب و نوسەری حەزرەتی پیرە کە نزیکەی سی و پێنج ساڵە لە خزمەت حەزرەتی پیردایە لێم بیست فەرمووی:

دوای دەرکەوتنی نیشانەکانی کانی بەرد لە دووڕووە کە حەزرەتی پیر ئاشکرای فەرموو، شەوێ لە دوای خەتمە دەست کرا بە تەهلیلە پیری دەستگیر خۆی حازر بوو لە خەتمەکەدا، بێخودی‌یەك هات بە سەرما ئەمبینی حەزرەتی پیر لەفظي (لا اله)ی بەرز ئەکردەوە تا خوا حەزکات وە لەوێوە (الاالله)ی ئەهێنا خوارەوەو ئەیکێشا بە سەر بەردی ئەو کانەدا وە بە تایبەت بە چاوی خۆم بەردێکی گەورەم ئەبینی کە بەردەکانی ئەم لا و ئەولا و تەنیشتی وورد و خاش ئەبوو، و چەند جارێ ئەوەم ئەبینی کاتێ بە هۆش هاتم چوومە ژوورەکەی خۆم و بۆ هاوڕێی خۆشەویستم ملا سید احمدی ئیمامی خانەقام گێڕایەوە، پێم ووت با بچین بەیانی نیشانەی تەوەجوهەکە تاقی بکەینەوە لە سەر ئەو بەردەی کە لە سەری نەقش کراوە، بۆ بەیانی هەردوکمان پێکەوە چووین بۆ تەماشاکردنی ئەو بەردە لە کانە بەردەکە، بینیمان نیشانەی توجهە کە بە لەفظی جەلالە کە الله لە نزیکەی (٧٠) حەفتا شوێنا دەرچووبوو، کاتێ کە حەزرەتی پیر ئەو نەقشە جوانەی لە سەر ئەو بەردە کێشا منیش (نوسەر) ئەم چەند دێرە هەڵبەستەم نارد بۆ حەزرەتی شێخ محمد عثمان سراج الدین:

---

دائیرەی حەڤدەهەم : دائیرەی حەقیقەتی محمدی وە پێی ئەووترێ دائیرەی محبوبیەتی زاتی یە.

دائیرەی هەژدەهەم : دائیرەی حەقیقەتی ئەحمەدی‌یە.

دائیرەی نۆزدەهەم : دائیرەی خۆشەویستی صیرف و سەرچاوەی ئەنوار لەم دائیرەدا بە زاتەوە، عنصری خاکە.

دائیرەی بیستەم : لا تعینیه.

و نیسبەتی هەر دائیرەیەك بۆ ئەوەی سەروی وەکو نیسبەتی ذەڕەیەکە بۆ عالەمی موشاهەدە.

کــه نــەفی و مــەنفی بــۆ لای ژوور ئەبــەی
اســتثناو مثبــت لـــە ســەنگ ضـرب ئەکـەی
لەتلـەت ئەکـەی سـەنگ بـە ڕێکـی نەقشـی
الله لـــە صەفحـــەی سنگیـــا ئـەکێـــشی
ئـــەی بــۆ بـــە سینەم سـوڵتانی نــەقشی
مشــتێ لـەو گـەنجی ذیــکره نـابـــەخشی
تحجـر لـــە گــڵ نــرخی عـەیـانـــە
تـفـجـــر لـــە دڵ خێــر و ئیحسانـــە
ئـــەگەر بێکـــارەو پـــەست و تـەنبـــەڵم
وا بزانـــە مـنیش گـڵمـــۆتێ گـڵـــم

یانی : کاتێ لەفظي (لا اله)ە کە نەفیە بەرزی ئەکەیتەوە بۆ سەرەوە وە لەفظي (الله) ئەکێشی بەوکانە بەردەدا، وە بەردەکان لەت لەت ئەکەی و لەفظي جەلالەی (الله) بە جوانترین شێوە تیایا ئەکێشی، ئەی بۆ مشتێ لەو گەنجی زیکرە نابەخشی بە سینەم، با من نالایق و تەمەڵیش بم لە ناسین و پەرستنی پەروەردگارا وا بزانە منیش گڵمۆتێ گڵم، دڵ خستنە کارو زیندو کردنەوەی خێر و ئیحسانە.

هەزاران درووود و سلاو بۆ گیانی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) و ئال و یارانی.

**ك ٣٧٣:** زانای خۆشەویست جەنابی ملا عبدالله نامەیەکی نارد بۆ حەزرەتی پیر بە سپییەتی وە بە خەیاڵ مەبەستی خۆی تیا دیاری کردبوو، وە قطبي زەمان وەڵامی مەبەستەی نوسیبوەوە کە لە بارەی خەتەرە وخەیاڵات و وەسوەسەوە بوو فەرمووبوی: لە سەر خوێندنی قل اعوذ برب الناس بەردەوام بە، وە ............ بخوێنە وە ئاوی کووزەڵە بخۆرەوە، وە لە هەموو چەشنەکانی پاقلە پارێز بکە، وە

هەروەها لە دواییدا کە زانیم لۆمەم کرد و پێم ووت بۆچی نامەت بە سپییەتی ناردووە بۆ حەزرەتی پیر ئەویش زۆری سوێند بۆ خواردم کە بە مەبەستی امتحان و تەجروبە نەی نووسیوە بەڵکوو شەرمی کردوە کە ئەو مەبەستە بخاتە سەر کاغەز وە ووتی پێم عەیب بوو بنوسم کە سەلیسی بەولم توش بووە لە دوای تارەت لێم پەیدا ئەبێ یا روودانی خەتەرەیە، وە کە فەرمایشتەکەی نووسیبوو خوێندنی سوورەتەکە بۆ وەسوەسە و دوور کەوتنەوە لە چەشنەکانی پاقلە و ئاویی کووزەڵەکە بۆ سەلیسییەکەیە. سوپاس بۆ زاتی پەروەردگار وە هەزاران سڵاو بۆ ڕۆحی شیرین و پاکی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) نازدار وئال ویارانی[1].

**ك ٣٧٤:** جەنابی شێخ زاهیدی سەقز نوسراوێکی بۆ سەماحەتی حەزرەتی پیر (قدس سرە) نووسی بو چەند داواکارییەکی تیا بەیان کردبوو لە کۆتایی نامەکەدا نووسیبوی:

قوربان خێزانم سکی هەیە کوڕەکە ناو بنێین چی؟ حەزرەتی پیر وەڵامی فەرمووبو لە خوا داوای سەرکەوتن و صەلاحەتتان بۆ ئەکەین ئەمجا فەرمایشی فەرموو خوا ئاگاداری بفەرموێ ئەگەر منالەکەتان کچ بوو ناوی بنێن ئامینە، ملا زاهید فەرموی کە خوا پێی بەخشین کچ بوو ناومان نا ئامینە هەزاران شوکر و سوپاس و سەنا بۆ زاتی پاکی پەروەردگار و درودی بێ پایان بۆ سەر ڕۆحی پاکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی.

**ك ٣٧٥:** جەنابی برای خۆشەویستی بۆ خوام سید عطا بە بۆنەی وەفاتی پووریەوە کە دایکی ملا هبةاللهی برام بوو هات بۆ پرسە بۆ پێنجوێن لە دوای چەند

---

(١) هوا خواهی توام جانا و میدانم کە میدانی کە هم نادیدە می بینی و هم ننویشتە می خوانی
احب حبك الکامل و ادری انك تدری تری مالم یر تقرا معان لیس فی السطر

مانگیٚ بۆی گێرامەوە ملا هبةالله ووتی: چووین بۆ زیارەتگا لە دوای تیٚ پەڕبوونی ئەم ماوەیە سید عطا فەرمووی تۆ قەبرەکەیم پیٚ نیشان مەدە بزانە چۆن ئەو دۆستە خۆی قەبرەکەیم بۆ دیاری ئەکات، ملا هبةالله ئەفەرمویٚ ئەو ڕۆشت و منیش لە دوایەوە بووم، تا لە سەر مەزاری دایکی شیرینم وەستا ووتی ئەمە مەزاری دایکتە، چونکە حەزرەتی پیر تەشریفی هێناو لە سەر قەبری وەستا ئەی خوای پەروەردگار حمد و سوپاسیٚ بۆ زاتی پاکت کە هەر لایق بە گەورەیی و دەسەلاتی خۆتە و هەزاران درووود و ستایش بۆ ڕۆحی پاکی پێغەمبەری نازدار (صلى الله علیه وسلم) و ئال و یارانی.

**ك ٣٧٦:** لە گەورەو بەڕێز و سەروەرمان، برای حەزرەتی پیرمان شا محمد عثمان جەنابی حەزرەتی شێخ مولانا خالید ئەویش لێم بیست فەرمووی:

لە کاتێکا لە تاران بووم ڕۆژیٚ دوو کەس هاتن بۆ لام یەکیان خەڵکی مەهاباد و لە بانکی میللی تاران کاتب بوو، وە باوو با پیرانی مەنسووبی حەزرەتی شێخی سراج الدین (خۆشنودی خوا بیٚ) بوون، زانیبوی بە گەیشتنم بۆ تاران بۆ سەردان هاتبوو، ئەوەی تریان خوشکەزای دکتۆر مصدق بە بۆنەی ڕەفیقەکەیەوە هاتبوو، کاتیٚ دانیشتن شێخی باوکم تەشریفی هێنا و فەرمووی: توجە ئالەمە بکە و ئیشارەی فەرموو بۆ ئەوەی کە خەڵکی تاران بوو، بە ڕۆحی شێخ توجهم لیٚ کرد مجزوب بوو، جەزبەکەی دەوامی بوو، ئەیوت لە جەزبەکەیدا: نازانم بۆچی شێت بووم؟ بۆچی عەقڵ و هۆشم نەماوە؟ وە ئەگریا بە سەر خۆیا وە وای ئەزانی کە شێت بووە، بەڵام هاوڕێکەی دڵخۆشی ئەدایەوە و ئامۆژگاری ئەکرد و پێی ووت: تۆ شێت نەبوویت مجزوب بووی وە مانای جەزبەو حەقیقەتی جەزبەی بۆ باس ئەکرد، زۆری پیٚ خۆشبوو.

لە دوای باش بوون داوای چەند ووشیارییەکی ئیسلامی لیٚ کردم منیش پێم ووت کە ببیٚ بە ئەهلی سوننەت، بە قسەی کردم بوو بە سنی ئەمجار تەمەسوکی وەرگرت و بەیعەتی قبوولٚ کرد، لە پاشا هەڵسان و ڕۆیشتن لە دوای ڕۆژیٚ یا سیٚ

ڕۆژ هاتەوە باسی شێوەی بیارەی ئەکرد بە باخ و جۆگە و خانوەکانییەوە و ووتی: لە خەوەکەما چوومە ماڵی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین شێوەکەی بەم جۆرەیە و شورای ماڵەکە بو ماڵەکەی بەم چەشنە بوو وە حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدینی برات پیرۆزبایی لێ کردم و فەرمووی ساڵێکی تر لەم ڕۆژەدا پەیمان تازە ئەکەیتەوە.

( حەزرەتی مولانا ئەفەرموێ : شێخی باوکم ساڵی داهاتوو لە هەمان ڕۆژا بە ڕەحمەتی خوا چوو) انا لله و انا الیه راجعون.

وصار حضرة سیدنا القطب الاعظم سراج الدین خیر خلف لخیر سلف فالحمد لله رب العالمین.

**ك ٣٧٧:** مامۆستا ملا سید باقی گێڕایەوە فەرمووی:

جەنابی حەزرەتی شێخ مولانا خالید تەشریفی موبارەکی هێنا بۆ بالك[١] و لە ماڵی خاوەنی دێیەکە بوو بە میوان، ئێمەش چووینە خزمەتی بۆ بەخێر هاتن و زیارەتی لە دواییدا یەکێ لە خزمەکانی ئەو خاوەن ماڵە منداڵێکی هێنا ووتی با ناوی بنێ ووتیان حەز ئەکەن چەند ناوێ بدۆزینەوە بۆ ئەوەی ناوێکی بۆ هەڵ بژێرین تۆزێ بیری کردەوە ئەمجا فەرمووی ناوی ئەنێن (          ) تا کەمێك هیچی نەفەرموو و بێدەنگ بوو ئەمجا فەرمووی عەرزی کاکەیشم کرد ئەویش هەروای فەرموو، یانی شا محمد عثمان سراج الدین.

---

(١) بالك : دێیەکە لە مەریوان

(نیشتەجێ و مەزاری خوالێ خۆشبوو جەنابی عالمی متبحر لە عیلمی باطن و ظاهر مامۆستا ملا باقرە ـ لە دووڕووەی پایتەختەوە دوورە) .

**ك ٣٧٨:** دووبـاره بـرای حـەزرەتی پـیری دەسـتگیر حـەزرەتی مولانـا خالیـد فەرمووی:

له سەر فەرمانی شێخی باوکم چووم بۆ ناوچەی تورکمـان صـحرا جـەنابی بـرای خۆشەویستم کاك عثمان ڕای ئەگەیەنێ بەوەی که خەریکی شێخایەتییه لـەو ناوچـەیه لـه خـەوا: خالیـدی بـرام دێـت لـه سـەر دەستیا لای ئـەو تمسـك وەربگـرە لـه شـەوی دووەما ئەبینێ که پیر ئەفەرموێ هـەر کـەس دەستگیری نـەبێ شـەیطان شـێخیەتی، لـه شـەوی سـێیەما حـەزرەتی شـێخ ئەچـێته وێـزەی ئـەی ترسـێنی بـەوەی ئەگـەر تمسـك نەکەیت له ناوت ئەبەم من عثمانم کوڕی شێخ علاء الدین له بیارە.

مولانا ئەفەرموێ ئەو ڕۆژەی شەوەکەی ئەو خەوەی نیشان درابوو من گەیشتمـه ئەوێ له ئێوارەدا، پیاوێ له مزگەوت هات و کەوت به سەر دەست و پێما گەرمی و محبەتێکی زۆری دەربڕی زۆر سەرم سوڕما لێی کلاوێکی له خوری دروست کـراوی له سەرا بوو، هەر وەکو عولەما و زاناو پێشەواکانی ئایین نموونەی ئیسلامـەتی خۆیـان به مێزەرە نیشان ئەدەن.

وە له کاتی حەوانەوەدا لای ئەبەن، پرسیارم له ئەحواڵی کرد ووتی من شێخم و مریدێکی زۆرم هەیه و به سەر هاتی خۆی بۆ بەیان کردم به تەواوی ئەمجا تەمەسـوکو بەیعەتی وەرگرت هەزار شوکر و سوپاس بۆ خوا.

**ك ٣٧٩:** جارێکی تر گێڕایەوە فەرمووی :

له کاتی منداڵیمـا لـه دووڕووە بـوم ناکۆکییـەك کەوتـه بـەینی کاکـه عثمـانی بـرام و یـەکێ لـه ئاغاکـانی ڕەزاوی هـەورامان کـه سـەرۆکی عەشـرەتی ئـەو ناوچـەیه بـوو، دەمەبۆڵەیەك ڕوویدا هەڕەشەیان کردبوو، لـه دوای ماوەیـەك حسین بـەگیان هێنـا بـۆ ماڵەوە، عەرزی شێخی باوکمم کرد ئێوە فەرمووتان چاری نیه کـەچی چـاك بـوەوە و شـیفای بـۆ هـات. فـەرمووی : ئەوانـه کۆمـەڵێکی زاڵـم و زۆردارن لـه خـوا ناترسـن ئەشزانن هۆکەی ئێمەین، ترسام که خانـەقا بسـوتێنن لـه تـووڕەیی و پەسـتی و نـەزانی

خۆیان، داوام کرد لە خوا کە شیفای بۆ بنێرێ چەند ڕۆژێ بۆ ئەوەی لە شەڕیان بە دووربین تا ئەگەنەوە ماڵەوە، فەرموی: دوای ئەوەی ڕۆشتنەوە سێ ڕۆژی بە سەرا تێ پەڕی بیستمان کە نەخۆشییەکەی هاتۆتەوە سەری و لە دنیا دەرچووە. ولا حول ولا قوه الا بالله العلی العظیم وصلی الله علی سیدنا محمد وعلی اله وصحبه وسلم الی ابد الابدین. لە حەدیثي قدسیا هاتووە کە ئەفەرموێ: (اني لاثأر لأوليائي كما يثأر الليث الحرِبَ).

**ك ٣٨٠:** جەنابی میرزا ئەحمەدی بیارەیی[١] بۆی گێڕامەوە فەرمووی :

ئەچووم بۆ زیارەتی حەزرەتی شا محمد عثمانی سراج الدین (قدس سره) لە بیارەی شەریفەوە بەرەو دووڕووە، لە کاتێ گەیشتمە کەلی کەماجاڕ کە چیایەکی زۆر بڵندە لە میانەی عێراق و ئێراندا، ئالەو سەر کێوە بەرزەدا لە (عالەمی میثال)دا ئەمبینی کە ئەم حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین توجهی لە خەڵکی ئەفەرموو وە ئەو توجهانەم ئەبینی تا گەیشتمە قەلاجێ کە دێیەکە پیاوی بە جەرگ و توانا بە پێنج سەعات لە کەژی کەماجاڕەوە ئەتوانێ بیبڕێ ئەو ماوەیە، ئەو هەموو مەسافە دوور و درێژە کە بڕیومە بە درێژی ئەو ماوەیە ئەو زاتە عظیمە پڕ کەماڵە توجهی ئەفەرموو لە خەڵکی، وە تەنیا دوو کەس نەبێ کە ئەم ناسین یەکیان حەزرەتی شێخ مەرحومی باوکی عاجز بوو لێی وە ئازادی نەکرد و لێی خۆش نەبوو لە حاڵی لە دنیا دەرچوونیشا ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەگەڵ ئەوەشا کە گەردنی هەموو ئوممەتی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) ئازاد کرد، چونکە خیانەتیان لێ کرد و زۆریان ئازار دابوو. پەنا ئەگرین بە خوا لە ئازاردانی دڵی ئەولیا و زویرکردنیان لە خوا

---

(١) جەنابی میرزا ئەحمەد پیاوێکی بە تەمەنی خوشخولق و شیرین ڕەووشت و زمان بوو تەمەنی جوانی خۆی سەراسەر لە خزمەت غوثی وەقت و شێخی مەرحومی باوکیا بە خزمەت بە سەر بردبوو کە نزیکەی ٥٠ (پەنجا) ساڵێ لە خزمەتی خانەقادا خزمەت گوزار بوو.

ئەپارێینەوە کە بە لوطف و کەرەم و بەخشەندە بن تا سەر لەگەڵ هەمو موسڵمانانندا ئێمەش بێ بەش نەبین لەو مەرحەمەتە زۆرە و پڕ مەرحەمەت بن لەگەڵمان.

وە هەر ئەم جەنابی میرزا ئەحمەدە ڕەحمەتی خوای لێ بێ پیاوێکی ڕووخۆش و خوو ڕەووشت جوان نیشانەی شادی و گەشی لە دەمو چاوی پاکییا ئەدرەوشایەوە و سیمایەکی صاڵحانە کەرامات گێڕانەوە و کۆمەك بە زواری خانەقا هەر لە خۆی جوان بوو ئەو پیاوە خاوەن بەخت و نگینە بوو کە جەنابی شێخی مەرحوم نامەیەکی پڕ مژدەی بۆ نووسیبوو خەلاتی کردبوو، فەرموبوی: تۆم بە دۆستی هەر دو دنیای خۆم قبووڵ کردوە، وە هیچ خەتەرە و تردید لەو قبوڵکردنەدا نیە ئەم زاتە لە سەر وەسیەتی خۆی ئەو نامەیەیان دوای وەفاتی لە شەوی سێ شەممەدا بۆ خستە ژێر کفنە کەیەوە جەنابی حاجی ملا شریف و کاکە عەبەی کۆکا.

**ك ٣٨١:** جارێکی تر جەنابی میرزا ئەحمەدی بیارەیی گێڕایەوە فەرمووی:

حەزرەتی پیری دەستگیر شا محمد عثمان سراج الدین (قدس سره) بانگی کردم ژووری تایبەتی لە حەرەم بە تەنیا لە خزمەتیا بووم تەشریفی موبارەکیان نەواریان هێنا و قەصیدەی:

| | |
|---|---|
| یـــا محمـــد المصـــطفی | جئـت بالصـدق و الصـفا |
| خـــیر مقـــدم قـــدمت | انـتَ للاسقـــام شفـــا |

لە سەر بوو شریتەکە کە بە دەنگی پڕ تاثیر و بەرەکەتی حەزرەتی پیر خۆی بوو حەزرەتی پیر تەشریفیان چوونە موڕاقەبەوە تاثیرات و بەرەکاتێ هات بینیم کە نوورێ بەرز بوەوە تا گەییە ئەو مەقامەی پێغەمبەری موبارەك (صلی الله علیه وسلم) بە جیسمی پڕ نووری لە شەوی میعراج دا تەشریفی بردە ئەوێ. ستایش و سەنا بۆ خوای پەروەردگار و هەزار درووود و سلاو بۆ ڕۆحی پاکی پێغەمبەر و ئال و یارانی.

**ك ٣٨٢:** حەزرەتی پیر جەنابی شا محمد عثمان سراج الدین گیان لە وەڵامی نامەیەکی[1] بەڕێز مامۆستا مەلا سید عبدالکریمی ئیمام و مدرسی دێی ئەسکۆڵدا ئەفەرمویٚ:

**كامل السعادة و سيادة نديم مدرس**

فرزانه جناب ملا سيد عبدالكريم دام فضله السلام عليكم و رحمة الله و بركاته

بعد الأشواق وتمنياتي الخيرية لمزيد عزكم وفضلكم قد وصل الي كتابكم الكريم من الكريم فصار قصار الفرح والسرور لقلبي السقيم وارجو الله تعالى توفيقكم ودوامكم مع العافية والهناء لترغيب العلم والديانة ونشر الشريعة وهو على كل شي قدير وهو العليم بالعلم للعلم في العلم لكل علم من العلوم وهو الكل في الكل والجزء ولا جزء ولا كل الا بجزء من جزء كله وهو الكل في الكل كل ولا جزء ولا كل في كل كله ولا جزء من كله وهو الكل بكله و متصل بكل كل وهو جزء الكل بالكل وهو كل متصل بكل كله وارجو منه الوصال بالوصال للاتصال بايصال جزء من جزء كله الذي لا ينجزا من الكل لنا ولكم ولباقي الاخوان وارجو الدوام على ذكر لا حول ولا قوة الا بالله وصلى الله على سيدنا محمد و اله اجمعين.

خادم العلماء والفقراء

محمد عثمان النقشبندى

---

(١) وەڵامی نامەیەکە بۆ جەنابی سید عبدالکریمی ئەسکۆڵ ئیمام و مدرسی ئەو دێیە، وە یەکێکە لە چەندەها نامەی پڕ حیکمەت و ڕەحمەت کە بە زمانی کوردی و هەورامی و عەرەبی و فارسی و تورکی بۆ موسڵمانانی سەر ڕووی زەمین ئەنێریٚ بۆ سود و کەڵکی دین و دنیا و ظاهر و باطنیان.

ك ٣٨٣: لـه جـەنابی مامۆسـتا مـلا عبـداللهی کـاتبم بیسـت کـه لـه سـاڵی ١٣٨٤هیجریدا[1] بۆی گێڕامەوە فەرمووی:

کاتێ باوکی خۆشەویستم هات بۆ دووڕووە بۆ زیارەتی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین(قدس سره)کە یەکەم سەفەری بوو، وە یەکەم جاری بوو کە بە خزمەت حـەزرەتی پـیر بگـات، ماوەیـەك مایـەوە ئـەمجار ئیجـازەی وەگـرت و دوای تمسـك گەڕایـەوە، لـە ڕێگـا لـە نزیکـی سـنە ئوتومبێلەکـەیان وەرگـەڕا کـە دایکـم و چـەند کەسـێکی تـری تیـابوو، لـەو سـەفەرەدا کـۆچی دوایی کـرد و دایکـم برینـدار بـوو دەستێکیشی شکا.

حەزرەتی پیر فەرمووی مجتهدی بە تەلەفۆن پێ ووتووم کە تۆ بە پێویست ئەزانرێ بۆ سنە بچی، منیش دەستبەجێ ئەمرەکـەیم بـەجێ هێنـا و چـووم و دیم بـاوکم لـە دنیا دەرچوە و تەسلیم بە خاك کراوە و دایکیشم لە بیمارخانە خراوە، چووم سەرم دا لە دایکم زۆر بێ تاقەت بـووم کـە بینیم وا دەسـتی شـکاوە و خـوێن بـە دەم و چاویەوە دیارە و زۆر مات بووم و پەژاری دای گرتم بۆ دایکم و باوکم (فصبر جمیل)، ئەمجار لەگـەڵ مامۆسـتا مـلا رسـوڵی منعـاوی چـووین بـۆ سـەر قـەبران و دوای گـەیشتنم فاتیحەیەکم بۆ باوکی شیرینم نارد داوای کۆمەکیم لـە حـەزرەتی پـیر کـرد و پـەنام بـۆ برد و عەرزیم کرد کە دایکو باوکم ئاوایان لێ بە سەر هاتوە، وە یەکـەم جاریـان بـوە کە هاتوون بـۆ ئـەو سـەفەرە وە خـەڵکی ناحـەزیش ناودڵیـان ئەخەنـە ڕوو منیش زۆر نارەحەتم و مات و بێ تاقـەتم کۆمـەکی و یاریـمـەتیم بـدە وە مژدەیـەکی خۆشـم بـدەرێ دڵم پێی شاد بێ و سینەم گوشاد کات.

لە پاش کـەمێ بینیم ڕۆحی ئـەولیاکان بـەرەو سـەرقەبران و ڕووەو گـۆڕی بـاوکم هاتن و لە ئوتومبێلدا بوون، هەندێکیان پێشـی ئوتومبێلەکـەیان ئـەکردە قـەبری بـاوکم کاتێ ئەوەم بینی دڵخۆش بووم بەڵام لە دڵـەوە بـە ئاواتـەوە بـووم و حـەزم ئـەکرد کـە

---

(١) ئێستا ساڵی ١٣٨٤ هیجری ـ (١٨) ساڵ لەمەو پێش ئەکات.

پێغەمبەری موبارەك (صلی الله علی وسلم) حازر بوایە، لە دوور چاوم پێکەوت کە تەشریفی پڕ فەڕ و بەرەکەتیان هەزاران هەزار درووود و سلاّواتیان لێ بێ دەرکەوتن کە لە سەر ئەسپێکی ......... لە هەوادا ئەڕۆشت، تەشریفیان درودی خوایان لێ بێ گەیشت و ئەسپەکەی لە سەر قەبری باوکم لە هەوادا وەستاند کە نزیکی ٤، ٥ مەتر لە زەوی دوور بوو باوکم بینی لە قەبرەکەدا وەك نەخۆش بێ وابوو یان بێ تواناییەکی هەبێ.

پێغەمبەری موبارەکم (صلی الله علیه وسلم) بینی ئەی ڕوانی بۆ سینە بە تیلەی چاوی جوان و شیرینی لە سینگی باوکم وەك دوکەڵ و تاریکی بەرز ئەبووەوە و نورو بەرەکات و فیوضاتی ئەچوە ناو جێگەی و ئەو لێڵی و تاریکیەی ئەگرت، بەم شێوەیە سێ چارەکە سەعاتی تەواو بە چاوی موبارەکی ئەیڕوانی بۆ سینەی باوکم بە چەشنێ لەو ماوەیەدا قەبرەکە و لەشی باوکمی پڕ کرد لە سرور و شادی لە بەرەکەت و نورو فیوزات حەزم ئەکرد و ئاواتم ئەخواست کە من بوومایە لە جێگەی ئەو، کاتێ کە سەراپای قەبرەکەی و جەسەدی باوکمی پڕ کرد لە ئەنوار ئەمجار تەشریفی فەرموو بە هەوادا و بە جێی هێشت.

وە ئەولیاکان دەستیان کرد بە وەرگرتنی ئیجازە لە حەزرەتی پیر حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین بۆ ڕۆیشتن و دوای وەرگرتنی دەستور تەشریفیان فەرموو خەم و پەژارەو ماتییەکەی منیش نەما.

حمد و شوکر و سەنا بۆ خوا هەزاران درود و سلاّو بۆ گیانی پاکی سەرداری کائنات و سەروەرمان حەزرەتی محمد المصطفی (صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی.

وە جەنابی مامۆستا ملا رسولی مەنعاوی چی دیبو لەگەڵ ملا عبدالله دا لەو سەرقەبرانە لەو کاتەدا نوسیومانە.

**ك ٣٨٤:** لەم ساڵەدا خۆم لە دووڕووە بووم ئەگەر نامەیەك بۆ حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین بهاتایە لە هەر لایەکەوە لە لای شارەزوور و گەرمیانەوە ئەی فەرموو تۆ وەڵامەکەی بنووسەرەوە، ڕۆژێ نوسراوێ لە دەروێش عبدالرحیم وە هاتبوو کە خەڵکی چوڕستانە بوو لە قەزای هەڵەبجە، منیش لە دوای ناوو ناوونیشان و داوای دۆعای خێرو داوای کۆمەکی بۆی خوێندمەوە نووسیبووی قوربان لەماڵی خۆمانەوە چوومەتە ماڵی باوکم ئەپاڕێمەوە کە دۆعای باش گوزەرانی و ڕەفاهمان بۆ بفەرموون وە بە چاوێکی پڕ حیمایەتەوە ئاگاداریمان بفەرموون قوربان گیان دۆعایەکتان بۆ نارد بووین، کەوتۆتە دەست پیاوێ پێی ئەڵێن (یوسف شاە وەیس) و ئەڵێ ناتان دەمەوە زۆریشم داوا لێ کردوەتەوە و هەر ئەڵێ بە هیچ چەشنێ ناتان دەمەوە.

داواکارم لە قاپی گەورەو ئازیزمان کە دۆعایەکی ترمان بۆ ڕەوانە بفەرموی وە ئەمجار لە خوارەوە کاغزەکەی ئیمزا کردبوو.

حەزرەتی پیری دەستگیر لە گۆشەی نامەکەوە بەم چەشنە وەڵامی فەرموبو نامەکەتان گەیشت و هەڵگری نامەکەش خۆی حازر بوو کە کاتێ زەرفەکەم کردەوە دۆعایەك لە ناو کاغزەکەوە کەوتە سەر ئەرز، منیش پێم ووت ئەوە چییە؟ ئەویش بە عەجایەبێکەوە فەرموی واللە دۆعای تیا نەبوو نازانم من ئەوە چییە ئەوا دۆعاکەم بۆ ناردنەوە، هەر هەمان دۆعاکەی پێشوی خۆتانە هەزاران شوکر و سوپاس بۆ خوای پەروەردگار، وە نوسەر ئەڵێ من خۆم وا ئەزانم ئاگادار بووم لە کاتی هەڵچڕینی پاکەتەکە دۆعاکە کەوتە خوارەوە.

**ك ٣٨٥:** ئەوەی کە بەندە[1] لە خزمەت حەزرەتی پیرا بینیومە زۆرە، لەوانە جارێکیان حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین تەشریفی پڕ فەڕو پیرۆزیان هێنا بۆ پێنجوێن لە زەمانی حەزرەتی باوکی ئازیزیا وە لە مزگەوتی وەسمان پاشا تەشریفیان

---

(١) مەلا ئەحمەدی قاضي.

مانەوە، منیش خەریکی ناردنی نامەیەك بووم کە بینێرم بۆ بیارە بۆ پرسوڕای هێنانی (حەلاو)ی خێزانم کە مارەم کردبوو هێشتا نەم گواستبووەوە، کاتێ هەواڵی تەشریف هێنانی ئەم زاتە بوزرگو عالی جەنابەم بیست چووم بۆ خزمەتی و زیارەتیم کرد، بەلام نامەکەم یا لە مزگەوت بوو یان لە گیرفان ما بوو، دەستی پڕ فەڕ و بەرەکەتیم ماچ کرد و عەرزی ئەو زاتە عظیمەم کرد:

نامەیەکم بۆ جەنابی باوکی شیرینت نووسیوە فرسەت نەبوو بینێرم تەشریف هێنانی جەنابتان ئیتر وازی پێ هێنام لە ناردن.

فەرمووی: نامەکەت لە بارەی کارێکەوەیە نیوەی تەواو بوە نیوەی ماوە عەرزیم کرد بەڵێ ئەو زاتە عالی جەنابە نە فەرمووی چاکە نە فەرمووی خراپە تا تەشریفیان گەڕایەوە و پرسیان بە حەزرەتی شێخی باوکیان فەرموو ئەمجار وەلامیان فەرموو باسەکەم عەرزی شێخی باوکم کرد لە وەلاما ئاوای فەرموو.

**ك ٣٨٦:** جارێ لە خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین دا چووین بۆ شلێر وە شەوێك لە نزارە ماینەوە بۆ بەیانی وولاخیان ئامادە کردو ماینێکیان زین کرد بۆ ئەو حەزرەتە، کاتێ ڕوانی بە ماینەکەدا فەرمووی من سواری ئەم ماینە نابم وە فەرمووی نەخەیر واللە سواری نابم، ئەمجار بۆیان گۆڕی بە ماینێکی تر و لە خزمەتیا کەوتینە ڕێ نزیکەی پێنج شەش سەعاتێ ڕۆیشتین ڕۆژێکمان پێ چوو کاتێ گەڕاینەوە بۆ نزارە ئەو ماینە مرد کە حەزرەتی پیر فەرمووی سواری نابم، چونکە ئاگادار بوو بە حاڵەکەی بۆیە سواری نەبوو و نەبایا خەڵکی و هەروەها خاوەنەکەی بڵێن ئەم ماینە حەزرەتی پیر سواری بوە ئەبوایە محفوظ و پاریزراو بوایە و پیرۆز. سوپاس بۆ خوای پەروەردگار و هەزاران درورد و سلاو بۆ ڕۆحی پاکی پێغەمبەری نازدار و ئال و یارانی هەموو.

**ك ٣٨٧:** نەخۆشی و ئازارێکم هەبوو، چەند جار کە ئەچوومە خزمەتیان عەرزیم ئەکرد، ئەی فەرموو هەر ئێشەکە دەرکەوت پێم بڵێ ئەوا ئێشەکەم لێ پەیدا بۆتەوە، وە هەر کاتێ ئەمووت ئەوا ئێشەکەم بۆ پەیدا بوەوە بە کوللی ئەو ئێشەم لا ئەچوو نە ئەما، فالحمدلله والصلاة و السلام علی رسول الله.

**ك ٣٨٨:** لە کاتی وەفاتی حەزرەتی شا علاء الدین دا خوا مقامی ئەعلا بفەرموێ پڕی بوو لە خەڵك وە جەنابی حەزرەتی پیر شاهی عثمان گیان تەشریفیان لە میحرابەکەدا بوو، بەندە لەگەڵ ملا عزیزی خۆشکەزای مامۆستا ملا عارف بانەییدا بووم خوالێی خۆشبێ دانیشتبووین دوور لەو سەماحەتە قسەمان ئەکرد وە زۆر قسەکەمان بە چرپە و نهێنی بوو ئەوەی لە لامانەوە بوو گوێی لێ نەبو ئەڵێین چی وە قسەکەمان بۆنی غەیبەتی یەکێکی لێ ئەهات، حەزرەتی پیر ئاوڕی لێ داینەوەو بە دەنگی بەرز فەرمووی: اللهم اغفر لامة محمد مغفرة عامة[1] (صلی الله علیه وسلم) ئیشارەی فەرموو بە واز هێنانمان لەو باسە، سا خوا پەشیمانم و تەوبە بێ لە گشت غەیبەت و بێ ئاگایی و قسەیەکی نابەجێ کە لە دەممان دەرچوو بێ یا کردارو کردەوەیەك کە خوا پێی ناخۆشبێ، ساخوا لێمان خۆشبە بمان بەخشە عەفومان بکە تەوبەمان لێ قبووڵ بفەرموو تۆ خوایەکی بەڕاستی لێ بوردەو بەخشندە و میهرەبانی، وە بارانی ڕەحمەت بڕێژە بە سەر پێغەمبەری موبارك (صلی الله علیه وسلم) و ئال ویارانی.

**ك ٣٨٩:** جارێ لەگەل خوالێ خۆشبوو مامۆستا ملا عارفی بانەییدا لە پێنجوێنەوە هاتین بۆ خزمەت حەزرەتی پیر بۆ شاری سولەیمانی بۆ زیارەت لە حوجرەکەی ملا سید عارف، حوجرەکە پڕ بو لە مەلا و فەقێ و زانا و مامۆستایان بەندەش لە ناو دەرگاکەدا خۆم لە حاڵێکی زۆر ناڕەحەتا ئەبینی لە ترس و بیمی

---

(١) یانی : خوایە خوشبە تۆ لە هەموو موسڵمانانی ئوممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

گوناهو خراپەکانم، کتوپڕ حەزرەتی پیر شا محمد عثمان سراج الدین فەرمووی: یاأیها الذین آمنوا توبوا إلی الله توبةً نصوحاً.

سەرم هەڵبڕی حەزرەتی پیر بە عەجایەب ئەڕوانێ بۆم و چاوی موبارەکیم لێ ناتروکێنێ، واش دیار بوو کە مامۆستاکان هیچیان گوێیان لەو فەرمایشتەی نەبوو، پاکی و بێ عەیبی بۆ خوایە کە هەرچی بیەوێ ئەیکات، مەیلی بێ گوێ نەبیسێ نابیسێ، مەیل بکات گوێ کەڕ بکات لە هەر چی کەڕی ئەکات بۆ هەر چی بیەوێ بۆ هەرکەس بیەوێ.

**ك ٣٩٠:** جارێ لە مانگی ڕەمەزانا هەڵبەستێکم بەم چەشنە دانا

پەشیمانم پەشیمانم پەشیمان

نامەیەك لەو حەزرەتەوە گەیشت فەرمایشتی فەرموو بوو، منیش چەند دێڕێ شیعرم لە سەر هەڵبەستەکەی تۆ داناوە بەڵام هێشتا تەواوم نەکردوە ئەمەش سەرەتاکەیەتی:

ڕیکارم ڕیکارم ڕیکار

کەواتە کەی: پەشیمانم پەشیمانم پەشیمان

**ك ٣٩١:** لە باوکی شیرینم و خۆشەویستم ملا محمدی قازی م بیست ڕەحمەتی خوای لێ بێ بۆی گێڕامەوە کە ملا عبدالرحمن پێنجوێنی لە نەوەو ئەولادی سید نورالدین بریفکانی‌یە ڕەحمەتی خوایان لێ بێ کە لە ئەشراف بوە، وە زۆر کەس خەڵکی پێنجوێن ئەمە ئەزانن دڵنیاشم کە هیچ کەس ئەوەی بۆ حەزرەتی پیری دستگیر شا محمد عثمان سراج الدین باس نەکردوە، وە کەسیش باسی نەکردوە کە دایکی ڕەحمەتیم لە نەوەی ئەوانە[1]، لە وەڵامی نوسراوێکا ئەم دێڕەی بە مژدە بۆ

---

(١) یانی بەندە لە دایکەوە سیدە.

نوسیم کە مرحومی مەلای پێنجوێن لە نەوەی سید نورالدین بریفکانە و بەندەش لەوانم.

عزیز من سمّي شاه مختار　　　　زبیت العلم نسل جد ابرار

منیش زۆر پێی شادمان بووم بەو مژدە خۆشە شوکر و سوپاس و سەنا بۆ زاتی پەروەردەگار سوپاسێکی پاك و چاك و بێ پایان وە هەزاران درووود و سڵاو بۆ ڕۆحی پاکی پێغەمبەری نازدار ﷺ.

**ك ٣٩٢:** جارێ لەگەڵ حاجی کاکە حمەی کوڕی خوالێ خۆشبوو حاجی محمد صالح پێکەوە چووین بۆ بیارەی شریف ئەو شەوە لەوێ ماینەوە و ئیجازەشمان وەرگرت لە خزمەت حەزرەتی شێخ علاء الدین قدس سره کە بەیانی بگەڕێینەوە، کولێرەی خانەقامان وەرگرت و بە چاوە خواردمان، حاجی کاکە حەمە ووتی هەرکەس بچێ بۆ تەکیەی فلان بەیانیان کەرە و نان و ماستی دەرخوارد ئەدەن، دوای ئەوە هەڵسایین چووین بۆ خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین بۆ دەست ماچکردن و زیارەتی و بە دڵ حەزمان ئەکرد دۆعای خێرمان بۆ بفەرموێ، دوای زیارەتی ئەو سەماحەتە فەرمووی دانیشن نان و چایی بخۆن عەرزمان کرد خواردومانە، فەرمووی نەخەیر ئەبێ هەر دابنیشن، بە زۆر دای ناین و نان و کەرەی سپی و چای بۆ ناردین.

**ك ٣٩٣:** جارێ لە خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین دا بووم بە تەنیا لەو حوجرەیەدا کە چایان لێ ئەنا، ئەو حەزرەتەش نامەی ئەنووسی، بە زمان بۆ خێزانم مەتڵەبێکم عەرز کرد، لە پاشا بە دڵیش داوایەکی تری خێزانم تقدیم کرد کاتێ لە نامەکە بووەوە فەرمووی: ها یانی بۆم بڵێرەوە ئەڵێی چی منیش تەنیا داخوازییە زمانییەکەم عەرز کردەوە، فەرمووی هیچ مەتڵەبێکی ترت نیە!!! عەرزیم کرد نەخەیر

فەرمووی ئەی داوایەکی ترت هەبوو عەرزیم کرد هیچم نەووتوە، فەرمووی بەڵێ لە بارەیماڵەوەتان داوایەکی ترت هەبوو عەرزیم کرد ئەگەر ووتبێتم ئەشزانی چیم ووتوە سوپاس بۆ خوای پەروەردگار و درود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری موبارەك (صلی الله علیه وسلم) ئەو خوایەی کە دڵی خۆشەویستانی ئوممەتی پێغەمبەری وا ڕووناك و بێگەرد کردوە بە خەتەرە و خەیاڵی ناو دڵی خەڵکی ئاگاداری کردوون و ئەسرار و نهێنییەکانی بۆ ئاشکرا کردون، هەر وەك فەرموویانە: النقشبندیون جواسیس القلوب.

**ك ٣٩٤:** جارێك لە زەمانی باوکی پایە بەرز و پیرۆزییا حەزرەتی شا علاء الدین خۆشنودی خوابێ ئەم زاتە حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین تەشریفی هێنا بۆ پێنجوێن ماوەیەك تەشریفی موبارەکی مایەوە، ڕۆژێك لە خزمەتیا گەڕامەوە بۆ مزگەوتەکەی خۆم و لە سەر پشت پاڵ کەوتم بینیم کە تەشریفی هێنا بۆ مزگەوتەکە بەندەش هەستام بۆ خزمەتی لە بەر چاوم هەرما تا چەند هەنگاوێ نزیك بوەوەو عەباکەی چاك کرد بۆ دانیشتن ئەوسا لە بەر چاوم وون بوو.

**ك ٣٩٥:** واڕێکەوت ئازارێکی زۆر لە قورگی خێزانم دا پەیا بوو ڕۆژ بە ڕۆژ ئازاری هەر زیادی ئەکرد بە چەشنێ تفی بۆ قووت نە ئەدرا نە وەك خواردن ماوەیە ئاوا مایەوە ڕۆژێ ووتی پارە بۆ ڕۆژێکی وا سەرف نەکرێ بۆ چی باشە با بچین بۆ سولەیمانی بۆ لای پزیشکێ چارە سەرێکم بۆ بدۆزێتەوە پێم ووت من ئەچم بۆ بیارەی شەریف و عەرزی حەزرەتی شێخ عثمان ئەکەم، دڵنیاش بە هەر بە عەرز کردنی ئازارەکەت لە سەر سووك ئەبێ، ووتی بچۆ، کاتێ گەیشتمە ئەوێ وە بە دیداری موبارەکی شەرەفدار بووم عەرزیم کرد فەرمووی دەرمانی بۆ دائەنێین ان شاء الله نزیکی نیوەڕۆ دوبارە عەرزیم کردەوە، فەرمووی سەبرکە تا ئێوارە، ئێوارە عەرزیم کردەوە فەرمووی بەیانی هەروا ئارامی پێ گرتم تا سێ یان چوا ڕۆژ. بەیانییەك چوومە

خزمەتی دوای خۆر کەوتن فەرمووی خێزانت چییەتی؟ نەخۆشییەکەیم عەرز کرد، تۆزێ بیری کردەوە فەرمووی ناوی حەلاوە ووتم بەڵێ تۆزێ هیچی نەفەرموو منیش هەر ئەڕوانم بۆی وە تەشریفی دانیشتوە قاچێکی موبارەکی ڕاکێشاوە و قاچێکی تریانی لە سەر ئەژنۆیە دەستی موبارەکی خستۆتە سەر، وە نیوە دەستی لە سەر ئەژنۆیەتی و منیش وا خەریکم سەیری ئەکەم کە دەستی موبارەکی وورده وورده لە لای گوێیەوە بەرەو دەم و چاوی ئەجووڵێنێ ئەمجار لەوێوە بەرەو خوار دەستی موبارەکی هێنا تا سەر سنگی و چاوی کردەوە و فەرمووی: قەیناکا ئەگەر ئەتەوێ بگەڕێیتەوە، ئەو ڕۆژە دوای نیوەڕۆ گەڕامەوە و شەوەکەی لە هەڵەبجە بووم و دوای نیوەڕۆ گەیشتمەوە پێنجوێن، کە چوومەوەماڵەوە سەیر ئەکەم هەر ئەڵێ ناساخیشی نەگرتوە، بەلام ووتی لەو کاتەوە تۆ ڕۆیشتی تا چەند ڕۆژێ لە حاڵێکی زۆر ناخۆشا بووم کاتێ باوکم لە گوڵە هات بۆ مووچە وەرگرتن و بینیمی زۆر دڵگران بوو داوای ئیجازەی کرد و وەری گرت و خۆمان حازر کرد کە بکەوێنە ڕێ بەرەو سلێمانی بۆ لای پزیشك چوو کە ئوتومبێل بگرێ کاتێ ئەو ڕۆشت هەستم کرد کە شتێکی سارد و نەرم بە گەرووما چوە خوارەوە، تفم قووت دا بە ئاسانی قووت چوو ئاوم خواردەوە زۆر بە ئاسانی و بێ زەحمەت پارویەکیشم قووت دا هەر وەکوو کاتی ساخیم قووت چوو، کاتێ باوکم گەڕایەوە پێم ووت نایەم بۆ سلێمانی چاك بووم و حاڵم باش بوو، ئەویش چوو کەبابی بۆ کڕیم تێر و پڕم لێ خوارد کە وەختەبوو لەوە پێش لە برسا بمرم هیچم بۆ قووت نەئەچوو، سوپاس بۆ خوای پەروەردگار.

**ك ٣٩٦:** نامەیەکم نووسی بۆ سەروەری خۆم حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین بۆ پرسو ڕای کردنی پارچە ئەرزێکی خۆمان بە خانوو لە پێنجوێن وام ئەزانی ئەفەرموێ موبارەك دوای ناردنی نامەکە بۆ ئەو پێشەوای دین و دنیایە دەستم کرد بە کڕینی بەرد و پێویستی و کەلو پەل بۆی، بەلام هەرکات ئەمەوێ لەو بارەوە خەریك

بم یا کەل و پەلی بۆ بکڕم دەسبەجێ یەك جار ئەپژمم یا بۆ هەر کارێ کە خۆ گرتن و ئارامی پێویست بێ، ئێتر ئەو کارەم لە سەر شان قورس و سەنگین ئەبێ، چەند جار ئەم کارەم تاقی کردۆتەوە کە یەکجار پژمین لە هەر کارێکا نیشانەی ڕاگرتن و سەبرە، هەرجار خەریك ئەبووم پژمینێ ئەهات تا ڕۆژێ لە ناو خۆمانا باسم کرد ووتم: خوایە بیکەی بە خاطری جاهی قورئان و حەقیقەتی قورئان و پایە بەرزی قورئان من محتاجم بۆ خانویەك تیا بحەوێمەوە، ئەگەر ئەم خانوە باشە و چاکە با گوێم لە دوو جار پژمین وە ئەگەر چاکو باش نیە ئەوا یەکجارم گوێ لێ بێ، پاش کەمێ گوێم لە یەك پژمین بوو لە یەکێ بە بەردەمی پەنجەرەکەمانا تێ پەڕی، خێزانم ووتی ئەگەر حەزرەتی شێخ فەرمووی خانوو دروست بکە هەر دروستی ناکەیت؟ منیش ووتم ئەگەر ئەمر بفەرموێ دروستی بکەم ئەوا دەستی پێ ئەکەم، لە دوای چەند ڕۆژێ وەلامی نامەکەی خزمەت پیر هاتەوە لە سەرەتاوە فەرموو بوی لە خصوصی خانو کردنەوە جارێ سەبر گرە، ئەمرەکەیم بەجێ هێنا و پارەی کڕینی بەردەکانم وەرگرتەوە، چەند جار لە خزمەتیا بووم دوای ئەوە ویستویانە لە بارەی فرۆشتنی شتێکەوە یا کڕینیوە پرس و ڕای پێ بکەن کتوپڕ ڕێکەوتوە هەر لەو مەجلیسەدا دووجار پژمیون، کتوپڕ حەزرەتی پیری دەستگیر فەرموویەتی ئەوا بۆیان ئیمزا کردی ( العطسة شاهدة والعطستان شاهدتان) ئەمجار ئەو دۆستی خوایە لە ناو ئەو جەماعەتەدا ڕووی کردە بەندە و فەرمووی تۆ بۆ خانەوەکەت چیت کرد؟ منیش بە سەرهاتی ئەو خانوەم بۆیان گێڕایەوە، وە وام بۆ دەرکەوت کە سەماحەتیان ئاگادار بوون لەو پژمینانەی کە بو بەهۆی خانوو نەکردنمەوە، بۆیە لە جارەکانی پێشوودا پرسیاری نە ئەفەرموو ئەمجارە دوای ئەو دو پژمینە پرسیاریان فەرموو هەزاران شوکر و سوپاس بۆ خوای پەروەردگار، درود و ستایشی بێ پایان بۆ گیانی پاکی محمد رسول اللەی نازدار و ئال و یارانی، درود و سلاوێ بە بەردەوامی و هەرگیزا و هەرگیز نەبڕاوە و پرشنگدار و ڕوناك تا ڕۆژی دوایی.

**ك ٣٩٧:** جارێ لەگەڵ سێ کەسی[1] خەڵکی پێنجوێن بۆ بیارەی شەریف ڕۆیشتم بۆ زیارەتی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین (قدس سره) کاتێ گەیشتینە سید صادق یەکێکیان کە ناوی فتح الله فرج بوو، ووتی: ئەگەر حەزرەتی شێخ عانە[2] یەکی کۆنی دامێ ئەوا بڕوایەکی دامەزراوم پێی ئەبێ، کاتێ گەیشتینە بیارەی شەریف و بە دیدار و سیمای موبارەکی شەرەفدار و کامیاب بووین هەریەکەی سەرو دۆعای خەڵات کردین بەڵام عانەیەکی دا بە ناوبراو و فەرمووی: لە بەغا ئەم عانەم وەرگرتوە منیش ئەی دەم بە تۆ وەری گرە و ئیتر محبەت و عقیدەت ببێ، حمد و شوکر و سوپاس بۆ خوا ئاوات و داخوازییەکەی هاتە دی.

**ك ٣٩٨:** لە یەکێکی بڕوا پێکراوم بیست کە هەر وەك خۆم دیبێتم وەهایە بۆی گێڕامەوە ووتی: شەیتان خەتەری پێ کردم کە بچمە لای خێزانم کە لە حەیزا بوو ئەشم زانی کە حەرامە، ویستم ئەو کارە نا بەجێیە بە جێ بێنم کتوپڕ دەرگاکەمان بە توندی ڕایان وەشاند هەر وەکو یەکێ ڕای وەشێنێ منیش وازم لەو کارە بێ شەرعییە هێناو خوا پاراستمی بە کۆمەکی دۆستان، بۆ بەیانی هەستام سەیرم کرد دەرگاکە داخراوە کردمەوەو چوومە دەرگای دەرەوە بینیم ئەویش هەروەها زانیم کە ئەو کارە لە ئەولیاوە بوو، لە دوای ماوەیە نامەیە لە حەزرەتی شێخ محمد عثمان سراج الدین ەوە گەیشتم بە خزمەتی ئەم ئایەتە پیرۆزەی تیا نوسرابوو: ﴿اعوذ بالله من الشیطان الرجیم **ان النفس لامارة بالسوء الا ما رحم ربي**﴾ تو از مای کە از مای یانی تۆ لە وانەی کە (ما) ئەتگرێتەوە چونکە تۆ لە ئێمەی، ئەمجار ووتم: ئەوەی دەرگاکەشی

---

(١) ئەو سێ کەسە یەکیان حاجی کاکە حمە بوو دوەمیان ئەحمەد خوامراد و سێیەمیان فتح اللەی فرج بوو.

(٢) عانە : دراوێکی کۆنی عێراقە بە (٤) چوار فلس ئەچوو.

ڕاوەشاندوە دیارە هەر خۆی بووە، سوپاس بۆ خوای پەروەردگار و درودێکی بێ پایان بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار (صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی.

**ك ٣٩٩:** دوای حمد و سەنای خوای پەروەردگار و درود و ستایشێکی بێ حەد و ژمار لە سەر پێغەمبەری نازدار و ئال و یارانی هەموویان بە گشتی هەتا ڕۆژی دوایی بە پێی ئایەتی (وأمّا بنعمة ربّك فحدث) ئەم بەسەرهاتەی خۆم ئەنووسم خوای گەورە تۆش لە بەر خاتری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و یارانی شێرانی و ئەولیا و نازدارانی خاوەن وەفا و ڕاستی و پاکو بێگەردانی دەرگای ڕەحمەتت بمانپارێزە لە گشت سەختی و کۆسپ و تەنگانە و غەفڵەت و دڵ ڕەقی و تاریکییەك، وە لە هەرچییەك کە لە قاپی تۆ و دیداری شیرینت دورمان ئەخاتەوە ئەی پەروەردگاری گەردوون، و بارانی ڕەحمەتت بە تاوێکی بەهارانە بڕژێنە بە سەر محمد(صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی. ئەمەش کەرامەتەکەیە کە عەرز ئەکرێ:

حەزرەتی پیر فەرمانی فەرموو کە تەرکی جگەرە کێشان بکەم، وە چەند جارێ شاهی سراج الدین بە خۆی ئەفەرموو سێ بارە و چوار بارەی ئەفەرموو ئەمجار ئیتر نەی فەرموو کە بە خزمەتی ئەگەیشتم لە خزمەتیا جگەرەم نەئەخوارد. چەند ساڵێ بە سەر ئەو فەرمایشتەدا تێ پەڕی هەستم بە لاوازی و بێ هێزی ئەکرد و پەرەی ئەسەند تا جارێ لەگەڵ مەلا عەلیدا لە چاخانەکەی مـلا حمـه امین لە سلێمانی دانیشتبووین یەکێك لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو پێیان ئەووت سید سعید[1]، جگەرەکەیم داگیرساند زۆری ئەزیەت دام منیش پەیمانم کرد کە ئیتر جگەرە نەخۆم پاکەتەکەم دا بە ناو براوی تەنیشتم من ئیتر وازم هێنا ئەویش پێی ووتم دەستی پێ ئەکەیتەوە، منیش پێم ووت نەخەیر. دوای چەند ڕۆژێ چووم بۆ بیارەی شەریف و چەند شەوێ مامەوە، ڕۆژێ شێخ محمد عثمان سراج الدین فەرمایشتی فەرموو: بە یەکجگاری وازت لە

---

(١) ئەو سەید سعیدە ئیمام بوو لە بەکرە جۆ پێش ماوەیەك هاتە مزگەوتی دێیەك لەو نزیکانە.

جگەرە هێنا؟ عەرزیم کرد بەڵێ، فەرمووی: مەعلووم؟ ووتم بەڵێ، دوای ماوەیەکی تر چوومەوە خزمەتی فەرمووی: بە تەواوی وازت لە جگەرە هێنا؟ عەرزیم کرد بەڵێ زانیم کە ئاگادارە بە سەر ئەحواڵما بە ئەمری خوای تەوانا شوکر و سوپاس بۆ ئەو خوایە کە ئەوی ئاگادار کردوە بە هەموو ئەسراری کەون و نهێنی مریدەکانیا بە جەم.

**ك ٤٠٠:** جارێ لە بیارەی شەریف لەگەڵ جەنابی شێخ عثمانی سیرێدا هەر دوکمان بانگ کراین بۆ ماڵی حەزرەتی شێخ محمد عثمان سراج الدین چووین و لەوێ هێشتا قاوەڵتی ئامادە نەکرابوو بە جەنابی کاکە عثمانی سیریم ووت من شەرم ئەکەم لە خزمەت حەزرەتی پیردا هەرکات ئەو زاتە تەشریفی هێنا پرسیاری عەرز بکە لە بارەی ئەستێرەی دەس کردەوە، پەسەندی کرد ووتی باشە، وە من بە نهێنی ئەو باسەم بۆ کاکە شێخ عثمانی سیرێ باس کرد:

این چه شوریست که در دور قمر می بینم
همه افاق پر از فتنه و شر می بینم[1]

دوای ماوەیەکی زۆر حەزرەتی پیر تەشریفی هێنا بە بێ پرسیار کردن فەرمووی کە ئاوای ئەگەیاند (خەڵکی هەتا شوانیش ڕادیۆی کڕیوە و گوێی لێ ئەگرن بۆ ئەوەی کە پێی ئەووترێ مانگی دەسکرد، وە ئیتر لەو بارەیەوە هەرچی فەرموو گوێمان بۆ گرت سوپاس بۆ خوا و درود و سلاو بۆ گیانی پێغەمبەری نازدار و ئال و یارانی بەگشتی ئامین.

---

(١) عەرەبییەکەی: ما هذه الفتن تبدو في النظر منها امتلا الافاق في عصر القمر

**ك ٤٠١:** لە جەنابی حاجی وەستا ئەحمەدی خەیاتم بیست کاتێ کە هات بۆ زیارەتی حەزرەتی پیری دەستگیر حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین لە پێنجوێن ووتی: لەگەڵ عبدالرحمن چووین بۆ خزمەت ئەو زاتە بزورگە منالێکی پێ بوو کە دایکی نەی ئەویست و دووره پەرێزی لێ ئەکرد، هەروەك هەندێ گیاندار و زیندەوەری ماڵی ناهێڵێ بەچکەکەی شیری بخوات، وە بەتەمای ووتنی ئەو تکایە بوو لە خزمەت پیردا بۆ ئەوەی دۆعای بۆ بکات ووتی کاتێ منالەکەم دانا لە بەردەستیا بێ ئەوەی من هیچ بڵێم دوای ئەوەی دەستی موبارەك و پڕ فەڕی هێنا بە سەریا فەرمووی ئەم منالە گلەیی لە دایکی ئەکات بە ناوی منەوە پێی بڵێ ئەگەر دووری لەم منالە بکا و شیری نەداتێ لەلایەن ئێمەوە ئازاری تووش ئەبێ منیش منالەکەم بردەوەو ئەو کەڕامەتەم بۆ دایکی گێڕایەوە، ئەویش ووتی: ئەگەر ئەو شێخە با غەزنەیەك لە ئەرزا بۆ خۆی دەرهێنێ، هەر بەو چەشنە مایەوە، تا لە زستانا حاڵی خراپ بوو و نەخۆش کەوت وە بە دەردی ئیفلیجی گرفتار و دوچار بوو، لە بەهارا بردم بۆ بیارەی شەریف و حاڵی باش بوو، هەزار شوکر و سوپاس بۆ خوا و درود و ستایشی بێ پایان بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدارﷺ .

**ك ٤٠٢:** وە هەروەها جارێك لە خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین‌دا بووم (قدس سره) داوای ئاوی خواردنەوەیان کرد، منیش لەو کاتەدا تینووم بوو، خۆشحاڵ بووم لە دڵی خۆما ووتم لەو ئاوە ئەخۆمەوە، بەڵام ئاوەکە ماوەیەکی بەسەرا تێ پەڕی خۆم بە خۆمم ئەوت ئەو ئاوە هەر نەهات!!! ئەمجار کەوتمە لۆمەی خۆم ووتم ئەی نەفس: حەزرەتی پیر تینوویەتی داوای ئاوی فەرمووە من هیچ بە خەمی تینوویەتی ئەو زاتەوە نیم جارێ خەمی خۆمە پەیمان بێ تا لێرەدا بم ئاو نەخۆمەوە مەگەر حەزرەتی پیر ئەمرم پێ بکات!! کاتێ ئاوەکەیان ئامادە کرد و ئەو زاتە پیرۆز و بزورگە نۆشی کرد کەمێ لە پەرداخەکەدا مابووەوە فەرمووی ئەم ئاوە بدەن بە مەلا

ئەحمەد و پەرداخەکەشی بۆ پڕ بکەنەوە ئاوەکەم خواردەوە و پەرداخێکی تریشیان بۆ هێنام ئەویشم هەر خواردەوە شوکر و سوپاسێکی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگار سڵاو و درودی خوا لەسەر پێغەمبەر و ئال و یارانی.

**ك ٤٠٣:** جارێ بە ڕێگەوە بووم کە بچم بۆ زیارەتی حەزرەتی قطبی زەمان شا محمد عثمان بۆ بیارەی شەریف لە ڕێگا لە باسکە درێژ بە خزمەت جەنابی عالمی فاضل و محبی کامل مامۆستا ملا عارفی بانەیی گەیشتم کە تەشریفیان لە خزمەت حەزرەتی پیر ئەهاتنەوە پێی ووتم: کاتێ گەیشتمە بیارە و چوومە خزمەت حەزرەتی پیر ئەو کۆمەڵەی لەوێ بوون فەرموویان ئێستا حەزرەتی پیر خەبەری هاتنی ئێوەی دا و فەرمووی: ئیستا مامۆستا ملا عارف دێت بۆ ئێرە. شوکر بۆ خواو هەزار سڵاو بۆ گیانی پێغەمبەر و ئال و یارانی.

**ك ٤٠٤:** ئێمە کۆمەڵێ بووین لە خزمەت حەزرەتی پیردا لە بیارەی شەریف وە جەنابی حاج ملا ئەحمەدی ئیمامی دێی بناوە سوتەیە[1] کە لەسەر سنوری ئێرانە، وە حەزرەتی شێخ علاء الدین تەشریفی پڕ فەڕیان لە حاڵی حەیاتا بوو، ڕۆژێ هەمومان لە ماڵی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین‌دا بووین بە کۆمەڵ ئەم مامۆستایەی ناوبراو ووتی: چاوم مووی لێ هات، وە لەوە پێشیش هەر دوچاری ئەو نارەحەتییە بووم حەزرەتی پیر ناردمی بۆ کەرکوك لەوێ چاریان کرد، بەڵام ساڵی ڕابوردو زۆر گریام پێی لە ئاکامی ئەو زۆر گریانەوە دووبارە دووچار بوومەوە، کاتێ بە خزمەتی گەیشتین عەرزی کرد داوا کارم لە لوتفی جەنابتان کە دۆعایەکم بۆ بنووسی خوا منداڵێکی نێرینەمان پێ ببەخشێ، حەزرەتی پیر فەرمووی دوای ئەم ژن هێنانە پێکەنینت

---

(١) بناوە سووتە : سەر بە قەزای پێنجوێن و سەعات و چارەکێ لەوێوە دوورە. ئەم زاتە پڕ محبەتە جەنابی حاجی ملا احمد تا ئێستا کە خەریکی ئەم نووسینەم نقلی سلێمانی بوە.

ئەبێ!!! عەرزیم کرد بەڵێ، فەرمووی ناوی چییە؟ عەرزیم کرد عەدلە، ئەمجا شێوەی و چۆنیەتی برۆی و لووتی و بالاّی هەمووی باس کرد کە چۆنە ئەمجار فەرمووی: ئەو ئافرەتە عەرەق ئەکات بە بێ گەرما و ماندو بوونێ کە توشی ببێ بە هۆی ئیشەوە ئەمجار فەرمووی ئایا سکی هەیە؟ فەرمووی ئەمجارە تازە تێ پەڕی دۆعایەکی بۆ ئەنوسین بۆ سکی دووەمی بۆ ئەوەی نێرینە بێ یانی کوڕ، کاتێ لە خزمەتیا هاتینە دەرەوە ملا ئەحمەد فەرمووی: دیارە سکی ئەمجارەی کچ ئەبێ، کە بوو هەروا بوو، بۆ ساڵی داهاتوو وا ئەزانم کوڕی ئەبێ بەڵێ بۆ ساڵی ئایندە کوڕی بوو ناومان نا خالد سوپاس بۆ زاتی پەروەردگار درووود و سلاّو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار و ئال و یارانی.

**ك ٤٠٥:** کاتێ حەزرەتی شا علاء الدين قدس سره تەشریفیان لە حاڵی حەیاتا بوو چووم بۆ بیارەی شەریف شەوێ لە خەتمەدا بەشداریم کرد جەنابی حەزرەتی قطبی اعظم و نائبی رسول الله شا محمد عثمان سراج الدين تەشریفیان حازر بوو، کاتێ دەست کرا بە تەهلیلە ئەم زاتە موبارەکە هەر ئەهات و لێم نزیك ئەبووەوە تا سەری موبارەکی بە تەواوی هێنایە پێشەوە لێم لە کاتی لا الە سەری ئەبردە دواوە بەلاّم لە الا الله سەری ئەهێنایەوە پێشەوە، گەرمیەکی وام بۆ ئەهات، هەستم ئەکرد کە کلّپە و بلّێسەیەکی ئاگر بەرەو ڕووم دێ، هەزاران شوکرانە بۆ خوا و هەزاران درود و سلاّو لە دیاری پاکی پێغەمبەری نازدار.

**ك ٤٠٦:** جارێ لە بیارەی شەریف لە خزمەت ئەو دۆستی خوایەدا بووم دووکەس لە خەڵکی پێنجوێن یەکیان مصطفى فەقێ ئەحمەد و ئەوی تریان علی خەیات بوو هاتن پرسیان بەو حەزرەتە کرد لەبارەی هێنانی عائشەی کچی میرزا ئەحمەد بۆ مصطفای ناوبراو کە مارەی بکات، حەزرەتی پیر فەرمووی ناڕازیم زۆریان

لە خزمەتیا عەرز کرد کە دۆعای خێر بفەرموێ و بڕیاری خێری لە سەر بفەرموێ بەڵام هەر ڕەزامەندی پیشان نەدا ئەوانیش عەرزیان کرد ئێمە داوامان کردوە قوربان فەرمووی ئەگەر مارەیشت کردبێ بۆ تۆ نابێ، ئەمجار گەڕانەوە بۆ پێنجوێن و مارەی کرد و هێنای زۆری نەخایاند تەڵاقی دا و لێك جیا بوونەوە.

**ك ٤٠٧:** لە سەفەرێکا لە خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین مانەوەکەم پێی چوو، ڕۆژێ لە دڵی خۆما ووتم ئەگەر ئەم نیوەڕۆیە بۆ قاوەڵتی شتێکی مقوی نەخۆم بێ تاقەتم ئەکات، بۆ ئەم زەعیفی و بێ هێزییەم چووم بۆ خۆم لێی خەوتم یەکێ لە کارگوزارانی خانەقا بە ئاگای هێنام پێیان ئەوت میرزا ئەحمەد کە خۆی خەڵکی بیارە بوو فەرمووی: هەڵسە وا حەزرەتی پیر خواردنێکی تایبەتی بۆ ناردووی، منیش چوومە ژوورەکەی ملا عبداللهی کاتب سەیرم کرد ئاوی فڕوجە، بێگومانم کە مقوییەو بە سود و کەڵکە.

**ك ٤٠٨:** جارێکی تر حەزم لە برنج کرد لە کاتی قاوەڵتیدا چونکە نیوڕۆیان ئاووگۆشتیان دابەش ئەکرد، لە دوای کەمێ حەزرەتی پیر خواردنی بۆ ناردین بە یەکێ لە کارگوزارانی خانەقادا، وە خۆراکەکە برنج بوو وە پێی ووتین: حەزرەتی پیر لە بەشە خواردنی خۆی ئەم طەعامەی بۆ ئێوە ناردوە.

**ك ٤٠٩:** کۆمەڵێ لە دەسەڵاتدارو ساماندارانی وولەژێر گێڕایانەوە ووتیان:

ئێستا هەموومان لە خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین‌دا بووین فەرمووی: باخێکم دروست کرد چەند درەختێکی تیا بوو کوللەیەکی زۆر هێرشی هێنا لە باخ و بێستان و شینابییەکەی خوارد، کوللەیەکیان هات و لە نزیکمەوە وەستا، یا فەرمووی کوللەیەك هات و لە سەر دەستم ڕاوەستا پێم ووت: باخچەکەم ساوایە و درەختەکانی لاوازن حەز ناکەم ئێوە لە ناویا بێن و بچن.

فـەرمووی : لـە دوای ڕۆشـتنی ئـەو کولەیـە هـەموویان کۆچـیان کـرد و تاقـە دانەیەکی لێ نەما سوپاس و شوکر و سەنا بۆ خوای پەروەردگار.

**ك ٤١٠:** خوا لێخۆشبوو حاجی سلیمی پێنجوێنی دوکاندار کە پیـاوێکی چـاك و ڕاست و خواناس بوو گێڕایەوە ووتی:

چووم بۆ دووڕووە و چەن ڕۆژێ لەوێ مامەوە ئۆتۆمبیلێ هات حاجی عبداللهی کـوڕی ابـراهیم ئاغـای بانـەیی بـوو هـەر دووکمـان بـە بینـینی یـەکتر شـادمان بـووین پرسیارم لێ کرد لە کوێوە هاتووی؟ ووتی لە تاران و تـەورێز بـووم سـەرم لـە هـەموو پزیشك و دکتۆرەکان داوە ئەڵێن چارەت نیە بۆ ئەم هەناسە توندی و تەنگـە نەفەسـییە خـواردن و خواردنـەوەم بـۆ نەئـەخورا، لـە پاشـا دکتـۆرێکی باشـیان بـۆ هەڵـدام لـە هەمەدان چـووم بـۆ لای ئـەویش وەڵامەکـەی هـەروەك ئـەوان بـوو، ئـەمجار لـە دوای ئەوەی کە دەستم لە خۆم و ژیانم شت و مردنم نزیك بۆتەوە هاتمە خزمـەت حـەزرەتی شێخ محمد عثمان سراج الدین تا بە چاوپێکەوتن و بـە خزمـەت گـەیشتنی شـەرەفدار ببم و کۆمەکی و هیممـەتم بـۆ بکـات و بمپـارێزێ لـە داوو تەڵەکـەی شـەیتان لـە کـاتی سەرە مەرگدا.

ئەمجار ووتی: ناتوانم هیچ بخۆم و بخۆمەوە بە چەشـنێ نـاتوانم قـومێ ئـاو بخۆمـەوە ئەی هێنمەوە، زەرفێکی پێ بوو بۆکاتی پێویست ئەگەر چا یان ئاو بخواتەوە، وەکرێـی ئەم سەرە و سەری ئۆتۆمبێلەکەی دابوو. لەگەڵ ئەو هەرە قەرەباڵخی و هاتوو چۆیەدا لە شەوا داوای کرد کە بە خزمەت حەزرەتی پیر بگات و بڕوات.

کاتێ ئەو زاتە پڕ بەرەکاتە تەشریفی هێنـا حـاجی عبـدالله بـە خزمـەتی گـەیشت وە باسی ناساخییەکەی بۆ کرد، حەزرەتی پیر دڵخۆشی ئەدایەوە و پێی ئەفـەرموو مەترسـە ان شاء الله چاك ئەبی ئەمجار بە سەر هـاتی پیـاوێکی بـۆ گێڕایـەوە کـە دەسـتی لـە ژیـان شتبوو، وە بۆ ئەوەی لەدەست ئەم ژیانە ڕزگاری بێ و بمرێ ژەهری خواردبووەوە و خوا بۆی کرد بە مایەی چاك بوونەوەو شیفا بۆی، لە پاشا فەرمانیدا ئەوزاتە نووڕینە

که دەرمانێکی بۆ بگرنەوە و خواردییەوەو لە بەیانی ئەو شەوەدا داوای ماستی کرد و خواردی و نەڕشایەوە وە وەکو جاران وە بە دڵخۆشی و فەرەحی گەڕایەوە بۆ ناو کەس و کاری.

لە دوای ماوەیە لە شاری سولەیمانی یەکێکی خەڵکی بانەم دی و پرسیارم لێ کرد لە بارەی ئەوەوە، لە وەڵاما ووتی: کە بوو بە هۆی چاك بوونەوەو ڕزگار کردنم لەو ناساخییە.

**ك ٤١١:** لە جەنابی مامۆستا ملا شێخ عمری شەمێرانیم بیست بۆی گێڕامەوە ووتی: لە بەغا لەخزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین بووم لە کاتێکدا کە حەزرەتی شێخی مەرحوم شا علاء الدین لە حاڵی حەیاتا بوو، چەند نور و فیوضاتێکم دی وەکو داوی دەزوو وابوو لە ناو زەمیلەیەکدا ووتم ئەمە چییە؟ ووتیان ئەمە ئەنوار و ڕووناکی حەزرەتی رسول اللەیە (صلی اللە علیە وسلم) ووتم ئەم ئەنوار و ڕەحمەتە لە کوێوە هات لەگەڵ ئەوەی ئەم هەموو بێ ئەمری و بێ شەرعییە کە لە بەغایە ووتیان بەو ڕێگەدا هاتووە کە حەزرەتی شا محمد عثمانی پێدا هاتووە.

**ك ٤١٢:** جەنابی مامۆستا ملا مەحموودی سیاناو ووتی : کاتێ ئەم خوێند فەقێ بووم جەنابی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین تەشریفی هێنا بۆ حوجرەی فەقێکان شەوێکیان منیش بەپێوە ڕاوەستابووم داوای بەرەکەتم لێ کرد و چاوەڕوانی مەرحەمەتی بووم لەو کاتەدا ئەو حەزرەتە بە چەقۆ خەریکی داری بوو ئەیتاشی، هەستم کرد کە خەریکی تاشین و دەستکاری دڵمە، دوو کەس لەو کاتەدا لەوێ دانیشتبوون گاڵتەیەن بە من ئەهات و منیان بە لاوە زۆر بێ ئاگا و بێ خەبەر بوو، منیش سوپاس بۆ خوا ئەوەم ئەمبینی کە ئەمبینی.

ك ٤١٣: وه هەروەها له حمه خانی کوڕی محمود خانی کانیسانانم[1] بیست بۆی گێرامـەوه ووتی : لەگـەڵ طـاوس خـانم لـه ژووری حـەرەم دوو بـه دوو پێکـەوه گفتوگۆمان ئەکرد و باسی ئەولاد هاته پێشەوه ووتمان ئەگەر خوا کوڕێکی نێرینەی پێ بەخشین ناوی بنێین چی؟ من ووتم ناوی ئەنێین خەزانی زیندەگانی ئەویش لەبەر نەزانی خۆی ووتی ئەم ناوه بۆ ئافرەت ئەبێ ناوی نانێین بەو چەشنه بەڵام پرسوڕا ئەکـەین بـه حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین بـۆ ناوەکـەی، مـنیش پـێم ووت ئـاخر ئـەو بـه ناوه قەدیمەکان ناوی ئەنێ، له پاش ماوەیەك نوسـراوێ لـه حـەزرەتی پـیرەوه هـات بـۆ ملا محمد امینی کانی سانان لـه لایەکیـەوه نـوسی بـووی سـلاو لـه حمـه خـانی بـەڕێز و عالی قەدر ئەکەم پرسیاری لێ بکه بزانه ناوی کوڕکەیان دیاری کردوه یـان نـا؟ ووتی : کـاتێ مامۆسـتا پرسـیاری لـێ کـردم سـەرم سـوڕما لـەم قسـەیە! بـەڵام دوایی بـیرم کەوتەوه که ئەم زاته مەبەسـتی قسـەکەی ئـەو شـەوەی ئێمەیـە کـە لـە ژووری حـەرەم ووتراوه[2].

ك ٤١٤: وه لـه جـەنابی حمـه علـی بـەگم بیسـت بـۆی گێرامـەوه فـەرمووی : حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین تەشریفی موبارەکیان هێنا بـۆ دێـی بەرقـەڵا کـه لـەو کاتـەدا تەمـەنی موبـارەکی نزیکـی بیسـت و پێـنج سـاڵ ئـەبوو، وه خـاڵم مـەتاره یەکی[3] ئاو له ملیا بوو حەزرەتی پیر پێی فـەرموو تـۆزێ ئـاوم لـەو مەتارەیـەی خـۆت بـدەرێ، کـاتێ سـەری مەتارەکـەی کـردەوه دەنگێکـی لـێ بـەرز بـوەوه هـەمومانی دا

(١) ئەم حەمه خانی محمود خانی کانیسانانه بەگزادەی حەیدەر بەگییه له مەریوان.

(٢) چەند کەراماتێکی تریشی بۆ گێرامەوه که له یادم نەماوه.

(٣) مەتاره: بۆ کاتی بێ ئاوی و شوێنی تەنگانه و زەیقەت و دەشـت و دەر بـەکار ئەهێنرێ کـه بـه عەرەبی پێی ئەووترێ مطرة یان مطارة، وه بـەکارهێنانی ئـەم مەتارەیـه لـه کاتێکـا بـوو کـه هێشـتا تەرمۆس دانەهاتبوو.

لەرزاند تەنیا حەزرەتی شێخ نەبێ باکی پێی نەبوو، وە مەتارەکە وورد و خاش بوو زەردەیەکی کرد و فەرمووی هیچی تیا بوو؟ ووتی بەڵی فەرمووی مەتارەیەکی ترت بۆ ئەکڕم لە جیاتی ئەو مەتارەیە چونکە ئەمە حەرام بوو ئێمە ئەی زانین!!!

**ك ٤١٥:** جارێ لە خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین‌دا بووم کۆمەڵێ هاتن بۆ زیارەت کە لەوانە حمە خانی ئەحمەداوا و محمود خانی تۆچخان و والی خانی برای رشید خان. والی خان و رشید خان دوو گەنجی پێکەوتە بوون داوایان لە حەزرەتی پیر کرد کە هیممەتێکیان بۆ بکات و کۆمەکییەکیان پێ بکات و دڵیان پێی خۆشبێ، حەزرەتی پیر فەرمووی: ئەمشەو من ئەچمە خەتمەوە کاتێ تەشریفی هێنا بۆ خەتمە بەلای والی خاندا ڕۆیشت و لە بەر دەمیا دانیشت دوای کەمێ والی خان هەستا و ووتی: ئای بەخوا کوشتمی چوە سەربانی خانەقا هەر ئەهاتو ئەچوو نەیشی ئەتوانی قسە لەگەڵ کەس بکات تا یەکێکیان ناردە خزمەتی ئەو قطبی وەقتە و عەرزیان کرد، تەشریفیان هێنا و دەستی گرت و توزێ بە دیارییەوە وەستا و ئەمجا تەشریفیان بردەوە وە ئەمیش لە ژوورەکەیاندا مایەوە تا بەیانی و لەگەڵ کەسا نەئەدوا، لە بەیانیدا لێم بیست ئەیوت شوێنی ئازار و ئێشەکەم ئێستا ئەسووتێ.

**ك ٤١٦:** جارێکی تر لە خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین‌دا بووم یەکێ لە ئاغاکان بە ناوی عبدالله بەگ و براکەی لە خزمەتیا بوون، کە ئەو برایەی خەریکبوو تێك ئەچوو هێنابووی بۆ حەوانەوە و گەڕان وە یەکێك لە مامەکانی کە ناوی حمە بەگ بوو، لەگەڵیا بوو، کە گەنجێکی ڕەزا شیرین و شێوە جوان و پێکەوتوو بوو، هاتنە خانەقا و نوێژیان کرد بە جەماعەت و کاتێ زانییان کەس نەچوە دەرەوە ئەوانیش دانیشتن و دوای کەمێ خەتمە دەستی پێکرد وە حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین تەشریفی هێنا بەلای حمە بەگدا تێ پەڕی و دەستێکی هێنا بە

سەریا و هیچ ڕانەوەستا لەلایەوە، دوای ئەوەی چەند هەنگاوێ دوور کەوتەوە لێی، حمە بەگ دەستی کرد بە هاوار و گریان و صەیحە وە نزیکی سێ سەعات ئەو حاڵەتەی دەوامی کرد ئەمجار لە شوێنەکەی خۆیدا کەوت و جووڵەی نەکرد، لە شەوی داهاتوودا هەر بەو چەشنەی بەسەر هاتەوە، بۆ بەیانی ئەم شەوی دووەمە داوای تمسکی کرد لە حەزرەتی پیر وە ئەو زاتەش فەرمووی: ئێستا ناتوانێ طریقەت وەربگرێ بەڵام لە دوای هەر نوێژێکی فەرز با ١٠٠ استغفرالله بخوێنێ.

**ك ٤١٧:** لە جەنابی (حاجی عبدالرحمن کریم)م بیست بۆی گێڕامەوە وە ئەم کەرامەتە کە بۆ کۆمەڵێ لە خوێندەوار و ڕۆشەنبیرانی ئەگێڕایەوە لە سلێمانی ووتی: حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین داوای نەمامی کردبوو منیش چووم لە بەکرەجۆ لە نزیکی شاری سلێمانی بۆم سەند و بردم بۆ ماڵی حاجی عبدالرحمن حەڵواچی بۆ هەڵەبجە ئەو شەوە لەوێ میوان بووم بۆ ئەوەی بەیانی ڕەوانەی بکەم بۆ خزمەت حەزرەتی پیر بۆ دووڕووە، شەوێ کە هەستام دەزنوێژ تازە بکەمەوە حەزرەتی شاهی عثمانم بینی لە لای نەمامەکان بوو پێی ووتم: ئەگەر ئەم نەمامانە نەخەیتە ئاوەوە ڕەگەکانی ووشك ئەبێ منیش لەسەر فەرموودەکەی نەمامەکانم خستە حەوزەکەی ئەو حەوشەیەوە.

ئەمجار ووتی: حەزرەتی پیر ئاوا ئاگاداری نەمامەکان ئەکا بۆ ئەوەی ووشك نەبێ بەڵام بە نیسبەت ئینسانەوە کە هیچ مهم نیە ئەی چۆن ئاگای لێمان نابێ کە ئێمە مریدی ئەوین انشاء الله تعالی. بێگومان چاودێری و ئاگاداری هەموو مریدەکانی ئەکات وە یارمەتی و کۆمەکی هەموان ئەکات و ئەیان پارێزێ لە هەر شوێنێ وە لە هەر لایەك بن شوکر و سوپاس بۆ خوای پەروەردگار.

**ك ٤١٨:** وه هەروەها ملا شێخ محمدی حسینی مدرس له مزگەوتی حاجی کریم ووتی: کاتێ له زیارەتی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین بووم له دووڕووه منالێکیان هێنایه خزمەتی تەمەنی (١٠) ده سالان ئەبوو لاڵ بوو نەی ئەتوانی قسه بکات.

حەزرەتی پیر شاهی سراج الدین لێی پرسی ناووت چییه؟

هیچ وەلامی نەدایەوه، ئەمجاره لێی پرسییەوه ناووت چییه؟

دووباره هیچ وەلامی نەدایەوه، ئەمجا حەزرەتی پیر ڕووی موبارەکی سور هەڵگەڕا به دەنگێکی نزم فەرمووی یا رسول الله بەرزی کردەوه و دایەوه به زەویدا و لێی پرسی ناووت چییه؟ ووتی ناوم محمده به قوربانت بم، وه خوا شیفای بۆ نارد و ئیتر دەستی کرد به قسه کردن سوپاس بۆ خوای پەروەردگار، هەزاران دروود و سلاو بۆ ڕۆحی پاکی پێغەمبەری نازدار و ئال و یارانی.

لاڵی زگماك ناوی دێی پڕ شۆری عەشقی بێته گوێ
دێته گوفتاری ڕەوان، نەك وەك زمان فێربووی له نوێ[(١)]

**ك ٤١٩:** ساڵێك چووم بۆ خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین وه هەر جارێ بچوومایه بۆ خزمەتی دوای پێنج ڕۆژ یا زیاتر داوای ئیجازەم ئەکرد له بەر وەزیفەکەم نەبا تووشی شتێ ببم لەو دواکەوتنه ئەویش ئەمجاره که داوای ئیجازەم کرد فەرمووی من کەفیلی ئەوم با بمێنێ نەڕوا نەی ئەهێشت بگەڕێمەوه و ماوەی مانەوەکەم ئەگەیشته مانگ و زیاتر.

جاری دووەم داوای ئیجازەم کرد که ماوەی نزیکی بیست و چوار ڕۆژ مابوومەوه بڕیاری نەفەرموو به گەڕانەوەم نوسراوێ له پێنجوێنەوه هات که تیایا

---

(١) ولو سمع البكم اسم حي بها الهوى لعاد فصيحاً بادياً بالحكاية

بەیان کرابوو چونکە تۆ لە مەریوان ماویتەوە مەعاشەکەت دوا کەوتوە و ئاگاداری میری کرا وە بەم بۆنەیەوە، منیش بە هۆی میرزا صادقی بانەیی [1] نامەیەکم ناردە خزمەتی، نامەکەی دڕاند و پێی فەرمو: ئەم نامەیە درۆیە و ئەسڵی نیە خۆم زامنی مەعاشەکەی ئەوم.

وە لە جاری سێیەمدا نزیکی سێ مانگ مامەوە هەموو جارێ دڵی خۆش ئەکردم وە ئەیفەرموو پێم مەترسە هیچ نیە لە بەرەکەتی ئەو زاتەوە پارێزراو بووم هەموو جارێ سوپاس بۆ خوای پەروەردگار و درود و سلاوی بێ پایان بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار و ئال و یارانی.

---

(١) جەنابی کاکە علی ناوێ لە سلێمانی گێڕایەوە ووتی: میرزا صادق بانەیی ڕەحمەتی خوای لێبێ کە مریدێکی زۆر صادق و دڵسۆز و پیرۆز و ڕاست و دروست بوو لە خزمەت شا عثمان گیاندا سەرەڕای ئەمانە پیاوێکی دنیا نەویستی گوێ بە هیچ نەدەری ئەهلی جەزبە و شۆر بوو، لە کاتی سۆز و شیعر خوێندنەوەدا ڕاستی ناو دڵ و دەروونی پاکی گەرمی و لەزەتێکی ئەبەخشی بەو هەڵبەست و شیعرانە کە سەماحەتی پیری دەستگیر چەند بەکرەیەکی لێ گرتبوەوە کە بە گوێ لێ بوونی فەرەحی بە دڵ ئەبەخشی ئەم پیاوە خاسە کوڕێکی هەبوو ناوی حسن داخوازی کچی پیاوێکمان بۆ کرد هەر لە سلێمانی ناوی نەسرین باوکی کیژەکە تووڕە بوو بوو کە کچی من لە ڕیزی کوڕی تۆدا نیە، میرزا صادق ڕەحمەتی خوای لێ بێ خۆی گەیاندە خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین وە مەبەستەکەی عەرز کرد فەرمووی نامەیەکت بۆ ئەنوسم، نوسراوێکی لە حەزرەتی پیرەوە هێنا بۆ باوکی کچەکە، باوکی زیاتر تووڕە بوو لە وەلاما ووتبووی جارێکی تر باسی ئەو شتە مەکەنەوە بەلام حەزرەتی پیر فەرموبووی بۆ یەکتر ئەبن، لە پاش ماوەی شەش ساڵ هاتوچۆ و خوازبێنی دڵی نەرم بوو ئەو کچەی پێ بەخشی ئێستا هاوسەری یەکترن وە خوای تاکو تەنیا بە هیممەتی بزورگان چەند منالێکی پێ بەخشیون. مەریوان، میران، شیلان، ڤیان ...

**ك ٤٢٠:** جاریٚ ملا محمد ئەمینی کانی سانان بۆی گێڕامەوە ووتی:

هات بە خەیاڵما لە یەکێ لە زیارەتەکانی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین لە دوورووە کە نەخۆشەکان و ئەوانەی توشی جۆرەها دەرد و درم بوون ئەخۆن و ئەخۆنەوە لێرە ئەترسیٚ لەوەی لەوانەوە پیاو تووشی نەخۆشی و ناساخی بیٚ کە ئێمەش ئەو قاپ و کەلو پەلانە بە کار ئەهێنین لە خواردن و خواردنەوەدا وە ئەمەش یەکەم جارە کە خەتەرەی وا بێت بە خەیاڵما.

کاتیٚ چوومە خزمەتی کاتیٚ دەرگاکەم کردەوە بینیم تەشریفیان دانیشتوە سەیری کردم و بە زەردەیەکەوە فەرمووی ماموٚستا لێرە کەس تووشی ناساخی نابیٚ لە یەکترەوە، فەرمایشتی ئەو زاتە ئەو خەتەرە و خەیاڵەی لە دڵا نەهێشتم وە بە دڵێکی پیٚ خەم بە دڵنیایی گەڕامەوە بیٚ ئەوەی لە دڵما بمێنیٚ سوپاس بوٚ خوای پەروەردگار و درود و سڵاو بۆ گیانی پاکی چاکترین بەندەگانی خوا و ئال و یارانی.

**ك ٤٢١:** دووبارە ملا شێخ محمدی حسینی بۆی گێڕامەوە:

ماوەیەك لە دوورووە پیاویٚ لەویٚ بوو خەڵکی بانی بیٚ[1] ماوەیەك لەویٚ مایەوە بە چەشنیٚ کە حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین ئیجازەی نەئەدا لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر جار داوای ڕۆیشتنەوەی ئەکرد، بە شێوەیەك کە بلاوی کردەوە لە ناو خەڵکا کە گوایا حەزرەتی شێخ تەنها منی بۆ ئیشو کار لێرە هێشتۆتەوە بۆ کار و باری خۆی کە بەو قسەیە دڵی چەندەها کەسی ساردی پیٚ ئەبەخشی.

داوای لە من کرد کە لە خزمەت حەزرەتی شێخای بۆی بپاڕێمەوە و تکای ئیجازەی بۆ بکەم کە بگەڕێتەوە فەرمووی: بەڵیٚ ئیجازەی ئەدەم کاتیٚ کە شێخ طاهری شێخ محمدی خۆراسانی[2] هات منیش عەرزیم کرد بەڵکوو شێخ طاهیر

(١) بانی بیٚ: دێیەکە لە قەزای دەربەندیخان سەر بە پارێزگاری سلێمانی.

(٢) شێخ طاهری شێخ محمدی خۆراسانی: زانایەکی موبارەکە کە شوێنەکەی لە بانی بییەوە نزیکە.

نەهات فەرمووی: بەم زوانە دێت، حەفتەیەکی نەخایاند ئەم زانا بەڕێزە گەیشت، حەزرەتی پیر هەردوکیانی لەگەڵ منا کۆ کردەوە و ڕوی فەرمووە شێخ طاهیر و فەرمووی: کاتێ گەڕانەوە نیکاحی ئەم پیاوە تازە بکەرەوە چونکە تفەنگێکی دزیوە وە ئێستا وا لە عەماری ماڵەوەیاندا شاردویەتەوە پیاوەکە دانی نا بە ڕاستیدا و زۆر گریا و خۆیدا بە سەر کەوشەکانی حەزرەتی پیردا و بە دڵ پەشیمان بوەوە و تۆبەی کرد خوا حاڵی ئەویش و ئێمەش چاك بکا بە جاهی حەزرەتی رسول الله و ئال و یارانی.

**ك ٤٢٢:** جەنابی بەڕێز و خۆشەویست مامۆستا ملا شێخ خالیدی مفتی[١] بۆی گێڕامەوە فەرمووی: لە دوای وەفات و کۆچی دوایی حەزرەتی شا علاء الدین خوالێی خۆشنوود بێ، جەنابی خاوەن وەقرو ئەدەب و سیما زانای پایە بەرز و خاون مایە تەشریفی شێخ عبدالقادری داغستانی تورکمان سەحرا کە سەرۆکی زانایانی تورکمان سەحرایە تەشریفیان هێنا بۆ خزمەتی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین بۆ زیارەت وە چەند زانایەکی ئەو ناوچەیەشی لە خزمەتا بوو، چەن ڕۆژێ تەشریفی لە هەڵەبجە مایەوە، وە ئێمەی کۆمەڵێ مەلا و زانای ئەو ناوچەیە ئەو چەند ڕۆژەمان زۆر بە خۆشی لێ بەسەر چوو لە خزمەتیا. کاتێ ئوتومبێلیان هێنا و بۆ تەشریف و کۆمەڵێکی زۆر لە خزمەتیا بۆ خواحافیزی ماینەوە زۆر زویر و دڵگران بووم بۆ تەشریف بردنیان، وە لەو کاتەدا من عەقیدە و باوەڕم زۆر پتەوو دامەزراو نەبوو بە حەزرەتی پیر (قدس سره) لە دڵی خۆما ووتم تۆ بڵێی ئەم زاتە بزورگە کە حەزرەتی شێخە دارای پلە و پایەی زۆر بێ کە زاتی ئاوا گەورە و بەڕێز ئەچێت بۆ زیارەت بۆ خزمەتی، لە کاتی ئەم خەیاڵەمدا:

---

(١) ئیمام و مدرس و خطیبی مزگەوتی گەورە بوو لە هەلەبجە، وە سەرخەتمەی خانقا لە هەلەبجە، برای خوالێ خۆشبوو جەنابی مامۆستا شێخ جمیل بوو، وە برای زانای فاضل جەنابی شێخ نورالدین.

تەشریفی سەری موبارەکی لە پەنجەرەی ئوتومبێلەکەوە دەرهێنا کاتێ بینیمی بانگی کردم فەرمووی شێخ خالید وەرە!! کاتێ چوومە خزمەتی چپاندی بە گوێما فەرمووی: وەاللە وە باللە حەزرەتی شێخ عثمان شێخە وە هیچ شکێ لە شێخییەتی ئەودا نیە وە هەر کەسێ خۆی تەسلیم بکا و تمسك لە سەر دەستی ئەودا بکا سەر کەوتوە بێگومان[1].

وە فەرمایشتەکەی بە عەرەبی فەرموو چونکە خۆی تورکمانی[2] بوو، وە ئیتر بڕوای دامەزراوم پەیدا کرد بەم زاتە عظیمە کە حەزرەتی شا محمد عثمان وە بۆیشم دەرکەوت کە ئەم عالمە پیرۆزە بەشێکی گەورەی هەیە لەم عیلمی ئەسرار و تصوفە وە ئەهلی دەرك و نیسبەتە، بە کەشف بە حەزەکەی دڵی منی زانی شوکرانە بۆ خوای پەروەردگار و درود و سلاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار و ئال و یارانی.

**ك ٤٢٣:** لە (حاجی عبدالرحمن)م بیست لە سلێمانی بۆی گێڕامەوە ووتی:

هەموومان دەعوەت بووین لە ماڵی یەکێ لە ئەحباب، لەوێ حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدینم بینی تەشریفی هێنا مجذوب بووم و دەوامی کرد و نەکوژایەوە و بەردەوام بوو تا لە و ماڵە هاتینەوە، وە دووبارە بینیمەوە لە لای دەرگاکەوە تەشریفی وەستا بوو ئەوەندەی تر گڕو کلّپەی سەند بە دەوری خۆیا گێڕامی تا بێخود بووم و لە هۆش خۆم چووم وە برادەرەکانم بە دەورمەوە بوون تا بێدار بوومەوە هەموومان ئەوسا هاتینە دەرەوە ڕۆیشتین هەریەك بۆ ماڵی خۆمان.

---

(١) تورکمان سەحرا: ناوچەیەکە لە سەر سنوری ڕوسیا سەر بە ولاّتی ئێرانە.

(٢) ئەمەش فەرموودەکەیەتی بە عەرەبی (واللە وباللە ان الشیخ عثمان شیخ لا شك في مشیختە و من تمسك بە فقد نجح).

شوکر و سوپاس بۆ خوای پەروەردگار و سوپاس کە سنور و کۆتایی نەبێ و نیەتی وە درود و سلاو بۆ گیانی پاکی پیغەمبەری نازدار (صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی.

**ك ٤٢٤:** دوای ئەوەی کە حاجی عبدالرحمن ئەوەی بۆ گێرامەوە لە ڕێگەی سلوك و ترس لە دواڕۆژ ووتی: حاڵی زۆر سەیرم دیوە و بەلاّم خۆیان لێ شاردومەوە و ئێستا نەم ماوە بە چەشنێ کە لە ئیمانەکەی خۆم ئەترسم. ئەمجار ووتی: لە جەزبەدا بە سەرهاتی سەیر سەیرم ئەدی لەوانە:

لە بیارەی شەریف جەزبە زۆری بۆ هێنام لە کاتێکا کە شەیتان خەریك بوو دەورەی صۆفی محمد امینی خادمی ئەدات کە لە گیان کێشاندا بوو، بینیم کە شەیتانی علیه اللعنه خۆی لێ نزیك کردبوەوە کە گومراهی بکات لەو کاتە سەختەدا حەزرەتی شا محمد عثمانم بینی کە دەری کرد ئەو نەفرین لێ کراوەی مەلعونە، وە صۆفی حمە امینی لە فێلّ و تەلّەکەبازی ئەو گومڕایە ڕزگار کرد، وە خوا ئەو جارە شیفای بۆ نارد. وە کاتێ جەزبە کە بەرەو کەمی ڕۆشت و ئاسمانی ڕونم بۆ دەرکەوت ئەوسا دەرگای گفتوگۆ کرایەوە لەگەلّیا فەرمووی: ئێستا لە خەوا شتێکی سەیرم بینی و باسی کرد، بەلاّم هەر ئەوەی باسکرد کە من لە کاتی جەزبەکەدا دیبووم یا لەوەوە نزیك بوو ئەمجا لە دوای یانزە ڕۆژ بە ڕحمەتی خوا چوو، بەلاّم ئەوەندە هەیە لە کاتێکا کە لە جەزبەکەمدا ئەمبینی نەخۆشە و لە گیان کێشان دایە نەخۆش نەبوو هەرگیز.

**ك ٤٢٥:** جارێکی تر لێم بیست گێڕایەوە ووتی :

جارێکیان لە جەزبەدا بینیم کە حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین زنجیرێکی دامێ وە شەیتانم پێ بەستەوە لە بەری پێیەوە تا سەری لە دواییدا دوو گولّمێخی دامێ دامکوتا هەر دوکیان بە سەریا.

**ك ٤٢٦:** جارێکی تر بۆی گێڕامەوە ووتی: جارێکی تر نەخۆشیٚ هاتە ماڵمان بۆ ئەوەی لەگەڵیا بچم بۆ لای پزیشك چونکە تووشی نەخۆشی سیل بوبو، تووشی جەزبە بووم بە نەخۆشییەکەی ئەوەوە لە سنگیەوە تا بەری پێی، لە ژێر پێیدا برینێك پەیدا بو، تا ئێستاش ئەو بەم حاڵەی نەزانیوە، شوکر و سوپاس بۆ خوای پەروەردگار و هەزاران درود و سلاو بۆ گیانی پێغەمبەری نازدار (صلى الله عليه وسلم) و ئال و یارانی.

**ك ٤٢٧:** لە جەنابی کاکە سید محمدی سجادی کوڕی سید ئەحمەدی وەلیم بیست کە فەرمووی:

باوکم ئەیگێڕایەوە ئەیفەرموو کاتیٚ چووم بۆ حیجاز بۆ بەجیٚ هێنانی فەرزی حەج ڕۆژیٚ پێویستیم بە خۆشتن بوو، کاتیٚ چووم و خۆم شۆرد هاتمە دەرەوە کە بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە ڕێم لیٚ وون بوو تۆزیٚ کەوتمە بیر کردنەوە ئەمجا هات بە یادما کەوتمە داوای ئیستیمداد و کۆمەکی لە باوکی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدين و بەلام حەزرەتی شا محمد عثمان هەر خۆی تەشریفی هێنا لەسەر کۆلانەکەوە لەو پەڕی گەڕەکەکە خۆی نیشاندام وە بە چاکی موبارەکی ئیشارەی فەرموو وەرە، منیش چووم بە دوایا تا گەیاندمیەوە ماڵەکەی خۆمان، کاتیٚ گەڕامەوە بۆ شار و ولاتی خۆمان ئەم باسەم هەر لە یاد نەمابوو، ساڵێکیان بۆ کاریٚ عەرزیم کرد کە زۆر خەریك بوو پێوەی، عەرزیم کرد بۆچی ئەوەندە خۆت ماندوو ئەکەیت بەم ئیشەوە؟ ئەو زاتە پڕ سەماحەتەش فەرمووی من ماندوو ئەبم بەم کارەوە بەلام ماندوو نابم بەوەی لە مەکە ڕێگە نیشان یەکیٚ بدەم کە وون بوویٚ منیش بیرم هاتەوە لەو کاتەدا کە مەبەستی پیرۆزیان چییە! سوپاس بۆ خوای پەروەردگار وە مانای ئەو فەرموودەیە ئەوەیە خوا ئاگادارە کە من ماندوو نابم بەوەی کە یەکیٚ وون بویٚ بیخەمەوە سەر ڕیٚ ئەی چۆن بەم ئیشە بچووکە ماندوو ئەبم.

**ك ٤٢٨:** له جه‌نابی شێخ محمودی کانی سانانم بیست گێڕایه‌وه فه‌رمووی:

به‌ر له‌وه‌ی تمسك له سه‌ر ده‌ستی حه‌زره‌تی شا محمد عثمان سراج الدین‌دا وه‌ربگرم خۆم له ته‌ماشای ئافره‌تی نامه‌حره‌م بۆ نه‌ئه‌پارێزرا، تا چه‌ند جارێ چوومه خزمه‌تی، ڕۆژێ خه‌ریکی دروومان بووم ئافره‌تێکی نامه‌حره‌م به‌لاما تێپه‌ڕی ویستم بڕوانم بۆی له دڵی خۆما ووتم خۆ من چووم بۆ زیاره‌تی حه‌زره‌تی پیر و کتوپڕ له به‌ینمانا ته‌شریفی وه‌ستا و ئه‌مجار به ته‌واوی ته‌ریق بوومه‌وه.

جارێکی تر له ڕێگه‌ی باخ منیش ئه‌چووم و ئافره‌تێ به‌ره‌و ڕووم ئه‌هات وه‌ختێ نزیك بوه‌وه ویستم بڕوانم بۆی سه‌یرم کرد حه‌زره‌تی پیر ته‌شریفی له به‌ینمانا وه‌ستاوه.

**ك ٤٢٩:** له به‌رواری ٢٣ی ذوالحجه‌ی ساڵی ١٣٨٤[(١)] به خزمه‌ت جه‌نابی ملا رسولی مه‌نعاوی گه‌یشتم فه‌رمووی: ئه‌مساڵیش به دیداری پاکی حه‌زره‌تی رسول الله سید البشر (صلى الله علیه وسلم) گه‌یشتم، پێغه‌مبه‌ر درود و سلاوی خوای لێ بێ فه‌رمووی: عثمان طه‌بیبی دڵه.

**ك ٤٣٠:** له جه‌نابی ملا محمدی ووله‌ژێریم بیست که فه‌رمووی:

نه‌خۆشی سکێشه‌م بوو، یا فه‌رمووی سنگم ئێشی هه‌بوو، عه‌رزی ئه‌و سه‌ماحه‌ته‌م کرد، ئه‌م ئێشه‌م بۆ لابه‌، که سه‌یرم کرد بینیم چه‌ند شتێکی ووردی سپی چوه شوێنی ئازاره‌که ئیتر ئێشه‌که نه‌ما، سوپاس بۆ خوا.

**ك ٤٣١:** له جه‌نابی حاجی شێخ عثمانی سیرێییم بیست فه‌رمووی:

له ناوچه‌ی خۆمان له دێی سیرێ وام ئه‌زانی چاوه‌ڕوانی هه‌ڵاتنی خۆر ئه‌که‌م، کاتێ ڕۆژ هه‌ڵات به سه‌ر شاخه‌که‌وه، له جیاتی خۆر بینیم که حه‌زره‌تی شا محمد عثمان سراج الدین بوو هه‌ڵهات، به‌ڵێ ڕاسته ئه‌مه سراجی دین و ئه‌ویش سراجی دنیا.

---

(١) ئێستا ١٨ی ره‌جه‌بی ساڵی ١٤٠٢ له هیجره‌ت و کۆچی رسول الله (صلى الله علیه وسلم).

ك ٤٣٢: وه لە جەنابى مامۆستا ملا شێخ خالیدی مفتی کە ئیمام و خطیب و مدرسی مزگەوتی گەورەی هەڵەبجەیە بیستم فەرمووی:

لە خەوما وام ئەزانی کە لە خەتمەدا بووین وە جەنابی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین تەشریفی حازر بوو، حەزرەتی عمری کوڕی خطاب ﷺ تەشریفی حازر بوو فەرمووی ئەم شێخ عثمانە مرشدە هەر کەسێ کۆمەکی پێ بکات کۆمەکی پێ ئەکەم.

ك ٤٣٣: جەنابی خوالێ خۆشبوو حاجی سعیدی خفاف[1] گێڕایەوە فەرمووی:

لە ساڵی (٦٣) تووشی ناڕەحەتییەکی بە ئازار بووین، لە دوای ماوەیەك کە چووم بۆ زیارەتی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین پرسیاری لێ کردم لە دووڕووە فەرمووی:

حاڵتان چۆن بوو لەو کاتی (منع التجول)ە؟ عەرزی ئەو زاتەم کرد لە سایەی حەزرەتی پیرەوە سەلامەت بووین، لە یادم چوو باسی محفوظی دراوسێکەمان بکەم بە بۆنەی لطفی ئەو حەزرەتەوە کە لەگەڵمانا کردی ئەمجار حەزرەتی پیر فەرمووی: ئێمە وامان زانی کە دراوسێکەتان بەبۆنەی ئێوەوە ئەویش پارێزرا، ئەو فەرمایشتەی هەر نەهاتەوە یادم کە لە مجلسی پیرۆزی هاتمە دەرەوە ئەمجار بیرم کەوتەوە کە حەزرەتی شا عثمان مەبەستی فەرموودەکەیان لەو بەسەرهاتە بوو کە ڕوویدا.

سوپاس و شوکر و سەنا بۆ خوای پاکی بێ هەمتا درود و سلاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار و ئال و یارانی.

---

(١) ئەم پیاوە خەڵکی شاری سلێمانی بوو، مریدێکی خاس و صادق و بەوەفا و بە کەڵك بوو. بیزا بوو کە حەزرەتی پیر پێی فەرموبوو لە نامەیەکا (بە ظاهیر بچوکی بە باطن زۆر گەورە و زل).

**ك ٤٣٤:** له زۆر كەسم بیستوه كه له جەنابی خەلیفه ئەحمەدی بالك و بەڕێز مەلا محمودی سیاناویان بیستوه كه فەرموویانه[1]:

كۆمەڵی ئەولیا بڕیاریان دا له بەینی عەنەب و بیاوێڵه یا فەرموویانه له بەینی هەڵەبجه و بیاوێڵه كه هەردووكیان هەر یەك ئەگرێتەوه، وه سەرۆكەكەیان بڕیاری فەرمووه كه ئەبێ حەزرەتی شا محمد عثمان دابنرێ به مورشید له جێگەی باوكی عەزیز و گەوره قطبی پڕ سایه كۆمەك حەزرەتی شێخ علاء الدین قدس الله سره العزیز دوای كۆچكردنی بۆ ماڵی پڕ ڕێز و كەرامەت بەڵام یەكێ لەوان سێ جار ئەم به سەرهاتەی بینیوەو نیشانی دراوه، جارێكیان بەر له وەفاتی حەزرەتی شێخ علاء الدین قدس الله سره العزیز به حەوت ساڵ، وه جارێكیان به سێ ساڵ یان به پێنج ساڵ، وه دواجار بەر له وەفاتی شێخی مەرحوم به ساڵێ، شوكر بۆ خوا.

**ك ٤٣٥:** جەنابی ملا صالح له صالح خانی سلیمان خانەوه گێڕایەوه ووتی:

كوڕەكەم له تاران لێ وون بوو زۆری بۆ گەڕاین هەر نەمان دۆزییەوه ڕۆژنامه و ڕادیۆ بڵاویان كردەوه سۆراخی نەبوو، هەمووMان به تەمای نەماین چووین بۆ خزمەت حەزرەتی پیر و عەرزمان كرد فەرمووی له شاری عەبادان به دوایا بگەڕێن ئەی دۆزنەوه انشاء الله چووین لەوێ گەڕاین دۆزیمانەوه، حمد و سەنا بۆ خوا درود بۆ گیانی پێغەمبەری نازداری و ئال و یارانی و خوا له حەزرەتی پیرمان وون نەكات و له هەر شوێن بین بماندۆزێتەوه.

**ك ٤٣٦:** له جەنابی (میرزا عبدالوهابی شەفیعی)م بیست فەرمووی:

---

(١) كه ئەم دوو زاته كۆمەڵی دڵ ڕۆشنان هەموو له سەر ئەو بڕوایەن كه هەر دوكیان شك له ویلایەتیانا نیه و پیاوێكی زۆر جێگەی ثقه و بڕوان.

خوشکێکم هەبوو پێی ووتم بمبە بۆ خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین بەڵکو توجهێکم لێ بکات[1]، منیش بردمە خزمەتی عەرزیم کرد، تەشریفی هەڵسا و عەباکەی دا بە سەریا و چوە قەراخی ژوورەکە و خوشکم لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بوو بە هێواشی هەستا و ئەمجار گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی، خوشکم لە پاشا دەستی کرد بە ڕشانەوە و زۆر ڕشایەوە، وە چەند ڕۆژێ بە نەخۆشی مایەوە و ئەمجار بە ڕەحمەتی خوا چوو، وا دیار بوو بەرگری ئەو هەموو هیممەت و کۆمەکییەکەی بۆ نەکرا وەیان خۆی بە ئاواتی خواستبێ، بۆیە کە عەرزیم کرد لە سەرەتاوە کەمێ سستی نواند و داواکەی دواخستم کاتێ عەرزیم کرد بۆ توجە لێ کردنی. سوپاس و شوکر بۆ خوای بێ هاوتا و درود و سلاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار (صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی.

**ك ٤٣٧:** یەکێك بۆی گێرامەوە ئێستا باش ناوەکەیم لە یاد نیە فەرمووی:

کۆمەڵێ لە خەڵکی سەقز لە خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدیندا بوون (قدس سره) خۆیان ئامادە کردبوو بۆ گەڕانەوە بەڵام حەزرەتی پیر وەڵامی نامەکانی تەواو نەکردبوون، پیر فەرمووی بە شۆفێرە کە بڵێن کەمێ بوەستێ تا وەڵامەکانیان تەواو ئەبێ، تۆزێ وەستا و ئەمجار پەلەی کرد و دەستی کرد بە ڕۆیشتن حەزرەتی غەوثی وەقت بە فەقێیانەکەی هێمای فەرموو نەوەستان، ئەمجار کەمێ سەری موبارەکی ڕاوەشاند خێرا ئوتومبێلەکە وەستا تایەیەکی لە کار کەوت، هێشتا بە تەواوی چاکی نەکردبوو کە بە تەواوی نامەکان هەموی وەرگیرایەوە لە خزمەت پیردا.

**ك ٤٣٨:** جەنابی برای عەزیز ملا احمدی کوڕی حاجی ملا صاڵحی گەناوی بۆی گێرامەوە فەرمووی: وام ئەزانی لە خەوما قورئان ئەخوێنم وە بە درێژی باسی بە خزمەت گەیشتنی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدینی کرد، بێ ئەوەی بە

---

(١) ئەو کاتە حەزرەتی پیر لە ماڵی مجتهدی دەعوەت بوو لە شاری کوردستان کە سنەیە.

خزمەتی گەیشتبێ لەوە پێش، وە پرسیاری قورئانی لێ کردوە. ئەمجار پرسی ئەم دێڕە هۆنراوەی لێ کردم کە نەم بیستوە لەوە پێش، کاتێ بە ئاگا هاتم کەوتە بیرم نووسیمەوە.

**ك ٤٣٩:** جەنابی شێخ محمدی کەماڵەیی دارتاش بۆی گێڕامەوە:

کچێکم هەبوو نەخۆش کەوت، وەختی مردنی نزیك بوەوە ئەی ووت: ماڵەکە ڕێکو پێك بکەن و گسکی بدەن ئەوا حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدين تەشریفی لە ناو دەرگاکەدایە و دێتە ژوورەوە، ئەمجار وا دیاربوو پێشوازی و بەخێر هاتنی لە حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدين ئەکرد و لە دنیا دەرچوو خوا لەویش و لە ئێمەش خۆشبێ بە هیممەتی دۆستان[1].

نموونە بۆ ئەم چەشنە کەرامەتە زۆر زۆرە کەمێ ئەنوسین با چاوو دڵ لێی بێتاقەت نەبێ.

سوپاس بۆ خوای پەروەردگار و درود و سلاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار (صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی.

**ك ٤٤٠:** جەنابی زانای بەڕێز ملا صدیقی ئیمامی تورجان لە خوا لێ خۆشبوو حاجی بابە شێخی تورجان ئەیگێڕایەوە بۆم کە جەنابی حاجی بابە شێخ (هەزار و یەك جار ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرمووی کە لە وەڵامی شێخ عزالدین دا: عزالدین هەر کاتێ چوویتە بیارەی شەریف و ماوەیە لەوێ مایتەوە ئەگەر بە پلە و پایەیەکی بەرزی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدين ئاگادار نەبووی وەرە تف بکە لە ڕیشم.

**ك ٤٤١:** جەنابی مامۆستا ملا عبداللەی لاجانی بۆی گێڕامەوە فەرمووی:

---

(١) بەڵێ ڕاستە یەکێ لە سوودە گەورەکانی مرشد حازر بوونیەتی بە دیار سەری مریدی یەوە لە کاتی ماڵ ئاوایی و لە دنیای بێ وەفای فانی دەرچوونی.

له دوای چەند ساڵێ کاتێ گەڕامەوە بۆ لاجان قەزا و قەدەر ئاگر بەربووەوە لە ناو کۆمەڵێ داری سوتاندن، کە بە قەدەر گردێکی بچوك ئەبوو، بۆ سووتەمەنی زستان کۆمەڵ کرابوو، ووشکو برنگ بوو، لە یەك کاتا لە هەموو لایەکەوە ئاگر بەربوەوە ناوی بە مەرجێ کوژانەوەی زۆر ئاسایی نەبوو هیچ چارەسەرێکم نەبینی تەنیا ئەوە نەبێ یا سراج الدین م نووسی و لە سەر پەڕەیەکی بچووك و فڕێم دایە ناو ئاگرەکەوە کە لە کڵپە و بڵێسەدا بوو، کتوپڕ کوژایەوە هەر وەکو نەبووبێ، سوپاس بۆ خوای پەروەردگار و درود و سڵاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار و ئال و یارانی.

**ك ٤٤٢:** جەنابی زانای خاوەن پایە مامۆستا ملا اسماعیلی خطیب گێڕایەوە فەرمووی:

ئەو کاتەی کە حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین تەشریفی موبارەکی لە پێنجوێن بوو لە خەتمەدا چەن شەو لە سەر یەك بروسکە و بەرقیان بینیوە وەکو ئەستێرە بە سەریانا پەخشان بوە، ئەگونجێ بوترێ یا گومانی ئەوە بکرێ کە شتێ خرابێتە سەر بانی ئەو ژووری خەتمەیەوە ئەو تیشکە درەخشانە لە ئاساری ئەوەوە بووبێ، بەڵام کاتێ چوومەوە بۆ ماڵەوە دوای خەتمە پاڵ کەوتم تا وەکو بخەوم دەستم کرد بە خوێندنی أیة الکرسی و امن الرسول بینیم بە سەر سەرما سێ یان چوار لەو تیشکو بەرقە بە سەر سەرما تێ پەڕی.

ئەمجار دڵنیا بووم و جێگیری پەیا کرد کە ئەو بروسکە و تیشکە لە ئاثاری توجهاتی ئەولیاوەیە سوپاس بۆ خوای پەروەردگار و درود و سڵاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار (صلی الله علیه وسلم) و و ئال و یارانی.

**ك ٤٤٣:** دووبارە لە جەنابی مامۆستا ملا عبداللەی لاجانی م بیست فەرمووی:

لـە خزمـەت حـەزرەتی شـا محمـد عثمـان سـراج الـدین دا بـووم لـە سـەفەری قەلاشێخاندا، لـەوێ تـووشی نـەخۆشی بـووم، شـەوێکیان حـەزرەتی پـیری دەسـتگیر سەرێکی لێ دام، لەو کاتەدا دوو بە دوو بەندە لە خزمـەتیا بـووم بـە تـەنیا بـە چـاوی خۆم دیم دوو سەر هاتنە ژوورەوە لە سـەر یـەك مـل بـوون لـە بـەینی دیـوار و بنمیچـا ووتیان گەورەم ئەمر ئەفەرموی بۆ کوێ بڕۆین حەزرەتی پـیر وەلامی دانـەوە فـەرموی بۆ واشنطون ئیتر لە چاو وون بوون.

**ك ٤٤٤:** جەنابی مامۆستا ملا حمەمینی کانی سانان بۆی گێڕامەوە:

داوامـان لـە حـەزرەتی شـا محمـد عثمـان سـراج الـدین (قـدس سـره) کـرد کـە دەربارەمان کۆمەکی و هیممەت بفـەرموێ، ئـەو زاتـە گـەورە و عظیمـە فـەرمووی : مریدان و مەنسوبان کۆشـش و هـەوڵ نـادەن بـۆ کـاری خۆیـان و کـاتی خۆیـان بـە بێ هوودە و بێ سوود بە سەر ئەبەن، بیستومە لێیان کە هەیە ووتویەتی:

ا ـ فلان خۆ هیچـی نـەکرد وە سـەعی لـە طـەریقـەتا زۆر نـەبوو، ئـەوەی دەسـتی کـەوت تـەنیا بـە بۆنـەی توجهـاتی باوکیـەوە بـوو، نەخـەیر، مـن مجاهـدەم کـردوە و هەولێکی زۆرم داوە، ماوەی دوو ساڵ نەم خواردوە و نەم خواردۆتەوە.

ب ـ کاتێ چووم بۆ ناوچەی خـانقین پێـنج مـانگ لـەوێ مامـەوە لـە هـەموو ئـەو ماوەیەدا بە دەزنوێژی عیشاوە نوێژی بەیانیم کردوە.

ج ـ وە لە مانگی رمضـاندا لە یەکەم ڕۆژییەوە هەتا بیستەمینی هیچم نـەخواردوە و نەخواردۆتەوە تەنیا قومێ ئاو نەبێ کە بەربانگم پێ کردۆتەوە. بۆ ئەوەی ڕۆژووەکە بـە یەکتر نەبەسترێ.

د ـ وە مـاوەی سێ مـانگ لـە خزمـەت بـاوکی عـەزیزم دا بـووم لـە بـەغا هـەموو شەوێ تا سەعات شەش دەستم ئەهێنا بە سەر پشتیا تا پێـی موبـارەکی تـا خـەوی لـێ

ئەکەوت، ئەمجار هەڵ ئەستامە سەر پێ و ڕائەوەستام چاوەڕوانی بەرەکەت م لێ ئەکرد.

هەوڵ و مجاهدەی تریشم هەیە نایڵێم کە لەو ماوەیەدا تاقە ڕۆژێ نیە کە من خەریك نەبووبم.

**ك ٤٤٥:** لە جەنابی مامۆستا ملا جەلالی بانەیی کوڕی شێخ الاسلامم بیست بۆی گێڕامەوە فەرمووی: ساڵێکیان حاجی ملا عبدالرحمنی ڕەواندزی تەشریفی هێنا و دوو کوڕی لە خزمەتیا بوو دەفیان پێ بوو جار بە جار لێیان ئەدا.

عەرزیم کرد عەزیزا خۆ تۆ لە خولەفای حەزرەتی ضیاء الدین شێخ عومەری وە حەزرەتی شا علاء الدین کوڕی ئەو زاتەیە، بۆچی جەنابتان زەحمەت ئەکێشن لەم تەمەنەدا، لە وەڵاما فەرمووی: وا مەفەرموو ئەی عەزیزم ملا جلال الدین چونکە بێگومانبە کە حەزرەتی باوکی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین زۆر خاوەن قەدر و خاوەن پلە و مرتبەیەکی عالییە وە زۆر بە مەرحەمەت و لطفە لەگەڵما وە جەنابی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین خۆیشی زاتێکی زۆر خاوەن پایە و گەورە و صاحبی مەرتەبە و مەقامێکی عالییە هەروەها.

**ك ٤٤٦:** وە هەر وەها لە جەنابی ملا حەمەمینی کانی سانانم بیست فەرمووی:

حەزرەتی پیری دەستگیر شا محمد عثمان سراج الدین بۆی گێڕاینەوە فەرمووی: جار جار ئەچووم سەرم ئەدا لە جەنابی ملا شێخ عبدالرحمن ڕەواندزی لە ژوورەکەی خۆیدا هەموو جارێ بەرەکات و واریداتێکی زۆر سەیر و گرنگم چاو پێ ئەکەوت، ڕۆژێ پێم ووت: عەزیزا ئەم هەموو بەرەکات و ئەنوارە کە لە لێرەدا ئەیبینم لە تەئسیری چ ذیکرێکەوەیە لە وەڵاما فەرمووی: ئەوە بە هۆی ویردو ذیکرەوە نیە بەڵکو بە هۆی جەنابی باوکتەوە و لە ژێر سێبەری باوکی عەزیزتەوە و بە بۆنەی سایەی

جەنابتانەوە هەموو ڕۆژێ (١٠) دە جار بە زیارەتی دیداری حەزرەتی رسول الله (صلى الله عليه وسلم) شاد ئەبم ئەم بەرەکات و فیوضاتە لە بۆنەی تەشریف هێنانی جەنابیەوە وە لە بەرەکەتی حضوري ئەوەوەیە (صلى الله عليه وسلم) لێرەدا، وە صلى الله على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه وسلم فى كل يوم عدد ما فى علم الله بدوام ملك الله امين.

**ك ٤٤٧:** وە جەنابی ملا شێخ محمدی باليسانی[1] کوڕی شێخ طه باليسانی بۆی گێڕامەوە ووتی: کاتێ کە حەزرەتی شا علاء الدين قدس الله سره العزيز کە لە سەر دەستی موبارەکیا تمسکم وەرگرتوە، وە بڕوای تەواو و عەقیدەی کاملم نەبو لە خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدين دا لە بەر ئەوە بە دوای بیانوویەکدا ئەگەڕام بۆ ئەوەی لە بیارە بڕۆم و بچم بۆ شوێنێکی تر و لەوێ تدريس بکەم وە لام وابوو لە هەر لایەك تدريس بکەم و دەرس بڵێمەوە ژیانێکی باش و خۆشم ئەبێ، وە لەوە پێش کە قبوڵی هەموو جۆرە ژیانێکی بە ئەرك و کەمو کوڕییەکم کردبێ قەناعەتم پێ کردوە چونکە بە تەمای زانیاری معنوی بووم کە حەزرەتی شا علاء الدين وەفاتی فەرموو ئەو ئاواتەم بڕا چونکە جارێك پرسیارم کرد لە خزمەتیا کە دوای جەنابت کێیە کە بتوانێ ئیرشاد بکات و جێی جەنابت بگرێتەوە، فەرمووی عثمان عەرزیم کرد، ئایا ئەتوانێ ئێستا ئیرشاد بکات؟ لە وەلاما فەرمووی لە ژیانی منا نەخەیر[2] مامۆستا ملا شێخ محمد فەرمووی: چەندین ماوە تێپەڕی بە سەر وەفاتی حەزرەتی شا علاء الدين قدس الله سره العزيز لە خەوا دیم چوومە ژووری محاسنی شريفە هەزاران درود و سلاو لە خاوەنی بێ کە ئەو زورەیە کەسێ قطبی گەورە و عظیمی تیا مدفونە

(١) لە یەکێ لە مزگەوتەکانی بەغدا خطيب و امام و مدرس، کە لەوە بەر مدرسی خانەقای بیارەی شەریف بوو لە دوای مامۆستا ملا عبدالكريمی بیارە (ملا عبدالكريمی مدرس).

(٢) یانی لە دوای من ئەو مرشدە.

که حەزرەتی شێخ ضیاء الدین و حەزرەتی شێخ علاء الدین و حەزرەتی شێخ نجم الدینە قدس الله اسرارهم العلیە، وە بینیم سێ کەس لە لای ئەوسێ مەرقەدە دانیشتبوون یەکێکیان فەرمووی عثمان خەڵك فێری رابیطەی خۆی ئەکا یەکیان فەرمووی ئایا ئەوە باشە یەکیان فەرمووی دوای شەش مانگی تر حەقی هەیە، لەو ماوەیەدا دوودڵی و دانەمەزراوی ڕووی تێکردم بەرامبەر بەم زاتە پڕ شکۆ و پایە دارە، لەو کاتەشدا بەرەو سەفەری بەغا ئەهاتم لە خزمەتیا بە بیانوی نەخۆشی و سەردانی پزیشك و تەداوی و چارەکردنی ناساخییەوە خۆم گل دایەوە لەوێوە نەگەڕامەوە بۆ بیارەی شەریف، وە ماڵ و مناڵەکەشم هێنا لەگەڵ خۆما بۆ ...[1] بۆ ئەو ماوەی شەش مانگە، شەوێکیان خەریکی چەند ویردێ بووم ئەمخوێند و شەوی جومعەش بوو، کاتێ خەوتم هەر ئەو شەوە شەرەفدار بووم بە زیارەتی حەزرەتی فخری کائنات رسول اللهی نازدار علیه من الله أوفر السلام و أفضل الصلوات و أتمه عەرزی ئەو زاتە نورینەم کرد ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دڵم نەخۆشە، فەرموی بڕۆڕەوە بۆ بیارە دڵت چاك ئەبێ وە عثمانیش ئەهلە بۆ ئیرشاد، بۆ بەیانییا دوو فەقێ هاتن نامەیەکیان دامێ کە لە خزمەتی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین (قدس سره)نێردرا بوو، داوای فەرموو بوو بگەڕێمەوە بۆ بیارە.

**ك ٤٤٨:** لە زۆر لەوانەی جێی دڵنیایی و بڕوان بیستومە یەکێ لەوانە موئەذنی بیارەی شەریف بوو کە ئەیگێڕایەوە لە جەنابی زانای پڕ وەقر و وەفا زاتی خاوەن عیلمی شەریعەت و طەریقەت حاجی مەلا عبداللهی پەسوێ لەم زاتە موبارەکە ئەمینەوە ئەی گێڕنەوە: کاتێ ئەم زانا بە ناو بانگە بە خوا ناسی و پاکی و ڕێز و قەدر گەورەیی‌یە لە دوا ساتی ژیانیا تەشریف ئەبا بۆ شاری بانە واڕێ ئەکەوێ لە هەمان کاتا حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین تەشریفی موبارەکی لەوێ ئەبێ، ئەو شەوە ئەو زاتە لە خزمەت حەزرەتی شێخا ئەبێ بۆ بەیانی ئەو شەوە ئەفەرموێ: وام ئەزانی

---

(١) ملا شێخ محمد ناوی شوێنەکەی برد، بەلام شەیتان لە بیری بردمەوە.

ڕەفاقەت و تێکەڵی هیچ کەسێ سوودی بۆ من نیە بەڵام دەرکەوت کە صوحبەت و ڕەفاقەت بە سوودە بۆم چونکە ئیمشەو من سوودم لە حەزرەتی شێخ وەرگرت حەز ئەکەم ئەمشەویش بمێنمەوە لە خزمەتیا، کاتێ ویستی ئۆغر بفەرموێ وولاخیان بۆ هێنا و خەڵکی شاری بانە بۆ ماڵ ئاوایی و خواحافیزی حازر بوون ڕووی تێ کردن فەرمووی: من شهادەتێکم لە لایە وا ئەزانم درۆ ناکەم ئەبینم ئەرواحی ئەولیا بە کۆمەڵ بە دەوری ئەم شێخە عظیمەوەن کە کوڕی حەزرەتی شێخ محمد علاء الدین ە، وە من نیسبەتی حەزرەتی ضیاء الدین لەم زاتەدا زیاتر ئەبینم وەك لە باوکیا کە حەزرەتی شێخ علاء الدین ە وە وا ئەزانم کە ئیتر چاوم پێتان ناکەوێتەوە.

وە ئیتر خواحافیزی لێ کردن لە دوای تەشریف فەرموونەوەی بە چەند مانگێ کۆچی دوایی فەرموو لە دنیا دەرچوو[1].

**ك ٤٤٩:** لە جەنابی مامۆستای شێخ عثمانی مەردۆخیم بیست گێڕایەوە کاکە شێخ حمە ئەمینی برام سەردان و زیارەتی حەزرەتی شێخ علاء الدینی (قدس سره) کردوە وە زۆریش محبەت و ئیخلاصی ئەو زاتەی هەبوو، لە پاش ماوەیەك تووشی نەخۆشی گرانەتا بوو وە حەزرەتی شا علاء الدین وەفاتی فەرموو لە کاتی ناساخی ئەم

---

(١) وە لەم زانا عاریفە و زاتە بزورگە وە بە سەرهات و مناقیبی زۆر ئەگێڕنەوە: لەوانە یەکیان جەنابی حاجی ملا عارفی بانەیی کە مدرسی پێنجوێن بوو ئەی فەرموو: کاتێ فەقێ بووین و لە خزمەت ئەم زاتەدا ئەمان خوێند بە هەلم ئەزانی لە کاتی نوێژا لە پەنایەوە نوێژم دا ئەبەست لە کاتی الله اکبری نوێژ دابەستنا دەنگێ لە سنگی موبارەکیەوە ئەهات، سینەی موبارەکی ئەکولا، جۆشی کولانەکەی ئەبیسرا وە هەرکات لە نزیکیەوە نوێژم دابەستایە سنگی منیش وەکو سینەی ئەوی لێ ئەهات وە بەر دەوام ئەبوو تا کاتێ سەلام ئەدرایەوە و نوێژ تەواو ئەبوو. وە زۆر جار لە زاتی گەورە گەورەوە بیسراوە کە فەرموویانە: کاتێ ئەم زاتە عالی جەنابە حاجی ملا عبدالله پەسوێ لە کۆتایی خوێندنەکەیا تمسکی فەرمووە بە حەزرەتی شێخ عومەری ضیاء الدین قدس الله سره. حەزرەتی شێخ عمری ضیاء الدین لە بەیانی ئەم شەوەدا کە ئەم زاتە بەیعەتی وەرگرتوە فەرمویەتی: ئەمشەو سێ سەد کەس لە ئەولیای کبار پیرۆزباییان لێکردم بە بۆنەی تمسکی حاجی ملا عبداللهوە.

برایەما، کاتێ لە نەخۆشییەکەی چاك بوەوە بڕیارم دا کە بە وەفاتی شێخی علاء الدین (قدس الله سره) ئاگاداری نەکەین نەوەکوو دڵگران و پەژار بێ بەڵام خۆی گێڕایەوە ووتی لە کاتی بێخودییەکەمدا شتی زۆر سەیر و عەجایەبم ئەبینی لەوانە یەکیان ئەمەیە: بینیم کە حەزرەتی شێخ علاء الدین و کوڕی عەزیز و شیرینی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین ئەگەڕان بە چوار دەوری وولاتا و حەزرەتی علاء الدین خەڵکی تەسلیم ئەکرد بە شا محمد عثمان(قدس سره)وە خۆی بەرگی سپی پۆشی بوو وە هاتن بۆ ماڵی ئێمەش خۆمان تەسلیم کرد وەکوو هەموو خەڵکی، وە لە پاشا خەبەرمان دایە بەڕەزامەندییەکەی ئەمە مژدەیە و کەرامەت.

**ك ٤٥٠**: دووبارە لە زانای بەڕێز و ڕوخۆش وە ئیمامی وارع و دڵپاکم بیست کە جەنابی شێخ عثمانی مەردۆخییە گێڕایەوە ووتی:

هوشیاری کوڕم نەخۆشییەکی زۆر سەختی گرت وە ناڵەو دەنگێکی لێ ئەهات لە دوورەوە ئەبیسرا، شەوێکیان دایکی خستییە بێشکەوە هەموومان لە بەرگی خەوا بوین و گوێی لە نرکە و ناڵەیەوە بوو پاڕامەوە لە حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین(قدس سره) بۆ حاڵی ئەو مناڵە تا بە دەم پاڕانەوەوە توشی جەزبە و گریان بووم، ئەمبینی لەگەڵ ئەوەشا کە لە ژێر پێخەف و نوێنەوە بووم و چاویشم نوقاندبوو کە ڕۆحانیەتی ئەولیاکان حازر بوون وە گلۆپی دەستییان پێبوو وە لە هەموو لایەکەوە ئەیانگرتە ئەو مناڵە تا خەو زۆری بۆ هێنام کاتێ لە تاریکی شەوا بێدار بووم و دایکیم خەبەر کردەوە گوێمان لێ گرت دەنگی لێوە نەئەهات دایکی ترسی لێ پەیا بوو ووتی: ئەی هاوار نازانم کوڕەکەم چی بە سەر هات منیش پێم ووت خەوتوە، ووتی بەڵێ بەڵێ خەوتوە وە مەبەستی بێ باوەڕی بوو بە قسەکەم، کاتێ سەیرم کرد خەوتو بوو، خوا شیفای بۆ نارد بە هیممەتی دۆستان و چاك بوەوە و ناساخییەکەی نەما الحمد لله، درود و سلاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار (صلى الله عليه وسلم) و ئال و یارانی.

**ك ٤٥١:** له جه‌نابی زانای لبیب و واعظی ادیب حاجی ملا فرجی شکیب[1] م بیست بۆی گێرامه‌وه فه‌رمووی:

دراوسێیه‌کمان هه‌بوو له سه‌راو خێزانه‌که‌ی سێ منالی له دوا به‌جێما هه‌ر سێکیان به دواییه‌کدا مردن و ئه‌ولادی نه‌ما، به شه‌و و به ڕۆژ هه‌ر ئه‌گریا و ئه‌لالایه‌وه، منیش زۆرم به‌زه‌یی پیا ئه‌هاته‌وه که به ته‌نیا خۆی له ماڵه‌که‌دا مابوه‌وه له دلْما بوو ئه‌گه‌ر بچم بۆ بیاره‌ی شریف شکاتێکی له خزمه‌ت حه‌زره‌تی شێخ علاء الدین دا بۆ بکه‌م بۆ ئه‌وه‌ی خوا کوڕێکی پێ خه‌لات بکات، خوا ڕێکی خست چووم بۆ بیاره‌ی شریف و چه‌ند ڕۆژێ له‌وێ مامه‌وه ڕووم نه‌بوو عه‌رزی حه‌زره‌تی شێخ علاء الدین بکه‌م له به‌ر ئه‌وه‌ی ته‌مه‌نی موباره‌کی تێپه‌ڕی بوو.

ڕۆژێ حه‌زره‌تی شا محمد عثمان سراج الدین (قدس سره) ده‌عوه‌تی کردین بۆ ماڵی خۆیان له‌گه‌ڵ کۆمه‌ڵێ له زانایان بۆ قاوه‌ڵتی له ماڵی پیرۆزیان کاتێ دانیشتین فه‌رمووی: سه‌ییدێ له ئه‌ولادی پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه وسلم) یه‌کێ له شێخه‌کانی باوه‌جانی به دیارییه‌کی به نرخه‌وه ناردویه‌تی بۆ حه‌زره‌تی شێخ بۆ مه‌به‌ستی منال چونکه منالی نه‌بووه، منیش عه‌رزیم کرد قوربان من ماوه‌یه‌کی که‌م نیه لێره‌م ڕجام وایه ئیجازه‌م بفه‌رمون تا بگه‌ڕێمه‌وه ناو که‌سوکارم، حه‌زره‌تی شێخ له وه‌لامیا فه‌رمووی: ان شاء الله تعالی وه ده‌رمانه‌که‌شم بۆ ئاماده کردوه.

ئه‌مجار حه‌زره‌تی شا عثمان ڕووی کرده ده‌سته‌ی عوله‌ماکان فه‌رمووی: من ئه‌م ده‌رمانه‌م له مه‌عنه‌وییه‌وه یانی له باطنی یه‌وه فێر کراوم هه‌ر ئافره‌تێ منالی نه‌بووبێ و به‌کاری بهێنێ خوا منالی پێ ئه‌به‌خشێ، منیش عه‌رزیم کرد قوربان له‌و ده‌رمانه بۆ

---

(١) ئه‌م زانایه مشهور بوو به جه‌نابی حاجی ملا فرجی واژه‌یی، بۆیژێکی قسه‌زان و ده‌م ڕاست بوو پیاوێکی سه‌خی ته‌بیعه‌ت و قسه خۆش بوو، شاعرێکی ته‌ڕو مجلس ئارا بوو، زۆر حه‌زی له باسی ئه‌ولیا و که‌رامات ئه‌کرد به تایبه‌ت حه‌زره‌تی شا محمد عثمان سراج الدین وه ماوه‌یه‌کی تایبه‌تی بۆ ڕابیطه ته‌رخان کردبوو.

منیش وه لەوه پێش دۆعام بۆ ئەو ژنە داوا کردبوو لـه جەنابیان، فـەرمووی ان شاء
الله دۆعات ئەدەمێ بۆی، ئەم دەرمانە بۆ ئەو نابێ، ئەمجارە دوبارەم کردەوە کە دۆعام
نەداتێ دەرمانم بداتێ، فەرمووی دەرمان بۆ ئەو نابێ دۆعای بـۆ ئـەبێ، منیش لـە دڵـی
خۆما ووتم ئەو ژنە باوەجانییە دیاری ناردوە ئەو ئافرەتەی لای من هیچی نیە بۆیـە وا
شتێ بۆ نانێرێ ئەمجار ئاوڕێکی فەرموو بۆ لای من بە نیوە توڕەییەکەوە فەرمووی تۆ
وەسوەسە و خەتەرەت هەیە ئەم دەرمانە بۆ ئافرەتێکە کە هەرگیز منالی نەبووبێ. بەڵام
ئەو ئافەرتەی تۆ شکاتێ بۆ ئەکەی منالی بوە دۆعای بۆ ئەنێرم، ئایا بینیوتە یا بیستوتە
من هاتبم بۆ لای ئێوە یان بیستوتـه ئـەو ئافرەتـه هـاتبێ بـۆ بیارە منیش عـەرزم کـرد
نەخەیر. فەرمووی: بۆ ئەوەی بزانی من ڕاست ئەکەم لە قسەکەما بەو ناو نیشانەیە ئەم
ئافرەتە چاوی گەورە و گەشە وە هەر دو برۆی ڕەشە خاڵێك لە ژێر مەمکیایـەتی یـان
فەرمووی لە تەنیشتیایەتی، وە ئەگەر ئارەق بکاتەوە بە هـۆی گـەرماوە یا مانـدوبونی
ئیشەوە نیوەی لەشی ئەنیشێتە سەر ئارەق نیوەکـەی تـری هـەروەك خـۆی ئەمێنێتـەوە،
ئەمجار دڵنیاییم حاصـل کـرد و دۆعاکـەم بـۆ هێنایـەوە، پرسیارم کـرد لـە خێـزانم ئـەو
نیشانـەو ئیشارەتانـە لـەو ئافرەتـەدا هەیـە، بـۆ خـاڵ و عـەرەق کردنـەوە نـازانم بـەڵام
چاوەکانی گەورەو جوان و گەشە وە هـەر دو برۆیشـی ڕەشـە، خێـزانم پرسیاری لـێ
کردبوو لە وەڵاما ووتبوی خاڵەکـە هەیە بـەڵام بـۆ ئـارەق کردنەوەکـە خـۆم بـە خـۆم
نـەزانیوە. وا ڕێکـەوت پێکـەوە لەگـەڵ ماڵـەوەمانا چـوبون بـۆ نـاو بـاخ دوای ئـەوەی
ماندوو بووبو خەو زۆری بۆ هێنا بوو لە ژێر تیشکی خۆرەکەدا خەوی لێ کەوتبوو،
کاتێ بە ئاگا هاتبوو سەیر ئەکات نیوەی لـەشی هـەروەکو بـە ئـاو تـەڕت کـردبێ وابـوو
بەڵام نیوەی تری هەروەك خۆی وابوو.

ك ٤٥٢: لە بەڕێز جەنابی سعید بەگی خاوەنی دێی بەیەڵەم[1] بیست بۆی گێڕامەوە فەرمووی: جارێك لە خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین دا بووم (قدس سره) لە باخەکانی دووڕووەدا عەرزیم کرد قوربان کاتێ هاتم بۆ خزمەتت یەکێ لە منالەکانم بەجێهێشت بە نەخۆشی، هیممەتێ بخەرە کار با شیفای بێ بەلام وەلامی نەفەرموو، دەستی بە باسی ئەو باخە هەر وەکوو بفەرموێ ئەمە چ گوڵێکە ناوی چییە؟ وە بەم چەشنە، لە دوای ماوەیەك دووبارە عەرزیم کردەوە وام زانی هەر گوێ لێ نەبووە یان لە بیری چوو وەلامەکەم بداتەوە، ئەمجارەش هیچ وەلامی نەفەرموو باسێکی تری فەرموو مەبەستەکەی منی تیا نەبوو هەروەکوو گوێی لێ نەبووبێ، کاتێ گەڕامەوە بۆ مالەوە کوڕەکە لە دنیا دەرچووبوو، زانیم کە بێ دەنگییەکەی جەنابیان زانینیان بوە بە لە دنیا دەرچوونی و ئاگادار بوون پێی.

ك ٤٥٣: دووبارە لە جەنابی زانای ناوبراو شێخ عثمانی مەردۆخیم بیست بۆی گێڕامەوە فەرمووی: دوای تەواو کردنی خوێندن براکەم تێکچوو ماوەی سالێ زیاتر دەوامی کرد لەو ماوەیەدا چەند جار چوو بۆ خزمەتی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین (قدس سره) کە ئەگەڕایەوە دوای چەند ڕۆژێ وەکوو خۆی لێ ئەهاتەوە، وە دایکم چەند جار داوای لێ ئەکردم کە لەو بارەیەوە نامە بنێرم بۆ حەزرەتی پیر بەلام نەم ئەنوسی، چونکە ئەمزانی کە حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین ئاگادارە بەوەی کە برای منەو کوڕی تۆیە، وە خۆیشی یەکێکە لە موخلیسانی ئەو زاتە، ئیتر چ پێویست ئەکات بە نامە ناردن، وا ڕێکەوت لەم سالەیا نوسراوێکم بۆ سەماحەتیان نووسی و لە دواییدا نووسیم قوربان ئەهلی خوا چۆن غیرەتیان قبولْ ئەکات کە یەکێ

---

(١) بەیەڵە : دێیەکە لە ناوچەی مەریوان، وە ئەم سعید بەگە حەزرەتی شێخ زۆری خۆش ئەویست، وە یەکێ بوو لە مریدە زۆر مخلصە ڕاستەکان، وە بە گوێرەی ئاغاکانی ئەو ناوچەیە لە هەموویان بڕوا و عەقیدەی زیاتر بوو بە حەزرەتی پیر بێجگە لە حمە خان و ئەحمەد خانی برای لە کانی سانان.

له ئەهلی عیلم و زانا منالان یاری پێ بکەن، وە مەبەستم شکات و دەردە دڵی حاڵی براکەم بوو، لە نامەکەیا وەڵامی فەرموو بوو، عەزیزم مەلا خالیدی برات هات وە چەند ڕۆژ لە لامان لێرە مایەوە، وا سوپاس بۆ خوا بەو پەڕی باشی و چاکییەوە گەڕایەوە بۆ لاتان وە جارەکانی پێشوو درێغم نەکردوە دەربارەی، بەلام الامور مرهونة باوقاتها، سوپاس بۆ خوای پەروەردگار و درود و سلاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار (صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی.

**ك ٤٥٤:** جەنابی زانای هەر دو زانیاری و برای هەر دوو دنیا جەنابی مامۆستا ملا عبداللەی لاجانی[١] بۆی گێڕامەوە فەرمووی:

لە کاتی فەقێیەتیما ئەم خوێند لە خزمەتی جەنابی مامۆستا ملا باقردا لە بالك وە لەو کاتەدا وەکو ئاسنێکی بێ هێز وابووم لە بەینی دوو مغناطیسدا چونکە لە لایەکەوە محبەتی شێخی برهان[٢] (قدس سره) لە دڵما جێگیر بوبو وە لە لایەکی کەیشەوە هێرشی پڕ سۆزی محبەتی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین (مد ظله) لە دڵما هەر سات و کات بەرەو زۆری ئەڕۆیشت بە هۆی توجهاتی و تاثیری ڕەفاقەت و مجاوەرەی ئەو مامۆستایانە دۆست و ئەحباب کە لەو ناوەدا بوون، بێگومان هەر بە تەمای ڕێبازێ بووم کە بیدۆزمەوە بۆ دەرچوون و ڕۆیشتنم[٣]، تفؤل بە قورئانێکم

---

(١) ئەم زانا پڕ ئەدەبە لە کاتی تمسکیەوە تا ئیمڕۆ ماوەیەك بە سەرخەتمەیی وە ماوەیێکی تر بە کاتبی لە خزمەتی حەزرەتی غەوثی وەقتا بەردەوام بە ئیخلاص و ئەدەب و پیاوێکی بێ نفس و دڵ پاك و میوان پەزێر و زۆر بە ماریفەتە، وەتا دڵ حەزکات بە محبەتە و عالمە لە زانیارییە گشتییەکانا.

(٢) جەنابی حەزرەتی شێخ یوسفی برهان ڕەحمەتی خوای لێ بێ خەلیفەی حەزرەتی شێخ عمری ضیاء الدین بوو (قدس سره).

(٣) مامۆستا جەنابیان دوو بە سەر هاتیان گێڕایەوە لەم بارەیەوە ئەگەر خوا دەرفەتی نارد عەرزتان ئەکرێ یەکەمیان لە بارەی رابیطە کردنی جەنابییەوە لە کاتی خوێندنی علومی ظاهری دووەم لە بارەی ئەوەی کە گەشتیارێ مژدەی داوە پێی.

کرد بۆ ئەوەی دەرکەوێ بۆم کە ئایا مانەوەم لێرە قازانجە یا گەڕانەوەم کە قورئانەکەم کردەوە ئەم ئایەتە هاتە پێشەوە :

[يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لاَ يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لاَ يَشْعُرُونَ]

وام زانی فەرمانم پێکراوە بە گەڕانەوەم بە تەنیا خۆم ئامادە کرد، بەڵام جەنابی مەلا سید عبدالباقی نامەیەکی ناردەوە بۆ ماڵەوە کە من لێرە ئەمێنمەوە تا خوێندن تەواو ئەکەم.

لەو ماوەیەدا مەجزوب بووم هەروەکو لە کەراماتی ترا باسم کردوە هەستام چووم بۆ بیارەی شەریف وە لەوێ تمسکم وەرگرت بە طەریقەی موبارەك و پیرۆز لە دوای شۆڕشەکەی عێراق حەزرەتی شا عثمان (قدس سره) عێراقی بەجێهێشت وە هیجرەتی فەرموو بۆ ئێران وە ماوەیەك لە قەلاشێخان مایەوە باخاتێکی جوانی بۆ برای عەزیزی کە حەزرەتی مولانا خالیدە دروست کرد وە مریدان لەوێ خەریکی پاکردنەوەی ئەو باخە بوون لە بەرد و چاکردنی ناوچەکە، وە من و صۆفی ئەحمەدی بێروازی خەریکی شکاندنی بەردێکی پانی گەورە بووین بەڵام لە بەر ڕەقی لێدان کاری لێ نە ئەکرد، کاتێ تەشریفی موبارەکی هێنا فەرمووی: ئەوە بە لێدانی ئێوە ناشکێ؟ عەرزمان کرد نەخەیر فەرمووی لە ترسی خوا نەبوایە ئەی بەرد وام پیا ئەکێشای وورد و خاشم ئەکردی لە دواییدا فەرمووی لێی بدەن خۆی تەشریفیان لە دوورەوە وەستا چەند جارێ لێمان دا، بوو بە چوار لەتەوە شارە مێروولەیەکی لێ هاتە دەرەوە و بڵاو بوونەوە ئەمجار فەرمووی: [يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لاَ يَحْطِمَنَّكُمْ (مەلا عبدالله) سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ ] دڵنیا بووم لەوەی کە ئاگادار بوە بە تفؤل بە قورئانەکەم وە ئیتر کارو فەرمانی من لە ژێر سایەی پیرۆزیەتی إن شاء الله وە ئیتر گەڕانەوەم بۆ ماڵی خۆم ئەبێ بە ئیجازە و فەرمانی ئەم بزورگەوە بێ وە لەم بەسەرهاتە دوو کەرامەت هەیە، یەکەم زانین و ئاگادار بوونیەتی بەو شارە

مێرووله‌یه له‌ناو ئه‌و تاوێره که‌ڕ و بێگیانه‌دا دووه‌م زانین و ئاگادار بوونیه‌تی به تفؤل کردنم به قورئان.

**ك ٤٥٥:** جه‌نابی زانای پر که‌ماڵ حاجی مامۆستا ملا باقر فه‌رمووی:

عه‌رزی حه‌زره‌تی شا محمد عثمان سراج الدینم کرد (قدس سره) که لطف و کۆمه‌کی بفه‌رموێ ده‌رباره‌مان تا سه‌ر به زۆری و عه‌رزیم کرد قوربان: له‌م جه‌ژنه‌دا یه‌کێك قورئانی بۆ ئه‌خوێندین حاڵه‌تێکم بۆ په‌یدا بوو له وه‌جد و شه‌وق له دوای ئه‌و منیش ده‌ستم کرد به قورئان خوێندن و چه‌ند ئایه‌تێکم خوێند به‌ڵام ئه‌وه‌نده وه‌جد زۆری بۆ هێنام نه‌متوانی واز له قورئانه‌که بهێنم و دڵیشم به‌رگه‌ی ویسعه‌تی ئه‌و حاڵه‌ته‌ی نه‌ئه‌گرت، ده‌ستم کرد به داوای کۆمه‌کی و ئیستمداد له خزمه‌ت حه‌زره‌تی قطب شێخ علاء الدین (قدس الله سره العزیز) هیچ کۆمه‌کییه‌کم نه‌دی ئه‌مجار ده‌ستم به داوای کۆمه‌کی و یارمه‌تی له جه‌نابتان کرد، هاتن به هانامه‌وه و ئێوه حازر بوون وه دڵی منتان ویسعه‌ت پێدا به مه‌رجێ وازم له خوێندن نه هێنا و دڵیشم ویسعه‌ت و فراوانی په‌یدا کرد بۆ به‌رده‌وام بوون له سه‌ر خوێندن وه سینه‌م فراوان بوو بۆی، ترسم نه‌ما تکاتان عه‌رز ئه‌که‌م ئه‌و خه‌ڵاته‌تان به‌رده‌وام بێ وه مه‌رحه‌مه‌ت و کۆمه‌کتان ده‌رباره‌مان له کارا بێ، سوپاس بۆ خوای په‌روه‌ردگار و درود و سڵاو بۆ گیانی پاکی پێغه‌مبه‌ری نازدار (صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی.

**ك ٤٥٦:** بیستم له جه‌نابی مامۆستا ملا احمدی ئیمامی خانه‌قای سه‌قز که به ملا احمدی سه‌ڵته‌که‌ڵتو[1] به ناو بانگه گێڕایه‌وه فه‌رمووی:

کاتێ له بیاره‌ی شه‌ریف ئیمامی خانه‌قای موباره‌ك بووم له خزمه‌ت حه‌زره‌تی شا محمد عثمان سراج الدین (مد ظله) هاتین بۆ شاری سلێمانی کاتێ گه‌یشتینه په‌خشی

(١) سه‌ڵته‌که‌ڵتو : دێیه‌که له ناوچه‌ی سه‌قز له کوردستانی ئێران.

عەربەت کۆمەڵێ ئامێرە و کەلو پەلم بینی کە کارگەیێ لە دەربەندیخان ئیشی ئەکرد لەوێ بەکاری ئەهێنا خەیاڵێ هات بە دڵما کە:

موعتەزیلە ئەڵێن بە شەر خالیقی ئەفعالییەتی هیچ دوور نیە بەم خەتەرە و خەیاڵە دڵ گران بووم هەر چەند بەڵگەم بۆ خۆم ئەهێنایەوە هیچ سوود و کەڵکی نەبوو، وە لە سلێمانی لە ماڵی حاجی سعید (خوا لێی ڕازی بێ) تەشریفی حەزرەتی پیر دابەزی، ئەو شەوە لەوێ ماینەوە، چەند سەعاتێ لە شەو تێپەڕی حەزرەتی شیخ (مد ظلە) تەشریفیان هەر دانیشتبو وە منیش لە خزمەتیا بە پێوە ڕاوەستا بووم وە بەو خەیاڵەوە ئەتلامەوە داوام لە جەنابی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین ئەکرد و بە دڵ لێی پاڕامەوە و بە دڵ ووتم:

دەستگیر بۆ کاتی ئەم گیر و گرفتانە بە کەڵکە وا خەریکم سەر گەردان ئەبم فریام کەوە ئەگەر سەیرێکم بکەی هەمو ئەندامەکانی لەشم و هەست و بیرم نەماوە تەنها هەستکردنم بە دڵە و بەس، وە ئەو خەیاڵ و خەتەرەیەم هەر لە یاد ناچێتەوە، وە کتوپڕ بێخودییەکم هات بە سەرا و کەوتمە عالەمێکەوە کە هەرگیز باس ناکرێ گوێم لە گوفتاری (کُنْ) بوو پەیتا پەیتا خطاب ئەکرا وە ئەمبینی کە ئەو هەموو ئامێرە ئالات و مکائن و مصانع ە دروست کراوو داهێنراوانە[1] هەمووی لە نەبوونەوە بە نوێیی ئەهێنرانە بوون بە تەنیا فەرمایشتی ئەم خطابە(فیکون) وە لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بینی کە ناوی دروستکەران و داهێنەرانییان پێوە بوو وە هەریەکەیان لە سەری نوسرابوو، لە دوای ماوەیە چوومەوە باری پێشووم، بەڵام کە من لە کوێ بووم وە نەشم زانی لەگەڵ کێدام وە لە چ شوێنێکدا بووم، ئەمجار هەر وەکوو یەکەم جارم لێ هاتەوە و چوومەوە دۆخی جارانم وە هەموو ئەندامەکانی هەستم بۆ گەڕایەوە کە چاوم کردەوە سەیر ئەکەم کە حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین فەرمایشت

(١) داهێنان : اختراع / دۆزینەوە ، دروست کردن : اکتشاف.

ئەفەرمویٚ لەگەڵ دانیشتواندا و هەر ئەڵێی بە منیشەوە خەریك نەبوە، تا چەند ووردیلەیەك نەم زانی بۆچی ئەم بەسەرهاتە ڕووی دا وە هۆکەی چی بوو.

ئەمجار هاتەوە یادم کە من داوام لە حەزرەتی پیر کرد کە ئەو خەتەرە و خەیاڵە لە سەر دڵم لا ببات کە سەیرێکی دڵم کرد هەمووی لا بردبوو وە ڕزگارم بوو لەم بەڵا گەورەیە بە هیممەتی ئەم دۆستی خوایە، شوکر بۆ خوای پەروەردگار و درود و سلاو بۆ گیانی پێغەمبەری نازدار (صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی.

ئیتر لەو کاتەوە ئیمان و باوەڕەکەم بوو بە ئیمانێکی شهودی بەرامبەر بەم مەسەلە کەلامییە.

**ك ٤٥٧:** جەنابی کاکە میرزا صدیقی چنگیان[١] بۆی گێڕامەوە ووتی:

دوای ئەوەی خێزانم لە دنیا دەرچوو بە تەمای کچێك بووم ناوی ثانیە بوو لە دێی مەریوان، نامەیەکم ناردە خزمەتی حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین (قدس سرە) لەو بارەیەوە، لە وەلاما فەرمووبوی: موبارەك بێ ثانیە یەکێ بنێرە با تەماشایەکی چاوەکانی بکات بزانن نەخۆشی تەراخۆمای نیە، وا ئەزانم تەمەنی کورت ئەبێ هەر چەند ئەویش و ئەوانەی تری وەك تەمەنیان کورت ئەبێ بەلام چاك وایە هەر قەزا و بەڵای خۆت ببات، منیش مارەم کرد لە دوای حەفتەیەك بە سەر گواستنەوەیدا بینیم بەیانییەك چاو هەڵ ئەگلۆفێت!!! لێم پرسی ئەوە چیتە؟ ووتی چاوم ئەخورێ کە بە ووردی تەماشام کرد سەیرم کرد تووشی تەراخۆما بوە، جارێکی تریش خۆم حازر بووم قورئانی هەڵ بڕی و ووتی: خوایە داوات لێ ئەکەم

---

(١) ئەم کاکە میرزا صدیقە پیاوێکی تێگەیشتوو وورد بوو بە چاوپێکەوتنی پیاو خۆشی ئەوێ قسەزان و حەز لە کۆڕی پیاوانی خوا و زانایان و پیاو ماقولان زۆر ئەکرد، کار و باری خەڵکی ڕائەپەڕان بە کورتی نموونەی پیاوێکی چاك بوو بە هیممەتی پیری دەستگیر، ڕووخۆش و کراوە و گەش بوو حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین (مد ظلە) زۆری خۆش ئەویست.

بیکەی بە خاتری ئەم قورئانە من بکەی بە قوربانی ئەم میرزا صدیقە لە دوای پانزە مانگ پاش گواستنەوەی ماڵ ئاوایی کرد لە ڕۆژێکا کە بەلا لە هەموو لایەکەوە دەورەی دابووم.

بەڵێ هەموو ئامۆژگارییەکانیم بە چاوی خۆم دی کە هاتە دی کە نەخۆشی ناوبراو بوو، وە تەمەن کورتییەکەی.

**ك ٤٥٨:** ڕۆژی جومعە ٢١ی مانگی رەجەب ساڵی ١٤٠٢ی کۆچی لەگەڵ مامۆستایان و دۆستان چوین بۆ زیارەتی حاجی مامۆستا مەلا محمد ئەمینی مودەرریسی پێشوی کانی سانان، بەلام خەبەرمان زانی هاتوە بۆ دێی عەریەت بۆ ماڵی مەلا علی زاوای کە خطیبی بیارەیە بە هۆی جەنگ و جیدالەوە کۆچی کردوە بۆ دێی ناوبراو. تصادف عەینی ڕۆژ ئەویش تەشریفی هاتبو بۆ سلێمانی، گەڕاینەوە کاتێ بە خزمەتی گەیشتین یەك دوو خەویان بۆ گێڕاینەوە ئەویش فەرمووی:

یا ئەمشەو یا دوێشەو (ئێستا من لە بیرم نیە) لە خەوما لە خزمەت شێخ بووم، دیم شێخ مەجزوب بوو وە جەزبەکەی بە تول و توند بو، وتیان حەزرەتی رسول (صلی الله علیه وسلم) تەشریفی هێنا بەلام من حەزرەتم نە ئەدی وە لەوکاتا من و مەلایەکی عەرەب حازر بووین شێخ لە خزمەت پێغەمبەرا ﷺ معرفی ئەکردین بەلام لە بابەت منەوە فەرمایشتەکانی بە کەلیمەی قەڵەو ئەفەرموو (یانی تەعریفی بە وەصفی گەورە بۆ ئەکرد).

**ك ٤٥٩:** ڕۆژی ١٧ ذی القعدەی ١٤٠٢ی کۆچی کە تصادفی بە ڕۆژی شەممە کرد جەنابی حاجی عبدالرحمانی حەڵوا لە ماڵی خۆمان بۆی گێڕامەوە و ووتی: تا ئێستا ئا لەم بەینا نەبێ بە هۆی قسەی ئەم و ئەو مەجبور بوم بۆ کەسم بەیان نەکردوە. لە ساڵی ١٣٧٧ی کۆچی لە بیارە بووم حاڵەتێکم بو لە خزمەتیا وەستا بووم شێخ دانیشتبو، شێخ منی ڕاکێشا بۆلای خۆی قسەیەکم پێ بفەرموێ کتوپڕ تەماشام کرد

حەزرەتی پیر هەر شێخە بەڵام شێوە و صورەت و هەمو شکڵی چوە سەر صورەتی حەزرەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

**ك ٤٦٠:** لە زەڕاین پیاوێك هاتە خزمەت حەزرەتی پیر ناوی شێخ حەسەنی کوڕی شێخ ئەمینی نەوەی شێخ قادری سۆڵە بوو، ڕووی کردە حەزرەتی شێخ فەرمووی قوربان خەوێکم دیوە ئیجازە هەیە بیگێڕمەوە؟ حەزرەتی پیر فەرمووی بەڵێ. فەرمووی: لە خەوما بە خزمەت رسولی أکرم (صلى الله عليه وسلم) گەیشتم ڕووی لێ وەرگێڕام عەرزم کرد بۆچی ڕووم لێ وەردەگێڕی؟ فەرمووی عثمان هاتوە نەچووی بۆلای جاری پێشویش هەر نەچویت، هەرکەس عثمانی نەوێ ئێمەش نامانەوێ. بۆیە وا منیش هاتوومەتە خزمەتت.

**ك ٤٦١:** لە کەلار صۆفی محمود[1] ناوێکی تاوکۆزی هاتە خزمەت حەزرەتی پیر عەرزی کرد قوربان خەوێکم دیوە ئیجازە بفەرموو با بۆت باس بکەم، فەرمووی :

شەوی سێ شەممەی رابردوو لە خەوما قەرە باڵخێکی زۆرم چاو پێکەوت ووتیان حەزرەتی رسول الله (صلى الله عليه وسلم) تەشریفی هێناوە کە چوومە پێشەوە پێغەمبەری موبارەك (صلى الله عليه وسلم) تەشریفی موبارەکی لەوێ بوو وە حەزرەتی شا محمد عثمان لە خزمەتیا بوو، زیارەتم کرد و بە پەلە چوومەوە بە شوێن منداڵەکانمدا کە بیان هێنمە خزمەتی بۆ زیارەت، هەر دوو کوڕەکەم (صدیق و علی)م هێنا لە ڕێگا علی م لێ بزر بوو صدیقم هێنایە خزمەتی بۆ زیارەت، شا عثمان فەرمووی لە خزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بڵێن بە یەکێ با بانگ بدات پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی عثمان خۆت بانگ بدە، فالحمد لله على اعلان نعمة التجديد بأمر رسوله المجيد والصلاة والسلام على رسوله محمد صاحب

(١) صۆفی محمود کوڕی صۆفی ئەحمەدی خەڵکی (گڵێجاڵ) ە، وە ماڵی ئێستا لە بەمۆیە.

الفكر السديد و على اله و اصحابة الطاهرين اهل الرشاد وبالمديد، واجعلنا اللهم تحت لواء هذا المرشد ومن اتباعة الى يوم الدين.

**ك ٤٦٢:** جەنابی کاکە مصطفی تورکی لە خزمەتی حەزرەتی پیرا لە کەلار گێڕایەوە ووتی: هەر لە منالیمەوە لە ئەستەنبۆل هەستم ئەکرد بە الطافی حەزرەتی شا عثمان لەگەڵما. ماوەیەك بە بێ ئیجازە دەستم کرد بە خوێندنی چەند ئەورادێ لە پێشەوە دەرکی نیسبەتم بۆ پەیدا بوو وورده وورده ئەو فەرەحی و بەسطەم نەما هەستیشم کرد بەوە کە نیسبەتی شاعثمان لەگەڵما کز بوە و بەڵکو کوژاوەتەوە، بەو دەردەوە ماوەیەکی دوور و درێژ تلامەوە، تا پیاو چاکێکی لای خۆمان ڕۆژێك ڕێنۆمایی کردم ووتی بچۆرە سەر ئەو مەزارە فاتیحەیەکی بۆ بخوێنە، رابیطەکەت ئاشت ئەبێتەوە، منیش بە گوێم کرد سەرفرازی دۆستان بێ دەست بەجێ لەگەڵما ئاشت بوەوە و منیش پەژاری و ناڕەحەتییەکەم لاچوو.

**ك ٤٦٣:** صۆفی عبداللهی[1] باخە هەنارە کوڕی صۆفی محمدی صۆفی عبدالله گێڕایەوە ووتی: ڕۆژێ حەزرەتی پیر ڕووی تێکردین لە ڕووی دڵسۆزی و ئامۆژگارییەوە فەرمووی: من نەتانگەیەنم بە خوا خۆتان پێی ناگەن.

---

(١) صۆفی عبداللەی باخە هەنارە گێڕایەوە فەرمووی: صۆفی محمدی باوکم گێڕایەوە فەرمووی: باپیرەم لە خزمەت حەزرەتی شێخ عمری ضیاء الدین(قدس الله سره) دا بوە کە فەرموویەتی کوڕی من محمد ناکەوێتە ئاخر زەمان وە مەبەستی حەزرەتی شێخ علاء الدین بوە، کوڕی محمد ئەکەوێتە ئاخر زەمان وە مەبەستی حەزرەتی شا محمد عثمانی سراج الدین (قدس سره) بە ڕاستی نموونەی ئاخر زەمان و نیشانەکانی بە دیار کەوتوە، فیتنە و ئاشووب جیهانی داگرت، ناحەق هاتونەتە سەرکار و فرمان و داوای حق و ڕاستی ئەکەن، وە لە ڕاستیشا لە ڕاستی بە دوورن، خوا لە محبت و خۆشەویستی و فیتنە و ئاشوبیان بمانپارێزی لە بەر خاطری یەکە دۆستی خۆی وە لە شەڕ و عەکسیاتی ئەوانەش بمانپارێزێ کە لە ناو دڵیاندا محبەتو خۆشەویستی شاراوەیان هەیە بۆ ئەو دوژمنانەی خوا.

ڕاســـت و دروستـــــه فـــەرمـــايشـــتی تـــۆ
دەســـت ناگـــات بـــه خـــوا دیـــاره ڕاســـتەوخۆ
هـــەر تـــۆ دەســـتگیری ڕاســـته و بێ حیلـــە!!!
نـبـتـغـــي إلـيـــه نـــعـــم الوسيـلـــــة

ك ٤٦٤: ئەحمەدی کاکه عبدالقادری بانی بی (خوالێ خۆشبوو) بۆی گێڕاینەوە ووتی: شێخی ضیاء الدین فەرمووی ئەی علاء الدین کۆمەڵێك لە شیویکا نیشته جێ بوون چەند ساڵه لەگەڵیان خەریکم بانگەوازیان ئەکەم بێ سوودە، وە لە کاتی ئیرشادی جەنابی حەزرەتی علاء الدین (قدس سره) دا فەرمووی منیش لەگەڵیانا زۆر خەریك بووم، عثمان با من لە گەڕەکێکەوە تۆش لە گەڕەکێکەوە بچین سەریکیان لێ بدەین، کاتێ چووین سەگەکانی ناوچەکەش هەموویان دەورەی عثمانیان دا و مل کەچی بوون، فەرمووی عثمان من چەند ساڵه خەریکم بۆ خەڵکی ئەم ناوچەیه بۆم ڕانەهێنران تۆ بە یەك شەو سەگەکانیشیانت ڕاهێنا.

ك ٤٦٥ : صۆفی قادری مخلص[1] بۆی گێڕاینەوە ووتی: حەزرەتی شێخ علاء الدین (قدس سره) تەشریفی موبارەکی لە بیارە بوو، حەزرەتی شا محمد عثمان تەشریفی پڕ فەڕ و بەرەکەتیان لە دووڕووە بوو، لە زستانێکی سەختی وەکو ئەمساڵدا فەرمووی: با زیارەتێکی پیری دەستگیر حەزرەتی شا علاء الدینی شێخی باوکم بکەین، حازربن، عەرزیان کرد قوریان بەم زستانه تووش و سەخته ناگەینه

(١) ئەم صۆفی قادره ئێستا ماڵیان لە دەربەندیخانه وە سۆز و ئاوازێکی زۆر بە کوڵ و گەرمی هەیه فەرمووی من هیچم نەئەزانی بەم عەوامی و نەخوێندەوارییەوە کە هەم جارێك حەزرەتی شێخ عثمان پەنجەی موبارەکی خستە دەمی بەندەوە لەو کاتەوە ئەو شۆڕشی شیعر و سۆزە لە بەرەکاتیانەوە هەڵ قوڵاوە، فالحمد لله رب العالمین والصلاه والسلام علی اشرف المرسلین محمد واله وصحبه و اتباعه اجمعین.

ئەویٚ و کاتی هاتوو چوٚ نیە، هەر چەندیان ووت نەی بیست فەرمووی ئیشتیاقی دیدار زۆرە خۆم پیٚ ناگیریٚ هەستە صوٚفی قادر با بکەوینە ریٚ، بەو زستانە بیٚ دەرەتانە ئەگەیشتینە هەر شوێنیٚ ئاگاداری سەختی ڕێگایان ئەکردین تا گەیشتینە دەرەکیٚ بە چەشنیٚ ترسیان لیٚ نیشت ووتیان ڕەق ئەبنەوە، بە ناڕەحەتییەکەوە گەیشتینە کەماجاڕ بەلاٚم ئەم زاتە بیٚ باك بوو لەو هەموو زەیقەتەی کە بوو، دوای مەغریبیٚکی درەنگ وەخت گەیشتینە دەرەی مەڕ دوای بەخێرهاتن و خۆش هاتنێکی تەواو لێیان پرسین چۆنە وا بەم زستانە سەختە هاتوون بەم دیوا؟ ووتمان بۆ زیارەتی حەزرەتی شێخ هاتووین! مالٚ وێرانێکیان ووتی خۆ بەخوا من ئاگادارم حەزرەتی شێخ علاء الدین (قدس سرە) تەشریفی موبارەکی بردوە بۆ سەرگەت نەی هێشت ئەم بزورگە عالی جەنابە ئەو شەوە بحەوێتەوە لە دەرەی مەڕ وە ئەو هەوالٚەی کتوپڕ پێگەیاند، تەشریفی هەستا و کەوتینەوە ڕیٚ تا نەگەیشتینە خزمەتی، حەوانەوەی بە چاو نەدی کاتیٚ بە خزمەت ئەو قطبی وەقتە گەیشت فەرمووی عثمان بە سەیارەی محبت هاتووی لە دووڕووە وە بۆ سەرگەت؟ ئەمجار بە سەر هاتێکی زۆر گرنگی خۆی گێرایەوە کە بۆ ئوستادی خۆی حەزرەتی شێخ ضیاء الدین (قدس سرە) بەدی هاتوە، دوای ئەوە فەرمووی: یاخوا بەخێر بێی، فەرەحیت هێنا وە ئەم بەدی هاتەی گێراوە بۆ شێخ عثمان گیان، حەزرەتی شێخ عبداللّٰەی دهلوی هیندی ئەوەندە تەمەن دار بوو خستبوویانە ناو قەفەزێکەوە چنگێکی مابوو، یان فەرمووی ئەیان خستە ناو سەبەتەیەکەوە ئەیان هێنایە ناو خەتمە، لە ناو خەتمە کەیا جوان و گەنج ئەبوەوە وە قورئانی ئەخوێند دوای خەتمەکە بە هەمان دەستور وەك خۆی لیٚ ئەهاتەوە و ئەیان خستەوە شوێنی خۆی. وە مەبەستی ئەو قطبە عظیمە لەم فەرمایشتە ناوازەیە ئەوە بوو کە بە چاوپێکەوتنی دۆستان هەمو ناڕەحەتییەك نەئەما.

**ك ٤٦٦:** صۆفی تۆفیق کوڕی صۆفی حمه ئه‌مین له ده‌ربه‌ندیخان دائه‌نیشێ له که‌لار گێڕایه‌وه فه‌رمووی:

له سه‌فه‌رێکا حه‌زره‌تی شا محمد عثمان له ئاوایی دێیه‌ك فه‌رمووی دۆستێ شك نابه‌ن له‌م ئاواییه به په‌له چاییه‌کمان بۆ دەم بکات وه به په‌له بیخۆینه‌وه و بڕۆین؟ عه‌رزمان کرد ماڵێك هه‌یه فه‌رموو با له خزمه‌تتانا بین، کاتێ دانیشتین حه‌زره‌تی شێخی سراج الدین فه‌رمووی له‌م ماڵه بۆنی حه‌زره‌تی شێخی ضیاء الدین (قدس سره) دێت، عه‌رزیان کرد به‌ڵێ ڕاسته پشتێنێکی ئه‌و زاته له ماڵمان دایه پشتێنه‌که‌یان هێنایه خزمه‌تی زیاره‌تی فه‌رموو وه چه‌ند فه‌رمایشتێکی فه‌رموو.

**ك ٤٦٧:** جارێکی تر صۆفی تۆفیق گێڕایه‌وه ووتی :

له دووڕووه حه‌زره‌تی شا علاء الدین الله اکبری نوێژێکی ئێواره‌ی ئه‌کرد، له‌و الله اکبره‌دا دیم که ئه‌و ناوچه‌یه سه‌راسه‌ر نورێکی ڕه‌ش دای گرت سه‌راسه‌ر ناوچه‌که‌ی پڕکرد، هه‌مان چه‌شن ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆیی له خزمه‌ت حه‌زره‌تی قطبی زه‌مان شا عثمان دا بووین له دووڕووه خه‌ریکی بناوان به‌ستن بووین ده‌مه و ئێواره مامۆستا ملا عبدالله‌ی کاتب که له کاروباری بناوانه‌که‌دا به‌شداری ئه‌کرد ئه‌ویش فه‌رمووی با بڕۆینه‌وه به‌ردێکی لێ بوو له ڕێگاکه‌ماندا له‌وێ نوێژێکی بۆ کردین منیش نوێژم دا به‌ست له پشتییه‌وه، زۆری نه‌خایاند حه‌زره‌تی شێخ محمد عثمان سراج الدین ته‌شریفی هێنا و له لای منه‌وه نوێژی دابه‌ست و ئیقتیدای به مامۆستا ملا عبدالله کرد، کتوپڕ بێ ئاگا خه‌یاڵی نوێژه‌که‌ی حه‌زره‌تی شێخی علاء الدین (قدس الله سره العزیز) هات به یاد ما داواکار بووم که ئه‌م زاته‌ش عه‌ینی لوطف بفه‌رموێ، کتوپڕ به‌ره‌که‌ت و فیوضاتێکی ڕه‌ش سه‌راپا ئه‌و ناوچه‌یه‌ی داگرت و نوره‌که‌ش هه‌موو ئه‌و ناوچه‌یه و هه‌موومانی گرته‌وه، سوپاسێکی بێ پایان

بۆ خوای پەروەردگاری تاك و بێ هەمتا هەزاران سلاو بۆ ڕۆحی پاکی پێغەمبەری نازدار (صلی الله علیه وسلم) و ئال و یارانی.

ك ٤٦٨: بەڕێز و زانا وەلی بە وەفا خوالێ خۆشبوو خاڵە شێخ ئەحمەدی شاکەلی گەرمیانی[1] بۆی گێڕامەوە فەرمووی:

حاجی جاسمی باوکی حاجی عبداللەی جەلەولا ڕەحمەتی خوای لێ بێ فەرمووی: خاڵە شێخ ئەحمەد نامەیەکم بۆ بنووسە بۆ خزمەت حەزرەتی شا محمد عثمانی سراج الدین (قدس سره) بۆ لابردنی ئەو حاڵەتی مەجزوبی و جەزبەیە لە هەموو کاتێکا، حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین وەلامی ئەو داواکارییەی بەم چەشنە نووسیبووەوە: حاجی جاسم بە مەجزوبی لە دنیا دەرئەچێ، وە بە مەجزوبی زیندوو ئەکرێتەوە، وە بە جەزبەوە بە حضوری زاتی حەق ئەگات.

بەڵێ هەروا بوو کە ئەو سەماحەتە فەرموویان بە حاڵەتی جەزبەوە گیانی پاکی سپارد و قەزا و بەلای حەزرەتی پیری برد.

ئەمەش نموونەی هەڵبەستی جەنابی خوالێخۆشبوو خاڵە شێخ ئەحمەدی شاکەلییە:

ئەی چرای شەوقی جەماڵت شەمعی حوجرەی سینەکەم
دینەکەت ئاوی ڕەوانی مەزرەعەی ئایینەکەم
مەزرەعەی ئایینی طاعەت کاتی نەورۆزە و کزە
مەرحەمەتکە ڕوو لە من بە ئاوی دین و ژینەکەم

---

(١) خاڵە شێخ ئەحمەدی شاکەلی شاعیری گەورەی گەرمیان پیاوێکی زۆر بە ئەدەب و ویقار و ڕێز بوو لە ساڵی ١٣٢٣ی کۆچی لە دایك بووە وە لە شەوی یەك شەممەی ٢٠ی ربیع الثانی ١٤٠٢ کۆچی وەفاتی فەرموو، هەزاران ڕەحمەتی لێ بێ یەکێ لە فەرموودەکانی ئەوە بوو (حەیفە قصیدەیەك دابنرێ و ناوی ئەو سەماحەتەی تیا نەبێ، ئەو مەبەستی (حەزرەتی شا محمد عثمان سراج الدین) بوو.

ژینــــەکەم قوربـانی تـۆیــە بـۆ دریـــــژی ژینی تــــۆ

حـازرم قوربـان فیـدا کـەم ڕۆحـەکەی شیرینـەکـــەم

ڕۆحـــەکەی شـیرینـــەکەم هـەر چـاوە چـاوی ڕێگەتـە

حــازرم شـاها بـە بـرژانگ ڕێگەکـەت پـەرژین ئــەکەم

ڕێگەکـەت پـەرژین ئـەکەم تـا شـاکەل و شـیروانە بۆت

حەیـفە بـۆچی تـۆ نـەبینی دەشتـە سـەوز و شینـــەکەم

شینەکـــەم بـۆ شاکەلـــی کـــەم زاوو ئـــاوو شـۆرەزار

شـاکـــەلی قوربـانی تـــۆ بێ شێخــەکەی نەقشینـەکـــەم

شێخەکـــەی نەقشینـــەکەم قوربـانی تـۆ بێ ژینـەکـــەم

حـازری ئـەفـکاری تـــۆ بێ، بـۆ ویقایـەی دینەکـەم

بـــۆ ویقـایـەی دیـنی مـن دوور و نزیکـت بـۆ نـیـیـە

کـارەبـــاییکمە نیگاهـــت بـــۆ سـەوادی سینـــەکەم

سینەکــــەی پـر مـەینـــەتم، خومخانەیـەکی قەسوەتـــە

صـەفوەتی تــۆ مــەر بمالێ، قـەسوەتـە دێرینـــەکەم

قـــەسوەتـــە دێـرینـــەکەم ڕیشـەی لـە دڵمـا داکوتـا

گــــەر بــــژارێکی نـەبێ، فـەوتاوە زەرعی دینەکـەم

دینـەکەم مـەربوطی[1] یـاد و رابیطـەی[2] حوسـنی تـۆوە

حوسـنی تۆیـە نـووری دیـدەی پڕ تـەم و ئەسـرینەکەم

پـــڕ نـمـی دووریـە دیـدەم گـەرچی دووریـت بـۆ نیە

ئـەی فیـدای دوور و نزیکـت ڕۆحەکـەی بێتینـــەکەم

---

(١) دینەکەم مەربوطی : ئایینەکەم بەستراوە.

(٢) رابیطە : سرێکە لە ئەسراری طریقە لە میانەی دەستگیر و مریدانا.

ڕۆحەکـەی بێ تینـەکەم دووبـارە عـەرزی تـۆ ئـەکا
شـاکەڵی قـوربانی تـۆ بێ شێخـەکەی نەقشینەکـەم

**وەڵامی سەماحەتی شا محمد عثمان سراج الدين حفظه الله بۆ شاکەڵی:**

گـەرچی دوورە ڕێگـە جێگـەت هـەر لـە دڵـدا واز ئەکـەم
یـا دو فـیکرت بـۆ ئـەدیبی شـەوقی دڵ هـەمڕاز ئـەکـەم
نـەزمی خۆش و شـۆخ و شـیرینت فـەرەح بەخشـی دڵـە
شاکـەڵیش فـەزڵی هـەزار جـارە بـە سـەر شـیراز ئەکـەم
بـۆ تەماشـای شـاکەڵ و شیروانـە ئـازیز فیکـری خـۆم
هەر وەکو تـەیارە بـۆ ئـەوجی سەما ئاغـاز ئـەکـەم[1]
بۆ تـەمەنـنای حیفـز[2] و حوسـنی شـاکەڵی گریانـمـە[3]
ڕوو لە قاپی حەق بـە دڵ دەسـتی دوعـا هـەوراز ئەکـەم[4]

---

(١) ئاغاز ئەکەم : باڵ ئەگرم و ئەفڕم.

(٢) حیفز : حیفظ : پارێزگاری.

(٣) بـەڵێ هـەروا بـوو کـە گـەرمیانی ئاواتەکەی هاتـە دی و هـەروەکوو حـەزرەتی پـیر فـەرمووی (هەروەکو بە ئاواتی خواستبێ) بە حضوری سەماحەتیان شـایی مـەرگ مـەرگ بـوو قـۆچی قوربـانی سوپاسالاری دین و دنیا بوو، وە سەد خۆزگەم بەو کەسەی لەقاپیتا عاقیبەت خێر ئـەبێ ان شـاالله الرحمن.

(٤) هەوراز ئەکەم : بەرز ئەکەمەوە.

**نموونەیەکی شیعری حەزرەتی قطبی زەمان شاهی عثمانگیان :**

سەر گەشتە مەبن هەر وەکو پەروین و ستارە
بۆ ئەهلی خیرەد خۆ نیە لازم بە ئیشارە
هەرکەس ئەیەوێ عەفوی خودا و عومری دوبارە
ئەمڕۆ بە یەقین کەعبەیی حاجاتە بیارە
مەعلوومە کەوا طوری موناجاتە بیارە

ئەطراف و دەر و بانی بە قورئانە منور
ناو هۆدە و سەقفی بە ئەحادیثە مصور
ئەرواحی مەلەك گردە لە ئەرکانی مدور
باغاتی جینان ئاوی ڕەوانی وەکوو کەوثەر
وەك بوومی بەقیع جێگەیی ئاواتە بیارە

خاکی دەری بینایی یە بۆ دیدەیی کۆران
باعیث بە شفای نووری دڵی پاکی ئەسیران
دەربانی دەری خان و ئەمیر شاهو وەزیران
جێی ڕەحم و دەوای زامی چڵی چاکی فەقیران
سا مژدە کەوا کانی کەراماتە بیارە

هەرکەس ئەیەوێ نووری عیباداتی لە دڵ بێ
ئازو هەوەسی مەحبەسی دامی دمی دڵ بێ
خاکی گڵ و خاشاکی هەموو پاکی بە گوڵ بێ
جۆشی دڵی پڕ هۆشی خودا دۆزی بە قوڵ بێ
ئاوارە نەبێ، بەحری فیوضاتە بیارە

جـێـی مووی مەحاسینی نـەبی سیـدی اکـبر
بەم مـەسئـەلەیـە ناطقە خۆ شـــەرعی مطهر
یـەك مووی شەریـفی بە نبیێـکە بـەرابـەر
جێی فـەخری هەموو عالەمی ئەسرارە سەراسەر
عـالی هیـمەمە شـاهی مەقـامـاتـە بیـارە

ڕەحـمێـکە ئـیلاهی بە ویصالی شەوو مـاهـم
ئـەو شاهـەوا کـەوا سەیـقەلـە بۆ قـەلبی سیاهم
ئـەو شاهـە کەوا باعثـە بـۆ عـزەت و جاهـم
بـۆ ڕاهی هـودا هـەر ئەوە دەسگیر و پـەنـاهم
میرئـاتی صـفا مـەطلـەعی ئـایـاتـە بـیارە

یـاران وەرن و سـەر کـەنـە پێ دیـدە بـە گریـان
تـاکەی دەگـەڕێن مـات و سەراسـیمەوو عوریـان
بـۆ سـۆزی دەروون قرچـەیی دڵ سینـەی بـریان
بیـخۆ بـە صـەفای قـەلبی‌یـەوە جـەمعی برایـان
بـۆ نـوور و ضـیاء فـەوزی سـەعاداتە بیـارە



دانەر

ئـەمانـە وێنـەی ئـەسەد وبـازن
عـالی مەرتـەبـە وبـوڵنـد پـەروازن
بـە شـیرین خـووی و بـە بـەرزی هیممـەت
لـە نێـو ڕەگـەزی خۆیـان ممتـازن

قرائة هذه الصلوة الشريفة مرة واحدة تساوي ١٠٠٠٠٠ صلوات اخرى

اللهم صل وسلم وبارك على سيدنا ومولانا محمد شجرة الأصل النورانية ولمعة القبضة الرحمانية وأفضل الخليفه الانسانية وأشرف الصور الجسمانية و معدن الأسرار الربانية و خزائن العلوم الأصطفائية صاحب القبضة الاصلية البهجة السنيه والرتبة العليه من اندرجت النبيون تحت لوائه فهم منه واليه وصل وسلم وبارك عليه و علي اله واصحابه عدد ما خلقت ورزقت وامتت وأحييت الى يوم تبعث من افنيت وسلم تسليماً كثيراً الي يوم الدين والحمد لله رب العالمين

کەسێ لە سەجدەدا سەری لە سەر خاکی پاك دابنێ لە جێگەیە خاڵیدا کەس چاوی لێ نەبێ دەوام لە سەر ئەم دوعایە بکات هەرجار ٧ کەرەت تکراری بکاتەوە هۆی بە ئاوات گەیاندن و حاصل بونی مەقصودە.(اللّهم أنت العزيز و أنا الذليل و هل يرحم الذليل إلاّ العزيز). هەمو جارێ سەجدەی برد ٧ جار بیخوێنێ، بەلام لەگەلْ ئیخلاص و حضوری دلْ وە لە خەلْوەتیدا.

## ناوەرۆك

